کتێب: وڵاتەکەت باشتر بناسە
نووسینی: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٥٠
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٣٨)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

پێشکەشە بە

هەموو خاوەن خامەیەک کە لە حەق لای نەداوە

ئەوانەی خوێنی خۆیان لە پێناوی گەل و نیشتماندا بەخت کرد

شەهیدانی یەکی شوباتی ٢٠٠٤

*شێرزاد محەمەد ئەمین ڕۆژبەیانی*

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

# پێشەکی

سوپاسی بێ پایان بۆ یەزدانی پەروەردگار، کە ئێمەی رزگار کرد لە درندەترین رژێم لەسەر زەمین، کە مێژوویەکی پڕ لە ستەم و تاریکی تۆمار کرد، رۆژگارێکی ئەوتۆی رەخساند، کە پڕە لە ئازادی و سەرفرازی، ئەمڕۆ دەتوانین لەژێر سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، هەوای ئازادی هەڵمژین و، بتوانین ئەو نووسینانەی قەدەغە بوون لە لایەن رژێمەوە بگەیەنرێنە چاپ، رزگاری بێت لە شاردنەوە و درووود لە گیانی پاکی پێغەمبەر بێت.

ئەم کتێبە بەنرخە دەخەینە بەرچاوی خوێندەواران و رۆشنبیران و زانایانی گەلەکەمان. دانەری ئەم کتێبە (محەمەد جەمیل کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە کوڕی بەکر بەیداخداری رۆژبەیانی)یە، لە دێی فەرقانی سەر بەناوچەی قەرەحەسەنی سەر بەکەرکووک -کەرکولی کوردستانی-، لە رۆژی ۲۷ رەجەبی ۱۳۳۱ کۆچی بەرامبەر بە ۱۹۱۳ زایینی لە دایک بووە، دایکی (زەهراء کچی حەسەن محەمەد رۆژبەیانی ئامۆزای باوکێتی)، لە تەمەنی شەش ساڵیدا هەر لە ماڵی خۆیا، لای باوک و دایکی، فێری ئەلفوبێ بووە، خوێندنی قورئانی پیرۆزی دەس پێ کردووە، تا سورەتی قەصەصی خوێندووە، ئەو دوای سورەتەکانی بەچەند رۆژێ بۆ فەقێ عەبدوڵڵا خوێندوتەوە، کە لەو حەلەدا لای باوکی فەقێ بووە، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا قورئانی خەتم کردووە و خەتمانەی بۆ فەقێکانی باوکی بردووە.

ساڵی ۱۳۳۹ک/ ۱۹۲۰ز مەلا ئەحمەدی باوکی بەهۆی ناکۆکی رۆژبەیانییەکانی خزمی، لە فەرقانەوە گواستوویەتییەوە بۆ (بادەوا) لەوێ کە باوکی مامۆستای دەرس وتنەوە بووە، لای مەلا سەید وەهابی ئیمامی بادەوا کە فەقێی باوکی بووە، کتێبە کوردی و فارسییەکانی (عەقیدەی کوردی شێخ سەمیع، سمایل نامە، ناگەهان، باغەوان، ئەبی شودە)ی خوێندووە و فێری نووسین بووە، ساڵی ۱۳٤۱ک/۱۹۲۲ز کە شێخ مەحموود حەفید زادە لە رەهەندەیی وڵاتی هیندستان گەڕاوەتەوە بووە بەمەلیکی کوردستان (یا حکومدار) مەلا ئەحمەدی بردۆتە سلێمانی و، بەئامانجی دامەزراندنی جامیعەیەکی وەکو -جامیع الأزهر- لە مزگەوتی گەورە کردوویە بەمامۆستا، مەلا ئەحمەد محەمەد جەمیلی

کوڕی لەگەڵ خۆی بردووە و، لەوێ خۆی کتێبەکانی (گوڵستان بۆستان و، بینای) پێ وتووە، هەروا فێری (عەوامیلی جورجانی و، فەتح والقریب)یش... لەم سەردەمەدا جەمیل ژمارەیەک ڕۆژنامەی کوردی دیوە و خوێندۆتەوە کە زوبانی حاڵی حکومەتی شێخ مەحموود بووە، بەڵام لەم دواییەدا ناوی ئەو بەیاد نەدەهات، ناوی چ بووە، هەموو جارێ کە شێخ مەحموود هاتووە بۆ زیارەتی مەرقەدی کاک ئەحمەد لە مزگەوتی گەورە، گاڵتەی لەگەڵ جەمیل کردووە، ناوی ناوە (پێنج مەزەب) و، ئامۆژگاری کردووە بەم وتەیە (ڕۆڵە جەمیل بەمەلا مەلا غافڵ مەبە، بخوێنە بخوێنە)، پاش تێکچوونی حکومەتی شێخ مەحموود، ساڵی ١٣٤٣ک/١٩٢٤ز کە مەلا ئەحمەد سلێمانی بەجێ هێشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی خۆی لە بادەوا - جەمیلی هێناوەتەوە، هەر لەو ساڵەدا لە کەرکووک (مامۆستا عەلی حکمەت ئەفەندی سیامەنسوری) مردووە، کە مەلا ئەحمەد فەقێی بووە ئیجازەی لێ وەرگرتووە، جا مەلا ئەحمەد چووەتە پرسەوە و لەوێ چەند ڕۆژێ ماوەتەوە، خەڵقی کەرکووک و مەلا دۆستەکانی داوای لێ دەکەن لە جێی ئەو ببێتە مامۆستای قوتابخانە ئاینییەکان ئەویش بەڵێن ئەدا و دەبێ بچێتە ئیمتیحانەوە، مەلاکانی کەرکووک کە حەزی لێ ناکەن و لێی ئەترسن، لە ئیمتیحانا مەلایێ ئەهێننە پێشەوە و ئەو لە ئیمتیحانا سەر ئەخەن، ئەمە تەنها بەغیلی نەبێ هیچی تر نەبوو، بۆیە ئەو مەلایەیان هێنایە پێشەوە، مەلا ئەحمەد خەریک ئەبێ بەدڵشکاوی بگەڕێتەوە، پیاوماقووڵانی کەرکووک ناهێڵن و لە مزگەوتی منارە نەخشینە (کە ناوی مزگەوتی فەرهادە) بەئیمام و مودەریس دایئەمەزرێنن؛ جەمیل و فەقێ کەریم ئەحمەد لەگەڵ خۆی ئەباتە کەرکووک و لەگەڵ فەقێکانی تری خۆی دەرسیان پێ ئەڵێت. لەوێ کەمتر لە ساڵێ ئەمێنێتەوە لەگەڵ باوکی ئەگەڕێتەوە (بادەوا)، لەوێ قوتابخانەیەکی میری ئەکرێتەوە، جەمیل لە پۆلی چوارەم وەرئەگیرێ و سێ ساڵ تیایا ئەخوێنێ لەپاڵ خوێندنێ ئاینیدا، جا لەم حەلەدا ئەم کتێبانە ئەخوێنێ (مەتن موغنی، ئیظهار، تەصریفی مەلا عەلی، کیفایەی بێتووشی، لەگەڵ هەندێ کتێبی تری فارسی و تورکی، بەڵام پچرپچر، چونکە جارجار کە شوانیان نابێ یاساولەوان ئەم ئەرکە ئەگرێتە مل، لەم سەردەمەدا فەقێ لە بادەوا ئەمانە ئەبن: (موستەعید: مەلا مەحموودی دێلێژەیی، مەلا مارفی خاویەیی، مەلا قادری حەساری و هی تر، سوختەش ئەمانە ئەبن: سەعدی، ئەوڕەحمان، شێخ حەسەن کەبیر، سەعیدی کاتب سەید ئەحمەدی عەرەب، سەید حوسێن و هی تر...

ساڵی ١٣٤٧ک/١٩٢٨ز مەلا ئەحمەد لە بادەوا ئەگەڕێتەوە فەرقان، لەوێ بەدەرس

وتنەوە خەریک ئەبێ، جەمیلیش لەگەڵ فەقێکانا ئەگەڕێتەوە، لەم کاتانەدا فەقێ مەلا کەریم، مەلا حەمید، مەلا ئەحمەدی بچووک و چەند کەسێکی‌تر دەبن، سوختەش زۆر ئەبن - جەمیلیش وردە وردە ئەخوێنێ و، جارجارە سەرپەرشتی ئاشە ئاوەکانی ماڵی باوکی ئەکات، بۆ جۆماڵ و ئاشەوانی، هەروا دەر و شوانیش.

لەبەر چەند هۆیەک کە ئەگەڕێتەوە، بۆ پەیدابوونی ناخۆشی لە نێوانی جووتیارەکانی ڕۆژبەیانی -فەرقانی- و ئاغادێ -دەرەبەگ- جەمیل ئەچێ بۆ کەرکووک لای (مەلا سەید یوسفی) خزمی ئەخوێنێ - لە مزگەوتی حەسەن مەکی ئیمام و خەتیب ئەبێ، باوکی بەم چەند دێڕە شیعرە بەشێوەی ڕۆژبەیانی ئامۆژگاری ئەکا خۆشبەختانە گوێڕایەڵی هەردوو ئامۆژگارییەکە ئەبێ ئەمەش ئامۆژگاریەکەیە:

کوڕە قنجەکەم مایەی ژیانم
کزەی جەرگەکەم ڕوح ڕەوانم
وەدڵ بشەفی تەمێ و پەند من
ئاراستە مەوی دما ڕۆژ ڕۆشن
ئازا بە! بخۆن! با نەوی بێ کەڵک
نەوی و مەینەت قەشمەرچارِ خەڵک
خۆ نەوار بەوی با ماڵتیش نۆتن
لە نام خەڵکی یا حورمەتت مۆتن
کە بیتە پیا، خاوەن خووی باش بە
لێرد ئاییل ئاییل، هەراش هەراش بە
سەربەرز و بەرز ڕۆژگار بووە سەر
ملەت فرۆش مەو هۆزت بۆ نەوەر
باوەڕ و هێز بە، مەکە چەکەرەک
خوا لە پشتت بۆ غاری تەرک
فەقیر و هەژار لاوانن باشە
دەوڵەمەن کاری و پارە باشە

کاتێک کە مەلا سەید یوسف ئەقڵی پردێ ئەبێ جەمیلیش لەگەڵی ئەچێ، لەم حەلەدا کە (ڕۆژبەیانی) نیوچە موستەعید ئەبێ. دەرس بەچەند فەقێیەکی سوختە ئەڵێت کە

ئەمـانە ئەبن: (ئەحـمەدی مـەلا کـەریمی زەنگنەیی، حـەمـە ئەمین دارەمـانی، عـەبدوڵڵا دارمانی، حوسێن و عەلی ناوێکی خەڵکی دەوری پردێ) و، پاشان لە پردێوە ئەگەڕێتەوە فەرقان، چەند مانگێ ئەمێنێتەوە لە ساڵی ١٣٥٠ک/ ١٩٣٠ز بەزیزی ماڵی باوکی بەجێ ئەهێڵێ ئەچێتە هەولێر لە مزگەوتی حاجی قادری دەبباغ لای (مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا کوڕی حاجی مەلا محەمەد ئەمینی کونە فلوسەیی) ئەبێ بەفەقێ و دەرسی (موطەووەل) ئەخوێنێ، بەڵام بنەماڵەی یاسین ئاغا قەبووڵ ناکەن لە مزگەوت بمێنێتەوە، ئەیگوێزنەوە دیوەخانەکەی خۆیان، لە پاش چەند مانگێک ئەچێتە دێی (عەوێنە) لای مەلا عوسمان ئەبێ بەفەقێ، لەگەڵ حەسەن ئاغای (عـەوێنە) کـە پیـاوێکی خوێندەوار ئەبێ، ئەبێ بەدۆست، زۆر نامێنێتەوە یەکێ لە خزمەکانی بەدوای (جەمیل)دا ئەچێتە (عەوێنە) و ئەیهێنێتەوە هەواڵی کوشتنی باوکی پێ ڕادەگەیەنێ، ئەمە لە ساڵی ١٣٥٣ک/١٩٣٤ز دەبێ. لە ساڵی ١٣٥٥ک جەمیل بڕیار ئەدا بچێ بۆ پاکستان بۆ خوێندن، برا گەورەکەی (مەلا محەمەد ئەمین) و خزمەکانیان ناهێڵن، ئنجا بۆ خوێندن ڕوو ئەکاتە شارۆلکەی کفری (صەلاحییە) لەوێ لای موفتی محەمەد سەعید ئەفەندی بێوری سوەیلی ئەمێنێتەوە، لێرە لەگەڵ بەگزادەکانی جاف ئەبێ بەدۆست، کەریم بەگ سەرۆکی جاف و داود بەگی برای هامشۆیان ئەکرد و خەڵقی کفریش زۆریان خۆش دەوێ. هەر لەوێ لەگەڵ حوسێن حوزنی خێوی گۆڤاری ڕووناکی ئەبێ بەدۆست، وتار ئەنێرێ بۆ گۆڤارەکەی. لە ساڵی ١٩٤٢ ئیجازەی عیلمی لای مامۆستای پایەبەرز (مەلا ڕەزای واعیز)ەوە وەرئەگرێ، دانەر نازناوی بەبەندی بڵاوبۆتەوە ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ بەندکردنی لە گرتووخانەکانی ئێراق، چونکە پتر لە سێیەکی ژیانی لە بەندیخانەکان و ڕەهەندیی بردۆتە سەر، هەمووی لەسەر کوردایەتی و بەرگری لە گەل و نیشتمانەکەی بوو. حەیف و مەخابن بۆ کتێبخانەکەی کە کەوتە بەر شاڵاوی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ و سووتاندیان لەناویا چەندەها دەسنووسی نایاب هەبوو کە هی خۆی و بەهەشتیی باوکی بوو.

لە پاش چوونی بۆ ئێران و گەڕانەوە بۆ ئێراق لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٩ لە بەغدا مایەوە، نامۆژگاریەکەی باوکی لە گوێیا دەزرنگایەوە کە وتی: (باوەڕ و هێز بە، مامەکە چەکەرەک) ئەویش لە ژیانیا چەکەرەکی لە دوژمن نەکردووە. لەو ماوەیە چەندەها نووسینی مێژوویی بەنرخی بڵاوکردۆتەوە وەک: بەندەنیجین - مەندەلی - دەقوقاء - خانەقین - مێژووی حەسەن وەیهی و عەییاری... هتد. شایانی باسە لەگەڵ ئەم هەموو نارەحەتییەدا دوو جار لە ژیاندا ڕێزی لێ گیراوە، یەک لە ساڵی ١٩٨٧ لە لایەن شاعیر و

نووسەر و ئەندازیاری هەڵکەوتوو ڕێزدار خەسرەو بەگ جاف، دوو لە ١٩٩٤/٣/٣١ لە لایەن یەکێتی مێژوونووسانەوە خەڵاتی (وسام)ی پێ بەخشێنرا. بەچاوەنەترسی خۆی مایەوە تا شەوی ٢٦/٢٧-٣-٢٠٠١ کە بەدڕەندەترین شێوە لەلایەن کاسە لێسەکانی ڕژێمە ستەمکارەکەی بەعس کوژرا لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا بوو. لە کاتی ڕووداوەکەدا دەسیان لە کتێبخانەکەی وەردابوو چەندەها کتێبی بەنرخ نەمابوو، لە پاشان دەسیان بەسەر کتێبخانەکەدا گرت، بەهەر حاڵ بێ بەماندووبوونێکی زۆر و بەهیمەتی دۆستەکانەوە توانرا کتێبخانەکە لە قورگی گورگ و چەقەڵ ڕزگار بکەین، بەڵام جێی داخە کە یاداشتنامەکەی لە چنگی ئەوان مایەوە، تاکو ئێستا بێ سەر و شوێنە و جێی خۆشحاڵیمانە کە دەستنووسەکانی ڕزگار بوون.

با بێینە سەر ئەم کتێبە بەنرخە کە ناوی (وڵاتەکەت باشتر بناسە). بەنرخە چ لە بارەی زانیاری مێژووییەوە و، چ لە بارەی زانیاری جوغرافیاییەوە، جگە لە چەندەها لێکۆڵینەوەی زانستی، دانەر هونەرێکی بەکارهێناوە ئەویش ئەوەیە کە لەسەر شێوەی پیتی هەجاییەوە واتا (الحروف الهجائیة) نووسیوێتی، ئەم کتێبە بریتییە لە ٢٤٩ وتار، ئەمە لە ساڵانی شێست و حەفتاکاندا لە ڕادیۆی تارانەوە بەشی کوردی پەخش کراوە، تاکو ئێستا نەخراوەتە بەرچاوی خوێنەران و ڕۆشنبیرانی کورد، ئێمەش بەدەقی خۆیەوە ئەیخەینە بەرچاوی خوێنەرانی خۆشەویست، تەنها چەند ڕستەیەک لابراوە کە پەیوەندی بەئێزگەوە هەیە، ئەمە وا، بەڵام بەداخەوە دوو وتاری بەژمارە (١٢٠-١٢١) لەگەڵ لاپەڕەیەک لە وتاری ژمارە (١٣٨) ونە، ئێمە تکا ئەکەین هەرچی کەسێک زانیارییەکی دەربارەی ئەو دوو وتارە و لاپەڕەیە هەیە ئاگادارمان بکەنەوە، یاخود ئاگاداری دەزگای ئاراس بکەنەوە، ئیتر ئومێدەوارین توانیبێتمان خزمەتێ بەخوێنەرانی گەلەکەمان بکەین.

شێرزاد محەمەد ئەمین ئەحمەد ڕۆژبەیانی

٢٠٠٤/٢/١٢

وتاری: ۱

## ئالان

گوێگرانی بەڕێز، شەوتان خۆش، بۆ ئەوەی خوێندەوارانی کورد چاتر وڵاتەکەیان بناسن و، بکەونە سەر هەوەسی دانانی فەرهەنگی وڵاتناسی و کەسانی وڵاتناسین، بۆ ئەوەش کە خوێندەواران پتر هەوڵ بدەن یەکتری شارەزای وڵاتەکەیان و ناودارانی خۆیان بکەن، بەرنامەی کوردی ڕادیۆی ئێران ئەم ئەرکەی خستۆتە سەرشانی ئێمە کە لە ڕابردووی ئاوایی و شار و ناوچە و هەرێمەکانی وڵاتی کوردەواری بدوێین، تا ئەو ڕادەیەی سەرچاوەی مێژوویی و جوغرافی ڕێمان بۆ خۆش بکەن، باسەکانمان بۆ ڕوون بکەنەوە جا ئێمە بەپێی پیتە کوردییەکان وتارەکانمان لە (ئا)وە دەست پێ ئەکەین و چونکە تەنیا لە بارەی کوردستانی ئێرانەوە ئەدوێین، بەرگوڵی ئەم بەرنامەیەمان (ئالان)ە ئەوەندەش بزانن، کە بەم هۆیەوە ئەتوانین ناوی ناودارەکانی ئەو جێیانەش بیەین، ئەوەندەی کە خۆمان شارەزا بین و، مێژوو یارمەتیمان بدات.

موزیک

ناوی (ئالان) بەلامی قەڵەو، کوردییە، لە ڕیشەی (ئاڵۆسکان)ەوە هاتووە، کە (ئالاو) و (یەکائالاو) و (تێک ئالاو)ی لێ داتاشراوە، لێرەدا مەبەست پێچ و پلووچی ناو زورگ و هەڵەتی داوێنی چیایە. فارس و تورک و عەرەب لامەکە لاواز ئەدرکێنن، لەبەرئەمە زۆر لە کوردەکانی ئێرانیش (ئالان) بەلامی لاواز ئەدرکێنن، لەباتی لامی قەڵەو... ئەمە وەها و (ژاک دومورگان)ی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی کە ساڵی ۱۸۹۰ زایینی بەم ناوەدا تێپەڕ بووە، لە لاپەڕەکانی ۷-۳۹ی کتێبی (جوغرافیای خۆرئاوای ئێران)دا ناوی ئالانی بردووە، وتوویە: ڕیزە چیاکانی نێوانی (شنۆ) و (ئالان) لە سێ هەزار مەتر بەرزترن، وەک چیا ڕەش سپێ ڕەس، ئالاوە، قەندیل... تاد... ئەمە وەها و ناوی (ئالان) یەکێکە لەو ناوە کۆنانەی بەکارهێنراوە لە مێژوو و جوغرافیادا، ئەوەک هەر بۆ ئەم جێگەیە بەڵکو بۆ زۆر جێی تر. لە کتێبی (حدود العالم)دا کە کۆنترین کتێبی جوغرافیایە بەفارسی نووسرا بێ لە لاپەڕە ۱۰۹دا باسی (ئالان)ێکی کردووە کە هەرێمێک بووە لە نێوان سەریر و ڕۆم و ئەرمەنستاندا و ئەکەوێتە پێچ و پلووچی چیای قەفقازەوە کە دەبێ مەبەستی (ئەڕان)ی

ئێسته بێ و له هەرێمی گورجستانا بێ. بەڵام شەمسەدین سامی نووسەری تورکی دەوری عوسمانی له (قاموس الاعلام)دا (ئالان)ی بەناوی نەتەوەیێ داوەتەوە قەڵەم و وتوویە: ئالان نەتەوەیەکی ئاری نەژاد بووه له ئاسیای ناوەڕاست کۆچی کردووه بەرەو بەشی لای خواری خۆرهەڵاتیی ڕووسیا و، له ساڵانی ٣٧١ی پاش زایینیدا بەر لێشاوی عێلاتی (هۆن)ی تورانیی کۆچەر کەوتووه کە بەرەو ئەوروپا کشاون و، هەندێکیان بەرەو (فنلاندە) تارومار بوون، هەر ئەم هەرێمی ئالانەی کە (حدود العالم) ناوی بردووه له سەردەمی عەبباسیدا بەر شالاوی تاتار و مەغۆل کەوتووه، بەپێی (عالەم ئارای نادری) له دەوری نادر شادا (ئالانی)یەکان بەشێکی سپای نادر شایان پێکهێناوه، جگه لەم ئالانەی ناومان برد (مارکوپولو)ش باسی نەتەوەیەکی تری کردووه، بەم ناوه کە لەسەر سنووری وڵاتی (چین)دا بوون. هەروا دوو زانای پزیشکی و مۆسیقا فەرەنسەییش بەم ناوه هەبوون.

موزیک

گوێگرانی بەڕێز، ڕەنگه هەندێ له ئێوه لای سەیر بێ کە من له باسی ئالانی کوردستانەوه بازم داوه بۆ وڵاتانی دوور. بەڵام منیش وەکو ئەوانەی کە فەرهەنگی ناوان دەنووسن، ئەم باسانەم بۆ زیاده زانین هێنا و دوور نییە له کاتی مەغۆلدا هەندێ له ئالانە ئارییەکانی وڵاتی (ئەڕان) له جەور و ستەمی مەغۆل هەڵاتبن و پەنایان هێنابێتە ئەم چیا سەختانەی (کوردستان)ی ئێران و بووبنە هۆی بڕینی ناوی (ئالان) بەسەر ئەم ناوچەیەدا. با له بیرمان نەچێ کە (موستەوفی قەزوینی) یەکەم جوغرافیانووسە له لاپەڕە ١٣٧ی نوزهەت القلوبدا کە ساڵی ٧٤٠ کۆچی دایناوه ناوی ئالانی بەشی کوردستانی بردووه، وتوویە: ئالان شارۆلکەیەکی بەبایەخە... ئاووهەوای خۆشە، پاوەن و لەوەڕی زۆرە... جێی ڕاووشکاری پان و پۆڕە، بەرهەمی دەعڵ و دانەوێڵەیە، ئاوی کانیاو و کارێزە... بەڵام دیارە کە (موستەوفی) خۆی ئالانی نەدیووە، هەر له زمانی خەڵقەوە ئەم شتانەی تۆمارکردووه.

موزیک

بەپێی وتەکانی (ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی) له شەرەفنامەدا و، بەپێی دوو کتێبی مێژووی ئەردەڵان کە یەکێکیان (مەلا حوسەین) ناوێ نووسیویە و، ئەوی تریان مەستوورە خانمی ئەردەڵان نووسیویە، هەروا بەپێی قسەی (مامۆستا ئایەتوڵڵا مەردوخ)، (ئالان)

بەشێ بووە لە هەرێمی (ئەردەڵان) کە لەژێردەستی بنەماڵەی (ئەردەڵان)دا بووە، وەکو ئەشزانین سەرداریتی (ئەردەڵان) لە کاتی خۆیا هەر لە هەرێمی سنەوە تا (شارەزوور) درێژەی کێشاوە، تەنانەت لە سەردەمی مەغۆل و ئیلخانی و جەلایریدا کە لەژێردەستی پەیکە بەگ و، مەئموون بەگ و، محەمەد بەگدا بووە... ئەمە وەها و بەقسەی (مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی) لە ساڵانی ١١٣٠دا لەژێر فەرمانی یوسف شێخە بەگ ئالانیدا بووە. ژاک دومورگانیش ئەڵێ ساڵی ١٨٩٠ کە سەرۆک عیلەکان لەلایەن فەرمانڕەوای مەهابادەوە دائەنران، لەم کاتەدا سەرۆکی (ئالان) عەلی ئاغا ناوێ بوو. لە بیرمان نەچێ لە (قوورەی) سەر بەکوردستانیش دێیەکی تری (ئالان) ناو هەیە - هەروا لە دەوروبەری وەرتەنگی مێژووییشدا لە هەرێمی (حەلەوان) دێیەک بەم ناوە هەبووە.

موزیک

بابێینە سەر خووڕەوشتی خەڵقی هەرێمی (ئالان)، (ژاک دومورگان) ئەڵێ: هەرچەندە ئالان جێگەیەکی دووردەستە و دەبوایە خەڵقەکە زۆر دواکەوتووبن، کەچی وەها نییە، خەڵقی ئەو ناوە حەزیان لە ئاوەدانکردنەوە هەیە، مێوان دۆستن، ئاشنای کشتوکاڵن. لەم ساڵانەی دواییەشدا (تیمسار ڕەزم ئارا) لە لاپەڕە ٨٨ بەرگی چوارەمی فەرهەنگەکەیا ئەڵێ: ئالان یەکێکە لە دێهستانەکانی بەشی سەردەشتی سەر بەشارستانی مەهابادی ئوستانی ئازەربایجانی خۆرئاوایی، لا خواری کوردستانی ئێران، لای باکوری دێهستانی (بارباجی)یە، لای خواری ڕووباری زێی بچووکە، کە ئالانی کوردستان ئێران لە ئالانی کوردستانی عێراق جیا ئەکاتەوە، لای خۆرهەڵاتیشی دێهستانی باسکەیە و ئەم دێهستانە لەناو چیا و جەنگەڵ دایە، هەوای خۆش لە هاوینا تۆزێ گەرمە، بەهاری ڕەنگینە، میوەی هەنجیر و توو و گوێزە، خەڵقی ئالان لەبەر کەمی کشتوکاڵ هاوینان میوەکەیان لە دێهستانەکانی هاوسێ ئەگوێزنەوە بەدەغڵودان.

کار و پیشەیان زۆرتر، گەلەداری مەڕان بەخێوکردنە، دەسکەوتیان لە ئاژەڵ زۆرە، وەک شیر، ماست، ڕۆن، پەنیر کەشک، ژاژی، خوری، موو، پێستە و شتی تر - ئالان ٣٧ دێی بچووک و گەورەی هەیە، ژمارەی دانیشتوانی ٣٥٨٠ کەسە، گەورەترین دێی ئالان (بێتوش) و (دولکان) و (بێژوێ) و (سەنجوی)یە، کە لە سەردەمی کۆنا پڕ لە خوێندەوار و زانا بوون و، هەستیاری خاوەن هەڵبەستیان بووە، دوور نییە کە چیرۆکی (مەمی ئالان) لەلایەن خەڵقی ئێرەوە بەپەیڕەویی (مەم و زینی) ئەحمەدی خانی هەڵبەسترا بێ. ئێمە لە

باسی بێتوشدا باسی بنەماڵەیەکی زانای خەڵقی (ئاڵان) دەکەین. ئەمرۆکە لە گوندە گەورەکانی ئالاندا قوتابخانە، نەخۆشخانە، مزگەوت، بۆ ڕابەری خەڵقی بەرەو پێشکەوتن هەیە. تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٠/١١/١

**وتاری: ٢**

# ئەردەڵان

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش، بەختیاری و کامەرانیتان ئاواتی بەرنامەی کوردییە.

موزیک

ئەمشەو باسی (ئەردەڵان)تان بۆ دەکەین لە ڕووی جوغرافییەوە، ئەم ناوە لە سەرەتادا دراوە بەو هەرێمەی ئەکەوتە نێوانی (سۆران - موکریان - بابان - باجەڵان)، واتا ئوستانی کوردستانی ئەمڕۆی ئێران و، تۆزێ بڵاوتر. و بەداخەوە فەرهەنگە زمانییەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی وشەی (ئەردەڵ)یان خستۆتە دووتوانی لاپەڕە زێڕینەکانیان، تەنیا فەرهەنگی (مەردوخ) کە دانەرەکەی (ئایەتوڵڵا مەردوخ)ە و خەڵقی ئەم وڵاتەیە ناوی (ئەردەڵان)ی بردووە فەرموویە: (ئەردەڵ)! واتا پاسەوان، یاساوڵ، کێشک. کە نەبێ لە وشەی (ئوردو)ی تورکییەوە هاتبێ و، باشتر ئەوەبوو بفەرمووێت: (ئەردالْ) لەسەر کێشی (عەودالْ) و (کەژالْ) و (شەلالْ) دەبێ وشەیەکی کوردی بێت، واتا سپی واژ، ئارداوی ڕەنگ. (مامۆستا محەمەد میهری)ش کە لە ئەستەمبوڵ دەژیا و، لە ساڵانی ١٣١٣-١٣١٧ کۆچیدا لەوێ ڕۆژنامەی کوردستانی دەرئەکرد، خۆی لە بنەڕەتا لە بنەماڵەی (موفتی سنەیە) لە ڕیزە وتارێکیا کە ساڵانی ١٩٥٥-١٩٥٦ ئەینووسی بۆ گۆڤاری (هەتاو) کە لە شاری هەولێری کوردستانی عێراق دەرئەچوو وای ئەدایە قەڵەم کە ناوی (ئەردەڵان) لە بنەڕەتا (ئاری دالان) بووە... بەڵام با خۆمان لەوە بکۆڵینەوە... بەپێی گومانی من، وشەکە لە بنەڕەتا (هەردوو ئالان) بووە، لەبەرئەوەی سەرداریتیی (ئەردەڵان) لە هەرێمێکی چیاییدا پێک هاتووە ئەم ناوە بووە بەناو بۆ سەرداریتییەکە بۆ ئەو بنەماڵەیەی دەسەڵاتی وڵاتەکەیان بەدەستەوە بووە، بۆیە مێژوونووسان وایان داوەتە قەڵەم کە (بابا ئەردەڵان) ناوێ سەرداریتییەکەی دامەزراندووە، باوەڕیشم وایە کە هیچ پەیوەندیی لە نێوانی ناوی (ئەردەڵان) و (ئەرد) یا (ئورد)ی ئەشکانیدا نییە. ئەم ناوە لە پێش سەدەی هەشتەمی کۆچیدا نەبووە، جامع التەئریخی ڕەشیدی، جیهان گوشای جوەینی، گوزیدەی قەزوینی، جیهان ئارای غەفاری، ظەفەرنامەی عەلی یەزدی، کە مێژوونووسی سەدەکانی ناوەنجیی کۆچین، هەروا جوغرافیانووسانی (حدود ئەلعالەم،

مـەسـالـیـک ئەلمەمـالـیـک، مـوعـجـیـم ئەلبلدان، نوزهەت القلوب)یش ئەم نـاوەیان تۆمـار نەکردووە، ئەم ڕێگەیە لەسەر ئەوەی ئەم ناوە پەیدا نەبووە (ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی) کە سـاڵی ١٠٠٥ کۆچی شـەرەفنـامـەی لە مێـژووی کوردا داناوە یەکەم سەرچاوەیە باسی (ئەردەڵان) دەکـات، لە لاپەڕە ١٠٧دا دەڵێ: «دەگـێـڕنەوە، کـە یەکـێـک لە بنەمـاڵەی (مەروانی)ی سەرداری وڵاتی (دیاربەکر)، پاش ڕوخانی ئەم دەسەڵاتە خۆی شاردۆتەوە و، پەنای هێناوەتە ناو عـێلەکـانی (گـۆران)، ئەم کـابرایە ناوی (بابا ئەردەڵان) بووە. ئەم کابرایە لە پادمانی دەسەڵاتی (جەنگیزخان)دا وڵاتی شارەزووری داگیرکردووە و، خۆی ناوناوە (قوباد کوڕی فەیروزی ساسانی).

موزیک

بەڵام (مامۆستا ئایەتوڵڵا مەردوخ) زۆرتر باسەکەی بردووە بەرەو ژوور و لە لاپەڕە ٩٠ بەرگی دووەمی کتێبەکەیا کە ناوی (تەئریخی مەردوخ) ئەڵێ: (قوباد ئەردەڵ) ناوێ کە لە ژیری و ئازاییدا بێ هاوتا بووە، خۆی خستۆتە ناو سپای (یەشموت)ی کوڕی (هۆلاکۆ) وە، (یەشـمـوت) زۆری خـۆش ویسـتـووە و، هەمـیـشـە (بابا)ی پێ وتووە، کـاتێ کـە (یەشـموت) لە کرمانشـاوە بەرەو بەغدا شـالاوی بردووە، سەرداریێتی وڵاتی شـارەزووری داوە بەم (قوباد ئەردەڵ)ە، بەداخەوە ئێمە نازانین سەرچاوەی (مامۆستا مەردوخ) بۆ ئەم باسە چییە؟ موشەوفی قەزوینی لە لاپەڕە ٥٨٩ تەئریخی (گوزیدە)دا ئەڵێ: «هۆلاکۆ کە گـەیشـتـە کـوردسـتـان کـوشـتـارێکی زۆری کـرد و قـڕانی خـسـتـە ناو کـورد و سـەرداران و پیاوماقـووڵانی نەتەوەکە بەڵام (یەشـموت)ی کوڕی بەپێی کـتـێبی (جامیع التـەواریخی ڕەشـیـدی) لە سـەردەمی هۆلاکـۆدا بەلەشکرەوە بەرەو هەرێمی (دیاربەکـر) و (مـاردین) شالاوی بردووە، نەوەک کرمانشا و بەغدا.

موزیک

من لام وایە (بابا ئەردەڵان) خـۆی لە کـوردە گـۆرانەکـان بووە، لە وڵاتی دیاربەکـرەوە نەهاتووە، وشەی (باوە) خۆی نازناوێکە تەنانەتی گۆرانەکانە بەتایبەت (کاکەیی)یەکان بۆ شێخ و پیری ئاینی بەکاریان بردووە، وەکو بابا تاهیری هەمەدانی، بابا عەلی، باوە محەمەد لە خانەقین، باوە یادگار لە هەورامان، باوە شاسوار لە کفری، باوە گوڕگوڕ و باوە قەتاڵ لە کەرکووک... تاد... ئەم (باوە)یە کە نازناوی ئەم پیاوە گەورانە بوو، نازناوێکی خۆولاتی بووە و، هەموویان لە کاکەیی و گۆرانەکان بوون، جا دوور نییە کە بابا ئەردەڵانی

پیری کاکەیی و گۆران بۆ ڕزگارکردنی هەرێمەکەی و، بۆ ئازادکردنی خۆیشەکانی لە چنگ تاتار و مەغۆل و دوژمنی وڵات داگیرکا، لە سەرەتادا لەنێو ڕیزە چیاکانی کارداخ و هەوراماندا شۆڕشی هەڵگیرساندبێ و هەرێمی شارەزووری داگیرکردبێ، کە لە بنەڕەتا شارێ بووە لە نێوانی سلێمانی و هەڵەبجەی ئێستادا نزیک بەو زریەیەی کە بناوانەی بەندیخان پێکی هێناوە و ئێستە شوێنەواری ئەو شارە دێرینەییەی پۆشیوە. (شەرەفنامە) لە باسی پەیکە بەگی نەوەی بابا ئەردەڵاندا ئەڵێ: باوکی، وڵاتەکەی بەش کرد لە نێوانی کوڕەکانیان بەشی پەیکە بەگ (زەلم - نەوسود - شمیران - هاوار - شێخان - داودان - گوڵ عەنبەر «واتا خورماڵ») بوو، ئەم هەرێمانە هەموو چیایی و سەختن، بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێ کە لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچیدا ئەم سەردارێتیی ئەردەڵانە بووە بەدوو بەشەوە: بەشی (ئەردەڵان) و بەشی (بابان)، بەشی ئەردەڵان پەرەی سەندووە تا هەمەدان و دینەوەر و بەشی بابانیش تەنیوەتەوە تا (کفری - کەرکووک - کۆیە).

موزیک

لێرەشدا دیاردی بۆ ئەوە دەکەین کە ناوی (بابان)ی سلێمانیش لە بابا سلێمان کوڕی فەقێ ئەحمەدی داریشمانەوە نەهاتووە، ئەم بنەماڵەیە لە سەدەی یازدەیەمی کۆچیدا ئەم سەردارێتییەی بابانیان زیندوو کردۆتەوە، بەڵام دەورەکانی بابانی یەکەم و، دووەمدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆیەمی کۆچی. دەبێ لێرەدا بیدرکێنم، کە ساڵی ١٩٥٣ زایینی پاش ئەوەی (شەرەفنامە)کەی ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسیم وەرگێڕایە عەرەبی و چاپ کرا، ڕۆژێک لەگەڵ مامۆستا تەوفیق وەهبی بەگدا دەربارەی ناوی (بابان) ئەدووام، کە ئەم ناوە لە بنەڕەتا (باوە)یە و نازناوی پیری کاکەییەکانە و، زۆر جار بنەماڵەی ئاینیی کورد توانیویانە ڕابەری ڕامیاریی کورد بکەن، پاش ئەو دەم و دووە، چەند ساڵێ مامۆستا تەوفیق وەهبی بەگ لەم بارەوە ڕیزە وتارێکی نووسی و پاڵپشتی ئەم باوەڕەی کرد.

موزیک

مینۆرسکی، خۆرهەڵاتناسی مەزن، لە کتێبی (ئەلئەکراد)یدا کە دۆستم دوکتۆر مارف خەزنەدار کردوویە بەعەرەبی ئەڵێت: لە دەورانی دوایی دەوڵەتی ئێراندا بەسەرداری ئەردەڵان دەوترا (والی)، ئەم سەردارە دەبوایە لەگەڵ والییەکانی جۆرجیا و (لوڕستان) و بەشەکانی تری ئێراندا، لە تاج دانانە سەر شای تازەدا هاوبەشی بکات و، دەبێ بزانین کە سەرداری ئەردەڵان هەمیشە زۆر ناحەزی دەوڵەتی عوسمانی بووە، چونکە یەگانە

سەرداریتیی کوردی سوننی بووە کە پاش شەڕی (چالّدیران)ی مێژوویی، هەر لەپالّ ئێرانا ماوەتەوە و، خۆی نەداوەتە پالّ عوسمانی. سالّی ۱۰۳۰ کۆچی کە شا عەبباس ویستی لەگەلّ دەولّەتی عوسماندا پەیمانی تەقە وەستاندن ببەستێ و ئاشتی لە نێوانیانا بەرپا بکەن، مەرجی دەولّەتی عوسمانی ئەوەبوو کە دەولّەتی ئێران نابێ یارمەتیی سەرداریتیی ئەردەلاّن بدات، کە لەو حەلەدا سەردارەکەی (هەلّۆخان) بوو. بابێینە سەر شێوەی زمانی (ئەردەلاّن): بەپێی وتەی (بەهەشتی محەمەد ئەمین زەکی بەگ) لە سەرەتادا زمانیان گۆرانییەکی ڕووتی نزیک، هەورامیی ئێستە بووە، بەلاّم چونکە ولاّتەکە هێمنی و هات بووە، زۆر لە عێلاتی کرمانجی ژووروو و، کرمانجی خواروو ڕوویان تێ کردووە و، بوونە هۆی ئەوەی شێوەی گۆرانی بکشێتەوە شێوەیەکی کرمانجیی تێکەلّ و پێکەلّ جێی بگرێ کە ئەمڕۆکە پێی ئەلّێن شێوەی (سنەیی)، ئەمە وەها و (ئەردەلاّن) سەرداری وەکو (خان ئەحمەد خان) و، مەلا و زانای زۆر گەورەی پێ گەیاندووە، لە باسی شارەکانی (ئەردەلاّن)دا، هەر شارە هی خۆی ناوئەبەین. ئێستە کاتمان تەواو بوو تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

۱۳۵۰/۱۱/۷

۷/چلە/۲٦۷۲

وتاری: ٣

# ئەردەبیل

گوێگرانی بەڕێز، شەوتان خۆش! کامەرانی و بەختیاریتان ئاواتی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە، ئەمشەو دەربارەی (ئەردەبیل) ئەدوێین، کە یەکێکە لە شارەکانی ئازەربایجانی خۆرهەڵاتی ئێران. کتێبی (حدود العالم) کە کۆنترین کتێبی جوغرافیایە بەزمانی فارسی نووسرابێ لە لاپەڕ ٩٣ باسی (ئەردەبیل) دەکات ئەڵێ: (ئەردەوێل) شاری ناوچەی ئازەربایجانە، شارێکی گەورەیە، دەوری شوورەیە، شارێکی سەختە، پیت و فەڕی زۆر بووە، بەڵام ئێستە کەم پیت و بۆ شتە، جێی پادشایانی ئازەربایجانە... تاد.

موزیک

ئەمە وەها

وشەی (ئەردەوێل) دەبێ لە سەرەتادا (هەردەبێل) بووبێ، واتا چیاکان و زورگ و هەڵەتەکان، پاشان گەڕابێ، (ئەردەبیل) و، هیچ پەیوەندیێ لە نێوی (ئەردەوێل) و ناوی (ئەرد)ی ئەشکانیدا نییە. خەڵقی ئەم وڵاتە لە سەرەتادا هەموو لە عێلاتە کوردەکان بوون، زمانی ئەم ناوە بە(ئازەربایجانی) بەناوبانگە، لە سەرەتادا کوردی تێکەڵ و پێکەڵ بووە لە کرمانجیی ژووروو و، گۆرانی و، لوڕی، وەکو لەم چوار خشتەکییەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە پاڵشت دراوە بەشێخ سەفیەدین ئەردەبیلی لە کتێبی (صەفوەت الصەفا)دا ئەڵێ شێخ وتوویە:

دیرکێن سەر بەسەودای ئەگێچی
دیرکێن چەش چو خوینێ ئەسرەیجێ
دیرکێن سەر بەئاستانە چ تەدارم
خود نەواچی کووڕ بەختی چو گیجی

واتە: دەمێکە و لە دێر گاڤێکە سەر لە سەودای تۆدا گێژە... دێر وەختێکە چاو فرمێسکی خوێنین ئەڕێژێ...

دەمێکە سەرم بەئاستانەی تۆوەیە... تۆ ناڵێی ئەم بەخت کەچ و کووڕە چ گێژە؟!

ئەگەر باش سەرنج بدەینە وشەکانی ئەم چوارینەیە، ئەبینین وشەی (تە) کرمانجییە و،

مەبەست (تۆ)یە، وشەی (نەواچی) گۆرانییە، واتا (نالێی) هەروا وشەی (ئەسر) و (دێرە)ش... کە ئەکەن (فرمێسک) و (دەیێکە)... ئەمە وەها و نووسەری بەناوبانگ (ئەحمەدی کیسرەوی) زۆر چوارینی تری لە کتێبی (صەفوەت الصەفا)ەوە هەڵێنجاوە، بەڵام چونکە ڕوونووسکارانی کتێبی (صەفوەت) کوردییان نەزانیوە، هەموویان بەهەڵە تۆمار کردووە.

## موزیک

با بێینە سەر باسی ئەو عیل و تیرەیانەی لەوێ بوون، ڕەشید یاسمی لە لاپەڕە ۱۷۷ی کتێبی (کورد و پەیوەستەگی نژادایدا) وا لە زمانی (فتوح البولدانی، لازوری)یەوە نەگێڕێتەوە ئەڵێت: کاتێ کە حوزەیفەی یەمانی سەرداری عەرەب، هەڵمەتی ئازەربایجانی دا و، مەرزبانی ئەردەبیل نەیتوانی خۆی ڕابگرێ و شکا، هەشت هەزار درەم باجی داێ، بەو مەرجەی ئاتەشکەنکان وەکو خۆی بهێڵێتەوە، وێرانیان نەکات و، کوشتار و تالانی کوردەکان نەکات کە ئەو حەلە بریتی بوون لە (بەلاسجان، سەبەلان، ساترودان). ئەمە وەها بەداخەوە ناوەکانی کۆن بەهەڵە تۆمار کراون. هەروا کتێبی (تەجاریب الئومەم، دانراوی ئیبن میسکەوەیھ) لە لاپەڕەکانی باسی سالانی ۳۲۶ی کۆچی بەدواوە ئەڵێت: کابرایەکی (لەشکریی گیلی) ناو کەیەکێ بۆ لە سەرکردەکانی سپای (دەشمگیری دەیلەمی) و لەلایەن ئەوەوە کرابوو بەفەرمانداری هەمەدان، پەلاماری ولاتی ئازەربایجانی دا کە ئەو حەلە ژێردەستی دیسەم کوڕی ئیبراهیمی کورد بوو. دیسەم سپایەکی لە کوردەکان کۆکردەوە، بۆ بەرەنگاری لەگەڵ کردنی، بەڵام لەو شەڕەدا شکا و، هەموو ئازەربایجانی لە دەست چوو جگە لە ئەردەبیلی پایتەختی کە خەڵقەکەی زۆر مەردانە بەرگرییان لێ کرد. ئەمە وەها و مەبەستی (ئیبن میسکەوەیھ) لە دیسەمی کورد، دیسەمی شازلوییە، کە بەبنەماڵە فەرمانڕەوای ئازەربایجان بوون.

## موزیک

ئیبن حەوقەلیش لە کتێبی (صورة الارض)دا باسێکی ترمان بۆ ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: گەورەترین شاری ئازەربایجان ئەردەوێڵە، ئەمڕۆکە ڕەونەقی جارانی نەماوە، ساڵی ۳۳۱ کۆچی مرۆڤی ئەردەوێل ڕێیان نەدایە دیسەم کوڕی شازلویە بگەڕێتەوە ناو شارەکەی لەبەرئەوە مەرزبان کوڕی محەمەد کوڕی موسافیری سالاری کە سەرۆکی دەوڵەتی سالاریی کورد بوو – فەرمانی دا بەوێرانکردنی شوورەی شارەکە و، لەلایەن بازرگان و پیاوماقوولانەوە شوورەکە وێران کرا. ئنجا مەرزبان باج و پیتاکێکی زۆری خستەسەر

خەڵقی شارەکە، ئەوان چۆن پێیان هەڵنەسا، شارەکەیان چۆڵ کرد و هەڵاتن بەرەو چیا... با ئەمەش بڵێین کە سەردارەکانی: ساجی، سالاری، ڕەوادی، شەدادی، کە لە ئازەربایجان و ئەران و گورجستان دامەزرابوون، هەموویان کورد بوون و، لەوانە بوون کە دژی عەرەبستان و، دەوڵەتەکانی ئەمەوی و عەبباسی ناوی (خارجی) یا (یاغی)یان بەسەرا بڕیبوون و ڕەشید یاسمی ئەڵێ: بنەماڵەی (شەدادە) لە ئەردەبیل و لە گەنجەدا کە ئەمڕۆکە بە(ئەلیەزابیث پۆڵ) بەناوبانگە - تا ساڵی کۆچی ٥٩٥ هەر فەرمانڕەواییان بەدەستەوە بوو.

موزیک

پاش ئەم سەردەمە ساڵی ٦١٧ کۆچی یاقوتی حەمەوی ئەم شارەی دیوە، لە (موعجیم البولدان)دا ئەڵێ: ئەردەبیل شارێکی گەورەیە ساڵی ٦١٧ کۆچی پێیدا تێپەڕیوم، جێی شارەکە دەشتێکی پانوبۆڕە، جۆگە و ڕووباری زۆرە، زۆر سەیرە کە خاکی ئەوێ گیا و دەغڵ و درەخت ناهێنێ و لێی سەوز نابێ... پاش ئەوەی کە دیم بەچەند ساڵێ تاتار وێرانیان کرد و کوشتارێکی زۆریان لە خەڵقەکەی کرد، ئەمە وەها و هۆی ئەوەی کە هەردەوێل گیا و درەخت ناڕووێنی ئەوەیە کە زەوییەکەی (گەچۆڕە) و شۆرە و کانی تری تیایە، وەکو سەعدی ئەڵێت:

زەمینی شۆرە سونبوڵ بەر نەیارە
دەرۆ توخمی عەمەل ضایع مەگەردان

موستەوفی قەزوینیش لە لاپەڕە ٩٣ی کتێبی (نوزهەت القلوب)دا ئەڵێ: ئەردەوێل کموتۆتە پاومانی چیای سەبەلان، هەوای زۆر ساردە، بەجۆرێ هەرکە کەشی پایز داهات، ئ توانن خەلە و خەرمانیان کۆ بکەنەوە، ئەیهێڵنەوە بۆ ساڵی دوایی کە لە گەرمەی هاوینا کۆی بکەنەوە، ئاو و هەوای سازگارە، خەڵقی ئەو ناوە لەسەر ڕێچی شافیعیی ئاینی ئیسلامن و، لە دەروێشەکانی شێخ صەفین.

موزیک

مامۆستا موحیطی طەباطەبائی لە گۆڤاری (تەهرانی موصەوەر)دا لە وتارێکا نووسیبووی: خانەدانی سەفەوی کوردن، هەروا ڕەحیم زادەی سەفەوییش لە کتێبی (زیندەگانی شاە ئیسماعیل)دا ئەمەی دووپات کردۆتەوە، نووسیویە:

فەیروز شا، ناوێک لە کوردانی سەنجار هاتە ئازەربایجان و لە دێی کەڵ خورانی نزیکی

ئەرەبیل بەكشتوكاڵەوە خەریک بوو، (ئیسحاق كوڕی ئەمینەدین جوبرائیل) ناو لە نەوەكانی ئەو هەڵكەوت و بەناوبانگی (شێخ صەفی الدین) ناوبانگی دەركرد، تەریقەتی لە شێخ زاهید تاجەدین ئیبراهیم كوڕی ڕەوشەن كوڕی ئەمیر كوڕی بابل، كوڕی شێخ پەنداری كوردی سەنجانی وەرگرت، ئەمە وەها و من لام وایە (شێخ صەفی)ش خەڵقی سەنجار نەبووە كە یەكێكە لە قەڵا و چیا سەختەكانی (یەزیدی)ی كورد، بەڵكو ئەویش هەر خەڵقی دێی (سەنجان)ە و، ئەوەی لە (صەفوەت الصەفا)دا نووسراوە (سەنجار) هەڵەیە. با ئەمەش بزانین كە بنەماڵەی (حەیدەری)ی كورد كە كتێبی (عینوان المەجد)ی ئیبراهیم فەسیح ناوی بردوون، لەگەڵ بنەماڵەی (شیخ صەفی) لە یەک ڕەگەزن، لەمانە (عەبدوڵلا كوڕی حەیدەر، ئەحمەد كوڕی حەیدەر، سەبغەتوڵلا حەیدەری) مەلای گەورە بوون. غولام حوسێن لە (دائیرەت المەعاریف)ەكەیا ئەڵێ: لە سەردەمی شێخ سەفی بەدواوە ئەردەبیل كەوتەوە بووژانەوە، ئاوەدان بووەوە، بنەماڵەی سەفەوی كردیانە پایتەخت. شا عەبباسی مزگەوتێک و كتێبخانەیەكی چاكی تیا دامەزراند و، بارەگایەكی گەورەی بۆ خوابكای شێخ سەفی دروست كرد. ساڵی ١١٥١ نادر شای ئەفشار كە ئەو حەلە هێشتا سەردار سپای ئێران بوو، لەوێ فەرماندەكانی لەشكری كۆكردەوە و، شیرەكەی لە كاڵان هەڵكێشا، وتی: ئەمڕۆ لە ئێوەم ئەوێ شایێ بۆ ئێران هەڵبژێرن، ئەوانیش ئەو ئەركەیان خستە ئەستۆی خۆیان و، هەڵیان بژارد بەشا. لە دەورانی قاجاریشدا عەبباس میرزا ئەردەوێلی كردە ناوچەی فەرمانداریی وڵاتی ئازەربایجان و، بەهۆی ئەندازیارێكی فەرنسەییەوە كە ناپلیۆن لەگەڵ جەنەراڵ گاردان ناردبووی دژێكی سەختی تیا دروست كرد، بەڵام ساڵی ١٨٣٨ی زایینی كە شەڕ لە نێوانی ئێران و ڕووسدا قەوما، (پەسكی ویچ)ی سەرداری ڕووس ئەردەبیلی تاڵان كرد و، كتێبخانەكەی گوێزایەوە بۆ پترۆگراد واتا (لەنینگراد)ی ئەمڕۆ.

موزیک

بابێینە سەر ئەمڕۆكەی (ئەردەبیل)، یەكێک لە شارەكانی ئازەربایجانی خۆرهەڵاتی ناوچەی فەرمانداریییەكەیە، سێ بەخشی هەیە: یەكەم ئاستارایە كە نزیک بەزریەی خەزەرە و، جەنگەڵی زۆرە و، هەوای گەرمە، دووەم گەرمی موغانە كە هەر بەناویا دیارە گەرمەسێرە. سێیەمین بەخشی (ئەمین) و دەوروبەری ئەردەوێڵە. سەرژمێری شاری ئەردەوێل حەوتا هەزار كەسێكە و، بەخشەكانی كە بریتین لە ٧٤٠ دێ، سەرژمێریان ٣٣٥,٠٠٠ كەسێكە. لەم فەرمانداریییەدا ٤٠ قوتابخانەی ساوایی، بەرایی، ناوەنجی و

مامۆستایان هەیە، کتێبخانە، پۆست و تەلگراف و تەلیفون، نەخۆشخانە، زۆرخانە، بەرق و کارەبا، ئاوی لولە، چەند مێوانخانە و چاخانە و سینەمای تیایە. بەرهەمی بەخشەکان: گەنم، جۆ، برنج، میوە، هەنگوین و شتی ترە... دەوروبەری ئەردەوێل پڕە لە کانیاوی گەراوی گۆگردی، گەڕیدە و گەشتیاران ڕووی تێ دەکەن، زبانی خەڵقی وڵاتەکە ئەمڕۆکە، جۆرە تورکییەکی تێکەڵ و پێکەڵە، کە پاشماوەی مەغۆل و تاتار و ئێلخانی و، ئاق قویونلی و قرەقویونلی و داگیرکارانی وڵاتەکەیە. ئەمە وەها و لێرەدا کاتمان تەواو بوو، تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش

١٣٥٠/١١/١٥

١٥/چلە/٢٦٧٢

ڕۆژبەیانی

**وتاری: ٤**

## ئەسەد ئاباد

گوێگرانی بەڕێز شەوتان خۆش، بەهیوایین کامەران و بەختیار بن، ئەم زنجیرە وتارەی کە بەناوی (وڵاتەکەت بناسە) ئەنووسرێ، ئەوەمان دێنێتەوە بیر کە نیشتمان خۆشەویستترین شتە لە ژیانی مرۆڤا و ئەمەش بزانن کە لەم وتارەدا باسی (ئەسەد ئاباد) دەکەین.

موزیک

(ئەسەد ئاباد) ناوە بۆ هەرێمێک و شارۆلکەیەک و چەند گوند لە بەخشی کامیارانی ئوستانی کوردستانی سنە و، لە دێهەستانەکانی سیلکیی، هاوەند و لە بەخشی چەمچەماڵی سەحنەی کرماشان و لە بەشی ئیلامی لوڕستان. شارۆلکەی ئەسەد ئابادی مێژوویی ئەکەوێتە کەناری ڕێی هەمەدان کرماشان و پاومانی ڕیزە چیای ئەڵوەند و گەردەنەی ئەسەد ئابادی بەناوبانگ کە زستانان بەفر ئەیگرێ و، ڕێگەی قیرکراوی کرماشان - هەمەدان ئەبەسترێ تا یارۆ و، ماڵەی تراکتۆر، ڕێگەکە ئەکاتەوە. جا ئەم شارۆلکەی ئەسەد ئابادە ناوچەی بەخشێکە سەر بەفەرمانداریی گشتی هەمەدان، خاوەنی (حدود العالم) لە لاپەڕە ٨٣ دا ناوی ئەم شارەی ناوە (ئاسا ئاباد) کە دەبێ لەو حەڵەدا ئاسیاوی واتا ئاشی ئاوی زۆر بووبێ... ئەشێ وشەکەش لە بنەڕەتا (ئازا ئاباد) بووبێ و، بەپێی ڕابوردنی ڕۆژگار وەرگەڕابێ بە(ئاسا ئاباد). ئەبو حەنیفەی دینەوەری لە لاپەڕە ٤١٦ی کتێبی (ئەلئەخبار الطوال)دا ناوی (ئەسەد ئاباد)ی بردووە وتوویە: (تاهیر کوڕی حوسێنی فەرماندەی سپای (مەئمون) لەم ئەسەد ئابادەدا لەشکر بەزی کردووە. بەڵام کتێبی (موجمەل التەواریخ و القەصەصی) لە لاپەڕە (٥١٩)دا ئەڵێ: لە ڕۆژگاری تاهیرییەکانا (ئەسەد الدەولە) ناوێ ئەم شارەی بناغە ناوە، کە ئەمە پێچەوانەی قسەکەی (ئەبو حەنیفە)یە و دیارە بەهەڵەدا چووە. لەمە سەیرتر ئەوەیە یاقوتی حەمەوی لە (موعجیم البولدان)دا وای داوەتە بەرباس کە ئەم شارۆلکەیە (ئەسەد کوڕی زی سەرووی حیمیەری) لە تیرەکانی عەرەبی یەمەنیی بەر لە ئیسلام دروستی کردووە، کە لەگەڵ تووبەعدا لەوێوە تێپەڕیوە... ئەمە وەها و سەیرتر ئەوەیە کە شەمسەدین سامی لە (قاموسی الئەعلام)دا و (دیهخودا)ش لە فەرهەنگەکەیا، هەردووکیان ئەم هەواڵەی (یاقوت)یان

تۆمار کردووە، بێ ئەوەی هیچیان هاورێ بەلای ئەوە دابدەنەوە کە ئەم ئەفسانەیە چۆن هەڵبەستراوە؟ بۆ چ دەبێ کابرایەکی عەرەب هاتبێ لە کوردستان بنەڕەتی شارێک دابنێ ؟ جگە لەوەش ئێمە دەزانین کە (توببەع) ناوێکی تایبەتی نەبووە بۆ هیچ پادشایێ بەڵکو نازناوێکە بۆ بنەماڵەی پادشاهێتیی (یەمەن) هەروەکو (فیرعەون) نازناوە بۆ بنەماڵەی پادشاهێتی میسر، وەیا (قەیصەر) بۆ ڕۆم و (کیسرا) بۆ ئێران... و (چار) بۆ ڕووس.

موزیک

ئەم ئەسەد ئابادە لە سەدەی چوارەما لەژێردەستی بنەماڵەی (حەسەن وەیهی)یەکانی کوردا بووە، ساڵی ٥٩٠ کۆچیش بەپێی لاپەڕە ٣١ بەرگی دووەمی (جیهان گوشای) جوەینی لەژێردەستی (عەبباسی)یەکانا بووە، ناسرەدینولڵا عەبباسی کە بیستوویە سوڵتان تەکش خوارزەم شا خەریکە بەرەو بەغدا دێ، موئەیدەدین کوڕی قەسابی وەزیری خۆی بەدیارییەوە نارد بۆ پێشوازیکردنی، ئەم وەزیرە کە گەیشتە (ئەسەد ئاباد)، دە هەزار کەسی لەگەڵ بوو، لە کورد و عەرەب و، بەدزییەوە یەکێکی ڕاسپارد کە بەسوڵتان ڕابگەیێنێ کە بێتە پیرییەوە، هەرکە (سوڵتان تەکش) ئەم هەواڵەی زانی فەرمانی دا لەشکرەکەی هەڵمەتیان دا و، هەتا شاری دینەوەر ڕاویان نا و، ئەو ناوەشیان داگیرکرد و، هەروا لە لاپەڕە ٦١یشدا ئەڵێت: (سوڵتان محەمەد خوارەزم شا بڕیاری دا بچێ بەرەو بەغدا و، لە هەمەدانەوە بەرەو خوار کەوتە ڕێ، هەرکە گەیشتە گەردەنەی ئەسەد ئاباد، بەفر و سەرما تەنگی پێ هەڵچنی، بەشێکی زۆری گرانبار و لەشکرەکەی تیا چوو و، لە تاوان گەڕایەوە و، ئەمەی بەنوقلانەی نوشوستی دایە قەڵەم...) هەروا خواجە ڕەشیدەدین فەزلولڵاش لە لاپەڕە ٣٤١ بەرگی یەکەمی (جامیع التەواریخ)دا هەواڵێکی تری بەم چەشنەی گێڕاوەتەوە کە (جەنگیز خان) کاتێ ویستی شالاو ببات بۆ سەر بەغدا، کە گەیشتە ملەی (ئەسەد ئاباد) بەفر دای کرد و، بەشێ لە ولاغە بەرزەکانی هێزەکەی و زۆربەی سپاکەی بوونە ژێر کەنەلانی بەفرەوە و، ئەم لێ قەومانەی بەکاری چاوی پیس دایە قەڵەم و، لەوێوە گەڕایەوە... بەڕاستی سەیرە کە ئەمە بیروباوەڕی پادشا بێ و، بەم جۆرە بەرامبەر بەبەفری گەردەنەی ئەسەد ئاباد بشکێن و مل دابنەوێنن... ئەبێ ئێمە ناوی ئەم گەردەنەی ئەسەد ئابادە بنێین (دیکتاتۆرشکێن).

موزیک

لەوانەی وتمان سەیرتر ئەم باسەیە کە (ئەبولحەسەنی گوڵستانە) لە لاپەڕە ١٣٢ی

میژووی ئەفشاریه وەزەندییەدا ئەڵێ: حوسێن بەگی زەنگەنە کە لە تیرەی (حاجی) بوو و، لەوەبەر یاوەری نادر شا بوو و، لەوەپاش نادر لێی تووڕە بووبوو هەردوو چاوی هەڵ کۆڵی بوو و، لە هەرێمی کرماشاندا گۆشەگیر بووبوو، هەرکە هەواڵی کوژرانی نادر شای بیست سەرەڕای کوێری، کەوتە هەوەشی شۆڕشگێڕی و، لە کوڕگەلی گەنجی تیرەکەی خۆی هێزێکی سوارە و پیادەی هەڵبژارد و ناردی جاڕی دا بەهەموو تیرەکانی عیلی زەنگەنە و خێڵی (وەند)دا کە سوارە و پیادەیان ئامادە بێ... بەم جۆرە پازدە هەزار سوار و پیادە پێکەوەنا و لە سەرەتادا دەستی گرت بەسەر کرماشاندا، ئنجا کەوتە پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی وڵات و بەو هێزەوە سەرەو ژوور بووەوە، بۆ داگیرکردنی هەرێمی عەلی شوکور کە لەو حەلەدا ناوچەکەی هەمەدان بوو و، تا ئەسەد ئاباد پێش کەوت و ئەو ناوەی هەموو تالان کرد.

مورزیک

ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسیش کە لە ژانویەی، واتا حوزەیرانی ساڵی ۱۸۹۱ زایینیدا بەو ناوەدا تێپەڕبووە ئەڵێ: (شارەکانی ئەسەد ئاباد و توی سەرکان ئەکەونە دۆڵی گاماساپ -کە ئەکەوێتە سەر ئەو شەقامە ڕێیەی لە (میزۆپۆتامیا)وە- واتا لە وڵاتانی نێوانی دیجلە و فوراتەوە - کاروان پێیا ڕوو ئەکاتە ئێران، ئەم شارانە گەرچی لە پەنای زنجیرە چیای ئەلوەندی هەمەدان و ئەسەد ئاباد دان، بەڵام ئەوەندەی (هەمەدان) سارد نین و، بەفریشیان کەمتر لێ ئەبارێ. خەڵقی ئەو ناوە زستانان درەختی مێوەکانیان ئەخەنە ژێر خۆڵەوە کە سەرما نەیبات، هەروا بەهۆی ئەو جۆگەلەیانەوە کە خۆیان هەڵیان کەندووە، زەویوزارەکانیان ئاو ئەدەن و، گاماساپ کاتێ لە بەرزەبانەکانی (ئەسەد ئاباد) و (ئەهاوەند) و (کەنگاوەر)ەوە دائەچۆڕێ، ئەبێ بەڕووبارێکی گەورە و بەرەو خوار ئەبێتەوە لەگەڵ قەرەسودا تێکەڵ ئەبێ و، پاش ئەوەی بەهەندێ شێو و کەلەملەدا تێ ئەپەڕێ، ئەگاتە کلکەی چیای بێستون و لەوێوە بەرەو خوار دەبێتەوە تێکەڵ بەئاوی سەیمەرە و کەرخە دەبێ، ژاک دومورگان ئەڵێ: من خۆم لە دێی ئاو باریک چەند زەلامێکم بەکرێ گرت بۆ ئەوەی ڕێنوماییمان بکەن و، یارمەتیمان بدەن، شەو گەیشتینە گەردەنەی ئەسەد ئاباد کە ۱۷۳۵ مەتر لە ڕووی زریەوە بەرزە بەڕاستی ڕۆژێکی سەختمان ڕابوارد، بەڵام هەر چۆن بوو توانیمان ساغ و دروست ڕزگار ببین، وەلێ کاروانەکەمان، زۆر لە وڵاغەکانی لە دەست دا.

- ئەمە وەها و شاری ئەسەد ئاباد کە ناوچەی بەخشی ئەسەد ئابادە ٥٤ کیلۆمەتر لە خوار هەمەدانەوەیە و ئەکەوێتە کەناری شەقامەڕێی تاران - کرماشان، سەرژمێری ناوچەکە ٣٧,٠٠٠ کەسە و، ژمارەی خەڵقی شارۆلکەکەیش ٧,٠٠٠ کەسە. بەرهەمی وڵاتەکەش گەنم، جۆ، میوە، شەقڵەدار، بادام، تریاک، توتن و شتی ترە. کردەی دەستیشیان قاڵی، جاجم، گۆرەوی و شتی تری چنراوە. بابێتە سەر ڕچی ئاینییان، لە کاتی (موستەوفی قەزوینی)دا هەموویان لەسەر ڕچی شافیعی ئاینی ئیسلام بوون، بەڵام ئەمڕۆکە هەموویان لەسەر ڕچی شیعەیێتین و، زمانیشیان کوردیی لوڕییە، لەم دواییە تورکیشی تێکەڵ بووە و، فارسیشی ئەزانن، ناوچەکە چوار دێهستانی هەیە: (چهار دۆڵی - فاراسینچ - جولگەی ئەفشار - کولیائی). لە شاری ئەسەد ئابادا ٢٢٠ دوکان و چەند قوتابخانەی بەرایی و ناوەنجیی کچانە و کوڕانە هەیە، گەرماو و، ئاوی لولەی لە کارێزی سوڵتانی هەڵئەئێنجرێ، پۆست و تەلگراف و تەلیفونیشی هەیە، شوێنەواری دێرینەشی گۆڕی ئیمام ئەحمەد و عەماراوی سوڵتانییە. لەم شارەدا زانا و فەرمایشەوانی ناسراو هەڵ کەوتووە، وەکو ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولواحید کوڕی زەکەریای ئەسەد ئابادی کە ساڵی ٣٤٧ی کۆچی مردووە، مێژوونووسانی ئێرانی جەمالەدین ئەفغانی بەناوبانگیشیان بەخەڵقی ئەسەد ئاباد داوەتە قەڵەم، ئەوەک (ئەسعەد ئابادی ئەفغان)، مەبەست ئەو جەمالەدین ئەفغانییەیە کە شۆڕشێکی ئاینی و بیری لە میسر و جیهانی ئیسلاما بەرپا کرد و، قوتابیی وەکو محەمەد عەبدەی کوردی پێ گەیاند. ئیتر کاتمان تەواو بوو بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٠/١١/٢٤

٢٤ چلە ٢٦٧٢

**وتاری: ٥**

## ئالیشتەر

گوێگرانی بەڕێز، شەوتان باش! بەختیاری و ژیانی خۆشتان هۆی خۆشیمانە ئەمشەو... باسی (ئالیشتەر)تان بۆ دەکەین و. لە سەرەتادا تکامان وایە هەر کەس ئەم بەرنامەیەی پێ باشە و لای پەسندە، وەیا پێی خراپە و لای ناپەسەندە، بەم ناونیشانە نامە بۆ نووسەری بەرنامەکە بنێرێ (تاران - سازمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی میللی ئێران - بەشی کوردی - بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە).

موزیک

ئەو ناوە جوغرافییانەی ئێمە بەزنجیرە لێیان ئەدوێین، هەریەکەیان بۆ ئەوە دەشێ کە نامیلکەیەکی مێژوویی دەربارە بنووسرێ، بەڵام ئێمە کاتی باسەکەمان کەمە، لەبەرئەوە هەر بەم کورتییە لێی ئەدوێین، ئەلەشتەر بەخشێکە لە بەخشەکانی خورەم ئاوای فەرمانداریی گشتی لوڕستان، دوکتۆر پوور داود باوەڕی وەهابوو کە ئەم دەشتەی جوغرافیانووسان لە کتێبەکانیانا بەم ناوانە تۆماریان کردووە: (ئالیشتەر... ئەشتەر... لاشتەر... لیشتەر... ئەلشە...) ئەم دەشتە هەر ئەو هەرێمەیە کە لە سەردەمی ماد و هەخامەنشیدا پێی ئەوترا (نەیسا) و جێی پێگەیاندن و بەخێوکردنی چاترین ڕەوەی ئەسپ و مایینی چاک و ڕەسەن بووە. ئەمە وەها نووسەری (حدود العالم) لە لاپەڕە ٨٣ی کتێبەکەیا ناوی ئەم هەرێمەوە شارۆلکەیەی ناوە (لیشتەر)، وتوویە: شارێکی خۆش و هەوا سازگارە، کشتوکاڵی فراوانە، زۆرترین بەرهەمی فندقە، یاقوتی حەمەویش لە (موعجیم البولدان)دا ناوی ناوە (ئالیشتەر) و، دەربارەی وتوویە: ئەکەوێتە نێوان هەمەدان و نەهاوەند و دە فەرسەنگ لە نەهاوەندەوە دوورە و، کۆمەڵی زاناشی تیا هەڵ کەوتووە وەک ئەبو محەمەد میهری کوڕی محەمەدی ئەشتەری... و لە سەردەمی موستەوفی قەزوینیشدا وەکو لە لاپەڕە ١٢٧ی نوزهەت القلوبدا ناوی بردووە بەشێ بووە لە کوردستان و ئەڵێ: ئالیشتەر شارێکی ناوەنجییە، جێی چەمی شەقڵە و دیرەگە، کانی و کانیاوی زۆرە، ئاتەشکەدەیەکی تیابووە ناوی (ئەرووەخش) بووە... ئەمە وەها و ڕەنگە وشەکە (ئاوری خۆش) وەیا (ئاوری گەش) بووبێ و، موستەوفی قەزوینی بەهەڵە تۆماری کردبێ.

موزیک

بابێینه سەر لایەنی مێژوویی، له سەدەی شەشەمی کۆچیدا سولتان مەسعودی سەلجووقی لەگەڵ موستەرشیدی بیللای پۆستنشینی عەبباسی کەوتە شەڕەوە و، بەدیل گیرتی... پاش ئەمە ئەم پۆستنشینه لەلایەن (باطینی)یەکانەوە کوژرا، کە کۆمەڵەیەکی نهێنی بوون... ئنجا (موقتەفی بیللا عەبباسی) هاتە سەر تەختی پۆستنشینی و، دەسەلاتی ولاتی سپارد بەسولتان مەسعود کە لەو حەلەدا لە هەمەدان بوو، لەم سەردەمەدا هەندێ لە سەرداران و، میرانی کورد لە دەوری سەرۆکی ئەلیشتەر کۆبوونەوە و، دژی سولتان مەسعود شۆڕشیان هەڵگیرساند بەڵام سولتان مەسعود شالاوێکی سەختی کردە سەریان، پاش شەڕ و کوشتارێکی قورس، توانی سەریان پێ شۆڕ بکات. ئەم سەردارانەی کە ئەم شۆڕشەیان هەڵگیرساند بوو، لەو سەردارانە بوون کە سەر بەدەوڵەتی حەسەن وەیهی کورد بوون. هۆی ئەم شۆڕشەش نەتەوەپەرستییەکی ڕووت بوو، وەکو مێژوونووسان بۆمان دەگێڕنەوە: عەرەب لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسیدا پتر بیروەباوەڕیان لەگەڵ ڕەگەزپەرستی و عەرەب بەباڵاتر زانیندا بوو، پشتیان کردبووە دەستووری ئاینی، پێچەوانەی قورئان ئەجوولانەوە کە دەفەرمووێ: [إنّا خَلَقْناكُم مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثى وَجَعَلْناكُم شُعُوباً وَقَبائِلَ لِتَعارَفُوا إنَّ أكْرَمَكُمْ عِندَ اللّه أتقاكُمْ]، وەیا فەرموودەی پێغەمبەر کە دەڵێ: [لا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلى عَجَمِيٍّ إلاّ بالتَّقوى].

تارادەیەک کە هەندێ لە زانایان (کچێکی عەرەب)ی لاتیان، بەبێ ئارەزووی خۆی و کەسوکاری بەهاوشانی پیاوێکی ماقووڵی نەتەوەیەکی تر نەدەژمارد و، ئەو لاتەیان بە بەرزتر دائەنا و، ئەیانوت مارەیی نایێ. جا ئەم جۆرە بیروباوەڕە پووچە و، ستەم و زۆرداریی دەسەلات بەدەستەکانی هەندێ لە سەردارانی عەرەب، خەڵقی لە گیان وەڕز کردبوو... تەنانەت گەلی کوردی چیا نشینی بەدەمار، کە هەرگیز سەری پەستیان بۆ کەس دانەنواندووە... بەم هۆیانەوە لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسیدا زۆر سەردارێتیی کورد دامەزرابوو، کە هەر بەناو بەپۆستنشینی بەغداوە بەسترابوون... یەکێ لەم بنەماڵانە سەرداریەتیی حەسەن وەیهیی بوو کە لە تیرەی بەرزینی وەیا بەرزیکانی بوون و، هەر لە هەمەدانەوە تا چیای حەمرینیان لەژێر دەستا بووە. جا ئەم سەردارەی کە دژی سولتان مەسعود و پۆستنشینی بەغدا وەستابوو، یەکێ بوو لە نەوەکانی حەسەن وەیهیی کورد. و بەپێی ئەو قسانەی کە عەلی محەمەد ساکی لە لاپەڕە ٢٤٣ی کتێبی لوڕستاندا لە زمانی خاوەنی (راحة الصدور) و (طەبەقاتی سەلاطینی ئیسلام)ەوە ئەیگێڕێتەوە، ئەو ئەمیرە کوردەی ڕابەری سەردارەکانی کوردی کردووە بۆ شۆڕش ناوی (برسق کوڕی بەدر کوڕی

حەسەن وەیھ) بووە و، هەر ئەم (بروسکە) کە ئەوان بە(برسق)یان ناوبردووە، لە سەردەمی توغرولّ کوڕی مەلەکشای سەلجووقی شا هەر شۆڕشی گێڕاوە و، سەربەخۆیانە ژیاوە، تا ڕادەیەک کە (سولّتان توغرولّ) ناچار بووە بەلەشکرێکی قورسەوە هەلّ بکوتێتە سەر پایتەختی ولاتەکەی برسق کە ئالیشتەر بووە و، هەر لەوێ قەوامەدین دەرگەزرینی وەزیری خۆی، لە سێدارە بدا و هەلّی واسێ، بەو تاوانەی کە ئەو بووەتە (کتکە ئەوتینە)ی ئاژاوە و شۆڕش نانەوە.

## موزیک

ژاک دومورگانی خۆرهەلاتناسی فەرەنسەییش بەم ناوەدا گەشتی کردووە و لە لاپەڕەکانی ١٧٢-٢٠٢ی کتێبی (جوغرافیای خۆرئاوای ئێران)دا ئەلّێ: دەشتی ئالشتەر ئەکەوێتە باکوری خورەم ئاواوە و، ئەو عێلانەی لەم دەشتەدا مەلّبەندیان هەیە ئەمانەن: (حەسەنەوەند، پیرەوەند، دالّەوەند، گیرامالّ، سەکەوەند) و باسی ڕووباری (کوشگان)یش دەکا و دەلّێ: سەد مەتر لە ژوور ئەو پردە کۆنەوە کە لە سەردەمی ساسانیدا دروست کرابوو و، ڕووخابوو، عەرەبەکان لە جێی ئەو پردێکی نوێیان دامەزراند بوو کە سەد مەتر درێژایی و بیست مەتر بلّندییەتی و سەراسەری شیوەکەی داگرتووە و، لە پێشا بەردەنووسێکی پێوە بوو، بەخەتی کوفی مێژووی پردەکەی لەسەر هەلّکەندراوە، بەلام بەداخەوە، ئەمڕۆکە بەردەکە سواوە، نووسینەکەی ناخوێندرێتەوە... ئەمە بوو قسەکەی ژاک دومورگان. دەبێ بلّێم کە ئەم پردە گەرچی لە سەردەمی عەبباسیدا کراوە، بەلام عەرەب نەیکردووە، کوردەکان لەبەرئەوەی لە موسلّمانەتییا زۆر سەخت بوون هەموو شتێکیان بەعەرەبی یاداشت کردووە. ئەم پردەی کە لەسەر ڕووباری کوشگانە، تا ئەمڕۆکە شوێنەواری ماوە، بەفەرمانی میر ئەبو ئەلنەجم بەدر کوڕی حەسەن وەیهی کوردی بەرزینی دروست کراوە. ڕەشید یاسمی لە لاپەڕەکانی ٨٣ - ١٩٤ - ١٩٥دا، لە کتێبی (کورد و پەوەستەگی)دا ئەم باسەی هێناوە و، وێنەی پردەکەشی کێشاوە... ئەمە وەها و ئەو شارەی کە زۆرجار بنەمالّەی حەسەن وەیهی کردوویانە بەپایتەختی خۆیان، ئەمڕۆکە وێرانەیە و، تا سەردەمی قاجاریش کەلاوەکانی هەرمابوو، پاش ئەوە ئەم شارۆلکە بچووکەی ئێستە لە نزیکی دامەزرا کە ئەمڕۆکە ناوچەی بەخشێکە لە فەرمانداری گشتیی لوڕستان و، ئاووهەوای خۆشە، خاکی بڕشتە، هاوینەهەوارێکی فێنکە، زمانی خەلّقەکەی لوڕییە، لوڕییەکی تێکەلّ بەکرمانجی، ڕچی ئاینییان شیعەتییە، کاریان کشتوکالّ و گەلەداری و ئاژەلّ بەخێوکردنە. بەرهەمیان: گەنم، جۆ، گەنمەشامی، نیسک، نۆک و، شتی ترە. ڕێ

خستەیان بۆ بازاڕی شارە گەورەکان دەغڵ و ئاژەڵ و شەقڵەدارە، لەم شارۆلکەیە و دێهستانەکانیدا قوتابخانەی کچ و کوڕ، قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری، گەرماو، دەرمانخانە و، شتی تری هەیە.

گوێگرانی خۆشەویست، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۱۳۵۰/۱۱/۹

۹/ڕەشەمێ/۲٦۷۲

**وتاری: ٦**

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش!

هیوامان کامەرانی و شادیتانە، ئەمشەو باسی (ئیزە)تان بۆ دەکەین، ئەو شارەی کە ماوەیەک جێی شانازیی هەموو کوردێکی ئاری نژاد بووە.

موزیک

گوێگرانی خۆشەویست! (ئیزە) یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی کوردستان، ئەچێتەوە بۆ دەورانی دەوڵەتی (عیلام)ی و بەپێی ئەو بەردەنووسانەی کە لە چیاکانی (ئیزە) دایە، ئەبێ ئەم شارە لە سەردەمی (هۆیان ناگاش) و (شوتروک ناحونتە)ی پادشایانی (ئیلام)دا، دەبێ هەبووبێ، بەڵام ئەوەی کە مێژوونووسان و جوغرافیازانان بۆ ئێمەیان تۆمار کردبێ ئەمانەیە کە بۆتان ڕوون دەکەینەوە: نووسەری بەڕێزی لوبنانی بوتروس بوستانی لە لاپەڕە ٧٢٢ی بەرگی چوارەمی (دائیرەت المەعاریف)ە بەنرخەکەیا ئەڵێ: ئیزە ساڵی ١٧ کۆچی لە لایەن نوعمان کوڕی موقەڕینەوە بەئاشتی داگیر کراوە. کتێبی (حدود العالم)یش لە لاپەڕە (٨١)دا ئەڵێ: ئیزە شارێکە، سەواد و تاپۆی قورسە بەڵام ئاوەدان و پڕ لە پیت و بەرهەم و دڵخواز و دڵگیرە. کەوتۆتە کەناری ڕووبارەکەوە، چاترین (دیبا)ی تیا دروست ئەکرێ. و (دیبا)ی پەردە ماڵی خوا کە کەعبەی پێ ئەپۆشرێ، لەوێ دێتە بەرهەم، مەبەستی دانەر ئەو کاڵا ڕەشەیە کە هەموو ساڵ (کەعبە)ی بەشکۆی پێ دائەپۆشرێ. ناوی (ئیزە) عەرەب کردوویانە بە(ئیذەج) و هێکەیان گۆڕیوە بە(جیم). خاوەنی (موعجیم البولدان) لە لاپەڕە ٤١٦ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیا ئەڵێ: ئیزە هەرێمێک و شارێکە لە نێوانی خوزستان و ئەسفەهان دایە و گەورەترین شاری ئەم وڵاتەیە، پادشاکەی سەربەخۆیە، شارەکەی ئەکەوێتە نێوانی کۆمەڵە چیایێ کە بەفرێکی زۆری لێ دەبارێ و لەوێوە بەفر دەبرێت بۆ ئەهواز و دەوروبەری. ئاوی ئیزە هی کانی سلێمانە، کشتوکاڵی ئەوێ بەباران ئەبێ، کاڵەک و گوندورەی چاکی هەیە، شوێنی شارەکە ناو و چاڵییە، پردەکەی لەو شتە سەیرانەیە کە لە جیهانا بەناوبانگن، بەبەردی زل لەسەر شیوێکی وشکی زۆر قووڵ هەڵبەستراوە.

موزیک

خاوەنی (ئاثار البیلاد) وتوویە: پردەکە هەزار مەتر پانە، قوولایی شیوەکەشی سەد و یەنجا مەترە، بناغە و تەسمەڵی پردەکە بەئاسن و مز واتا قورقوشم دارێژراو بوو... پاشان چەند کۆڵەکەیەکی لێ رووخابوو، لە سەردەمی پۆست نشینێتی عەبباسیدا محەمەد کوڕی ئەحمەدی قومی وەزیری حەسەنی کوڕی بوویە بەچەند ساڵ، ئەو کۆڵەکانەی دروست کردەوە، دەست و کارگەرەکانی ئەو هەموو خەڵقی دێهاتەکانی ئیزە و ئیسفەهان بوون.

هەروا ئەڵێ: ئیزە بوومەلەرزەی زۆرە، پڕە لە کان... جۆرە گیایەکیشی تیایە کە پێی ئەوترێ (قاقۆڵە) بۆ ئەخۆشیی (نقرس) باشە.

ئاتەشکەدەییکی تیابوو تا سەردەمی هارون ڕەشید هەر ئەگرا... و لە خوار شارەکەشەوە زەریاچەیەک هەیە، کێژەنگەیەکی تیایە، هەرچی تێ بکەوێ ڕزگاری نابێ. چاترین قامیشی شەکر هی ئیزەیە و، زانای زۆر لەم شارەدا هەڵ کەوتوون، بۆ نموونە ئەبو محەمەد کوڕی یەحیا کوڕی ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی فورەکی ئیزەجی خەڵقی ئەم شارەیە.

تا ئێرە قسەی خێوی (ئاثار البیلاد) بوو. ئەمە وەها و بوتروس بوستانی ئەڵێ: ناوی پردەکەی ئیزە (خرِ زاد) بوو... با لە بیریشمان نەچێ کە ئیزە خۆی لەسەر گەرمیان دەژمێرێ . . یاقوت بەهەڵە بیستوویە کە ساردەسێرە و، خاوەنی (نوزهەت القلوب) دانی پیا ناوە کە گەرمێنە.

موزیک

دانیشتوانی شاری ئیزە لوڕن، لوڕ لقێکی گەورەیە لە نەتەوەی کورد، کتێبی (صورەت ئەرضی ئیبن حەوقەل) لە لاپەڕەکانی (٢٣-٣١)دا بەڕوون و ڕەوانی دەڵێ: کوردەکان بەسەر ئەم هەرێمی ئیزەیەدا بەدەسەڵات بوون. جگە لەوەش (ئیبن بەتوتە)ی جیهانگەڕی بەنوبانگی ئەندەلوسی لە لاپەڕە ١٨٤ی گەشتنامەکەیا ئەڵێت: لە توشتەرەوە چووین بەرەو (ئیزە)، بەسێ ڕۆژی تەواو بەناو چیاکانا ڕۆیشتین و، لە هەر قۆناغێکا زاویەیەک هەبوو - مەبەستی لە زاویە جێگەیەکە مەلا و فەقێ و دەروێشی تیا بووبێ - ئنجا ئەڵێ: ئیزە (ماله میر)یشیان پێ ئەوت، ئەم شارە پایتەختی سوڵتان ئەتابەگ بوو، لەم شارەدا چوو بەمامۆستای مامۆستایان (شێخ نورەدین کرمانی) کەوت کە پیاوێکی چاک و لە خواترس بوو، بەڕێوەبەرایەتی هەموو زاوییەکان بەدەس ئەوەوە بوو کە خۆیان پێیان ئەوت (مەدرەسە) -واتا خوێندنگە- پاشان ئیبن بەتوتە لەسەر قسەکانی ئەڕوات و ئەڵێ: کاتێ من ڕۆیشتم پادشای ئیزە ئەتابەگ ئەفراسیاب کوڕی ئەتابەگ ئەحمەد بوو و، بەم وڵاتە ئەوترا (لوڕستان). ئەم ئەفراسیابە پاش ئەتابەگ یوسفی برا گەورەی دەسەڵاتی وڵاتی

گرتبووه دەست، کە ئەویش جێنشینی باوکی بووبوو، هەروەکو لە خەڵقم بیست ئەتابەگ ئەحمەد پیاوێکی باش بووە و، لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیدا چوار سەد و شەست زاویە و خوێندنگەی دامەزراندبوو، ئەو باج و پیتاکەی لە گەلەکەی کۆی ئەکردەوە ئەیکرد بەسێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خەرجی خوێندنگە و قوتابخانەکان، بەشێکی بۆ خەرجی سپا و هێزی وڵات و، بەشێکی بۆ خەرجی بارەگا و دەس و پێوەند... و لەم بەشە دیارییەکی بۆ ئەبو سەعید دەنارد. من شوێنەواری کردەوەی چاک و پیاوانەی ئەم ئەتابەگەم لە لوڕستانا زۆر بینی و، هەر ئەو ساڵەی من گەیشتبوومە ئەوێ، ئەتابەگ ئەحمەد مردبوو، ویستم بچم بۆ دیتنی ئەفراسیاب بەڵام بەمراز نەگەیشتم، تا ئێستە قسەی ئیبن بەتوتە بوو، محەمەد عەلی موەحید کە ئەم کتێبەی وەرگێڕاوە بەفارسی لە زمانی (گیپ)ی خۆرهەڵاتناسەوە ئەڵێ: دەبێ ئیبن بەتوتە ئەم یاداشتەی هی دووەمین دیداری بێ لە ئیزە، کە لە چین گەڕاوەتەوە، نەوەک هی یەکەمین دیدار، چونکە ئەو کە ساڵی ۷۲۷ چووبووە ئیزە هێشتا ئەتابەگ نوسرەتەدین ئەحمەد مابوو، بەڵام کە ساڵی ۷۳۳ گەڕایەوە بۆ ئیزە ئەو مردبوو.

موزیک

ئەم ئەتابەگ نوسرەتەدین ئەحمەدە، پیاوێکی زانا دۆست، ئەدەب پەرست بووە، دەستی بەخششی بۆیان درێژ کردووە. شەرەفەدین ئەبو فەزڵ سەید فەزلوڵلا ڕاجی حوسێنی قەزوینی کە تا ساڵی ۷۰ی کۆچی هەر لە ژیانا بووە، مێژووی (ئەلموعجەم ئاثار ملوك العجم)ی بەناوی ئەوەوە داناوە، هەروا بولبولی خۆش نەوازی زمانی فارسیش، خواجە حافیزی شیرازی کە باوکی لە بنەڕەتا خەڵقی ئیزە بووە ئەم پارچە هەڵبەستەی دەربارەی ئەم پادشا گەورەیە وتووە کە بەناوی (سەرای موغان) بەناوبانگە و لە سەرەتاکەیا ئەڵێ:

فەلەک جونەیبەکەشی شا نوصرەت الدین است

بیا ببین مەکەش دەست دەر ڕیکاب زەدە

ئەمە وەها و غولام حوسێن موساحیب لە دائیرەت المەعاریفە فارسییەکەیا ئەڵێ: ئیزە لە سەردەمی والییەکانی لوڕستانا ناوی گۆڕا بوو بە(مال الئەمیر) و، پاشان فەرهەنگستانی ئێرانی ساڵی ۱۳۱٤ فارسی ناوی کۆنی ئیزەی زیندوو کردەوە. لێرەدا دەبێ بڵێم غولام حوسێن وای زانیوە کە وشەکە تێهەڵکێشێکی عەرەبییە، واتا (دارایی و سامانی سەرۆک) کەچی وا نییە، وشەکە کوردی ڕووتە، ماڵە میر واتا (پایتەخت) چونکە کۆشکی ئەمیر لەوێ بووە، بەم ناوە نراوە.

بابێینه سەر ئەمڕۆی ئیزه، گەرچی لە کۆنا شارەکە ئاوەدان و زۆر گەورە و پانوپۆڕ بووه، لە دواییدا ڕووی کردۆتە وێرانی تا بوو بەیەکێک لە ناوچەکانی سەر بەئەهواز، پاشان لە شەهریوەری ساڵی ١٣٣٧، فارسیدا، کرا بەناوچەی فەرمانداریی گشتیی بەختیاری و چوار مەحاڵ و ئەم بەخشانەی پێوە بەسترا: ئیزه و دەوروبەری باغ مەلیک، دێ دز، ئەندیکا، سەردەشت، سنووری ئەم هەرێمە بەم جۆرەیە: لای باکووری ئەلیگودەرزه، خۆرهەڵاتی شار کورده، لای خوارووی دێ دەشتە و، خۆرئاوای مەسجید سلێمانە. لەوێوه تا ئەهواز ٢٠٧ کیلۆمەترە و تا تاران ١٠٤٧ کیلۆمەترە، دەوروبەری چیاکانی چۆ - وەرزەرد - شاوەیس - ئاو بەنان و هی تره. بەسەرژمێری هەرێمەکە ١٥٠/٤٣٠ کەسە، قوتابخانەی بەرایی، ناوەنجی، مامۆستایانی تیایە، نەخۆشخانە، پۆست و تەلگراف و تەلیفۆنی بێ تەلی هەیە، لەگەڵ بانک و سینەما، بەرهەمی وڵات دەغڵودان و دەسکەوتی نژدلییه...

گوێگرە خۆشەویستەکان، کاتی بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا وتارێکی تر بەخواتان دەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٠/١١/١٣

**وتاری: ٧**

## ئیلام

گوێگرە خۆشەویستەکان، شەوتان باش

ئەمشەو باسی (ئیلام)تان بۆ دەکەین، کە ناوچەی فەرمانداریی گشتی ئیلام و پشتکۆ و، لوڕستانە... ئەم ئیلامە لە پێش ساڵی ١٣٠٩ی فارسیدا شارەدێیەک بوو بەناوی (حوسێن ئاوا) و بەدەست والییەکانی لوڕستانەوە بوو، لەم دەمە بەدواوە کە شاهەنشایی پەهلەوی دەسەڵاتی لە دەس سەرداران و دەرەبەگەکان دارنی، فەرهەنگستانی ئێران ئەم شا گوند و هەرێمەی ناونا (ئیلام) و، بەوە ناوی (عیلام)ی کۆنی زیندوو کردەوە، جا بۆ ئەوەی هەموو لایەک یادێ لە عیلامی کۆن بکەین ئەم باسە ڕوون ئەکەینەوە.

موزیک

یونسکۆ دەربارەی ئێران کتێبێکی زلی نووسیوە، ناوی ناوە (ئێران شهر) لەم کتێبەدا دەربارەی (عیلامی) کۆن ئەڵێ: نەتەوەی عیلام کە لە دەورانی بەردینییەوە لای خوارووی ئێراندا ئەژیان و، تەمەنیان هەشت هەزار ساڵێ درێژەی کێشا، زۆر زوو خۆیان لە شەوەزەنگی نەزانی و نەخوێندەواری ڕزگار کرد و، بەرەو شەبەقی خوێندەواری کەوتە ڕێ. و لەبەرئەوەی لەگەڵ سومەرییەکان هاوسێ بوون، جۆرێ چێرێ -وەیا خەتی- کە دایانهێنا زۆر لە شێوەی چێر و خەتی سومەرییەکان ئەچوو. نموونەی ئەم نووسینە تا ئێستە بەسەر بەردەنووسەکانی (ڕێ شار)ی لای شووشهوە کێلە بەردەکانی نیزەی لوڕستانەوە هەر ماوە و، عیلامییەکان بەخۆیان دەوت (هاتیتی) و پاشان وڵاتەکەیان بەناوی ئەنشان یاخۆ (ئەنزان) ناسرا.

بەڵام تا ئێستەش بۆ مێژوونووسان ساغ نەبووەتەوە کە عیلامییەکان لە چی ڕەگەزێ بوون، تەنیا ئەوەندەیان دەربارە دەزانین کە وڵاتێکی سەربەخۆ بوون، پشتیان دابووە چیا و زریەوە و لە کەس باکیان نەبوو، سومەری و بابلییەکان زۆرجار هەڵیان کوتایە سەر عیلام بەڵام هیچیان پێ نەکردن، تا ساڵانی ١٧٩٠ی بەر لە زایینی، کە حەمورابیی پادشای مەزنی بابل شاڵاوی کردە سەریان، وڵاتەکەیانی داگیرکرد، هەروەکو لە بەشی چواردەیەمی نامیلکەی (پەیدابیشی تەورات)دا دیاردی بۆ کراوە، بەڵام پاش ماوەیەک کوێتر ناحونتی

پادشــای عــیــلام ولاتەکــەی ڕزگــار کــرد و کــاروباری تیــا ڕێکخــست. جگە لەوان ئاسورییەکانیش زۆرجار پەلاماری عیلامیان دا و پریان پێ نەبرد. بەڵام (ئاشوور پانیپاڵی دیکتـاتۆری خوێنڕێژی وێرانکاری ئاشووری کە هەڵی کوتایە سەر عیلام هێڵەی پێ کرد و خـاکی بەتورەکە بێژا، خـۆی لە بەردەنووسـەکـەیا شـانـازی بەو کـارەیەوە دەکـات و ئەڵێت: ﴿ڵاتی عیلامم لە ئاوەدانییەوە گۆڕی بەوێرانی، کەلاوەکانی وڵات بوون بەجێی جانەوەران و درندان. پاش ئەوە عیلامییەکان لەگەڵ کلدانییە بابلییەکان پەیمانیان بەست و، خۆیان دایە پاڵ مـاد و، لەو سـەردەمـەدا کە (هۆوەخشـەتەرە) شـای بەدەسـەڵاتی مـاد بـوو عـیـلام بەشێ بوو لە ماد و، پاشان لە سەردەمی (ئازی دەهاک)ی گوروشی گەورەی هەخامەنشی داگیری کرد.

موزیک

ئەمە وەها و خوالێخۆشبوو موشیر الدەولە حەسەن پیرنیا سنووری عیلامی بەم جۆرە تۆمـار کـردووە: (لای خـۆرئاوای ڕووبـاری دیجلە و لای خـۆرهەڵاتی بەشێ لە هەرێمی فـارسی ئێـسـتـە و، لای باکـوری شـەقـامێ کـە لە هەمـەدانەوە ئەچوو بەرەو بـابل و لای خوارووشی زەویەی ئەڤرەنگ کە ئێستە پێی ئەوترێ خەلیجی فارسی و، ئەم هەرێمانەیان لەژێر دەستا بوو: خۆزستان - لورستان - بەختیاری گەورەترین شاری وڵاتەکەش (شوش) بوو کە لەو حەلەدا کۆنترین شاری جیهان بوو و، گەورەترین شـاری عـیلام. هەروا شـاری (مـاراکتو)ش کە لە کەناری ڕووباری کەرخەدا بوو و، لەگەڵ شاری خایدالو کە ڕەنگە لە جێی خـوڕەم ئـاوای ئێـسـتـەدا بووبێ، شـاری ئەهوازیش کـە ئەشێ لە بنەڕەتا ناوەکـەی کوردییەکی پەتی بێ و لە وشەی (ئاوەزێ)وە هاتبێ کە دەکا (نزە) و ئاویژە یا لە وشـەی (ئاهو وازی)یەوە هاتبێ کە جێگەیەکی چۆڵ و لەوەڕگای ئاسک و ماسک بووبێت.

موزیک

ئێمە لە باسی (ئالیشتەر) و (ئیزە)شا وتمان کە لە سەردەمی ساسانیدا کەوتە دەست سـپای ئیسلام و، پاشان مایەوە بۆ ئەمەوی و عەبباسییەکان، بەڵام کوردانی بەدەمـار و چیاییشین لە دەست بیر و ئەندێشەی ڕەگەزپەرستانەی هەندێ عەرەبی شۆڤێنی بەتەنگ هاتن و لەم هەرێمانەدا سەرداریتییەکی سەربەخۆیان پێک هێنا وەک حەسەن وەیهییەکان، عەییارییەکان، دوو ئەتابەگییەکانی لوڕستانی گەورە و بچووک... پاشان والییەکانی لوڕسـتـان لەگـەڵ بنەمـاڵەی سـەفـەویدا بوون بەزاوا و خـەزوور و، بەجـۆرێکی دەرەبەگـانە

بەرێتوەیان ئەبرد. و هەروەها مایەوە تا دەورانی پەهلەوی، بێ گومان خەڵقی ئەم ناوە تا سەدەی بیستەم نەیانئەزانی کە (عیلام)ی کۆن کوێ بووە، گەرچی ئەم ناوە لە تەوراتیشدا هەبوو، بەڵام زانایانی خۆرهەڵاتناس کە کەوتبوونە لێکۆڵینەوەی باسی مێژوویی و، کۆنە شارەکانیان لە بن خاک دەرئەهێنا، ناوانی (عیلام) و (ماد) و (هەخامەنشی)یان لە گۆڕەوە زیندوو کردەوە و، فەرهەنگستانی ئێرانیش بۆ یادی عیلامی کۆن ناوی ئەم هەرێمەی نا (ئیلام). جا (ئیلام) ئەمڕۆکە ناوچەی فەرمانداریی گشتیی (ئیلام و لوڕستان و پشتکۆ)یە ئەکەوێتە خۆرئاوای وڵاتی ئێرانەوە، لای باکوری ئوستانی کرماشان و فەرمانداریی گشتیی لوڕستان و پشکۆیە، کە ناوچەکەی خوڕەم ئاوایە لای خواریش ئوستانی خۆزستان و سنووری عێراقە، لای خۆرهەڵاتیشی بەخشی ئەندیمشکی دزفولە، لای خۆرئاوایش دیسانەوە سنووری عێراقە. سەرژمێری هەرێمەکە ١٨٧/٣٦٠ کەسە و ئەم فەرمانداریە چوار بەشە:

یەکەم: (ئیلام)ە کە چوار بەخشی هەیە: (دەوروبەری ئیلام - چەوار - ئایوان - شێروان).

دووەم: (میهران)ە کە سێ بەخشی هەیە: (دەوروبەری میهران - ساڵح ئاوا - ئەرکەوازی).

سێیەم: (دێ لوڕان)ە کە چوار بەخشە: (دەوروبەری دیهلوڕان - ئاوەدانان - زەڕین ئاوا، مۆسیان).

چوارەم: (بەدرە)یە کە (ئەبهەر)یشی پێ دەڵێن، دوو بەخشی هەیە (دەوروبەری ئەبهەر - دەڕەشار).

ئەمە وەها و ئیلام هەرێمێکی سەردەسێرە لە ڕووی زریەوە ١٤١٠ مەتر بەرزە، کەوتۆتە پاڵی چیا. بەرزترین کێوی نزیکی (کەبیرکوە)، کە تەپەڵاکی (٣٠٦٣) مەتر بەرزە و ڕووبارەکانی فەرمانداریی عیلام ئەمانەیە: (سەرئاوکە - سەرئاوکەلان - سەرئاو زنجیرە - گەنجە - گلێتم - سێ کان) کە ئەمانە هەموویان ئەڕژێنە ئاوی (صەیمەرە)وە، هەروا چەمی گەنجان - کاوی - چنگوڵە - و میوات، کە ئەرژێن بەدیوی عێراقا لە شاری ئیلام و شارستانەکانی سەر بەئەوێدا چەند قوتابخانەی بەرایی، ناوەنجی هەیە، لە دێیەکانیشا ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ ئەخوێندەواری هەیە. هەروا نەخۆشخانە - داروخانە - دەرمانگاە - گەرماو - سینەما - ئاوی لولە - چاخانە - میوانخانە - پۆست و تەلگراف و تەلیفۆن هەیە.

دەسکەوتی وڵاتەکە دەغڵ و دانەوێڵە و بەرهەمی ئاژەڵییە، کاری دەستکردیان چنین و جۆلایی و تەونە. لەوێ کارگەی دارتاشی و پێڵاوسازی و جلوبەرگ دوورینیش هەیە. ئیتر کاتمان تەواو بوو تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

۱۳۵۰/۱۱/۱۶

۱۶/چلە/۲۶۷۲

# ئیوان

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆی کوردی ئێرانە. ئەمشەو باسی (ئەیوان)تان بۆ دەکەین، کە پێی ئەوترێ (ئەیوانی گەیلانی غەرب) و لەمەوبەر بەناوی (ئیّوان خانەقین) دەناسرا.

موزیک

ئەیوان: دێیەکی گەورەیە، ناوچەی بەخشێکە سەر بەفەرمانداریی شاهئاباد ئوستانی کرماشان. غولام حوسێن موساحیب لە دائیرەت المعاریفی فارسیدا ناوی چەند (ئەیوان)ێکی هێناوە، وەک (ئەیوان ئیستەخر) لە لاهیجان، (ئەیوانی خوڕەم ئاوا)ی لوڕستان و، (ئەیوان کەرخە) و (ئەیوان شاهئاباد) و ئەڵێ: ئەیوان کەرخە شوێنەواری سپاخانەیەکی دەورانی شاپوری دووەمی ساسانییە، کە دەکەوێتە لای ڕاستی ڕووباری کەرخەوە، بەلای خۆرئاوای شوشدا، بەدووراییی (٢٦) کیلۆمەتر ساڵی ١٣٢٨ی فارسی دەستەیەک لە زانایانی دێرینەناسیی فەرانسەیی لەوێدا کەوتنە لێکۆڵینەوە و هەڵکۆڵین، بەڵام ڕامیاریی ئەو حەلە ڕێی لەسەر پایەداریی ئەو، لەسەر ئەو کارە نەدا، لەبەرئەوە وازی لێ هێنا و لە ساڵانی ١٣٢٩-١٣٣١دا یەکێک لەو ساختمانانەی کە لەژێر زەوی دەرهێنرابوو و، هەندێ شوێنی کەل و کوت و ڕووخاو بوو بەگەچ و چیمەنتۆ پینە و پەڕۆکراو، دروست کرایەوە.

موزیک

بیستیارانی خۆشەویست! ئێمە ئەمانەویست باسی (ئەیوانی گێلان) واتا ئەیوانی سەر بە(شاهئاباد) بکەین، بەڵام بەهۆی ناوی (ئیّوان)ەوە لە جغز دەرچووین، ئێستە ئەو زانیارییانەی کە فەرهەنگی جوغرافیایی ڕەزم ئارا و، دائیرەت المعاریفی فارسی باسیان کردووە، تێکەڵاویان ئەکەم بەیەکا بۆ ئەوەی باسەکەی لێ بهێنمە بەرهەم، ئەم ئەیوانە ئەکەوێتە لای خواری شاهئاباد بەلای خۆرهەڵاتی بەخشی گیلانی غەربا، لای باکوری دێهستانی چلەیە، لای خواریشی بەشی چواری سەر بەفەرمانداریی ئیلامە، لای

خۆرهەڵاتیشی بەخشی شێروان چەرداوڵە، لای خۆرئاوایشی بەخشی سوماری سەر بەقەسری شیرینە، شەقامەڕێی شاهئاباد - ئیلام بەناوەندیا ڕائەبوورێ، دەوروبەری ئەیوان بەریزە چیایەکی سێگۆشەیی تەنراوە، بەرزترین چیای ئەو ناوە لووتکەی مانشستەکە ٢٦٥٣ مەتر لە ڕووی زریەوە بەرزە. گەورترین ڕووباریشی گەنگیرە کە دائەچۆڕێ و ئەکشێ بەرەو سۆمار لەوێوە بەرەو خوار لێژ ئەبێتەوە بەرەو مەندەلی و قازانییە. بابێینە سەر ناوی (ئەیوان)، ئایا هەر (هەیوان)ی کوردی واتا دالآنە؟ یاخۆ بناغەیەکی تری هەیە؟ کاتێ سەرنج بدەینە ناوی (ئەیوان)ی کیسرا بۆمان دەرئەکەوێ ئەو جێیانەی ناوی (ئەیوان)یان پێوەیە، جێگەگەلێکی بەشکۆی هاوینەهەواری شاهانە بوون، وا دیارە (ئەیوان خانەقین)یش پەیوەندی بەناوی عێلی (ئێوانی)ی کۆنەوە هەبێ کە بەشێ بوون لە عێلی (کەڵهوڕ) و، هەندێ لە مێژوونووسان سەریان لە خۆیان شێواندووە (ئەیوانی) و (ئەیوائی) تورکمانیان بەیەک داوەتە قەڵەم. بۆ وێنە دوکتۆر مستەفا جەواد لە پەراوێزی لاپەڕە (٢١٣)ی بەرگی یەکەمی کتێبی (بەغداد)دا کە ڕیچارد کۆک بەزمانی ئینگلیزی نووسیویە و ئەوان کردوویانە بەعەرەبی، نووسیویە: عێلی ئیواقیی تورکمان لە سەردەمی (هۆلاکۆ)دا لە نێوانی ئێران و عێراقا بوون، لەگەڵ ئەوەشا کە شەمسەدین سامی لە (قاموس الأعلام)دا زۆر بەڕاست و ڕەوانی ئەم باسەی روون کردۆتەوە و، ئەو باوەڕەی بەهەڵە داوەتە قەڵەم؛ و نووسیویە: ئێوانی، یاخود ئیوانی، عێلێکی تورک بوون لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا لە کاتێکا کە جەلالەدین خوارەزم شا کەوتبووە ولاتگیری و، ڕەوی کردە سەر هەرێمەکانی گورجستان و ئەخلاط، ئەم عیلی (ئەیوانی)یە هەلی دەس کەوتبوو لە چیاکانی ئازەربایجانا خۆی قایم کردبوو و کەوتبووە تالآن و بڕۆ. بەڵام سپای جەلالەدین خوارەزم شا هەڵی کوتایە سەریان، تەرتەوەرتەی کردن، تا ئێرە قسەی خاوەنی (قاموس الاعلام) بوو، ئەوەی ڕاستی بێ لە سەردەمی دەسەڵاتی سەلجووقییەکانا کە هەموو دەسەڵاتێکیان لە دەست پۆستنشینی عەبباسی دارنی بوو، گەلی عێلاتی تورکیان لە بەغدادا جێگیر کردبوو... هەروا لە نێوانی بەغدا و هەرێمەکانی کوردیشدا، تەوەک کوردەکان، تەنانەت ئەتابەگەکانی لوڕستان پەلاماری بەغدا بدەن. وەکو ئەبینین نزیک بەلوڕستان، بنکەیەکیان دامەزراندبوو بەناوی (بەیات) و هێزی تورکی (بەیاتی)یان تێ خستبوو، بەڵام هەروەکو دانەرانی (تەئریخ گوزیدە و مونتەخەب التەواریخ و شەرەفنامە) بۆمان ئەگێرنەوە (بەدر کوری شوجاعەدین خورشیدی) میری لوڕستانی بچووک هێزی بردە سەریان و، تەفروتونای کردن و بنکەی (بەیات)ی خستە سەر قەڵەمڕەوی لوڕستانی

بچووک. جا بەمانەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە کوردەکان مەیدانیان نەداوە عێلە تورکەکان لە خاکەکەیان جێگیر بن.

## موزیک

بابێینە سەر ئەوەی کە ئەم هەڵەیەی مێژوونووسان لە کوێ هاتووە؟ و چۆن (ئیوان)ی کورد بووە بەئیوائی و یا (ئیواقی)ی تورکمان؟

ئەمە لەوێوە هاتووە کە سلێمان شا کوڕی پەرچەمی ئێوانی خاوەنی بەهاری لای هەمەدان و سەرداری کوردستان، یەکێ بووە لە پیاوە گەورەکانی کوردستان و خەزووری (عیزەدین گرشاسف کوڕی نورەدین محەمەد) پیری لوڕستانی بچووک بوو... خەلیفە ئەم سەردارەی دانا بەفەرماندەی هێزە تورکەکانی ناو بەغدا، کە بەرگرییان بکات، لە گولمەز و گۆبەندنانەوە... بەڵام خەلیفە ناسرەدینوڵلا کە ساڵی ٥٧٥ی کۆچی لە جێی باوکی دانیشت و تا ساڵی ٦٢٢ بەسەر تەختی پۆست نشینییەوە بوو، وەکو لە جامیع التەواریخدا هاتووە، ئەم سلێمان کوڕی پەرچەمەی لە سەرداری لاداوە و، برا گەورەکەی کردووە بەسەرداری تورکمانەکان. بەگومانی من لە ڕقی ئەوە بووە کە ساڵی ٦٢١ی کۆچی خوشکەکەی خۆی دابوو بە(سوڵتان جەلالەدین خوارەزم شا). بەڵام پاش ئەوە دیسانەوە کراوەتەوە سەرداری هێز چونکە ساڵی ٦٣٩ کۆچی کە حیسامەدین خەلیل کوڕی بەدر کوڕی خورشیدی بلوچی کە یەکێ بووە لە گەورەکانی کورد و، لە بنەماڵەی میرانی لوڕستانی بچووک، سەری لە فەرمانی خەلیفەی عەبباسی موستەنسیری بیللاە پێچاوە و، شۆڕشی بەرپا کردووە و، چووە خۆی داوەتە پاڵ مەغۆل و بەپشتیوانی ئەوان شالاوی کردۆتە سەر قەڵای دەهار و گەمارۆی داوە، کە (سلێمان شا ئەیوانی)ئەمەی بیست، خەلیفە بەسپایەکی ٦٩,٠٠٠ کەسییەوە چوو بۆ گیانی، لە سەهەر بەیەکا تەقان، و حیسامەدین شکا... بەڵام دووبارە کەوتنە شەڕەوە حیسامەدین سەرکەوت و خەریک بوو لوڕستان لە عیزەدین گرشاسف کوڕی محەمەدی سەرداری لوڕستان داگیر بکات کە خوشکەزای سلێمان شا ئیوانی بوو، بەڵام سلێمان شا بەو هێزە زۆرەوە لە دوو لاوە گەمارۆی دا و، دەوری گرت و لە زۆر جێگەی تریشەوە هێزی لەسەر ڕێی دانا.... گەڵاڵەی قسە حیسامەدین خەلیل کەوتە داو و، گیرا و کوژرا و، ئەم قەوماوەیە بەپێی (ئەلحەوادیث الجامعیە) لە ساڵی ٦٤٣دا ڕووی دا... بەڵام شەرەفنامە و تەئریخی گوزیدە، مونتەخەب التەواریخ، جیهان گوشای جوەنی، جیهان ئارای قازی غەفاری هەموویان بەساڵی ٩٤٠یان داوەتە قەڵەم.

ئەمە وەها و پاش کوژرانی تەرمەکەیان بردەوە بۆ (سلێمان شا)، بەدیار تەرمەکەوە ئەم دوو هەڵبەستە فارسییەی وت:

پچارە خەلیل بەدر سەرسام بوو * ئارەزوی گرتی بەهاری کام بوو

**وتاری: ٩**

## بابان

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش، کامەرانیتان هیوای بەشی کوردی ڕادیۆی ئێرانە، هیوامان وایە ڕیزە وتاری (ولاتەکەت بناسە) سوودێکی باشی بووبێ بۆ پێ ناساندنی ئەو جێیانە، بەو کەسانەی کە شارەزای نین، ئەبێ ئەوەشتان بۆ دەربخەین کە ئەمشەو باسی بابان دەکەین، بەو هۆیەوە کە لە هەرێمی (کرماشان) و (هەمەدان)دا چەند دێ هەن بەناوی (بابان)...

موزیک

وشەی (بابان) وشەیەکی کوردییە، لە بنەڕەتا لە وشەی (باوەوە) هاتووە کە هەم بەباوکی باوک وتراوە، هەم بەباوکی دایک و، هەم بۆ پیری ڕچێکی ئاینی و دەروێشی و، لەم ڕووەوە هاوتایە لەگەڵ وشەی (پیر) و بەلای زۆرەوە ئەم نازناوە لە هەرێمی (گۆران) نشینا باوبووە و بۆ جێیانی تری کوردستانیش پەرەی سەندووە. هەروەک لە وتاری (ئەردەڵان)دا باسمان کرد لە پارچەی سەرەتایی ناوەکە (بابا)... با جارێکی تریش دیاردی بۆ ئەوە بکەین کە لە کوردستانی ئەم دیو و ئەودیودا سەدەها خوابگای پیرۆزی ئاینیی ناسراو هەیە کە سەرەتای ناوەکەیان بەنازناوی (بابا) دەس پێ ئەکا، وەکو (بابا تاهیر) لە هەمەدان و، لە مەندەلی و (باباگوڕگوڕ) لە کەرکووک و زۆر جێی تری و (باوە محەمەد) لە خانەقین، باوە شاسوار لە کفری، بابازەید لە مەلاوی لوڕستان، بابا بزورگ لە دلفانی لوڕستان... بابا چجک، باوە ئەلیاس، باوە قەتاڵ، باوە یادگار... تاد...

بابێینە سەر ئەوەی کە چۆن وشەی (بابا) یا (باوە) وەرگەڕاوە بە(بابان) و لە کەیەوە؟... یەکەم نووسەرێ کە باسی ئەم بنەماڵەی کردبێ (ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی) سەرنامەدی مێژوونووسانی کوردستانە لە کتێبەکەیا کە ناوی (شەرەفنامە)یە و ساڵی ١٠٠٥ کۆچی دوایی هێناوە - واتا بەر لە سێ سەد و هەشتا و شەش ساڵ- لە لاپەڕە (٣١٢) وەرگێڕاوی عەرەبییەکەی چاپی بەغدایا ئەڵێت: سەردارانی بابان لەناو فەرمانڕەوایانی کوردستانا بەوە بەناوبانگ بوون کە ژمارەی خێڵ و عیل و هێز و دارودەستەیان زۆربوو. بەڵام دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە بە(پیر بوداق بەبەئی) -کە ناوی

بابانی لێوه هاتووه- و بەئەمیر بوداقی ڕوستەمی برای، کە هەردوو لایان وجاغ کوێر بوون دوایی هات. ئەم ئەمیـر بوداقـە لەلایەن میـر سـەیدیی سـەرداری سـۆرانەوه کـوژرا و، هەستـیـاران و بەیت وێژانی کـوردسـتـان دەربارەی ئەم کـارەسـاتە جەرگـبـڕە زۆر بەیتـیـان هۆنییەوه و، زۆر سەر شیـوەنی بەسۆزیان هەڵبەست، کە لە دیوەخانان و، لە کۆڕی مرۆڤا نەخوێندرایەوه. جا لەم قسانەی ئەمیر شەرەفخان بۆمان دەرئەکەوێ کە وشەی (بابان) لە وشەی (بابائی) هاتووه کە ئەچێتـەوه بۆ تەریقەتی (بابائی)، کـە پتـر لەناو گـۆرانەکـانا هەبووه و، بەداخەوه خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ لە مێژووی سلێمانیدا، کە وەرگێڕاوه بەعەرەبی لەم بارەوه ئەفسانەیەکی زۆر پڕ و پووچی لە زمانی مێژوونووسەکانی تورکەوه گێڕاوەتەوه، گۆیا: سولـتـانی عوسمـانی کە چاوی کەوتووه بەسلێمـان پاشـای بابان لێی ترساوه وتوویە: (وای بەبە) ئەوه ئەم ناوەی لێ پەیدا بووه و، زۆر جێـی سەرسوڕمانە کە بەهەشـتـیی ئەمین زەکی بەگ بەم ئەفسـانەیە باوەڕی کـردووه، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی شەرەفنامەی دیوه و، زانیویە کە سەرداریتیی بابان لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا بووه.

وه ئەوەی ئەمین زەکی بەگ لە زمانی تورکانەوه ئەیگێڕێتەوه، هی سەدەی یازدەی کۆچی بەدواوەیە، چونکە وەکو ئەیزانین سلێمان پاشا ی کوڕی فەقێ ئەحمەد ساڵی ١١١١ کۆچی لە جێی باوکی بووه بەسـەرداری بابان. با ئەمـەش بزانین کـە (بابان) سێ دەوری دیوه... دەوری بابانی یەکەم بەمیر بوداق کوڕی ڕۆستەم دوایی هاتووه، کە ئەسەرەتا دەسەلاتیان و ئەپاومـانی بەمـێـژووەکی تایبـەتی ئەنووسـراوه... دەوری دووەم لە (پیـر ئەظەری کـوڕی بایرام)ی پیـاو و نۆکـەری بنەمـاڵەی بابانەوه دەست پێ ئەکـا، ئەگـاتە پاومـانی سـەدەی دەیەمی کـۆچی... و لەم سـەردەمـەدا بەهۆی شەڕ و هەرای نێـوانی دەوڵەتی عـوسـمـانی و دەوڵەتی سەفـەوییـەوه وڵاتی (بابان) پێـشـێـل ئەبێ و سـەرئەنجـام ئەکـەوێتـە ژێر دەسـتـی (ئەمـیـر بەگی کـوڕی شێخ حـەیدەری موکـری) کـە ئەو خـۆیشی لە بنەڕەتا لە بنەمـاڵەی (بابان) بووه و پاشان سەرداریـیـەکە شێـوا و هەر پارچەیەک لە وڵاتی (بابان) کـەوتە ژێر جنگی یەکێ لە دەرەبەگەکان. و ئەمیر شەرەفخان زۆر داخی بۆ ڕووخانی بابان و ڕوودانی ئەم ئاژاوەیە خواردووه، کە سەرداریەتییەکی کوردی بەهێزی لەناوبردووه.

موزیک

دەوری سێیـەم لە سـەردەمی فـەقێ ئەحـمـەدی داریشمـانەییـیەوه دەس پێ ئەکـات کە لە پاومـانی سـەدەی یازدەیەمـا سـەرداریەتی بـابانی زیندووکـردۆتەوه و، بەگـومـانی ئێـمـە ئەم

فەقێ ئەحمەدە دەبێ کوڕی بابا میر کوڕی بوداق بەگی کوڕی شێخ حەیدەری موکری بووبێ و، هەر چۆن بێ لە دەوری سێیەما (سلێمان پاشا) دەورێکی باشی گێڕاوە و پەرەی دا بەولاتەکەی... ئنجا ئیبراهیم پاشا کە شاری سلێمانی بناغە نا... پاش ئەم دووە ئەوڕەحمان پاشا کە ویستی شالاو بکاتە سەر بەغدا و تا چیای حەمرین چوو... و ئەم سەرداریەتییە تا ساڵی ١٢٦٣ی کۆچی مابوو، پاشان دەوڵەتی عوسمان تێکی دا. شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەربارەی ئەو دەورەی بابانە پارچە هەڵبەستێکی یەکجار بەرزی هەیە، لە سەرەتاکەیا ئەڵێ:

لە بیرم دێ سلێمانی کە دار الحوکمی بابان بوو

وە لە دوای ئەم پارچە هەڵبەستەدا ئەڵێ:

عەرەب ئینکاری فەضلی ئێوە ناکەم فاضیلن ئەمما
صەلاح الدین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو

ئنجا بابێینە سەر سنووری چوار لای ولاتی بابان، ئەم سەرداریيە لای ژووری، واتا باکووری هاوسنووری ئەردەڵان بوو... کە جارجارە (ئالان) و (بانە) و (مەریوان)یش بەرئەکەوت، لای خۆرهەلاتی ڕووباری سیروان و سەردارێتیی باجەلان بوو و، جارجارە مەندەلی و بەدرە و کوتیشی داگیر ئەکرد، لای خوارووشی (واتا باشووری) ڕیزە چیای حەمرین بوو کە ئەکەوێتە نێوانی سیروان و زێ و بەغداوە. لای خۆرئاوایشی زێی بچووک بوو کە پێی ئەوترا زێی کۆیە و، جارجارە لەم لایەشەوە ئەیتەنییەوە، تا هەرێمی (زرزا) و (ڕەواندوز). ئەم میرییە ماوەی پێنج سەد ساڵی فەرمانڕەوایی، بەسەر ولاتی باباندا کرد کە عوسمانییەکان سەرئەنجام ناویان نا (ویلایەتی شارەزوور) و بەوە ویستیان هەم ناوی شاری شارەزووری کۆن زیندوو بکەنەوە و، هەم ناوی (بابان) لە بیری خەڵق ببەنەوە... پاش ئەوە گۆڕدرا بەویلایەتی مووسڵ و هەروەک وتمان یەکێک لە شوێنەوارانی باشی بابان شاری سلێمانییە کە جێی شانازییە بۆ کورد. برایم پاشا دایمەزراند و، دروستی کرد، تەنانەت مزگەوتە گەورەکەی کە زۆر بەناوبانگە. هەروا جۆگەی (بەکرەجۆ)یە کە بەکر پاشای بابان هەڵی گرت و، ئەو قوتابخانە ئاینییانەشە کە لە شارەکانی ولاتی باباندا دروست کران، تەنانەت ئەو دوو قوتابخانە ئاینییەی کە لە قەلای کەرکووک دروست کران، یەکێکیان لە مەیدان بەناوی (مەحمود الخال) بەناوبانگە و، ئەوی تریان بەناوی (شا غازی) کە هەردووکیان لە سەردەمی ئەحمەد پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشادا دروست کراون، کە بە(غازی) بەناوبانگ بوو و یەکێک لە هەستیاران دەربارەی وتوویە:

شاه غازی احمد لشکرشکن
آنکه تیغش قلب اعدا میبرید

بەداخەوە مامۆستا خاڵ لە کتێبی شێخ مەعرووفی نودهییەکەیدا، ناوی مەدرەسەی شا غازی بەهەڵە تۆمار کردووە و نووسیویە (شا عەبباس). هەروا یەکێک لە ناودارانی بابان شا خالید بووە کە زۆر خزمەتی ئەدەب و زانایانی کردووە. کابرایەک تەجویدێکی بەفارسی داناوە کە ئاخر هەڵبەستی ئەمە بوو (شا خالید حاکمی موڵکی بەبان) کە بەشێوەی نوسیاری فارسی و بەپیتی ئەبجەد ئەکات ساڵی ١١٥٥ی کۆچی.

ئەمە وەها حەمەی مەلا کەریم بەشێکی لە کتێبی (نورالئەنوار)ی عەبدوسەمەدی توداری وەرگێڕاوەتە کوردی و ناوی ناوە چمکێکی مێژووی هەورامان و (مەریوان) و لە پێشەکییەکەی خۆیا، لە لاپەڕەی ٤ دا دەڵێ: (بۆ نموونە کێ ئەزانی لە سەدەی هەشتەمی هیجرەتدا میرنشینییەکی بابان بووە لە کوردستانا؟ و یەکێک لە میرانی ئەم میرنشینییە لەگەڵ تورک بەشەڕ هاتووە؟ و تا حەلەب و دیاربەکر ڕۆیشتووە... تاد) ئێمە ئەمەمان زۆر لا سەیرە کە ئەم گەنجەی ئەیەوێ دەم لە مێژوو بدات بۆ چ ئەوەندە لە مێژووی وڵاتەکەی بێ ئاگا بێ... دەبێ لە سەرەتادا بڵێین: شەرەفخانی بەتلیسی باسی ئەوەی کردووە کە سەرداریتیی دەوری یەکەمی بابان لە سەدەی نۆیەما تێک چووە. دەوری دووەم لە سەدەی دەیەما تێک چووە... هەروا ئەمین زەکی بەگیش لە مێژووی سلێمانیدا ئەمەی وتووە... جگە لەوەش عەبدولسەمەد توداری کە کابرایەکی نەخوێندەوار بووە، وای داوەتە قەڵەم کە لە سەدەی هەشتەما میر حەمزە چووەتە سەر (تورک) بۆ حەلەب... کە ئەمە هەڵەیە تورکی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەما کە لە نێوانی ٩١٨-٩٢٦دا سوڵتان بووە، وڵاتی شام و حەلەب و میسری داگیرکردووە، لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا تورک لەو ناوە نەبووە، هەرێمی (حەلەب و کلیس و ئەعزاز) بەدەست بنەماڵەی (جان پولا)ی کوردەوە بووە کە ئەمڕۆکە لە لوبنان بەبنەماڵەی (جانبلاط) بەناوبانگن. ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان تکامان وایە لە گەنجانی کورد باشتر لە مێژووی خۆیان و وڵاتەکەیان تێ بگەن، ئنجا تیری ڕەخنە بگرنە خەڵقی و، هەموو مرۆڤی وڵاتەکەیان بەنەزان بدەنە قەڵەم، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٠/١٢/٣
٣ ڕەشەمێ ٢٦٧٢

**وتاری: ١٠**

## بانه

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش. کامەرانیتان هیوای بەرنامەی کوردی ڕادیۆی ئێرانە و، هۆی بەختیاریمانە کە پێتان ڕابگەیەنین ئەمشەو باسی (بانە)تان بۆ دەکەین...

موزیک

بانە: ئەمڕۆکە ناوە بۆ شارۆلکەیەک کە ناوچەی فەرمانداریی سەر بەئوستانی کوردستانە، لە سەرەتادا هەروەکو (ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی) لە لاپەڕەکانی ٤١٣-٤١٥ی شەرەفنامەی فارسیدا کە لە (قاهیرە) چاپ کراوە و، لە (تاران) ئوفسێت کراوە و، هەروا لە لاپەڕە ٣٤٣ی وەرگێڕراوە عەرەبییەکەی چاپی بەغدادا تۆمار کراوە، وتوویە (بانە) ناوە بۆ ئەو سەردارییەی کە دەکەوێتە نێوانی سەردارێتییەکانی (ئەردەڵان - بابان - موکریان)ەوە، دوو قەڵای زۆر گرنگی تێدایە، یەکەمیان قەڵای (پیرۆزە) و ئەوی تریان قەڵای (شێوە)یە و، مەبەستی (ئەمیر شەرەفخان) لە قەڵای (پیرۆزە)، قەڵای (بەر ڕۆژە)یە کە قەڵایەکی گرنگ بووە و، شاری (بانە)ی ئێستە لەسەر شوێنەواری ئەو قەڵایە دامەزراوە و مەبەستیشی لە قەڵای (شێوە) قەڵای (شوێ)یە کە شوێن کەلاوەکانی لای دێی (شوێ)ی ئێستەیە، کە یەکێکە لە دێهاتەکانی سەر بە(بانە). ئەمە وەها و ئنجا با بچینەوە سەر باسەکەی (شەرەفنامە)، ئەڵێ:

سەرۆکی عێل و خێڵەکانی دەوروبەری (بانە) بەنازناوی (بانەیی) دەناسران و، سەردارانی (بانە)ش بەبنەماڵەی (ئیختیارەدین)ی بەناوبانگن. هۆی ئەم نازناوەش ئەمەیە کە خەڵکی هەرێمی (بانە) خۆ بەخۆ ئاینی ئیسلامیان وەرگرتووە و، سەریان بۆ هیچ کەس لە پادشایانی ئیسلامی دانەنواندووە. ئەمە وەها و دوور نییە ئەم قسانەی (ئەمیر شەرەفخان) لەو ئەفسانەیەوە مابێتەوە کە (عومەری واقیدی) تۆماری کردووە، کتێبێکی فارسیی دەستنووسم لەبەردەستایە (مەلا عەبدولعەزیز واعیزی)ی سەردەشتی لەسەر کتێبێکی عەرەبیی (فتوح سەواد العیراق) ناو، کە لە (مەلا سەمەدی) مەرگەیی وەری گرتووە، وەریگێڕاوە بەفارسی، ئەڵێ: خەڵکی (بانە) بێ شەڕوشۆڕ ئیسلامیان پەسەند کرد و ناردیان بیست کەسیان لە عەرەبەکانی لەشکری خالیدی کوڕی وەلید هێنا

که فێری قورئان و نوێژیان بکەن، پاشان لە هەڵێکا هەر بیست کەسەکەیان کوشت، خالید کە بەمەی زانی هاتە سەر (بانە) و سێ سەد کەسی لێ کوشتن، وڵاتەکەشی تالان کردن...

بەڵام ئێمە لامان وایە ئەم ئەفسانەیەی کە گۆیا ناوی (ئیختیارەدین) لەوێوە هاتبێ کە خۆ بەخۆ ئیسلام بوون، شتێکی دەست هەڵبەستە، ناوی (ئیختیارەدین) لە پێش سەردارانی (بانە)شدا لە ئێرانا هەر باو و قاو بووە، بۆ نموونە لە لاپەڕەکانی (٨٢ - ١٣٧ - ١٤١)ی تەئریخی جەهان گوشای جوەینیدا و، هەروا لە لاپەڕە (٤٩١)ی تەئریخی گوزیدەی موستەوفی قەزوینیدا ناوی ئیختیارەدینی زۆر هاتووە، تەنانەت مەلیک ئیختیارەدین کوڕی موئەیەد الملک قەوامەدینی ئەبوبەکری ئەجەلێ کە پادشای ئەبیوەرد و زۆزان بووە لە وڵاتی خوراسانی ئێستەدان و بەپێی ئەوەی کە وشەی (زوزان) لە فارسیدا، هیچ جۆرە مەبەست و مەعنایەکی نییە و، لە کوردیدا بەکوێستان و بەجێی فێنک دەڵێن، دەبێ ئەم ئیختیارە دینییە لەو کوردانە بێ کە کۆچکراون بۆ هەرێمی (قوچان و بوجنورد) لە سەردەمی ئالوبویە و سەلجووقییەکانا، ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی ترەوە خالید کوڕی وەلید نەگەیوەتە کوردستان. ئەو لە سەرەتای ئیسلامدا بەلەشکرەوە هاتبووە عێراق و لە کاتێکا کە لە عەین التەمری کەربەلا، کە بە(شثاثە)ش بەناوبانگە، خەریکی شەڕ بوو، لە شامەوە داوا کرا، ئەوێی بەجێ هێشت و چوو بۆ شام و، ساڵی ٢١ کۆچی لە (حیمص) مرد. جگە لەوەش کتێبەکەی واقیدی دەبێ ناوی (فتوح العیراق) بێ، بەڵام ئەو کتێبە دەسکاری کراوە، ناوی شارە کۆنەکانی کوردستان تێکدراوە، بنەماڵەی (مەلا سەمەد) ناوانی تازەیان لە جێی ئەوان داناوە، وەکو ساوجبلاغ، ئیسماعیل قولی، کە لە دەورانی (مەغۆل) و (سەفەوی)دا پەیدابوون و، لە سەرەتای ئیسلامدا نەبوون.

## موزیک

ئەمە وەها و بنەماڵەی سەرداریتیی بانە لە سەرەتای سەدەی نۆیەما دامەزراوە، سەردارەکانی بەڕیزە ئەمانە بوون: میر محەمەد، میرزا بەگ، بوداق بەگ، سلێمان بەگ، بەدر بەگ...

شەرەفنامە تا ئێرەی هێناوە، کتێبی عالەم ئارای عەبباسی لە لاپەڕە ٨١٤ دا ئەڵێ: ساڵی ١٠١٨ کۆچی شا عەبباسی سەفەوی فەرمانی دا بەگرتنی سەردارانی وڵاتی موکری، کە یەکێ لەوانە ئەسکەندەر سوڵتانی میری بانە بوو و، لەو حەلەدا بانە سەر

بەمەراغە بوو، ئەم ئەسکەندەر سولتانە زۆر بێ باکانە و، بەجەرگانە چووە پێشگای شا عەبباس، کە شا عەبباسی ئەم دلێرییەی لێ دێ لێی بورد و لەسەر جێی خۆی دایناپەوە و، مۆری سەرداریتی دایێ. بەڵام سالی ۱۰۲۱ کۆچی ئەم (ئەسکەندەر سولتان)ە لە فەرمانی شا عەبباس سەری پێچا و، یاغی بوو، ئەوانیش فەرمانیان دا بە(صارو سولتان بیگدلی) کە فەرمانڕەوای (صارو گورگان) و (گاورود) بوو، شالاو بکاتە سەر بانە ئەم صارو سولتانە بەهێزێکی جەنگاوەرەوە هەڵی کوتایە سەر کوردەکانی (بانە) و لە پاش شەڕ و کوشتار قەلاکەی داگیرکرد و، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەسکەندەر سولتان و لەشکرەکەی ئەوێیان بەجێ هێشتبوو، بەڵام صارو سولتان بێ بەزەییانە دەستووری دا بەتۆلەسەندن لە کوردەکان و ۷۰۰ کەسی لێ کوشتن، ئەمە وەها و ڕەنگە دەستوورەکەی شا عەبباس بەو سەختییەش نەبووبێ، بەڵام خاوەنی کتێبی عالەم ئارا کە خۆی داخ لە دڵ بووە، بەم جۆرە ناشرینە باسەکەی تام و خوێ کردبێ. پاش ئەم دەورە بانە کەوتۆتە ژێردەستی فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان و سالی ۱۲۳۶ی کۆچی واتا ۱۸۲۱ زایینی کە (میستەر ریچ) بەوێدا تێپەڕیوە سەرداری بانە (نوروڵلا خان) ناوێ بووە. پاشان دەسەلاتی بانە کەوتۆتە دەست کەریم خانی بانە ئنجا لەوەوە ماوەتەوە بۆ (یونس خان) و پاش کوژرانی کەوتۆتە دەست محەمەد خان کە میستەر هەببارد لە سالی ۱۹۱۳-۱۹۱٤ زایینیدا چاوی پێ کەوتووە، بەڵام پاشان لە لایەن ئیبراهیم بەتلیسی فەرماندەی لەشکری عوسمانییەوە کوژراوە، ژاک دومورگانی خۆرهەلاتناسیش بەبانەدا تێپەڕیوە و دەڵێ هەموو سالێ لە ۱٥ی تشرین (واتا دیسەمبەر) بەدواوە پەیوەندیی نێوانی بانە و سەردەشت ئەپچڕێ، بەفر ڕێگەکان ئەبەستێ. خەڵق مێگەلەکانیان لە شیو و دۆڵ و ڕاستە بانەکانا ئەلەوەڕێن، پتر دەسکاریی درەخت وە لقوپۆپی جەنگەلەکان دەکەن. ئافرەتانی بانە لە جوانی و خووڕەوشت نموونەی بەرزی ئافرەتی کوردستانن. چیاکانی بانە دڕندەی وەک گورگ، ورچ و بەراز و، چەقەڵ و ڕێوی زۆرە. هەروا گیانلەبەرانی کێویی وەکو ئاسک، کەروێشک، بزنە کێویشی هەیە و، پەلەوەری وەکو مراوی، کەو، قازی قولنگ، چێرگێشی هەیە.

## موزیک

ئەمڕۆکە بانە شارۆلکەیەکی قنجیلەیە، پاش سووتان، خۆی ئاوەدان کردۆتەوە، بانە لای خۆرئاوای باشووری کیشوەری ئێرانەوەیە و، لەسەر سنووری کوردستانی ئەودیوە... ناوچەی فەرمانداریبە لەوەپێش سەر بەمەهاباد بوو ئەمڕۆکە سەر بەسنەیە، کە ناوچەی ئوستانی کوردستانە سێ بەخشی هەیە: ۱- ئەمەشیر. ۲- پەهلەوی دژ کە لە پێشا پێی ئەوترا

ئەنوو. ٣- ئالوت. سەرژمێری دانیشتوانی بانە و بەخشەکانی ٥٧ ٤١,٠ کەسە، زبانیان کوردی و، قوتابخانەی ناوەنجی کوڕان و کچان، پێنج قوتابخانەی بەرایی، ٣٣ خوێندنگەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، ژمارەیەک مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی، نەخۆشخانە، دەرمانگا داروخانە، سینەما، گەرماو، خۆراکخانە، چاخانە، میوانخانەی تیایە. لقەکانی بەڕێوەبەرایەتی پوست و تەلگراف و تەلیفۆن و بانکی هەیە بەرهەمی ولات دەغڵ و دانەوێڵە، دەسکەوتی ئاژەڵی و، گردگاریشیان هەیە وەک خەڵووز، کەتیرە، بنێشت، شەقڵەدار. خوێندەواری باشیشی هەیە، لە بنەماڵەی ئیختیارەدین سێ کەسیان مامۆستای زانکۆن وەک عەبباسی فارووقی، دوکتۆر ئیختیار و یونس. گوێگرانی بەڕێز کاتمان تەواو بوو، تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٠/١٢/١٠

وتاری: ١١

# بەختیاری

گوێگرە خۆشەویستەکان، شەوتان خۆش

ئاواتەخوازی کامەرانی و بەختیاریتانین و هۆی دڵشادیە کە پێتان ڕاگەیینم ئەمشەو باسی (بەختیاری)تان بۆ دەکەین.

بەختیاری لە سەرەتادا ناوی عێلێک بووە لەوانەی کە لە چیای (سماق)ی شام -کە لە لای حەلەبەوە درێژە ئەکێشی تا ئەسکەندەرونە- هەڵکەندراون و، لە تاو ستەمی داگیرکارانی بێگانە ڕوویان کردۆتە لوڕستان بۆ ئەوەی لە سایەی فەرمانڕەوایانی خۆماڵیی لوڕستاندا بەئاسایش و ئارامیی ژیان ببەنە سەر. (تەئریخی گوزیدەی موستەوفی قەزوینی) و (مونتەخەب التەواریخی موعینیی نەتەنزی) - کە پێی ئەوترێ تەئریخی شوانکارە - و (شەرەفنامە)ی ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی، هەرسێکیان لەم بارەوە قسەکانیان یەک ئەگرێتەوە و، ئەمە پاڵاوتەیەتی:

موزیک

لە سەردەمی ئەتابەگ هەزار ئاسف کوڕی ئەبو تاهیر کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبو الحەسەن فەزلەویدا، کە پاش مەرگی باوکی لە ساڵانی ٥٥٠ی کۆچی بەدواوە دەسەڵاتی وەرگرتە دەست و، ئاڵای دادپەروەری هەڵ کرد و، خاکی وڵات لە سایەی ئەودا وەرگەڕا بەبەهەشتی بەرین، عێل و خێڵێکی زۆری کورد هەرێمی (جەبەڵ سماق)یان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە لوڕستان. ئەم عێل و خێڵاتە پتر لە سی تیرە بوون وەکو (ئەستەرکی، مەماکۆیە، بەختیاری، جوانکی، بێدانیان... تا دوایی)، جا بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ عێلە هاتووەکان شێوەی زمانیان کرمانجیی باکور بووە، شیوە ئەو شوێنەوارە لە لوڕستانی گەورەدا کە پێی ئەوترێ (بەختیاری) پتر بەدی ئەکرێ...

بابێینە سەر باسی ئەوەی کە ناوی (بەختیاری) لە کوێوە هاتووە؟

(شەرەفنامە) لە باسی سەردارانی وڵاتی (حیصن کیفا)دا کە لە بنەماڵەی (ئەیوبی) بوون، ئەڵێت: نەتەوەی کورد لایان وایە کە لە بنەڕەتا ئەچنەوە سەر دوو برا: (بوژن) و (بوخت). لە سەرەتادا ئەم دوو برایە لەم ناوەدا بوون، پاشان نەتەوەیان بوون بەدوو

بەشەوە، نەتەوەی (بوژن) لە هەرێمی (حیصن کیفا)دا ماونەوە و نەتەوەی (بوخت) چوون ولآتی (جەزیرەی ئیبن عومەر)یان ناوەدان کردۆتەوە -کە بە(جزیر و بۆتان) بەناوبانگە- و ناوی (بۆتان) لە (بوخت)ەوە هاتووە و (بۆتان) گەل وشەیە و، ئەم بوختییانە لەوێوە تا هەرێمی ئەسکەندەرونە درێژەیان کێشاوە، پاش تێکچوونی دەوڵەتی ئەیوبی تەنگەتاوکراون، لەبەر شەڕوشۆڕ و نەهات و گرانی ولآتیان بەجێ هێشتووە و، ئەوەیان پێ باش بووە کە لە سایەی فەرمانڕەوایەکی خۆ زمان و خۆماڵییا بژین. جا روویان کردۆتە (لوڕستان) کە لەو سەردەمەدا، بەهێزترین فەرمانڕەواییەکی کورد بوو، لە خاکی ئێرانا و، هەروەک لە لاپەڕە ٤٩ (مونتەخەب ئەلتەواریخی موعینی)دا هاتووە: ئەتابەگ ئەفراسیاب کوڕی ئەتابەگ نوسرەتەدین کە لە بەسرەوە تا ئەسفەهانی لەژێردەستا بووە، بڕیاری دابوو، خاکی پاکی ئێران لە چنگی مەغۆل ڕزگار بکات و، ئەم هەرێمەی کە ئێستە بەبەشێکی ئەوترێ (بەختیاری) ئەو حەلە پێی ئەوترا لوڕستانی گەورە و تا سەدەی دەیەم ئەم ناوە هەر هەبوو... بەڵام (سەفەوی)ەکان بۆ ئەوەی ناوی فەرمانڕەوایانی لوڕستان لە بیر ببەنەوە، هەرێمەکەیان بەناوی تیرەی (بەختیاری وەند)ەوە ناونا. (بەختیاری) و قاجارەکانیش ناوی لوڕستانیان گۆڕی بە(پێشکو) و (پشتکۆ) و، هەروەها مایەوە تا لە دەورانی شاهەنشایی پەهلەویدا یاسای ولآت گۆڕا... دەستووری نوستان خرایە کار و، کیشوەری پان و پۆڕی ئێران کرا بەچەند نوستان، لە سەرەتادا لوڕستان بەش کرا بەسەر نوستانەکانی کرماشان و خۆزستان و ئەسفەهاندا. بەڵام لەم دواییەدا بەشی زۆری لوڕستان کرا بەچەند فەرمانداریی گشتی، یەکێ لەوانە فەرمانداریی گشتیی چوار مەحاڵ و بەختیارییە، بۆ ئەم زانستە سەرنجی دائیرەت المعاریفی فارسی و، تەئریخی ئال موزەفەر بدەن، بەپێی ئەم کتێبانە و بەپێی (ڕاهنومانی شەهرستانەکان) بەختیاری ناوچەیەکە لە نێوانی ئەسفەهان و خۆزستان و فارسی و لوڕستاندا، ڕووباری سزار کە لە چیاکانی بەختیاری دێتە خوارەوە، بووەتە سنوور لە نێوانی لوڕستان و بەختیاریدا «جا بەختیاری ئەکەوێتە لای خۆرئاوای بەشی ناوەندیی کیشوەری ئێرانەوە، چەند زنجیرە چیای تیایە کە لای خۆرئاواوە بەرەو باشووری ئێران، واتا لای عیلی بەختیاری زنجیرە چیای (زەردکۆ)، کە زۆر لقی لێ جیا ئەبێتەوە. ئەم هەرێمە شیو و دۆڵ و جەنگەلی زۆرە، پاوەن و لەوەڕگای زۆر و فراوانی هەیە، سەر زەوییەکەیان دانراوە بەسێ فەرمانداری کە ئەم شارستانانە ناوچەیانن: (شەهر کورد) (ئیزە) و (بروجن) و ئەم سێ فەرمانداریییە فەرمانداریەکی گشتی پێک دێنن کە ناوی فەرمانداریی گشتیی (چوار مەحاڵ و

بەختیاری)یە. عێلی بەختیاری بەدوو بەش دەدرێنە قەڵەم، کە پێی ئەڵێن حەوت لنگ و چوار لنگ و بەپێی کتێبی (ئیران شەهر) کە یونسکۆ نووسیویە:
چوار لنگ ئەم تیرەیانەیە:

موزیک

هەلیل - کشول - بارونی - کامیلی. حەوت لنگیش ئەم تیرانەیە: زراسوەند - شاشاڵۆک - دیناران - مورمویی - سادات سالوئی - ئال داودی - قەلعە کوردی - زەندی - خودابەخشی - کەل بابەکی - شێخ چهل تەنانی و چەندی تری.

ئەمە وەها و بەختیاری هەروەکو ناوە بۆ عێل و خێڵە کۆچەرەکان، ناویشە بۆ خەڵقی شارۆلکە و دێیەکان، کەوا دەکەونە ئەم هەرێمەوە. بەپێی (ڕانومای شارەکان) سەرژمێری بەختیاری بەپێی ژمارە ١٣٤٥ی فارسی نزیکی سێ سەد هەزار کەس بووە و، فەرمانداریەکە دوو شارستان و هەشت بەخشی هەیە. لەم هەرێمەدا نزیکەی ٦ قوتابخانەی ناوەنجی ٢٠ قوتابخانەی بەرایی، ٦٠ قوتابخانەی بەرەنگاریی نەزانی و نەخوێندەواری هەیە. لە شارەکانی: شارکورد، بروجن و گەورە دێیەکانی (شۆراب - مێرنەج - گەیار - گەندمان - لاردەکان - و ئەردەل)دا... زۆر کارگە و کارخانەی بچووک هەیە. کتێبی (ئامارژە باستانی ئێران) وای داوەتە قەڵەم کە خۆرهەڵاتناسی بەرێز گیرشمەن ساڵی ١٩٤٥ زایینی لە گەرووی پایەدا کەوا لە ناو چیاکانی بەختیارییا، بەلای خۆرهەڵاتی شوشتەردا کەوتە هەڵکۆڵینەوە، لاشە و، ئێسکی ئادەمیزادی پێش مێژووی دۆزییەوە، کە گومان دەکرا هی دە هەزار پانزە هەزار ساڵ لەمەوپێش بێ، با ئەوەش بزانین کە ئەتابەگانی لوڕستان لەم وڵاتەدا کە ئێستە بەناوی بەختیاری دەناسرێت، سکە و دراوی تایبەتیان هەبووە... بەڵام دوکتور حوسێن قولی ستودە لە لاپەڕە ٢١٦ی بەرگی یەکەمی تەئریخی ئالی موزەفەردا ئەڵێ: هەرێمی بەختیاری، یا لوڕستانی گەورە لە سەردەمی شا شوجاعی فارسدا خۆیان بەسەر بەم پادشایە زانیوە بەڵگەشی بەوە هێناوەتەوە، کە ساڵی ٧٦٢ی کۆچی لە سەردەمی ئەتابەگ پشەنگی کوڕی یوسف شادا دراوی وڵات بەناوی (شا شوجاع)ەوە بووە و دراوی ساڵی ٧٦٢ دۆزراوەتەوە. ئێمە بەدووری نازانین کە مەبەست لە شا شوجاعی (شا شوجاعەدین خورشید)ی دامەزرێنەری ئەتابەگێتی لوڕستان بێ، نەوەک (شا شوجاع)ی فارسی.

ئەمە وەها و بەرهەمی وڵاتی بەختیاری، لە شار و دێهاتەکانیا دەغڵ و دانەوێڵەیە و،

هی عێلاتی کۆچەر دەسکەوتی ئاژەڵییە و ئەسپ و ئێستر و گا و مەڕ و بزن و ڕۆن و خوری و موو.

بیستیارانی بەڕێز لێرەدا کاتمان تەواو بوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

۱۳۵۰/۱۲/۱۸

۱۸/ڕەشەمێ/۲٦۷۲

**وتاری: ١٢**

# برادۆست

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش، هەموو کاتێکتان بەشادی و کامەرانی بەسەربەرن...
ئەمشەو باسی (برادۆست)تان بۆ دەکەین کە ناوی ناوچەیەکە، لە سەرەتادا ناوبووە بۆ بنەماڵەیەکی سەردارێتیی کوردی بەهێز کە لە بنەڕەتا فەرمانڕەوای شاری ورمێ (واتا ڕەزائیەی ئەمڕۆ) و دەوروبەری بوون... بەڵام بەداخەوە ئەو مێژوونووسانەی کە تا سەدەی دەیەمی کۆچی دەربارەی کورد شتیان نووسیوە، جگە لە ئەمیر شەرەفخان بەتلیسی کەسیان بەتەواوی دەربارەی (برادۆست) نەدواون. ئەمیر شەرەفخان لە لاپەڕەکانی ٣٨٣-٣٨٦ی شەرەفنامەی فارسیی چاپی قاهیرە، ئۆفسێتی تاران و، لە لاپەڕەکانی ٣٠٧-٣١٢ وەرگێڕاوی عەرەبییەکەیا ئەڵێت: عێلی برادۆست، لە سەرەتادا لە عێلە کۆنەکانی گۆرانن و، سەردارانی برادۆست بەبنەچەکە ئەچنەوە سەر هیلال کوڕی بەدر کوڕی حەسەن وەیهی بەرزیکانی کە بەبنەماڵە لە سەردەمی عەبباسیدا فەرمانڕەوایانی هەرێمەکانی دینەوەر - شارەزوور بوون، ئەم هیلال کوڕی بەدرە، ساڵی ٤٠٥ کۆچی لەگەڵ شەمش الدەولەی کوڕی فەخر الدەولەی کوڕی ڕوکن الدەولەی ئال بوویەدا کەوتە شەڕەوە بەڵام سەرەڕای ئەوەش کە جەلال الدەولە ئال بوویە هێزێکی گەورەی نارده یارمەتی نەیتوانی بەرەنگاریی شەمس الدەولە بکات، شکستی خوارد و کوژرا، پاش خۆی تاهیری کوڕی بەسەر شارەزوورەوە مایەوە و، دوو کوڕەکەی تری کە ناویانی تۆمار نەکردووە - ڕوویان کردە وڵاتی ورمێ (واتا ڕەضائیيەی ئەمڕۆ). یەکێکیان سەردارێتیی عێلی ناکۆی گرتە مل، ئەوی تریان بوو بەسەرداری ناوچەی خان ئەلماس.

موزیک

ئەوەی ڕاستی بێ مێژوونووسانی کورد و تورک و عەرەب و فارس باسی کورد و نەتەوەکانی تری ئێرانیان خستۆتە پشت گوێ، ئەوان پاش ئال بوویە تەنیا باسی پادشایانی (سەلجووق و تاتار و مەغۆل و ئێلخانی)یان کردووە، کە هەموویان داگیرکاری وڵات بوون، زۆر کەم دەربارەی میرێتی و سەردارێتییەکانی ناوخۆ دواون.

ئەمە وەها ڕۆییوە تا ساڵانی سەدەی نۆیەمی کۆچی، لەم سەردەمەدا دوو مێژوونووس کە

دەربارەی سەفەوی نووسیویانە: یەکێکیان حەسەنی شاملو خاوەنی (ئەحسەن التەواریخ) و ئەوی تری ئەسکەندەر مونشییە خاوەنی (عالەم ئارا). با جارێ بگەڕێینەوە سەر (شەرەفنامە) ئەو ئەڵێت: غازی قڕانی کوڕی سوڵتان ئەحمەدی برادۆستی کە خێوی ورمێ بوو، کاتێ شا ئیسماعیلی سەفەوی کەوتە پەرەدان بەدەسەڵاتی و، ویستی ورمێ داگیر بکات، بەرەنگاری بوو و، شەڕێکی باشی لەگەڵ قزلباش کرد، بەڵام پاشان، کە سەردارانی کورد تێکڕا بڕیاریان دا بچنە دیتنی شا ئیسماعیل و بەشایێتی بیناسن و، لە تاج بەسەرنانیدا هاوبەشی بکەن، غازی قڕانیش لەو کارەدا هاوبەشی کرد... شا ئیسماعیل کە ئەم جوامێرییەی غازی قڕانی دیت، فەرمانی بۆ مۆر کرد کە لە جێی خۆی بەسەردارێتیی ورمێ و ناوچەکانی تەرگەوەر و سومای و دۆڵی و قەڵاکانی دەوروبەرییەوە سەرنەفراز بێت. پاشان کە شەڕی چاڵدێران دەستی پێ کرد و لە ساڵی ٩١٨ کۆچییەوە تا ساڵی٩٢٢ درێژەی کێشا، سەفەوییەکان بەرامبەر بەعوسمانی شکان... هۆی شکستیش ئەوە بوو کە ١٦ سەردارێتیی کورد بەهانی مەلا ئیدریسی بتلیسی خۆیان لە ئێران پچڕی و، بوونە پاڵپشتی عوسمانی و، بەم کارە هەم خۆیان لەناو برد و هەم دەوڵەتی سەفەوییان شڵەژاند و، پاش ئەم سەرکەوتنەی دەوڵەتی عوسمانی سوڵتان سلێمانی کوڕی سەلیم کە بە(قانوونی) ناسراوە، ئەم غازی قڕانەی کرد بەڕاوێژیاری خۆی و، بەشێ لە وڵاتی هەولێر و بەغداشی خستە سەر وڵاتەکەی ژێردەستی و لەوە بەدوا سەردارێتیی برادۆست بوو بەدوو بەش:

یەکەم: بەشی (سومای) کە ئەم چەند سەردارە یەک لە دوای یەک فەرمانڕەوای بوون: شا محەمەد کوڕی غازی قڕان - بوداق بەگی کوڕی شا محەمەد - حەسەن کوڕی شا محەمەد و ئەوەی دواییان بەهۆی هەندێ درۆی دەست هەڵبەست تاوانبار کرا و بەفەرمانی سوڵتان سلێمان لە (وان) کرا بەدارا. پاش ئەو عەلی کوڕی غازی قڕان، ئنجا ئەولیا کوڕی بوداق بەگ دەسەڵاتیان گرتەدەست.

موزیک

بەشی دووەم: (تەرگەوەر) و (قەڵاداودان) بوو، کە ئەم سەردارانە یەک لە دوای یەک فەرمانڕەوای بوون: (ناسر بەگی کوڕی شێخ حەسەن بەگ - شیر بەگی کوڕی ناسر بەگ - زەینەدین بەگ)... ئەمە وەها و بابێینە سەر (ئەمیر خانی لەپ زێڕین). لە لاپەڕە ٧٦٢ی کتێبی (عالەم ئارای عەبباسی)دا و، لەوە بەدوا ئەم بەسەرهاتەی نووسیوە کە ئێمە گەڵاڵەکەی ئەنووسین: «لە سەردەمی شا تەهماسپی سەفەویدا کابرایەکی (قەرەتاج) ناو

هەبوو کە خۆی لە ڕیزی شا خۆشویستان ئەدایە قەڵەم و فەرمانڕەوای ورمێ بوو و لەو حەلەدا بەرامبەر بەشا محەمەد بەگی سەرداری برادۆستی دەست نێژی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕا بوو... هاتە لای شا تەهماسپ...

شا لەم کابرایەدا دروشمی ئازایی و جوانمەردی بەدی کرد فەرمانی بۆ مۆر کرد، کە لەسەر سەرداریتیی (ورمێ - تەرگەوەر - مەرگەوەر - شنۆ) پایەدار بێ، لە سەردەمی شا تەهماسپدا ئەم پایەی هەر هەبوو. پاش مەرگی شا تەهماسپ لەگەڵ عومەر بەگی سۆراندا بوو بەهاوسوێن و، لەگەڵ دوژمنەکانی کەوتە شەڕەوە، لە یەکێ لە شەڕەکانا دەستێکی بەر شمشێر کەوت و، لەپی پەڕێنرا... حەڵی کە شا عەبباس چووە سەر تەخت و ئەم قەرەتاجە چووە پێشگای ئەو بەرامبەر بەجوامێری و مەردایەتی نواندنی، دەستووری دا بەهونەرمەندە زەڕنگەرەکان دەستێکی لە (زێڕی سوور) بۆ دروست بکەن، بەگەوهەر و مروارى و ئەڵماس بینەخشێن. پاش ئەم بەناوی ئەمیر خانی لەپ زێڕین ناوبانگی دەرچوو، هەرکە سەردارانی کورد بەم ڕێزلێنانەی شایان زانی و، چاویان بەهێز و مەردایەتیی ئەمیر خان کەوت، هەموو سەری بچووکییان لە بەریا دانەواند و بەسەرۆکی خۆیان پەسەندیان کرد.
ئەمیر خان کە ئەمەی زانی داوای لە شا عەبباس کرد ڕێی بدات کۆنە قەلاکەی دمدم ئاوەدان بکاتەوە کە بەسەر کێوێکی زۆر سەختەوە بوو، گۆیا لە بنەڕەتا کەلاوەی قەلایەکی دەورانی ماد بووە، بە بەهانەی ئەوەی کە بتوانێ بەهۆی ئەو قەلایەوە خۆی لە شالاوی لەشکرانی عوسمانی بپارێزێ. شا عەبباس ماوەی دا، ئەویش بەچەند ساڵ قەلایەکی زۆر قایم و بەپشتی دروست کرد، کە حەوت قەلا بوو، یەک لەنێو یەک و، حەوت شورەی بەرزیشی بەدەوریانا کێشا و، لەناو قەلاکەوە بۆ سەر زەوی چالاوی لێدا، کە لە کاتی تەنگانەدا، ئاو لە بیر دەربهێنن و پێویستیان بەئاوی دەرەوە نەبێ. هەرکە پیر بوداقی سەرداری تەورێز بەم باسەی زانی، لای شا عەبباس کەوتە دووزمانی و، (شا)ی لە (ئەمیر خان) بەدگومان کرد، جا شا عەبباس بۆ تاقیکردنەوەی ئەمیر خان دەستووری دایێ کە بەلەشکرەوە بچێتە سەر کوردستانی ئەردەڵان و، شالاویش بکاتە سەر هەرێمەکانی جزیرە و دیاربەکر، ئەمیر خان کە فەرمانەکەی وەرگرت، بەهانەی هێنایەوە، لەسەر ئەوە شا دەستووریدا بەلەشکری قزڵباش، لە ئیسفەهان و، تەورێزەوە بچن و شالاو ببەنە سەر ئەمیر خان و حەوت ساڵی تەواو لەو قەلایەدا گەمارۆ درا. پاشان بەفێڵ دەرکرا و کوژرا.
بەیت وێژانی کورد سەدەها بەیتیان دەربارەی ئەم شەڕە هەڵبەست. لێرەدا قسەکانی عالەم ئارا تەواوبوو...

ئێمە لامان وایە ئەو قەرەتاجەی کە عالەم ئارا ناوی ناوە (ئەمیر خانی لەپ زێڕین) هەر قەرەخان کوڕی ناسر بەگی کوڕی حەسەن بەگی برادۆستی بووە کە پاش غازی قڕان بووە بەسەرداری تەرگەوەر، هەروا عومەر بەگی سۆرانیش دەبێ عومەر بەگی کەڵهوڕ بێت، کە ئەمیر خان یاری داوە لەو حەلەدا کە دەرتەنگی تا بەغدا بەدەستەوە بووە، جگە لەوەش قەلای دمدم هەر ئەبێ ئەو (قەلا داودان)ە بێ، کە شەرەفخان ناوی بردووە... بابێینە سەر ئەوەی کە سمایل خانی شکاک کە بە(سمکۆ) بەناوبانگە ئایا لە نەتەوەی ئەمیر خانی لەپ زێڕینە؟ ئەگەر سمایل خان شکاک بێ، لە نەتەوەی ئەو نییە. شکاک وەیا (شقاق) عێلێکی کوردی ولاتی (حیصن کیفا) بوون، لە بەشی فنیک و گورگیل دائەنیشتن، پاش تێکچوونی دەوڵەتی ئەیوبی لە سەردەمی سەفەویدا کۆچیان پێ کراوە بۆ خوراسان و سەر سنووری ئەفغان، پاشان لە سەردەمی نادردا هێنراونەوە هەرێمی کرمنشا و تا سەردەم کەریم خانی زەندیش هەر کۆچەر و هێزی ئامادەی دەوڵەت بوون... و (ڕاهنومای شەهرستانها) زانیارییەکەی لەم بارەوە، هەڵەیە...

ئەمرۆکە برادۆست یەکێکە لە سێ دێهستانەکانی بەخشی (سومای) سەر بەشاری ڕەزائییە، ئەکەوێتە چیایەکی سەردەسێر، لای باکوری دێهستانی سومای و لای باشووری تەرگەوەر و لای خۆرهەلاتی کەنار بڕۆژە و لای خۆرئاوایشی سنووری تورکیایە، ٥٢ دێی هەیە، سەرژمێریان ٥٦٣٠ کەسە، ناوچەی دێهستانەکە دێی (ئێشکە سوورە)یە، گەورە دێیەکانی ئەمانەن: (چێرە - زەنگەکان - گەنگەرچین - ستەکان - زێ حێلان) لە کوردستانی ئەودیویش برادۆست ئەخشێکە سەر بەفەرمانداریی ڕەواندزە، دانیشتووانی برادۆست خاوەنی کشتوکاڵ و مەڕومالاتن، چاترین پەنیر و هەنگوین و ژاژی و توتنیان هەیە، قوتابخانە و مزگەوت لە دێیەکانا هەیە. تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٠/١٢/٢٤

وتاری: ١٣

# بروجورد

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش، ئاواتەخوازی بەمراز گەیشتنی هەموو لایەکین، ئەمشەو باسی (بروجورد) ئەکەین کە یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکای لوڕستان. ئەم شارە لە بنەڕەتا ناوی (بەرد گرد) بووە واتا لای بەردەمی چیا... و کتێبی (حدود العالم) لە لاپەڕەی (٨٣)دا دیاردی بۆ ئەم بنەڕەتە کردووە و، ناوەکەی بە(بروگرد) تۆمار کردووە. بەداخەوە جوغرافیانووس و مێژوو دانەرەکان هیچیان سەرنجی بنەڕەتەکەیان نەکردووە. هەر بەوجۆرە تۆماریان کردووە کە عەرەب دەستکاریان کردووە و، گافەکەیان گۆڕیوە بەجیم. لێرەدا دەبێ بڵێم: کە ئەوانەی بەعەرەبی ناوی شار و کەسانی کورد یاخۆ ئێرانیی تریان تۆمار کردووە بۆ ئەوەی عەرەب بتوانن وێژەکە فێر بێن، هاتوون پیتەکانیان گۆڕیوە، بەوێنە گوندی شاپوریان کردووە بە(جوندی شاپور) و ئەم هەڵەیە تا ئەمڕۆش هەر ماوە و بەم جۆرە ئەوتریێ و کەم کەس ناوە کۆنەکە ئەناسێتەوە - و (بەردگرد)یان کردووە بە(برو جورد)، (گوڵ پایەگان)یان کردووە بە(جور فادەقان) (گۆرەک)یان کردووە بە(جۆرقان) و (گۆران)یان کردووە بە(جۆران) (کەماژان)یان کردووە بە(قرمیسین)، (خانەگین)یان کردووە بە(خانەقین) و (بەنانەگین)یان کردووە بە(بەندەنیجەین) و لە پاشان بووە بە(مەندەلیچن) و (مەندەلی) و (دێ کۆک)یان کردووە، بە(دەقوقا) و (میرەگان بچووک)یان کردووە بە(میهرەجان قذف) و بەم جۆرە هەزارەها ناوی شار و دێ و زانا و گەورە پیاوان و عیلی کوردیان لێ گۆڕیوین... ئەمڕۆکەش نیوچە خوێندەوارانی کورد لەسەر هەمان ڕێچ ئەڕۆن، ڕچی کوێرەڕێ و، خەریکن (صاد) ئەگۆڕن بە(سین) و (طێ) ئەگۆڕن بە(تێ) و (ظێ و ذال و ضاد) ئەگۆڕن بە(زێ)، وەها ئەزانن بەم جۆرە ئەتوانن ماڵی خەڵق داگیر بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە سێزدە سەدەیە کورد و نەتەوەکانی تری موسوڵمان بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە ئەم پیتانەیان وەرگرتووە و بووەتە خۆماڵی و، کتێب و دیوانی پێ نووسراوە کەچی ئێستە ئەیدەنە دواوە، بەڵام پاش ماوەیەکی تر کە خوێندەواری پەرەی سەند و خۆی لە زمانەکانی تری دزییەوە ئەو حەلە خوێندەواری کورد لە فەرهەنگی کوردییا، دوای ئەو وشانەدا ئەگەڕێ کە لە بنەڕەتا بە(ث - ذ - ص - ض - ط - ظ)

نووسراون و، پاشان گۆڕدراون بە(سین) و بە(ز) و بە(تێ)، ئەو حەلە وشەکان لە هیچ فەرهەنگێکا نادۆزنەوە و، نایشزانن کە ئەمانە لە بنەڕەتا لە عەرەبی یا فارسی یا تورکییەوە هاتوون، کە بچین لەوێ بەدوایانا بگەڕێین و سەرگەردان ئەبن... ئەو حەلە هەروەکو ئەمڕۆ کە من نەفرین ئەکەم لەوانەی وشەی مێژوویییان لێ گۆڕیوین، ئەوانیش نەفرین ئەکەن لەم نیوچە خوێندەوارانە.

## موزیک

بیستیارانی خۆشەویست، ببورن من لام وابوو لە باسی (بروگرد) بۆ پەراوێز... کتێبی ئاثاری باستانی لە لاپەڕە ٦٤٤دا ئەڵێت: ئەبولعەبباسی سەففاح کە یەکەمین پۆست نشینی عەبباسی بوو، سەلمانی عەبباسی مامی خۆی کردبوو بەوالیی بەسرە. ئەویش ناردی ئەبو تەمام کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن کوڕی ئەحمەد کوڕی حەمدانی سەیەریی کرد بەفەرماندەی بروجورد.

یاقوتی حەمەویش لە (موعجیم البولدان)دا ئەڵێت: (بروجور ناوی شارێکە لە ناوەندی هەمەدان و کەرەجدا، لە سەرەتا شار نەبووە، گەورە دێیەک بووە پاشان (حەمولە) وەزیری بنەماڵەی (ئەبو دولەف)ی کورد کردییە مەڵبەند و جێگای خۆی و بەم جۆرە پەرەی سەند و ئەمڕۆکە شارێکە قەڵادار و، بەپیت و بڕشت. میوە لەوێوە ئەچێت بۆ (کەرەج) و شارەکانی تری. شارەکە بەدرێژایی نیو فەرسەنگ جێی داگرتووە، مزگەوتەکەی زۆر گرنگە، بنەماڵە زاناکانی ئەوێ زۆر بەناوبانگن، یەکێ لەوان ئەبولفەزل کوڕی محەمەد هیبەتوڵلا بروجوردییە...

موستەوفی قەزوینیش لە (نوزهەت القلوب)دا دەڵێ: بروجورد ئەکەوێتە ئیقلیمی چوارەمی جوغرافیایی، شارێکی گەورەی درێژە کەوتووە، دوو مزگەوتی تیایە یەکێکیان کۆنە، ئەویتریان تازەیە، ئاووهەوای ناوەنجییە، شەرابی باشی هەیە و، زەعفەرانی زۆرە.

زەفەرنامەی تەیمووریش لە لاپەڕە ٢٢٨دا ئەڵێ: ساڵی ٧٨٨ ئەمیر تەیمووری ساحێبقڕان کە ڕووی کردە خاکی ئێران هەموو سەران و سەردارانی ناوخۆ سەریان بۆ دانەواند، جگە لە مەلیک عیزەدین فەرمانڕەوای لوڕستان... لەبەرئەوە دەستووری دا وەروجورد و دەوروبەریان هەموو تاڵان کرد و کوردەکانیان قەڵاچۆ کرد و زۆریشیان لە لووتکەی چیاکان و لە هەڵدێرگەکانەوە غل کردە خوارەوە. پاشان لە لاپەڕە ٤٢٠ دا ئەڵێ: ئەمیر تەیمووری مەزن خۆی ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەبیعی دووەم کە ڕۆژی هەینی بوو، بەڕۆژی بەختیاری ئەزانی

و له بروجورد لەشکربەزی کردووه، له چەند لاوه لەشکری نارد بۆ سەر مەلیک عیزەدین بەڵام دەستی نەکەوت، ئەو خۆی له قەڵای (مانگره)دا قایم کردبوو، پاشان ڕووی کردبووه نوشتەر ئنجا ئەمیر تەیموور، کابرایەکی (سەیفودین قوڵداش) ناوی کرد بەفەرمانڕەوای لوڕستان.

موزیک

محەممەد ئەمین گوڵستانەش له زۆر جێگەی کتێبەکەیا ناوی بروجوردی بردووه ئەڵێت: له ساڵانی ۱۱٤۲ بەدواوه که نادر شا خەریک بوو لەگەڵ سپای ئەفغاندا بەرەنگاری دەکرد، عوسمان پاشای سەرداری عوسمانی هەلی بەدەست هێنا. عێراقی عەجەمی داگیرکرد، نادر شا که بەمەی زانی زۆر بەپەله خۆی گەیانده بروجورد و لەوێوه ڕووی کرده نەهاوەند... هەرکه عوسمان پاشا بەم هەواڵەی زانی ترسی لێ نیشت و بەپەله گەڕایەوه بەرەو هەمەدان. پاش مردنی نادر شا کابرایەکی کائیدکەلب عەلی خان ناو له دەوروبەری بروجورد ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد و، هێزێکی ده هەزار کەسی پێکەوەنا، بەڵام ئیبراهیم شا فەرمانی دایه (سەلیم خانی ئەفشار)ی قرقلویی بچێته سەری و شۆڕشەکەی دامرکێنێ، ڕۆیشت و کەوتنه شەڕەوه و، پاش بەیەکادانێکی دوور و درێژ گوللەیەکی وێل دای لەسەر سنگی کائیدکەلب عەلی خان و له خوێنا گەوزاندییەوه و کوشتی. پاش ناوایێ ئەم بروجورده درا بەکابرایەکی زەکەریا ناو، پاشان که کەریم خانی زەند کەوته وڵاتگیری، ئەم زەکەریا خانه لەگەڵی کەوته شەڕەوه، بەڵام زۆری پێ نەچوو ڕێک کەوتن و لەوەدوا سەردارانی زەند بروجوردیان داگیرکردووه و دژی ئازاد خانی ئەفغان کەوتنه شەڕ و تەنینەوه و پێشکەوتن.

بولدانی ناصریش ئەڵێت: ساڵی ۱۲۷۰ لەلایەن شاهی قاجارەوه ئیعتماد السەلتەنه کرا بەفەرمانڕەوای هەرێمی عەرەبستان و خوزستان بروجورد لەو کاتەدا شارێکی نیوچه وێرانه بوو لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا مزگەوته بەناوبانگەکەی و شورەکەی و خەنەکەکەی دەوری هەر مابوو.

ئەمیر شەرەفخان ناوی بروجوردی نەبردووه، وا دیاره لەو حەلەدا وێرانەتر بووه: پاشان ژاک دومورگان له ٦ حوزەیرانی ساڵی ۱۸۹۱دا تا ۱۲ تەموز بەو ناوەدا گەڕاوه ئەڵێت: (ئەگەر سەرنجێکی کەمی خانووبەرەکانی بروجورد بدەین بۆمان دەرنەکەوێ ئەم شاره زۆر کۆن نییه، لەگەڵ ئەوەشدا که دانیشتوان لایان وایه له حەلی ساسانیدا بووه، ئێسته سەرژمێری ناگاته ۲۵ هەزار کەس بەڵام شارێکی خاوێن و پاکه، دەوروبەری هەموو باغه،

بازێرێکی گەورەی هەیە کاروانسەرا و پۆستخانەشی هەیە، لەمەوبەر گونگەرە و بارووی هەبووە ئەمڕۆکە رووخاوە، یەکێ لە دێیەکانی ناوی (بەحرەین)ە، ئەم ناوە عەرەبییە، وا دیارە لە کاتی خۆیا رووبارەکانی مەلایر و نەهاوەند و بروجورد، هەرسێکیان پەنگێنراونەوە و بوون بەزەریاچە، بۆیە عەرەب پێیان وتووە (بەحرەین)... جگە لە لوڕەکان کوردی تریش لەو ناوە زۆرن. قسەکانی ژاک دومورگان تەواوبوو.

ئەمڕۆکە شاری بروجورد شارستانێکی سەر بەفەرمانداریی گشتی لوڕستانی پێشکۆیە، سێ بەشی هەیە: یەکەم دەوروبەری، دووەم دووروو، سێیەم ئوشترنیان، سنووریشی بەم جۆرەیە: لای ژووری واتا باکوری سنووری شارستانەکانی مەلایر و نەهاوەندە، لای خۆرهەلاتی سنووری شارستانەکانی ئەراک و ئەلیگودەرزە، لای خۆرئاوای سنووری شارستانی خوڕەم ئاوایە، ناوچەی فەرمانداریییە لە خوڕەم ئاوا و ١١٤ کیلۆمەتر و لە تارانەوە ٣٩٤ کیلۆمەتر دوورە، شوێنی شارەکە بەپاڵ چیاوەیە بۆیە پێی ئەڵێن بەروگرد، لووتکەی چیاکانی دەوروبەری بەرزن، تەنانەت کێوی گرو ٤٢٠٠ مەتر بەرزە، رووبارەکانی باغ شا و قەلا کەرەم و نائی زەویی ئەوێ ئاو ئەدەن.

سەرژمێری ئەو ناوە بەپێی ساڵی ١٣٤٥ (١٧٥،٨١١) کەس بووە. لە بروجورد و بەخشەکانیدا شەش قوتابخانەی ناوەنجی، ٣٠ قوتابخانەی بەرایی، ٩٠ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە، ٢ نەخۆشخانە، ٩ دەرمانگا، ١١ داروخانەی هەیە، چوار مزگەوت، ٤٣ گەرماو، ٣ سینەما، ٧٠ خۆراکخانە، ٨٥ چاخانەی هەیە، ٤ هوتێل و ١٥ میوانخانەی تیایە، ئاوی لولەیە، کارەبا و بەرقی تیایە، لەگەڵ پۆست و تەلگراف و تەلیفۆن. خەڵقی ئەو ناوە خێوی مێگەل و کشتوکاڵن، بەرهەمیان جۆ، گەنم، چەوەندەری شەکر، ترێ، گوێز، بادام و میوەی ترە. کردەی دەسیان مافوور، جاجم، بەرە و، دەوار و شتی ترە، رچی ئاینییان جەعفەرییە، زبانیان کوردیی لوڕییە و، ئەمە وەها و تا وتاری ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/١/٦

٦/ نەورۆز/٢٦٧٣

وتاری: ١٤

# بەهار

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش!

کامەرانیتان هیوای ڕادیۆی کوردیی ئێرانە، ئەمشەو باسی بەهارتان بۆ دەکەین، تکام وایە سوودی لێ وەربگرن.

موزیک

بەهار وا دیارە لە پێشا ناوەکەی کوردیەکی پەتی بووە، (جامیع التەواریخی ڕەشیدی) لە لاپەڕە ٦٠٦دا ناوەکەی بەشێوەی گۆرانی و لوڕی بەواو نووسیوە، جا (وەهار) ناوی شارێکی کۆنە نزیک بەهەمەدان، ئەمڕۆکە گەورە دێی بەهار جێی گرتۆتەوە... ئەو شارە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا یەکێ بووە لە شارە ناسراوەکانی کوردستان، مستەوفی قەزوینی لە لاپەڕە ١٢٧ی (نوزهەت القلوب)دا لە باسی کوردستانا ئەڵێت: بەهار قەڵایەکە لە سەردەمی سلێمان شاه ئیوەی ئەمیری کوردستانا پایتەختی وڵاتەکەی بووە. ئەمە وەها و هۆی ناونرانی ئەم جێیە بە بەهار دەبێ لەبەر خۆشی و سازگاریی ئاووهەوای ئەوێ بووبێت، کە خەڵقی لەتاو تەوژمی ساردی هەمەدان ئەوێیان بە بەهار دابێتە قەڵەم، بەڵام زۆر سەیرە کە تیمسار ڕەزم ئارا لە فەرهەنگی جوغرافیاکەیا و غولام حوسێن موساحیبیش لە دائیرەت المەعاریفەکەیا، وایان داوەتە بەر داس کە هۆی ناونرانی بە بەهار ئەوەیە کە شا ئیسماعیلی سەفەوی لە ساڵی ٩١٤ی کۆچیدا ئەو شارەی ئاوەدان کردۆتەوە و، عێلی (بەهارلو)ی تیا داناوە و، ناوی بووە بە بەهار... و دەبێ ڕاست و ڕەوان دان بەوە بنێم کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و، بەداخەوە هیچ کامیان ئەوەندە خۆی ماندوو نەکردووە کە سەرنجێکی مێژووی وڵاتەکەی بدات... ناوی بەهار وەیا وەهار سێ سەد ساڵ لەوەپێشتر لە (نوزهەت القلوب) و (تەئریخی گوزیدە) و (جامیع التەواریخ)دا، بەڵکو لە دەیان کتێبی تەئریخی عەرەبیشا تۆمار کراوە... بابێینە سەر باسی ئەم سلێمان شا ئەیوەیە کە کێ بووە؟ بەداخەوە مێژوونووسان دەربارەی ئەم کابرایە زۆر بەهەڵەدا چوون! بۆ نموونە گوێ بدەنە ئەم هەڵانە. خۆرهەڵاتناسی بەناوبانگ لیسترنج کە کتێبی (سەر زەوییەکانی پۆست نشینێتیی خۆرهەڵاتی)دا کە لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوە بەعەرەبی و بەفارسی، لە باسی بەهارا

ئەڵێت: لە نیوەی سەدەی شەشەمی کۆچیدا سوڵتان سەنجەری سەلجووقی بەشی لای خۆرئاوای وڵاتی چیای - کە عەرەب ناویان نابوو (بیلاد الجەبەل) دابڕی لە کرمنشاە و ناوی نا (کوردستان) و، سلێمان شای برازای خۆی کرد بەفەرمانڕەوای، ئەم سلێمان شا ئەیوە هەر ئەو سلێمان شایەیە کە لە نێوانی ٥٥٤-٥٥٦دا لە جێی مامی کرا بەسەرۆکی بنەماڵەی سەلجووقی و بەپادشای عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم... ئەمە بوو قسەکانی لیسترنج، ئەبێ ڕەک و ڕاست دان بەوەدا بنێم کە (لیسترنج) بەهەڵەدا چووە، سلێمان پاشای سەلجووقی و سلێمان شا ئەیوە هەرگیز یەک نین، ئەوی پێشوو تورک و سەلجووقی و برازای سوڵتان سەنجەرە کوڕی محەمەد کوڕی مەلەکشای سەلجووقییە و، ئەوی بەهار سلێمان شای کورد کوڕی پەرچەم لە تیرەی ئەیوانییە... هەروەکو لە باسی (ئەیوان خانەقین)دا ڕابرد...

سلێمان شای سەلجووقی لە دەورانی سوڵتان سەنجەری مامی داوە لە دەورانی (سوڵتان مەحموود) و (سوڵتان توغرول)دا ناوێکی نەبووە، پاشان لە دەورانی مەسعودی برایا ویستی بەیارمەتی برازاکانی خۆی و بەپشتیوانی سەردارانی لوڕستان و خوزستان و ئەسفەهان شۆڕش بکات بەڵام (سوڵتان مەسعود) زرنگ بوو زوو فەرمانی دا بەسپاکەی: لە هەموو لاوە گەمارۆیان دا، گرتیان و خستیانە زیندانەوە... پاش ئەوە بەماوەیە لە زیندان ڕزگار بوو. ساڵی ٥٥٤ی کۆچی کە سوڵتان محەمەدی کوڕی مەلەکشا مرد لەبەرئەوەی سلێمان شا گەورە تەمەنی بنەماڵەکە بوو (موقتەفی بیللاە) کردی بەسوڵتان و نازناوی (مەلیک موعیزالدین ئەبولحاریث)ی دایێ بەڵام برازاکانی لێی ڕاپەڕین و گرتیان و لە قەڵای (عەلاء الدولە) لە هەمەدان توندیان و لەو زیندانەدا مرد.

بەڵام (سلێمان شا کوڕی پەرچەم ئەیوانی) لە ڕەگەزی کورد بوو، باوک و باپیرانی هەموو ئەمیری کوردستان بووبوون، قەڵەمڕەوی ژێردەستیان بەپێی (جامیع التەواریخ) لاپەڕە ٣٤٩ پێی ئەوترا وڵاتی پەرچەم. ئەم کابرایە ئەوەندە بەدەسەڵات بوو کە ناسرەدینولڵا عەبباسی بردی بۆ بەغدا و کردی بەسەرۆکی ئەو هێزەی لە تورکمانەکان پێک هاتبوو لە سەردەمی موعتەصیم بیللاهدا، لەو گەنجانەی تورک کە بەدیل گیرابوون، وەیا بەپول کڕابوون... (ناسرەدینولڵا) نازناوی (شیهاب الدین)ی بەخشی بەم (سلێمان شا)ە، پاش ماوەیەک ڕقی لێ هەستا و لە سەرۆکی هێزەکە لای دا... برا بچووکەکەی لە جێی دانا.

سلێـمـان شـا ئەیـوانی بۆ بەهێـزکـردنی خۆی و پشـت قـایم بوون یەکـێک لە خوشکەکـانی خۆی دایە ئەمیر شەرەفەدین ئەبوبەکری سەرداری لورستانی بچووک... کە ئەو کوژرا، دای بەعـیـزەدین گرشـاسـفی برای... جگە لەوە کـە سـوڵـتـان جەلالەدین خوارەزم شـا لە ٦٢١دا ڕووی کردە ئوسـتـەر واتا (شوش)، سلێـمان شا ئیوە چوو بەپیرییەوە و، خوشکەکەی خۆیی داپێ. وا دیارە ئەم کـارەی بووە هۆی ڕق هەسـتـانی (ناسـرەدینوڵڵای عـەبـبـاسـی) و لە سەرداری لایدا، بەڵام پاشـان کـە هۆلاکـۆ کـەوتە وڵاتگیـری و پەرەپێـدان بەقـەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتی و خـەریک بـوو شاڵاو بکاتە سـەر بەغـدا لەم سـەردەمـەدا (مـوعـتـەصـیم بیللا عەببـاسـی سلێـمـان شـای گـەیاندەوە و بردی بەڕیزی (مـوجاهیـدالدین واتا سالارسـپـاه) و پایەی مـوئەیدەدین عـەلقـەمی سـەرەک وەزیر، بەڵام هەروەکو مـەحـویی هەسـتـیـاری مـەزنی کورد ئەڵێت:

فـەلەک هەرگـا کـەسـێکی هەڵبـڕی وەعـدەی هیـلاکـەتیـە
کە مل بۆ گەینە پەت بێتن لە کورسی و ئەسکەمل چی بکا؟

هۆلاکۆ لە هەمـەدانەوە پەیامی نارد کە پۆستنشین سێ کەس بنێرێت: ١- سلێمان شا. ٢- مجاهیـدەدین سپاه سالار. ٣- موئەیدەدین عەلقـەمی سەرەک وەزیر... بەڵام پۆستنشین بەخۆیا نازی گوێی نەدا، لای وەها بوو پشتی قاییمە، بەڵام لەبەرئەوەی گەنجینەی وڵاتی بۆ خۆی تەرخان کردبوو، فـەرمـاندە و سـەرۆکانی وڵات هەموو ڕقـیـان لێ بوو،... پاش ئەوە چەند جارێ لەگەڵ هۆلاکۆ نامە و فرستادەی گۆڕییەوە... هۆلاکۆ سـەرئەنجام بڕیاری لەسەر داگیرکردنی بەغدا دا و، لێشاوی سپای مـەغۆل و تاتار بەرەو بەغدا کشا و بەغدا داگیر کرا، هۆلاکۆ ئەم سلێمان شاهە و ٧٠٠ کەسی لە خوێشاوەندان و دەس و پێوەندانی کوشت و لاشـەکـانیـانی نارد بۆ فـەرمـاندەی مـووسڵ کـە لەوێ بۆ چاو شکـاندنی کـوردەکـانی تر هەڵیانواسن، پاش ئەم کارەساتە بەدرەدین مەسعـودی کوڕی بەدر کوڕی نورەدین مـحەمـەدی سەرداری لوڕی بچووک) کە لەوەپێش (حیـسامەدین خەلیل)ی برای بەدەستی سلێمان شا کـوژرابوو، هەسـتـا چووە بەغـدا داوای لە هۆلاکـۆ کـرد مـاڵ و منـاڵی (سلێـمـان شـا)ی پێ بسـپـێـرێ ئەویش پێی سپـارد و، هەمـوویانی هێنایەوە لوڕسـتـان ئەمـە گـەواهێکە لەسـەر ئەوەی سلێمان شا کوردی لوڕ بووە. جگە لەمانە موعینەدین نەتەنزی خاوەنی مونتەخەب التـەواریخ ئەڵێ: کـە حیـسـامـەدین خـەلیل لەلایەن سلێـمـان شـاهەوە کـوژرا، بەدرەدین مـەسـعـوودی برای ڕووی کردە پایتـەختـی هۆلاکۆ لە وڵاتی خەتا... و لە سـاڵی ٦٤٠ەوە تا ساڵی ٦٥٦ هەر لای هۆلاکۆ بوو و، خۆی لەشکری لە هۆلاکۆ وەرگرت و شاڵاوی کردە سەر

سلێمان شا و له خوێنی بەدرەدینی برایا کوشتی و ماڵ و منداڵی بەئەسیر برد و، ژنەکانی بەسەر سەرانی لوڕا دابەش کرد...

زانای بەڕێز میرزا محەمەد قەزوینی تەنیا مێژوونووسێکە دیاردی بۆ ئەوە کردووە، کە نابێ سلێمان شاهی خاوەنی بەهار و سلێمان پەرچەمی ئیواقی تورک یەک بن، وا دیارە قسەکانی خاوەنی تەئریخی شوانکارەی بەرچاو کەوتووە.

مامۆستا ڕەشید یاسمی ئەڵێ: کە مەغۆل وڵاتی ئێرانیان داگیرکرد شاری بەهار درایە مەلیک کوڕی تودان باوکی ئەمیر چوپان بەڵام بەداخەوە دیاردی بۆ سەرچاوەی باسەکەی نەکردووە. بەهاری ئەمرۆ ناوچەی بەخشی (سیمیەزود)ی سەر بەفەرمانداریی گشتیی هەمەدانە... ئەکەوێتە باکوری خۆرئاوای هەمەدانەوە، ١٤ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، ٦ کیلۆمەتریش لە ژوور شەقامی هەمەدان - کرماشانەوەیە، ١٨٨٥ مەتر لە ڕووی زەریاوە بەرزترە، لە دەشتێکی پان و پۆڕایە، لای خوار و ژووری هەموو باغات و میوەی ترێیە، کشتوکاڵی زۆرە تەنانەت بۆ سەوزەی هاوینە و بەهارە. چیمەنی (ئەندچین) ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتییەوە، خان و مانی شارەکە لە خشت و قوڕ دروست کراوە و، پێنج گەڕەکی هەیە: (ئاق دەزوازە- قەڵا- مەحەلەی شار- تەپەکان- حوسێن بابا) سێ کارێزیشی تیایە (تازە کارێز- سەر ئەشکاف- مەیان ئاوایی) جگە لەم کارێزانە کە باغ و باغاتی شارەکە ئاو ئەدات لە هەموو حەوشێکا چاڵاو هەیە، ئاوی ژێر زەوی زۆر نزیکە، دانیشتوانی بەهار ١٢ هەزار کەسن. ئەم شارۆلکەیە ئەمرۆکە جگە لە تەپەکان شوێنەواری کۆنی تری نەماوە، ئەمرۆکە قوتابخانەی بەرایی، ناوەنجی تیایە، سینەما و گەرماوی هەیە، دەرمانگا و شتی تری تیایە، خەڵقەکەی بەشی زۆریان تورکی ئازەرین کە لەم دواییەدا کۆچ پێ کراونە ئەوێ، بەشێکیشیان لوڕ و گۆرانی کۆنن. ڕچی ئایینییان شیعەیەتی و کاکەیییە.

گوێگرانی خۆشەویست تا بەرنامەیەکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/١/١٥

وتاری: ١٥

## بۆکان

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش!

بەختیاری و سەرفرازیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە، هۆی شادیمانە کە ئەمشەو بتوانین باسی (بۆکان)تان بۆ بکەین.

موزیک

بۆکان، ناوی شارۆلکەیەکە لە قوڵی موکریانی سەر بەفەرمانداریی مەهاباد، لە ئوستانی ئازەربایجانی خۆرئاوایی، ناوی شاری بۆکان وەکو من گومان ئەکەم گەلوشەی -واتا جەمعی- بۆکەیە، کە لە هەندێ شێوەی کوردییا بۆ مەزن و پیاوماقووڵ بەکار ئەبرێت و ئەبێژرێ: (بۆکە بۆکەکانی تیرە و عێلەکان هاتن) و بەدووریشی نازانم کە تێهەڵکێش بێ لە دوو وشەی (بۆ) و (کان) و لەبەرئەوە بێ کە کانی و حەوزەکەی چەواوێکی نەوتینی بەسەرەوە بووبێ و، ئەم ناوەی بەسەرا بڕا بێت. جگە لەمانە ئەگەر باوەڕ بەوە بکەین کە بنەماڵەی (دیبوکری) لە دەوروبەری دیاربەکرەوە هاتوون، دەبێ ناوی بۆکان لە ناوی قەڵای بۆکەوە هاتبێت کە یەکێ بووە لە دژە زۆر سەختەکانی تیرە و عێلەکانی (میللی)ی هەرێمی ماردینی سەر بەدیاربەکر، چونکە وەکو (تەئریخی جەودەت) بۆمان ئەگێڕێتەوە دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری دابوو کاروباری عێلەکانی میللی ببەستێ بەبەغدا و بەو دوورییە... نەوەک بەدیاربەکرەوە بەو نزیکییە... جا تەیموور خان پاشای میللیی لەم کارە قەشمەری ئامێزەی دەوڵەتی عوسمانی تووڕە بوو، شۆڕشێکی سەختی هەڵگیرساند و، پاش ئەوەی کە شکستی خوارد، ئەو وڵاتەی بەجێ هێشت و، بەتیرە و عێلەکانی ژێر دەستییەوە ڕووی کردە حەلەب و هەروەکو ئەیزانین لە سەردەمی شاهەنشایی بنەماڵەی (پەهلەوی) شا هەندێ لەو عێلانە هاتوونە هەرێمی (ماکۆ) و کەناری ڕووباری ئەرەس و تا ئێستە کۆچەرین وەکو (شێخکانلو - دودکانلو - دەللانی) و چەند تیرەی تری... بەڵام ئێمە لە سەرچاوە مێژووییەکان ناوی عێلی دیبوکریمان لە بەشی تورکیادا بەرچاو نەکەوتووە، ئەمە وەها بەڵام خەڵقی دەوروبەری بۆکان وا ئەدەنە قەڵەم کە ناوەکە بۆکان نییە، بەواوی کراوە (بووکان)ە بەواوی وشراو، لە وشەی (بووک)ەوە هاتووە کە دیاردییە

بۆ جوانیی و ڕازاوەیی ئەو ئافرەتانەی کە هەمیشە لەسەر کانی و حەوزەکەی بۆکان وەکو بووک بینراون... حەمە ڕەزا خەلیلی عێراقیش لە یاداشتەکانیدا باوەڕی بەم قسانە کردووە و ناوی حەوزەکەی بۆکانیان ناوە (چەشمە عەروس)، هەروا هەژاری هەستیاری کوردیش لە پارچە هەڵبەستێکا ئەم بیروباوەڕەی پاڵپشت کردووە... بەڵام من لام وایە ئەم قسانە لە ڕاستییەوە دوورن. بۆکان لەناو کوردەواریدا هەر بەواوی کراوە بیستراوە، جگە لەوەش ئەو حەلە کە دێیەکی بچووک بووە و، نەبووە بەشارۆلکە، هەر ئەم ناوەی بووە... دەبێ ئەم ناوە هی پێش دامەزرانی بێ.

## موزیک

تەنیا مێژوونووسی کورد کە ناوی (بۆکان)ی بردبێ، وەکو بێتە بیرما، بەهەشتیی حوسێن حوزنی موکریانییە لە کتێبی (ئاتروپاتێن) وەیا (کوردستانی موکریان)دا کە لێرە بەداخەوە ڕوونووسی دەست ناکەوێ - لەبەرئەوە ناچارم بەم هەواڵانە وازبێنم. (ناسیخ التەواریخی قاجاریە) لە لاپەڕەکانی ٣٥٨ بەرگی سێیەم و ٣٥٢ بەرگی چوارەمدا باسی سەردارێکی کوردی موکریان دەکات کە ناوی عەزیز خان بووە ئەڵێت: میرزا تەقی خانی ئەمیر نیزام -و مەبەستی ئەمیر کە بیرە- کە بوو بەوەزیری نیزام لە سەردەمی محەمەد شای قاجاردا، لەبەرئەوەی کە عەزیز خانی موکری دۆستی بوو لای شا کەوتە هەڵنان و پیاهەڵگوتنی: کە سوارچاک، دلێر، جوامێر، دەسەڵات و ژیرە... بەم جۆرە و بەداخوازی میرزا نەزەر عەلی خانی حەکیم باشی، عەزیز خان کرا بەسەرهەنگی غەیرەسپایی و دانرا بەفەرماندەی تیپی فارس لە شیراز و، لەوێ مایەوە تا کۆچی دوایی (محەمەد شای قاجار). ساڵی ١٢٦٤ کە ناسرەدین شاهی قاجار لەسەر تەخت دانیشت و، میرزا تەقی خان کردی بەسەرەک وەزیر... ئەم عەزیز خانە کرا بەئاجودان باشی شا -واتا سەر یاوەران- و لە پاشان کرا بەسەردار سپای گشتیی ئێران و چوو بۆ لای جێگرەوەی نیکولای قەیراڵی ڕووس، کە هاتبووە سەر سنووری ئێران بۆ ئەوەی خێراتنی لێ بکات و هەندێ ڕاسپێریی شای پسێ ڕابگەینێ... عەزیز خان کە چوو بۆ ئەم سەفەرە لە ڕێیا پشێوئەی محەمەد عەلی بابیش لە زەنجان دامرکان. ساڵی ١٢٦٨ کە ئەمیر تەقی خان لە سەرەک وەزیری لادرا، عەزیز خان ویستی تاران بەجێ بهێڵێ، ناسرەدین تێگەیشت کە بیری وایە شۆڕش هەڵگیرسێنێ لەبەرئەوە لە سپاسالاری دەری کرد، ئەویش باروبنەکەی خۆیەوە پێچایەوە و، گەڕایەوە بۆ سەردەشت کە نیشتمانی خۆی و هی عێلی موکری بوو و، لەوێ بەگۆشەگیری دانیشت، وەلێ ناسرەدین شا بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە مۆچەیەکی باشی بۆ خۆی و برازاکەی

بڕییەوە. ئەمە وەها و بەداخەوە سپهری دانەری (ناسیخ التەواریخ) ناوی برازاکەی نەبردووە، هەروا ناوی بۆکانیشی نەبردووە و، سەردەشتی وتووە. دەبێ ئەو سەردەمە بۆکان سەر بەسەردەشت بووبێ نەوەک مەهاباد.

## موزیک

جگە لەوەی وترا عەبباس پەروێز لە لاپەڕە ٣٦٨ی تەئریخی ٢٥٠٠ ساڵەیا ئەڵێت: ساڵی ١٢٦٨ عەزیز خان کرا بەسەرۆکی (دار الفنون)، با لە بیرمان نەچێ کە عەزیز خان زاوای ئەمیر کەبیر بوو، کچەکەی خواستبوو کە خوشکی ساعید الملک بوو، کە لە پاشان بوو بەفەرماندەی هێزی تۆپخانە... ئەمە وەها پاش چەند ساڵێ ناسرەدین شا لە دەرکردنی عەزیز خان پەشیمان بۆتەوە... واتا نامەیەکی بۆ نووسیوە: سەرەتاکەی بەم جۆرە بووە: (عەزیز ابیاتا عەزیزەت کونەم...) عەبباس ئیقبال لە کتێبی (ئەمیر کەبیر)دا لە لاپەڕەکانی ٣-٤-٣٧٦-٣٧٩ ئەم باسەی نووسیوە ئەڵێت: پاش دەرکرانی میرزا ئاغا خان لە سەرەک وەزیری، عەزیز خان هێنرایەوە سەر کار و، کرایەوە سەردار سپای گشتیی سپا و، بەپێشکاری موزەفەرەدین میرزای جێگرەوە، کە کرابوو بەوالی ئازەربایجان و، هەر لەو ساڵەدا چووە تەورێز و خەڵقی ئەو وڵاتەی لە گڕ و گێچەڵی میرزا فەزلوڵلا و میرزا مستەفای کوڕی ڕزگار کرد. بابێینە سەر باسی نووسەرانی خۆرهەڵاتناسی، بازیل نیکیتین لە لاپەڕە ١٤٤ی کتێبی (ئەلئەکراد)یا کە لە فەرەنسییەوە کراوە بەعەرەبی بەڵام چونکە وەرگێڕ شارەزای مێژووی کورد نەبووە هەڵەی زۆری تیا کردووە - لەو کتێبەدا ئەڵێت: عەزیز خان پیاوێکی مەزن بوو، دوژمنەکانی لای شا دووزمانیان کردبوو بەوە تاوانباریان کرد کە گۆیا بەدزییەوە لەگەڵ دەوڵەتی ڕووس ڕێک کەوتووە ویستویە هێزیان لێ وەربگرێ و کوردستان لە ئێران دابڕێ. لەسەر ئەوە لە سەردار سپایی دەریان کرد و، گەڕایەوە لە بۆکان دانیشت، لە تاران شەقامێ بەناوی ئەوەوە هەیە (مەبەستی نیکیتین چوار ڕێی عەزیز خانە) - جگە لەوەش ناوی سەرداریش هەر شوێنەواری ئەوە. ئەمە وەها و ژاک دومورگانیش لە ٣٠ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٩٠دا بۆکانی دیوە و لەگەڵ سەردار سەیفەدین خانی سەرداری موکریانا دۆست بووە و لە وێنە دەستکێشەکانی ئەو بۆ کتێبەکەی سوودی زۆر وەرگرتووە، پاشان لە یاداشتی ٢٠ نۆڤەمبەری هەمان ساڵا لە لاپەڕە ٤٠-٤٥ی کتێبی جوغرافیای خۆرئاوای ئێرانا ئەڵێت: (سەردار سەیفەدین خانی دۆستم کە لە تەمەنی حەوت ساڵانا بوو باوکی مردبوو، کە لە کاتی مردنیا فەرمانڕەوای ئازەربایجان بووبوو، دایکی هەموو سامان و داراتی پاشماوەی لەناوبرد بوو، لە هەشت سەد ئاوایی

(ڕەنگە هەڵە بێت و هەشت ئاوایی بێت) تەنیا بۆکانی بۆ مابوو، ئەم کوڕە بەهۆی دەست و پێوەندەکانییەوە -کە ئەمەگناس بوون- نرابووە بەر خوێندن و پێ گەیەنرا بوو و، لە سپای ئێرانا گەییبووە پایەی سەرتیپی و ئەوەی ڕاستی بێ پیاوێکی هوشیار و زرنگ بوو، جگە لە کوردی زمانەکانی فارسی، تورکی، عەرەبیی زۆر چاک ئەزانی، هەروا بەشی خۆی فەرەنسی و ئەڵمانیشی ئەزانی لەگەڵ ئینگلیزی. و لەو قوتابیانەی کە نێررابوون بۆ ئەوروپا بۆ خوێندن، لە هەموویان وردبینتر و ژیرتر بوو هەروا وێنەگری باشیش بوو... بەپایەی سەرتیپی کرابوو بەفەرماندەی موکری و لە تەمەنی ۲۹ ساڵیدا جوانەمەرگ بووبوو. بەڕاستی مەرگی ئەو بۆ ئێران زیانێکی زۆر گەورە بوو. لەم دواییەدا بیستم کە خانمەکەی ژارخواردی کردبوو، ئەو خانمەی کچی ئاغایەکی کورد بوو. خۆرهەڵاتناسی مەزنی ڕووسی مینورسکیش لە کتێبی (ئەلنەکراد) کە دوکتۆر مارف خەزنەدار وەری گێڕاوە بەعەرەبی لە لاپەڕە ٦٣دا ئەڵێت: ساڵی ۱۹۱۱ی زایینی سەرداری بۆکان بانگهێشتی کردین بچینە سەردانی. ئێمە خوڵکەکەی ئەومان زۆر بەشادییەوە قەبووڵ کرد و ڕۆیشتین، هەرکە لە شارۆلکەی بۆکان نزیک بووینەوە، هەر پێنج وردە جارێ دەستەیەک سوار ئەهات بەپیرمانەوە، پاشان کە نزیکی شار بووینەوە کوڕەکەی هات بۆ پێشوازیمان. کە گەیشتینە ناو شارۆلکەکە ئنجا خۆشی هاتە پیرمانەوە و، ئێمەیان برد لەناو باغچەکە لە کەناری ئەستێڵە جوانەکەی بۆکان (کە پێی دەوترێ حەوزی بۆکان) دایان بەزاندین، لەوێ چەند چادر و خێوەت بۆ ئێمە هەڵدرابوو. پاش بەخێرهاتن لێ کردنمان پێش خزمەت و دەست پێوەندان چاییان هێنا، چای لەسەر چای... پاشان میوەیان هێنا، میوەی جۆرجۆر جارێکی تریش چایی. ئنجا نیوەڕۆژە... پاش ئەوە دیسانەوە چایی، لەسەر سینیی پڵاوەکان دوو ماسیی زۆر زلیش سوورکرابوونەوە کە بەتایبەتی بۆ ئێمەیان ڕاو کردبوو و، ئەو ماوەیەی کە لەوێ بووین بەجۆرێکی هەمیشەیی ساز و سەمتور و گۆرانی گوێمانی نەوازش ئەدا و، مێشکمانی ئەبووژانەوە... بەداخەوە دەبێ دانی پیابنێم کە ساڵی۱۹۱٤ سپای عوسمانی تەورێزیان گرت ئەم سەردارەیان کوشت. ئەمە وەها و بەداخەوە مینورسکی ناوی ئەم سەردارەی بۆکانی نەبردووە... لام وایە مەبەستی حەمە حوسێن خانی کوڕی سەیفەدین خانە کە ئیبراهیم تبلیسی فەرماندەی تورک لە مەراغە تیرەبارانی کرد... گۆیا عەلی خانی کوڕیشی هەر لەوێ تیرەباران کراوە. ئەمە وەها و گوێگرانی خۆشەویست ئێمە لێرەدا کاتمان تەواو بوو تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

۱۳٥۱/۱/۲۳

## وتاری: ١٦

گوێگرانی بەڕێز شەوتان خۆش! کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە.

وەکو حەوتەی پێشوو بەڵێنمان دانێ ئەم حەوتەیەش لەسەر باسی مێژووی بۆکان ئەڕۆین. وەکو لە بیرتانە، حەوتەی پێشوو ڕوونمان کردەوە کە دەبێ ناوی بۆکان یا لە (بۆک)ەوە هاتبێت کە دەکاتە مەزن وەیا لە ناوی قەڵای بۆکەوە هاتبێت کە لەلای ماردینە وەیاخۆ لەوەوە هاتبێت کە کانییەکەی بۆکان چەوراوی نەوتی بەسەرەوە بۆ بێت و، بۆی (کان)ە نەوتی لێ هاتبێ، هەرچۆنی بێ، ئێمە ناوی چەند پیاوێکی مەزنی بۆکانمان برد وەکو عەزیز خانی سەردار، کە لە سەردەمی محەمەد شای قاجاردا فەرماندەی تیپی فارس بووە و، لە سەردەمی ناسرەدین شاهیشدا بووە بەسەر یاوەران (یاخۆ ئاجودان باشی) وەهەروا بووە بەسەرداری گشتیی سپاش و، بەسەرۆکی زانکۆی (دار الفنون)یش کە لەو حەلەدا بەرزترین قوتابخانەی ئێران بووە و، پاش لابرانی ئەمیر کەبیر لە سەرەک وەزیری ئەویش لە سالارسپایی دەرکرا و، پاشان هێنراوەتەوە سەر کار و کراوەتەوە سپاە سالاری هەرێمی ئازەربایجان و پێشکاری موزەفەرەدین میرزای والیی ئازەربایجان. هەروا ناوی (سەیفەدین خان)مان برد کە ژاک دومورگان لە کتێبەکەیا ناوی بردووە و، زۆر هەڵی ناوە و، گەرچی ئەو ناوی باوکی نەبردووە، بەلام وەکو بۆکانیەکان خۆیان دەڵێن کوڕی عەزیز خان بووە و، ئەویش بەپایەی سەرتیپی ماوەیەک فەرمانەدەی موکریان بووە. جگە لەوانەی وتمان، سەردار حەمە حوسێن خان-یشمان ناوبرد کە خۆی و عەلی خانی کوڕی ساڵی ١٩١٤ی زایینی لەلایەن فەرماندەی هێزی عوسمانییەوە، کە تەورێزی داگیرکردبوو گوللەباران کران...

موزیک

خۆرهەڵاتناسی مەزن ئەدوارد براون لە لاپەڕە ١٤٦ی کتێبی ئینقلابی ئێراندا کە ئەحمەدی پژوە وەری گێڕراوە بەفارسی ئەڵێت: ساڵی ١٩٠٧ی زایینی کە ئەکاتە ساڵی ١٢٨٥ی فارسی، محەمەد حوسێن خانی فەرمانڕەوای ساوجبلاغ -واتا مەهابادی ئێستە- تەلگرافێکی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەو حەلەی ئێران نارد، کە هێزی دەوڵەتی عوسمانی ئەو ناوەیان داگیرکردووە و، هەموو هەرێمە کوردەکانی خستۆتە ژێردەستی خۆی،

ئەمە وەها و محەممەد ڕەزا خەلیلی عێراقی ناوێکیش، کە پاش هەرای ئازەربایجان لەگەڵ سپادا بەناوی ڕۆژنامەگەری چووە موکریان، لە یاداشتەکانی خۆیا کە بەناوی (خاطیراتی سەفەری ئازەربایجان) نووسیویە. لە لاپەڕە ١٨٦دا ئەڵێت: دێکانی داشبەند - ئوچ تەپە - و شارۆلکەی بۆکان - دانیشتووەکانیان لە عێلی دێبوکرین و، ئەم عێلانە لە تیرەوە عیلەکانی تری موکریانی مەهاباد پتر لە شارستانییەوە نزیکن و، ژمارەی دانیشتوانی خودی شاری بۆکان ٤,٠٠٠ کەسن، ئیلخانییەکان لە هەلێکا ئەم شارۆلکەیان بە ٦٠٠ هەزار تومان کڕیوە، بەڵام ئەمڕۆکە دەسکەوت و دەرئامەدی ساڵانەی زۆر لەو نرخە پترە کە پێی کڕاوە، لەم شارۆلکەیەدا دوو گەرماو هەیە: یەکێکیان هی موسڵمانەکانە، بەتایبەتی و زۆر پیس و پۆخڵە، ئیلخانییەکان ڕۆژانە ئەیدەن بەکرێ بە ٦٣ تومان. گەرماوەکەی تری تەرخان کراوە بۆ ئەو سەد ماڵە جووەی لەوێن... بۆکان کانی و ئاوێکی هەیە لەناو چەشمەیێ هەڵئەقوڵێ کە لە بەرد تاشراوە، چوار سووچێکی درێژ کەوتووە، پێی ئەڵێن کانی بووکان، ئافرەتانی بۆکان بۆ ئاوبردن دێنە سەری. ئەوەی ڕاستی بێت ئافرەتانی بۆکان ئەوەندە جوانن کە مرۆڤ لە تەماشایان تێر نابێ تەنانەت چاوی جوانیان بێ وێنەیە. پیرەژن و پیرە پیاوەکانیشیان هەر چاویان جوانە، زۆر سەیرە ژنە جوولەکەکانی بۆکان پێچەوانەی ژنە جووی جیهان، کە دیمەنێکی تایبەتییان هەیە و زۆر جوانن. خاکەکەی بۆکان زۆر بەپیت و بڕشتە، لێرەوە دەغڵ و دانەوێڵە ئەنێررێ بۆ ئازەربایجان. ئەمە وەها و تیمسارڕەزم ئاراش لە فەرهەنگی جوغرافییەکەیا ئەڵێت: (بۆکان ناوی بەخشێکە لە سێ بەخشەکانی شارستانی مەهاباد، ئەکەوێتە سەر شەقامەڕێی میان دوواو - سەقز، لای باکوری خۆرئاوای ئەوێ سنووری بەخشەکانی ناوخۆی مەهابادە، لای خۆرهەڵاتیشی سنووری بەشی شاهین دژە، کە لە کاتی خۆیا پێی ئەوترا (صاین قەڵای هەوشار). باشووریشی -واتا خوارێ- سنووری بەخشی سەقزە. بەخشی بۆکان سێ دێهستانی هەیە: ١- ئاختاچیی بۆکان. ٢- بیهی. ٣- تورجان.

ئەم سێ بەخشە تێکڕا ١٤٠ دێیان هەیە و، سەرژمێریان لەگەڵ شاری بۆکاندا بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٣٠ فارسی ٤٢,٨٦٠ کەس بووە. گەورەترین ڕووباری بۆکان ناوی سیمینەروده -کە لە کۆنا پێی ئەوترا: ڕووباری تاتاهۆ، ئەمە وەها و لێرەدا دەبێ بڵێم: ئەوەی کە لەناو خەڵقا ماوە گۆیا: (تاتاهۆ) و (جەغاتو) بەناوی دوو کوڕی (جەنگیز خان) یا (هۆلاکۆ خان)ەوە ناونراون، ئەم باسە شتێکی درۆیە، نە جەنگیز بەم ناوانە کوڕی

هەبووە و نە هۆلاکۆ... بەڵکو هۆلاکۆ خۆی لە کەناری ڕووباری جەغاتو مردووە کە پێش ئەوە بەسەدەها ساڵ ئەو ناوە هەر هەبووە و ، ناوی تاتاهۆ ناوێکی کوردیی پەتییە ، لەوێوە هاتووە کە ئاوەکە بەتوندوتیژی خۆی (تاتە بەرد) هۆ ئەدا و ڕائەڕفێنێ.

مۆزیک

بۆکان، ئەمڕۆکە شارۆلکەیەکی جوانکیلەیە ، باغ و باغاتی زۆرە ، کشتوکاڵی بەبڕشتە ، ئاژەڵ و ماڵاتیان زۆرە ، توتن و چەوەندەری شەکر پێ ئەگەیەنن، لە شارۆلکە و دێهستانەکانا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەزانین زۆرە. هەروا چەند قوتابخانەی بەراییش هەیە. لەناو شاردا دوو قوتابخانەی ناوەنجیی کچانە و کوڕانەش هەیە... یەکێکیان لە قەڵاکەی سەردارایە و ، دوو نەخۆشخانەی تیایە ، پۆست و تەلگراف و تەلیفۆن و ئاوی لوولەکەش و ، کارە و بەرق و هەمەجۆرە بەڕێوەبەرایەتییەکی میری تیایە ، گەرماوە کۆنەکان، ئەمڕۆکە گۆڕاون بەسێ گەرماوی تازە خاوێنی ژمارەیی ، بازاڕۆڵکەیشی تیایە زۆر جێگەی دێرینەی تیایە کە ئەمڕۆکە لەژێردەستی بەڕێوەبەرایەتی دێرینەشناسی دایە. دوو مزگەوتی گەورە و چەند مزگەوتی بچووکی تیایە ، چەند شەقامی قیرکراوی هەیە. لە کۆنا قوتابخانەی ئاینی و مەلای چاکیش هەبووە هەم لە خودی بۆکان و هەم لە گەورە دێی تورجان و دێیەکانی ترا. عێل و تیرەکانی بۆکان ئەمانەن: (ئیلخانی - عەلیاری - قارەمانی - عەبباسی) کە بەپێی ئاماری میری ٤٧٠٠ خێزانن بەناوی دیبوکری بەناوبانگن. گۆیا لە وڵاتی دیاربەکرەوە هاتوون، بەڵام هەروەکو لە وتارەکەی ترا وتم: ئێمە لە کتێبە مێژوویییەکانا ناوێکی وەهامان لەناو کوردی تورکیادا نەدیوە ، جگە لەو عیلانەی وتمان لە هەرێمی بۆکاندا عیلی بەگزادە هەیە کە گەورەترین بەشیان تیرەی فەیزوڵڵا بەگییە ، دەبێ ئەم بەگزادانە لە بنەڕەتا لە مەرگە و پشدەرەوە هاتبن، یا لە تیرەی بەگزادەی هەماوەند بن ئەمە وەها و ڕچی ئاینیی خەڵقی بۆکان موسڵمانەتی و شافیعیتییە ، زمانیان کوردییە ، فارسی و تورکیش دەزانن، لێرەوە بەخواتان ئەسپێرین، بەرنامەکەمان دوایی هات، تا بەرنامەیەکی تری خواتان لەگەڵ، شەوتان باش.

١٩٧٢/٣/١٨

١٣٥١/١/٢٩

**وتاری: ١٧**

# بێتوش

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان خۆش، کامەرانیتان هیوای بەرنامەی کوردییە و، هۆی خۆشی و شادیمانە کە لە سەرەتادا پێتان ڕابگەیێنین کە ئەو نامە و نووسراوانەی ئەینێرن بۆ بەرنامەی کوردی ڕادیۆی ئێران، چ بەناونیشانی (کرماشان - ڕادیۆی کوردی ئێران) و یاخۆ بەناونیشانی (تاران - مەیدان ئەرک - بەشی کوردی - سازمانی ڕادیۆ و تەلویزیۆنی میللی ئێران)، ئەو نامانە هەمووی دەگاتە ئێمە... بۆ نموونە ئەمجارە کاک عەبدوڵلا خورشیدی خەڵقی شاری سنەی کوردستان نووسراوێکی بۆ بەرنامەی (وڵاتەکەت بناسە) هەناردبوو تیا دڵشادی خۆی دەربڕی بوو، بەرامبەر بەو بەرنامەیە و بەتانی ستاپیشا چووبوو ئێمە بەرامبەر بەوە زۆر سپاسی ئەکەین و، لە وەرامی پرسیارەکەیا ئەڵێین: بەرنامەی کوردی تەنا نییە بۆ ڕۆڵەکانی کوردی ئاری نژاد لە هەر گۆشەیەکی جیهانا بن، زانست و زانیاری و پێشکەوتوویی ئەو ڕۆڵە کوردانە، کە هاوکاریمان لەگەڵ دەکەن، هەمیشە سەرچاوەی سروشتی ئێمەیە، بەهەموو خۆشیەکەوە وەری ئەگرین و، ئەوەش ڕائەگەیینێ کە هەر کەس لەمەودوا نامەیەک بۆ ڕادیۆی کوردی بنووسێت چ ئەو نامەیە مێژوویی و جوغرافی و ئەدەبی بێت، وەیا زانستی و مافی و، چیرۆکی و شوێنەواری باو و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و مەتەڵۆک و گاڵتە و گەپ، وەیاخۆ پرسیار بێت لە بارەی ئاین و کاروباری کۆمەڵایەتییەوە ئەو نووسراوانە و، ئەو بەرنامانە لە پێشا ئەخرێنە پێش چاوی ئەنجوومەنی نووسەرانی ئەو جێیەی ئێستگەکەی تێدایە، پاش خوێندرانەوە و پەسەندکردنی ئەدرێت بەو بەرنامەیە کە بتوانی سوودی لێ وەربگرێ. ئەو حەلە یا بەناوی نووسەرەکە خۆیەوە بڵاوی بکاتەوە وەیاخۆ ناوی ببا و سپاسی لێ بکات. ئەمە وەها و ئەمشەو باسی (بێتوش)تان بۆ دەکەین.

موزیک

بێتوش: دێیەکی بچووکە سەر بەدێهستانی دولکانی هەرێمی ئالانی بەخشی سەردەشتی فەرماندارییی مەهابادی ئوستانی ئازەربایجانی خۆرئاوا... بێ گومان هەندێ لە ئێوە ناوی ئەم دێیەی بیستووە نەوەک لەبەرئەوەی کە بێتوش شوێنەوارێکی کۆن و

هەرێمێکی بەناوبانگ و ناسراوبووە... نەء... نەء... تەنیا لەبەرئەوە ناوبانگی دەرکردووە کە زایدگای بلیمەتی کوردی مەزن مەلا عەبدوللایە... کە لە ئەدەبی عەرەبیدا گەییوەتە پایەیێ حاجی قادری کۆیی، هەستیاری هێژای کورد دەربارەی ئەلێت: (وەکو بێتوشی شاعیری عەرەبی لە کوردا نەهاتووە و نەدەبێ) بەڵێ! نەوەک هەر لە کوردا، بەڵکو لە عەرەبیشدا، چونکە ئەوانەی تام و بۆی ئەدەبی عەرەبی دەزانن، ئەویان لەلا لە موتەنەبیی و بوحتەری کەمتر نەبووە، ناوبانگی بلیمەتیی ئەو، وەهای کردووە کە کورد و فارس و عەرەب هەموویان ناوی بێتوش بزانن، گەرچی ئەوێ دێیەکی بچووکی ٥٠ ماڵییە و، لە داوێنی چیاکانی ئالاندا شاراوەتەوە و، دووردەس و کەس پێ نەرەسە. لێرەدا ئەکەومەوە یادی هەڵبەستێکی تری حاجی قادری کۆیی کە دەربارەی شارەکەی خۆی وتوویە:

هەروەکو شارانی تر، خەڵق ئاشنای کۆیە نەبوون

شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵقی لەسەر کۆکردەوە

بەڵێ حاجی ڕاست دەفەرموویت: هۆی ناوبانگی شاران، شارۆلکە یان گەورە دێ یان، کوێرە ئاوایی یان تەنیا هونەری ئەو مرۆڤانەیە کە هی ئەوێن، هونەر بەهەموو مەبەستێکییەوە، کە مرۆڤایەتی بەرەوپێش ببات چ هەستیاری بێ؟ و هەست بزووێنێ... وەکو هەڵبەست و گۆرانی و مۆسیقا، یا دەمار بزووێنی وەک دلاوەری و جوامێری و هاوکاری تاد... بۆیە حاجی قادری کۆیی ئەڵێت:

شێیر و قەڵەم شەریکن لەم عەصرەدا دریغا

شێیرم قەڵەم تەراسە، کالانییە قەڵەمدان!

ئنجا با سەرنجێکی ئەو پارچە جوانە ئەدەبییە بدەین، کە بێتوشی دەربارەی دێیەکەی خۆی (بێتوش) بەپەخشان و بەهەڵبەست دایڕشتووە، ئێمە پەخشانەکەتان بۆ وەرئەگێڕینەوە سەر زمانی کوردی، بەڵام پارچە هەڵبەستەکەتان هەر بەعەرەبی بۆ دەخوێنینەوە کە گوێتان بەئەدەبی بەرزی عەرەبیی مەلایەکی کوردی لادێی، لە جیهانا کەم وێنە، ئاشنا ببێت... جا فەرموون گوێ بگرن ئەلێت: (بێتوش، دێیەکە لە دێیەکانی کوردەواری، زۆرە جەنگەڵ و باغ و داری، فت و فراوانە، میوە و تەڕە باری، جۆگەی ڕەوانە وەکو کانی ئاو و ڕووباری، خەم و خەفەت لەوێ نییە دیاری، زبان لە ستایشیا گەییوەتە بێزاری، هەوای خۆشی و، کەشی گەشی ئەڵێی لە بەهەشتەوە هاتووە بەدیاری، گەرچی من لە دووریی ئەو کەوتوومە خەم خواری، بەڵام لە پەسەندیا هۆنیومەتەوە گەوهەر و مرواری...

ألا حَيِّ بيتوشاً وَأكنافَها الّتی
يَكادُ يُرَوِّی الصّاديات سرابُها
مَرابعُ يُزری بآلعَبير رَغامُها
وَتَهزَأُ بآلظَّبيِ آلنَّفور كَعابُها
بلادُ بها حَلَّ آلشبابُ تَمائمي
وَأَوَّلُ أرضٍ مَسَّ جِلدي تُرابُها
لَقَدْ كانَ لي منها عَرينٌ وكانَ من
مُقامي لَها سُحبٌ سَكوبٌ رَبابُها
وَلَمْ تَنُب بي- إن يَنُبْ يَوماً بأهله
مَكانٌ وَلَمْ يَنعَقَ عَلَيَّ غُرابُها
وَلكِن دَعاني لإغترابيَ مَعْشَرٌ
غِياثٌ إذا الأهوالُ ماجَ عُبابُها
فَهاجَرتُها هَجرَ الحُسامِ قِرابَهُ
عَلَى رَغْمِها تَبْكی عَلَيَّ هضابُها
يَعِزُّ عَلَی الإنسانِ تَوديعُ نورِهِ
وَسُودِ جِعادٍ أنَّ تَنائی شبابُها

لەم هەڵبەستەدا تاکە هۆنراوەیەکی خواستراوەیە هی یەکێک لە هۆنەرانی عەرەبە و، ئەمەش بەشێکە لەو پارچە هەڵبەستەی دەربارەی دێیەکەی خۆی هۆنیوێتییەوە...

ئا ئێستە، بێ گومان زۆرتان ئەیەوێ بەسەرهاتی تەواوی (مەلا عەبدوڵلای بێتوشی) بزانێ، جا بۆتان ڕوون ئەکەینەوە: (مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عیزەدین بێتوشیی ئالانییە، لە تیرەی (خانخەلی). ئەم کوڕە لە بێتوش هاتۆتە جیهانەوە، لای باوکی قورئان و بەرایی زانین فێر بووە، لە تەمەنی ١٥ساڵیدا باوکی مردووە، لەگەڵ مەلا مەحموودی برا گەورەی چووەتە دێی (سەنجوێ) لای مەلا محەمەدی هەزارمێردی کە ناوبانگی بە(ئیبن الحاج) ڕۆیشتووە، خوێندوویانە، پاشان چووەتە لای سەبغەتوڵلا ئەفەندی حەیدەری لە دێی ماوەران کە سەبغەتوڵلا چووەتە بەغدا ئەویش چووەتە بەغدا. ئەڵێن خۆی و مەلا مەحموودی برای لە ماڵی دونیا تەنیا دوو کتێبی دەستنووسیان هەبووە: (ئیبن حەجەر)ێک و (قاموس)ێک

بۆ ئەوەی بژین، کتێبەکانیان کردۆتە بەر،، هەردووکیان فرۆشتوون... پاش ئەوە سەر بەرەو خوارەوە بوون بۆ کەناری زریەی فارس لە شارۆلکەی ئەحسا ء کە لەناو کوردەواریدا پێی ئەڵێن (حەسا). مەلا مەحموودی برای ئەبێ بەمامۆستا... وا دیارە ئەمە لە ساڵانی ١١٧٠ کۆچیدا رووی دابێ و، تا ساڵی ١١٧٨ لەوێ مابنەوە. پاشان خۆی و مەلا مەحموودی برای گەڕاونەوە بۆ کوردستان و، لە سەردەمی یوسف شێخەبەگی سەرداری بێتوشدا، لە ساڵانی ١١٨٠دا لە بێتوش بووە و، پاش ئەوە جارێکی تر خۆی بەتەنیا رووی کردۆتەوە عەرەبستان و، ماوەیەک لە ئەحسا ماوەتەوە و، ماوەیەکیش لە بەسرە. تەنانەت کاتێ کە لە ساڵی ١١٩٠دا سادق خانی زەند بەسرەی داگیرکردووە، ئەو لەوێ بووە. پاش ئەوە بێتوشی زۆر کتێبی تری بەهەڵبەست و بەپەخشان داناوە. ساڵی ١٢١١ کۆچی لە بەسرە بەر ئاکامی مەرگ کەوتووە و، خوابگای پیرۆزی لە شاری (زوبەیر)ی نزیکی بەسرەیە، لە گۆڕستانی شێخ حەسەنی بەسریدا.

موزیک

ئێوە گوێتان لە هەڵبەستی عەرەبیی بێتوشی بوو، ئەم تەنیا هەڵبەستە کوردییەش کە خوالێخۆشبووی باوکم لە کەناری سیپارەیەکا تۆماری کردووە هی ئەوە، من لە کاتی خۆیا لە گەلاوێژدا بلاوم کردبووەوە...

لە دیباچەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم
دەبینم مەبحەثی وەصفت لە هەر فەصلێ و لە هەر بابێ

هەروا بێتوشی لە ئەدەبی فارسیشا دەستێکی بالای هەبووە، ئەم هەڵبەستانە هی ئەوە

(خون مینا بەقدح ریز وبمن دەساقی
تا دگرخنەء بیجا بەحریفان نزند)
(تیر در معرض هجراست زآغوش وصال
خندە سوفار بەدلگیریٔ پیکان نزند)

لە تاکە هەڵبەستێکی تریدا ئەڵێت:

(محرا برا بگو کە زما دل تهی کند
خورشید روی ماە مرا چون زوال نیست)

بابێینە سەر باسی ئەمڕۆکەی بێتوش، دێیەکە سەر بەدێهستانی ئالان کە سەر بەبەخشی سەردەشتی فەرمانداریی مەهابادە، ١٥ کیلۆمەتر لە سەردەشتەوە دوورە، کەوتۆتە لاپالی

ڕیزه چیای نزیکی سنوور، ئاو و هەوای خۆشە، قوتابخانەیەک، مزگەوتێک و چەند دوکانێکی هەیە. مەلایەکی هەیە گوایە لە نەتەوەی بێتوشییە، گوایە قازیی ئەو ناوەشە. شێوێ بەناوەندی دێی بێتوشدا ڕائەبووری، کە ئەڕژێتە (زێ) و، ڕچی ئایینی خەڵقی ئەو ناوە شافیعییە، زمانیان کوردییە فارسیش ئەزانن، کار و پیشەیان کشاوەرزی دران دارییە، تەون و کردەی خۆماڵیشیان (بەڕە، مافوور، جاجم، گۆرەوی) و شتی ترە... دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و توتن و مازو و گەزوو و کەتیرەیە و، میوەی هەمەڕەنگ و، خوری و پێستە و شەقڵەداریش ئەنێرن بۆ بازاڕی ئەو ناوە. ئەمە وەها وا دیارە ناوی بێتوش تێ هەڵکێش بێ لە دوو وشە (بێ) و (توش)، لەوێ بێ یەکی توش هەبووبێ بەپاڵێکەوە خەڵق پێی نەگەیینێ، ئەمە وەها و تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٣/١٧

٢٦٧٣ ک

**وتاری: ١٨**

## بێجار

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش کامەرانیتان هیوای ئێمەیە... ئەم حەوتەیە باسی (بێجار)تان بۆ دەکەین.

موزیک

بێجار: ناوە بۆ هەرێم و بۆ شارۆلکەیەک، سەر بەئوستانی کوردستانی سنە. مێژووی ئەم هەرێمە زۆر کۆنە، گەلێک هەراوهۆریای دیوە، لە سەردەمی سەفەوییەکان (زۆرێن کەمەر) بەناوبانگترین جێی ئەم ناوچەیە بووە پاشان کە عێلی (گەروس) هاتوون و، جێی سیامەنسوورییەکانیان لەو ناوەدا گرتووە، ناوی هەرێمەکە بووە بە(گەڕوس). و لەم دواییەدا ناوی بێجاری بەسەرا براوە. (شەرەفنامە) لە باسی سەرداریتیی سەرۆکەکانی عێلی سیامەنسووردا ئەڵێت: شا تەهماسپی سەفەوی ساڵی ٩٦٠ کۆچی خەلیل بەگی دانا بەسەرداری عێلی سیامەنسوور، بەپایەی میری میران و کردی بەفەرماندەی هەموو کوردەکانی ئێران و، ٢٤ تیرە و عێلی کوردی بەسەرۆکانییەوە خستە ژێر فەرمانی ئەو و هەرێمەکانی (سولتانیە - زەنجان - ئەبهەر - زۆرین کەمەر)ی لەسەر مۆر کرد. بەڵام پاش ماوەیەک رقی لێ هەڵگرت و بەمەلاو بەولاوە تەرتە و وەرتەی کردن. پاش شا تەهماسپ ئنجا سولتان محەمەد خودابەندە پاشماوەی سیامەنسوورەکانی لەوێ کۆکردەوە و، دەوڵەتیار خانی کوڕی خەلیل بەگی کرد بەسەرداریان و، هەرێمەکانی زەرێن کەمەر - گرشەپی - سەجاس - زەنجان - صورلغ - قەیدا- شەیقات - ئەنگوران - قانجوقەی باڵا - قانجوقەی خواروو)ی خستە ژێردەستی. جگە لەمانەش شەرەفنانە ئەڵێت: ساڵی ٩٦٨ تەیموور خانی کوڕی سولتان عەلی خانی ئەردەڵانی خۆی دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی و، پشتی کردە سەفەوییەکان و، دەستی دایە تەنینەوە و، پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی: لەم لاوە زۆرێن کەمەری داگیرکرد و، لەولاوەشەوە کرماشان و هەمەدان... لەسەر ئەمە دەوڵەت سولتانی سیامەنسووری) هاواری بردە بەر دەوڵەتی سەفەوی و سپای ئێران هاتە فریای... ئەمە وەها و، لە سەردەمی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵانیدا ناوی گەروس کەوتە سەر زاران. مەستوورە خانمی ئەردەڵان لە لاپەڕەکانی ٤٥-٤٦ی تەئریخی ئەردەڵانیدا

ئەڵێت: (ساڵی ١٠٤٠ بەدواوە کە خان ئەحمەد خان لەو ئەخۆشییە ڕەوانییە ڕزگار بوو، کە لەناو کوژرانی کوڕەکەی تووشی هاتبوو، لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی تێکی دا و، سەری نەژێر دەسەڵاتی شا سەفی سەفەوی دەرهێنا و، کەوتە بیری سەربەخۆیی و پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی. جا (هەمەدان - کرماشان - ئورمیە - سونقور - گەڕوس)ی داگیرکرد و خستییە سەر وڵاتی ئەردەڵان، پاش ئەوە ئاهەنگێکی جەژنی پادشایەتی گێڕا و خۆی بەسەربەخۆ دانا و جاڕی پادشایەتیی خۆی دا. (مەردوخ) لە کتێبەکەیا ئەڵێت: شێخ شەمسەدین وتار خوێنەرەوەی ڕۆژی هەینی (واتا خەتیبی جومعە) بەم هۆیەوە خوتبەیەکی زۆر گرنگی خوێندەوە.

ئەمە وەها و، بەداخەوە لە کتێبە مێژووییە کۆنەکان هەر ئەمەندە باسی هەرێمی (بێجار) کراوە... با ئەوەش بزانین کە ناوی بێجار دەبێ لەوێوە هاتبێ کە شوێنی شارۆلکەکەی ئێستە لە کاتی خۆیا، چەم و دارستانی (بی) بووە. مەسعودی کەیهان لە کتێبی جوغرافیاکەیا ئەڵێت: (گەڕوس، وڵاتێکە بەبڕشت، جێی کشتوکاڵە. ئاوی سپی ڕود کە پێی ئەوترێ ڕووباری پەلوار سەر زەوییەکەی ئاو ئەدات، پەمۆ، ترياک، پێ ئەگەیەنن، باغ و دارستانیان کەمە، جەنگەڵ و پێشەیان هەر نییە. وڵاتەکە بژوێنە، قۆرخ و پاوەنی زۆرە، جێی مێگەل بەخێوکردنە...

## موزیک

سەرتیپ ڕەزم ئاراش لە فەرهەنگەکەیا ئەڵێت: (بێجار یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی کوردستان، لا ژووری -واتا باکوری- بەخشەکانی قەیدار و ماه نیشانی زەنجان و، بەخشی تەکابی سەر بەمەراغەیە. لای خۆرئاوایشی بەخشی دیواندەرەیە، لای خواریشی واتا باشووری بەشی دەوروبەری (قوروە)یە، هەرێمێکی چیاییە، سێ ڕیز چیای هەیە، ئاووهەوای ساردە، سێ ڕووباری هەیە (قزل ئوزون - واتا سپی ڕود) (ئەلوار) و (گەوەزەن)... شوێنی وڵاتەکە ١٩٢٠ مەتر لە ڕووی زریەوە بەرزە، پاش دەماوەند لە هەموو شارەکانی تری ئێران لە ڕووی زریەوە بەرزترە، لەوێوە بۆ تاران ٤٧٤ کیلۆمەتر ڕێیە و، بۆ سنە ١٣٨ کیلۆمەترە... لەناو شارەکەدا ئەم چەم و کارێزانە هەیە (کانی سەراب - دەرەی قەراجەلی - کانیی خاوەر ئاوا - کارێزی کاریار - کارێزی شاهروخ - کارێزی عەلی شا).

بێجار، کەلاوە و شوێنەواری کۆنی زۆرە ٢٧٦ دێی بەدەورایە، کە سەر بەحەوت

دێهـــســـتـــانن. سـەرژمـێـری بێـجـار و دەوروبەری ١٢٠٧٤٩ کەسە. لە هەرێمـەکەدا سێ قوتابخانەی ناوەندی هەیە (١٣٩) قوتابخانەی بەرایی و بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە، (١٢٠) مزگەوت و حوسێنییە و خانەقای تیایە. نەخۆشخانەیەک، دوو دەرمانگاە، چوار داروخانە، بەڕێوەبەرایەتی میری بەهەمـوو لق و پەلەکانییەوە، پۆست و تەلگراف و تەلیـفـۆن و ئاوی لوولە و، بەرق و کـارەبا و سـینەمـای تیـایە، سێ مـێـوانخـانەی تیـایە، بەرهەمی ولات دەسکەوتی ئاژەڵـیـیـە، وەکو خـوری، روون، پەنیر، کـەرە، مـاست، شـیـر... بەرهەمی کـشـتـوکـاڵـیـشـیـان دەغڵ و دانەوێڵـەی ترێیە. کـردەی دەسـتـیـان: مـافـوور، بەڕە، جاجم، گـۆرەوی و، شتی تری چنراوە. بێجار، تەنیا یەک بەخشی هەیە، کە پێی دەڵێن حەومە -واتا ناوخـۆی- و حەوت دێهـسـتـانەکـەی ئەمـانەن: (پیـرتاج - خوسـرەو ئاوا - سیلتان - سیامەنسوور - گـۆرانی - گاوبازە - نەجەف ئاوا). ڕچی ئاینیی دانیـشـتـوانی هەرێمەکە شیعەیەتییە، شێوەی زمانیـان گـۆرانیـێـکی تێکەڵ و پێکەڵە بەلوڕی و لەکی. فـارسی و تورکیش نەزانن، چەند مـاڵێ جولەکـەیشـیـان هەیە. عێلە بەناوبانگەکانی ئەوێ سیامەنسوورە کە بەشێکی زۆر کەمیـان لێرە مـاونەوە، ئەو دوایان تەرتە وەرتە کـراون بۆ ئەفغـان... ئێـمە گەرچی لێرەدا تـۆزێ لە ناوی گەروس دواین بەڵام باسی گـەروس و ئەمـیر نیـزامی گـەروسی بەناوبانگ کـە یەکـێـکە لەوان ئەهێـڵـێـنەوە بۆ پیـتی گـاف. جگە لەو عێلانەی وتمان: (کەبورەوەند - خواجەوەند - چلەمیر) و هەندێکی تریشیـان هەیە. با لە بیرمان نەچێ کە (بێجار) ولاتێکی سەردەسێرە و ترێی باشی هەیە، چەمی خاوەر ئاوا و باغـەکـانی شـاهروخ ئاوا و سـەرئاو جـێـگە سـەیرانی خـەڵقی ئەو نـاوەن. بێـجـار لـووتکەی چیای بەرزی هەیە بۆ نموونە (زەرنیخە) ٣٠٣٠ مەتر بەرزاییەتی.

گـوێگرە خۆشەویستەکان! بەداخەوە سەرچاوەی مێژوویـیـمـان دەربارەی بێجـار زۆر کـەم بوو، چونکە ئەم جێگەیە پاش وێرانبوون و لەناوچوونی زۆرین کەمەر پەیدا بووە. ئێسـتـە کاتمان تەواوبوو تا حەوتەیەکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٣/٦

# بێساران

گوێگرانی بەڕێزی ڕادیۆی کوردیی ئێران شەوتان باش، کامەرانی و سەرفرازیتان ئاواتی بەرنامەی کوردییە... ئەمشەو باسی (بێساران)تان بۆ ئەکەین کە ناوی دێیەکە لە دێهستانی ژاوەرۆی هەورامان، سەر بەبەخش و ناوچەی ڕەزاو کە یەکێکە لە بەخشەکانی ئوستانی کوردستان... ناوی بێساران وەکو بۆم دەرئەکەوێ تێهەڵکێشە و، لە دوو وشەی (بێ) و (ساران)ی گەل وشەی (سار) پێک هاتووە. وشەی یەکەم -واتا بێ- ڕەنگە لە (بەهی)وە بووبێ بە(بەی) و، ئنجا بووبێتە (بێ) و، لەبەر زۆری (بەهیی کێوی ناوی بووبێتە (بەهی سار) پاشان بووبێتە (بێ ساران) تەنانەت وشەی سار پاشوەندێکی کوردی - فارسی - پارسییە، کاتێ بەکاربراوە، کە لە جێگایەکا شتێ زۆربووبێت... وەکو (کۆسار) بۆ جێگەی شاخاوی و زورگ و هەڵەت، وەیا (چەشمەسار) بۆ جێگەی پڕ لە کانی و سەرچاوەی ئاو و، ئەم (سار)ە لە کوردییا، جارجار وەرگەڕاوە بە(زار) وەکو ئەڵێین (ئەمەک زار) واتا خوێ لێن و جارجاریش وەرگەڕاوە بە(جاڕ) وەکو (کەفر جاڕ) بۆ جێگەی داری کەفر و تەروی زۆربێت، وەیا (نەرگسەجاڕ) بۆ جێگەیەک کە نەرگسی زۆربێت... هەروا ئەشێ ناوی بێساران لە بنەڕەتا (بەی سەران)یش بووبێ لەبەرئەوەی لووتکەی چیاکەی نزیکی داری بەیی زۆر بەسەرەوە بووبێت... و ئەگونجێ شتێکی تری بێ کە خەڵقی ئەو ناوە خۆیان باشتری بزانن... یا داری بێی زۆر بووبێ بەبێی درێژ بخوێنرێتەوە.

ئەم دێیە، گەرچی شوێنێکی لایە و، لەناو چیایە و، دوورەدەس و، کەس نەرەسە، بەشی زۆری نووسەران و ئەدیبان و خوێندەوارانی کورد ناویان بیستووە، هۆی ئەم بیستران و ناسرانە تەنیا ئەوەیە کە بنەماڵەیەکی خوێندەواری تیا هەڵکەوتووە، ناوبانگی ئەوان بووەتە هۆی ناسرانی ئەم دێیە، تەنانەت هەڵبەستی جوانی (مەلا مستەفا بێسارانی)، کە هەر کاتێ مرۆڤ ناوی بێساران ببیستێ تەنیا ئەوەی بەخیالاّ دێت... بەڵێ (مەلا مستەفا بێسارانی) ئەو هەستیارە گەورە و مەزنەیە کە لە شێوەی هەڵبەست هۆنینەوەیا ڕچێکی سادەی تایبەتیی خۆیی هەبووە تا ڕادەیەک کە (حاجی قادری کۆیی) کاتێ بەتانی ناوی

شاعیران و ئەدیبانی کوردی لە دەست چووا ئەڕوات، دەربارەی ئەو ئەڵێت:

(خـۆ مـەلا مـصطەفـای بێـسـاران

بێ نەظیـرە نەظمی لە کـوردسـتـان

نەوەک هەر حاجی قادر، کە دۆستی زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد بووە، بەڵکو هەستیاری هێژای کورد (مەولەوی مەعودمی تاوک گویزی)ش - کە هەست و هەڵبەست و گیانی عیرفانی یا هیچ لە مەولەوی مەعنەوی ڕومیی فارسی کەمتر نەبووە - ئەویش شانازی بەوەوە کردووە کە لە شێوەی هەڵبەستیا پەیڕەوی لە بێسارانی کردووە. سەرنجێکی لاپەڕە ٤٣٦ی دیوانە چاپکراوەکەی بدەن، لە نامەیەکا کە بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیی دۆستی نووسیوە و، داوای لێ کردووە بێتە سەردانی کە یەک بگرن و پێکەوە سکاڵا لە دەس ستەمی ڕۆژگار بکەن و، هاوبەشی دەرد و خەفەتی یەکتر بن، کە بەو جۆرە بتوانن خەم بەبادا بدەن، لەو نامە هۆنراوەیەدا نیو بەیتی بێسارانی خستۆتە ناو فەردێکی خۆیەوە و، هەڵبەستەکەی خۆی پێ ڕازاندۆتەوە و، کردوویە بەبەڵگە بۆ بیروباوەڕی خۆی و ئەڵێت:

بیـــســـارانی یەن نەتوی فـــەرد من

خەم چەنی خـەمـان زوو مـەپوسـاکن

ئەمە وەها و با گوێ بدەینە مامۆستا عەلائەدینی سەجادی زانای بەرزی هاوکاتمان تێ بگەین کە دەربارەی ئەم بێسارانییە لە کتێبی مێژوویی ئەدەبی کوردییەکەیا، چ شیرین بەتانی هەڵنانی بێسارانییا چووە و ئەڵێت: (پیرێکی دانا، مەلایەکی زانا، دڵی ئاوێنەی چیاکان، فیکری بەرزی ئەلەکتریکی بەنەنەکان، شەیدای ئاسمانی هەورامان، شابازی کلاوەی بێساران، مامۆستای ئەدیبان، وەرەنگرێژی شاعیران... مەلا مصطەفای کوڕی مەلا ئەحمەدی بێساران لە ساڵانی ١٠٥٢-١١١٣ی کۆچی و ١٦٤١-١٧٠٢ زایینییا ژیانی بەسەر بردووە و، ٦١ ساڵ تەمەنی بەفەڕ و پیتی تێ پەڕاندووە... بەڵام مینورسکی وای داوەتە قەڵەم کە ساڵی ١٧٦٠ زایینی مردووە. خوابگای بێسارانی لەو گۆڕستانە دایە کە دەکـەوێتـە نێـوانی ئـاواییـــەکـانی (دوڕو - ڕەزاو - تەرخـاناوا)وە و، خـەڵق بۆ ئارامکردنەوەی دڵی پەشێویان، ئەچنە سەر ئارامگاکەی و ڕاز و نیازی خۆیان ئەکەن... ئەمە وەها ئێمە لێرەدا پارچە هەڵبەستێکی جوانی بێسارانیتان پێشکەش ئەکەین کە ئەفەرمووێ:

جەوساوە دیدەم دور کـەفـتـەن جـەتۆ

لیـلا ویش لێـلـەن، لیـلا و تەرمـەبو

(روشەنی بسات و نەم بیەن تار * زیندەگیم تاڵەن، وێنەی ژار مار)

(کەسی کەونەی تەور حاڵ جەستەش بۆ * بێسە، جۆیای تۆ، ئاوات واستەش بوو)

(خاسش هەر ئێدەن مەرگەش میهمان بۆ * مەگەر ئەو و مەرگ، دەردش دەرمان بوو)

واتا لەو گاڤەوە کە چاوم لەتۆ دوورە، سۆمای چاوم تاریک داهاتووە و، پتریش تاریکتر ئەبێت... ڕووناکی جیهانم لەلا تاریک بووە و، ژیانم لەلا وەکو ژاری مار تاڵە

کەسێ کە تەندروستی بەم چەشنە بێت و، بەم جۆرە ئاواتی وێڵی تۆ بێت...

چاک وایە مەرگ ببێتە مێوانی، چۆن تەنیا مەرگ ئەتوانێ دەرمانی دەردی بکات

ئەمە وەها و بەقسەی مامۆستا عەلائەدین سەجادی (بێسارانی) ژنی نەهێناوە، وجاغ کوێر مردووە، بەڵێ بێسارانی ژنی نەهێناوە، بەڵام شیعرەکانی وجاغی ڕۆشن بووەتەوە، لێرەدا هەڵبەستەکەی حاجی قادرم هاتەوە بیر کە ئەڵێ

(ئەوی شاعیر نەبێ کوێرە وجاغی * لە سایەی شیعرەکان بابی کوڕانم)

بابێینە سەر باسی ئەمڕۆکەی بێساران، دێیەکی سێ سەدماڵییە سەر بەبەخشی (سەوڵ ئاوا)ی لقی شارستان و فەرمانداریی مەریوانە. ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی ڕەزاوەوە، بەدوورایی سی کیلۆمەتر و، دە کیلۆمەتریش لە ئاویەهەنگەوە دوورە و ئەکەوێتە لای خوارییەوە. شوێنی دێی بێساران چیایی و ساردەسێرە، ژمارەی دانیشتوانی بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٣٥ فارسی، ٢٠٢١ کەس بووە، خەڵقی ئەو ناوە کوردن شێوەی زمانیان گۆرانییە بەشی هەورامی، ڕێچی ئاینیان شافیعییە، ئاوی خواردنەوەیان کانیاوە، کار و پیشەیان کشتوکاڵە و، باغداری و مێگەل بەخێوکردنە، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و توتن و میوەیە، کەتیرە و مازوو و بنێشتە تاڵیشیان هەیە... قوتابخانەیەکی تیایە، لەگەڵ مزگەوتێک و چەند دوکان... جێی دێرینە و کۆنی تەنیا ئارامگاکەی بابا شێخی بێسارانییە...

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواو بوو، تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین شەوتان خۆش.

١٣٥١/٢/٢٠

٢٦٧٣ک

وتاری: ۲۰

## بێستون (۱)

گوێگرە خۆشەویستەکان! شەوتان باش! کامەرانیتان ئاواتی بەرنامەی کوردییە، بەهەڵی ئەزانین کە لە سەرەتادا پێتان ڕابگەیەنین کە هەر نامە و نووسراوێک ئەنێرن بۆ بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە، لەباتی ئەوەی بینێرن بۆ کرماشان، بەم ئاونیشانە ڕەوانەی بکەن و، لەسەر پاکەتەکە بنووسن: (تاران - سازمانی ڕادیۆ تەلەفزیۆنی میلليی ئێران بەخشی کوردی - بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە) بەم جۆرە نامەکانتان زووتر ئەگاتە دەستمان و، لێرەوە گورجتر وەڵامی پرسیارەکانتان ئەدەینەوە. ئەمجارە نامەیەکمان وەرگرت لە گوێگری بەڕێز کاک کەرەم محەمەد بێویانی خەڵقی دێی بەردە عەلی، پرسیاری کردبوو دەربارەی پێوەندی لە نێوانی دوو تیرەی بێویانی و ڕۆژبیانیدا، پاش سپاسکردنی، هەواڵی ئەدەمێ کە وەڵامی نامەکەی کاتێ ئەدەینەوە بگەینە باسی بێویانی و هیوا وایە چەند حەوتەی تر چاوەڕوان بکات، ئەمە وەها و ئەمجارە باسی (بێستون)تان بۆ دەکەین.

موزیک

بیستەرانی خۆشەویست! بێ گومان زۆر لە ئێوە یا چیای پیرۆزی بێستونی دیوە، وەیا ناوی بیستووە، چونکە چیرۆکی شەیدایی (شیرین و فەرهاد) وای کردووە کە هەموو کوردێک، بەڵکو هەموو ئاری ڕەگەزێک لەگەڵ بیستنی ناوی بێستوندا دڵی بکەوێتە خورپە خورپ و، تەلی تەمورەی هەستی بێتە لەرە و لەرزە. بەڵێ ئەم چیا ڕەشە بەرزەی کە ئەڵێی ئاڵای ڕەشە چووە بەحەوادا لە بنەڕەتا ناوی (بوغستان یا بەغستان) بووە، واتا جێی خوایان. دوکتور پوور داودی بەهەشتی لای وایە کە ئەم ناوە لەوێوە هاتووە، نەتەوە ئارییەکان لە لووتکە بەرزەکانەوە نزا و نیایشیان لەگەڵ خواکانی خۆیانا کردووە... بەڵام بەپێی باوەڕی من تەپەڵاکی لووتکەی بێستون لە هەزاران ساڵەوە تا سەردەمی ماد و هەخامەنشی جێی ئابوودە و پەیکەری خواکانی نەتەوە ئارییەکان بووە، هۆی هەڵبژاردنی ئەم لووتکەیەش لەناو ڕیزە جیاکانی زاگرۆسدا، بۆ پارێزگاریی پەیکەری خواکان؛ ئەوە بووە کە چیاکە ئەوەندە لووس و تووش بووە کەس نەیتوانیوە بچێ بەگژیا و، ئەگەر نەتەوە نیشتمانییەکان لە شەڕێکا بەرامبەر بەدوژمن شکستیان خواردبێ، نەتەوەی دوژمنی زاڵ

بوو دەستی نەگەییووەتە پەیکەری خواکان، کە بیانگوێزێتەوە بۆ پایتەختی خۆی.
موشیرالدەولە پیرنیا لە لاپەڕە ١٥٦٨ی (کتێبی ئێرانی باستان)دا لە زمانی (دیودور سی سی لی) مێژوونووسی یۆنانییەوە کە بیست و یەک ساڵ بەر لە زایینی مەسیح چل و یەک کتێبی دەربارەی مێژووی ئەفەریقا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نووسیوە، ئەڵێت: ئەو زانایە چیاکەی ناو ناوە بوغ ستان واتا جێی خوایان. جا بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە وشەی بوغ) لە ناوی یوغاشی خوای کاسییەکانەوە هاتووە، چونکە لە پارسیی کۆندا تەنانەت لە بەردەنووسەکانی داریوشی مەزندا وشەکە (بەغ)ە نەوەک (بوغ)، دەبێ کوردەکانیش کە تا ئەمڕۆکە بەجۆرە گایێ کە لە (ئەپیس)ی خوای میسرییەکان ئەچێت ئەڵێن (گابوغە)، ئەم وشەی (بوغ)ەیان لە (بوغاش)ەوە بۆ مابێتەوە کە نموونەی هێز و توانایی بووە... وا دیارە تورانییەکانیش (بوغا)یان بۆ ناوی خوا بەکارهێناوە، کە تا سەدەکانی ناوەڕاست ناوی زۆر لە سەردارەکانیان بوغا بووە... بەڵام پارچەی یەکەمی ناوی (بەغ داد) و بەردەنووسەکانی داریوشی مەزن و، قسەی ئاشو زەردەشت کە لە ئاوێستادا بەغیان بۆ ناوی خوا بەکاربردووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ناوی بێستون لە بنەڕەتا بەغستان بووە، پاشان بووە بەبێهستان و ئنجا بووە بەبێهستون و بەبێستون، وشەی بەغ لە دواییا بووە بە بەگ ئەو نازناوەی کە بۆ پیاوماقووڵان بەکار هاتووە مامۆستای مەزنی کورد تەوفیق وەهبی بەگ دەربارەی ناوی بەغدا نامیلکەیەکی بەنرخی بەعەرەبی نووسیوە، زانکۆی مەشهەد وەری گێڕاوە بەفارسی و لە گۆڤارەکەیا بڵاوی کردۆتەوە، لەوێدا لەم بارەوە زانیارییەکی پڕ سوود هەیە دەربارەی ڕیشە و بنەڕەتی وشەی بەغ.

## موزیک

بابێنە سەر باسی ناوی بێستون هەروەک بەچیاکە ئەڵێن، لە سەرەتادا گۆیا شارێکیش بەم ناوە هەبووە و، لەناوچووە، بەڵام ئەمڕۆکە، دێیەک بەم ناوە هەیە، دێی بێستون دێهستانی چەمچەماڵی بەخشی سەحنەی سەر ئوستانی کرماشانە، ئەکەوێتە داوێنی چیای بێستون، ٣٩ کیلۆمەتر لە کرماشانەوە دوورە و، لە (سەحنە)شەوە ٢٥ کیلۆمەترە. کێوی بێستونیش ٤٠ کیلۆمەتر لە ژوور کرماشانەوەیە. بەشێ لەم چیای بێستونە کە ناوی کێوی پەڕاوە، نەخش و نیگارێکی پێوەیە... بەرلەوەی ئەو بەردەنووسانە ڕوون بکەینەوە، با بیروباوەڕی هەندێ لە مێژوونووسان و جوغرافیاناسانی کۆن دەربڕین، کە خەڵق تێ بگەن لەم بارەوە چ بیروباوەڕگەلێکی سەیر دەربارەی پەیکەرە و بەردنووسەکان دەربڕاوە. ئیبن حەوقەل وای داوەتە قەڵەم کە پەیکەرەکە نیشاندەری قوتابخانەیەکە مامۆستای

قوتابخانەکە شورکێکی بەدەستەوەیە قوتابییەکان تەمێ ئەکات. یاقوتی حەمەویش لای وابووە کە یەکێک لە شایان ویستویە بەدەوری بێستوندا بازاڕێ دروست بکات هەتا بمێنێتەوە، یادگاری هێز و توانایی ئەو بێ و، زۆر شتی تری وەهاش وتراوە، ئێمە لێرەدا ئەکەوینە یادی قسەی حافیظی شیرازی کە ئەڵێت: (چون نەدیدەند حەقیقەت رەهی ئەفسانە زەوەند). و ئەبێ ئێمە سپاسی خوا بکەین کە لە سەرەتای ئاینی ئیسلامدا کەس دەسی نەگەییوە بەم بەردەنووسانە و، ئەم پەیکەرانە و، گەر نە بەناوی ئەوەوە کە پاشماوەی بوت پەرستانە لە ناویان ئەبرد. ئەمە وەها و ماڵی خۆرهەڵاتناسانی نەبەرد و خەباتکار ئاوا بێ، کە پاش هەزاران ساڵ، بەهەسکە هەسک و، هەناسەبڕکێ چوون بەگژ چیای تووشی بێستون و چیاکانی تری کوردستان و وڵاتی ئێراندا و، بەردەنووس و پەیکەرەکانیان خوێندۆتەوە و خوێندەوارانی ئەم سەدەی دواییەیان لە سەرەگێژە و خەیاڵ بڵاوی رزگار کرد و، بۆیان دەرخستین کە هەندێ لە بەردەنووسەکان هی سەردەمی داریوشە و، هەندێکی کۆنترە و، هەندێکیشی هی دەورانی ساسانییە، وەک لە وتارەکانی ئایندەدا دوورودرێژ باسی لێ دەکەین ئێستە کاتمان تەواو بوو، تا وتاری ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٣/٩

٩ جۆزەردان ٢٦٧١

٣٠ مایس ١٩٧٢

**وتاری: ٢١**

## بێستون (٢)

گوێگرە خۆشەویستەکان! شەوتان باش!

بەختیاری و کامەرانیتان ئاواتی بەرنامەی کوردییە. جارێکی تریش جاڕ ئەدەینەوە کە هەر کەس نامە بۆ ئەم بەرنامەیە دەنووسی بەم ناونیشانە بینێرێ (تاران - سازمانی میللی ڕادیۆ تەلەویزونی ئێران - بەشی کوردی - بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە).

موزیک

گوێگرانی بەڕێز، ئێمە لەسەر باسی بێستون دەڕۆین، لە وتاری پێشوودا وتبوومان کە ناوی بێستون لە بنەڕەتا بوغستان یان (بەغستان) بووە، کە ئەکات جێی خوایان و، باوەڕی هەندێ لە مێژوونووسانی کۆنمانیش دەربارەی بەردەنووسەکانی بێستون بۆ دەرخستن و، بەڵێنمان دانێ کە لەسەر باسەکە بڕۆین و، نووسراوی سەر بەردەنووسەکانی ترتان بۆ روون بکەینەوە لەبەر شەوقی ڕۆناکیی ئەو جۆرە زانیارییەی کە خۆرهەڵاتناسان لە سەدەکانی نۆزدەیەم و بیستەمدا خوێندوویانەتەوە.

موزیک

سەنیع الدەولە لە کتێبی (بولدانی ناصری)دا، لە لاپەڕەی ٣٠٨دا ئەڵێت: بەسەر تەپەڵاکی چیاکەی بێستونەوە کانیاوێکی بەهێز هەیە رووبارێکە بۆ خۆی، لەسەر ئەو کانییە تاتەبەردێکی نووسراوی بەنەخش و نیگار ڕازێنراوە هەیە، بەرزایی و پان و پۆڕی دوازدە مەتر ئەبێ، گەردشی چەرخی چەپگەرد نووسراوەکانی کوێر کردۆتەوە، بەجۆرێ کە ناخوێندرێتەوە و تەنیا پەیکەرەکانی ماون، کە هەڵتۆقیون و باش دیارن، هەندێکیان درشت و هەندێ وردن، هەندێ سوارەن و هەندێ پیادەن و، هەندێ چەکدارن و هەندێ بێ چەک و سەڵتەزەلامن. شێخ عەلی خانی زەنگەنەش کە ماوەیەک فەرمانڕەوای کرماشان بووە. لە ناوەندی ئەو تاتەبەردەدا، بەزمانی فارسی وەقفنامەیەکی هەڵکەندووە، کانیاوەکە و دوو دێی قەرەوەلی و چمیکان ناوی کردووە بەوەقف.

تا ئێرە قسەی سەنیع الدەولە بوو.

موزیک

بێ گومان ئەو بەردەنووسەی سەر تەپەڵکی بێستون کە نووسراوەکەی کوژاوەتەوە، هی دەورانی ماد و نەتەوەکانی لەوە پێشترە و، دەبێ ئەو نووسراوە دەربارەی ناوی خواکانی نەتەوە ئێرانییەکان بووبێ، کە پەیکەرەکانیان لەوێدا بووە و، بووە بەهۆی ئەوەی کە ناوی ئەو جێیە بنرێ بوغستان... و پاش ئەوە ناوی (ئاهورا) جێی ناوی (بوغ)ی گرتۆتەوە، هەروەک لە بەردەنووسەکانی هەخامەنشی و کتێبەکانی (ئاشو زەردەشت) بۆمان دەرئەکەوێ، کە زۆر کەم ناوی (بوغ)یان بردووە و، فرە زۆرتر ناوی (ئاهورا)یان هێناوە.

موزیک

بابێنە سەر بەردەنووسەکانی تری، کە چۆن خوێندراونەوە، لە سەدەی حەڤدەیەما چەند کەسێ لە خۆرهەڵاتناسان وێنە بەرداریان لەم بەردەنووسانە کردووە، بەڵام لەناو هەموویان سیر (ڕاولینسن) کە مێجەرێکی سپای ئینگلیسی بوو لە هەموویان چاتر لەم کارەدا سەرکەوت. ئەم (مێجەر ڕاولینسن)ە کە لە سەردەمی محەمەد شای قاجاردا لەگەڵ دەستەیەک لە ئەفسەرانی ئینگلیسی، لە هیندستانەوە بۆ مەشقدانی ئەفسەرانی ئێران هاتبووە تاران و، ماوەیەک مابووەوە و بەم هۆیەوە فێری فارسییەکی باشیش بووبوو، توانی لە ساڵانی ١٨٣٣-١٨٤٠دا گەنجنامەکەی ئەلوەندی هەمەدان و، ستوونەکانی بەردەنووسەکەی بێستون و تاق و سان و تەخت جەمشید و جێیانی تری وێنە بگرێ و، بەهۆی زانایانی زمانە کۆنەکانی بابیلی و، یۆنانی و پارسیی کۆن و پیتی بزمارییەوە، دروشمەکان هەڵ بێنێ و، لە خوێندنەوەی ستوونەکانی بێستوندا سەر بکەوێ و، ئەمیان بکات بەپێ پلکە بۆ سەرکەوتن بەسەر گرێ کوێرەکانی ترا و، هەموویان هەڵ بێنێ، جا پاکژ و گەلاڵەی کۆششی ئەم خۆرهەڵاتناسانە بەمەتن و تەفسیرەوە، لە زۆر نامیلکەی دێرینەشناسیدا بڵاوکراوەتەوە، ئێمە بۆ ئەم مەبەستە چاومان گێڕاوە بەکتێبی (فەرمانهای شاهان هەخامەنشی)دا کە ئەڵێت قسەی مامۆستا ئایەتوڵڵا مەردوخ (ئالان) بەشێ بووە لە هەرێمی ئەردەڵان کە لەژێردەستی بنەماڵەی ئەردەڵاندا بووە، وەکو ئەشزانین سەردارێتیی ئەردەڵان لە کاتی خۆیا هەر لە هەرێمی سنەوە تا (شارەزوور) درێژەی کێشاوە، تەنانەت لە سەردەمی مەغۆل و ئیلخانی و جەلایریدا کە لەژێردەستی پەیکە بەگ و، مەنموون بەگ و، محەمەد بەگ دابووە... ئەمە وەها و بەقسەی مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی لە ساڵانی ١١٣٠دا لەژێر فەرمانی یوسف شێخە بەگ ئالانیدا بووە. ژاک دومورگانیش ئەڵێ ساڵی ١٨٩٠ کە سەرۆک عێلەکان لەلایەن فەرمانڕەوای مەهابادەوە دائەنران، لەم کاتەدا سەرۆکی ئالان عەلی ئاغا ناوێ بوو.

لە بیرمان نەچێ لە (قوورەی) سەر بەکوردستانیش دێیەکی تری ئالان ناو هەیە - هەروا لە دەوروبەری دەرتەنگی مێژوویشدا لە هەرێمی (حەلەوان) دێیەک بەم ناوە هەبووە.

موزیک

بابێینە سەر خوورەوشتی خەڵقی هەرێمی ئالان، ژاک دومورگان ئەڵێ: هەرچەندە ئالان جێگەیەکی دووردەستە و دەبوایە خەڵقەکە زۆر دواکەوتوو بن، کەچی وەها نییە، خەڵقی ئەو ناوە حەزیان لە ئاوەدانکردنەوە هەیە، میوان دۆستن، ئاشنای کشتوکاڵن. لەم سالانەی دواییەشدا (تیمسار رەزم ئارا) لە لاپەڕە ٨٨ی بەرگی چوارەمی فەرهەنگەکەیا ئەڵێ: ئالان یەکێکە لە دێهستانەکانی بەخشی سەردەشتی سەر بەشارستانی مەهابادە، هەروا لەم ستوونەدا پەیکەری نۆ کەس لە پادشایان و فەرمانڕەوایانی ولاتان هەیە لەگەڵ ناویان، کە شۆڕشیان هەڵگیرساندووە دژی شای هەخامەنشی و تێ شکاون و بەدیل گیراون و، بەجلوبەرگی خۆ ولاتییەوە کوت لە مل و زنجیر لە دەست پێکەوە شەتەک دراون و لەبەردەم داریوشا ڕیزکراون، یەکێ تریشیان لەبەر پێی داریوشا پاڵ کەوتووە ئەپاڕێتەوە و، دەستی لالانەوەی هەڵ بڕیوە، دەبێ ئەم پەیکەرە دیاردی بێ بۆ بووژەکردنی (گوێ ماتی موغی مادی) کە بەدرۆ خۆی ناونابوو (بەردیا) و تەختی شاهێتیی (کەبوجیە)ی داگیرکردبوو، بەلام پاشان داریوش بەسەریا زاڵ بوو و، لەناوی برد، لەم پەیکەرەدا داریوش وەستاوە سەرکەوایەکی لەبەرە کە پاومانەکەی بەنەخش و نووسین ڕازاوەتەوە، شۆڕکێکی بەدەستەوەیە، نیشانەی تەمێکردنی دیلەکانە و، پەیکەری (فرەوەهەر)یش بەسەر سەریەوە باڵی ڕاکێشاوە، لای پشتیشییەوە دوو کەس لە یاوەرانی وەستاون یەکێکیان ڕمێکی بەدەستەوەیە ئەوی تریان تیر و کەوانێ. ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە لەو سەردەمەدا ئەم چەکانە بەکاربراون، ستوونی دووەم دەربارەی شۆڕشکردنی بابل و ماد و ساگارتییە. ستوونی سێیەم دەربارەی شۆڕشی پارتی مەرو و بەردیای درۆکانی و دووەمین شۆڕشی بابلە. ستوونی چوارەم دەربارەی ئەو کارانەیە کە داریوش لە ولاتە شۆڕش کردووەکانا ئەنجامی داوە. ستوونی پێنجەم دەربارەی شۆڕشی خۆزستانە.

موزیک

ئەمە وەها و ڕیچارد فرای لە لاپەڕەی ١٤٤ی کتێبی (میراتی باستانی ئێران)دا کە وەرگێڕاوە بەفارسی ئەڵێت: هۆی دروست مانەوە و لەناو نەچوونی بەردەنووسەکەی داریوش ئەوەیە: کاتێ سەنگ تاشەکان نووسینەکانیان هەڵکەندووە، لە سەرەوە تا خوار

پێ پلقەکانیان ڕۆخاندووە، ڕێی سەرکەوتنیان بۆ بەردەنووسەکە نەهێشتووە، سەنیع الدەولە ئەڵێ: کوردەکانی دەوروبەری کرماشان بەم پەیکەرە و بەردەنووسانە ئەڵێن دەروێشان وا دیارە لەمێژە و لەناو کوردەکانا قاو بووە کە ئەم بەردەنووسە هی داریوشە بەڵام بەرابردنی ڕۆژگار و لەبەرئەوەی لەو ناوەدا دەروێشانی ئەهلی حەق زۆرن، ناوی (داریوش)یان لێ بووە بە(دەروێشان). با ئەوەش بزانین کە جگە لەو بەردەنووسە، لە هەرێمی بێستوندا بەردەنووسی تر زۆرە، هەندێکی هی دەورانی ئەشکانی و پارتە و، هەندێکی هی دەورانی ساسانییە. یەکێ لە شایانی قاجاریش، خۆی خستۆتە ڕیزی ئەوانەوە و، شتێکی نووسیوە کە لە وتارەکانی ئایندەمانا لێی ئەدوێین، ئێستە کاتمان تەواو بوو بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٣/١٦

١٦ جۆزەردان ٢٦٧٣

٦ حوزەیرانی ١٩٧٢

## بێستون (۳)

گوێگرانی بەڕێز شەوتان خۆش!

لە یەزدانی پاکیزە ئاواتەخوازی بەختیاری و سەرکەوتنتانین، جارێکی تریش پێتان ڕادەگەیەنین کە بۆ ئەم بەرنامەیە بەم جۆرە نامە بنووسن: (تاران - سازمانی ڕادیۆ تەلەویزیۆنی میللی ئێران - بەشی کوردی - بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە).

موزیک

بیستیارانی خۆشەویست! لە وتارەکانی پێشوودا باسێکی بەردەنووسەکەی داریوشی گەورەمان بۆتان کرد، کە بەقەدپاڵی شاخی پڕۆی چیای بێستونەوەیە، ئەمجارە دەربارەی هەندێ لە بەردەنووسەکانی تری ئەدوێین، (ژاک دومورگان)ی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی، گەرچی لە کتێبی جوغرافیای خۆرئاوای ئێراندا، باسی دێرینەشناسی و شوێنەوارە کۆنەکان و. بەردەنووسەکانی حەواڵەی ئەو کتێبەی کردووە، کە لەم بارەوە نووسیویە، بەڵام ئێمە بۆ ئەم وتارەمان، ئەوەندەمان بەسە کە لەو کتێبەیا لێی دواوە، (ژاک دومورگان) لە لاپەڕەی ۱۰۱دا ئەڵێت: لای خۆرئاوای بەردەنووسەکەی داریوشی گەورەوە، تاتەبەردێکی تری گەورەتر و پان و پۆڕتر هەیە کە سەنگ تەراشی کراوە و، ئامادەی نووسین لەسەر هەڵکەندن بووە، بەڵام هەروا هێڵراوەتەوە بێ ئەوەی هیچی لەسەر بنووسرێ... من لام وایە ئەو تاتەبەردە، لە تاتەبەردە کۆنەکانی تر کۆنتر بووە و، نووسراویشی بەسەرەوە بووە، بەڵام نووسراوەکە ئاینی بووە، یا سیاسی و، لەبەرئەوە نووسینەکەی داتاشراوە و، لەناوبراوە.

موزیک

بابێینە سەر باسی (تاق بوستان)... (ژاک دومورگان) لە لاپەڕە ۱۰۳ی کتێبی ناوبراودا ئەڵێت: لەو ڕووەوە کە ئەم ناوە شوێنەواری دێرینەی کۆنی شاری کاسپدانە و تاق بوستان یا تەخت بوستانە، بەڕاستی جێی ئاوڕ و سەرنجە... نزیک بەکانیاو و ئەستێڵێکی بەردین، لە تاشە بەردەکەی داوێنی چیای بێستوندا و تالاری تاقدار دروست کراوە، تاقێکیان کە بەرزترە، لە تاقە نزمەکە پتر بەنەخش و نیگار ڕازێنراوەتەوە، کەوانی کەمەری تاقە بەرزەکە پەیکەری دوو پاڵەوانی جیهانگیری لەسەر هەڵکەندراوە کە لە دوو

لاوه تاجێکیان گرتووه، خوار کەمەرەکە دوو بەشە: بەشی لای سەرەوەی پەیکەرێکی سێ کەسییە، دووانیان بەهۆی شتێکەوە ڕاگیراون، سێیەمیان کە لە ناوەندی ئەو دووانە دایە، وا دیارە پەیکەری پادشایە کە زۆر بەشکۆ و سەلارییەوە وەستاوە و خۆی داوە بەسەر گالۆکی دەسەلات و پادشایەتیدا، بەشی لای خوارەوەشی پەیکەری سوارێکە نێزەیەکی بەدەستەوەیە، کەوانێک و قەڵغانێکیشی پێیە و، زرێ و کڵاوێکیشی لەبەرە. ئەم پەیکەرە تا بڵێی هونەر و وردەکاری تیا بەخەرج دراوە، ئەملا و ئەولای دیواری تالارەکەش بەنەخش و نیگار و چاوئەندازی ڕاو و شکار ڕازێنراوەتەوە، لە ڕووکاری لای خۆرئاوایشەوە بەلای چەپا (شا) سواری بەلەمێ بووە و، تیری ئەنگاوتووەتە بەرازێک و لەشی کون کون کردووە، فیلەکانیش بەڕیزە وەستاون، ژنە چۆپی کێشەکانیش هەندێکیان ڕووت و هەندێکیان پۆشتە خەریکی سەمبا و گۆرانی وتن و ساز و سەمتور لێدانن. لای ڕاستیشەوە نۆکەر و دەس و پێوەندەکان نچیرێکیان داوە بەزەوییا، خەریکن پارچە پارچەی دەکەن... لەلای ڕاستی ئەم پەیکەرەشەوە پەیکەرێکی تری هەڵتوقاوتر هەیە، نەخشی ڕاوە ئاسکێکە، لەبەردەم شادا ئەنجام دراوە، ژنەکان لای ڕاستەوە لەسەر پارچە ڕایەخێ دانیشتوون، بەڵام بەداخەوە ئەم وێنەیە تەواو نەکراوە و نەگەییوەتە ئەنجام. ئەو تاقەکەی تری کە بچووکتر و نزمترە تەنیا پەیکەری دوو پیاوی تیا هەڵکەندراوە، لەگەڵ نووسراوێ بەزمانی پەهلەوی، بەپێی لاپەڕەکانی ٢٤٣-٢٥٥ی یاداشتەکانی (سیلوستەر دوساسی) فەرەنسی، کە هیساڵی ١٧٧٣ییە و، لە پاریس چاپ کرا و نووسراوەکە بەم جۆرەیە، نووسراوی یەکەم ئەڵێت: خاوەنی ئەم پەیکەرە پەرستیاری (ئورمزد) شاهیوری مەزن، شای شایانی ئێران، زادەی عاسمانی لە ڕەگەزەی خوایان، کوڕی پەرستیاری نورمزد، هورمزی گەورە شای شایانی ئێران و نەنێران، زادەیی عاسمان لە ڕەگەزەی خوایان، نەوەی نەرسیسی گەورە، شای شایان. نووسراوی دووەمیش ئەڵێت: خاوەنی ئەم وێنەیە پەرستیاری (ئورمزد) بەهرامی مەزن، شای شایانی ئێران و نەنێران و زادەیی عاسمانی، لە نژادی خوایان، نەوەی هورمزی گەورە، شای شایان...

موزیک

جا دەبێ باش لە یادمان بێت کە بەردەنووسەکانی پاڵ شاخی پرۆی بێستون هی دەورانی هەخامەنشییە، بەڵام نەخش و نیگارەکانی تاق و بوستان و بەردەنووسەکانی هی دەورانی ساسانییە و، مەبەست لە وشەی (ئەنێران) کیشوەرەکانی ژێردەستی شاهەنشای ئێرانە، کە لە سنووری ئێران بەدەرەوەن. جگە لەم پەیکەرانەی کە ناومان بردن، لای ڕاستی تاقە

بچووکەکەوە پەیکەرێکی تریش هەیە، سێ کەسییە، یەکێکیان شایە بەسەر لەشی کابرایەکی دیلا هەنگاو ئەنێ.

## موزیک

گوێگرانی خۆشەویست وەکو گوێتان لێ بوو، ژاک دومورگان لەم کتێبەیا دیاردی بۆ ئەوە نەکردووە کە ئەم ئەسپ سوارە زرێ لەبەرە کێیە؟ بەلاَم ئەگەر لە یادتان مابێت، لە زمانی یاقوتی حەمەوییەوە بۆمان گێڕانەوە کە لە (موعجیم البولدان)دا، وەکو نووسەرەکانی تری کورد و فارس لە کتێبەکانیانا، هەموو وایان داوەتە قەڵەم، کە ئەو ئەسپ سوارە (خوسرەوی پەروێز)ە کە بەسەر (شەودێز)ەوەیە و لە چیرۆکەکانی (شیرین و فەرهاد)ی نیزامی گەنجەوی و خانای قوبادی و نووسەرانی ترا دەربارەی دواون. جا لەبەرئەوەی ئێمە کاتمان تەواو بووە، باسی سەنگ تەراشی فەرهادی هونەرمەند و شەیدای ئەو و شیرین ئەهێڵینەوە بۆ وتاری ئایندە و، ئێستە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٣/١٦

١٦ جۆزەردان ٢٦٧٣

٦ حوزەیران ١٩٧٢

**وتاری: ٢٣**

# بێستون (٤)

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش، خۆشی و کامەرانیتان ئاواتی بەرنامەی کوردییە.

لە وتارەکانی پێشوودا بۆمان ڕوون کردنەوە کە بەردەنووسەکانی بێستون ئەوەی بەپاڵی چیای (پرۆ)وەیە هی دەورانی هەخامەنشییە و، ئەوانەی بە(تاق)ەکانی تاق وەسانەوەیە هەندێکی هی شاپوور بەهرام و هەندێکی هی خوسرەوی پەروێزە و، لێرەدا بەر لەوەی دوورودرێژ چیرۆکی شەیدایی (شیرین و فەرهاد)تان بۆ بگێڕینەوە، بەهەلی ئەزانین لە هەندێ شت بدوێین؛ نووسەری بەڕێز کاکە حەمەی مەلا کەریم لە شمارە ٥ی گۆڤاری (بەیان)ی ساڵی ١٩٧١دا وتارێکی جوانی دەربارەی سەنگتەراشییەکانی (تاق بوستان) نووسیبوو، بەناوی (ڕازی یەکێک لە دڵدارییە نەمرەکانی مێژوو)، لەم وتارەدا هەستی جوانی خۆی دەربارەی نەخش و نیگارەکانی بێستون و ئەوینی گەرم لە نێوان (شیرین و فەرهاد) دەربڕیوە، هەروا گەنجانی ڕێ بەدێیی کردووە بۆ ئەوەی کە تام و بۆ لە چیرۆکی ئەویناویی خۆبەختکارانەی فەرهادی ڕەنجبەر ببەن!

ئێمە پەسەندی خۆمان بەرامبەر بەوتارە جوانە دەرئەبڕین، بەڵام لە هەمان کاتا ئەو هەڵانەی بۆ ڕاست دەکەینەوە کە لە دوو وتارەکەیا هەیە:

١- نووسیبووی: تاقە بچووکەکەش کۆمەڵە نەخشێکی تیا هەڵکەنراوە، وەک نەخشی سەرکەوتنی خوسرەوی پەروێز بەسەر دوژمنەکانیا و، خاک و پاکەوتنی ئەو دوژمنانە و، لێبوردن داواکردنیان لە خوسرەو تاد...

ئەگەر لە بیرتان مابێ ئێمە لە وتاری سێیەمانا دەربارەی بێستون ڕوونمان کردبووەوە کە ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی کە ئەم بەردەنووسەی خوێندۆتەوە ئەڵێ: ئەو تاقەی بچووکتر، پەیکەری دوو پیاوی تیا هەڵکەندراوە لەگەڵ نووسراوێ بەزمانی پەهلەوی کە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە خاوەنی پەیکەرەکان (شاهپووری) مەزن شای شایانی ئێران و (بەهرامی مەزن) شای شایانی ئێرانێ. و لەو تاقەدا هیچ شتێ پەیوەندی بەخوسرەو پەروێزەوە نییە.

٢- کاکە حەمەی مەلا کەریم ناوی چیرۆکەکەی خانای قوبادی ناوە (شیرین و فەرهاد)

ر وای داوەتە قەڵەم کە وەرگێڕاوی (خوسرەو شیرینی) نیزامی گەنجەییە، کەچی چیرۆکەکەی خانای قوبادیش ناوی (خوسرەو و شیرین) وەیا (شیرین و خوسرەو)ە، دەڵێن: خانای قوبادی چیرۆکێکی بەناوی (شیرین و فەرهاد) نووسیوە، بەڵام لەناوچووە، (مەولەوی) لەو چیرۆکە لاپەڕەیەکی گیر هاتووە، ئەم هەڵبەستانەی لێ هەڵێنجاوە و خستویەتییە ناو پارچە هەڵبەستێکی خۆی، کە ئەمە هەڵبەستەکانە:

«گا، چون ستارەی تاریکەی سەحەر
گا قەمەر، گا خۆر، مەیو و نەظەر»
«گا و، بیستون هەستیی بیناوە
حوسنشی گوڵ گون وەش و ئیستینفاوە»
«دەست شیرنیش ماوەرۆ ئەویاد
فەرهادێ نەتەتاق. فەرقەکەی فەرهاد»
گا، چەرخ دیدەی صەت لەیلافرۆش
کورەی نازناز ماوەر و نەوجۆش»
«تا بۆی حەرارەت، مەوج دەریای دەرد
مەجنون وێنەی ئەم بەرۆ هەردە و هەرد»

ئەڵێن: مەولەوی بڕیاری دابوو کە دەربارەی (شیرین و فەرهاد) داستانێ بنووسێ، بەڵام کە ئەم لاپەڕەیەی دی، خۆی لەو پایەیەدا نەدی کە شتی وەها بهێنێتەوە بەرهەم، وازی هێنا.

٣- کاکە حەمەی مەلا کەریم ئەڵێت: لە خۆڕا نییە کەوا شاعیری بێ هاوتای کورد خانای قوبادی ئەوەی کە مەولەوی بەو هەموو شان و شکۆ ئەدەبییەوە شوورەیی لێ هاتووە، خۆی لە عاستیا بەشاعیر دانێ و لە مەجلیسا سەرهەڵبڕێ...

ئێمە دەربارەی ئەم وتانەی کاکە حەمە دەڵێین: دەبوایە بڵێ: مەولەوی بەو هەموو شان و شکۆ ئەدەبییەوە، زاتی نەکردووە و، نەیوێراوە خۆی لە عاستیا بەشاعیر دانێ و، لە مەجلیسا سەر هەڵبڕێ... جگە لەمەش وای زانیوە کە خانای قوبادی و مەولەوی هاوتەمەن و هاوسەدە بوون کەچی وا نییە. خانای قوبادی بەپێی مێژووی ئەدەبی کورد لە نێوانی ١٧٠٠-١٧٥٩دا ژیاوە و، مەولەویش لە ١٨٠٦-١٨٨٣دا ژیاوە.

٤- مایەوە ئەوەی کاکە حەمەی مەلا کەریم وای زانیوە کە (خوسرەو شیرینی) خانای

قوبادی وەرگێڕاوی خوسرەو و شیرینی نیزامی گەنجییە و، لەبەرئەوە هەستی ڕەگەزپەرستی تیا جوولاوەتەوە وتوویە: «کە هەرچەندە بەناوە وەرگێڕانی شیرین و خوسرەوەکەی نیزامی گەنجەوییە، بەڵام هەر کەسێکی بێ لایەن بەراوردی ئەو دووانە بکات بەیەک، ناچار ئەبێ دان بەوە دابنێ کە وەک ئەڵێن هەر خوایان یەکێکە... ئەگینا هەرگیزاو هەرگیز نیزامی ناگا بەقوڵەپێی خانەدا و، ناتوانی لە عاستیا بڵێ منیش هەم... بەڵام بڵێم چی؟ کە خانا کوردە... تاد.

ئێمە پاش پەسەندکردنی هەستی بەرزی کاکە حەمەی مەلا کەریم ئەم بیر و باوەڕەی ڕاست دەکەینەوە: یەکەم: خانای قوبادی تەنیا پەیڕەوی لە نیزامی کردووە و، چیرۆکەکەی خۆی هەموو بەرهەمی مێشکی خۆیەتی و پالاوتەی سەرچاوەی خەیاڵی خۆیەتی و، لە فارسییەوە وەری نەگێڕاوە. جگە لەوەش کێ وتوویە (نیزامی) لەگەڵ خانادا هاونەتەوە نین؟ کە بەم جۆرە دەماری ڕەگەزپەرستی لە کاکە حەمەدا بجوولێ و، ئەم شاعیرە جیهانییە، لە پایەی خانادا نەبینی و بەکەمتری بداتە قەڵەم؟ نیزامی گەنجەیی خەڵقی گەنجەیە کە بەئەلیەزابیث پۆل بەناوبانگە و، لە حەلی خۆیا یەکێ بووە لە شارەکانی دەوڵەتی ڕوادیی کورد و، خود نیزامی بەوەوە شانازی کردووە کە دایکی ڕەئیسەیەکی کورد بووە، بەڵام بەباوکیانە نازیوە، یا لەبەرئەوەی کە دەربارەی کەم میهرەبان بووە، یا لەبەر ئەوەی کە دایکی تەڵاق داوە و، ئەو لە کۆشی دایکیا پێ گەییوە، جا گوێ بگرە لە نیزامی لە لاپەڕە ۸۷-۸۸ی (لەیلا و مەجنون)ەکەیدا کە باسی بنەماڵەی خۆی دەکا چی دەڵێ:

«گـرْشُـدَ پـدَرَم بە سُنَّت جَـدَ
یـوسف پـسَـر زکي مُـؤيَّد»

«با دَوْر بـە داوري چەکـوشم
دَوْراست نەجَوْر چون خروشم»

«چون دَرْپـدَرَان رَفـتـة دیدم
عْـــرِق پـدَري زدِلْ بُريـدَم»

تا ئەڵێت:

«گر مـادَرْ مَنْ رئیسـە ء کـرد
مادَر صِفتانه پیش مَن مُرد»

«اَزلا بە گـــــری کـــــرا کُنَمْ
تاپیش مَـنْ آردَش بَفَـــریـاد»

بەم هەڵبەستانەدا بۆمان دەرئەکەوێ، کە کاکە حەمە بێ ئەوەی شارەزای ئەدەبی نیزامی و بنەماڵەی نیزامی بێت، لەخۆڕا بڕیاری دەربارەی داوە و، لە کوردی جیا کردۆتەوە.

موزیک

بابێینە سەر ئەوەی کە خۆرهەڵاتناسەکان، تەنانەت ئەوانەی کە دەربارەی (تاج گوزاری شاهان) دواون، وایان داوەتە قەڵەم کە ئەو پەیکەری لە (تاق وەسان) دایە و، شا لە نێوانی دوو کەس ڕاوەستاوە، حەڵەقەیی وەرئەگرێ، گوایە یەکێ لەو دوو پەیکەرەی زەردەشتە و، یەکێکیان (ئاناهیتا)یە، یاخۆ وەکو لە (بەیان)دا وێنەی کێشراوە یەکێکیان (ئەهورامازدا) و ئەوی تریان (ئاناهیتا)یە، من بەش بەحاڵ خۆم لام وایە ئەم بیر و ڕەوانە هەڵەیە، لام وایە ئەوی ناوەند شایەکە و، کەس نازانێ کەم شایە... ئەوانەی ئەملا و ئەولایان گرتووە، یەکێکیان (ئەهریمەن)ە کە حەڵقەیەکی بەدەستەوەیە ئەیەوێ شا بۆ لای خۆی بکێشێ، ئەوی تر کە خەرمانەی خۆری بەسەرەوەیە وێنەی (میترا)یە کە لە زمانە ئارییەکانا (میهر)ی پێ ئەڵێن و، بۆ ئەوەی باشتر لەم وێنانە حاڵی ببین، دەبێ سەرنجی ئەو کتێبانە بدرێت کە دەربارەی ئاینی مێترا پەرستی دانراون، تەنانەت کتێبەکەی تەوفیق وەهبی بەگ، کە دەربارەی ئاینی میهرپەرستی لە کوردستان و (هەتەرە)دا دایناوە.

ئێمە وتاری ئایندەمان تەرخان دەکەین بۆ باسی ئەوینی شیرین و فەرهاد و، سەنگ تەراشییەکانی ئەو قارەمانە... ئێستا کاتمان تەواو بوو بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٣/٣٠

٣٠/جۆزەردان/٢٦٧٣

**وتاری: ٢٤**

## بێستون (٥)

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش، کامەرانیتان هۆی دڵشادی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە.

لە وتارەکانی پێشوودا بەڵێنمان دانێ کە بەهۆی باسی بێستونەوە یادێکیش لە ئەوینی گەرمی (فەرهاد) بکەین، ئەو ئەوینە ئەفسانەییەی شەوق و تینی داوە بەدڵ دەروون و بازووی (فەرهاد) کە بەهیوای گەیشتن بە(شیرینی)ی دڵداری و، بەکامەرانی بوون بەو کاتە شیرینە، پەیاپەی قوڵنگ ڕاوەشێنێ بێ ئەوەی هەست بەماندوویەتی و شەکەتی بکات... بەڵام با ئێمە بزانین ئەم فەرهادە کێ بووە؟ ئێمە لە مێژووەکانی کۆنی ئێرانا، تەنیا ناوی چوار فەرهاد دەزانین لە پادشاکانی ئەشکانی و دیارە ئەم فەرهادە هیچ کام لەو شایانە نییە، خۆ ئێمە لە سەردەمی ساسانی شا، بەم ناوە نە شایەک نە شازادەیەک ناناسین! ئەی ئەم فەرهادە کێیە؟ و خەڵقی کوێیە؟ کە بووەتە نموونەی شەیدای خۆبەختکار و، بەیەگانە شەهیدی ڕێی ئەوین و دڵداری؟ (ئەمیر شەرەفخان بەتلیسی) یەگانە مێژوونووسی کورد لە لاپەڕە ٢٦ی شەرەفنامەدا وای داوەتە قەڵەم کە فەرهاد کوردە و، لە تیرەکانی لقی (کەڵهوڕە)، ئەم باوەڕەی ئەمیر شەرەفخان لەوێوە هەڵقوڵاوە کە هەرێمی بێستون سەر بەکرماشانە و، ئەم ناوە لە هەزاران ساڵەوە مەڵبەندی تیرە و عێلەکانی کەڵوڕ بووە، کە بەگومانی من ئەم ناوە تەنیا لەوێوە هاتووە، کە ئەمانە پارێزگاری گەورەترین ئابودە و پەیکەری (ئاهورا)یان بەئەستۆوە بووە، کە لەبەر مەزنی و زلی پایەی ئەو خوایە، یا ئەو پەیکەرە بەکوردی (کەڵە ئاهورا)ی پێ وتراوە، واتا مەزنترین (ئاهورا).

موزیک

بەڵام مامۆستا مەلا کەریمی بیارە لە پەراوێزی لاپەڕە ٩٢ی ئەو دیوانە مەولەوییەدا کە پێشەکی بۆ نووسیوە و، هەڵبەستەکانی بەپەراوێز ڕوون کردۆتەوە و، چای کردووە، لەوێدا ئەڵێت: فەرهاد کوردی لوڕە! بێ ئەوەی دیاردی بۆ سەرچاوەیەک بکات. من لام وایە ئەم گومانەی مامۆستا مەلا کەریم لەوێوە هەڵقوولاوە کە مرۆڤی لوڕ، تەنانەت ئەو فەیلییانەی

لە بەغدان، هەرگیز لە کارا کۆڵ نادەن و ناپسێن و، هەست بەماندوویەتی و شەکەتی ناکەن و، خۆیانیش زۆر بەپتەو و قەوی و قۆڵ بەهێزن. لەگەڵ ئەمەشدا هەستیارانی فارسی زمان، هێزی فەرهادیان بەهی خۆیان دانەناوە، بەتینی ئەوینیان داناوە، تا ئەوەتا یەکێکیان ئەڵێت:

(بیستون را عشق کەند و شوهرەتش فەرهاد برد)

بێ گومان ئەو هەڵبەستەی هەستیاری فارسی زمان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەمەوبەر، هەموو خەڵقی باوەڕیان وەهابووە، کە سەنگ تەراشییەکانی کێوی بێستون و تاق بوستان و دوکان داود و جێیانی تری ئەو ناوەی کوردستان، هەموو شوێنەواری قوڵنگ و تیشەی فەرهادن، بەڵام وەکو لەپێشا وتمان لە سەدەی هەژدەیەم بەدواوە، بۆ خەڵق ڕوون بووە کە سەنگ تەراشییەکان و بەردەنووسەکان، هی چەند دەورێکن، هەندێکیان هی دەورانی ماد و، هەندێ هی هەخامەنشی و هەندێ هی ئەشکانی و، هەندێ هی ساسانییە.

## موزیک

بابێینە سەر شیرین، ئەو کچە قۆزە پەری ڕەنگەی کە نیزامی گەنجەیی و خانای قوبادی بەفارسی و بەکوردی بەتانی شۆخ و شەنگی جوانی ئەوا چوون، تا ڕادەیەک ڕووخساری ئەویان چواندووە بەمانگی چواردە و، دەمی بەغونچە گوڵی تازە پشکوتوو و، گەردەنی بەگەردەنی ئاسکی بانی مەقانی ڕەم کردوو و، قەد و باڵای بەشمشاد و سەروو و عەرعەری جوبیارانی کوردستان! ئەم شیرینە بەقسەی مێژوونووسەکان کچی شای ئەرمەن و لەسەر ئاینی مەسیحی بووە... و دەبێ بپرسین ئەی فەرهادی کەڵور لە کوێی دیوە؟ و چۆن شەیدای بووە؟ لە خەوا؟ یا بەدیتن؟

خانای قوبادی ئەڵێ: شیرن خەڵقی مەهستانی لای زریەی دەربەند بووە. و کاکە حەمەی مەلا کەریم مەهستانی بەمەهاباد داوەتە قەڵەم، بێ ئەوەی بەبیریا بێت کە ناوی مەهاباد تازەیە و لە سەردەمی شاهێتی پەهلەویدا داکەوتووە. من لام وایە مەبەستی خانای قوبادی لە مەهستان (مەهرووان) بووە. کە ئەمڕۆکە بووە بەمەریوان و لە زریەش مەبەستی گۆمی (زرێ وار) و، لە دەربەندیش (دەربەندی دزڵی)یە کە ئەمانە هەموویان لە کرماشانەوە نزیکن و، لەو سەردەمەشا هەروەک ئەمڕۆکە (ئەرمەنی و گورجی) نموونەی جوانی بوون و، هەمیشە کچی جوان بەئەوان دەچووێنرا و تەشبیە دەکرا. ئەم شیرینە و فەرهادە دڵیان بەیەکەوە بوو، بەڵام شیرین لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و سەربەرز بووە و، فەرهادیش

کابرایەکی ڕەنجبەری کورد بووە، جگە لە قوڵنگەکە و هێزی سەرمایەیەکی تری نەبووە. و بۆ گەیشتن بەیاری نازداری، هەر هەناسەی ساردی کێشاوە، کە خوسرەوی پەروێزی شای ساسانی باسی جوانیی ئەم کچەی بیستووە ناردوویە هێناویانە، بەڵام شیرین دڵی لای فەرهاد بووە و خۆی نەداوە بەدەس (خوسرەو)ی پەروێزەوە و، هەر ڕۆژە بەهانەیەکی دۆزیوەتەوە. فەرهادی دڵداریش هەمیشە بۆ دیتنی شیرین بەدەوری کۆشکەکەی خوسرەودا بسکەی هاتووە و، خەریکی چاوبڕکێ لەگەڵ شیرین بووە، کە خوسرەو بەمەی زانیوە لەبەر دڵی شیرین نەیکوشتووە، بەبیروڕای ڕاوێژکاران ئەم کارەی بۆ دۆزیوەتەوە، جۆگەیەک لە بێستونەوە بیات بۆ کۆشکی شیرین لە قەسری شیرین، کە لە چیاکانی کوێستانەوە سبەینان زوو شیری تێ بکرێ و بەرەو کۆشکەکە بخرێتە ڕێ. جا بەقسەی هەڵبەستەرانی ئەم ئەفسانەیە فەرهاد کاری خۆی گرتۆتە ئەستۆ و گەیاندوویەتییە پایان و، مەرجی خۆی بردۆتەوە، لەم کاتەدا خوسرەوی پەرویز بۆ ئەوەی شیرینی لە دەست نەچێ پەنا ئەباتە بەر (پیرەژنی فەرهادکوژ)، ئەم پیرەژنە سەر ئاسنینە، هەواڵی مەرگی شیرین ئەدا بەفەرهاد ئەویش پاش کوتانی پیرەژنە بەتاتەبەردێکا، قوڵنگێک ئەدات بەمێشکی خۆیا و، بەم جۆرە ئەبێ بە(شەهیدی عیشق) و سەر ئامەدی خۆبەختکاران لە ڕێی ئەوینا و، ڕەنجی بەبادا ئەچێ و، تا ئەمڕۆکە کوردەواری لە هەر کەسێ دوعای بەد بکات پێی ئەڵێت (ڕەنجت بەڕەنجی فەرهاد بێ). لێرەدا ڕەخنەکەی (نەخول)م دێتەوە بیر کە لە فەرهادی گرتووە و، لەسەر ئەوەی چۆن بۆ خاتری شیرین خاکەکەی خۆی داوەتە بەر قوڵنگە، لەو پارچە هەڵبەستەیا کە (شەرتە شڕتە)ی ناوە ئەڵێ:

(شەرتە گەرمن کوە کەن بم وەصلی شیرینم هەبێ)

تیشەیێ نادەم لە بەردت تۆی کە شیرینی منی)

بەڵام ئەگەر ئەم ئەفسانەیە بەم جۆرە ببوایە، دەبوایە کاری جۆگەکەی فەرهاد لای قەسری شیرین دوایی بهاتایە و، لەوێ خۆی بکوشتایە نەوەک لە بێستون. ئەمە وەها و ئێمە لەم وتارەدا مەبەستمان ئەوە نەبوو کە ئەفسانەی (شیرین) بگێڕینەوە. باسەکەی ئێمە جوغرافی و مێژوویییە، تەنیا بەهۆی بەردەنووسەکانی بێستونەوە لێی دواین.

بابێینە سەر باسی دێی بێستون کە سەر بەسەحنەی کرماشانە، خەڵقەکەی فەلاح و کشاوەرز و خاوەن ئاژەڵن، دەرئامەدیان گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تریە، لەگەڵ دەسکەوتی ئاژەڵی... لە دێیەکەدا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواریش هەیە.

شێوەی زمانیان کەڵهوڕیی کوردییە، ڕچی ئاینییان شیعەیێتییە، فارسیش ئەزانن... گوێگرانی بەڕێز، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، ئێستە کاتمان تەواو بوو، شەوتان باش.

۱۳٥۱/٤/۳

۲٦۷۳/٤/۳

**وتاری: ٢٥**

## بیلو

گوێگرە خۆشەویستەکان! شەوتان باش

کامەرانیتان هۆی خۆشی و شادیی بەرێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە. خۆشحاڵین بەوەی کە جارێکی تریش هەلمان دەس ئەکەوێ لەگەڵ بیستیارانی بەرنامەی (وڵاتەکەت بناسە)دا بگەینەوە یەک و، بتوانین ئەوەندەی لە وزەمانایە بۆ ڕەزامەندییان تێ بکۆشین.

موزیک

ئەمشەو باسی (بیلو)تان بۆ دەکەین... لە ئوستانی کوردستانی ئێرانا کە ناوچەکەی شاری سنەیە، دوو دێ هەیە ناویان (بیلو)وە بەلامی لاواز، ڕەنگە ئەم وشەیەش هەروەکو (بێڵو) بەلامی قەڵەو ناو بێ بۆ ئەو سەرچاوانەی کە پایزان وشک دەکەن و، بەهاران دەژێنەوە. هەر چۆنێی دێی (بیلو)ی یەکەم لە بەخشی بانەیە، سەر بەدێهستانی (دەشتەتاڵە) و، ٢٠ کیلۆمەتر لە بانەوە دوورە و، ئەکەوێتە لای خۆرئاوایەوە و، لە شەقامەڕێشەوە ٤ کیلۆمەترێک دوور ئەبێ، ئەم دێیە بچووکە و کەمتر لە ٢٠ ماڵە، تیمسار ڕەزم ئارا لە فەرهەنگی جوغرافییەکەیا، دانیشتووەکانی بەکەمتر لە سەد کەس داناوە. خەڵکی ئەم دێیە کاروباریان کشتوکاڵ و ڕاندارییە، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، بەرهەمی ئاژەڵی و خوادادیشیان هەیە وەک مازوو، کەتیرە، قەلقاف، زوبانی خەڵکی دێیەکە کوردی و ڕچی ئائینییان ئیسلام و سوننین...

موزیک

بیلوی دووەم دێیەکە لە بەخشی مەریوانا ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی پەنجوێن و، لای باکوری شاری قەڵای مەریوانەوە و، ١٨ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، لە شەقامەڕێکەشەوە ٢ کیلۆمەترە، هەرێمێکی کوێستانییە و سەردەسێرە، ئاوی چەم و کانیاوە ٨٠ ماڵێ ئەبێ، سەرژمێریان بەپێی (فەرهەنگی ڕەزم ئارا) ٣٧٠ کەس بووە و، ئێستە زۆرترە - زبانیان کوردییە و ڕچی ئائینییان ئیسلام و سوننییە، کار و پیشەیان کشتوکاڵ و ڕاندارییە، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، توتن و برنج و شتی تریشیان هەیە، مزگەوت و قوتابخانەی ئائینی تیایە، قوتابخانەی بەراییشی تیا دامەزراوە.

هۆی ناوبانگی دێی بیلو ئەوەیە کە مەڵبەندی بولبولی ئەوین پەرستان، هەستیاری دڵ گەرمی شەیدای کوردستان، (کاکە حەمەی ناری)یە، کە لەساڵی ١٩٠٤ەوە تا ١٩٤٤ی زایینی لەو دێیەدا پێش نوێژی مزگەوت و مامۆستای قوتابخانەی ئاینی بووە و، حوسێن بەگی بیلو بۆ ئەم کارە بەرزە بانگهێشتی کردۆتە ئەوێ... جا هەروەکو لەمەوبەر وتمان هۆی بەرزبوونەوەی ناوی هەمموو جێیەک، بەوەوەیە کە کەسێکی پیاوی تیا هەڵ بکەوێ... پیاو بەهەمموو ماناوە، چ لە ڕووی خوێندەوارییەوە، چ لە ڕووی جوامێرییەوە... تاد.

موزیک

ئەمە وەها و گەرچی زۆربەی خوێندەوارانی کورد بەهەڵبەستی جوانی کاکە حەمەی ناری گوێیان شاد بووە، بەڵام زۆری وایان هەیە کە بەسەرهاتی ئەو نازانن، ئێمە بۆ ئەم باسە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلائەدین سەجادی نەکەین بەسەرچاوگە و، ئەم زانیارییانەی لێ هەڵئەئێنجین. مەلا کاکە حەمە کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانە، لە بنەڕەتا خەڵقی هەورێمی شلێرن کە ناوی گوڵی جوانی شلێری لێوە هاتووە، دایکی کاکە حەمە لە بەگزادەکانی (کێکن)ە، کە ئەویش لە دێیەکانی مەریوانە، کاکە حەمە لە دێی کێکن لە دایک بووە و، لە شەش ساڵییا باوکی فێری ئەلف و بێی کردوو و، مەشقی بۆ داداوە و قورئانی پێ خوێندووە و کتێبە بەرایییەکان و فارسیشی فێر کردووە. پاش ئەوەی کە لە خەم دەرچووە چووە بۆ فەقێیەتی و، بەقوتابخانە ئاینییەکانی مەریوان و هەوراماندا گەڕاوە، ئنجا چووەتە لای مەلای پەنجوێنی و مەنطقی لەلای خوێندووە. پاش ئەوە ڕۆییوەتە سنە لە مزگەوتەکانی (شەریعەت مەدار) و (دارالئیحسان)دا دوو ساڵێک ماوەتەوە، شارەزای ڕەوشت و خووی خەڵقی ئەوێ بووە. پاش ئەوە چووەتە بانە بۆ لای قازی عەبدولڕەحمان کە مەلایەکی بەناوبانگ بووە، ئنجا چووەتە تورجان و بۆکان و مەهاباد و بەهەمموو قوتابخانەکانی ترا گەڕاوە تا وان و باشقەڵا. پاش ئەوەی بەم گەشتانە و، خوێندنە جۆرجۆرانە مێشکی خۆی زاخاو داوە، هاتۆتە ڕەواندز و لەوێ لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و، گەواهینامەکەی لەبن دەستی خۆی قایم کردووە و گەڕاوەتەوە بەرەو کێکن، وەلە جێی باوکی بووە بەپێش نوێژ و مامۆستای دێی کێکن.

ئنجا وەکو وتمان حوسێن بەگی بیلو چووە هێناوێتییە بیلو بۆ ئەوەی پتر بتوانێ خزمەتی کوڕانی نەتەوەکەی بکات، جا مەلا کاکە حەمە کە پیاوێکی زانا و، هەستیارێکی بەزەوق و قسە خۆش و زۆریش لە خواترس و پارێزگار بووە، هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی

ڕەوشت و خوی بەرز بڵاو بکاتەوە و لە ساڵی ١٩٠٤ەوە تا ساڵی ١٩٤٤ی زایینی بەو جۆرە ڕێبەری و ڕێنومایی فەقێیان و ڕۆڵەیانی کوردی کردووە و لەم ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە... ئێمە پیرۆزبایی لە دێی بێلو دەکەین کە خۆی بەناوی مەلا کاکە حەمەوە بەرزکردۆتەوە و، بەم هۆیەشەوە پارچە هەڵبەستێکی گەرمی ئەویناوی ئەو زاتەتان پێشکەش دەکەین کە لە لاپەڕە ١٣٦ی دیوانەکەیا چاپ کراوە؛ لەژێر ناوی (دەرسی عیشق)دا:

مودەتێکە من گرفتارم بەدەس سەوداتەوە
بووم بەدوای چینی زوڵف و پەرچەمی تاتاوە
مەنعی قوللابی موژەت ناکەم لە ڕاکێشانی دڵ
چون ئەسیری چاوی مەستی خەویەتی ئەیباتەوە
وا سەرم دانا بەعەزمی بەردەبازی ڕێگەکەت
مەرهەمی دەردی دڵی من، وا بەگەردی پاتەوە
گەر دەپرسی حاڵی پەروانەی دڵم دوور بێ لە ڕووت
وا لە سوزشدا، لە سایەی شەوچرای گۆناتەوە
چاوی خوێن خواری، بەخوێنم فێرە وەک لێوێ بەمەی
لێی گەڕێن ئێوە و خوا، ئەو کافرە بێخواتەوە
شاهی چاوت مولکی صەبر و تاقەتی بردم بەزۆر
موصحەفی ڕووی تۆ بەگژیا چی، ئەگەر نەمداتەوە
مێشی خاڵت نافڕێ، بەس باوەشێنی کە بەناز
چونکە پابەندە بەشەهدی ڕومەتی زیباتەوە
شین و، واوەیلایە، ئاثاری قیامەت هەڵدەسێ
گوڵ بەدەنی ئەمڕۆ، ڕووەو مەشریق ئەگەر لا کاتەوە
لەب (شەکەر) فەرمو: بەزوڵفت باوەشێنی بەس بکات
مێشی ڕوحم گەر ئەنیشێتەوە، بەقەندی چاتەوە
خەطی دەرسی عیشقی (ناری) وەک ڕقومی خاڵەکەت
وا بەلەوحی گەردنی بێ گەردی وەک میناتەوە

گوێگرانی بەڕێز... ئەو جێیانەی بچووکن و مێژوو لە یادی کردوون، گەرچی لای

خێویانیش باییدار و بەنرخ بن. و خەڵقی ناوخۆیان شتیان زۆر دەربارەی بزانن، بەڵام ئێمە کە ناشارەزای هەموو سووچێکی وڵاتەکەین، ناچارین تەنیا چاو بەکتێبی نووسراوا بگێڕین، ناگــزووری و ناتەواوی هی ئەو ســەرچاوانەیە کــە لەو بارەوەن دانەران و نووسەرەکانیان هەندێ ناویان بەهەڵە چاپ کردووە. ئێمە لە پاومانی ئەم وتارەدا، داوا لە بیستیارانی خۆشەویست دەکەین بەپێی وزەی خۆیان ڕانومایيمان بکەن. و تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٤/٨

٨/دروێنە/٢٦٧٣

**وتاری: ٣٦**

# بیویانی

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش! کامەرانیتان هۆی دڵشادیی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە، ئەگەر لە یادتان مابێ چەند حەوتەیەک لەمەوبەر، بەڵێن وابوو بە(کەرەم محەمەد بیویانی) کە وەڵامی پرسیارەکەی لە باسی بیویانیدا بدەینەوە... ئەو کوڕە کوردە لە نامەیەکا کە بۆ ئەم بەرنامەیەی نووسیبوو، پرسی بووی! پەیوەندی لە نێوان دوو تیرەی (بیویانی) و (ڕۆژبەیانی)یا چییە؟ جا ئێمە گەرچی ئەم زنجیرە وتارەمان زۆرتر پەیوەندی بەجوغرافیاوە هەیە واتا شار و دێ و ئاواییەکان بەخەڵق ئەناسێنین و، بەو هۆیەشەوە هەر بەسەرهاتێکی مێژوویی ئەویشمان بەرچاو بکەوێ ڕوونی ئەکەینەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە بیویانی هەروەکو ناوە بۆ تیرەیەک و ناویشە بۆ هەرێمێ کە پازدە دێی تیایە و، لەبەرئەوەش کە ڕۆژبەیانی هەر وەکو ناوە بۆ تیرەیەک، بەم ناوە چەندین ئاواییش هەیە، ئەوا لە باسی بیویانیدا وەڵامێکی کورتی کاک کەرەم ئەدەینەوە.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی لە لاپەڕەکانی ٥٤-٩٣ی جوغرافیای خۆرئاوای ئێراندا چەند جارێ ناوی بیویانجی بردووە و، ئەڵێ: بیویانج ئەکەوێتە پاوەمانی کێوی شاهۆوە و جێگەیەکی سەردەسێرە، شێوەی زمانی ئەو ناوە (روجبی)یە کە لە هەورامییەوە نزیکترە و عێلەکانی (جاف) و (لەک)ی ئەو ناوە شێوەی زمانیان کوردی سنەییانەیە، ئنجا ئەڵێ: بیویانج و ڕوجبی، لە بنەڕەتا زۆرتر بوون، عێلاتی سنە تەنگیان پێ هەڵچنیون، تەرتە وەرتەیان کردوون، ئەمە وەها و لە قسەکانی ژاک دومورگان وەهامان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەو وشەی (روجبی) بەتاک وشەی (روجبیانی) دانابێ و، زۆر سەیرە وەرگێڕی فارسییەکە، وشەی (بیویانژ)ی کردووە بە(بیویانج) و وشەی (روژبی)شی کردووە بە(روجبی) وەک (ژ)ی نەزانی بێ و لە بنەڕەتا عەرەب بووبێ. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە لەو حەلەدا (بیویانژ) سەر بەئوستانی (سنە) -واتا کوردستانی ئێستە- بووە، پاشان کە سنە و کرماشان بوون بەدوو ناوچەی دوو ئوستان (بیویانژ) خراوەتە سەر کرماشان، ئا ئەوەتا تیمسار ڕەزم ئارا، نیو سەدە لەوە پاش لە

فەرهەنگی جوغرافییەکەیا ئەڵێت: بیویانژ یەکێکە لە دێهستانەکانی ناوچەی کرندی سەر بەفەرمانداریی شاهئاباد و ئەکەوێتە لای باکوری بەخشی کرندوە، چوار دەوری چیای زۆر سەختە، رووباری (زمکان) لەوێوە هەڵئەقوڵێ و، شۆڕ ئەبێتەوە هەرێمی (گۆران) -واتا ئەو سەر زەوییانەی عێلی گۆرانی تیا دائەنیشن- ئاو ئەدات.

بەرزترین چیای ئەو ناوە لووتکەی کێوی نسار، ئنجا کێوی سیاهانە. پێ دەشتی بیویانژ ٦ کیلۆمەترێک پانایی و ١٥ کیلۆمەترێک درێژایی ئەبێ. یازدە دێی گەورە و بچووکی تیایە، کار و کاسبی خەڵقەکەی ئەم ناوە کشتوکاڵ و مێگەلدارییە، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، بەرهەمی ئاژەڵییان شیر و ماست و رۆن و خوری و پێستەیە، ژمارەی دانیشتوانی ١٣٠٠ کەس ئەبێ، زبانیان کوردییە... قسەکانی رەزم ئارا لێرە دوایی هات و، بێ گومان لەوەی کە ئەڵێ شێوەی زمانیان کوردییە، مەبەستی گۆرانییە، نەوەک گۆرانییەکی سەختی وەک هەورامی، بەڵکو گۆرانیەکی تێکەڵ بەلوڕی و کەلوڕین، جگە لەمە ئەمین زەکی بەگی بەهەشتیش (بیبیانی) بەمەش لە عێلی گۆران داوەتە قەڵەم و، مەبەستی ئەوە بووە کە شێوەی زمانیشیان گۆرانییە و، ئەم بیویانژانە ئەمرۆکە بە(قەڵخانی) بەناوبانگن و، لەسەر رچی ئاینیی کۆنی کوردن کە پێی ئەوترێ (کاکایی)، بەڵام بیویانییەکان کە ئەمرۆکە چەند دێیەکن لە دەوری (قەسری شیرین) و جارجارە خۆیان بەجاف و جارجارە خۆیان بەباجەلان ئەدەنە قەڵەم، ئەوانیش هەر رۆژبەیانین و، لە بنەڕەتا لەگەڵ بیویانژەکان یەکێکن... بەڵام ئەوان بەهۆی هاوسێتی ئەو هەرێمانەوە کە رۆژبەیانی تیا دانیشتوون، بوون بەسوننی و لەسەر رچی شافیعیی ئیسلامن و، شێوەی زمانیشیان لە گۆرانێتییەوە لای داوە بۆ کرمانجێتیی خواروو...

## موزیک

هەروەکو لە قسەکانی ژاک دومورگان بۆمان دەرکەوت بیویانژ لە بنەڕەتا رۆژبەیانین و با ئەمەش روون بکەینەوە کە ئەم تیرەی رۆژبەیانییە (روزبەیانی) و (روزبیانی) و (روزبهانی)شی پێ ئەڵێن. موستەوفی قەزوینی لە (تەئریخی گوزیدە)دا و موعینی تەنزی لە (مونتەخەب التەواریخ)دا و ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی لە (شەرەفنامە)کەیا، هەر سێکیان، کە دەربارەی سەرداریتی و ئەتابەگێتییەکانی هەردوو لوڕستانی گەورە و بچووک دواون، لە باسی لوڕستانا ناوی (روزبهانی)یان بردووە. لە قسەکانی دووانیان وا دەرئەکەوێ کە رۆژبەیانی لوڕ نین، بەڵکو (روزبهانی، زەنگەنە، سیامەنسووری، چنگن) لەو عێلانە بوون کە لە دەوروبەری گەرووی دەربەندی لوڕستاندا نیشتەجێ بوون، واتا

گۆران بوون، وەکو لوڕەکان کۆچەر نەبوون. وە ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە لە کوردستانی باشووردا، هەمیشە (گۆران) ناو بووە بۆ کوردە نیشتەجێکان، کە هەمیشە بەترسنۆک دراونەتە قەڵەم، کە نەیانوێراوە لە ئاواییەکان دوور بکەونەوە و، قسەی جافەکان... کە ئەڵێن: (گۆران... بووەتە پەندی پێشینان)، جا گۆرانەکان لە کۆنا عێلاتێکی زۆر بوون: وەکو (زەنگەنە - شێخان - سیامەنسووری - ڕۆژبەیانی - کاکەیی - ساڵەیی - شوانی کێشک - عێلی گۆران - گەلالی...) کە هەموویان بەشێوەی گۆرانی نزیک بەهەورامی ئێستە دواون.

ڕۆژبەیانییەکان لە بنەڕەتا بەشێ بوون لە عێلی گەورەی (شوول) کە ئەمڕۆکە لە ئوستانی فارس دائەنیشن، وا دیارە لەپێشا لە هەرێمی گیلان و ئازەربایجان دانیشتوون مێژوونووسی کوردی بەهەشتیی حوسێن حوزنی موکریانی لەو کتێبەیا کە ناوی ناوە ئاتروپاتێن یا کوردستانی موکریان ئەم هەڵبەستە فارسییەی پاڵشت داوە بە(قەتران) و گەرچی لە دیوانە چاپەکەیا نەنووسراوە، ئێمە لە زمانی ئەوەوە باسی دەکەین دەڵێ:

«ز اکراد راوند و شاهین و شول * بس لشکر آمد سوی دزفول»

جگە لەمەش وەکو (ئەلکامیلی ئیبن الئەثیر) لە لاپەڕە ۱۷۰ بەرگی ۸دا و کتێبە مێژووییەکانی تریش دەڵێن: روزبهان کوڕی وەنداد ساڵی ۳٤٥ی کۆچی دژی موعیز الدەولەی دەیلەمی نال بوویە شۆڕشی هەڵگیرساند و تا ئەهوازی داگیرکرد، پاشان موعیز الدەولە بەسەریا زاڵ بوو... هەروا (مونتەخەب التەواریخ)یش لە لاپەڕە ۳۸دا ئەڵێ: سەیفەدین مهاکانی ڕوزبهانی کە لە سەردەمی ساسانییەوە، بەبنەماڵە تا سەدەی کۆچی سەرۆکی شولستان بوون، نیازی لەسەر ئەوە بەست کە لوڕستان داگیر بکات بەڵام نەسیرەدین محەمەد کوڕی هیلال سەرۆکی لوڕستان بەسەریا زاڵ بوو و کوشتی و هەرێمی شولستانیشی داگیرکرد. ئەمە وەها و ئەمڕۆکە هەروەکو بیویانییەکان تەرتە وەرتەبوون، هەروا ڕۆژبەیانییەکانیش، هەر وەکو ئەوان ناویان گۆڕاوە بە(بیبیانی) و بە(بیویانژ)، ڕۆژبەیانییەکانیش لە شیراز و کرماشان و مەلایر بە(روزبهانی) ناو ئەبرێن و، لە لوڕستان بەڕوزبیانی و، لە کوردستانی ئەو دیوا (عێراق) بەڕۆژبەیانی. ئەمە وەها و ئەم درێژەدانە لەبەر دڵی کاک کەرەم محەمەد بیویانی بوو، ئەگەر خوا هەل بدات لە باسی ڕۆژبەیانیدا زۆرتر لەم باسە ئەدوێین، ئێستە کاتمان تەواو بوو، شەوتان باش.

۱۳٥۱/٤/۱٤

۱٤/دروێنە/۲٦۷۳

## وتاری: ۲۷

# پاتاق

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش! ئاواتەخوازی کامەرانی و شادیتانین و، بەهیواین کە ریزە وتاری ولاتەکەت بناسە، بەسەرهاتی کۆنی ولاتتان بهێنینەوە بیر و بتانخاتە سەر ئەو بیرەی کە پێشکەوتی ئەمڕۆتان لەگەڵ ژیانی کۆنا بەراورد بکەین. و ئەوەشمان لەبیر ناچێ کە بەداخەوە بڵێین، کاتێ ئەمانەوێ دەربارەی روونکردنەوەی هەندێ جێ شت بنووسین، سەرچاوەی مێژوویی یارمەتیمان نادات چونکە لەو بارانەوە کەم شت نووسراوە، ئێمە خۆمانیش ئەوەندە بەڵەد نین وەک بەهەرێمەکەدا گەڕابین، بەتانی بەسەرهاتی ئەو جێیەدا بچین. لەبەرئەوە ئەگەر هەست بەکەم و کوڕی کرا، تاوانی ئێمە نییە. و با ئەوەشتان پێ ڕابگەێنین کە ئەمجارە باسی (پاتاق)تان بۆ دەکەین.

موزیک

پاتاق، ناوی یەکێکە لەو چوار دێهستانەی کە سەر بەبەخشی (سەرپلی زەهاوە)ن کە لە زاراوەی کوردی ئەو ناوەدا پێی ئەوترێ (سەرپێڵی زەهاو). بابێینە سەر بنج و بناوانەی ناوی پاتاق، دەبێ لەوێوە هاتبێ کە ملەی پاتاق ئەکەوێتە ئاخری زنجیرە چیای تاق بوستان و، پاتاق واتا پاوماني ئەو چیایەی (تاق)ی تیایە. ئەمە وەها و بابێینە سەر باسی مێژوویی ئەم ناوە: بەقسەی موشیر الدەولە پیرنیا کە لە لاپەڕە ۲۷۰۳ی ئێرانی باستاندا لەم بارەوە نووسیویە:

ئەم ناوە لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بووە و، شوێنەواری کۆنی ئەو ناوە لەسەر ئەوە گەواهە، چەند بەردەنووسی هەیە، یەکێکیان هی سەردەمی ئەردەوانە، لە شایانی ئەشکانی... بەڵام بەداخەوە روون نەکراوەتەوە هی کام ئەردەوانە! جگە لەوەش دوو سەنگ تەراشی تریش هەیە لەو ناوەدا، مێژوویان ئەگەڕێتەوە بۆ پتر لە دوو هەزار ساڵ بەر لە زایینی، واتا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە هێشتا نەتەوە ئارییەکان لەم ولاتەدا نەبوون بەخاوەن دەسەلات... جگە لەمانە لەم ناوەدا سەنگ تەراشێکی تریش هەیە هی سەردەمی (پارت)ەکانە، بەیەکێک لە پادشایانی پارت سواری ئەسپێکی تۆزی بچووکی بەتەوژمە و، کابرایەک لە کوڕانی ولات لەبەردەمیا وەستاوە، چەپکە گوڵێکی بەدەستەوە پێشکەشی

نەکات بەشا، کە لەم پەیکەرەدا تاجێکی ڕیشوداری بەسەرەوەیە، بەرگێکی زۆر تەنگی لەبەردایە، تەنیا دەلینگی شەڵوارەکەی زل و بڵاوە، کە تا سەر چەکمەکەی پۆشیوە. کابرای سەنگ تەراش، پەیکەرەکەی شای جوان هەڵکەندووە، وردەکاری تیا کردووە، بەڵام پەیکەری کابرای ڕۆڵەی گەل زۆر ناشرین دروست کراوە... دوور نییە کە ئەو حەلە یاسا بەو جۆرە بووبێ هی شاجوان و هی خەڵقی تری ناشرین بکێشرێ.

موزیک

پاتاق، کە ناوچەی دێهستانێکە، دێیەکی گەورەیە، ئەکەوێتە باشووری لای خۆرهەڵاتیی بەخشی سەرپێڵەوە، وەها بەلێواری شەقامەرێی قەسری شیرین - کرماشانەوە و، ئەکەوێتە لای خواری دەربەندە تەنگەکەی پاتاق و لای باکوری چیای (شالە گۆش و باڵا تاق) و لای خواری (بەرزکۆ)وە. دوازدە دێیەکی هەیە، گەورە و بچووک، لە هەموویان گەورەتر دێی (فولادی)یە و زۆربەی ئاواییەکانی سەر ئەم دێهستانە ئەکەوێتە کەناری شەقامەرێیەکە... ئەمە وەها و ئاوی ئەم دێیە هی سەرابی پاتاقە، لەوێوە شۆڕ ئەبێتە خوارەوە. خەڵقی ئەم ناوە کوردی کەڵهوڕن، فارسیش ئەزانن، دانیشتوانی دێی پاتاق ٣٠٠ کەسێ ئەبن، کار و کاسبیان کشتوکاڵ و گەلەدارییە، بەرهەمیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، توتن و برنج و پەموشیان هەیە. دەسکەوتی ئاژەڵیشیان شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن و پێستە و خورییە. مەڕ و ماڵات ئەنێرن بۆ فرۆشتن، جگە لەم کارانە لەبەرئەوەی ئەو ناوە چیایەکی جەنگەڵاوییە، خەڵق ئەتوانن لە داروەدەوەن سوود وەربگرن. داری قەڵاشکراو و، هێزم و پەرج بوو سووتەمەنی ئامادە ئەکەن و، لە تەنەی دارە زلەکان خەڵۆز دروست ئەکەن و بۆ فرۆشتن ئەینێرنە شارەکان، ئەمە وەها و لە دێکانی سەر بەپاتاق خوێندنگەی بەرەنگاری لەگەڵ نەزانی وەسازمانی ڕێنومایی تەندروستی و، پەرەپێدان بەکشتوکاڵ هەیە. دەستەیەک لەوانەی کە خوێندنی ناوەنجییان تەواو کردووە و دەورەیان دیوە و بۆ ئەم ڕانومایییە ئامادە بوون. ئاوایی پاتاقیش مزگەوت و قوتابخانەی بەرایی تیایە. گوێگرانی خۆشەویست، لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات، تا حەوتەیەکی تر بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٤/١٩

١٩/دروێنە/٢٦٧٣

**وتاری: ٢٨**

# پاڵنگان

گوێگرانی بەڕێزی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێران شەوتان باش!

کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە، خۆمان بەخۆشبەخت ئەزانین، جارێکی تریش لەگەڵتان کۆئەبینەوە و، ئەمجارە باسی (پاڵنگان)تان بۆ دەکەین.

موزیک

پاڵنگان، یەکێکە لە شوێنەوارە کۆنەکانی کوردەواری، ئەکەوێتە پەنای چیای (شاهۆ)وە... دەبێ ئەم ناوە یا لە (پڵنگ)ەوە هاتبێ کە کوردەکان لەبەر ئازایی خەڵقی ئەم هەرێمە بەسەر شارەکەدا بڕبیێتیان و لەوێ ئەڵێن (پالنگ)ان، وەیاخۆ تێهەڵکێش بێ لە دوو وشەی (پاڵ) و (گا)، چونکە ئەکەوێتە پاڵی چیاکەوە... ئەمە وەها و ئەگەر باوەڕ بکەین کە ئەم دوو هەڵبەستەی مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی و کەسانی تری تۆماریان کردووە و، لافی ئەوەیان لێداوە کە کۆنن و هی سەرەتای ئیسلامن و لەسەر پێستە ئاسک نووسراون و، ئەڵێ:

زۆر کار ئەرەب کردنە خاپور
گەناو (پاڵە) هەتا شارەزوور
ژن و کەنیشکان و دیل یشینا
مەرد از اتلی ژەروی هوێنا...

ئەگەر ئەمە ڕاست بێ دەبێ مەبەست لە (پاڵە) ئەم شارۆلکەیەی (پاڵە) بووبێ. و هەر چۆن بێ شاری پاڵەنگان لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا بەدەس بنەماڵەی (بابا ئەردەڵان)ەوە بووە تا سەدەی نۆیەم و، وا دیارە، لەو حەلەدا کە تۆزێ ئەردەڵان لاواز و کەم هێز بووە، سەردارانی کەلهوڕ دەستیان بەسەرا گرتووە... با گوێ بدەینە ئەمیر شەرەفخان یەگان مێژوونووسی کۆنی کورد لە لاپەڕە ٤٠٨ی شەرەفنامە فارسییەکەیا ئەڵێت: میران و فەرمانڕەوایانی کەلوڕ سێ لق بوون؛ و خۆیان وا ئەدایە قەڵەم کە لە بنەڕەتا لە ڕەچەڵەکی (گودەرزی گیو)ن، لقەکان ئەمانە بوون: لقی (پاڵەنگان)، لقی دەرتەنگی (حەلەوان)، لقی (ماهیدەشت). ئێمە لێرەدا باسی لقی (پاڵەنگان) ئەکەین، ئەوەکانی تری

ئەهێڵینەوە بۆ جێی خۆی... لە سەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەویدا غەیبوڵلا بەگ ناوی گۆڕانی، کە خێوی پاڵەنگان و ئەم قەڵایانە بوو. (دێودز - نەودز - دزمان - کواە گور) (مۆر) و (کلانە) و (نشور) و (مرواریدیەمەن) خۆی دایە پاڵ شا ئیسماعیل. بەگومانی من دەبێ ئەم کارە لە ساڵانی ٩١٣-٩١٤ کۆچیدا بووبێ کە شا ئیسماعیل شاڵاوی کردۆتە سەر بەغدا و داگیری کردووە. ئەم غەیبوڵلا بەگە پیاوێکی ڕەوشت بەرز، لە خواترس، هونەرمەند، سایەدار بووە؛ بەداخەوە جگە لە (شەرەفنامە)، لە هیچ کام مێژووی دەورانی سەفەویدا، وەک (ئەحسەن التەواریخ) و (عالەم ئارای عەبباسی) ناوی ئەو و وڵاتەکەی نەهاتووە. دەبێ شەرەفخان ئەم هەواڵانەی لە کوردەکانی ئەو ناوە بیستبێ.

موزیک

هەرکە غەیبوڵلا بەگ محەمەد بەگی کوڕی لە جێی دانیشت، شا تەهماسپی سەفەوی فەرمانی دایێ کە لەسەر سەردارێتییەکەی خۆی پایەدار بێ و، کچەکەشی خواست، بەمە خۆیشی لەو ناوەدا پشت ئەستوور کرد. ئەم محەمەد بەگە پیاوێکی زانا و، ئەدەب دۆست بوو، لە پاڵەنگان خوێندنگەی نایینی و، مزگەوتی دروست کرد و، دەربارەی گەل دادپەروەر بوو. بەم جۆرە بیست ساڵی فەرمانڕەوایی کرد، پاشان وڵاتەکەی لە نێوان چوار کوڕەکەیا دابەش کرد. کە ناویان (میر ئەسکەندەر، میر سلێمان، سوڵتان موزەفەر، جەمشید بەگ) بوو، لە ناویا میر ئەسکەندەری کرد بەجێگری خۆی جا ئەم ئەمیر ئەسکەندەرە لە سەردەمی شا ئیسماعیلی دووەمدا مرد، سولاغ حوسێنی تەکلو کە یەکێ بوو لە فەرمانداەکانی سپای قزڵباشی سەفەوی و لە دینەوەر دائەنیشت لەم هەلەدا پاڵەنگانی داگیرکرد، بەڵام لەبەرئەوەی خوێنخوا و ستەمکار بوو، براکەی خۆیشی هاوکاری لەگەڵ نەکرد، ئەوە بوو سوڵتان حوسێنی تەکلو ڕای کرد بۆ شارەزوور کە لەژێردەستی مەحموود پاشای کوڕی شەمسی پاشای میر میراندا بوو، بەڵام دەسەڵاتی زۆر پایەدار نەبوو، هەرکە شا ئیسماعیلی دووەم مرد وەلی خان تەکلو سەرداری هەمەدان، کە لە خۆی بایی بووبوو و، کەوتبووە خەیاڵی سەربەخۆیی پاڵەنگانی داگیرکرد و خستییە سەر هەمەدان، بەڵام مەحموود پاشا کە سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوو پاڵەنگانی لە دەس دەرهێنا و خستییە سەر وڵاتی بابان. پاش ئەمە، یا لەژێر دەستی سەردارانی ئەردەڵاندا بووە، یا لەژێردەستی میرانی باباندا. لێرەدا گەڵاڵەی قسەکانی ئەمیر شەرەفخان تەواوبوو.

ماموستا عەلائەدین سەجادیش، ئەم باسەی لە زمانی کوڕێکی پاڵەنگانییەوە تۆمار کردووە، ئەڵێ: پاڵەنگان کۆنە میر و شایارنشینە، لای خۆرهەڵاتی گوندی کوڕەی دەژنە

بووه، لای خۆرئاوای دیو دز بووه کە ئەمڕۆکە پێی ئەوترێ (دیوە ژناو)، لای باشووریشی واتا لای خواری چیای شاهۆیە، لای باکوریشی چەمی نییەر و میراوە، دوانزە فرسەنگ لە خوار سنەوە بووە، لەبەرئەوەی هەمـوو دەوروبەری چەم و کـانی بووە دیمەنی نیـمـچـە «وروگـە»یەکی هێناوەتەدی، لەبەرئەوە حـەوت پردی لەسـەر هەڵواسـراوە ئاوەکـانی دەوروبەری ڕووباری گەورەیان پێکهێناوە کە تێکەڵ سیروان ئەبێ. و تیمسار ڕەزم ئاراش ئەڵێ: پاڵەنگان یەکـێکە لە دێهسـتـانەکـانی (ژاوەرو)ی بەخـشی ڕەزاوی ئوسـتـانی کوردستان و کەوتۆتە لای باشووری خۆرهەڵاتییەوە و، بەلێواری سیروانەوەیە. ئەم قسانەی تیـمسـار ڕەزم ئارا هی کـاتێک بووە کـە ئوسـتـانی کـوردسـتـان و ئوستـانی کـرمـاشـان و فـەرمـانداریی گشـتی هەمـەدان هەمـوو یەک ئوسـتـان بوو، بەڵام سـاڵی ١٣٧٧ی فـارسی بەدواوە بەش کرا بەئوستانی کوردستان کە ناوچەکەی (سینەدژ)ەوە بەئوستانی کرماشان کە ناوچەکەی (کرماشان)ە و بەفەرمانداریی گشتی هەمەدان و (پاوە) کرا بەفەرمانداریی و ناوی (ژاوەرو) برایەوە سـەر ڕیشـەی بنچـینەیی و کـرایەوە بە(جـوانڕۆ)، جـا ئـەمـڕۆ پاڵەنگان یەکێکە لە دێهستانەکانی بەخشی جوانڕۆی سەر بەشارستانی پاوەی ئوستانی کـرمـاشـان و، هەروەک وتمان لەمـەوپێش جـێی زانایان و ئەدیبـان بوو، زەین العـابدین پاڵەنگانی کە لە ١٦٨٠ و تا ١٧٨٠ زایینی ژیاوە، واتا سەد ساڵی ڕەبەق تەمەنی بووە، هەسـتـیارێکی زۆر بەناوبانگ بووە بەداخەوە هیچمـان لە هەڵبەستەکانی دەس نەکەوت و ئێمە ناوی عێلات و تیرەکانی ئەم ناوە لە باسی پاوەدا ئەبەین، پاڵەنگان ٣٦ کیلۆمەتر لە (ڕەزاو)ەوە دوورە و بەلێواری سیروانەوەیە، هەرێـمـێکی سـەردەسێرە، دانیشـتوانی هەزار کـەسێ ئەبێ، زمـانـیـان گـۆرانـیـیـە، هەم هەورامی و، هەم گـۆرانیی تێکەڵ و پێکەڵ بەکرمانجی و کەلوڕی و لوڕی ئەزانن، ڕچی ئاینییان شافیعیی ئیسلام و، کار و کاسبیان کشتوکاڵ و ڕاندارییە، باغ و دارستانی میوە یان زۆرە، لە دێ (هەنگوێن) و بنیشـتیش، لەگـەڵ کـەتیـرە و مـازوو و، گـوێز و مـیـوەی کێـوی هەیە، لەم سـەردەمـەدا خـوێندنگەی بەرانگاری لەگـەڵ نەخوێندەواریش دانراوە و، سازمانی نەخۆشی لابەر و کشـتـوکاڵ باش بکەریش هەیە. گوێگرانی بەڕێز لێرەدا باسەکەمـان تەواو بوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥١/٤/٢٤

٢٤/ دروێنە/٢٦٧٣

**وتاری: ٢٩**

## پاوه

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

خۆشی و بەختەوەریتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە. ئەمشەو باسی (پاوە)تان بۆ دەکەین کە ناوچەی فەرمانداری و سەر بەئوستانی کرماشانە.

موزیک

ناوی (پاوە) دەبێ لەوێوە هاتبێ کە دەکەوێتە لاپاڵی چیای شاهۆوە... کە ناوی ئەم کێوە لە بنەڕەتا لە (شاهکۆ)وە هاتووە و، لەبەر بەرزی و دووورودرێژی ئەم ناوەی بەسەرا براوە، ئەم زنجیرە چیایە بەلای خۆرهەڵاتی دێهستانەکانی ڕەوانسەر و جەوانرۆ و پاوەدا درێژەی کێشاوە تا سەر سیروان و لەبەر سیروان پێی ئەوترێ کێوی تەخت و، هەر ئەم شاهکۆیە کە لە زمانی یۆنانیی کۆندا وەرگەڕاوە بەزاگرۆس، کە لە کلکەی زریەی فارسەوە تا پاومانی ئارارات و زریەی ناوەڕاست درێژە ئەکێشێ و بەرزترین لووتکەی شاهۆ لای پاوە ٣،٣٧٠ مەترە لە ڕووی زریەوە. ئەمە وەها و ئەوەی کە لای هەندێ قاوە کە گۆیا (پاوە) ناوی سەردارێکی (یەزدی گورد)ی پادشای ساسانی بووە، ئەفسانەیەکی درۆیە، نە لە کتێبە مێژووییەکانا و لە داستانەکانیشا شتی وەها بەرچاو نەکەوتووە و، نەبیستراوە. ئەم پاوەیە لە کۆنا سەر بەحەلەوان بووە و یەکێک بووە لە قەڵا سەختەکانی عەییارییەکان و حەسەن وەیهییەکان، پاشان ماوەتەوە بۆ سەردارێتیی ئەردەڵان ئینجا کەوتۆتە دەست سەردایێتی کەلوڕ و، بەدەس ئەو لقەوە بووە کە فەرمانڕەوای دەرتەنگ و حەلەوان بوون. ئەمیر شەرەفخان لە لاپەڕە ٤٠٨ بەدواوە، وای داوەتە قەڵەم کە ئەم سەردارێتییە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لەژێر فەرمانی زۆراب بەگ ناوێکا بووە، کە پیاوێکی بەدەسەڵات و خاوەن زەبروزەنگ بووە، پاش مردنی ئەو کەوتۆتە ژێر فەرمانی عومەر بەگی کوڕی، لەم سەردەمەدا سوڵتان سلێمانی عوسمانی کە پێی ئەوترا (قانونی) توانیویە بەهۆی ذوالفیقارْ خانی کەلوڕەوە کە لەلایەن سەفەوییەکانەوە کرابوو بەوالیی بەغدا، وڵاتی شارەزوور و عێراقی عەرەب داگیر بکات. لەم حەلەدا ئەم عومەر بەگە خۆی داوەتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی و تا لە ژیانا ماوە هەر فەرمانڕەوای ئەم ناوە بووە... پاش

کۆچی دوایی کردنی ئنجا قـوباد بەگی کوڕی جێی ئەوی گرتۆتەوە و، لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچیدا کە شەرەفخان خەریکی بەرهەمهێنانی کتێبی شەرەفنامە بووە، ئەم قوباد بەگە لە دینەوەرەوە تا بەغدای لەژێر دەستا بووە.

وا دیارە پاش ئەوە هەروەکو لە لاپەڕەکانی ٦٦٠ی (عالەم ئارای عەبباسی)دا هاتووە، فەرماندەکانی سپای قزڵباشی، بەفەرمانی شا عەبباس ئەم هەرێمەیان لە میر قوبادی کوڕی میر عومەری کەلوڕ داگیرکردووە و، تا ساڵی ١٠٢٩ کۆچی هەر لەژێردەستی سەفەویدا بووە، پاشان کە دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی ڕێک کەوتوون و، پەیمانی دەست بۆیەک درێژ نەکردنیان بەستووە، دەوڵەتی عوسمانی گورجستانی داوەتەوە بەئێران، بەو مەرجەی کە دەوڵەتی سەفەویش هەرێمی دینەوەر تا بەغدا بداتەوە، سەردارانی کەلوڕی ژێر دەستی عوسمانی.

موزیک

پاوە ماوەیەک لەژێردەستی سەردارانی کەلهوڕدا، سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوو، ساڵی ١٠٣٢ کۆچی کە بەکر سوباشی ویستی بەغدا لە عوسمانی دابڕێ و، سەربەخۆ بەڕێیەوە ببات و، بەدزییەوە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران پەیمانی بەستبوو، بەو هۆیەوە دەوڵەتی سەفەوی ئاژاوەی سەر سنووری کردە بەهانە و، لە هەمەدانەوە هێزێکی خستە ڕێ بەرەو زەهاو و دەرتەنگ... هەروا هەندێ لە سەردارانی ئێرانیشی نارده بەغدا بۆ ئەوەی دەم و دووی بەکر سوباشی تاقی بکەنەوە. لەم هەلەدا یەکێک لە سەرتیپەکانی سپای ئێران چووە ناو دەرتەنگ و پاش ئەوە شالاوی بردە سەر میر محەمەد بەگی لەک، کە لە قەڵای زەهاودا بوو، قەڵاکەی گەمارۆ دا... و هەر لەو ساڵەدا میر محەمەد بەگ کۆچی دوایی کرد، بەڵام کوڕەکەی و براکەی بەبەهانەی ئەوەی کە ئەیانەوێ بچن بۆ لای شا عەبباس خۆیان لە گەمارۆ ڕزگار کرد و، لە قەڵاکە دەرچوون و بەرەو شارەزوور و کەرکووک هەڵهاتن، پاش ئەوە پاوە و ئەم هەرێمانە ماوەیەک لەژێردەستی میرانی ئەردەڵاندا بوون و، ماوەیەکیش لەژێردەستی ئەمیرانی باباندا... و ماوەیەکیش لەم ناوەدا دەرەبەگەکانی هەورامان بەناوی سان و خان بەسەر ئەم ناوەدا دەسەڵاتیان هەبوو.

موزیک

بابێینە سەر وەزع و دۆخی ئەمڕۆکەی پاوە، ئەمڕۆکە شارستانە واتا ناوچەی فەرماندارییە و، شارۆلکەیەکی جوانکیلەیە... ئەکەوێتە دۆڵەکانی خۆرئاوای کێوی شاهۆوە ١٥٢٥ مەتر لە زریەوە بەرزە و، لە خۆرئاوای کرماشانەوە ١٤٠ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە.

ساڵی ١٣٣٨ی فارسی کراوە بەفەرمانداری و ئەم بەخشانەی هەیە:

١- ناوخۆی. ٢- نەوسود. ٣- ڕەوانسەر. ٤- جوانڕۆ. ٥- بایەنگان. ٦- بابا جانی (تەزگلە). کە هەریەکەیان بەناوی خۆیەوە لێی ئەدوێین.

دانیشتوانی فەرمانداریی پاوە بەهەر شەش بەخشەکەوە بەپێی سەرژمێری ١٣٤٥ی فارسی ٨٩,٩٨٤ کەسن. زمانیان گۆرانی بەشی هەورامی و کرمانجی سنەیی و کەڵوڕییە. ئاینیان ئیسلام و لەسەر ڕچی شافیعین. ئەم عێل و تیرانە سەر بەئەم فەرماندارییە و شەش بەخشەن: ئیناقی، ئیمامی، کەمانگەری، جەوانڕۆیی، بابا جانی. تاد... ئەمە وەها و لە پاوەدا مزگەوت، خوێندنگەی ئاینی، قوتابخانەی بەرایی و ناوەنجی، دەرمانگا بەرق و کارەبا، تەلگرافی بێ تەل، بازاڕ، گەرماو، هەیە پاوە هەر لە کۆنەوە بەوە بەناوبانگ بووە، کە خەڵقەکەی زمان لووس و، قسە خۆش و، جیهانگەرد و، زرنگ و، نان پەیداکەر بوون. زانای باش و، هەستیاری چاک و، بەیت وێژیان هەبووە لەو شاعیر و هەستیارە مەزنانەی کورد کە نازناوی پاوەییان هەیە، لە ڕۆژنامەی کوردستان و کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردیدا تەنیا میرزا عەبدولقادری پاوەیی و، مەلا عەبدولخالیقی پاوەیی ناویان هاتووە، دوور نییە ئەو ناوەش کە مامۆستا سەجادی نووسیویە عەبدولخالیقی پاوەیی هەر میرزا عەبدولقادر بێت، کە ئەو ناوی نەهێناوە. ئێمە بۆ نموونە سێ هەڵبەستی ئەوتان بۆ تۆمار دەکەین ئەمە هی ئەوە:

من هەر تۆم هەنی، نەک واچی تۆم بۆ
تۆم بۆ چەنی عام، نییەن چەنی تۆ
تۆ تۆ تۆی دەروون بکێڵە پیشدا
تەرتۆ تۆییێت وی غەیر جەتۆ تێشدا
توخوا وێت ئاسا باوەرش وەبەر
وە مەودای ئەڵماسی پارە پارەش کەر

گوێگرانی بەڕێز، بیستیارانی خۆشەویست، تا بەرنامەیەکی تری کە بەیەک دەگەینەوە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٤/٢٥

٢٥/دروێنە ٢٦٧٣

وتاری: ٣٠

# پایگلان

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە شەوتان باش کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە. لەم هەلەدا کە جارێکی تری بەیەک دەگەینەوە، ئەمەوێ بەرامبەر بەنامە جوانەکانتان سپاستان بکەم، ئەمشەو ئێمە دەربارەی (پایگلان) ئەدوێین، کە یەکێکە لە دێیەکانی بەخشی جوانڕۆی فەرمانداریی پاوە و، بەهیواین نەبێتە هۆی ئازاردان و، ماندوویەتیی گوێتان و، بتوانین بەم بەرنامەیە ناشارەزایانتان ڕێ بەدێیی بکەین.

موزیک

پایگلان: یەکێکە لە شوێنەوارە کۆنەکانی کوردەواری، کە پێش ئیسلام و پاش ئیسلام هەر بووە، ڕەنگە هۆی ناوەکەی ئەوە بێ کە جێگەیەکی تووش بێ و، مرۆڤ پێی بخلیسکێ، واتا ناوەکە تێهەڵکێش بێ لە دوو وشەی (پای) و (گلان)، وەیاخۆ وشەکە (پاگولان) بووبێ، واتا لە جێگەیەکا تیاغە نرابێ، کە سەرەوەی گوڵزار بێ، وەیاخۆ لەبەرئەوە بێ کە نزیک بەچەند دەربەندێک بێ و، ناوەکە تێهەڵکێش بێ لە دوو وشەی (پای گەلییان) و لەو کاتانەدا گۆرانەکانیش هەروەک کرمانجیی ژووروو بەدەربەندیان وتبێ (گەلی). ئەمە وەها و بەداخەوە کتێبە مێژووییەکانی کوردەواری و، تەنانەت شەرەفنامە ناوی ئەم جێیەیان نەبردووە. تەنیا تەئریخی ئەردەڵان مەستوورە خانم چەند جارێ ناوی بردووە، بەڵام بێ گومان ئەو چونکە لە کاتی خۆیا سەر بەپاڵەنگان بووە، وەک ئەو دوای هەرێمەکە، هەر لەژێردەستی فەرمانڕەوایانی کەلوڕدا بووە... تەنانەت قەڵای بایەزید و گردی ئەقارەخانە و گردی زیندان و قەڵاتورەکەرێژەکەی، هەموو گەواهن لەسەر کۆنیی ئەم جێگەیە و، دەبێ لە سەردە فەرمانڕەوایانی عەییاری و حەسەن وەیهی و ئەردەڵاندا بووبێ...

موزیک

دێی پایگەڵان، لەوێوە پتر ناوبانگی پەیدا کردووە کە مەلای چاکی هەبووە و مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی باش... مەلا قاسمی پایگەڵانی، مەلا فەتاحی پایگەڵانی پیاوانی گەورە و زانایانی بەناوبانگ بوون... مەلا مستەفای بێسارانی هەستیاری مەزنی کورد، کە

بەشێوەی گۆرانی یەکێکە لە هۆزە هەرە بەرزەکان، لەم پایگەڵانە بەفەقێتی خوێندوویەتی... و لەم بارەوە بەسەرهاتێکی سەیری بێسارانی ئەگێڕنەوە، کە مامۆستا عەلائەدین سەجادیش لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا باسی کردووە. ئەڵێن بێسارانی لەم دێیە شەیدای کچێ بووە، ئەو ئەڤین گەرمە ئەوەندە بەسۆز بووە، ئەوەندە داوێن پاکانە و خاوێنانە بووە، کە ئەنجام وەرگەڕاوە بەشەیدایییەکی خوایی، تا ئەم ڕادەیە کە جارێکیان بێسارانی بۆ بینینی یارەکەی ئەچێتە سەربانی مزگەوت کە لەوێ دەور بکاتەوە و، بەدەم هاتوچۆی دەورەوە، جارجارە چاوی بەدیداری یاری ڕۆشن بکاتەوە. بەڵام هەروەکو کوردەواری دەڵێن: هەمیشە غەنیم بۆ شەیدا پەیدا ئەبێ، لەو سەربانەشەوە لقی دارتویی بەرچاوی گرتبوو، نەیئەهێڵا ماڵی یارەکەی ببینێ ئەویش بەسۆزی ئەوینەوە کەوتە نزا و نیاز و ئەم پارچە هەڵبەستەی لە دڵێکی پڕ لە ئاورەوە بەهەناسەی گەرم، بەحەوادا بڵاوکردەوە:

موزیک

چڵـی نـەپـەنـا، چڵـی نـەپـەنـا
چڵی چۆن ڕەقـیب مـدران نەپەنا
هۆر ئامـان مـدران نەروی تەمـەننا
مـەرباد قـودرەت بدەرۆش فـەنا
وە باد قـودرەت لەتار لەتار بوو
نماز و باڵا و قـیـبلەم دیار بوو
بسـۆز و بآهر بازدەی سـەحـەر
ڕیشـەش جـەزەمین بەربار و وەدەر
تا باڵای قیبلەم چون شەمع خانان
بونبـوو و چەم نەبەرزە بانـان

موزیک

ئەمە وەها و ئەم پایگەلانە، لەو سەردەمەدا کە هەورامان سەر بەئوستانی کوردستان بوو، ئەمیش یەکێ بوو لە دێهستانەکانی ژاوەرۆی بەخشی (ڕەزاو)... تیمسار ڕەزم ئارا لە فەرهەنگی جوغرافیاکەیا ئەڵێ:

پایگەلان یەکێکە لە دێهستانەکانی ژاوەرۆی بەخشی ڕەزاوی سەر بەشارستانی

سەنەندج... بەڵام ئەمرۆکە ئەم ناوە لە ئوستـانی کوردستـانی کۆن دابڕاوە و هەروەها کـە جارەها وتوومانە ئوستـانی کوردستانی سـەرەتای دەورانی پەهلەوی ساڵی ١٣٣٧ بەدواوە بەش کرا بەسێ بەش: ئوستانی کوردستان و ناوچەکەی شاری سنەیە، ئوستانی کرماشان کە ناوچەکەی کرماشانە، فەرمانداریی گشـتیی هەمەدان. جا ئەمرۆکە پایگەڵان سەر بەخشی جوانرۆی سـەر بەشارسـتانی پاوەیە ٣١٠ کـیلۆمـەتر لە خۆرهەڵاتی لای خـواری ڕەزاوەوەیە. و ٢٠ کیلۆمەتر ئەکەوێتـە لای خواری خۆرئاوایی ئاویهەنگەوە. هەرێمـێکی چیایی و سەردەسێرە، دانیـشتـوانی خۆی و دێیەکانی دەوروبەری ٢,٠٠٠ کـەس ئەبێ... کـاریان کـشـتـوکـاڵ و، مـێگەل بەخـێـوکـردنە. دەسکەوتـیـان دەغڵ و دانەوێڵـە و مـیـوەی جۆراوجۆرە. کەتیرە و گوێز و مـازوو و توتنیـشـیـان هەیە، بەرهەمی ئاژەڵیـشـیـان ماست و ڕۆن و خـوری و پێـسـتـەیە. لەم دێیـەدا مـزگـەر، ئاسنگەر و، جـۆڵا هەیە. مـزگـەوت و خوێندنگەی ئاینی و، قـوتابـخـانەی بەرایـیـشی تیـایە، بازارچەیەکی هەیە چەند دوکـانێ دەبێ.

گوێگرە بەرێزەکان بەداخی هیچمان لە شوێنەواری زانا و هونەر و هەستـیارانی خەڵقی ئەم دێیە چنگ نەکەوت هۆی ئەوەش کەمتەرخەمی خوێندەوارانی کورد بووە...

وە لێرەدا دوایی بەوتارەکەم دەهێنم تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرم، شەوتان باش.

١٣٥١/٥/٣

٣/خەرمانان/٢٦٧٣

وتاری: ٣١

## پشتکوه و پێشکوه

گوێره بەڕێزەکان شەوتان باش، کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە... لە بیستیارانی هێژا و خۆشەویستەوە نامە و نووسراوێکی زۆرمان بۆ هاتووە ئەپرسن: ئایا دوو ناوی (پشتکوە) و (پێشکۆه) کەی پەیدابوون؟ و بەسەر کام بەشی لوڕستانا براون؟

لە وەرامیانا دەڵێین: ئەم باسە زۆر دوور و درێژە، ئێمە وامان دانابوو کە وەڵامی ئەم باسە بهێڵینەوە بۆ باسی ئەو ناوانەی کە بەپیتی (لام) دەس پێ ئەکەن، واتا لە باسی (لوڕستان)دا لێی بدوێین... بەڵام ئێستە کە بیستیارانی بەڕێز زۆریان بۆ هێناوین و، ئەگونجێ بەم زووانە نەگەینە پیتی لام و نەوەک مانگەها، بەڵکو ساڵگەلێکی تریش ئەم باسە درێژە بکێشێ و، بیستیاران تامەزرۆی وەڵام بێننەوە، ناچاربووین هەر لە پیتی (پێ)دا وەرامیان بدەینەوە.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز دەزانن کە هەرێمی پشتکوە و پێشکوە هەمان لوڕستانی کۆنە و، لەبەرئەوەی هەرێمەکە چیاییە و، هەر لە هەمەدان و ئەراکەوە درێژە ئەکێشێ تا ئەگاتە ئیزە و دەوروبەری خوزستان، کە پێی دەوترێ کلکەی زنجیرە چیای زاگرۆس و ئەم ڕیزە چیایانەی لێ جیا ئەبێتەوە: (کوەسیا - سپی کۆە - چنگڕێ - پونە - وشتر مل - سیاە کەمەر - کەوەرکۆە - و زۆر ڕیزە چیای تری کە لە جوغرافیای نیزامی (تیمسار ڕەزم ئارا) و لە جوغرافیای خۆرئاوای ئێرانی ژاک دومورگان و لە لوڕستانی عەلی ساکیدا زۆر بەوردی باسیان لێ کراوە. لە سەرەتای ئیسلام و سەدەکانی بەرایی کۆچیدا ناوی لوڕستان ناوێکی گشتی بووە بۆ ئەو هەرێمە پاشان کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا فەرمانڕەوایی لوڕستان دامەزراوە، ئەو ناوەی لەژێر دەسەڵاتی پۆستنشینێتیی عەبباسی دەرهێناوە، هەرێمەکە دوو ناوی پەیدا کردووە، (لوڕستانی بچووک) لەژێردەستی فەیلییەکانا بووە و، (لوڕستانی گەورە) کە لەژێردەستی بەختیارییەکانا بووە... ئێمە لە باسی وشەی بەختیاریدا ئەوەمان ڕوون کردبووەوە کە وشەی بەختیاری لە وشەی (بوختی)یەوە هاتووە،

که له جزیره و کوردستانی سوریەوە باریان کردۆتە لورستان بەڵام تا ئێستە قسەمان لەوە نەکردبوو کە ناوی فەیلی لەکوێوە هاتووە، ئەم باسە چون دوور و درێژە، لێرەدا تەنیا دیاردیەکی بچووک بۆ دەکەین و، درێژەی باسەکە ئەهێڵینەوە بۆ وشەی فەیلی. جا هەندێ لە مێژوونووسان چ ئەوروپیی و چ ئێرانی وایان داوەتە قەڵەم کە ناوی فەیلی لە وشەی (فیل)ەوە هاتووە و، هۆی ناوەکەشی ئەوەیە کە ئەم لورانەی پشتکۆ هەمیشە خەریکی ناژاوەنانەوە و، هەڵگیرساندنی شەڕ بوون و، لەم کارەدا فرتوفێڵی زۆریان بەخەرج داوە لەبەر ئەوە ناوبانگیان بە(فەیلی) ڕۆیشتووە. جا ئەم لێکدانەوە زۆر سادەیانەیە و، ڕەنگە لە پیاوانی پیر و پاتاڵی خەڵەفاوی ئەو ناوەیان بیستبێ و، بەداخەوە ئەوەندە وردەوە نەبوون کە بزانن وشەی فەیلی لە کوێ هاتووە! ڕاستە لە شێوەی فارسی و شێوەی کوردی کۆندا فەیلی و فێڵی هەروەک یەک دەنووسران، بەڵام جۆری درکاندن و تەلەفوز پێکردن زۆر لە یەک جیایە، فەیلی بەفەتحەی (فێ) و لامی لاوازە. کەچی فێڵی بەیێی مەجهول و لامی قەڵەوە، ئەمەیە ئەڵێن (گەز لە کوێ و چاو لە کوێ)... سەرچاوەکانی مێژووی کۆن ئەمەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە: تەئریخی گوزیدەی موستەوفی قەزوینی، مونتەخەب التەواریخی موعینی نەتەنزی، شەرەفنامەی ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی، بۆمان دەرئەخەن کە دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی لورستان ناوی ئەبولحەسەن فەضلەوی بووە و، ئەوەش زانراوە کە هەروەکو ئەوترێ فەضلەوی هەروا ئەوترێ (فەضلی)ش و، ئەوەش زانراوە کە نە لە کوردیدا وشەی (ضاد) هەیە و، نە لە شێوەی لقەکانی نەتەوەی کوردا، تەنانەت لە لوڕییا کە پیتەکانی (ح، ذ، ط، ظ، ص، ض)یان نییە جا پیتی (ضاد)ی فەضلی وەیا فەضلەوی وەرگەڕاوە بە(یێ) و بووە (فەیلی).

## موزیک

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان وشەی (پشتکۆه) و (پێشکوه)، لە سەردەمی سەفەوییەکانا فەرمانڕەوایی لوڕی گەورە نەمابوو، لوڕی بچووک دەستی گرتبوو بەسەر هەردوو فەرمانڕەواییەکەدا... دەوڵەتی سەفەوی بۆ ئەوەی نینۆکی سەردارانی لوڕستانی بچووک بقرتێنێ، کە لە چینی فەیلی بوون، لەلایەکەوە بناغەی ژن و ژنخوازییان لەگەڵ دانەمەزراند و، لەلایەکەوە مەیدانیان نەئەدا دەسەلاتیان پەرە بسێنێ، بەم جۆرە هاتن بەشی ژێر دەسەلاتی فەیلییان ناونا (پشتکوە) و بەشی بەختیارییان ناونا (پێشکوە) جا مەبەست لە پێشکوە ئەو هەرێمەیە کە ئەکەوێتە بەشی خۆرهەلات و لای خواری چیاکانی لوڕستان و مەبەستیش لە پشتکوە بەشی خۆرئاوا و باکوری لوڕستانە کە بەلای سنووری

عـێـراقـا ئەڕوانێ. ئەمـە وەها و ئێـمـە لەبەرئەوەی کـاتمان تەواوبوو درێژەی ئەم باسـانە ئەهێڵـینەوە بۆ وتارەکـانی ئاینده، کـە لەسـەر باسی ئەو جێگەیانە دەڕۆن ئـەکـەونە بەشی پشتکو و بەشی پێشکو و ئێسـتە خواحافیـزیتـان لێ دەکەین و تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٥/٩

٩/خەرمانان/٢٦٧٣

**وتاری: ٣٢**

## پشتکۆ

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە شەوتان باش!

کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە. ئەوەش بزانن کە نامەکانی ئێوە دڵشادمان دەکات، گوێ شلکردنتان بۆ بەرنامەکان هێزمان ئەداتێ و، پتر ئەمانخاتە سەر شەوقی خزمەت، ئەم جارە هەروەکو لە بەرنامەی پێشوودا بەڵێنمان دانێ، باسی پشتکۆ و پێشکۆتان بۆ ڕوون دەکەینەوە.

موزیک

پشتکۆ: ناوێکە لە سەردەمی سەفەویدا دراوە بەلوڕستانی بچووک... کە ئەمڕۆکە فەرمانداریی ئیلام بەشێکی گەورەی دائەگرێ... بەرزترین زنجیرە چیای پشتکۆ ئەو کێوەیە کە لەوێ ناوی (گەورەکۆ)یە و، لە جوغرافیا فارسییەکانا ناویان (کەبیرکوە) و، بەهەڵەش ئەچن لەم ناوە، ئێمە مەبەستمان کەبیرکوەی لوڕستانە، نەوەک کرماشان. ئەم کەبیرکوە... لە کلکەی چیای زاگرۆسەوە درێژە ئەکێشێ تا سەر خەلیجی فارسی، لە باکوری لای خۆرئاواییەوە، درێژە ئەکێشێ بەرەو باشووری خۆرهەڵاتی و، دوو بەخشی هەیە: ١- بەخشی بەدرە. ٢- بەشی دەرەشار، کە ئەکەونە داوێنی لای خۆرهەڵاتی کۆە گەورە واتا (کەبیرکۆە)ەوە. وە بەخشەکانی (ئاوەدانان - زەڕین ئاوا - ئەرکەوازی ساڵح ئاوا)ش ئەکەونە داوێنی لای باشووری خۆرئاوای کەبیر کۆهەوە. بەرزترین لووتکەی ئەم کەبیرکۆهە ناوی (وەرزەڕین)ەوە ٣٠٦٢ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە. ئەو کێوانەی لە کەبیرکۆە جیا ئەبنەوە و، بەلای خۆرئاوادا درێژە دەکێش، وردە وردە نزمتر ئەبنەوە، یەکێکیان کێوی (دینارەوەند)ە، کە ئەکەوێتە نێوانی ئاوەدانان و دیهلوڕان و، بەرزایی ئەم دینارەوەندە ٢٦٠٠ مەترە و، ڕیزە کێوەکانی سیاەکۆ، سۆرکۆ، چیای حەمرین) لقی ئەم کێوەن... و ڕووبارەکانی خاکی فەرمانداریی ئیلام هەموو لە زنجیرە چیاکانی سەر بەکەبیرکۆهەوە شۆڕ ئەبنە خوارەوە، وەیا هەڵئەقوڵێن... جا ئەم ڕووبارانە یا ئەڕژێنە (سەیمەرە)وە، وەیا ئەچن بەرەو دیوی عێراق و تێکەڵی دیجلە دەبن.

موزیک

پشتکۆ: لە ڕووی کەش و ئاووهەواوە سێ بەشە:

١- بەشی چیا بەرزەکان کە بەجەنگەڵ و دارستان پۆشراوە، ئەم بەشە دەوروبەری شاری ئیلام و بەخشی چەوار و بەخشی بەدرە و بەخشی ئەرکەوازی و بەخشی ساڵح ئاوا ئەگرێتەوە و، سەردەسێرە و، پلەی ناوەنگی هەوا لە هاوینا ئەگاتە ٣٠ خاڵ -واتا ٣٠ ژوور سفر- و لە زستانا کەم ئەبێتەوە تا پێنج پلە ژێر خاڵ -واتا پێنج دەرەجە ژێر سفر-.

٢- بەشی بەخشەکانی (میهران) و (دیهلوران) کە ئەکەوێتە هاوشانی بیابانەکانی دوو ئوستانی کوت و عیمارەی عێراق، ئەم بەشە وڵاتێکی گەرمەسێرە و، ئاوەکەی سوێرە و گۆگردییە... واتا لەو گەڕاوانەیە کە خەڵقی بۆ لابردنی نەخۆشیی پێست مەلەی تیا ئەکەن...

٣- هەرێمی بەخشەکانی ئاوەدانان و دەرەشار و شێروان و چەرداوڵ و زەڕین ئاوا و لای خوارووی ناوچەی ساڵح ئاوا... هەوای ئەم ناوە ناوەنجییە، گەرما و سەرمای لە ئەندازەیەکی ناوەنجی دایە.

بابێینە سەر باسی دانیشتوانی پشتکۆ، ئەمانە کوردی فەیلی و کوردی کەلوڕن، کە ئەمڕۆکە بەهەڵە ئەم شێوەیە ناونراوە لەکی و، کەچی لەکستان ئەکەوێتە خوار ئەم هەرێمانەوە... و مامۆستا تەوفیق وەهبی ئەم ناوەی ڕاست کردۆتەوە و، ناوی شێوەی زمانی کوردی ئەم ناوەی ناوە (کرماشانی) و، بەداخەوە هەندێ مێژوونووسان خەڵقی ئەم ناوە بە(کورد) نازانن، لایان وایە کورد و لوڕ دوو نەتەوەی جیان لە یەکتر، کەچی کوردی ئەم هەرێمانە هەر لە کرماشانەوە تا دواترین جێی پشتکۆ و تەنانەت کوردەکانی بەدرە و مەندەلی و دەوروبەری کوت لە عێراقا هەر خۆیان بەکورد ئەزانن و، بەزمانی کوردیی کرمانجی خواروو ئەڵێن (جاف)... لێرەدا ڕووداوێکی سەیرم هات بەبیرا، ساڵی ١٩٥٧ی زایینی لە مەندەلی پێش نوێژە و مامۆستای ئاینی بووم، من لەگەڵ خەڵقەکە بەشێوەی کەڵهوڕیی تێکەڵ بەفەیلی ئەدوام، فەرمانداریکیان نارد بۆ مەندەلی کە لەودیو پێی ئەڵێن (قائیمقام) خەڵقی سلێمانی بوو، بەشێوەی سلێمانی لەگەڵ خەڵقەکە ئەدوا یاخۆ بەعەرەبی. کابرایەکی خەڵقی ئەوێ هاتە لام وتی: (ئا شێخ قائیمقامی ڕامان هاتگە، جافە یەک حەرف کوردی نیفەهمت) من دامە قاقای پێکەنین وتم: برا گیان! ئەم قائیمقامە بڕبڕەی کوردە، خەڵقی شاری سلێمانییە، زمانی ئەوێ کوردییە و شێوەی

کرمانجی خوارووه، شێوەی ئێوە کوردی کەلهوڕی تێکەڵ بەفەیلییە، بۆیە باش لەیەک ناگەن.

لێرەدا پرسی: وتی هۆی جیاوازی و لەیەک دووری شێوەکانی کوردی چییە؟ لە وەڵاما پێم وت: هۆی دووری شێوەکان ئەوەیە کە لە خاکی کوردستانا، چی ئێستە و چی زوو، یاسای عەشایری و عێلاتی هەبووە، ئەمانە لەسەر خاک و ئاو و لەوەڕ لەگەڵ یەک دوژمن بوون. و کەمتر هاتوچۆی یەکتریان کردووە... جگە لەوەش، تا ئەم سەدەی بیستەمە، لەپێشا تفاق و کەرەسە بۆ دروستکردنی پرد کەم بووە، خەڵقی نەیانتوانیوە، لە هەموو جێیەک پرد هەڵبەستن، ڕووبارە گەورەکانی خاکی کوردستان وەکو (سەیمەرە - سیروان - زێی بچووک - زێی گەورە - خاپوور - دیجلە - فورات) و هی تری بوون بەبەرگریی لە ڕێی هاتوچۆدا... ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە نەتەوەی کورد لە ماوەی هەزاران ساڵدا شێوەی زمانیان ببێ بەچوار بەشی گەورەوە، وەک ئەمیر شەرەفخان داوێتییە قەڵەم، یا چەند شێوەیێ گەورە و بچووک، کە لەم دواییەدا نووسەران و مێژوونووسان لە کتێبەکانیانا تۆماریان کردووە... جگە لەمەش گەورەترین هۆ بۆ ئەوەی کە زمانی کوردی بۆتە شێوەی جیاجیا، ئەوەیە کە زمانی خوێندن و خوێندنەوە بەکوردی وەک ئەمڕۆ (ستاندارد)ی نەبووە... بەم جۆرە کابرام تێگەیاند کە فەرماندار کوردی دەزانی و کوردە، وەلێ کوردییەکەیان لەیەک دوورە. ئەمە وەها و تا بەرنامەیەکی ترا باسی (پێشکۆ)تان بۆ ڕوون دەکەینەوە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٥/٢٥

٢٥/خەرمانان/٢٦٧٣

وتاری: ٣٢

# پێشکۆ

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی (ولاتەکەت بناسە) شەوتان باش!

کامەرانی و بەختیاریتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە و، هۆی دڵشادیمانە کە جارێکی تریش بەیەک دەگەینەوە و، ئەتوانین باسی (پێشکۆ)تان بۆ بکەین.

موزیک

لە وتاری پێشوودا باسی (پشتکۆ) بوو کە ئەکات بەشی خۆرئاوای ئەم چیایەی لوڕستان - و هەروەکو وتمان ریزە چیای لوڕستان ئەکەوێتە کلکەی باشووری زاگرۆسەوە و، هەزارەها ساڵە هەر هەیە لە سەرەتای دەورانی ئیسلامدا بەم دیو و ئەودیوی چیای لوڕستان ئەوترا (ماسەبزان) و (میهرەگانی بچووک)... پاشان کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی بەدواوە، فەرمانڕەوایی لوڕستان دامەزرا بەدیوی خۆرئاوا وترا (لوڕستانی بچووک) و بەدیوی خۆرهەڵات و باکور و باشوورا پێی ئەوترا (لوڕستانی گەورە) و ئەم ناوانە تا دەورانی سەفەوی هەر هەبوو، ئەوان بۆ لابردنی ئەم ناوە، ناوی هەرێمەکەیان نا (پشتکۆ) و (پێشکۆ).

جا بەخشی (پێشکۆ) ئەوەیە کە دەکەوێ بەدیوی عێراقدا، هەر لە مەندەلی و بەدرەوە تا (عیمارە) و بەشی پشتکۆش لەلای هەمەدان و ئەراکەوە ئەکشێ بەرەو خوار تا سنووری خوزستان. ئەم بەشە چیاییە کە پێی دەوترا (پێشکۆ) ئەمرۆکە ناونراوە (فەرمانداریی گشتی لوڕستان و پێشکۆ).

ئەم بەشە چیاییەش وەکو ئەودیو... بریتییە لە چەند زنجیرە چیایێ: یەکەمیان بەقسەی ژاک دومورگان کێوی (ئوشتوران کۆ)یە، کە لە چیای بێستونی کرماشانەوە جیا ئەبێتەوە و، سەرەتا لە شیوی گاماساوی نزیک تەختی شیرینەوە دەست پێ ئەکات و لە بەرامبەر کێوی (پەڕاو)ەوە ڕاست و ڕاست ئەڕوات بەرەو باشوور تا ئاوایی بەحرەینی سەر بەشارستانی وەروگرد... جا بەرزترین لووتکەی ئەم ڕیزە چیایانەی لە (پێشکۆ)وە جیا ئەبێتەوە، ئەمانەن:

١- کێوی چل نابا لغان لە ٤٥٠٠ مەتر لە ڕووی زریەوە بەرزە و، ئەکەوێتە لای خوارووی شاری نەهاوەندەوە و هەمیشە بەفری پێوەیە...

٢- کێوی گەرو و کە ٣٠٠٠ مەتر بەرزە.

٣- کێوی پونا کە ٢٦٩٠ مەتر بەرزە و، گەلیـیەکی زۆر تەنگی هەیە کە کاروانی سادە دەڕوات لە کاتی هاوینا، لە وەروگردەوە بەرەو خوڕەم ئاوا... جگە لەمانە ڕیزە چیاکانی دەیەڵە - سیاه کەمەر - وشتر مل - چفا دزان - سورە کێو - سەراوکێو و هەندێ ڕیزە چیای تریشی لێ جیا ئەبێتەوە.

موزیک

گەورەترین ڕووبارێ کە لەم چیایانەوە پەیدا ئەبێت ڕووباری سەیمەرەیە کە چەند لقێکی هەیە وەک ڕووباری کوشکان ڕووباری زاڵ. بەشی پێشکۆ ئەمڕۆکە بەش کراوە بەسێ فەرمانداریی گشتی: یەکەم بەشی فەرمانداری گشتی لوڕستان و پێشکۆیە کە باسی لێوە دەکەین. دووەم بەشی فەرمانداریی گشتی چوار مەحاڵ بەختیارییە و، سێیەم بەفەرمانداری گشتی بویر ئەحمەدییە. بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە لوڕستانی گەورە، بەش کراوە بەچوار فەرمانداریی گشتیی و هەندێ هەرێمیش خراوەتە سەر فەرمانداریی هەمەدان...

بابێینە سەر (پێشکۆ)، ئەم فەرمانداررییە گشتییە سێ شارستانی هەیە:

یەکەمیان: شارستانی خوڕەم ئاوایە... ئەم شارستانە ١١ بەخشی هەیە: ١- ناوخۆی. ٢- ئەلیشتەر. ٣- دلفان. ٤- چقلوەندی. ٥- وەیسیان. ٦- زاغە. ٧- کێو دەشت. ٨- دورو. ٩- مەلاوی. ١٠- پاپی. ١١- حوسێنیە.

دوومیان: شارستانی وەروگرد واتا بروجوردە کە سێ بەخشی هەیە: ١- ناوخۆی. ٢- دورود. ٣- ئوشترانیان.

سێیەمیان: شارستانی ئەلیگودەرزە کە سێ بەخشی هەیە: ١- ناوخۆی. ٢- مامون. ٣- شول ئاوا... ئەمە وەها و لە سەرەتای دامەزرانی لوڕستاندا کە دوو بەش بووە، لوڕستانی بچووک پێی ئەوترا لوڕستانی فەیلی و، بەلوڕستانی گەورە ئەوترا بەختیاری... بەڵام ئەمڕۆکە بەختیاری بەتەواوی لە لوڕستان دوورخراوەتەوە. زمانی ئێستەی پێشکۆ لوڕییە. لوڕیەکی سادە کە تێکەڵ بەکەڵهوڕی نەبووە، وەکو دیوی پشتکۆ...

موزیک

لەم دواییەدا والییانی لوڕ، بەسەر پشتکۆ و بەشێ لە پێشکۆشا دەسەلاتیان هەبوو، ژاگ دومورگان بەم ناوەدا ڕابردووە ئەڵێت: کاتێ لە (هەنجیرکۆ)وە ڕوومان کردە شاری ڕەشماڵ نشینی والی... کە پتر لە هەزار دەوار ئەبوو ئەم ڕەشماڵ نشینانە هەموو هێزی والی و دارودەستەی ئەون. جا ئەم والییە چەند جارێ لەگەڵ تیرەی سەگەوەندی پێشکۆدا کە یەکێکە لە تیرە هەرە ئازا و بەجەرگەکانی ئەو ناوە، چەند جار کەوتۆتە شەڕەوە... جارێکیان ٣٠٠ کەسێ لەم تیرەیە دابوویان بەسەر شاری (دژبوڵ)دا، لە گەڕانەوەیان نزیک بەڕووباری کەرخە والیی ئەوانی گەمارۆ دا... سەرۆکی تیرەی (عەمەڵە)ی دەوروبەری شوش، کە تفەنگچییەکانی سەگەوەند عێلەکەیان تالان کردبوو، ڕێنومایی والی و هێزی دەوڵەتی دەکرد... ئەمانە پەڕینەوە بۆ بەری چەپی ڕووباری کەرخە و عێلی سەگەوەندیان غافڵگیر کرد... جا والیی ئەوەک بەسەر پشتکۆدا، بەڵکو بەسەر بەشی پێشکۆشا هەر دەسەلاتی ئەڕۆیشت... زۆر سەیرە کە خاوەنی کتێبی (لوڕستان) کاک عەلی محەمەد ساکی بنەماڵەی والییانی ئەم دواییەی لوڕستان، کە بەسەر پشتکۆ و پێشکۆدا دەسیان ئەڕۆیشت، بەبنەماڵەیەکی والییانی، بداتە قەڵەم. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمیر شەرەفخان باسی لێ نەکردووە، بەلام خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ ئەڵێ: بنەماڵەی والییانی ئەم دواییە لوڕستان، پشتکۆ و پێشکۆ ئەچنەوە سەر حوسێن خان کوڕی مەنسوور خانی سەلوێزی؟ کچەزای شا ویردی خان کە لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەویدا گەورەترین پیاوی کوردی ئەو ڕۆژانە بوو... ئەمانە لە تیرەی سەلوێزی بوون کە یەکێکە لە تیرە کوردەکانی پشتکۆ و، هەرگیز عەرەبی نەبوون. ئەم هەڵەیە هەروەک ئەو هەڵەیە وایە کە هەندێ لە نووسەران، لوڕ بەکورد نازانن.

وە ئێمە وەک جارێکی تریش بەڵێنمان دانێ ئەم باسانە ئەهێڵینەوە بۆ کاتی خۆی، بۆ ئەو کاتەی لە دوو وشەی لوڕستانی گەورە و لوڕستانی بچووک ئەدوێین.

ئێستە کاتمان تەواو بوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٥/٢٨

**وتاری: ٣٤**

## تورجان

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش!

ئاواتی ئێمه بەختیاری و بەمرازگەیینی ئێوەیه و، سەرکەوتنتان بەسەر هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکی ژیانا... ئەمشەو باسی (تورجان)تان بۆ دەکەین، ئەمەش نابێ ببێتە هۆی سەرسوڕمانتان، کە بۆ چ لە پیتی (تێ)دا تا ئێرە هاتووین؟ ڕاستە ئێمه دێ و ئاوایی و شارۆلکەی وەهامان هەیە کە سەرەتاکەی (تێ) و (ئەلف) دەس پێ بکات وەکو (تاژەبان، تاجەوین)... بەڵام بەداخەوە لەم جێیانەدا ڕووداوی مێژوویی نەقەوماوە و، کەسانێکی مێژوویی هەڵ نەکەوتووە... ئێوەش زۆر چاک دەزانن کە ئێمە مەبەستمان لەم بەرنامەیە خەڵق ئاشناکردنە بەسەرگوزەشتی پیاوانی مێژوویی، بەقەوماوە و ڕووداوی مێژوویی کە لەم هەرێمەدا ڕووی دابێ. هەر جێیەک مێژوو لەبارەیەوە شتێکی تۆمار نەکردبێ، ناچارییە کە ئێمە چاو لە باس لێ کردنی بپۆشین. جا پاش ئەوەی مۆسیقایەکی هەموار گوێ ئەدەنێ، دڵ بدەنە باسی (تورجان).

موزیک

گوێگره بەڕێزەکان! تورجان ناوە بۆ یەکێ لەو چوار دێهستانەی کە سەر بەبەخشی بۆکانن، هەروا ناوە بۆ گەورە دێیەک کە ناوچەی ئەم دێهستانەیە... ئەم دێیە گەرچی لە شەرەفنامە و مێژووە کۆنەکانی کوردەواریدا ناوی نەهاتووە، بەڵام وەکو دەماودەم دەیگێڕنەوە لە سەردەمی بوداق خانی موکریدا هەبووە، گۆیا خانمی بوداق خان، خانمێکی زۆر ئەدەب و زانست دۆست بووە، لەو قەڵایەوە کە ئێستە شوێنەواری دیارە، هەمیشە چاوی بڕیوەتە مزگەوت و ژووری فەقێکان، بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی جوولانەوەی فەقێکان بخاتە ژێر چاو و، ئاگای لە باری مزگەوت و پەرستگاه بێ... بێ گومان پاش سەردەمی بوداق خان، تورجان هەر ئەو دەورەی بەسەرا هاتووە کە بەسەر ئەو دوای هەرێمەکەدا هاتووە... تەنانەت ئەوەی کە لە باسی بۆکاندا دیارمان بۆ کرد.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئەم دێهستانە، تەنانەت تورجان کە گەورە دێی ئەو ناوەیە، هەمووی موڵکی عەزیز خانی سەردار بووە، وەکو لە باسی بۆکاندا لێی دواین... ئەڵێن

عەزیز خانی سەردار، هەروەکو قەڵاکەی بوداق خانی سەرلەنوێ دروست کردۆتەوە، هەروا مزگەوتەکە و خوێندنگە ئاینییەکەشی لە بنەڕەتەوە گۆڕیوە. و لەم دواییەدا مەلای چاک، هەبووە لە تورجانا... گۆیا بنەماڵەی تورجانی کە خانەدانی زانست و ئەدەب و زانیارین لە بنەڕەتا (قزڵجی) نین، بەڵکو مەلا عەلیی قزڵجیی بەناوبانگ و نەتەوەکانی ئەویش هەموویان لە بنەڕەتا لە خێزانی تورجانن. مەلا عەلی کوڕی مەلا محەمەد کە بەمەلای قزڵجی بەناوبانگە و، لە ساڵانی ۱۲۰۲-۱۲۹۵دا ژیاوە و، پەراوێز و کەنارەی بەسەر زۆر لە کتێبەکانەوە نووسیوە و، بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە قسەکانی هەمیشە زۆر زەق و وردبووە، تەنانەت هەندێ (تەئەممەل)ی بەکارهێناوە، کە فەقێ و مەلا بۆ زانینی هۆی ئەو (تەئەممەل)انە، زۆر خۆیان ماندوو کردووە، ئەم مەلا قزڵجییەیش گۆیا لە بنەڕەتا هەر تورجانییە و لەبەرئەوەی ماوەیەک لە (قزڵجە) مامۆستای ئاینی بووە، نازناوی قزڵجی وەرگرتووە.

## موزیک

جا هەروەکو وتمان تورجان کە هەم ناوە بۆ گەورە دێیەک و، هەم بۆ ئەو دێهستانەی کە ئەم دێیە ناوچەیەکتی، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای بەخشی بۆکانەوە، لای باکوریشی دێی (ئاختاچی)ی سەر بەبۆکانە، لای باشوور و خواریشی هاوسنوورە لەگەڵ میر ئاوی سەقز کە دێهستانێکە و، لای خۆرهەڵاتیشی دێهستانیی دیهیی بۆکانە. ئەمە وەها تورجان خۆی کەوتۆتە جێگایەکی چیایی ئاووهەوای ناوەنجییە، لە ڕۆژگاری دێی بەدەورایە. سەرژمێری دێهستانەکە بەتەواوی دێیەکانەوە ۱۵۰۰۰ کەس ئەبێ، ژمارەی خودی ئاوایی تورجانیش ۷۰۰ کەسێ ئەبێ. لەم دێیەدا دوو مزگەوتی کۆن هەیە، قوتابخانەی ئاینیش هەبووە، لە سەردەمی بنەماڵەی ئەحمەد بەگی تورجانیدا لەو قوتابخانە ئاینییەدا نزیکەی ۵۰۰ فەقێ هەبووە و، چەند مەلای چاک بەفێرکردن و دەرس وتنەوە خەریک بوون هەموویان بەرگ و کتێب و خواردنیان لەسەر ئەحمەد بەگ بووە، هەر لەو قوتابخانە ئاینییە کۆنە ئەمڕۆکە سوود وەرگیراوە بەشێکی کراوە بەقوتابخانەی بەرایی منداڵان بووە بەشێکی کراوە بەقوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و بەشێکیشی کراوە بەجێی ئەوانەی کە پێیان دەوترێ سپای دانش و سپای بیهداشت و، سپای باش خەریکی کردنی کشتوکاڵن... جگە لەمانە بنەماڵەی بوداق خان بنەماڵەی ئەحمەد بەگی تورجانی لە ناوەندی گۆڕستانی کۆندا گۆڵاو و چڵکاوی زۆر بووە، بەمێشولەی لەرز و تا واتا (مەلاریا) بەناوبانگ بووە، بەڵام لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا، مەلاریا لە هەموو

خاکی کوردستانا ڕیشەکەن کراوە... ناوی تورجان و دێیەکانی سەر بەدێهستانەکە هی چەمی (سیمینەرود)ە، کار و کاسبیی خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و مێگەل بەخێوکردنە، بەرهەمیان دەغڵ و دانەوێڵە و توتن و تریاک و پەمۆ و شتی ترە. دەسکەوتی ئاژەڵیشیان ڕۆن و خوری و موو پێستە و پەزی فرۆشتنە. کردی دەستیشیان بەتەون و، جۆلاییيە، ئەم شتانە دروست دەکەن: مافوور، بەڕە، جاجم، دەوار، خەرار، جەواڵ... شتی چنراویشیان هەیە، وەک گۆرەوی و، لفکە و، بلوز کە لێرە پێی دەڵێن چاکێت... دێهستانی تورجان ۳۷ گشتیدا، گۆڕستانێکی تایبەتیی خۆیان هەیە کە ساحەی و گومەزی جێی سەرنجی گەشتیارانە... ئەمە وەها ماموٚستای تورجانی زادە کە ئەمڕۆکە لە زانکۆی تەورێز ماموٚستایە و لە زانستی ئاینییا شارەزایە و زمانەکانی کوردی، تورکی، فارسی، عەرەبی، زۆر چاک ئەزانێ و نووسراو و شوێنەواری زانستیی بەنرخی هەیە، هەروا هەڵبەست و هۆنراوەی باشیشی هەیە، خەڵقی ئەم دێیە تورجانەیە. ئیتر کاتمان تەواو بوو تا بەرنامەی ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۱۳۵۱/٦/۸

۸/گەلاوێژ/۲٦۸۳

وتاری: ٣٥

## توی سەرکان

شارۆلکەی (توی سەرکان) وەک جێگەکانی دەوروبەری، لە سەدەی پێنجەمی کۆچی بەدواوە، لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی لوڕی بچووکدا بووە کە پێی ئەڵێن (فەیلی) و (پشتکۆ)، چی بەر لەسەردەمی سەفەویی و هەم پاش ئەوەش توی سەرکان لە سەردەمی قاجاردا بەشێ بووە لە ویلایاتی ئەلاث کە دراوە بەشێخ الملوک. مەبەست لە ویلایەتی ئەلاث ئەم جێیانە بووە (توی سەرکان - مەلایر - نەهاوەند) و لە دەورانی شاهەنشاهی پەهلەویدا بووە بەناوچەی شارستان و، سەر بەفەرمانداریی گشتیی همەدانە... ئەم شارۆلکەیە لە چەند گەڕەک پێکهاتووە: (زەڕهان - قەیطور - جولاستان - دەروازە - پشت قەڵا - تەوەکولی - ناسری - باغوارد - دەستجورد - قەڵعە)... ئەم شارستانە چوار بلوک - وەیا بەشی هەیە: ١- ناوخۆی. ٢- خوڕەم ڕود. ٣- قولقول ڕود. ٤- کوڕ زان ڕود...

موزیک

جێی شارۆلکەکەی توی سەرکان بەرزە، چاو ئەندازی زۆرە.

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

کامەرانیتان هۆی دڵخۆشیی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە. ئێمە ئەم حەوتە باسی (توی سەرکان)تان بۆ دەکەین.

موزیک

توی سەرکان شارۆلکەیەکە ئەکەوێتە داوێنی چیای ئەلوەندەوە بەلای باکوریا و، لای باکوری خۆرئاوایشی سنووری بەخشی ئەسەد ئابادە و لای خۆرئاوایشی بەخشی کەنکەوەرە، لای خۆرهەڵاتیشی سنووری فەرمانداریی مەلایرە و، لای باشووریشی سنووری شارستانی نەهاوەندە...

ناوی توی سەرکان لە دوو ناو پێکهاتووە... یەکەمیان (توی)یە کە لە سەردەمی موستەوفی قەزوینیدا شارۆلکەیەک بووە... دووەمیان (سەرکان)ە کە لەو سەردەمەدا دێیەکی بچووک بووە و، هەردووکیان سەر بەرودئاوەر بوون. پاشان دوو جێی توی و

سەرکان بوون بەیەک شارۆلکە، ئەمە لەلایەنی جوغرافییەوە...

بابێینە سەر باسی مێژوویی، ئاو و هەوای خۆشە، ١٦٠ دێی بەدەورایە، بەرزترین لووتکەی زنجیرە چیاکانی تووی سەرکان چیای (خان گرمز)ە، کە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای شارەکەوە و، لقێکە لە چیای ئەلوەند و بەرزایی ٢,٦٦٨ مەترە لە ڕووی زریەوە... کێوەکانی (کەمەر زەرد - کەلیان - سیاە دەرە)ش ئەکەونە لای باشووری و نزیکەی ٢٨٠٠ مەتر بەرز ئەبن.

توی سەرکان زەویوزارێکی باشی هەیە، جێی کشتوکاڵی زۆرە. دوو ڕووباری گەورەی هەیە: یەکەمیان ڕووباری (کوڕزان)ە کە سەرچاوەکەی لە چیای ئەلوەندەوە دێتە خوارەوە و، لە سەرەتادا بەدوو شێوی سەرابی و سەرکاندا ڕائەبووری و پاشان لەگەڵ قولقول ڕود تێکەڵ ئەبێ و لێژ ئەبێتەوە بۆ مەلایر، ئنجا ئەڕژێتە نێو ڕووباری گاماساو. دووەم ڕووباری خوڕەم ڕودە کە ئەمیش لە لووتکەی بەفرداری ئەلوەندەوە دێتە خوارەوە و، لەگەڵ لقی کەندەر تێکەڵ ئەبێ و ڕوو ئەکاتە ئەسەد ئاوا و، لەوێوە شۆڕ ئەبێتەوە بۆ کەنگەوەر، جگە لەمانە چەم و شیوی تریشی زۆرە، کە هاوینان وشکن و، کاتەکانی تری ئاویان هەیە.

## موزیک

توی سەرکان، شارۆلکەیەکی ئاوەدانە، بازاڕ و دوکانی تێدایە، سینەما و جێی سەیران و ڕابواردنی هەیە، نەخۆشخانە، دەرمانگا، قوتابخانەی ناوەنجیی کچانە و کوڕان و، چەند قوتابخانەی بەرایی، گەرماو، مزگەوت، پۆست و تەلگراف و، کارەبا و بەرق و شتی تری تیایە. کارخانەیەکی شخارتە و کبریتی تیایە.

ژاک دومورگان ساڵی ١٨٩١زایینی توی سەرکانی دیوە، ئەو حەلە کارمەندێکی دەوڵەتی تێدا بووە، بەڵام وەکو ئێستە شارۆلکەیەکی گەورە نەبووە. بەقسەی دومورگان ئەوێ زۆر لە هەمەدان ئاووهەوای خۆشترە چونکە لەپاڵ چیاکە دایە بەدیوی خۆرئاوادا، کەمتر بەفری لێ دەبارێ و نەوەندەی هەمەدان سارد نییە، سەرژمێری خودی توی سەرکان ٢٠ هەزار کەسێک ئەبێ و، هی شارستانەکەشی تا بەهەر چوار پەخشەکەوە سەد هەزار کەسێک ئەبێ.

خەڵقی ئەم ناوە فەلاح و خێوی کشتوکاڵن، گەنم، جۆ، برنج، نیسک، نۆک، توتن و، تریاک پێ ئەگەیێنن، پەمۆ، میوەشیان زۆرە. لە ئاواییەکاندا ئاژەڵیش بەخێو ئەکەن، وەک مەڕ و بزن و مانگا، چوار پێی تریشیان هەیە، ئەوی ئەینێرنە بازاڕی شارەکانی

گەورە بریتییە لە دەغڵ و دانەوێڵە، مەڕومالآت، خوری و پێستە، پەموو، توتن، میوە و شەقڵەدار. ڕچی ئاینییان شیعەییتییە، زمانیان لوڕییە، فارسیش ئەزانن... لەو ناوەدا تورکیش پەیدا بووە... ڕەوشتیان باشە، وەک نەتەوەیەکی چیایی ئازا و بەجەرگن... ژاک دومورگان دەڵێ: کاتێ لە دلاوەرەوە بەرەو توی سەرکان دەچووین، زۆریان نارەحەت کردین. بەبەرد چەند کەسێکیان لە کۆمەڵەکەمان بریندار کرد، بەڵام من پێم خۆش نەبوو کە سەخت دەربارەیان بجوولێمەوە تەقەیان لێ بکەم، چونکە ئەبووە هۆی ئەوەی کە سەرباز و یاساوڵەکانی قاجار بێن بۆ هاوارمان و ئەو دێیانە تالآن بکەن و، بەهانەی ئێمەوە خۆیان بکەونە ڕاوڕووتی کوردەکان. ئەمە وەها و گوێگرە خۆشەویستەکان زانیاریمان دەربارەی توی سەرکان هەر ئەمەند بوو، بەداخەوە هیچ هەستیار و خوێندەوارێکی بەناوبانگ و سەر بەئەم ناوە لە کتێبەکاندا بەرچاو نەکەوت، تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٦/١٣

**وتاری: ٣٦**

# تیلەکۆ

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

ژیانی پڕ لە خۆشی و کامەرانیتان هۆی دڵخۆشیی ئێمەی بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە، ئەمە وەها و بەپێویستی دەزانم کە پێتان ڕابگەیێنم نامەکانتان هەموو ئەگات، بەڵام بەداخەوە ئێمە ناتوانین زوو زوو ویستەکانی ئێوە بەجێ بهێنین، هەریەکە لە ئێوە وای پێ خۆشە کە ئێمە باسی دێیەکەی ئەو، یا شارەکەی ئەو لەپێشا بکەین، کەچی ئێمە بەرناکەمان بەپێی پیتەکان داڕشتووە، ئەبێ چاوەڕوانی باسی دێ و شارەکانتان بن بەپێی ئەو ڕچە. و ئەمشەو باسی **(تیلەکۆ)تان بۆ دەکەین.**

موزیک

تیلەکۆ لە سەرەتادا ناو بووە بۆ عێلێکی کۆچەری کورد، **لە پاشان ناوی عێلەکە بڕاوە** بەسەر ئەو دێ و هەرێمانەدا کە ئەم عێلەی تیا بەزیوە. **ئێمە لە کتێبە جوغرافییەکانی** تیمسار ڕەزم ئارا و مەسعودی کەیهان و ڕاهنومای شارستانها و چەند کتێبی ترا، لە بەشی کوردستانی ئەمدیوا سێ جێگەمان بەناوی (تیلەکۆ) بەرچاو کەوتووە:

یەکەم تیلەکۆ: ناوی دێیەکە سەر بەدێهستانی سەرقەڵای بەخشی ئەلاثی سەر بەئوستانی کرماشان، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای سەر قەڵا واتا گەرمەسیری وەلەدبەگی بەلای خۆرئاوایدا و، هەشت کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، نزیک بەسنووری کوردستانی ئەودیوە و پێ دەشتێکی گەرمەسێرە، دانیشتووەکانی ١٦٠ کەس دەبن، ناوی خواردنەوەیان هی شیو و بیرە، کاریان کشتوکاڵە، بەرهەمیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، دەسکەوتی ئاژەڵیان ماست و پەنیر و ڕۆن و خوری و کەوڵە. زستانان وەلەدبەگییەکانیش، وەک تیلەکۆییەکان، تا بەهار لەم گوندەدا ڕۆژگار بەسەر ئەبەن.

تیلەکۆی دووەم: ناوی دێیەکە سەر بەیەکێ لە دێهستانەکانی بەخشی کامیارانی سەر بەئوستانی کوردستان. ئەم گەورە دێیە دانیشتوانی ٤٠٠ کەس دەبێ، ئەوانیش دیسانەوە کار و کاسبییان کشتوکاڵ و مێگەل بەخێوکردنە.

موزیک

تیلەکـۆی سـێـیـەم: ناوە بۆ یەکێ لە دێهـسـتـانەکـانی بەخـشی دیواندەرەی سـەر بەفەرمانداریی سەقز و ئوستانی کوردستـان و، لای خواروی بەخشەکەوەیە. لای باکور و خۆرئاواشی سنووری دێهسـتـانی (هەوەتو)وە کە بەفـارسی (ئوباتو) نووسـراوە و، سـەر بەبەخشی دیواندەرەیە، لای خۆرئاوا و لای باشووریش دێهستانی درا زەرە خۆیەتی.

تیلەکۆ هەرێمێکی زورگ و هەڵەت و سەردەسێرە، زستانی زۆر درێژە، بەفر و سەرمای بەتەوژمە، هاوینی فێنکە هەرێمەکەی کە کەژوە کێوی زۆرە، هەمیشە بژوێن و لەوەڕی زۆرە، بۆ مێگەل و ئاژەڵ بەخێوکردن چاترین جێگایە.

تیلەکۆ: دوو ڕووباری هەیە کە لە پاومانی سنووری دێهستانەکەدا ئەڕژێنە ناو شیوی خوڕخوڕەوە واتا (جغەتووە)، ڕووباری یەکەم ناوی (ئیراب)ە دێیەکانی (ئیراب - تەمر بیگ - شاشاکەل - چنارە) ئاو ئەدات کە بەکەناری ئەم ڕووبارەوەن.

بەرزترین کێوی ئەم زنجیرە زورگ و هەڵەتەی کە لە باشوور و لای خواری دێهستانەکەوە بەرەو خـۆرئاوا درێژەی کـێـشـاوە، پێی ئەڵێن (کـێـوی حـاجی سـیـدو) کـە بەرزترین لووتکەکانی ئەمانەیە، لووتکەی چار کە ٢٦٣١ مەتر بەرزاییەتی، لووتکەی چیا ڕەش کە ٢٦٤٢ مەتر بەرزاییەتی. ناوچەی ئەم دێهستانە گەورە دێی (ئیرانشا)ە کە لە ڕووی زریەوە ١٩٥٢ مـەتر بەرزە، قـەڵایەکی زۆر کـۆن و بەرزی هەیە بەناوی (یەکـەدار) کـە جـێگەکـەی لە ڕووی بەرز ئەبێ. هەروا قـەڵای ئوردوگـاش کـە ٢٣٢٩ مـەتر بەرزە. ئەم دێهستانەی تیلەکۆیە ئەکەوێتە سەرە ڕێی تەختکراو -وە لە پاشا قیر و ئیسفاڵت کراوی - سەقز - سنە و، ٥٠ دێی هەیە، دانیشتوانی ١٠ هەزار کەس دەبێ.

ناسری موحسنی لە جوغرافیای کوردستانا ئەڵێ: ئەم عێلە دوو سەد ساڵێکە هاتوونە کوردستانی ئێران، لە سەرەتادا لە دێی باشماق بەزیون، پاشان بەزۆر جێی ئوستانی سنەدا بڵاوبوونەوە. ئەمانە کار و کاسبییـان کشتوکاڵ و ڕان بەخێوکردنە، بەرهەمیان دەغڵ و دانەوێڵـە و توتن و پەمۆ و چەوەندەر و شتی ترە، دەسکەوتی ئاژەڵیشیان هەموو جۆرە بەرهەمێکی حەیوانییە.

ڕچی ئاینییان شافیعیی ئیسلامە، زمانیان کوردی گۆرانییە، لە دێیەکانیان قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، مزگەوت و چاخانە و شتی تریشیان هەیە. دێ بەناوبانگەکانی تیلەکۆ (ئیرانشا - تەمر بیگ - قەڵاکۆپ - پارسانیان - جندیان - شەممە - جەیرانیان - باشماق)ە. تیلەکۆ خوێندەواری زۆری بووە، ئێمە بەسەرهاتیان نازانین. محەمەد بەگی تیلەکۆیی هەستیار و ئەدیب بووە و، لە ڕۆژنامەی کوردستانا

ـ مۆستا و دوکتور سەدیق موفتی زادە پارچە هەڵبەستێکی سەید سادقی پاسانیانی
ێنەکۆی تۆمار کردووە، پێشکەشتانی ئەکەین ئەڵێ:

چراخم کنیـــان، چراخم کنیـــان
ڕیشـەی دڵ وەگـاز ڕیشـەکـەن کنیـان
تاتا خـەم تەنان، تانتـەی تەن تەنیـان
مــوهر ڕەواجم و کـەســاس و ونیــان
مــینای قــیـمـەتم و، صــەت پارە بێ
هەر پارەی پەی من صــەت پەژارە بێ
ئاوارەی مـەجلیس، مـەجرای مـەوبەتان
جــیــام نەئوتاخ جــەرگــەی ئومەتان
وێڵ وێڵ مەگێڵۆن چون هەر جائیـیان
ئازام ئـەوەند هـیچ ئـاوائیـــــیـــان
رود، نەفـەرق سـەر، بەسـتـەن قـولڕە
خــــــەریـکم چەنی دەرد دووبارە،
وەی طەور، هامسەران جەم بێن تەوەللا
مــەونیــام مــاچان (نەعــوذ بیللاه)
غــــەز، ئەلویدای کـــۆچ لوامـــەن؟
یادار دەوڵەت جــەبیخ کنیــامــەن؟

ئەمە وەها و تا وتارێکی تری بەیەگ دەگەینەوە خواتان لەگەڵ شەوتان خۆش.

١٣٥١/٦/٣٠

٣٠/گەلاوێژ/٢٦٧٣

وتاری: ٣٧

## جاوان

گوێگرانی بەڕێز شەوتان خۆش!

کامەرانیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە و، بەپێویستی نەزانین کە پێتان ڕابگەیێنین ئەمشەو باسی (جابان و جاوان)تان بۆ دەکەین.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! لە سەرەتادا دەڵێین: ناخی قووڵی مێژوو وەکو زەریەیێکی بێ پەی و بن وەهایە، مرۆڤ لە ناوەڕۆکی لاپەڕە زێڕینەکانیدا گەوهەری وەها گرانبا بەدەست ئەهێنێ کە کەم کەس لە گەوهەرناسان ئەتوانێ نرخی بۆ دابنێ. یەکێ لەم نموونانە بەسەرهاتی جابان وەیاخۆ جاوانە، کە ئێمە لە زنجیرە وتارێکا باسەکە ڕوون دەکەینەوە... با ئەوەش بڵێین کە لە هەندێ کتێبی مێژووییدا ناوە کە بەپیتی (بێ) تۆمارکراوە، واتا نووسراوە جابان و لە هەندێکیشا بە (واو) جاوان نووسراوە، بەڵام ڕاستییەکەی جاوانە هەروەک جاوانییەکان خۆیان ئەیدرکێنن و، بۆ جەختیش لەسەر ئەوەی کە جاوان بە(واو) ڕاستترە لە جابانی بە(بێ)، فەیروز ئابادی خاوەنی (قاموس) وشەکەی جاوانی تۆمار کردووە، ئەمە وەها و گەرچی ناوی جاوان لە (شەرەفنامە) و (خولاصەت تەئریخ الکورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ) و کتێبە مێژووییەکانی تری نووسەرانی کوردا هەر نەهاتووە، بەڵام بەهەشتیی دوکتور مستەفا جەواد دەربارەی ئەم عێلە وتارێکی دووروودرێژی بەعەرەبی نووسیبوو و، لە (گۆڤاری زانستیی عێراقی)دا ساڵی ١٩٥٤ی زایینی کە دەکاتە ساڵی ١٣٣٢ فارسی بڵاوی کردبۆوە و، ناوی نابوو (عێلی جاوانی لە بیر براوە و ناودارەکانی) و، لەم وتارەدا تیری ڕەخنەشی گرتبووە ئەمیر شەرەفخان و مێژوونووسانی تری کورد لەسەر ئەوەی ناوی ئەم عێلەیان فەرامۆش کردووە... بابێینە سەر قسەکانی دوکتۆر مستەفا جەواد خۆی، گەرچی ئەو وتارە دوور و درێژەی دەربارەی ڕابردووی ئەم عێلە نووسیبوو، بەڵام نەیئەزانی کە ئەم عێلە ئێستە ماون یا نە؟ و لە کوێن و، لەگەڵ نووسەری ئەم بەرنامەیەدا لەم بارەوە دوابوون و، هەردوولا گومانیان ئەمە بوو: کە ڕەنگە وشەی (جاوان) لە بنەڕەتا (گاوان) بووبێ و، عەرەب وەریان گێڕابێ بە(جاوان)، هەروەک ئەمین

زەکی بەگی خوالێخۆشبوو دەربارەی ناوی (جابان)ی یاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە لاپەڕە ١٢٣ی بەرگی یەکەمی مێژووەکەیا ئەم باوەڕەی نیشان داوە کە جابان لە گابانەوە هاتووە... بەڵام بەپێی ئەو زانستانەی لە (فەرهەنگی دیهخودا) و (فەرهەنگی غولام حوسینی موساحیب) و (فەرهەنگی جوغرافیایی تیمسار ڕەزم ئارا) دەرئەکەوێ وشەی (جابان) هەر (جاوان)ە بەجیم و، لە بنەڕەتا (گاوان) وەیا (گابان) نەبووە... پاش موزیک ئەم باسە ڕوون ئەکرێتەوە.

موزیک

تیمسار ڕەزم ئارا ئەڵێ: جابان یەکێکە لە ئاواییەکانی سەر بەدێهستانی ئەبرشێو و پشتکۆی بەخشی ناوخۆی شارستانی دەماوەند، ئەکەوێتە باشووری لای خۆرهەڵاتی دەماوەندەوە و، لە داوێنی چیاکە دایە بەدوورایی ٢٧ کیلۆمەترێ، بەلای شەقامەڕێی (تاران - مازەندەران)دا و، دانیشتوانی کورد و فارسن... تاد...

وە فەرهەنگی دیهخوداش ئەڵێ: جاوان یەکێکە لە دێیەکانی دێهستانی مارینی بەخشی (سەدە)ی سەر بەئەسفەهان و ئەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی دێی سەدەوە بەدوورایی ٧ کیلۆمەتر و، کیلۆمەترێکیش لە شەقامەڕێی (ئەسفەهان - تەهران)ەوە دوورە. لەم دوو فەرهەنگە مێژوویی و جوغرافیانەوە وامان بۆ دەرئەکەوێ کە عێلی جاوان هەر ماوە و لەناو نەچوون...

بابێینە سەر ئەوەی کە ئەم عێلە لە سەرەتادا لە کوێ بووە و پاشان چی بەسەرهاتووە؟ و ئێستە لە کوێیە؟ بەپێی لاپەڕە ٢٥٤ی کتێبی (مروج الذهب)ی مەسعودی چاپی ئەوروپا، ئەو عێلە کوردانەی کە لە وڵاتی چیادا بوون، واتا لەو وڵاتانەدا کە (عەرەب) پێیان وتووە (بیلاد الجبل) وەیا عێراقی عەجەمی - ئەم عێل و تیرانە بوون: شا زەنجان - لوڕ - بارولکان - بارینجان - باویسیان - خالیە - جبا نارفیە - جاوانیە، تاد... و... گەرچی ئەشێ ناوی هەندێ لەم عێلانە بەهەڵە تۆمارکرابێ... بەڵام بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەو جاوانانەی ئێستە نزیکی دەماوەند دائەنیشن وەیا لە جێی ترن... لە بنەڕەتا هەر لەم هەرێمەدا بوون و، ئەوان کەمتر جێی خۆیان گۆڕیوە - چونکە هەرێمی ئەسفەهان و هەرێمی ڕەیی کۆن، واتا ئوستانی تارانی ناوچەی ئەمڕۆ، هەموو لەسەر وڵاتی چیا دراونە قەڵەم، لێرەدا بەهەڵی ئەزانین کە بڵێین... جابانیش ناوی جێگەیەک بووە لە وڵاتی شێروان کە ئەمڕۆکە لەژێردەستی شورەوی دایە، لەم جابانییەدا بوو کە شا ئیسماعیلی سەفەوی

سـاڵی ٩١٣ی کۆچی شـەڕی لەگـەڵ فـەڕوخی یەسـار کـرد... هەروا ناوی جـابان گـەیـوەتە یەمـەنیش و، ناوە بۆ ناوچەیەک لە یەمـەن. وا دیارە لە سـەردەمی ئەیـوبییـەکانا هەندێ لە جەنگاوەرانی جاوانی برابێتە ئەوێ...

موزیک

جگە لە ناوی جێیـەکـان، ئێـمە لە مێـژووی بەر لە ئیـسلام و سەرەتای ئیـسلامدا ناوی چەند پیـاوێکی گـەورەی خەڵقی ئێران دەبیـستـین، کە بێ گـومان کـورد بوون و لەم عـێلە بوون... بۆ نموونە: جـابان یەکێ بوو لەو سـەردار لەشکرانەی (پوور اندوخت)ی شـای ئێران ناردی بۆ شەڕی (ئەبو عـوبەیدەی ثەقەفی) فـەرماندەی لەشکری ئیسلام و، بۆ بەرەنگاریی (موثەننا کوڕی حاریثـە)... و ئەم جابانە لە شـەڕا شکاوە بەدیل گیـرا، مەطەر کـوڕی فـیـضە ناوێ بەرامـبەر بەدوو هەزار درەم و دوو غـوڵام و کەنیـزێ ئازادی کرد، بێ ئەوەی بیناسێ... پاشـان کە ناسـرا دووبارە دیل کـرایەوە، بەڵام ئەبو عـوبەیدە لەبەر مـەطەر کوڕی فـیـضـە هەر ئازادی کردەوە...

جگە لەم سەردارە ئێـمە ناوی جابان ئەبیـنین کە بەئەبو مـەیون ئەناسـرا، خۆی و مـەیمونی کوڕی پێی ئەوترا ئەبو بەسیر هەردووکیان کـورد و لە یارانی پێغەمبەر بوون. بێ گومان ئەم دووە لەگەڵ جابان یەک نین، چونکە ئەو لە زەمـانی حەزرەتی پێـغـەمبـەردا بەدیل گـیـرا و، باسی ئەوەش نەکراوە، کە بێتە سەر ئاینی ئیسلام.

گوێگرە بەڕێزەکان، حەوتەکانی ئایندە باس لە عێلی جاوان دەکەین، ئێسـتە کاتمان تەواو بوو شەوتان خۆش.

١٣٥١/٧/٨

٨/میوە گەیان/٢٦٧٣

## وتاری: ٣٨

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

بەختیاریتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە... لە حەوتەی پێشوودا باسی ئەوەمان بۆ کردن، کە عێلێکی کورد هەبووە بەناوی جاوان و لە هەرێمی چیادا نیشتەجێ بوون، ئەوەشمان ڕوون کردەوە، کە مەبەست لە هەرێمی چیا، لە زاراوەی جوغرافیانووسانی عەرەب و ئیسلامدا ئەو شار و دێهاتانەیە کە دەکەوتنە نێوانی ئازەربایجان و، کوردستان و فارسەوە، کە پێی دەوترا (بیلاد الجەبەل) یاخۆ (عێراقی عەجەمی) و، ئێستە درێژەی باسەکە دەس پێ ئەکەین، جارێ گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

لە وتاری پێشوودا وتمان ناوی ئەم عێلە لە کتێبە کۆنەکانا و لە فەرهەنگەکانا جاوانە، بەڵام هەندێ (واو)ەکەیان گۆڕیوە بە(بێ) و کردوویانە بەجابان. جا باش وایە ئێمە لەوە بکۆڵینەوە کە هۆی ئەم گۆڕانە چییە؟... بەپێی باوەڕی ئێمە ئەم عێلە لە بنەڕەتا، وەکو جاوانەکانی ئێستەی دەماوەند شێوەی زمانیان کرمانجیی ژووروو بووە و، مەبەست لە کرمانجی ژوورووش ئەو شێوە زمانەیە کە بەهەڵە هەندێ لە نووسەران بڕیویانە بەسەر (بادینان)ی عێراقدا بێ ئەوەی بێتە بیریان کە ئەم شێوەیە لەناو کوردی ئێران و، تورکیا و، شورەوی و، سوریاشدا، قسەی پێ دەکرێ...

ناوی عێلەکەش لە بنەڕەتا (جاڤان) بووە و بەپیتی (ڤێ) ئەوەش ئاشکرایە کە پیتی (ڤێ)ی کرمانجی ژووروو، هەمیشە لە کرمانجیی خوارووودا وەرئەگەڕێ بە(واو) و، لە فارسیشا زۆر جاران دەبێ بە(بێ)... لێرەدا با جارێکی تر ئەوەتان بخەینەوە یاد کە هەندێ کەس ناوی کرمانجی خوارووویان ناوە (سورانی) بێ ئەوەی بزانن کە سۆران لە کۆنا تەنیا ئوستانی هەولێری ئەمڕۆ بووە و، نابێ ناوی شێوەی سۆرانی بەزۆر بدرێ بەکرمانجیی (موکریان، کوردستانی سنە، بابانی کۆن -واتا دوو ئوستانی کەرکووک و سلێمانی- و بەباجەلان -واتا هەرێمەکانی خانەقین، بەلەد، مەندەلی، زەهاو)...

ئەمە وەها و، ئەوەی وتمان کە (ڤێ) بووە بە(واو) وەیا (بێ) وەک (ئاڤ - تاڤ) لە

کرمانجی ژووروودا، کە ئەم (ڤێ)یە لە کرمانجی خوارووداوەرگەڕاوە بە(واو) بووەتە (ئاو - تاو)... بەڵام لە فارسیدا بووە بە(ئاب) واوکە (ئاب)... و لەم بارەوە هەشیارانە گەواهـ و بەڵگە هەیە. جا کە ئەمەمان زانی، بۆمان دەرئەکەوێ وشەی (جاڤان) لە کرمانجیی خوارووداو بووە بە(جاوان) و، لە فارسیشدا بووە بە(جابان)... بۆیە مێژوونووسەکانی کۆن و تازە هەم بە(واو) و هەم بە(بێ)ی نووسیویانە.

با ئێستە واز لە ویژەوانی و زمانناسی بێنین و بچینەوە سەر باسی مێژوویی و جوغرافی. دەبێ ئەم عێلە لە بنەڕەتا لە کوێ بووبێ؟ دوکتور مستەفا جەوادی ئەڵێ: ئەمانە لە خرێسان واتا (بەعقوبە) و کەناری دیالا و سیروانەوە شۆڕبوونەوە بەرەو عەرەبستان، کە ئەم باسە زۆر جێی سەرنجە و، پاشان لێی ئەدوێین...

مێژوونووسی بەناوبانگ (ئیبن الئەثیر) لە کتێبی (ئەلکامیل)دا لە پاوەمانی سەدەی چوارەمی کۆچیدا ناوی سەردارێکی عێلی جاوان دەبات کە ناوی وەڕام کوڕی محەمەد جاوانییە، ئەم سەردارە لەگەڵ (ئەمیر بەدر کوڕی حەسەن وەیهی)ی فەرمانڕەوای بەشی خۆرئاوا و باشووری -واتا لا خواری- ئێرانی ئەو سەردەمەدا هاوکاریی کردووە و، یارمەتیشیان لە عێلی (بەنی ئەسەدی میزیەدیی عەرەب) وەرگرتووە، بۆ گەمارۆدانی بەغدا دژی (عەمید الجیوش)ی سەردار سپای دەیلەمی.

جا بەم پێیە کە بڵێین جاوان لە کەناری ڕووباری سیروان بوون، دەبێ ناوی (جەوان ڕو)ی ئێستە یادی کۆنی ئەوان بێ و، ناوەکە تێهەڵکێش بێ لە دوو وشەی (جاوان و ڕود) کە هەمان ڕودی سیروانە، ئەوان لە کەناری بوون. پاشان ئەم عێلە یا لەناو خۆیانا شەڕیان بووبێ بەشێکیان کۆچیان کردبێ بۆ عەرەبستان، وەیاخۆ لەو سەردەمەدا لەگەڵ سپای دەیلەمیدا لێیان بووبێ بەشەڕ و شکستیان خواردبێ و، چووبنە خوار بەغدا، وەیاخۆ نەهاتی و گرانی تەنگەتاوی کردبن کە هەرێمەکە بەجێ بهێڵن و سەرەو خوار بڕۆن... ئێمە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ئەبینین کە عێلی جاوان لەگەڵ عێلی بەنی ئەسەدی میزیەدیدا لە خوار بەغداوە شاری حیللەیان دامەزراندووە و، لە دار و پەرد و خشت و کەرپووچی کۆنە شاری (بابل) بۆ دروستکردنی ئەم شارە کەڵکیان وەرگرتووە و، ئەو گەڕەکەی کە کوردە جاوانییەکان تیا جێگیربوون تا ئەمڕۆکە هەر بە(حەی الئەکراد) بەناوبانگە و ئەم عێلە تا ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی کۆچی هەر لەوێ بوون، پاش ئەوە لە مێژوودا ناویان نابرێ. دەبێ چییان لێ هاتبێ؟ بێ گومان جاوانەکانی ئێستەی پشتی دەماوەند لەو

جاوانه نین، چونکه دەربارەی ئەو ڕابردووە هیچ نازانن و، تا ئێستەش هەر زمانیان کرمانجیی ژووروە. بێ گومان جاوان ڕووییەکانیش لەم بارەوە هەر هیچ نازانن... ئەی نەبێ ئەم عێلە گەورەیە، ئەم هێزە بەدەسەلاتەی کە زۆرجار لە شەڕا ناوی براوە و، دەورێکی زۆری گێڕاوە چی بەسەر هاتبێ؟ ئێمە بەدووری نازانین کە عێلی جافی ئێستەی کوردستانی ئەودیو هەر ئەو جاوانانە بن... لەبەر چەند هۆیەک:

یەکەم: مێژوونووسەکانی عەرەب وا ئەدەنە بەرداس کە جاف لە بنەڕەتا بەنی ئەسەدی عەرەبن... و نەبێ ئەم هەڵەیە هەر لەوێوە هاتبێ کە ئەمانە لە حیللە لەگەڵ بەنی ئەسەد پێکەوە ژیا بن.

دووەم: ئەوەیە کە جاف خۆیان بەدوو بەش دەزانن، جافی جوانڕۆیی کە خۆیان بەناوی جافی مورادی ناو ئەبەن و، لایان وایە کە سوڵتان مورادی عوسمانی ئەوانی گواستۆتەوە بۆ کوردستانی ئەودیو... و جافی زەهاو... جا هەر ئەمەی کە هەندێ لە جاف خۆیان بە(جاوان ڕۆیی) دەزانن ئێمە لە مەبەستەکەمان نزیک دەکاتەوە.

سێیەم: (شەرەفنامە) کە باسی ئەردەڵان و بابان و هەموو قەڵاکان و عێلەکانی ئەو ناوەی کردووە، ناوێکی لە عێلی گەورەی جاف نەبردووە، بەڵکو ناوی جاوانیشی هەر نەبردووە... ئەمەش بۆمان دەرئەخات کە لەو سەردەمەدا عێلی جاوان بەڵکو عێلی جافیش لە کوردستانا نەژیاون.

چوارەم: هەروەکو مەستوورە خانمی ئەردەڵانی لە مێژووەکەیا بۆمان دەرئەخات زمانی کۆنی کوردستانی سنە هەروەکو کوردستانی کرماشان و وڵاتی کەرکووک و لوڕستان بریتی بوون لە شێوەکانی گۆرانی و، کەڵوڕی و، لوڕی... شێوەی کرمانجی لەم ناوەدا شتێکی دواهاتووە ئێمە وشەی (ئێژم) یاخۆ (بێژە)ی وڵاتی سنەی ئەمڕۆ، یا جافی ئەودیو، بەپێکهاتوو لە تێکەڵاوی کرمانج بەگۆران دائەنێین.

تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

## وتاری: ٣٩

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش!

کامەرانیتان ئاواتی ئێمەی بەڕێوەبەرانی ڕادیۆی کوردیی ئێرانە... لە وتارەکانی پێشوودا ئەو باسانەمان ڕوون کردەوە کە مێژوونووسەکانی سەرەتای موسوڵمانە ناوی عێلێکی کوردیان بردووە، بەناوی جاوان بەوە ئەم عێلە مەڵبەند و هەواریان وڵاتی چیا بووە، واتا عێراقی عەجەمی بەڵام ئەم جێ مەڵبەندەیان بەجۆرێکی ورد دەسنیشان نەکردووە، جگە لەمەش ئێمە باسی ئەوەشمان کرد کە مێژوونووس و، فەرهەنگی جوغرافیانووسەکان هەروەک ناوی عێلەکەیان بەپیتی (واو) تۆمار کردووە و، نووسیویانە جاوان، هەروا هەندێکیان بەپیتی (بێ) تۆماریان کردووە و، نووسیویانە جابان، بەڵام هەردووڵا هەر مەبەستیان ئەم عێلە بووە، کە لێی ئەدوێین.

هەروا ئەوەشمان وت کە ئەبێ: ناوی هەرێمی جەوانڕۆی ئوستانی کرماشان یادگاری ئەم عێلە بێ و، ناوەکە لە دوو وشەی (جاوان) و (رود) پێک هاتبێ و، دیاردی بێ بۆ ئەوەی کە مەڵبەندیان لە کەناری ڕووباری سیروان بووە، هەروا دیاردیشمان کرد بۆ ئەوەی کە ڕەنگە ناوی جافی ئەمڕۆ داتاشراو و سووک کراوەی ناوی جاڤانی کرمانجی ژووروو بێت، ئێستە با گوێ بدەینە سازێکی دڵڕفێن، تا پاشان لەسەر باسەکەمان بڕۆین...

موزیک

وتمان: دەبێ مەڵبەندی بناغەیی عێلی جاوان هەرێمی جوانڕۆی ئەمڕۆ بووبێ، پاشان ئەم عێلە وردە وردە تەنیبێتەوە. با جارێ شوێن پێی عێلەکە هەڵ بگرین... کتێبی (ئەلکامیل)ی ئیبن الئەثیری مێژوونووسی مەزن، لە دەنگوباسی ساڵی ٣٩٧ی کۆچیدا ئەڵێ: یەکێ لە سەردارەکانی عێلی جاوان کە ناوی وەرام کوڕی محەمەد بوو ویستی بەیارمەتی بەدری کوڕی حەسەن وەیهی بەرزیکانی شاڵاو بباتە سەر بەغدا و، عەمید الجیوش ئەبو عەلی حەسەن کوڕی ئەبو ججعفەری دەیلەمی تیا گەمارۆ بدەن کە دۆستی عەضودالدەولەی ئال بوویە بوو. جا ئەو حەلە بەدر کوڕی حەسەن وەیهی سەرداری قارەمانی بەرزیکانی، فەرمانڕەوای خۆرئاوا و باشووری ئێران بوو واتا فەرمانڕەوای بەشێ لە ئازەربایجانی خوارووی ئەمڕۆ و ئوستانی کوردستان و ئوستانی کرماشان و فەرماندارییە گشتییەکانی لوڕستان و هەمەدان و ئوستانی خوزستان و، شارەزووری کۆن

واتا دوو ئوستانی کەرکووک و سلێمانیی کوردستانی ئەودیو... جا بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە عێلی جاوان لەو ڕۆژەدا لە دەرەوەی ئەم سنوورەدا بوون، واتا لە هەرێمی جەلەولای ئەمڕۆدا قەراخان و قزرابات واتا (سەعدیە) و شارەبان واتا (میقدادییە) و بەرازەرو واتا (بەلەدروز) و خرێسان واتا دەوروبەری بەعقوبەدا بوون...

هەروا (ئەلکامیل)ی ئیبن الئەثیر لە دەنگوباسی سالّی ٤٢٠ کۆچیدا ئەلّێ: لەو کاتانەدا کە ئال بویە لەناو خۆیانا شلّەژا بوون، لافاوی تورکی توران زەمین بەپێشەوایی سەلجووقییەکان، ولاّتی ئێران و هەندێ تری لە ولاّتانی ئیسلامییان گرتە پێش، لەو حەلەدا دەولّەتی (حەسەن وەیهیی کورد) نەمابوو، دەولّەتی عەییاری کورد، کە لە بنەڕەتا لە عێلی شازەنجانی بوون و ژێردەستی حەسەن وەیهی بوون جێی ئەوانیان گرتبووەوە...

جا سەردار ئەبولفەتح کوڕی وەرامی جاوانی و حیسام ئەلدەولە ئەبولشەوک کوڕی محەمەد کوڕی عەییاری شازەنجانی لەگەلّ دەولّەتی عەقیلیدا -کە لەو حەلەدا لە دەوروبەری مووسلّ دامەزرابوو- پەیمانیان بەست و کەوتنە بەرەنگاریی تورکە سەلجووقییەکان و، پاش شەڕگەلێکی سەخت بەسەریانا زالّ بوون و، تورکەکانیان تا (نوسەیبین) ڕافڕاند، کە ئەکەوتە نێوانی دوو ڕووباری (دەجلە و فرەهات)ەوە، کە عەرەب کردوویانن بە(دیجلە و فورات).

## موزیک

سالّی ٤٣١ کۆچی جەلال الدەولە کوڕی بەهاء الدەولە کوڕی عەضود الدەولەی ئال بویە کە لە بەغدا دووچاری ئاژاوە و پەشێوی بووبوو بەدەست ئەو هێزە تورکەوە -کە ئال بوویە خۆیان لە سەرەتادا بۆ سەر پێ شۆڕکردنی عێلاتی کورد و عەرەب هێنابوویانە دی- لە تاوان هاواری بردە بەر سەردار کوردەکانی جاوانی و عەییاری، جا ئەبولفەتح کوڕی وەرامی جاوانی و ئەبو الفەوارس کوڕی سەعدیی عەییاری چوونە هاوارییەوە و، فریای کەوتن و ئەو لەشکرەیان بۆی سەرشۆڕ کرد...

لەم قسانەی (الکامیل) دامان بۆ دەرئەکەوێ کە عێلی جاوان پاش لەناوچوونی دەولّەتی حەسەن وەیهی بەرزیکان و لە جێی ئەوان دانیشتنی دەولّەتی عەییاری شازەنجانی کورد زۆرتر پەرەیان سەند بێ و بەهێزتر بووبن و، کەوتنە تەنینەوە...

چونکە بەپێی (ئەلکامیل) سالّی ٤٣٢ی کۆچی کە حیسام الدەولە کوڕی ئەبولشەوکی فەرمانڕەوای دەولّەتی عەییاری، لەگەلّ ئەبولماجید موهەلهەلی برایا لەسەر فەرمانڕەوایی و

دەسەلأت نێوانیان تێک چووبوو و، کەوتبوونە شەڕەوە ئەبولفەتح کوڕی وەرامی جاوانی ویستی لەم هەلە سوود وەربگرێت و هەرێمی بەندەنیجین و حەلەوان داگیر بکات و، مەبەست لە بەندەنیجین مەندەلییە و، مەبەست لە حەلەوانیش کۆنە شاری حەلەوانە کە ئەمڕۆ شوێنەواری لای سەرپێڵی زەهاو دیارە، حیسام الدەولە هەرکە ئەمەی زانی، داوای هێزی لە جەلال الدەولە کوڕی بەهاء الدەولەی دەیلەمیی ئال بویە کرد، کە لەو حەلەدا فەرمانڕەوای بەغدا بوو... جەلال الدەولە هێزێکی باشی بۆ نارد. بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە جاوانەکان لەو سەردەمەدا دەسەلاتیان، تەنیا تا هەرێمی بەرازەرو واتا (برلەدروز) پەرەی سەندووە.

ئەمە وەها و، عێلی جاوان دەبێ سوودیان لە ناکۆکی بنەماڵەی عەییاری وەرگرتبێ، بۆ تەنینەوە و، پەرەدان بەدەسەلاتیان. ئەلکامیلی ئیبن الئەثیر و، ئەلمونتەزەمی ئیبن الجەوزی هەردووکیان ئەڵێن: ساڵی ٤٣٨ ئەبولفەتح کوڕی وەرامی جاوانی لەسەر فەرمانی سەعدیی کوڕی ئەبولشەوکی عەییاری دەستی گرت بەسەر هەرێمی مەندەلیدا، بەلام سورخاب کوڕی محەمەد کوڕی عەییاری سەرداری دەوڵەتی عەییاری ڕەوی کردە سەریان و، بەسەریانا زاڵ بوو و هەردووکیانی بەدیل گرت و، لەشکرەکەیان کە کورد و غوز بوون، پەرتوبلاوبوونەوە. لەم قسانە وەهامان بۆ دەرئەکەوێ، کە جاوانی و بەشێ لە عەییاری دژی دەوڵەتی عەییاری کورد و، دژی دەوڵەتی ئال بویەی بەغدا کە لەناو خۆیانا شڵەژا بوون، لەگەڵ ئەو تورکانەی شالاویان ئەهێنا هاوکارییان کردووە...

ئەمە وەها و ئێمە لێرە کاتمان تەواو بوو، لە وتاری ئایندەدا بەشێکی تری باسی (جاوان)تان بۆ ڕۆشن ئەکەینەوە... ئێستە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٧/١٦

**وتاری: ٤٠**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی (وڵاتەکەت بناسە) شەوتان خۆش، کامەرانیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی ڕادیۆی کوردیی ئێرانە.

لە وتارەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە عێلی جاوانی توانییان دەست بەسەر دێهات و شارەکانی کەناری ڕووباری سیرواندا بگرن... لای خۆرئاوا تا خرێسان -واتا بەعقوبەی ئەمڕۆ- و لای خۆرهەڵاتیشەوە تا مەندەلی بەڵام پاش ئەوە چییان بەسەر هات؟ و چییان کرد؟... ئەمە درێژەی دەوێ، جارێ با گوێ بدەینە موسیقایێ ئنجا لەوە ئەدوێین...

موزیک

گوێگره خۆشەویستەکان! وا دیارە عێلی جاوانی و سەردارەکانیان، کە لەوە پێش خۆیان سەر بەعەیبارییەکان ئەزانی کە لە عێلی شازەنجانی و فەرمانڕەوای سەردارێتیی عەیباری بوون، پاشان نێوانیان تێک چووە، لەسەر ئەوەی کە جاوانی خەریکی تەنینەوە بوون و، ئەوان قایل نەبوون و تەنگەتاویان کردوون، جا بەکەناری سیرواندا وردە وردە شۆڕبوونەوە... کتێبی (ئەلکامیل)ی ئیبن الئەثیر و میرئات الزەمانی کچەزای ئیبن الجەوزی هەردووکیان لە باسی ساڵانی ٤٣٨ و ٤٣٩دا ئەڵێن: ئیبراهیم ئینالی برای دایکیی توغروڵ بەگی سەلجووقی لەشکرێکی لە غوز و کورد پێک هێنا و، ناردییە سەر سورخابی کوڕی محەممەد کوڕی عەیباری شازەنجانی کە فەرمانڕەوای عەیباری بوو، هەندێ لەم لەشکرە غوزە لە کاتی شاڵاودا لایان گرت و هەڵیان کوتایە سەر ئەبولفەتح کوڕی وەرامی جاوانیش (ئەبولفەتح) لەتاو زۆری ئەو هێزە و، ترسی دڕندەیی و ناوبانگی خراپی تاڵان کاری و کوشتارکردنیان، مەڵبەندەکەی خۆی بەجێ هێشت، بەو هیوایەی کە هێزی غوز بکەونە تاڵان و بڕۆی ماڵەکەی و، ئەویش بتوانێ لە کاتی سەرگەرمیانا هەو بکاتەوە سەریان و قەڵاچۆیان بکات... بەڵام خەیاڵی خاوبوو ئەوان هاوڕیان لە ماڵ و حاڵی ئەبولفەتح نەدایەوە و، بەدوای خۆیا چوون و ڕاویان نا... ئەبولفەتح لە ترسی گیانی خۆی ناچار لێیان هەڵگەڕایەوە و لەگەڵیان کەوتە شەڕێکی سەخت و، بێ کەس کوژانە کەوتە ناویان کۆمەڵێکی لێ بەدیل گرتن، کۆمەڵێکی لێ کوشتن و، ئەو دوایانی تارومار کرد و هەرچی بنە و بارگەیان هەبوو هەمووی داگیرکرد... بەڵام لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە شا دیسان ترسی لە شاڵاوی دووبارەی (غوز) هەبوو. لەبەرئەوە نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای

(ئال بویە) نووسی کە لە بەغدا بوون، بۆ ئەوەی بێن یاریدەی بدەن و کۆمەکی بکەن...
بەڵام ئال بویە خۆیان جۆرێ شڵەژا بوون کە نەئەپەرژانە سەر خۆیان چ جای سەر جاوانەکان لەبەرئەمە ئەبولفەتح بەسەرۆکایەتی هەندێ لە جاوانەکان ئەو ناوەی بەجێ هێشت و، لە رووباری دەجلە پەڕییەوە بەرەو بەری خۆرئاوای... ئەمە وەها و غوزەکان هەروەک شالاویان بردبووە سەر هەرێمی ئەبولفەتح هەروا شالاویشیان بردبووە سەر بەرازەرو -واتە بەلەدروزی ئەمڕۆ- تا کەناری جۆگەی سەلیل کە هی ئەبو دولەف قاسم کوڕی محەممەدی جاوانی و - وە ئەبێ ئەم ئەبو دولەفە برای وەرام و مامی ئەبولفەتح بووبێ- جا ئەم ئەبو دولەفە لێیان راپەڕی و شەڕێکی سەختی لەگەڵ کردن و هەڵی ڕفاندن و بەسەریان زاڵ بوو و، هەرچی بنە و بارگەیان هەبوو هەمووی لێ داگیرکردن. جا ئەم ئەبو دولەفە ئەیەویست پێی جاوانییەکان لە هەرێمی خرێساندا -واتا بەعقوبە-دا هەر بەقایمی و دامەزراوی بهێڵێ... بەڵام سەعدی کوڕی ئەبولشەوکی شازەنگانی سەرۆکی عەییاری لەگەڵ سوڵتان توغروڵدا رێک کەوتبوو و، ساڵی ٤٤٢ی کۆچی بەهاوکاری هێزێکی غوز هەڵی کوتایە سەر ئەبو دولەف و هەرێمەکەی ژێردەستی و هەبوو نەبووی تالان کرد، ئەبو دولەف بەجۆرێ شڵەژا تەنها بەبەرگەکەی خۆییەوە توانی هەڵ بێ...

## موزیک

لەو زانیارییانەی وتراوە، هەروەکو لە سەرەتای ئەم زنجیرە وتارەدا پێشبینیمان کردبوو، دەرئەکەوێ: کە هۆی کۆچ و ڕەوی عێلی جاوانی بەرەو لای باشووری بەغدا و، هاوکاریکردنیان لەگەڵ بەنی میزیەدی ئەسەدیی عەرەب بۆ دامەزراندنی شاری حیللە هەمووی پاش شکست خواردنیان بەرامبەر بەفەرمانڕەوایی عەییاری کورد و ئەو غوزە سەلجووقییانە بێ، کە دەوڵەتی ئال بویەیان ڕووخاند... جا لەبەرئەوەی کە غوزەکان جانەوەر و درندە بوون و، هێزیانیش زۆر بووە، ترس و لەرزێکی سەخت نیشتۆتە دڵی جاوانەکان و عێلانی تری کە لە ڕووباری دەجلە پەڕیونەوە. ئەمە وەها و پاش بەتەواوی رۆخانی دەوڵەتی ئال بویە، پۆستنشینی عەبباسی کە ئەلقایم بیللای خەلیفە بوو و، لەوەپێش دژی سەلجووقییەکان پروپاگەندە و چاوەڕاوی دەکرد، نامەی نارد بۆ توغروڵ بەگی سەلجووقی و خولکی کرد بۆ هاتنە بەغدا و، نازناوی پادشای خۆرهەلات و خۆرئاوای دایێ، جا ڕۆژی ٢٢/ مانگی خوێندرایەوە... بەڵام هەر لەو سەردەمەدا بەشێ لە فەرمانڕەوایی و سەردارێتییەکانی کورد و عەرەبی عێراق، کە لە عەبباسی و سەلجووقی نارازی بوون، خۆیان کردبوو بەدۆستی خەلیفەی فاطیمی میسر کە شیعەی ئیسماعیلی و،

ـرێ ئەلموستەنسیر بیللا ئەبو تەمیم مەعەد کوڕی عەلی ظاهیر بوو، تا ڕادەیەک لە هەندێ تەرەکەکانی بەغداش وتاری هەیینییان بەناوی ئەوەوە ئەخوێندەوە... جاوانییەکان، کە لە ێـزی دەجلـە پەڕیبـوونەوە بۆ لای خـوار و خـۆرئاوا، وهاوسـوێنی بەنی مـیـزیەدییـە ـسـەدییەکان بوون، ئەوانیش سەر بەخەلیفەی فاطیمی بوون...

سـولتـان توغـرول، لە باکوری عێـراق و کوردسـتانا لەگەڵ هەندێ لەمانە کەوتە شەڕەوە... ـلاـ دەربارەی سەردار و فەرمـانڕەواکانی لای خواری بەغدا، کەوتە بیـری دۆسـتـایەتی و ـشـتکردنەوە سەردار عێلەکانی ئەو ناوە، کە هەموویان هاوسوێن بوون، ئەبولفەتح کوڕی ـرامی جـاوانیـیـان هەڵبـژارد بۆ نومـایەندەیی خـۆیان بۆ لای سـولتـان توغـرول و ئەلقـایم ـلای عـەبـبـاسی جـا لە ١٥ مـانگی شـەوالی سـاڵی ٤٤٩دا ئەبولفـەتح و بەدران کـوڕی ـزالدەولەی مـیـزیەدیی ئەسـەدی عـەرەب گـەیشـتـنە بەغـدا و (عـەمـیـد العـراق) بەناوی ـولتان توغرولەوە و پێشوازیی لێ کردن و، لەگەڵ یەک ڕێک کەوتن.

گـوێگرانی بەڕێز... ببـورن وتارەکـەمـان درێژەی کـێـشـا تا وتارەکـانی ئاینده بەخـواتان ـسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٧/٢٣

## وتاری: ٤١

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە شەوتان باش! شادی و خۆشیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامـەی کـوردیی ڕادیۆی ئێـرانە... ئەگـەر لەبیـرتان مـابێ وتمان: (عـێلی جـاوانی) پاش ئەوەی لەلایەن فـەرمـانڕەوایانی عـەییـاری و هێـزی غـوزەی سەلجووقییەوە تەنگەتاو کران خاکی کوردستانیان بەجێ هێشت و لە ئاوی (دەجلـە) پەڕینەوە بۆ لای خواری بەغدا. بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی کە کچەزاکەی ئیبن الجەوزی لە کتێبی (میرئات الزمان)دا لە دەنگوباسی ساڵی ٤٥٢ کۆچیدا نووسیویە؛ دەبێ عێلی جاوان پاش ڕێککەوتن لەگەڵ توغـروڵ بەگ جـارێکی تر گـەڕابنەوە لا ژووری بەغـدا و کەناری سیروان، چونکە لەو کتێبەدا ئەڵێ: (ساڵی ٤٥٢ی کۆچی جاوانییە وەرامییەکان جۆگەی نەهرەوانیان بەربەست کرد و، کەلەبەرەکانیان بۆ ئاودانی کشتوکاڵ کردەوە، ئەمە وەها و جارێ گوێ بدەنە پارچەیەک (موسیقا)...

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان! ساڵی ٤٥٥ کۆچی سوڵتان توغروڵ لە شاری ڕەی کۆچی دوایی کرد، مردنی ئەو سەری شێواند لە خەلیفەی عەبباسی ئەلقایم بیئەمریللا، چونکە سەردارییە عەرەبەکانی ئەو ناوە، کە سەر بەخەلیفەی فاطیمی میسر بوون، کەوتنە شاڵاو بۆ سەر بەغـدا... ئەلقـایم لەتاو هەڵەت و تالان و بڕۆی ئەوان، ناچار بوو کـەوتە نامـە گـۆڕینەوە لەگەڵ هەندێ لە سەردارە کوردەکانی وەک ئەبولفەتح کوڕی وەرام و ئەبولنەجمی برای و ئەبوکالیجار هەزارئاسپ و بەدری کوڕی موهەلهەلی عەییاری... هەروا لەگەڵ هەندێ لە سەردارە عەرەبەکانی وەک موسلیم کوڕی قورەیشیی عەقیلی و دەبیس کوڕی عەلی میزیەدی ئەسەدی کە یەکەمیان فەرمانڕەوای وڵاتی مووسڵ و دووەمیان فەرمانڕەوای هەرێمی حیللە بوو، داوای لێ کردن زوو بگەنە بەغدا بۆ ڕاوێژ و تەگبیر بۆ بەڕێوەبردنی کـاروباری وڵات. سـەردارە کـوردەکـان بەهێـز و چەک و تفـاقـەوە گـەیشـتنە بەغـدا. لەم سـەفـەرەدا ئەبولفـەتح جاوانی لە بەغـدا کـۆچی دوایی کـرد و، تەرمـەکـەیان گـوێزایەوە بۆ گەرگەرایا کە نزیکی شاری کوتی ئەمڕۆ بوو... بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە لەو حەلەدا هەر لە نەهرەوانی نێوانی خانی بەنی سەعد و بەعقوبەوە تا کوت لەژێردەستی جاوانەکان بوو و، پاش ئەبولفەتح دەسەڵات کەوتە دەست ئەبولنەجمی برای.

موزیک

سـاڵی ٤٨٨ کۆچی کە سـەردەمی خـەلافـەتی ئەلموستـظهـیـربیللا کـوڕی ئەلموقـتـەدیر بینـەمریللادا، یوسف کوڕی ئاباقا بەفەرمانی تاج الدەولەتەتش کوڕی ئەلپ ئەرسەلانی سەلجووقی شالاوی کردە سەر بەغـدا و، داوای ئەوەی کرد کـە وەزیری بەغدای ئەو حەلە عەمید الدەولە ئەبو مەنسوور کوڕی جەهیری تەغلەبی لە بەغدا دەرچی... عەمید الدەولە لە تاوا هاواری بردە بەر وەڕام کـوڕی ئەبو فـیـراسی جـاوانی... ئەویش بەهێـزێکی زۆرەوە هاتە بەغدا، بەلام لەم سەردەمەدا تاج الدەولەتەتش مرد، ئیتـر ئاگری هەڕەشە و گوڕەشە دامرکا و، شەڕ و هەرا دوایی هات.

ئەمە وەها و بەپێ ئەو زانیـارییـانەی لە کتێبی (المناقب المزیدیە) وەرئەگـیـرێ، وا دیارە کـە سـەردار (سـەیف الدەولە سـەدەقـە کـوڕی مـەنسـوور، کـوڕی دەبیس کـوڕی مـیـزیەدی ئەسـەدی) لەم سـەردەمـەدا دەسـەلاتی خۆی زۆر پەرەپێداوە و، هەمـوو سـەردارەکـانی ئەو ناوەی بەرەو خۆی کێشاوە و، توانیویە هەرێمی جامیعەین بکاتە مەڵبەندی خۆی و، لەگەڵ کوردە جاوانییـەکان بکەوێتە هاوکاری بۆ دامەزراندنی شـاری حیللە نزیک بەکۆنە شـاری بابل و، تا ئەمڕۆکە؛ ئەو گەڕەکەی جاوانی تیـا بەزیوە و، لایەن عـێلی جاوانی کوردەوە دروست کراوە بەناوی گەڕەکی کوردان (مەحەلەت الئەکراد) بەناوبانگە و، سەیریش ئەوەیە کە جاوانەکانی ئەو ناوە گەرچی لەسەر ڕچی شافـیعی و سوننی بوون، چارەنووسی خۆیان بەتەواوی بەسـتـووە بەچارەنووسی بەنی ئەسـەدەکـانەوە کـە عـەرەب و لەسـەر ڕچی شـیـعی بوون. و هەروەکو وتمان جاوانەکان زۆر بەبەنی ئەسەدەوە بەسترابوون، بۆ نموونە: کەیقوباد کـوڕی هەزارئاسپی دەیلەمی کە سـەرداری هەرێمی تکریت بوو، لە ترسی سـەلجـووقـییـەکـان خۆی دایە پاڵ سەیف الدەولە کوڕی سەدەقە کوڕی مەنسووری میزیەدی ئەسەدی جا سەیف الدەولە دەرەبەگـێـتی تکریتی بەقـەواڵە لە مـەلەکـشـای سـەلجـوقی وەرگـرت... ئنجـا فەرمانڕەوایی ئەوێی سپارد بەوەڕام کوڕی ئەبو فـیـراسی کوڕی وەڕامی جاوانی و، کردی بەجێگری خۆی لەوێ. جگە لەمەش تارادەیەک ئەیپەڕمو بەجاوانییـەکانا کە مەحالەکانی واسیت و دەوروبەری بەجۆرێکی دەرەبەگییان خستە ژێردەستیان و فەرمانڕەوای جاوانی کە لە مەحالی واسیـتدا بەدەسـەلات بوون ئەمانە بوون: یەکەم ئەبولنەجم -کە ئەشێ براکەی ئەبولفەتح بووبێ- ئەویتریان ئەبو شوجاع عـاسیم کوڕی ئەبو النەجم بوو... هەریەکە لەم دوو فەرمانڕەواییە، سەر و دێیەکیان بەناوی خۆیانەوە بەیادگار هێشتەوە، بەناوی (نەجمیە) و (عـاصـیـمـە). ئێمە گەرچی دەربارەی بەسـەرهاتی ئەم دووە شـتـێکی تەواو نازانین... بەلام بەپێی ئەلمەناقـیب المیـزیەدییـە و خـەریدەت القـەسر. ئەم عـاسـیـمـە پاڵەوانێکی بەهێـز و

قـارەمـانێکی دەلێـر بووە تا ڕادەیەک کـە لە تەمـەنی گـەنجـیـدا پـتـر لە پەنجا شـێـری لەناو جەنگەڵا بەڕم و نێزە کوشتـووە؛ جگە لەوەش هەسـتـیـار و خاوەن هەڵبـەست و هۆنراوە بوو، بەزمانی عەرەبی و هەندێ لە هەڵبەستەکانی لە کتێبی (خەریدەت القەسر)دا نووسراوە...

وا دیارە جاوانەکان لەم دەورەدا، زمانی نووسین و ئەدەبییان بۆتە عەرەبی... بەڵام نازانین ئایا هەمـوویان هەر بەعـەرەبی دواون یا نە؟ ببـورن ئێـمە لێرە کاتمان تەواوبوو... تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٧/٢٦

## وتاری: ٤٢

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە شەوتان باش! شادی و بەختیاریتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە و، هۆی بەختیارییە کە پێتان ڕابگەیەنین، ئێمە هێشتا لەسەر باسی جاوان دەڕۆین کە هەر وەک وتمان لە هەرێمی کوردستانەوە بەرەو خوار بوونەوە بەرەو عەرەبستان، تەنانەت لای خواری بەغدا و دەوروبەری شاری حیللە کە خۆیان لە دامەزراندنی شارەکەدا هاوبەشییان کردووە... جارێ گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان! بەپێی دەنگوباسی ساڵی ٤٧٢ی کۆچی کە لە کتێبەکانی (ئەلکامیل)ی ئیبن الئەثیر و (ئەلمونتەظەمی) ئیبن الجەوزی: سەیف الدولە ئەبو النەجم کوڕی بەدر کوڕی وەڕامی جاوانی خێو و فەرمانڕەوای تیسفونگ بووە کە بەرامبەر بەنوعمانیەی ئەمڕۆ بووە و، لەوێ ساڵی ٤٧٢ کۆچی، ناکامی مەرگ بووەتە میوانی... هەروا شەرەف الدەولەی برایشی فەرمانڕەوا و خێوی واسیت بووە و، لەوێ قوتابخانەیەکی ئاینی بۆ قوتابیانی ڕچی شافیعی دامەزراندووە. ئەمە وەها و ساڵی ٥٠١ کۆچی کە سوڵتان محەمەد کوڕی مەلەکشاهی سەلجووقی ڕقی هەستاوە لە ئەبو دولەف سورخاب کوڕی کەیخوسرەوی دەیلەمی کە دەرەبەگی ئاوە و ساوە بووە -و مەبەست لە (ئاوە) (ئاوەج) و مەبەست لە (ساوە)ش، هەر ساوەیە کە ئێستەش نزیکی تارانن...- جا ئەبو دولەف لە ترسا هەڵاتووە بەرەو عەرەبستانی عێراق و، خۆی داوەتە پاڵ سەیف الدەولە سەدەقە کوڕی مەنسووری ئەسەدی میزیەدی فەرمانڕەوا و دەرەبەگی حیللە... سوڵتان محەمەد کە بەمەی زانی، داوای لە سەدەقە کرد بیداتە دەستەوە، بەڵام سەدەقە ئەم کارەی بەنامەردی و ناپیاوەتی ئەزانی کە پەنابەر بداتەوە دەستەوە و لە نامەیەکا بەرپەرچی سوڵتانی دایەوە... سوڵتان ڕقی هەستا و بەسپاوە ڕووی کردە عێراقی عەرەب و، لە دێی قوسانی نزیکی جۆگەی غەرافی ئێستە لەگەڵ سەدەقە کەوتنە شەڕەوە، صەدەقە لەم شەڕەدا کوژرا و سپاکەشی شکا و ژمارەیەکی زۆری لێ دیل کرا، کە بەشێکی زۆریان لە پیاوان و سەردارانی عێلی جاوانی کوردبوون... پاش ئەم سەرکەوتنەی سوڵتان... ئنجا فەرمانڕەواکانی سەلجووقی بڕیاریان دا لە ڕێگەیەکی ترەوە بۆی بڕۆن... ویستیان بشێوی بخەنە نێوانی

بەنی ئەسەد و جاوانەکان و، بۆ ئەم مەبەستە دەرەبەگێتی و فەرمانڕەوایی حیللە و دەوروبەریان سپارد بەدوو تیرەی بێ ناونیشانی جاوانی کە پێیان ئەوترا (بەشیری) و (نەرگسی)، کە فەرمانڕەوایان کابرایەک بوو ناوی سیاگێل بوو... جا سەردار ئەبو شوجاع عاسیم کوڕی ئەبولنەجم جاوانی کە یەکێ بوو لە سەرداره گەورەکانی جاوان و، لە زمانی عەرەبیشا زانا و هەستیارێکی بەرز و خاوەن هەڵبەست و هۆنراوەی چاک بوو، لە پارچە هەڵبەستێکیدا، کە داد و فەریادی تێدا ئەکا لە چەرخی چەپگەرد و دەروی قسە ئەکاتە هەناوی خۆی... یاخۆ یارەکەی ئەڵێ: «پێم وت: ئەی بەپێناوت بم وازبێنە، نازانی کە ڕۆژگار وەرگەڕاوە... دێیەکانی سەر ڕووباری نیل -کە لقی بوو لە فورات- سیاگێل تیا بووەتە فەرمانڕەوا و، بەدرانی کوڕی دەبیس دوورخراوەتەوە بۆ حەلەب»

فَقُلْتُ لَهَا كُفِّي جُعِلْتُ لَكِ آلفداء
أَلَمْ تَعْلَمِي أَنَّ آلزَّمَانَ قَدِ آنقَلَبْ
قُرى آلنِّيلِ قَدْ آضْحى (سياگَيْلُ) آمراً
بِها وَنُفِيْ (بَدْرانُ) مِنْها إلى (حَلَبْ)

وە هەر بەناوەکەدا دیارە کە سیاگێل کورد بووە و، لەوەپێش سەر بەجاوانەکان بووە، کە لەگەڵ بەنی ئەسەد هاوکار بوون. بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە سەلجوقییەکان تا چ رادەیەک توانیویانە کوردەکان لە ناوخۆیانا بەشەڕ بدەن و بیانکەن بەگژ یەکا، بۆ ئەوەی بەسەریانا زاڵ بن و کوێخا لە جێی سەردار دابنێن... هەروا لە ساڵانی ٥١٢ی کۆچی بەدواوە کە ئەلموستەرشید بیللای عەبباسی چووە سەر تەختی خیلافەت و پۆستنشینێتی لەگەڵ بەنی ئەسەد و جاوانەکانی دەوروبەری بەغدا و حیللە تێکی دا و، ناخۆشی درێژەی کێشا تا ساڵی ٥١٦ کۆچی، ئاق سەنقەری برسقی فەرمانڕەوای بەغدا لە جێی مەلیک مەسعودی سەلجوقی شاڵاوی بردە سەر هەرێمەکانی ژێردەستی بەنی ئەسەد و جاوانەکان، جا دەبیس کوڕی سەدەقە بەهێز و سپاوە بەرەنگاریان بوو و فەرماندەیی سپاکەشی سپاردبووە ضیائەدین موهەلهەل کوڕی ئەبو العسکر جاوانی و پاش ماوەیەک شەڕ موهەلهەل شکا و خۆی و پیاوماقووڵانی سپاکە، بەسێ هەزار کەس لەو هێزانەوە کەوتنە گەمارۆ و بەدیل گیران... بەڵام وا دیارە لەگەڵ ئەو شکانە سەختەشا هەرێمەکەیان لە دەس نەداوە، ساڵی ٥١٧ کۆچی جارێکی تریش خەلیفەی عەبباسی و فەرمانڕەوای سەلجوقی، هێزیان بەرەو حیللە خستەوە ڕێ... ئەم جارەش (دەبیس) ئامادەی بەرەنگاری بوو و

فەرماندەیی سپاکەی خستە ئەستۆی سەردار فەخرەدین ئەبو محەمەد عەنتەری کوڕی ئەبو عەسکەری جاوانی برای موهەلهەلی ناوبراو، کە یەکێ بوو لە دلێرەکانی ڕۆژگاری خۆی... جا ئەم (عەنتەرە قارەمانە لەپێشا شالاوی بردە سەر قۆڵی ڕاستی سپای خەلیفە و شکاندنی بەدوواوە، ئینجا هەڵی کوتایە سەر ئەو قۆڵی سپاکە و تێکی شکاندن... بەڵام ئەمیر عیمادەدین زەنگی کوڕی ئاق سەنقەر لە واسیتەوە بەهێزێکی گەورەوە بەرەو ژوورەوە بوو شالاوی کردە سەریان و، لای پشتەوە هێزی بەنی ئەسەد و جاوانی خستە ناو چەمەرەی گەمارۆوە و چەند هەزارێکی لێ بەدیل گرتن، تەنانەت عەنتەر خۆیشی دیل کرا... بەڵام وا دیارە عەنتەر پاش ئەوە بەخشراوە و لە دیلی ڕزگاری بووە. جا ئەم عەنتەری جاوانییە ئەوەندە دلێر و ئازا بووە کە هەستیاری بەناوبانگی عەرەب سەعدی کوڕی محەمەدی کوڕی سەیفیی حەیسە بەیسە لە چەند پارچە هەڵبەستێکا ئەوی هەڵناوە و لە یەکێکیانا ئەڵێت:

«هەر کات شمشێرە سپی پەرۆش بوو لە تینوانا... لە خوێنی کەللەسەر»

ناوی ئەدا عەنتەر و تێر ئاوی ئەکا... مەبەستم عەنتەری عەبسی نییە و، هاوناوی ئەوە، کە شایستە ترە بەستایش و هەڵنان. ئەگەر عەبس شانازی کردووە بەشاسواری خۆیەوە کە ناوی عەنتەر بووە، لە ڕاستییا جاوانەکان لەوە پتر هەقی شانازییان هەیە... ئەو کوڕێکە بۆ ئەدارا سەرچاوەیە و، بۆ ترساوی تاوانکار، لە ترسی ڕزگارکارە»...

إذا قَلِقَتْ بيضُ السُّيوفِ ظَماءَةً
سَقاها فَرَوّاها مِنَ الهامِ عَنْتَرُ
ولَم أردِ العَبْسِيَّ لكنْ سَمِيُّهُ
وَمَنْ هُوَ أولى بالثَّناءِ وَأجدَرُ
فَإنْ فَخَرَتْ عَبْسٌ بفارسِ رُعبِها
فَإنَّ بَني الجاوانِ أعلى وَأفْخَرُ
فَتىً هُوَ لِلعافي مِنَ الجودِ مَوْرِدُ
وَلِلخائفِ الجاني مِنَ الخوفِ مُصْدِرُ

و لە پارچە هەڵبەستێکی تریشیان ئەڵێ:

«من گەرچی سەرۆکی عێلی (دارم)ی عەرەبیم و، بەرگری لە نژادیان دەکەم بەڵام جاوان هەڵئەنێم لەبەر خاتری عەنتەر،... تا دوایی...

وَإنّي وَإنْ أسَــيْتُ سَــيِّــدَ دارِمٍ
أُناضِلُ عَن أحــســابهِمْ وَأُقــارِعُ
لمثْنٍ عَلَى (آلجاوانِ) مِنْ أجلِ (عَنْتَرٍ)
ثَناءً إذا كــتَّــمْــتُــهُ فَــهُــوَ ذائِعُ

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئا ئەمانەبوون دلێرانی کوردی جاوان لەناو جەرگەی عەرەبدا... و ئێمە باسی بەسەرهاتی ئەم عەنتەرە ئەهێڵینەوە بۆ وتاری نایندەمان... ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٨/١٣

٢٦٧٣/٨/١٣

## وتاری: ٤٣

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی (وڵاتەکەت بناسە) شاد بن. هۆی دڵخۆشیمانە کە بزانین وتارەکانمان بۆ ئێوە دڵگیر و دڵ چەسپە و، ئەوەش بزانن کە نامەکانتان دەگات و، هەریەکەی لە کاتی خۆیا وەڵامی بەئێوە و بیستیارانی خۆشەویست دەگاتەوە... با ئەوەشتان پێ ڕاگەیێنین کە ئەم وتارەمان پاومانی جاوانە و، جارێ گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز... لە وتاری پێشوودا باسی عەنتەری جاوانمان کرد، کە هەستیاران و هەڵبەستە هۆنەرەوەکانی عەرەب هەڵیان ناوە و، لە عەنتەری عەبسیی خۆیان بەبەرزتریان داوەتە قەڵەم... جا با بزانین سەرئەنجامی عەنتەر و جاوانییەکان ئەگاتە کوێ! ساڵی ٥٢٩ کۆچی سوڵتان مەسعودی کوڕی مەلەکشای سەلجووقی کە هەر بەخوێن ڕژتن سامی خۆی بەسەر وڵاتەکانی ژێردەستی خەلیفەی عەبباسیدا سەپاندبوو، فەرمانی دا بەکوشتنی دەبیس کوڕی سەدەقەی ئەسەدی فەرمانڕەوای حیللە و دۆستی جاوانەکان... و لە هەمان کاتا سەدەقەی کوڕی دەبیسی دانا لە جێی باوکی... جا ئەم کوڕە کە منداڵ بوو عەنتەری جاوانی هەم وەکو لەلە و ئەتابەگی وەهابوو، هەم مامۆستاش بوو، لە ئەدەب و ڕابەرییا، جا کە ئەم سەدەقەی دووەمە ساڵی ٥٣٠ کۆچی ویستی بچێ بۆ لای سوڵتان مەسعود بۆ بەغدا سەردار عەنتەری جاوانی لەگەڵ خۆی برد، کە ڕێنومایی بکات و لەباتی ئەو لەگەڵ سوڵتانا بدوێت و، کاروباری فەرمانڕەوای وڵاتەکەی بۆ ڕێک بخات... جا بۆمان دەرئەکەوێ لەم سەردەمەدا بەنی ئەسەد و جاوان پشتیوانی تەواویان لە سەلجووقییەکان کردووە.

ساڵی ٥٣٢ کۆچی کە نێوانی سوڵتان مەسعود و داود کوڕی مەحموودی سەلجووقی برازایا تێکچوو، بوزابەی دەرەبەگی خوزستان و مەنگەبرسیی دەرەبەگی فارس کە لەو حەلەدا فەرمانڕەوایی وڵاتەکەیان بەقەواڵە لە مەلیک داود وەرگرتبوو، هەردووکیان پشتیوانیان لە داود ئەکرد. بەڵام سەردارانی کورد و عەرەبی کوردستان و عێراقی عەرەب هەموو پشتیوانی سوڵتان مەسعود بوون، جا سوڵتان مەسعود سپایەکی قورسی پێک هێنا و لە دوو قۆڵەوە هەڵی کوتایە سەر (داود)، لە قۆڵی فارسەوە بەسەر سپای داودا زاڵ بوو و، مەنگەبرسی فەرمانڕەوای فارسیشی بەدیل گرت و، لەبەردەستیا کوژرا. بەڵام لە قۆڵی

خوزستانەوە بوزابە سەرکەوت و بەسەر سپای سولّتان مەسعودا زالّ بوو و، گەمارۆی دان و زۆی لیّ بەدیل گرتن، تەنانەت سەردارەکانیان کە سەدەقە کوڕی دەبیس میزیەدی ئەسەدی و عەنتەری کوڕی ئەبولعەسکەری جاوانی مامۆستای بوزابە لە تۆڵەی مەنگەبرسیی دۆستیا هەردووکیانی کوشت، بەم جۆرە دوارۆژی ژیانی سەردارێکی کوردی بەناوبانگ هات، کە هەم لە دلێرییا و هەم لە هەستیارییا کەم وێنە بوو. پاش ئەم کارەساتە دڵتەزێنە سولّتان مەسعود فەرمانڕەوایی حیللەی دایە محەمەد کوڕی دەبیس کوڕی سەدەقە کە برای سەدەقەی کوژراوبوو و، سەرۆکێتی کاروباری ولاّتی دا بەضیائەدین موهەلهەلی کوڕی ئەبو العەسکەوی جاوانی برای عەنتەری کوژراو و کردیشی بەجیّ باوەڕ و پیا ڕاپەڕماوی خۆی...

ئەمە وەها و سالّی ٥٤٧ کۆچی سولّتان مەسعودی سەلجووقی مرد و، سولّتان مەحموودی کوڕی محەمەدی کوڕی مەلەکشای سەلجووقی لە ئێران -واتا لەرەی- لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت و، خەلیفەی عەبباسی ئەلموقتەفی بیئەمریللا لە کاروباری ولاّتا سەربەخۆ مایەوە و، بەنی ئەسەد و جاوان بوونە لایەنگری، بەلاّم فەرمانده تورکە سەلجووقییەکان و سەرداره عەرەبەکانی سەر بەئەوان، کەوتنە هاندانی سولّتان محەمەد کە ڕوو بکاتە عێراق و داگیری بکاتەوە و، خۆیانیش لەو ناوەدا بەسەردارێتیی مەسعود بیلالی ناوێک دژی خەلیفە کەوتنە ئاژاوە نانەوە. و سەرەک وەزیری خەلیفە کە ناوی عەونەدین یەحیا کوڕی هوبەیرە بوو لێیان ڕاپەڕی و بەسپاوە بەرەنگاریان بوو و، پاش شەڕ و هەرا بەسەریانا زالّ بوو و، تەرتە وەرتەی کردن. لەم کاتەدا سولّتان محەمەد سەردارێکی کوردی نارد بەهاواریانەوە، کە بەفریایان بگات ناوی سالار گۆڕ کوڕی زوهەیر بوو. مەسعود بیلالی کە ئەیەویست دەسەلاّت بەدەس خۆیەوە بیّ و، خۆی فەرمانده بیّ نهێن برانە سالار گۆڕی بەسپاوە لە جێگەیەکەوە برد بەرەو حیللە کە لە ڕووباری فورات بدات و، داوی دانا بۆ خنکاندنی. لەسەر ئەم چەپەڵییە نێوانی مەسعود بیلالی و سولّتان محەمەد تێکچوو. مەسعود بیلالی لەم هەلە سوودمەند بوو بەهێزەکەیەوە ڕووی کردە تکریت، کە بەشی ئەرسەلان کوڕی سولّتان توغرولّ کوڕی محەمەد کوڕی مەلەکشای سەلجووقی بوو، ئەرسەلانی ناونا سولّتان و بەهێزەکەی خۆی و سپاکەی ئەرسەلانەوە کە لەژێر فەرماندەیی ئال بەقوش ناوابوو، هەڵیان کوتایە سەر بەغدا، بەلاّم خەلیفەی عەبباسی ئەلموقتەفی بیللا لێیان ڕاپەڕی، لا خواری بەغدای سپارد بەضیائەدین موهەلهەل کوڕی ئەبو العەسکەری جاوانی و دەربەگێتی حیللەش دایێ و خۆیشی بەسپاوە لە بەغداوە

بەرەو ژووره بوو بەرەو بەرازەرو و لەویّ لەشكربەزی كرد، هیّزی سەلجووقی و هیّزی خەلیفە نزیک بەناوایی (بەگمەزی) كە دوو فرسەنگ لە بەعقوبەوە دووربوو تەقین بەیەكا و، پاش شەڕیّكی سەخت خەلیفە بەسەر سەلجووقیدا زاڵ بووه. ئەمە وەها و ئیّمە كە باسی جاوان دەكەین، با بگەڕیّینەوە سەر باسی ئەوان... ضیانەدین موهەلهەلی جاوانی وا دیارە تا ساڵی ٥٥٣ كۆچی فەرمانڕەوای حیللە بووه پاشان كۆچی دوایی كردووه و، پاش ئەو تا دەورانی عەبباسی دوای هاتووه و، بەدەس هۆلاكۆوه قڕان كران... جاوانەكان پیاوی گەورە و ناوبانگیان هەر هەبووه، تەنانەت حیسامەدین ئەبو فیراس كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبو فیراسی جاوانی لە سەردەمی ئەلخەلیفە ناسرەدینوڵلا عەبباسیدا ساڵانی ٦٢٢ كۆچی سەرداری حاجییان بوو بەرەو مەكە كە ئەم پایەیە زۆر بەرزبوو. پاشان كە لەگەڵ ناسرەدینوڵلا تیّكی دا پەنای بردە بەر مەلیک عامیل ئەبو المەعالی محەممەد كوڕی مەلیک عادیل ئەیوبی لە میسر ماوەیەک مایەوه، بەڵام خەلیفە ناسرەدینوڵلا هیّنایەوە و كردی بەفەرمانڕەوای (دەقوقا) و مەبەست لە دەقوقا شارۆلكەی تاوغی ئیّستەیە، كە لەو حەلەدا شاریّكی گەورە بوو و، لەباتی كەركوكی ئیّستە ناوچەی وڵات بوو... و ناوی دەقوقیش لە بنەڕتا دیّ دیّماكۆک بووه، كلدانییەكان كە لەو ناوەدا لە لاشوم -واتا لاسوتین- و كلیّسە و ئیمام بوون، ئەوان و عەرەب ناوه كوردییەكان گۆڕیوە. پاش ئەم دەورە، جاوان خویّندەوار و هەستیاری گەورەیان هەبووه و، هەروەک وتمان وا دیارە لە هەرای هۆلاكۆ بەدواوەی كۆچیان كردووه بۆ وڵاتانی ژیّردەستی ئەیوبی چونكە لەسەر ڕچی شافیعی بوون و، ناوچەی جاوان لە یەمەن یادگاری ئەوانە، وەیا گەڕاونەوە بەرەو كوردستان و هەریّمی چیا و عیّراقی عەجەم، با لەبیرمان نەچیّ زۆر لە سەردارانی جاوان ناویان (وەڕام) بووه، دوور نییە شارە دیّی (وەرامین)ی نزیک بەتاران و چیا شویّنەواری كۆنی ئەوان بیّ. گویّگرانی بەڕیّز تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپیّرین شەوتان باش.

١٣٥١/٨/١٣

## وتاری: ٤٤

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە، شەوتان باش، درودی گەرمی ئێمەتان پێشکەش بێ، بێ گومان ئەزانن کە ڕیزە وتارەکەمان دەربارەی جاوان لە کورتی برییەوە، کە بچینە سەرباسێکی تری. جا لەبەرئەوەی کە ئێستە نۆرەی ناوی جەوانڕۆیە و، هەروەک لەپێشا دیاردیان بۆ کردبوو، پەیوەندی هەیە بەباسی جاوانەوە، بەباشمان زانی کە دەربارەی ئەویش بدوێین. ئێستە با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

لە وتارەکانی جاواندا وتبوومان: کە ئێمە لامان وایە ناوی جاوان ڕۆ تێهەڵکێش بووە لە دوو وشەی (جاوان) و (رود)، لەو سەردەمەدا کە جاوانەکان لەوێ ماڵ بەزیان کردووە، یەکێ لە لقەکانی سیروان ناوی ئەوانی گرتۆتە خۆی و، پاشان ناوەکە سووکتر بووە و بووە بە(جەوان ڕۆ)... و خەڵقی ئەو ناوە کردوویانە بە(جوان ڕۆ) کە ئەکات ڕووباری جوان، یاخۆ ڕۆژی جوان بەڵام تیمسار ڕەزم ئارا لە لاپەڕە ٥٩ جوغرافیای نیزامی ئێران بەشی کوردستاندا وای داوەتە قەڵەم کە کوردەکان پێی ئەڵێن (چوار ڕود)، کە ئەمەیان شتێکی سەیرە، چونکە لە فەرهەنگی جوغرافیاییەکەیدا، ناوەکەی بەلاتینی بەجۆرە تیپێ نووسیوە کە بخوێندرێتەوە (جاڤان ڕود)، گومانیشم نییە هاوڕی دابێ بەکرۆکی ناوەکەدا و عێلی جاوانیشی هاتبێ بەبیرا.

ئەمە وەها و دەبوایە ناوی جەوان ڕود بدرێ بەڕووباری لقی سیروان کە بەو هەرێمەدا تێ ئەپەڕێ و، کە جاوانەکان تیا دانیشتوون، بەڵام بەپێچەوانە ئەمڕۆکە وشەی (رود)ەکە نووساوە بەناوی عێلەکەوە و، بووە بەناو هەم بۆ ناوچەی بەخشەکە و هەم بۆ هەرێمەکە و، بەعێل و تیرەکانی ئەو ناوەش ئەوترێ جەوانڕۆیی... وا دیارە ئەم جۆرە ناونانە لە زاراوەی کۆنی کوردیدا باوبووبێ، چونکە ئێمە زۆر ناوی تری بەم جۆرەمان بەرگوێ ئەکەوێ و، لە کتێبەکان ئەخوێنینەوە... بۆ وێنە لە ئوستانی هەولێری کوردستانی ئەودیو عێلێکی گەورەی کورد هەیە، ناوی (زێباری)یە، ئەم عێلە لە بنەڕەتا بەشێ بووە لە عێلی بارزان -کە لە شەرەفنامەدا بەهەڵە نووسراوە بازیران- و ئەم بەشە پاش ماوەیەک لە بارزان جیابووەتەوە و، لە کەناری زێی گەورە ماڵ بەزیان کردووە و، ناوی عێلەکە لەبیر براوەتەوە و ناوی کەنار و لێواری زێ کە ئەکا (زێبار) دراوە بەعێلەکە و پێیان وتووە زێباری. و زۆریش

سەیرە کە جوغرافیانووس و مێژووزانە کۆنەکان هیچیان ناوی جەوانرۆیان نەبردووە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەرێمێکی کۆن و پڕ لە دژ و قەڵای سەخت و شوێنەواری کۆنە... بەڵام وا دیارە لە سەردەمی سەلجووقی و مەغۆل و سەفەویدا، ناوی قەڵای پاسکە پتر بەناوبانگ بووە، ئەم ناوانەی تری هەموویان لەپاڵ ئەوا شاراونەوە.

مورزیک

بابێنە سەر باسی جەوانرۆی ئەمڕۆ، بەپێی فەرهەنگی جوغرافیای تیمسار ڕەزم ئاراوە کتێبی (شەهرستانها) جەوانرۆیەکی لە دێهستانەکانی بەخشی جەوانرۆ بووە و، ئەمڕۆکە ئەوچەی بەخشەکەیە، کە لەوەبەر سەر بەئوستانی کوردستانی سنە بووە و، ئەمڕۆکە سەر بەئوستانی کرماشانە و یەکێکە لە بەخشەکانی فەرمانداریی پاوە و سنووری بەم جۆرە بووە: لای باکوورییەوە هەورامانی لهون و ڕووباری سیروانە کە ٤٠ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە، لای باشوور و خۆرئاوایش دێهستانەکانی وەلەدبەگی - قوبادی - باوەجانی بووە و، لای خۆرهەڵاتیشی بەخشی (ڕەوانسەر)... هەرێمەکە چیایی و سەخت و جەنگەڵاوی، زنجیرە چیای (شاهۆ) لەم نزیکانەدا دەبێ بەدوو ڕشتەوە: بەرزترین لووتکەی بەشی یەکەمی، کە ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی ڕێی (شمشێر)ەوە ٣٣٧٠ مەتر لە ڕووی زریەوە بەرزە. بەشی دووەمیشی کە درێژە ئەکێشێ بۆ سەر (سیروان) لەو لقە دایە کە لە چیای ئاتەشگاوە ئەچێ بەرەو چیای زەردوئی و ٢٥٠٠ مەتر بەرزە لە ڕووی زریەوە و، دەبێ لووتکەی قەرزاڵە هەزاران ساڵ لەوە بەر (ئاگرڕێژێن) بووبێ، وەیاخۆ لەو سەرە ئاتەشگایەک هەبووبێ، چونکە ئەم هەرێمە ئەوەندە کۆنە کەس بەبیریا نایێ و، هیچ مێژوویێ پەیی بەسەرەتای ئاوەدانێتیی وڵاتەکە نەبردووە، ئەم وڵاتە -بێ گومان- بەر لە سەردەمی گوتی و لولو و عیلام و ئاشووری و میدیا هەر ئاوەدان بووە، قەڵا و شوێنی هەوارە کۆنەکان بەڵگەن لەسەر ئەوە:

١- قەڵای گەوری کە بەسەر لووتکەی چیاکەی نزیک بەئاوایییەکانی ڕووانی و زەردوییەوەیە، بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر کۆنیی ئاوەدانێتی و، شارستانێتیی لەو ناوەدا...

٢- قەڵای پاسکە یەکێکە لەو قەڵا کۆنایانەی کە (شەرەفنامە) ناوی بردووە.

٣- قەڵای قوڕە قەڵا...

٤- قەڵای جەنگیزخان، کە ئەکەوێتە باکوری قەڵای جەوانرۆوە.

٥- کەلاوەی قەڵاکەی سەید ئەحمەد کە ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی دێی مەزیدییەوە. لێرەدا

دەبێ بڵێم ئەم ناوە لە بنەڕەتا تا میزیەدییە بووە و، جاوانەکان، کە هەندێکیان پاش دەورانی هۆلاکۆ گەڕاونەوە و بەرەو کوردستان ناوی میزیەدییەی هاوسوێنی خۆیانیان بڕیوە بەسەر ئەم دێیەدا، یا ئەشێ هەندێ بەنی میزیەدی لەگەڵ ئەمان پەنایان هێنابێتە چیاکانی کوردستان.

جگە لەمانە خۆ ئەشکەوتی کاوات کە نموونەی سەنگ تەراشیی کۆنە، بەڵگەیە لەسەر ئەمەی، هەزاران ساڵ پێش مێژوو کوردانی چیای زاگروس تیا ژیاون و، هونەرکارییان تیا کردووە.

دانیشتوانی هەرێمی جەوانرۆی ئەمرۆ لە تیرە و خێڵەکانی جافن و، کار و پیشەیان ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵە. زۆریشیان تا ئێستەش گەرمێن و کوێستان ئەکەن. زستان ئەچنە دێیەکانیان، کە بەتورکی پێی ئەڵێن (قشلاق) و بەهار و هاوین و پاییزیش بەناو چیاکانی هەرێمەکەدا بەدوای لەوەڕ و پاوەندا دەگەڕێن. دەسکەوتیان خێر و بێری ماڵات و، بەرهەمی کشتوکاڵ و، میوەی باغ و باغات و میوەی کێوی و هەنگوین و بنێشت و کەتیرە و شتی ترە. ئەمە وەها و هەرێمی جەوانرۆ زۆر خوێندەواری بەرز و هەستیاری گەورەی پێ گەیاندووە کە جێی شانازی و فەخرن بۆ هەموو کورد و ئاری نژادان وەک (کەیفی و مەلکە و مەولەویی تاوگۆزی) کە ئێمە لە وتاری ئایندەمانا دەربارەیان ئەدوێین.

ئێستە کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٩/١

**وتاری: ٤٥**

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە، کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆی کوردییە. ئێمە لە دڵەوە سپاسی هەستی بەرزی ئێوە دەکەین، کە دڵ ئەدەنە بەرنامەکەمان وەلێی ورد ئەبنەوە و پێشنیهاد و خواستی خۆتان ئەنێرن و ڕەخنەی وردبینانە دەگرن. لە وتاری پێشوودا کە باسی (جەوانرۆ)مان کرد بەڵێنمان دانێ کە دەربارەی ئەو هەستیارانە و، ئەو نووسەرانە بدوێین، کە پەیوەندییان هەیە بەناوچەی جەوانرۆوە، جا ئەمشەو نۆرەی ئەوەیە، بەڵام با جارێ گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

گوێگرە بەرێزەکان! ئەو هەستیارە بەرێزانەی کە پەیوەندییان هەیە بەناوچەی جەوانرۆوە زۆرن. هەندێکیان شوێنەوار و کەلەپووری ئەدەبییان لێ بەجێ ماوە و هەندێکیان بێ شوێنەوار و کەلەپووری ئەدەبی لە دەسمان چوون، تەنیا ناونیشانیان ئەزانین، ئەویش بەجۆرێکی کورت و ناتەواو... ڕاستە کە ئێمە وتارەکەشمان جوغرافی و مێژووییە و، ڕێی ئەوەمان نییە کە بەسەرگوزەشتی ئەوانەوە، بەرنامەکە ببەینە سەر... بەڵام لەبەرئەوەی کە ڕۆڵەکانی کوردی ئەم دەورە ڕەنگە ناوی هەندێ لەوانیان نەبیستبێ یا لەبیر چووبێتەوە، ئێمە تا ڕادەیەک ناویان ئەهێنینەوە بیر.

حاجی قادری کۆیی هەستیاری بەهەشتیی پایەبەرز و دڵسۆزی ئەمر گەر نەبوایە، ئەمانە هەروەک شوێنەواریان لەناوا نەماوە ناونیشانیشیان تیا ئەچوو. بەڵام خوا ماڵی ئەو بکات بەبەهەشتی بەرین، کە لە پارچە هەڵبەستی باغچەیی شاعیرانیدا بەجۆرێکی گەلاکەوە کورت ناویانی بۆ پاراستووین حاجی قادر ئەڵێ:

(کەیفی) حاجەت نییە بکەم باسی
ئەم کتێبە بخوێنییەوە ئەیناسی

.............................................

پاشان ئەڵێ:

لە کون و قوژبنی کەلاوەیی دەهەر
چەندی تری هەن میثالی گەنج و گوهەر

سەبکی جامی و غیرەتی سەلمان
بەیتیان ون بووە، وەکو خۆیان
مەلکەقورە و، حەججاری و کەیەل
(قِسْ مِنْ أسمائِهِمْ وَلا تسْألْ)
شیعریان جوانە بەس نییە کوردن
گەرچی بێ ناو و گەلێک وردن
مەلکەمان مەلەکەمەوتی مەعنایە
یانی هەر چۆنی حەز بکات وایە
حەسەنی باوکی فەقێ ئۆمەر
کوڕی ئۆمەری محەمەد سەروەر

کەیفی لە نێوانی ١٨١٤-١٨٨٣ی زایینیدا ژیاوە و، فەقێ هۆمەریش لە نێوانی ١٨٢٠-١٨٧٦دا و، مەلکەش هاودەمی مەولەوی بووە، ئەمانە تەنیا حاجی قادر ناویانی زیندووکردۆتەوە و، مامۆستا سەجادیش بەپەیڕەوی ئەو ناوی تۆمار کردوون و، دەربارەی کەیفی ئەڵێ:

لە سەرەتادا کەیفی فەقێ بووە، چووەتە کۆیە لەوێ لەگەڵ حاجی قادرا هاوفەقێ بوون و، حەزی لە کچێکی (ئایشۆکی) ناو کردووە و، باسی دڵدارییان بەخەڵقا بڵاوبووەتەوە، بێ گومان لەو حەلەدا کە کەیفی لە کۆیە بووە باسی رۆشنبیری ئەوروپا کە لە پرشنگ دانابووە گەییوەتە کۆیە. کەیفی و حاجی قادر کە دوو فەقێی ژیر و زرنگ بوون و هەردووکیان هەستیار و خێوی هەڵبەست بوون، لەو تیشکی رۆشنبیرییە سروشیان وەرگرتووە و، بۆیان دەرکەوتووە ئەو هەتاوی پێشکەوتنەی لە ئەوروپاوە هەڵدێ و، تاوی ئەگاتە ئەستەمۆڵی پایتەختی وڵاتە موسڵمانەکان و، لەوێوە تیشکێ ئەهاوێنە دەرەوە، ئەو تیشکە هێندە کەم شەوق و زەردە هیچ دڵێ روون ناکاتەوە، هیچ هەناوێک گەرم ناکاتەوە، لەبەر ئەوە (کەیفی) و (حاجی) بریاریان داوە پێکەوە بەرچی ئەو تیشکە زەردەدا برۆن بەرەو رووناکیی راستەقینە. بەم جۆرە هەردووکیان گەییونە ئەستەمۆڵ و لەوێ گیرسانەوە و، لە سای بنەماڵەی بەدرخان پاشا و شەقامەرێی رووناک بیرییان گرتۆتەبەر.

کەیفی چووەتە زانستگەی (فردوماف) -واتا حقوق- و حاجیش بووە بەمامۆستای کوڕانی بنەماڵەی بەدرخان پاشا و پیاوماقووڵانی تری کورد لەوێ، کە فارسی و عەرەبی و

کوردییان فێر بکات. حاجی قادر بڕیار ئەدات کە بەرەبەنی بمێنێتەوە بەڵام کەیفی ژن ئەهێنێ و چەند منداڵێ ئەخاتەوە، پاشان ئاکامی مەرگ چنگ لە یەخەی قایم دەکات و، جوانەمەرگانە و دووره ولاتانە سەرئەنێتەوە و، بەم جۆرە پاش خۆی خەڵقی لە هەڵبەست و کەلەپووری بێ بەش و بەهرە دەبن بەڵام لە پارچە هەڵبەستەکەی حاجی قادر کە لەسەر شیوەنییا وتوویە، بۆمان دەرئەکەوێ کەیفی یەکێ بووه لە بلیمەتانی ڕۆژگاری خۆی و، بەچوار زمانی (کوردی - تورکی - فارسی - عەرەبی) خوێندەوار و نووسەر و هەستیار بووه... با ئێستە گوێ بدەینە ئەو سەر شیوەنییە دڵسووتێنە...

موزیک نای حەزین درمێ

فەلەک بەتیر و کەمانی لە ئێمە چۆتە کەمین

شکارە گاهی زەمینە لە چنگی کوێ و دەچین!

دەخاتە گەردنی ئێمە میشالی دابەستو

گوریسی بەڵەکی صوبح و شام و ناترسێن

بەحوقەبازیی لوعبەی زەمانە ناخەڵەتێین!

ئەمێستە پێ دەکەنین و لە ئاخرا دەگرین

ئەمین مەبە لە سبەینێ، ئەمەت بەسەر دێنێ

حەوادیثاتی زەمانە کە نایێتە تەخمین

وجودی ئێمە کە ڕۆژی حەیاتی ئاوابوو

یەقین بزانە شەو لێ گۆڕاو دەربەدەرین

ئەم ئەرضە کۆنە هەوارە، حەلایقی کۆچە

طەماعی سوودی نەبێ کەس لەژێری چادری شین

دوو گەز زەمین و سێ گەز جاو و مستەخۆڵێکە

لیباسی پێ خەف و ڕاحت هەتا دەگاتە سەرین

صەبا! موسەللەمی ئافاق و قاصیدی غورەبای

ئەنیسی یاوەر و، هەم ڕازی عاشیقی غەمگین

هەستە! مەوەستە! وەڵامێ بگەینە خاکی وڵات

دیارە چەند حەزین و غەریب و بێ کەیفین!

که چۆیته سەر حەدی(بابان)و عێلەکەی (جافان)
بەکوڵ بگریێ وەکو بارانی (فەروەردین)
لە قوڕ بنیشە بڵێ: قەوم و قبیله هاوارە
ئەسیرە(کەیفی)لە ڕۆما ، لە حەبسی ژێری زەمین
لە کوێرە دێیەک کە(کەیفی) تیا بێ فیردەوسە...
جەهەننەمە کە ئەما(کەیفی) ، شاری قوسطەنطین
حەزین و دەرهەمی ئەم شارەزوری بێگانەن
لە حەسرەتی، عەجەبا(شارەزور)ی چۆن نەگرین؟
گەلێ هەناسەی هەڵکێشا و چاوی خۆی گێڕا
کەسی نەدی لە عەشیرەت! لە داخی چۆن نەمرین
زمانی کوردیی و تورکیی و فارسیی و عەرەب
وەهای دەزانی وەکو بەیتی خوسرەو و شیرین
ئەمەش دەلیلە لە تەئثیری مەرثیەی کە گوتم:
چوار زمانی تیایە قەصیدەیی ڕەنگین

دریغ و حسرت از آن شاهباز صدر نشین
بدام مرگ فتاد و نجاک گشت دفین
زلوحە ء خط موزون و قطعە ء منظوم
خجل شد (ئیبن هلال) و روان (ابن یمین)

بەکێ بڵێم کە بە(کەیفی)بڵێ:بەکەیف و سرور
غەمی نەبێ لەفەلەک، عاکیفانی چلله گوزین

جُنوبُهُمْ تَتجافی عَنْ مَضاجِعِهِمْ
یَستَغْفِرونَ لَكَ بِالغُدُوِّ حَتّی حین

کبیر در بو مصبیت عظیم واقعه در
(صغیر) در یازارسه تأریخ، خامەئی مشکین

لە یەک دوو لاوە هەتیوی لەپاش جێماوە
یەکێکیان بیکری مەعانی،دووانیان طیفلی حەزین

ئەمن کــە مـــامی ئەوانم دەیاندەمـــە ئودەبا
کـچـانی زادەیی طەبعی لەطیف و حـەجلەنشین
وەلێ کـوڕانی ڕەضـا نین بەخـاکی ڕۆم و دەڵێن:
لەلای ویـلایەتەوە، چاوەدێری مــــامی تـرین

لەم پارچە هەڵبەستەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە (کەیفی) جەوانڕۆیێ لە عێلی جاف بووە و، لەو سەردەمەشا جافی جەوانڕۆ و جافی شارەزوور یەک بوون و لەژێر فەرمانڕەوایی سەردارێتی باباندا بوون... ئەوەشمان نابێ لەبیر بچێ کە سەرئامەدی هەستیارانی هەرێمی جەوانڕۆ مەولەوییە، کە خەڵقی تاوک گوێزە و شوێنەوار و کەلەپووری وەکو خۆی زیندووە، بەشەوقترین ئەستێرەیە لە شێوەی ئەدەبی گۆرانیی زمانی کوردیدا... تەنانەت لە کوردستانی ئەودیو... هەر کەس مەقام و ئاهەنگە کوردییەکان بزانێ، با نەخوێندەواریش بێ بۆ (قەتار، ئەڵلاوەیسی، خاوکەر، خورشیدی، ئای ئای، تێ هەڵکێشی، سەحەری) هەمیشە هەڵبەستی مەولەوی بەکار ئەبات و، لە زریەی بێ پەیی ئەدەبی ئەو، بەهرە وەرئەگرێ... تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین کاتمان تەواو شەوتان باش.

١٣٥١/٩/٦

**وتاری: ٤٦**

## جورقان

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش! بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیە سپاسی هەستی بەرزی ئێوه دەکەن کە بەپەیام و بەنامەی دەرخواستی هەم ئەم بەرنامەیە هەڵئەنێن و، هەم ڕەخنەی سازەندە ئەگرن. ئێمە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ڕەخنەسازەندەکانی ئێوە پەسەند ئەکەین، چونکە ڕێ بەدتییمان دەکەن و، ڕێنوماییان تیایە بۆ چاترکردنی بەرنامەکان و بۆ بەرەوپێش بردنیان و، لێرەدا بەهەلی دەزانین کە پێتان ڕابگەیێنین کە ئێمە ئەم حەوتەیە باسی (جورقان) دەکەین کە شارۆلکەیەکە لە دەوروبەری هەمەدان... و لە بنەڕەتا ناوە بۆ عێلێکی کورد. جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی موسیقایی.

موزیک

مێژوونووسان، لایان وایە کە وشەی جورقان لە بنەڕەتا (گەورکان) بووە، کە ناوە بۆ عێلێکی کوردی بەناوبانگ، عەرەب پیتی (گافە)کەیان گۆڕیوە بە(جیم) و کردوویانە بە (جورکان) پاشان درکاندنی پیتی (جیم)یان لەگەڵ (کاف) لەلا قورس بووە، (کاف)ەکەیشیان گۆڕیوە بە (قاف) و کردوویانە بەجورقان، بەڵام کوردەواری بەعێلەکەی خۆیانیان هەر وتووە (گەورک)... کە تاک وشەیە و گەل وشەکەی دەبێتە (گەورکان) و بەداخەوە هەندێ بەوەشەوە نەوەستان کە بڵێن جورقان بەڵکو (ڕێ)کەشیان گۆڕیوە بە (زێ) و کردوویانە بە(جوزکان)... و لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە تا ئەمڕۆ ئەم ناوەی گۆڕراوە، هەر بەو جۆرە عەرەبییە ئەدرکێنرێ و لە دەوری هەمەدان ناوە بۆ شارۆلکەیەک...

خاوەنی (موعجیم البولدان) ئەڵێ: (جوزقانەکان، تیرەگەلێکن کورد لە دەوروبەری حەلەوان دائەنیشن و، بەم ناوە دێیەکیش لەلای هەمەدان هەیە... و بەر لە یاقوت مێژوونوسی بەناوبانگ مەسعودیش لە کتێبی (مروج الذهب)دا ئەڵێ: ئەو کوردانەی کە بەجوزقان بەناوبانگن، وا لەسەر ئاینی مەسیحین، پەیڕەوی ڕچی یەعقوبین... ئەمە وەها و بێ گومان خوێندەوارانی ئەمڕۆ ئەم جۆرە زاراوەیان لا سەیرە... لە قوتابخانەی ئەسکەندەرییەی کۆندا مەسیحییەت سێ ڕچی هەبوو: (مەلکانی - ئەسطوری -

یەعقوبی). ئەمرۆکە ئەم زاراوانە گۆڕاون و بووە بە (کاتولیک - پروتستانت - ئورثوزوکس)... جا بەم زانیارییانەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە ناوی (گەورک) لە گاورەوە هاتووە، کە ئەکات مەسیحی و لە گەبرەوە نەهاتووە کە دەکات مەجوسی و، بەر لە پەیدابوونی ئیسلام ئەم عێلی گەورەکە مەسیحی بوون.

ئەبو الفیدای ئەیوبیش لە کتێبی (تەقویم البولدان)دا کە کراوە بەفارسی لە لاپەڕە ٤٨٣دا ناوی جورقانی هێناوە کە یەکێکە لە دێیەکانی هەمەدان... دوکتور فریجی ئەلمانیش لەو کتێبەیا کە دەربارەی کورد دایناوە و، کراوە بەتورکی بەناوی (کوردلەر) لە لاپەڕە ٣٥دا ئەڵێ: جوزکان عێلێکی کوردن لە دەوروبەری هەمەدان دائەنیشن... ئەمە وەها و ئەم جورقانانە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی حەسەن وەیهی کورددا زۆر بەهێز بوون، تا ڕادەیەک: کە ساڵی ٤٠٥ی کۆچی کاتێ بەدر کوڕی حەسەن وەیهی شالاوی کردە سەر حوسێن کوڕی مەسعودی سەر بەبنەماڵەی ئال بویە و لە قەلای کوس جەددا ماوەیەکی دوور و درێژ گەمارۆی دا ئەم جورقانانە چوونە فریای حوسێن کوڕی مەسعود و بەدریان ناچار کرد کە واز لە گەمارۆ بهێنێ و هەڵ بێ، بەلام لە چنگیان ڕزگار نەبوو کوشتیان و، تەرمەکەی بەفەرمانی ئال بویە نێررا بۆ نەجەف و لەوێ نێژرا. لێرەدا خۆرهەلاتناسی مەزن (مینورسکی) ئەڵێ: ئەم قەلای کوس جەدە کامەیە؟ ئایا مەبەستی مێژوونووسان کۆسەی هەجیجی هەورامانە...؟ یاخۆ گوش خدی کەناری سفید ڕودە؟ کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سنووری فەرمانڕەوایی حەسەن وەیهییەکان پانوپۆڕ بووە.

موزیک

بابگەڕێینەوە سەر باسی جورقان، تیمسار ڕەزم ئارا لە فەرهەنگی جوغرافیاییەکەیا ئەڵێت: جورقان شارۆلکەیەکە لە دێهستانەکانی چوار بلوکی بەخشی سیمینەرودی سەر بەفەرمانداری هەمەدان، دەکەوێتە لای باکوری شاری هەمەدانەوە بەدوورایی ١٠ کیلۆمەتر، بەلای خۆرهەلاتی شەقامەڕێی (هەمەدان - تاران)دا و لە دەشتاییی دایە و، مەڵبەندێکی سەردەسێرە و دانیشتوانی نزیکەی چوار هەزار کەسێ دەبن، زمانیان تورکی و فارسییە. کەوابێ خەڵقی ئەمڕۆی جورقان لەو عێلە کوردانە نین کە لە سەرەتادا مەسیحی بوون و پاشان ئیسلام بوون، ئەبێ لەم سەدانەی دواییەدا یا (گەورک) ئەم ناوەیان بەجێ هێشتبێ، وەیاخۆ دێی جورقان هەر زستانە هەواری (گەورک) بووبێ... کە بەتورکی پێی ئەڵێن قشلاق...

با ئەوەش بزانین کە عێلی گەورک لەمەوبەر کۆچەر بوون، لە نێوانی لای سەرووی زێی بچووک و سیرواندا ئەژیان... بەڵام لە سەردەمی شاھەنشاھی پەھلەویدا، کە خێڵاتی کۆچەر، جێنشین کران عێلی گەورکیش وازیان لە کۆچەری ھێنا، ھێندێ لەم عێلە، لە فەرمانداری سەقز دان... سەرژمێری گەورکی سەر بەمەھاباد سێ ھەزار ماڵێ دەبێ و سەرژمێری گەورکی سەر بەسەقزیش حەوت سەد خێزانێ ئەبێ... جا ھەروەکو خەڵقی جورقانی لای ھەمەدان بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن، خێڵەکانی گەورکیش لە ھەردوو ئوستانی ئازەربایجانی خواروو کوردستاندا بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن. بەڵام تەنیا یەک جیاوازی ھەیە لە نێوانی گەورەک و جورقاندا، گەورک ھەروەک کۆن زمانیان کوردییە و، ئێستەش ئیسلام و لەسەر ڕچی شافیعین. بەڵام جورقانییەکان زمانیان تورکی و فارسییە و، لەسەر ڕچی شیعیێتی ئیسلامن و دێی جورقان ئاوی کارێزە، دەسکەوتی خەڵقەکەی ھی بەرھەمی کشتوکاڵە، وەک گەنم، جۆ، نیسک و نۆک، سەرەڕای بەرھەمی ئاژەڵی وەک شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن و خوری و پێستە.

لە ئاوایی جورقاندا قوتابخانە و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و سپای پەرەپێدان بەکشتوکاڵ و، چاترکردنی تەندروستی ھەیە... و چۆن لێرەدا کاتی بەرنامەکەمان بەسەرئەچێ، تا بەرنامەی داھاتوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/٩/٢٠

وتاری: ٤٧

گوێگرانی خۆشەویستی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش!

کامەرانی و بەختیاریتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە. ئێمە لە زنجیرە وتارێکا دەربارەی چاڵدێران ئەدوێین کە زۆر لە ئێوە ئەم ناوەی لە مێژوودا خوێندۆتەوە و لە ڕادیۆشەوە بیستووە، بەڵام هەندێ لە گەنجان پێتەویستن بەوەی زۆرتر لەم باسە شارەزا بن، تەنانەت ئەوەی کە (چاڵدێران) لە کوێیە و لەم جێگرەدا چی ڕووی داوە کە بۆتە هۆی ناوبانگ دەرکردنی... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا ئنجا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

موزیک

چاڵدێران ناوە بۆ دەشتێکی پانوپۆڕ کە پێوانەی ٧٥٥ کیلۆمەترە و، نزیکەی ٨٤ دێی تێدایە، ئەکەوێتە بەخشی سیا چەشمەوە کە سەر بەفەرمانداریی ماکۆیە لە نوستانی ئازەربایجانی خۆرئاواییدا کە ناوەندەکەی شاری ڕەزائییەیە واتا شاری (ورمێ)ی کۆن... ناوی چاڵدێران ڕەنگە لە بنەڕەتا لە (چاڵ) و (دەران) یا (چار) (دەران) یا (چار) (دێران)ەوە هاتبێ... دوور نییە هەر لەبەرئەوەی کە ئەکەوێتە داوێنی زنجیرە چیای ساری چەمەنەوە -واتا چەمەنی سارد- و لە چاو ئەوێدا چاڵ و قووڵە، ئەو ناوەی بەسەرا برابێ... ئەم هەرێمە هەر لە بنەڕەتا نیشتمانی کورد بووە، گەرچی ماوەیەکی زۆریش لەژێر دەس ئەرمەنیدا بووە و بەپارچەیەک لە خاکی ئەرمەنی دراوەتە قەڵەم. بابێینە سەر ئەوەی ئەم چاڵدێرانە لە کەیەوە ناوبانگی پەیدا کردووە؟ هۆی ئەم ناوبانگە چییە؟...

هۆی ناسرانی ئەم جێیە، ناو دەرکردنی شەڕی چاڵدرانە کە لە نێوانی شا ئیسماعیلی سەفەوی و سوڵتان سەلیمی عوسمانی ڕووی دا... بۆ ئەوەی ئێمە باشتر بزانین شا ئیسماعیل کێیە و سوڵتان سەلیم کێیە؟ و بەمان بۆچ دەڵێن بنەماڵەی سەفەوی؟ و بەوان بۆچ دەڵێن بنەماڵەی عوسمانی پێویستە تۆزێ پتر لە مێژوو قووڵەوە بین... ئەگەر لە بیرتان مابێ ئێمە لە وتارێکا کە دەربارەی ئەردەبیل -یا ئەردەوێڵ- نووسیبوومان بۆمان ڕوون کردبوونەوە کە شێخ سەفیەدین، زانایەکی بەڕێز و پیرێکی گەورە بووە و، زاوای شێخ زاهیدی گەیلانی و خەلیفەی بوو، ئەم دوو پیرە دەستگیرە هەردووکیان کوردبوون...

شێخ سەفی لە بنەڕەتا خەڵقی دێیەک بووە بەناوی سەنجان، لە دەوروبەری ئەردەبیل. بەڵام هەندێ لە مێژوونووسان بەهەڵە وایان دایە قەڵەم کە خەڵقی سەنجارە و لە دەوروبەری وڵاتی حەلەبەوە هاتووە... چونکە نەیانئەویست دان بەوەدا بنێن کە ئەم جۆرە پیاوە گەورەیە کورد و کوردستانی و ئاری نژادن حەزیان ئەکرد ڕیشەیان ببەنەوە سەر عەرەب بەزۆر و درۆ ڕیشەیەکی عەرەبی بۆ دروست بکەن، بیکەن بەسەید. کوردەکانی دەوروبەری ئەردەویل و ئەو ناوە هەموویان سەر بەشێخ زاهید بوون، پاشان بوون بەپەیڕەوی شێخ سەفیەدین... پاش کۆچی شێخ سەفی نەوەکانی یەک لە دوای یەک لەسەر پۆستی شێخێتی دانیشتن... مەغۆل و تاتار و ئیلخانی زۆر ڕێزیان لەم بنەماڵەیە ئەنا و بەبنەماڵەی سەفەوی ناسراون.

بابێینە سەر عوسمانییەکان، ئەمانە هیچ پەیوەندییەکیان بەحەزرەتی عوسمانەوە نییە کە سێیەمین خەلیفەی پێغەمبەری ئیسلام بووە، ئەمانە لە بنەڕەتا تورکن، لە سەردەمی سەلجووقییەکانا کەوتبوونە ئاسیای بچووک -واتا ئەنادۆڵ- سوڵتان عەلائەدین سەلجوقی. عوسمانجقی باپیرە گەورەی عوسمانییەکانی لە دەوروبەری ساڵی ٦٨٠ کرد بەسەرۆکی هەرێمێ... پاش کۆچی دوایی سوڵتان عەلائەدین، کەوتە پەرەدان بەوڵاتەکەی و، لە دەورانی تاتار و ئیلخانی پەرەیان سەند. ئەوە بوو سوڵتان بایەزید لەگەڵ تەیموری لەنگدا کەوتە شەڕەوە و بەدیل گیرا و پاش مردنی تەیموورلەنگ عوسمانی بوو بەدەوڵەت...

بنەماڵەی سەفەوی کە زۆر بەهێز بوون و، دەروێشیان زۆر بوو و، هەموو لە کوردە سادە دڵەکان بوون، کە خۆیان ئەکرد بەپێناو بەڕابەری شێخ جونەیدی کوڕی شێخ صەدرەدین ئیبراهیمی نەوەی شێخ سەفی کەوتە ئەوەی هەڵمەتی گورجستان بدات بۆ ئەوەی بیانهێنێتە سەر ڕێی ئیسلام... سوڵتان ئوزۆن حەسەنی ئاق قویونلو لەبەرئەوەی زانی شێخ جونەید خەریکە ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر ئەبێ، کردی بەزاوای خۆی و خەدیجە بیگی ئاغای خوشکی دایێ شێخ جونەید پاش ئەوەی کە چەند جارێ شاڵاوی بردە سەر گورجستان ئنجا ویستی وڵاتی شێروان داگیر بکات و، لەگەڵ ئەمیر خەلیل کەوتە شەڕەوە و، لەو شەڕەدا کوژرا، پاش خۆی حەیدەری کوڕی لە جێی دانیشت کە خوشکەزای سوڵتان ئوزون حەسەن بوو هەم ڕابەریی دەروێشانی گرتە دەست و، هەم دەسەڵاتی ئەو ناوانەی کە ئوزون حەسەن خستبوویە ژێردەستی جونەیدی باوکی. پاش ئەوە ئوزون حەسەن کچەکەی خۆی دایێ کە ناوی عالەم شا بیگم خاتوون بوو... شێخ حەیدەر کەوتە تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی و، چەند جارێ شەڕی لەگەڵ فەڕوخ یەسار کوڕی ئەمیر خەلیل کرد و، شکاندی... بەڵام سوڵتان یەعقوبی کوڕی سوڵتان مورادی ئاق قویونلو پشتیوانی لە فەڕوخ یەسار کرد.

سولتان حەیدەری سەفەوی لەم شەڕەدا کوژرا، سێ کوڕی لەپاش بەجێما... (عەلی، ئیبراهیم، ئیسماعیل) سولتان یەعقوب ماوەیەک ئەمانەی لە قەڵای ئەختەماری ئازەربایجاندا خستە ژێردەست بەسەری... ئینجا دووری خستنەوە بۆ قەڵای ئیستەخری فارسی. لەم کاتەدا خوشکەکەی شا ئیسماعیلی سەفەوی بڕیاری دا بچێت بەرەو حیجاز کە تا ژیانی ماوە لەوێ بمێنێ. بەڵام کە گەیشتە دیاربەکر و بڕیاری دا لەوێوە بڕوات چووە (حیصنی کیفا)... لەوێ مەلیک خەلیل کوڕی مەلیک سلیمان کە فەرمانڕەوای (حیصنی کیفا) بوو و، لە بنەماڵەی مەلکان و لە بنەڕەتا نەچوونەوە سەر پادشایانی ئەیوبی... لەگەڵ خوشکەکەی شا ئیسماعیلدا ڕێک کەوتن و بوون بەهاوسەر... مەلیک خەلیل زەماوەندێکی زۆر گەورەی ساز کرد... کە یەکێک لە شاعیرانی کورد بەفارسی دەربارەی ئەو زەماوەندە ئەڵێت:

موزیک زەماوەند

آسمان ساخت در آفاق یکی سور چه سور؟
که از ان سور شد اطراف ممالک معمور
اجتماعیست منوّر قمري را با شمس
اتصالیست مقرب ملکی را با حور
مهد بلقیس زمان داشتة است ارزاني
بسرا پرده، جم دولت تشریف حضور

پاش ئەمە، شا ئیسماعیل، کە تەمەنی حەوت ساڵان بوو، هێنرایەوە بۆ گەیلان و لەوێ مایەوە... و دەروێشەکانی باوک و باپیری لەم ماوەیەدا هەمیشە لە خزمەتیانا بوون، وەکو لە وتاری ئایندەدا باسیان دەکەین ئێستە کاتمان تەواوبوو شەوتان باش.

## وتاری: ٤٨

گوێگرانی بەڕێزی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش! کامەرانیتان ئاواتی ئێمەی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە، ئێمە لەسەر باسی چالدێران دەڕۆین. لە وتاری پێشوودا باسی ئەوەمان کردبوو کە بنەماڵەی شاهەنشای سەفەوی لە سەرەتادا ڕابەرانی تەریقەت بوون و، بەرەگەزەش لە کوردە کرمانجە سوننییەکانی ئەرسەنجان یاخۆ سەنجانی نزیک ئەردەوێل بوون، کە هەندێ مێژوونووس بەهەڵە ئەم ناوەیان کردووە بەسنجار و وایان داوەتە قەڵەم کە فەیروز شای باپیری سەفەوی خەڵقی سنجار لای خۆرئاوای کوردستانی ئەودیو بووە نزیک بە حەلەب.

هەروا لەوەش دواین، کە شێخ جونەیدی نەوەی شا سەفی ئەردەبیلی کە ڕابەری ئاینی بوو و، دەسەلاتی جیهانیشی زۆر بوو، سولتان ئوزون حەسەنی ئاق قویونلو کە سەرۆکی پادشایی یەکی تورکمانی شیعە بوو، کردبووی بەزاوای خۆی، بۆ ئەوەی خۆی بەئەو پشت قایم بکات و خەدیجەبیگمی خوشکی دایێ، هەروا شا حەیدەری کوڕیشی کە جێی گرتەوە، دیسان سولتان ئوزون حەسەن کردی بەزاوای خۆی و عالەم شای کچی خۆیی دایێ... ئێستە ئەو دوای باسەکە...

موزیک

شێخ حەیدەری سەفەوی کەوتبووە پەرەدان بەدەسەلاتی جیهانی و، ماوەیەک لەلایەن ئوزون حەسەنەوە کرابوو بەفەرمانڕەوای هەرێمی دیاربەکر و ئەو ناوە، پاش مردنی ئوزون حەسەن گەڕایەوە ئەردەبیل و لەوێوە کەوتە هەڵمەتدانی گەیلان و شێروان... بەلام کە سولتان یەعقوبی کوڕی سولتان موراد بوو بەپادشای دەوڵەتی ئاق قویونلو بڕیاری دا دەسەلاتی شا حەیدەری سەفەوی کەم کاتەوە.... هەرکە شا حەیدەر کەوتە شالاو بۆ سەر ولاتەکانی ژێردەستی (فەڕوخ یەسار) (سولتان یەعقوب)، کەوتە یارمەتی فەڕوخ یەسار و بەرگری لێ کردنی... شا حەیدەر لەو شەڕەدا کوژرا و، سێ کوڕی هەتیوی لەپاش بەجێ ما کە بریتی بوون لە (عەلی، ئیبراهیم، ئیسماعیل)... سولتان یەعقوب ماوەیەک ئەمانەی لە قەلای ئەختەماری ئازەربایجاندا دەسبەسەر هێشتەوە ئینجا دووری خستنەوە بۆ قەلای ئیستەخری فارس لە ترسی ئەوەی دەروێش و پەیرەوانیان نەیانڕفێنن: چوار ساڵ و نیو لە قەلای ئیستەخردا دەسبەسەر بوون، کە ساڵی ٨٩٨ ڕۆستەم بەگی کوڕی مەقسوود

بەگی ئاق قـویونلو لەسـەر تەختی پادشاهی دانیشت شا عالەم خانمی ژنی شا حەیدەر و دایکی ئیسماعیل کە پووری ڕۆستەم بوو، داوای لێ کرد منداڵەکانی لە بەند ڕزگار بکا و بیانهێنێتەوە وڵات. شا ڕۆستەم دەستووری دا، هێنرانە هەرێمی لاهیجانی گەیلان، ئیسماعیل گەرچی لاو و بەتەمەن مناڵ بوو، ڕابەریی دەروێشەکانی بنەماڵەی گرتەدەست و بوو بە شێخ ئیسماعیل. ساڵی ٩٠٥ کۆچی شێخ ئیسماعیل لە تەمەنی سێزدە ساڵەدا بوو، کە بەهانەهانەی دەروێشەکانی بنەماڵەی و پەیڕەوەکانی کە لە سەرەتادا هەموو کورد و سوننی بوون بەڵام پاش ئەوە کە جونەید و، حەیدەر هەردووکیان بوون بەزاوای سوڵتان حەسەنی ئاق قویونلو، عێلە تورکمانە شیعەکانیش هەموویان بوون بەدەروێش و پەیڕەوی بنەماڵەی سەفەوی و، لەناو ئەمانەدا عێلی ئیستاجلو -لە عێلەکانی تری بایەندورلو- زۆر بەهێزتر و بەدەسەلاتتر بوون... لەمانە هێزێکی گەورەی پێک هێنا و چووە ئەرغەوانی ئاستارای کالش و، لەوێوە بەهار چووە ئەردەبیل. بەڵام لە ترسی سوڵتان حوسەین نەوەی جیهان شا نەیتوانی لەوێ گیر بێ ڕووی کردە جخور سەعد و ئالام -کە ئەم ناوە هەڵەیە و دەبێ مەبەستی ئالان بێ کە ئەڕانی ئێستەیە- و لەوێوە چووە ناو عێلی ئستاجلو...

ساڵی ٩٠٦ کۆچی ئیسماعیلی سەفەوی بەحەوت هەزار دەروێشەوە لە ڕووباری کوڕ پەڕییەوە و، لوتکەی دژی گوڵستانەوە لەگەڵ فەڕوخ یەساردا کەوتە شەڕەوە و، شکاندی و تۆڵەی باوکی لێ کردەوە و کوشتی و بەشێکی پیاوماقووڵان و سەرانی ئەو ناوەشی لەناوبرد... بەقسەی (میستەر ئەدوارد براون) (فەڕوخ یەسار) جاوانی بووە و، لەو ناوە لە هەرێمی جاباندا بووە. پاش ئەوە شێخ ئیسماعیل بەهێزێکەوە چووە شەماخی و لەوێوە خەلفا بەگی بەهێزێکەوە نارده سەر شێخ شای کوڕی شێروان شا، پاش ئەوەی وڵاتەکەی ژێردەستی داگیرکرد ڕووی کردە قەڵای باکو و ئەو ناوەشی داگیرکرد. لەم ساڵەدا بوو کە شێخ ئیسماعیل سەفەوی بەجۆرێکی ئاشکرا جاڕی دا بەناو خەڵقا کە پەیڕەویی لە ڕچی شیعەی ئیمامی دەکات. بێ گومان پەیڕەویکردنی شێخ ئیسماعیلی سەفەوی لە ڕچی شیعەیێتی سێ هۆی هەبوو:

یەکەم: ئەیەویست کەوا نیشان بدات لە بنەماڵەی ئال بەیتە و بەرگری لە ڕچی باوک و باپیرانی خۆی دەکات.

دووەم: ئەیزانی بەشی زۆری تورکەکانی وڵاتەکانی ژێردەستی قەرەقویونلو و ئاق قویونلو و ئەنەدۆڵی تورکیی، پەیڕەوی ڕچی شیعەیێتین، ئەو ئەیەویست نەوەک تەنیا بەهۆی

ڕێبەرێتی تەریقەتی سەفەوییەوە خەڵقی لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، بەڵکو ئەیەویست بەهۆی ڕچی شیعەشەوە کە لقی بۆ لە موسوڵمانەتی پتر خۆی بەخەڵق بناسێنێ.

سێیەم: ئەو دایکی و نەنکی هەردووکیان شیعەبوون هەر لە منداڵییەوە خۆشەویستیی شیعەیێتی چووبوو بەمێشکییا و، ئەیەویست پەرەی پێ بدات.

جگە لەمانەش وەکو ئەدوارد براون لە کتێبەکەیا ئەگێڕێتەوە شێخ ئیسماعیل گەنجێکی لاوچاکی ئازابوو بۆ شێخێتی دروست نەکرابوو بۆ شاییێتی دروست کرابوو، لەبەرئەوە تا ئەوپەڕی بەرزفڕی، حەزی لە بەرزێتی و دەسەڵات بوو و، تا ئاخر پلەی بزێوی و ئازایی دلێر و نەبەرد بوو. بەچاونەترسی خۆی، خۆی لە ١٣ ساڵیدا بەچەند دەسەڵاتی هاوسێ ناساندبوو،... بەڵام مەلا ئیدریس بەتلیسی ڕابەری کوردەکانی بەشی وڵاتی عوسمانی، لەبەر چەند شتێ دژی وەستابوو: یەکێ لەوانە ئەوەبوو کە مەلا ئیدریس لە سەردەمی سوڵتان یەعقوبی ئاق قویونلودا وەزیری دەربار یا وەکو دەڵێن (وەزیری کۆشکی شاهانە) بوو، بێ گومان لەوەدا کە ئەوان بەمنداڵی دوور خرابوونەوە دەستی هەبوو شێخ ئیسماعیل داوای لێ کردبوو، کە هەوڵ بدات کوردەکان بکات بەپەیڕەوی بەڵام ئەو نەوەک هەر ئەیویست کوردەکانی وڵاتی عوسمانی لە بەرزفڕیی شێخ ئیسماعیل ڕزگار بکات، بەڵکو ئەیەویست کوردەکانی ئازەربایجانیش ڕزگار بکات... جا ئەمانە هۆی کینە و ڕق بوو لە نێوانیانا کە پاشان بووە هۆی شکست خواردنی شا ئیسماعیل لە شەڕی چالدێران وەک باسی لێ دەکەین، لە وتارەکانی ئایندەدا، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/١٠/٢

٢٣ کانونی یەکەم ١٩٧٢

**وتەی: ٤٩**

گوێگرە بەڕێزەکانی ئەم بەرنامەیە، شەوتان باش.

لە وتارەکانی ترا وتمان، کە هۆی ناوبانگی چاڵدێران شەڕی چاڵدێرانی بەناوبانگە کە لە نێوانی شا ئیسماعیلی سەفەوی شای ئێران و سوڵتان سەلیم عوسمانیدا ڕووی دا... بەڵام بۆ ئەوەی پتر، چۆن ڕوودانی ئەم شەڕە ڕوون بکەینەوە، لە سەرەتادا باسمان لە ژیانی بنەماڵەی سەفەوی کرد، وئنجا تۆزێ لە سەرگوزەشتی شا ئیسماعیل دواین و، لەم وتارەشدا هەر لەسەر ئەو باسە دەڕۆین... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

شێخ ئیسماعیلی سەفەوی کە ڕابەری تەریقەتی سەفەوی بوو و، خۆی دانا بەپەیڕەوی ڕچی شیعەییتی، ساڵی ٩٠٧ پاش ئەوەی کە شێروان و باکۆ و گەیلان و تەورێزی داگیرکرد، شاری تەورێزی کردە پایتەختی شایی خۆی و، بەجۆرێکی ڕەسمی تاجی پادشایی لەسەر نا... پاش ئەمە کەوتە تەنینەوە و پەرەدان بەوڵاتەکەی، ساڵی ٩٠٨ بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە ڕیشەی بنەماڵەی ئاق قویونلو لەبن دەربهێنێ... بەم نیازەوە ئامادەی شاڵاو بوو بۆ سەر دوو عێراقی عەجەم و عێراقی عەرەب و، لە هەمەدان لەگەڵ سوڵتان مورادی کوڕی سوڵتان یەعقوبی ئاق قویونلودا کەوتە شەڕەوە و، بەسەریا زاڵ بوو... سوڵتان موراد لەشکری خۆی کێشایەوە بەرەو شیراز... بەڵام شا ئیسماعیل لێی نەگەڕا ڕاوی نا و دوای کەوت و ساڵی ٩٠٩ شیرازیشی داگیرکرد و بەم جۆرە شارەکانی عێراقی عەجەمی و، فارسی و، کرمان، هەموو کەوتە ژێردەستی سەفەوی و، شا نوێنەرانی خۆیی تیایانا بەجێ هێشت. سوڵتان مورادی ئاق قویونلو کە شکستی خواردبوو، بەسپاوە هەڵات بەرەو بەغدا ئنجا شا ئیسماعیل گەڕایەوە بۆ سەر ئەوانەی کە لە ناوەوەی سنووری وڵاتا هێشتا تەواو گەردنیان نەچەماندبووە و، سەریان شۆڕ نەکردبوو. تەنانەت لە هەرێمی گەیلان و دەماوەنددا ئەوانەی هەموو سەر شۆڕکرد و، ئنجا کەوتە قەڵاچۆی: بەر شیر نەکەوتووانی ئاق قویونلو و، گەیلان، تەنانەت ئەوانەی کە لە کوشتنی شێخ حەیدەری باوکیدا لە سپای سوڵتان یەعقوب و فەڕوخ یەساردا بوون... ساڵی ٩١١ لە سەردەمی هاویندا، شا ئیسماعیل ڕۆژانی خۆی بەکەیف و خۆشی لە هەمەدان ڕابوارد... ئنجا ڕووی کردە (تەخت سلێمان)... و ساڵانی ٩١٢ و ٩١٣، خوراسانیش کەوتە ژێردەستی

بنەماڵەی سەفەوی... ئنجا شا ئیسماعیل فەرمانڕەوایی بچووکی ذوالقەدری گرتە پێش چاو، کە بەشێکی ئێستەی وڵاتی تورکیای بەدەستەوە بوو... لە قەیسەرییە شاڵاوی بردە سەری و شکاندی، وڵاتەکەی داگیرکرد. پەیڕەوانی شا ئیسماعیل بەقزڵباش ئەناسران، لەم سەردەمەدا، کوردەکانی وڵاتی تورکیای ئێستەش هەموویان سەر بەئاق قویونلو بوون و، ئەمیر بەگ موسلو کە لەلایەن عەلائولدەولەوە فەرمانڕەوای دیاربەکر بوو و لەسەر ڕچی شیعە بوو، زۆر گورج خۆی دایە پاڵ شا ئیسماعیل و لەوە مەبەستی ئەوەبوو کە هەر لەسەر ئەو پایەیە بمێنێتەوە... بەڵام شا ئیسماعیل ئەوی بەعێڵانی سەربەخۆیەوە هێنایە پاڵ خۆی و پیر محەممەد خان استاجلوی کردە فەرمانڕەوای دیاربەکر... ئنجا شا ئیسماعیل خۆی ئامادە کرد بۆ داگیرکردنی عێراقی عەرەب، تەنانەت چاوی لە بەغدا و هەرێمەکانی لای باشووری بوو، کە بارەگا پیرۆزەکانی پێشەوایانی موسوڵمانەتی، تەنانەت پێشەوایانی ڕچی شیعەی تیابوو. ئەوەشمان لە بەرا وت کە سوڵتان مورادی ئاق قویونلو، گەڕابووەوە و بەغدای کردبووە پایتەخت... جا شا ئیسماعیل لەگەڵ پیاوماقووڵانی شیعەی عەرەبدا ناوی گۆڕییەوە و، ڕووی کردە عێراق... (باریک بیگ پەرناک)ی فەرمانڕەوای بەغدا بەنوێنەرێتیی سوڵتان مورادی ئاق قویونلو بەم کارە نهێنییانەی زانی، لەبەر ئەوە گالی دا سەید محەممەد کەمونەی ڕابەری شیعەی عەرەب کە سەرۆکی سەیدەکان و، سەرپەرشتیی بارەگا پیرۆزەکانیشی بەدەستەوە بوو، لە نەجەف لەژێر زەوییا زیندانی کرد... بەڵام کە سپای شا ئیسماعیل گەیشتە عێراق، خەڵقی بەغدا و دەوروبەری ئەوەندە لە دەسەڵاتی ئاق قویونلو بەتەنگ هاتبوون هیچ جۆرە بەرەنگارییەکیان نیشان نەدا، باریک بەگ پەرناک سوڵتان مورادی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و، بەرەو وڵاتی ڕۆم واتا تورکیای ئێستا هەڵاتن، شا ئیسماعیل خادیم بەگی ئەمیر دیوانی کرد بەفەرمانڕەوای بەغدا و دەوروبەری و خۆیشی کەوتە دیدەنی بارەگا و جێ پیرۆزەکان. پاش ئەم سەرکەوتنە کە بێ شەڕبوو خادیم بەگ کەوتە قەڵاچۆی ئەوانەی نیازی بەربەرەکانییان هەبووە و، بەم جۆرە زۆر کەس لەناوبرا... لە هەمان کاتا شا ئیسماعیل فەرمانی دا بەئاوەدانکردنەوە و، لە ژێرگرتنی ئەو گومەز و بارەگایانەی، پێشەوایانی ئاینی موسوڵمانەتی، کە هەموو موسوڵمانەکان بەرێزەوە سەرنجیان ئەدەن بەڵام شیعە بەتایبەتی بەهی خۆیانیان ئەزانن، لە هەمان کاتا زۆر بارەگا و جێی پیرۆزی تریش وێران بووبوون، هەروا کەمونەش لە زیندان ڕزگار کرا و، پایەیێکی بەرزی درایێ.

ئنجا شا ئیسماعیل بەغدای بەجێ هێشت و بەسەر شوشتەر و حەوێزە و کوە گیلویەدا

گەڕایەوە بەرەو شیراز. لەم ناوە بنەماڵەی ئال موشەعشەع هەبوون، کە حەزرەتی عەلییان بەخوا ئەدایە قەڵەم. شا ئیسماعیل گەرچی خۆی بەپارێزەری ڕچی شیعەیەتی دائەنا، بەڵام لەگەڵ ئەمانە کەوتە ئەبەرد و هەموویانی قەڵاچۆ کرد. ئنجا لەگەڵ شا ڕۆستەمی فەرمانڕەوای لوڕستانا نامەی گۆڕییەوە و، لە سەرەتادا کەوتنە شەڕەوە، بەڵام پاشان شا ڕۆستەمی لوڕستان، بەو هۆیەوە کە شا ئیسماعیل ڕابەری ڕچی شیعەیەتی بوو و، بەو ناوەوە نامەی لێ ئەنووسی، سەری بۆ شۆڕ کرد و هاتە لای... شا ئیسماعیل فەرمانی دا ڕیشە درێژە جوانەکەی شا ڕۆستەمیان، تەڵ تەڵ، بەمرواری و یاقوت و فیرۆزە و جۆرە گەوهەری تری ڕازاندەوە و، دۆستایەتیەکی بەهێزیان لەگەڵ یەک بەست و لەوێوە چوو بەرەو شیراز ئنجا گەڕایەوە بەرەو تەورێزی پایتەخت... لەم سەردەمەدا شیعەیەتی لەناو تورکەکانی وڵاتی ڕۆمدا پەرەی سەندبوو... تا ڕادەیەک کە یەکێ لە پەیڕەوانی شا لە قزڵباشەکان بەناوی چاشان قولی لەگەڵ حەسەن شا قولی کوڕی، خۆیان کرد بەناو ئەو شیعەیانەدا و، لەوێ شۆڕشێکی شیعەییتییان هەڵگیرساند، سوڵتان بایەزید زۆر بەسەختی ئەم شۆڕشەی کوژاندەوە. بەپێی نووسینی (عەلی ئەبولفەضل)ی کوڕی مەولانا ئیدریسی بەتلیسی، چل هەزار کەسێکیان لێ کوژرا و، ئەو دواشیان نێوچاوانیان داغ کرا، کە بناسرێن و، لەم بارەوە سوڵتان بایەزید لەگەڵ شا ئیسماعیلدا زۆر نامەی گۆڕییەوە، کە واز لە پەنجە تێوەژەنن بهێنێ، بەڵام شا ئیسماعیل لەوە بەرزەفڕتر بوو...
سەلیم کوڕی سوڵتان بایەزید کە ئەم شڵەژانەی وڵاتی دی، ساڵی ٩١٨ کۆچی، لەگەڵ فەرماندە و پیاوماقووڵانا وتووێژی کرد و، باوکی لە تەختی سوڵتانی هێنایە خوارەوە و، خۆی لە جێی دانیشت. سوڵتان سەلیمیش کە بە یاوز سوڵتان سەلیم بەناوبانگە، واتا خوێنڕێژ و دڵڕەق وەک شا ئیسماعیل بەرزەفڕ بوو. لە سەرەتادا مەلا ئیدریسی بەتلیسی کرد بەدۆستی خۆی، کە بەناوبانگترین مەلای کوردبوو و، هەموو فەرمانڕەوایانی کورد و، سەرداران و سەرەک عێلان بەقسەیان دەکرد و سەریان بۆ دەچەماندەوە و، لەو حەلەدا زۆر لە سەردار عێلە گەورەکان، سەربەخۆ هەرێم و ناوچەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد و، سەڵتەنەتی ئاق قویونلو تەنیا بەناوە خاوەن دەسەڵات بوون. جا مەلا ئیدریسی بەتلیسی هەوڵی ئەدا ئەم سەردار عێلانە و فەرمانڕەوایانەی کوردی هەموو کرد بەدۆستی سوڵتان سەلیم بەو مەرجەی لە هەرێمی خۆیانا بەسەربەخۆیی بمێننەوە، بەڵام پاشان چی ڕووی دا؟ لە وتارەکانی داهاتوودا قسەی لێ دەکەین ئێستا بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١١/ ١٣٥١/١٠، ١ جەنوەری ١٩٧٣، ١١ ڕێبەندان ٢٦٧٣

**وتاری: ٥٠**

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش! کامەرانیـتان ئاواتی ئێمەیە و، جارێکی تری ئەیخەینەوە یادتان کە ئەم بەرنامەیەی ئێمە گەرچی جوگرافییە و، تەنیا بۆ ئەوەیە کە باشتر شار و دێیەکانی وڵات بەخەڵق بناسێنین... بەڵام جارجارە، ئەچینە ناو باسی مێژووییەوە... ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کە لەم بارەوە سەدەیان کتێبی فارسی و عەرەبی و تورکی و زمانی تری نووسراوە، وەک (موعجیم البولدان)، (مەراصید الاطلاع) بەعەرەبی و، فەرهەنگی ڕەزم ئارا کە تەنیا دەربارەی جێگەکانن... وەیا قاموس الئەعلام و، دائیرەت المەعاریفەکان و، فەرهەنگی دیهخودا و هی تری کە هەم دەربارەی جێیان و هەم دەربارەی کەسان نەدوێن... ئەم جۆرە کتێبانە کە ناوی دێیەک، یا شارێ یا ناوچەیەک ئەبەن، دوور و درێژ لەسەر بەسەرهاتی مێژوویی ئەو جێگەیە ئەڕۆن... بێ ئاوڕدانەوە بەلای ئەوەدا ئەو باسە مێژووییە ئاینی بێ، ڕامیاری بێ، دەربارەی گەلانی جیاجیا بێ،... جا ئێمەش کە جارجارە لەسەر باسێکی مێژوویی ئەڕۆین، هەر ئەمە هۆیەتی کە پەیڕەوی لەو ڕچە دەکەین با لە بیرمانیش نەچێ کە ئێمە هێشتا لەسەر باسی چاڵدێران دەڕۆین و، جارێ با گوێ بدەینە موسیقایەک.

موزیک

گوێگرانی خۆشەویست، لە وتارەکانی پێشوودا وتمان ناوی چاڵدێران بۆیە زۆر بیستراوە چونکە پەیوەندی بەشەڕی عوسمانی و سەفەوییەوە هەبووە. سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی و شا ئیسماعیلی یەکەمی سەفەوی، هەردووکیان پیاوانی دوور ئەندێش و بەرزەفڕ بوون و، هەردوولایان ئەیانەویست وڵاتەکەیان پەرە پێ بدەن. شا ئیسماعیل کە لە چەند شەڕی گەورەدا سەرکەوتبوو و، سنووری وڵاتی لە باکورەوە گەیاندبووە باکو و لە خۆرهەڵاتەوە بە خوراسان و لای خوارەوە بە بەغدا و، ئەیەویست لای خۆرئاوا و باکوری خۆرئاواشەوە، بتەنێتەوە بەڵام لای باکوری خۆرئاوایەوە، دەوڵەتی ذوالقەدرییە هەبوو کە سەر بەعوسمانییەکان بوون و لای خۆرئاواش دەوڵەتی عوسمانی بوو... شا ئیسماعیل گەرچی لە کاتی تاج لەسەرنانیدا، مەلیک خەلیلی حیصن کیفا و چەند سەرداری تری کوردی لە تەورێزدا خستبووە زیندان، بەڵام لە ساڵانی ٩١٨ و ٩١٩دا کە ئەیویست بەرەنگاری دەوڵەتی عوسمانی ببێ، خۆی بەناچار دەزانی کوردەکان ڕابکێشی بەلای

خـۆیا... لەو حـەلەدا، مـەلا ئیـدریسی بەتلیـسی گـەورەترین زانای ئاینیی کـورد و، بەناوبانگترین پیاوی ئەو ناوە بوو، لە گەنجییـا لە ئێران خوێندبووی، پاشان لە دەورەی دوو دەوڵەتی (قەرەقویونلو) و (ئاق قویونلو)دا هەم سەرۆکی گشتیی موفتییە ئاینییەکان بوو و، هەم ماوەیەک وەزیری دەرباری سوڵتان یەعقوبی ئاق قویونلو بووبوو، کە باپیری دایکیی شا ئیسماعیل بوو لەگەڵ بنەماڵەی سەفەوی شا بەبنەماڵە دۆست بوو، جا شا ئیسماعیل نامەیەکی بۆ نووسی و داوای ئەوەی لێ کردبێتە سەرلێدانی... بەڵام مەلا ئیدریس بەم پارچە هەڵبەستە وەڵامی دایەوە:

مرا میـدان! أباً عن جد غلام خـاندان خود
کـه جـدم خادم جدت، براه قدس چاکرشد
ز تلمـیـذان جـد ثانی شـاه است والدهم
کـه علم ظاهر ازوی دید، وباطن زو منورشد
طریق بندگـیی خـامی من باشـاه حـیـدر
ز حسن اختلاط بنده، همچون شیر و شکرشد
ز حسن اتفاق است، این کەدر آیات قرآنی
بهرجا نام (اسماعیل) بەتام بنده همبرشد

لەم پارچە هەڵبەستە بۆمان دەردەکەوێ، کە باپیری مەلا ئیدریسیش لەگەڵ شێخ جونەیدا بووە لە ڕۆیشتنیا بۆ سوریا و فەلەستین... هەروا بۆمان دەرئەکەوێ کە مەلا ئیدریس تا چ ڕادەیەک خۆی بەخاوەن دەسەلات و مەزن داوەتە قەڵەم و، شانازی بەخۆیەوە کردووە... لێرەدا شتێکم دێ بەبیرا... مامۆستا مەلا محەمەدی مەردۆخیی سنەیی کە بەنازناوی ئایەتوڵڵا مەردوخ بەناوبانگە... شتێکی هەیە لەم هەڵبەستانە دەچێ. ئەو لەپاڵ ئەو کتێبە مێژووییەیا کە دەربارەی کورد بەفارسی نووسیویە، دوو هەڵبەستی جوانی شاعیرێکی کوردی فارسی وێژی لەژێر وێنەکەی شاهەنشا ئاریا میهری پەهلەوی و، خۆیدا تۆمار کردووە کە بەم جۆرەیە:

اگر دل زیاد تو غافل نشیند
خـدنگ بلا بردل دل نشـیند
بنازم ببـزم محبت کـه آنجـا
گدائی بەشاهی مقابل نشیند

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان... سوڵتان سەلیمی عوسمانی بەر لە شا ئیسماعیل

کەوتە خۆ ئامادەکردن، لەلایەکەوە بەهۆی مەلا ئیدریسی بەتلیسییەوە بەدرۆ و دەلەسە هەموو سەرداره کوردەکانی هەڵخەڵەتاند و، فەرمان و ئالا و شنل و پارەی بۆ ناردن و، شانزه فەرمانڕەوایی لێ دروست کردن... و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ پادشای ئۆزبەگدا نامەی گۆڕییەوە و، پەیمانی لەگەڵ بەست... جگە لەمانە ناردی لە ئەوروپا چەکێکی زۆری ئاگرینی کڕی، وەک تۆپی باروتدار و مەنجەنیق و شتی تری کە شا ئیسماعیل ئەمانەی نەبوو... و لە ساڵی ۹۲۰ی کۆچیدا کەوتە شالاو بۆ سەر سنووری ئێران... لە سەرەتادا ناوچە کوردەکانی داگیرکرد، وەکو هەرێمەکانی بتلیس، دیاربەکر، وان، حەکاری و، جزیر و بۆتان... ئنجا ڕووی کردە هەرێمی تەورێزی پایتەختی ئێرانی ئەو حەلە... و شەڕێکی یەکجار سەخت لە نێوانی دەوڵەتی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی ڕووی دا...

جارێ با لێرەدا ڕەخنەیەک لە کتێبی (دائیرەت المەعاریفی فارسی غولام موصاحب) بگرم، کە بەهەڵە ساڵی شالاوی سوڵتانی عوسمانی و شەڕی چاڵدێرانی بە ۲ی ڕەجەبی ساڵی ۹۲۵ هجری قەمەری داوەتە قەڵەم...

پالافتەی باس، مێژوونووسانی ئێرانی و مێژوونووسانی عوسمانی هەریەکەیان بەجۆرێ باسی شەڕی چاڵدێران دەکات و بەشەڕی چاڵدێراندا هەڵ ئەڵێ... و هەریەکەیان ژمارەی کوشتاری ئەولا باس ئەکەن... بەڵام هەموو مێژوونووسەکان لەسەر ئەوەن سوڵتانی عوسمانی تەورێزی پایتەختی سەفەوی داگیرکرد بەڵام شا ئیسماعیل کشایەوە بەرەو هەمەدان و پاش ماوەیەک پایتەختی خۆی وەرگرتەوە... جا ئەم شەڕە سەختە چونکە لە دەشتی چاڵدێراندا ڕووی دا و تا ئەمڕۆکە ئەم ناوە لە مێژووەکانا هەر ماوە، ئەمە وەها...

ئەمڕۆکە چاڵدێران ناوی یەکێکە لە دێهستانەکانی بەخشی سیاچەشمەی سەر بەشارستانی ماکو، ٨٤ دێی تێدایە و سەرژمێری خەڵقەکەی ١٣،٢٤٠ کەسێکە، شارۆلکەی سیاچەشمە ناوچەی بەخشەکەیە. دەسکەوتی خەڵق، بەرهەمی کشتوکاڵە... مێگە و ڕان و ئاژەڵی تریشیان زۆرە، ئاوی دێیەکان هی ڕووبارەکانی قزلچای و چاڵدێران و چەشمەساری و هەندێ کارێزە. بەشێ زۆری دانیشتوانی چاڵدێران کورد و لەسەر ڕچی ئاینی ئیسلام و سوننین و، هەندێکیش تورک لەسەر ڕچی شیعەی ئیسلامن... کردی دەستیان مافوور و بەڕە و جاجم و شتی ترە، لەو ناوە هەنگوینیش زۆر بەدەست ئەهێنرێ و، باشترین پەنیریش هەیە.

گوێگرانی بەڕێز لێرەدا وتارەکەمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/١٠/١٦

**وتاری: ٥١**

گوێگره خۆشه‌ویسته‌كانی به‌رنامه‌ی وڵاته‌كه‌ت باشتر بناسه شه‌وتان باش!

كامه‌رانیتان ئاواتی به‌ڕێوه‌به‌رانی به‌رنامه كوردییه‌كانی ڕادیۆی ئێرانه. ئێمه ئه‌مشه‌و باسی (چه‌هار مه‌حاڵی به‌ختیاری)تان بۆ ده‌كه‌ین... كه ناوه بۆ فه‌رمانداریێكی گشتی. و ده‌بێ له سه‌ره‌تادا بۆتان ڕوون بكه‌ینه‌وه كه له كیشوه‌ری شاهه‌نشای ئێراندا جۆری ڕێكخراویی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تییه‌كان، وه‌كو هی وڵاتگه‌لی تری خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست نییه كه كورد زمانیان تیایه. بۆ وێنه: لێره دوو جۆره فه‌رمانداری هه‌یه، كه له كوردستانی عێراق و سوریه، پێی ئه‌وترێ (قه‌زا). جۆری یه‌كه‌م هه‌ر ئه‌و فه‌رمانداریه ئاساییه كه سه‌ر به‌ئوستانه كه له كوردستانی ئه‌ودیو پێی ئه‌وترێ (موحافه‌زه). و جۆری دووه‌م فه‌رمانداریی گشتییه، كه له فه‌رمانداری ئاسایی گه‌وره‌تره له پایه‌دا و، له ئوستان بچووكتره و، چه‌ند فه‌رمانداریه‌كی ئاسایی پێوه به‌ستراوه... هه‌ندێ له‌و فه‌رمانداریه گشتیانه، چوار پێنج فه‌رمانداریی هه‌یه كه لێره پێی ئه‌وترێ (شارستان) و، هه‌ندێكیان كه‌متر. ئه‌م فه‌رمانداریه گشتیانه، به‌ستراون به‌وه‌زاره‌تی ناوه‌وه‌ی وڵاته‌وه، كه پێی ئه‌وترێ وه‌زاره‌تی كیشوه‌ر... جارێ با گوێ بده‌ینه ئاهه‌نگێكی مۆسیقا...

مۆزیک

چهار مه‌حاڵی به‌ختیاری، نیشته‌جێی تیره و لقه‌كانی عێلی به‌ختیارییه، له سه‌رده‌می فه‌رمانڕه‌وایی ئه‌تابه‌گیی لوڕستانی گه‌وره‌دا، ده‌ورانی زێڕینی پێشكه‌وتووداری دیوه. پاش ئه‌وه، به‌هۆی ئه‌وه‌وه كه عێلاتی به‌ختیاری به‌ئاژه‌ڵ به‌خێوكردنه‌وه خه‌ریک بوون، هه‌رێمه‌كه به‌نه‌خوێنده‌واری و پاشكه‌وتوویی ماوه‌ته‌وه... ته‌نانه‌ت له ڕووی كشتوكاڵ و شوێنه‌واری شارستانییه‌وه و، له ده‌ورانی قاجاردا به‌ستراوه به‌ئوستانی ئه‌سفه‌هانه‌وه و، تا ده‌ورانی شاهه‌نشایی په‌هله‌ویش هه‌ر سه‌ر به‌ئه‌سفه‌هان بوو و، پێی ئه‌وترا (مه‌حال ئه‌ربه‌عه) واتا چوار ناوچه، چونكه برێتی بوو له چوار به‌خش به‌ڵام له‌م ساڵانه‌ی دواییه‌دا له ئوستانی ئه‌سفه‌هان جیا كرایه‌وه و كرا به‌فه‌رمانداریی گشتی و ڕاسته‌وخۆ به‌سترا به‌وه‌زاره‌تی كیشوه‌ره‌وه و پله‌ی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تیی به‌رزكرایه‌وه.

سنووری چوار مه‌حالی به‌ختیاری به‌م جۆره‌یه: لای خۆرهه‌ڵاتی و باكوری خۆرهه‌ڵاتیی،

سنووری ئوستانی ئەسفەهانە، لای باشووری سنووری فەرمانداریی گشتیی بۆیر ئەحمەدی و، سەردەسێر و شارستانی سمیرەمە و، لای خۆرئاوای باکوریش شارستانی ئیزەی سەر بەخوزستانە...

پێوانەی پانوپۆریی سەرزەوینی ئەم فەرمانداریيە ۱۵۷۳۱ کیلۆمەتری چوارگۆشەییە و، ژمارەی دانیشتوانیشی بەپێی سەرژمێریی ساڵی ۱۳٤٥ی فارسی ۲۹۹۰٥۷ کەسە.

ناوەندی ئەم فەرمانداریيە، شارۆلکەی شار کوردە و، هەروەک ڕوونی ئەکەینەوە دوو فەرمانداریی ئاسایی پێوە بەستراوە، کە پێیان ئەوترێ شارستان.

یەکەم شارستان، لە خود (شەهر کورد) دایە و، ئەم بەخش و ناوچانەی هەیە: ۱- دەوروبەری. ۲- شوراو. ۳- میزدەج کە پێی ئەوترێ (جونقان). ٤- کەیار.

دووەم شارستانی (بروجن)ە، کە چوار بەشی هەیە کە ئەمانەن: ۱- دەوروبەری بروجن. ۲- گەندمان. ۳- لەردەکان. ٤- ئەردەل...

دانیشتوانی شارۆلکە و دێهاتەکانی ئەم هەرێمە، لە عێلی بەختیارین و ئەگەر لەبیرتان مابێ، لە باسی وشەی بەختیاریدا دووردرێژ دەربارەی ئەم عێلە دوابووین و، ڕوونمان کردبووەوە کە ئەمانە لە سەرەتادا لە جزیر و بۆتانەوە هاتوون و، لایان دایە کە بوخت و بوژن دوو برابوون و ڕەگەزەی کوردیان هێناوەتە دی، بەڵام لە سەردەمی سەلجووقی و مەغۆلدا لەتاو ستەمی فەرمانڕەوایانی ئەو ناوە، کۆچیان کردۆتە ئەم وڵاتە چیاییيە سەختە و ئەمڕۆکە بەختیاری یازدە لقی گەورەن کە لەژێر دوو ناوی حەوت لنگ و چوار لنگدا کۆئەبنەوە...

**هەرێمی چهار مەحال**، وەک ئەو دوای خاکی بەختیاری لە سەردەمی ئەتابەگیی لوڕستانی گەورەدا، لە ڕووی خوێندەواری و ئابوورییەوە زۆر پێشکەوتووبوون. بەپێی وتەی (ئیبن بەتوتە)ی جیهانگەردی بەناوبانگی ئەندەلوسی، کە بە لوڕستاندا تێپەڕیوە، لەگەڵ عێلاتی کۆچەری خاوەن مەڕوماڵاتا ٤٦٢ قوتابخانەی کۆچەر هەبووە و، خەڵقەکە خێوی ئاژەڵ و ماڵاتی زۆربوون.

پاش لەنێوچوونی فەرمانڕەوایی لوڕستان، لە دەورانی قاجاریدا کەمتر گوێ دراوە بەوەی خەڵقی هەرێمەکە چۆن ژیان بەسەر ئەبەن و ئەوانیش لەبەرئەوەی کە کۆچەر بوون، بەنەخوێندەواری و دووری لە شارستانێتی ماونەوە. تا ڕادەیەک کە زۆر لە خاکەکە هەر بەوێرانی و چۆڵی ماوەتەوە، بەپێی کتێبی (دائیرەت المەعاریف)ی غولام حوسێنی

موساحیب لە دەورانی قاجاردا یەکێک لە خەڵقی هەرێمەکە بەناوی (حاجی محەمە ڕەزا خان) کەوتۆتە بیری ئەوەی هەرێمەکە ئاوەدان بکاتەوە، جا بەخشی (میزدەوج)ی گرتۆتە بەرچاو کە جێیەکی بژوێن و پڕ لە پیت و بڕشتە، لەوێ زۆر لەتیرە و لقەکانی عێلی بەختیاری نیشتەجێ کردووە و، هانی داون بۆ کشتوکاڵ. هەروا لە شارۆلکە و ناواییەکانا: گەرماو و، مزگەوت و، ئاشی ئاو و، دژ و قەڵا و نیشانەی ئاوەدانیتیی دامەزراند و، ٢٠٠ سوارێکی مووچەخۆری بۆ پاراستنی هەرێمەکە لە دز و جەردە، ڕاگرت و ئاوەدانیی بەوناوەدا بڵاوکردەوە... پاش خۆی خان بابا خان ئەم ئەرکەی گرتە سەر شان و، لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا، چەهار مەحال ڕەونەقی وەرگرت، عێلات و تیرەکان نیشتەجێ کران و شوێنەواری شارستانیتی بڵاوکرایەوە... و پاشان ناوی (مەحال ئەربەعە) گۆڕا بە (چهار مەحال) و، کرا بەفەرمانداریی گشتی و لە ئوستانی ئەسەفەهان جیا کرایەوە و، پاش شەشی بەهمەنی ساڵی ١٣٤١ ئیتر لەو ناوەدا گەشە درا بەکاروباری مرۆڤانەی زۆر گرنگ، تەنانەت سپای زانستی و، سپای باودان بەکشتوکاڵ و، سپای ساغ ژیان نێرران بۆ دێکان و خەڵقەکە هان دران بۆ فێربوونی ژیانی مرۆڤانەی نوێ... ئەمڕۆکە لە بەشی زۆری دێیەکانا قوتابخانە هەیە و، کاروباری کشتوکاڵ ڕەونەقی سەندووە و، دەرمانگا و داروخانە و، کارگەی بچووکی پیشەیی تیایە. دەسکەوتی خەڵقی وڵاتەکە، بەرهەمی ئاژەڵی و کشتوکاڵییە، کردی دەستیان، بەڕە، مافوور، جاجم و، شتی چنراوی ترە...

ئەوەی لە هەرێمەکەوە ئەینێرنە شاران بۆ فرۆشتن ڕۆن و پەنیر و، پێستە و، خوری و، هەموو جۆرە ئاژەڵێکە لەم هەرێمەدا، هەستیار و هونەرانی بەناوبانگ هەڵکەوتوون بەڵام ئێمە بەداخەوە شوێنەواری کوردی و شێوەی لوڕیی ئەوانمان چنگ نەکەوتووە... ئەمڕۆکە پڕمانی بەختیاری بەزمانی فارسی هەستیارێکی مەزن و، نووسەرێکی زەبەردەستی بەناوبانگە و ئەوە کاتمان تەواوبوو، تا بەرنامەیەکی تری سەڵاوی گەرم و چەپکە گوڵی ڕێزلێنان بۆ ئێوەی خۆشەویست.

شەوتان باش

١٣٥١/١٠/٢٦

**وتاری: ٥٢**

# چنگنی

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی (وڵاتەکەت باشتر بناسە) چەپکە گوڵی ڕێز و سەڵاوی ئێمەتان لێ بێ. هۆی شانازیی بەرنامەگەلی کوردیی ڕادیۆ ئێرانە، کە گوێگرانی بە بەهەست و هوشیار و زانا، شەوانە، ڕۆژانە، خەو و حەسانەوەی خۆیان ئەبەخشن بەم بەرنامەیە و، بەوردی گوێی ئەدەنێ و، هەندێکیانیش لەسەر شریت و نەوار تۆماری دەکەن، پاشان بۆ ئەوەی پتر سوودی لێ وەربگرن، ئەینووسنەوە و، ڕەخنەی سازەندەی خۆیان بۆ ئێمە دەنێرن. ئەمە وەها و باپێتان ڕابگەیێنین کە ئێمە ئەمشەو باسی (چنگنی) دەکەین بۆ ئەوەی مێژووی بەسەرهاتیان نەکەوێتە لاپەڕەی فەرامۆشی بەڵام با لە سەرەتادا پارچە ئاهەنگێکی مۆسیقا جوانتان پێشکەش بکەین...

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! چنگنی، یا چگنی، یاخۆ چگێنی، ناوە بوو چەند جێیەک لە کوردستانی ئەودیو سنوور و ئەمدیو سنوورا.

یەکەم: دێیەکە لە ناوچەی سەنجابیدا کە سەر بەئوستانی کرماشانە و ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی کۆزەرانەوە، کە هەرێمێکی پێ دەشت و سەردەسێرە و، خەڵقەکەی کوردن و فارسیش ئەزانن و، بەکشتوکاڵەوە خەریکن و، ئاژەڵدارن.

دووەم: دێیەکە لە دێهستانی گاوبازەی سەر بەشارستانی بیجاری سەر بەئوستانی کوردستان و، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای پیرتاجەوە کە دەبێ ئێرە نیشتەجێی بنەڕەتی ئەم عێلە بووبێ، وەکو پاشان ڕوون ئەبێتەوە.

سێیەم: یەکێکە لە دێیەکانی بەخشی چگنی سەر بەشارستان و فەرمانداریی گشتیی خوڕەم ئاوای لوڕستان.

چوارەم: ناوچەیەکە لە دەوروبەری قوچانی سەر بەئوستانی خوراسان...

ناوی ئەم چوار جێی باسمان کردن هەمووو لەوێوە هاتووە کە عێلی چنگنییان تییا بووە و، تیا ژیاوە... ڕەنگە ناوی چنگنی خۆیشی لەوێوە هاتبێ کە ئەم عێلە زۆر پڕ نەوبەچنگ

و نازا بووبن. ئەم عێلە گەرچی لە زۆر دەمێکەوە بوون، بەڵام چونکە کۆچەر بوون، ناویان
نەچۆتە مێژووەوە... تەنانەت لە سەردەمی سەفەویدا، لەبەر ئاژاوەی شەڕوشۆڕی خۆرهەڵات
و خۆرئاوای ئێران، بەملاو ئەولادا نێرراون .

ئەسکەندەر مونشیی دانەری (عالەم ئارای عەبباسی) و ئەمیر شەرەفخانی نووسەری
(شەرەفنامە) وایان داوەتە قەڵەم کە ئەم عێلی چنگنییە و عێلی سیامەنسوور و عێلی
زەنگەنە، سێ عێلی گەورە بوون لە عێلە کوردەکانی ئێران و، شێوەی زمانیان گۆرانییە با
ئەوەش بڵێین کە گۆرانی بەهەڵە براوە بەسەر هەورامیدا خەڵقی هەورامان بەشێکن لەو
کوردانەی کە بەزمانی گۆرانیی ئەودێن. عێلی چنگن لە هەرێمەکانی ئازەربایجان و
عێراقی عەجەمیدا زۆر بەدەسەڵات بوون، بەڵام کۆچەر بوون و جێگەیەکی تایبەتییان بۆ
خۆیان تەرخان نەکردووە و، ئەوەندە سەرشۆڕی دەسەڵاتی ئەو سەردەمانە بوون کە کارێ
ئەنجام بدەن، یا فەرمانێ ڕاپەڕێنن ناویان بخاتە ڕیزی سەردار و فەرمانڕەواکانی سەر
بەدەوڵەتەوە، تا ڕادەیەک کە ئەمیر شەرەفخان ئەڵێت: لە سەردەمی ئێمەدا عێلی چنگنی
پیاوانی دلێر و ماقووڵ و مەزنیان، هەموو لەنێو چووبوون...

ساڵی ٩٥٥ کۆچی شا تەهماسپی سەفەوی پاراستنی قەڵای وان و دەوروبەری سپارد بە
عەلی سوڵتان چنگنی کە بتوانێ بەرامبەر بەدەوڵەتی عوسمانی بووەستێ و ئەو ناوە
بپارێزێ و، بیروباوەڕەکەشی بەڕاست دەرچوو، کاتێ کە سوڵتان سلێمانی قانونی شاڵاوی
هێنا بۆ سەر ئەو هەرێمە، نەیتوانی قەڵای وان داگیر بکات، عەلی سوڵتان زۆر بەجەختەوە
توانی بەرگری لە وڵاتەکە بکات و، لەو شەڕانەدا کە بەرامبەر بەهێزی عوسمانی کردی،
زۆر چاک سەرکەوت.

گوایە پاش ئەم سەردەمە، هەندێ تیرەی عێلی چنگنی لە هەرێمەکانی ئازەربایجان و
کوردستان و عێراقی عەجەمدا دەسیان داوەتە ئاژاوەنانەوە و، ڕێ بڕی و، تاڵان و بڕۆی
کاروان و، ڕووتکردنەوەی بازرگانان... خەڵقی لە زەبروزەنگیان بێزاربوون و کەوتنە
سکاڵاوە دادیان بردۆتە بەر شا تەهماسپ ئەوانیش فەرمانیان داوە بەفەرمانڕەواکانی ئەو
هەرێمانە کە هەریەکەیان لای خۆیەوە هێز بۆ دامرکاندن و سەرشۆڕکردنیان بنێرن و،
شەڕێکی زۆر لە نێوانی ئەوان و، هێزگەلی ئەو سێ هەرێمەدا ئەقەومێ و، ئەوان کە کۆچەر
ئەبن، بڕیار لەسەر ئەوە ئەدەن، کە وڵاتەکە بەجێ بهێڵن و، لەبەرئەوەی کە دەوڵەتی
عوسمانی دوژمنیان دەبێ، پەنای پێ نابەن و، بڕیار ئەدەن بەسەر خوراسان و ئەفغاندا ڕوو

بکەنە هیندستان لەم سەردەمەدا (قەوزاق خانی تەکلو) کە لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە کرابوو بەفەرمانڕەوای خوراسان و لەبەر هەندێ هۆی ناکۆکی لە شا تەهماسپ کەوتبووە ترسەوە هەرکە بیستی ٥٠٠ سواری دلێری چنگنی ئەیانەوێ وڵاتی ئێران بەجێ بهێڵن و بەرەو هیندستان بڕۆن، بەهەلی زانی کە ٥٠٠ پاڵەوانی دلێر بکات بەپشتیوانی خۆی زۆر گورج نامەی بۆ ناردن و، بانگهێشتی کردن بۆ هیرات و لەو ناوە نیشتەجێی کردن. شا تەهماسپ کە خۆی ڕقی لە قەوزاق بوو، لەم کارەی پتر تووڕە بوو و، زۆر بەتوندوتیژی هێزی ناردە سەری و، بەسەریا زاڵ بوو و، قەوزاق نەوەک هەر شکستی خوارد، بەڵکو سەریشی تیاچوو... پاش ئەمە عێلی چنگن، کە لەو ناوە بوون ڕوویان کردە هەرێمی غورجستانی ناوەندی کابول و هیرات هەرکە شا تەهماسپ بەمەی زانی، بارەکەی زۆر بەتەرگزە و پڕ مەترسی هاتە بەرچاو و، کەوتە تەگبیر بۆ بەرگری لەم خەتەرە. لەو کاتەدا یەکێک لە عێلی چنگنی هەڵکەوتبوو، ناوی بوداغ بەگ بوو داوای کرد، هاتە پێشگای و پایەی سەردارێتیی گشتیی هەموو عێلی چنگنی دایێ و، داوای لێ کرد بچێت بۆ هەرێمی خوراسان و ئەفغان و ئەو ٥٠٠ سوارە کۆبکاتەوە لە دەوری خۆی و، لەو بیرە لایان بدات کە کۆچ بکەن بۆ هیندستان و، بیانگێڕێتەوە بۆ خوراسان و لەوێ ناوچەیەکیان بۆ تەرخان بکات و، خۆی سەردارێتی ڕامیاری و بەڕێوەبەرایەتییان بگرێتە دەست.

ئەم بوداغ بەگە ڕۆیشت و لەم ئامانجەیا پیرۆز بوو و سەرکەوت و ئەو سوارانەی گێڕایەوە لە هەرێمی قوچان نیشتەجێی کردن و، تا ئەمڕۆ ناوچەی چگنی بەناوی ئەوانەوەیە. پاش ئەوە زۆر شت ڕووی دا، بەڵام ئێمە بەداخەوە کاتمان لێرەدا تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/١٠/٣٠

گوێگره بەنرخەکانی بەرنامەی (وڵاتەکەت باشتر بناسە) شەوتان باش، ئاواتەخوازی پێشکەوتنتانین، لە هەموو کاروبارێکا؛ و پێتان ڕاگەیەنین کە ئەمشەویش هەر لەسەر باسی چنگنی دەڕۆین. ئەوەبوو وتمان کە لە کتێبە مێژوویییەکانی دەوری سەفەویدا و ها دراوەتە قەڵەم، کە کۆنترین و گەورەترین عێلی کوردی ئێران سێ عێلی (زەنگەنە و سیامەنسووری و چنگنی) بوون... هەروا ئەوەشمان ڕوون کردەوە کە ئەم عێلە کۆچەر بوون مەڵبەندێکی تایبەتییان بۆ خۆیان تەرخان نەکردووە، لە هەرێمەکانی ئازەربایجان و عێراقی عەجەم و ئوستانەکانی کوردستان و کرماشان و فەرمانداریی گشتی لوڕستانی ئەمڕۆدا لە هاتوچووندا بوون، پاشان هەندێکیان ویستوویانە بەسەر خوراساندا بۆ هیندستان کۆچ بکەن... بەڵام شا تەهماسپی سەفەوی چوونی ئەوانی بۆ هیندستان بەتەرگزە و مەترسییەکی گەورە هاتۆتە بەرچاو، لەبەرئەوە بوداغ بەگی چنگنییەی ناردووە بەرگری لە چوونیان بکات و، لەو ناوە ناوچەیەکیان بۆ تەرخان بکات و، پاراستنی سەرسنووری ئێران - ئوزبەگستانیان پێ بسپێری... با ئێستە گوێ بدەینە مۆسیقایێ ئنجا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

موزیک

لە وتاری پێشوودا، وتمان کە خەڵقێکی زۆر لە دەس ڕاو و ڕووتی ئەم عێلە بەتەنگ هاتبوون و، سکالایان بردبووە بەر شا تەهماسپ... بەڵام ڕەنگە ئەو قسانە دەس هەڵبەستی هەندێ لە مێژوونووسان بووبێ، کە ئەمیر شەرەفخان بێ بەراورد و لێکۆڵینەوە تۆماری کردبێ... چونکە عالەم ئارای عەبباسی ئەڵێت: **ساڵی ۹۳۳ی کۆچی، چنگنییەکان، لەگەڵ** (روملو) و (طەوالشەکان)، لە ئەردەبیلدا دژی ئەستاجلووەکان هەڵسان و لە قەرە دەرە پێشیان بەئەستاجلووەکان گرت و، بەرەنگاریان بوون و، ڕێیان بەستێ کە نەتوانن بچنە ناو ئەردەبیلەوە... بەڵام شا تەهماسپ یارمەتی بۆ ئەستاجلووەکان نارد و، ئەوان شکستیان خوارد... وا دیارە هۆی ئەوەی کە ٥٠٠ سواری چنگنی بەرەو خوراسان ڕۆیێون، شکستیان لەم ئاژاوەیەدا بووبێ.

ئەمە وەها و هەر لەم سەردەمەدا مەحموود خەلیفەی چنگنی و محەمەد سوڵتان جەلال ئوغلیی چنگنی سەردارێتی ئەو هێزەیان بەدەس بوو کە عێلی چنگنی هاتبووە بەرهەم بۆ

پاراستنی قەرەباغ... و شتی تری لەم ساڵانەدا نەبوو.

پاش مردنی ئیسماعیل میرزای کوڕی شا تەهماسپ کە دەسەڵات کەوتە دەست سوڵتان محەمەد خودابەندە و، دەوروبەری خوراسان شلەژا بوو، (خەیر ألنّسابیکم)ی دایکی شا عەبباسی دەستووری دا کە وڵاتی خوراسان سەراپا بخرێتە ژێر دەسەڵاتی بوداخ بەگەوە کە شا تەهماسپ لە کاتی خۆیا ناردبووی بۆ ئەو ناوە و، داوای لێ بکرێ کە هەرێمەکە لە شاڵاوی تاتار و ئوزبەگ بپارێزێ... بوداغ بەگ هێزێکی گەورەی پێکەوە نا و ئەو ناوەی بەتەواوی خستە ژێردەسەڵاتی خۆی... ساڵی ٩٧٧ شا عەبباسی ئەم بوداغ خانە کرد بەلەلەی شاهزادە سوڵتان حوسێنی کوڕی و داینا بەفەرمانڕەوای مەشهەد و هەرێمی قوچانیشی سپارد بەکوڕەکانی تەنانەت ئەو دووەیان کە دلێر و بەناوبانگ بوون و ناویان حەسەن سوڵتان و حوسێن سوڵتان بوو. ساڵی ١٠٠١ کۆچی واتا ١٥٩٢ زایینی عەبدولمۆئمین خانی ئوزبەگ بڕیاری دا کە هەرێمی قوچان لە خوراسان دابڕێ و، داگیری بکات بەڵام بوداغ خانی چنگنی تەکی پێ دانە دواوە و، ئەو ناوەی لە شاڵاویان پاراست. و ساڵی ١٠٠٤ کۆچیی قوتبەدین ئاغای چنگنی کە لە پیاوە گەورەکانی دەورانی شا عەبباس بوو، بەنومایەندەیی شا عەبباسی چووە لای عەبدولمۆئمین خانی ئوزبەگ، پەیامێکی هەڕەشە ئامێزی پێی ڕاگەیاند، کە ناوەڕۆکەکەی ئەوەبوو: یان دەست لە دەستدرێژی و شەڕفرۆشی هەڵ بگرێت و، یاخۆ پیاوانە و مەردانە بێتە مەیدانەوە بۆ شەڕ...

و هەر لەم ساڵانەدا بوو کە هەرا لە نێوانی عوسمانی و سەفەویدا، گەرم بووەوە، جا شا عەبباس هەرێمی هەمەدانی سپارد بەحەسەن عەلی خان چنگنی کوڕی بوداغ خان و، تا ساڵی ١٠٠٥ کە خاوەنی شەرەفنامە لەو ناوە بووە، ئەو هەر والی و سەرداری ئەو هەرێمە بووە...

ساڵی ١٠٠٦ ئوزبەگ شاڵاویان هێنایە سەر (دامەغان) و (بەسطام)... شا عەبباس فەرمانڕەوایی ئەو ناوەی سپارد بەم حەسەن عەلی بوداغ خانە و، ناردی بۆ بەرەنگاریی ئوزبەگ و حەسەن عەلی چنگنی شەڕێکی دلێرانەی کرد، بەڵام لەو شەڕەدا کوژرا...

پاش خۆی عەلی سوڵتانی برای جلەوی دەسەڵاتی ئەو ناوەی گرتەدەست - بوداغ خان خۆی گەرچی چووبووە ساڵا و پیر بووبوو بەڵام ساڵی ١٠٠٧ کۆچی شاڵاوی کردە سەر (مەرووی شاهجان) و (ما وراء النهر) و، تورکمان و ئوزبەگەکانی ئەو ناوەی ڕەتاند، تا باغباد و بوخارایشی داگیرکرد و، هەرێمەکانی زیسا و ئەبیوەردیشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆییەوە...

له سالآنی ۱۰۱۱ کۆچیدا، دوو کوڕی تری بوداغ خان که ناویان یوسف عەلی خان و عەلی سولتان بوو، کەوتنە ڕوو و، لەلایەن شای سەفەوییەوە کران بەفەرمانڕەوای دوو هەرێمی پانوپۆڕ لەو ناوەدا...

جگە لەمانەی وترا... سەفەر قولی بیگ چنگنیش لە سالآنی ۱۰۱۲دا یەکێ لە سەردارانی گەورە بوو، کە (قارص) و (بایەزید)ی بەدەستەوە بوو. هەروا عاشور خانی چنگنیش، فەرمانڕەوایەکی مەزن بووە... بابێینەوە سەر ئەو چنگنییانەی کە لە لوڕستان دان و، لە ناوچەی چنگنی سەر بەفەرمانداریی گشتی خوڕەم ئاوادا ئەژێن... ئەوانە گۆیا سێ سەد سالێکە کەوتوونە لوڕستانەوە، ئەگەر ئەوە ڕاست بێ، دەبێ لە چنگنییەکانی عێراقی عەجەم بن... چنگنیی لوڕستان ئەکەوێتە نێوانی سپی کێو و، چیاکانی چل وەراز و تەنگ تونیلەوە، دەشتێکی پانوپۆڕە سێ دێهستانی هەیە بەناوانی (دورە - ناوکەش - سوماق). دانیشتوانی ئەم بەخشە ١٤ هەزار کەسێ ئەبن، ناوەندی ناوچەکە دێی دورەیە و، لەم بەخشەدا قوتابخانە، خوێندنگەی لابەری نەخوێندەواری، مزگەوت، داروخانە، دەرمانگا و، شتی تری هەیە بەسەر ڕووباری کوشکانەوە لە دێهستانی سماقەدا پردێکی کۆنی ڕووخاوی سەردەمی ئەتابەگانی حەسەن وەیهی هەر ماوە. ئەم هەرێمە جەنگەلآوییە، باغاتی کردگاری سەوز بووی زۆرە، وەک گوێز، بەڕوو، کاق و تورش... خەڵقی ئەم ناوە ئێستە لەسەر لوڕ ئەژمێررێن و، شێوەی زمانیان بووەتە لوڕی... دەسکەوتیان بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵە... دەشتی چنگن، بەبرشتترین هەرێمی ئەو ناوەیە... جگە لە چنگنییەکان تیرە و عێلی تریش لەو ناوەدا هەن، تەنانەت بنەماڵەی (سەیدە حەیات ئەلغەیبی)یەکان، لەو ناوەدا ڕێز و شکۆیان بۆ خۆیان پێکهێناوە و، گومان دەکرێ، بەپێی ئەوەی کە هەم سەید و هەم نزیک بەسەر سنووری عێراقن، لە بنەڕەتا لە ولآتی عەرەبەوە پەنایان هێنابێتە ئەو ناوە.

هەر چۆن بێ ئەوانیش ئەمڕۆ هەر لە لوڕە کوردەکان ئەدرێنە قەڵەم. گوێگرە بەڕێزەکان، لێرەدا کاتی بەرنامەکەمان تەواو بوو، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین، لە بارەگای یەزدانی بەڕێز تکاکارین بەرەو مراز بچن و بەخۆشی بژین، شەوتان باش.

۱۳۵۱/۱۱/۲

۲/بەفرانبار/۲۶۷۳

# چنگۆڵە

گوێگرە بەهەست و ژیرەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش، کامەرانی و خۆشیتان ئاواتی بەرزی ئێمەیە... و ئەمشەو ئەمەوێ باسی (چنگۆڵە)تان بۆ بکەم، کە ئەم جێگەیە لای ئێوە گرنگ و ناسراو نییە، بەڵام لە مێژوویییەکی کۆنا دەورێکی سەیری بووە، جا پاش بڵاوکردنەوەی ئاهەنگێ لەم بارەوە ئەدوێین...

موزیک

چنگۆڵە، لە سەردەمی سەفەوییدا، قەڵایەک بووە لە هەرێمی لوڕستاندا، قەڵایەکی سەختی وەها کەم جار سپا توانیویە ڕێی پێ ببات، جا ئەم قەڵایە بەسەرهاتێکی هەیە...

عالەم ئارای عەبباسی لە بەرگی یەکەمیدا لە لاپەڕەکانی ١٤١-٤٥٦ ئەڵێ: ئەمیر جیهانگیر کوڕی شا ڕۆستەمی لوڕ، خەریکی ئاژاوەنانەوە بوو، لە سەردەمی شاهێتیی شا تەهماسپی سەفەویدا... ئەیەویست هەرێمی قەڵەمڕەوی عەلی شوکور -واتا هەمەدانی ئێستە- بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و، بۆ ئەو مەبەستە ئەو ناوەی هێنا بووە تەنگ بەتاڵان و بڕۆ... شا تەهماسپ دەستووری دایە عەبدوڵڵا خانی ئەستاجلو کە میری میرانی ئەو ناوە بوو، بچێت بۆ سەر پێ شۆڕکردن و، دامرکاندنی ئاژاوەکەی... عەبدوڵڵا خان ساڵی ٩٤٩ هەڵی کوتایە سەر هەرێمی لوڕستان و لەگەڵ ئەمیر جیهانگیر خان لێیان بووە شەڕ... ئەمیر جیهانگیر لەبەر کەمی هێزەکەی لە شەڕەکەدا شکا و، لە ئەنجامی بەرەنگاریدا بەدیل گیرا و لەلایەن سپای قزڵباشەوە کوژرا... دوو کوڕەکەی کە ناویان شا ڕۆستەم و محەمەدی بوو، هەڵاتن بەرەو بەغدا. لەشکری قزڵباش کەوتنە قەڵاچۆی لوڕستان و، تاڵان و بڕۆی وڵاتەکە و، کوشتارێکی زۆریان تیا کرد و، ئاژەڵ و سامانی خەڵقەکەشیان هەموو داگیر کرد و هێنایان و، کاری تری زۆر خراپیان کرد. ئەمیر شا قاسمی زاوای میر جیهانگیر کە ئەمەی دی، کەوتە نامە ناردن بۆ شاە تەهماسپ و تکای کردن: کە لەشکر لە وڵات بکێشێتەوە و، ببوورێ لە کوڕەکانی جیهانگیر... ئەویش تکاکەی پەسەند کرد بەو مەرجەی بگەڕێنەوە وڵات و فەرمانی دا کە وڵاتەکە لە نێوانیانا بەش بکرێ... با لەبیرشمان نەچێ؛ ئەم ئەمیر شا قاسمە یەکێ بوو لە بنەماڵە سەیدە

بەرێزەکانی سەر سنووری لورستان و، لەو ناوەدا زۆر بەرێز و بەدەسەلات بوو.

ئەمەبوو قسەکانی عالەم ئارا بەلام ئەمیر شەرەفخان کە پێش ئەسکەندەر مونشی بەچەند ساڵ ئەم باسانەی تۆمار کردووە ئەڵێ:

پاش کوژرانی ئەمیر جیهانگیر، ئەبو موسلیم گۆدەرزی کە لەلەی شا رۆستەم بوو، ویستی دڵپاکی و نۆکەرێتی خۆی دەربارەی شا تەهماسپ نیشان بدا... شا رۆستەمی فریو دا و بردی بۆ لای شا تەهماسپ بۆ تاران بەسەد سوارەوە، هەرکە گەیشتە ئەوێ شا تەهماسپ فەرمانی دا، ناردیان لە قەلای ئەلەموتدا، زیندانیان کرد، خەڵقی لورستان کە بەمەیان زانی، بڕیاریان دا برا بچووکەکەی شا رۆستەم کە ناوی محەمەدی بوو، بپارێزن... و بردیانە قەلای چنگۆڵە شاردیانەوە. لەوێ لەلە و مامۆستا و بەردەستانی وریایان بۆ ئامادە کردو کە پێ بگات... ماوەیەک ولاتی لورستان بێ سەردارمایەوە... خەڵقەکە بەملاو ئەولادا تەرتە وەرتە بووبوون... کابرایەکی لور کە بەسەر و سیما زۆر لە شا رۆستەم ئەچوو، خۆی گەیاندبووە لورستان و، جاری دابوو کە شا رۆستەمەوە لە ئەلەموتەوە هەڵهاتووە و، دەسەلاتی لورستانی گرتبووە دەست و، کەوتبووە هێز کۆکردنەوە... ئەم هەواڵە گەیێندرایە شا تەهماسپ.. لەبەر ئەم ناچاربوو، ناردی شا رۆستەمیان لە زیندان رزگار کرد و، لەگەڵ هێزێکا ناردییەوە بۆ لورستان... کە خەڵقی لورستان ئەم هەواڵەیان بیست لە کابرای ساختەچی تەکینەوە و، گرتیان و، سەنگەساریان کرد.

شا رۆستەم بەناوی فەرمانداریی ولات، دەسەلاتی گرتەدەست... لەم کاتانەدا، کە چەند ساڵێ بەسەر شاردنەوەی محەمەدیدا رابردبوو، محەمەدی هەڵچووبوو، پێ گەیی بوو، بووبووە گەنجێکی نەبەز... لەبەرئەمە شا تەهماسپ دەستووری دا ولاتی لورستان کرا بەدوو بەشەوە: بەشی پێشکۆ درایە شا رۆستەم و بەشی پشتگۆی درایە محەمەد، دوو برا کەوتنە بەرێوەبردنی ولات و بووژاندنەوەی عێلەکانیان، بەم جۆرە تا ساڵی ٩٧٤ کۆچی بەسەریان برد... شا رۆستەم زۆر ملکەچی فەرمانی شا تەهماسپ بوو. بەلام محەمەدی سەربەست و سەربەخۆیانە ئەژیا و، خورەم ئاوای کردبووە ناوچەی فەرمانڕەوایی خۆی و، خەریکبوو پەرە بدات بەدەسەلاتی شا تەهماسپ لێی کەوتە بەهانە و، چەند جارێ ناردی کە داوای باج و پیتاکی لێ بکەن بەلام محەمەدی گوێی نەئەدا... شا پەروەر خانمی ژنی شا رۆستەم، کە کچی ئوغورخانی کوری شا رۆستەمی گەورە بوو، کە هەر ئەو شا رۆستەمەیە کە بەناوی شیعێتییەوە لەگەڵ شا ئیسماعیل رێک کەوتبوو و، شا دەستووری دابوو، ریشەکەیان بەمرواری و یاقوت و زومرووت رازاندبووەوە...

ئەو کچە لەلای بنەماڵەی سەفەوی خۆشەویست بوو بەدزییەوە نامەی بۆ شا تەهماسپ نووسیبوو داوای لێ کردبوو، محەمەدی لەو ناوە هەڵگرێ و، دەسەڵاتی وڵات هەمووی لەژێردەستی شا ڕۆستەمی مێردیدا بێ. جا شا تەهماسپ دەستووری دابووە ئەمیر خان موسلوی فەرمانڕەوای هەمەدان بچێت بۆ سەر وڵاتی بەختیاری بەناوی کۆکردنەوەی باج و پیتاکی پاشکەوتووەوە و لەوێشەوە بەدزییەوە هەڵ بکوتێتە سەر محەمەدی ئەمیر خان کە گەییە لای شا ڕۆستەم، محەمەدیی بێ ئاگا، لە هەموو کەینوبەین... بەسەد سوارەوە چوو بۆ خێرهاتنی، هەرکە کۆڕی قسە و نانخواردنیان گەرم بوو و، محەمەدی هۆشی لە هەموو لا برا... ئەمیر خان بەدزییەوە گاڵی دا... دەستگیریان کرد و، خۆی و ئەو سەد سوارە پیاوماقووڵەی کە لەگەڵی بوو، هەموویان بەکۆت و زنجیر و پاڵە هەنگەوە نێرران بۆ ئەلەموت.

ئەمە وەها و لە وتاری ئایندەدا، بەسەرهاتی محەمەدی ئەگێڕینەوە و، لەپاش ماوەی بەسەرهاتی چنگۆڵەش ئەدوێن، ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/١١/٩

٩/چلە/٢٦٧٣

١٩٧٣/١/٢٩

**وتاری: ٥٥**

گوێگرە ئازیزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان خۆش. کامەرانیتان ئاواتی ئێمەی بەڕێوەبەرانی کوردییە. ئێمە ئەو حەوتەیەش هەر لەسەر باسی (چنگۆڵە) ئەڕۆین... ئەوە بوو لە وتاری ڕابردوودا وتمان: کاتێ کە ئەمیر جیهانگیری سەرداری لوڕستان، لەشەڕا کوژرا، خەڵقی لوڕستان تووشی دەربەدەری و زۆر و زەنگێکی زۆربوون، شا ڕۆستەمی کوڕە گەورەی جیهانگیر بەهۆی ئەبو موسلیمی گودەرزیی لەلەیەوە، خۆی گەیاندە بارەگای شا تەهماسپی سەفەوی، بەڵام محەممەدی کوڕی جیهانگیر کە منداڵ بوو، هەندێ لە پیاوماقووڵانی لوڕستان بردیانە چنگۆڵە شاردیانەوە، کە پێ گەیی بەدەستووری شا لوڕستان بەش کرا بەدوو بەش، بەشی پێشکۆ درایە ڕۆستەم خان و بەشی پشتکۆش بەمحەممەدی و، چەند ساڵێ دوو برا بەم جۆرە وڵاتەکەیان بەڕێوەبرد، بەڵام پاشان شا تەهماسپ لە محەممەدی کەوتە بەهانە و، بەوهۆیەوە کە شا پەروەری کچی ئوغور خان کە ژنی ئەمیر ڕۆستەم بوو، نامەی نهێنی نووسیبوو بۆ شا تەهماسپ، دەستووری دابوو بەفەرمانڕەوای هەمەدان کە بەناوی باج و پیتاک وەرگرتنەوە، محەممەدی دەستگیر بکات، ئەوەبوو لە کاتی نانخواردنا محەممەدی و سەد سواری پیاوماقوولی لوڕستان گیران و نێرران بۆ ئەلەموت، جا پاش موسیقایێ ئەو دوای بەسەرهات.

موزیک

محەممەدی خانی سەرداری بەشی پشتکۆی لوڕستان، کە لە چنگۆڵەدا بەنهێنییەوە پەروەردە کرابوو و، زۆر مەردانە و گیان ئازادانە هەڵچووبوو و، حەزی لە سەرشۆڕکردن نەبوو، کەوتە داو و برایە قەڵای ئەلەموت و دە ساڵ لەوێدا مایەوە... بەڵام چوار کوڕی ئازا و دلێری ڕزگار بووبوون، کە ناویان (عەلی خان - ئاسڵمەز - جیهانگیر - شاهویردی) بوو... ئەمانە وڵاتی لوڕستانیان کردە پارچەیەک ئاگر و، ژیانیان لە ڕۆستەم شای مامیان تاڵ کرد و، فەرمانڕەوای هەمەدانیشیان هێنایە لەرزە و، دەسدرێژییان تا جوربادەقان -واتا گوڵ پایەگانی ئێستە- و تا ئەسفەهان پەرەی سەند... دەستە و دایەرەی شا تەهماسپ سکاڵایان بردە لای شا و، تێیان گەیاند کە باشترین ڕێ بۆ لابردنی ئەم ئاژاوەیە ئەوەیە کە محەممەدی لە زیندانی ئەلەموت ڕزگار بکرێ و بکرێتەوە سەرداری لوڕستان، بەو مەرجەی کوڕەکانی بنێرێ لە دەرباری شادا بمێننەوە، نوێنەرانی شا تەهماسپ چوونە لای محەممەدی

و پەیمانیان لەگەڵ بەست کە نامە بنووسێ لە کوڕەکانی: سی هەزار سەر ئەسپ و ئێستر و ڕەشەوڵاغ و، گوێدرێژ و، پەز... کۆبکەنەوە و بهێنن بۆ دەرباری شا تەهماسپ و، خۆیشیان بێن لێرە بمێننەوە، داوەکو محەمەدی بەربدرێ و بچێتەوە بەسەر لوڕستانەوە دابنیشێ محەمەدی نامەیەکی بەم جۆرەی نووسی، جا محەمەدی لە قەڵای ئەلەموت دەرهێنرا و، لە قەزوین لە ماڵی حوسێن بەگی ئەستاجلو دانرا، کە لەژێر چاوەدێریی ئەوا بمێنێتەوە تا کوڕەکانی دەگەن. هەرکە نامەکەی محەمەدی گەیشتە کوڕەکانی، وازیان لە شۆڕش هێنا و، دووانیان دە هەزار سەر ئەسپ و ئێستر و چوارپای تریان هێنا و هاتن بەرەو قەزوین کە گەیشتنە دێی شەرەف ئاوای نزیکی قەزوین هەواڵیان بۆ باوکیان نارد... محەمەدی لەگەڵ حوسێن بەگی ئەستاجلودا لەو ماوەوە دووا پێی وت: کوڕەکان؛ هەندێ ئەسپ و ئێستر و مەڕ و ئاژەڵیان هێناوە، بەڵام من خۆم نازانم ئایا جۆریان ئەوەندە باشە کە بتوانین پێشکەشی بەبارەگای (شاهی)یان بکەین یا نە؟ ئەگەر ماوە بفەرموون خۆم بچم ئەم دیارییە ببینم. حوسێن بەگ چەند سوارێکی لەگەڵ نارد و، خستییە ژێر چاوەدێری چەند ئەفسەرێکی جێ باوەڕدوە. کاتێ چوون بۆ شەرەف ئاوا تاریک داهاتبوو، محەمەدی پێشنیاری کرد ئەوشەوە لەوێ بنون کە بۆ سبەینێ بەڕۆشنایی دیارییەکە ببینن... و هەرکە بەشێ لە شەو ڕابوورد. محەمەدی و هەردوو کوڕەکەی و شوان و دەستە و دایەرەکانیان خۆیان هەڵ دایە سەر زینی ئەسپ و بۆی دەرچوون... بۆ سبەینێ ئەم هەواڵە گەیشتە شا تەهماسپ، زۆر شڵەژا و فەرمانی دا بەئەمیر خانی فەرمانڕەوای هەمەدان و سەردارانی تری، کە پەیدۆزییان بکەن... بەڵام خاوەخاوی ئەمان لە کوێ؟ و کێچانە ڕاپەڕینی ئەوان لە کوێ؟... کە ئەم هەواڵە گەیشتە شا ڕۆستەمی برای کە سەرداری لوڕستان بوو... لە ترسا وڵاتەکەی بەجێ هێشت و هەڵات بەرەو قەزوین و پەنای بردە لای شا تەهماسپ محەمەدی هەموو وڵاتی لوڕستانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بۆ ئەوەی جارێکی تری شا تەهماسپ سپا نەنێرێ بۆ لوڕستان.

ئەمیر محەمەدی نامەیەکی دۆستانەی لە شا تەهماسپ نووسی و، بەڵێنی ملکەچی و، باج و پیتاک دانی دایێ و، بەم جۆرە بوو بەفەرمانڕەوای گشتیی هەردوو بەشی لوڕستان، هەم پشتکۆ و هەم پێشکۆ... و تا دەورانی شا تەهماسپ و شا ئیسماعیلی دووەمی کوڕی بەسەرچوو، ئەم وڵاتەی لە ئاژاوە دوور ڕاگرت و، لە سەردەمی سوڵتان موڕادی سێیەمی عوسمانیدا... کە لە ساڵانی ٩٨٣ و تا ١٠٠٣ کۆچی لەسەر تەخت بوو محەمەدی (مەنەلی - جەسان - بەدرە - تورساق)یشی خستە سەر لوڕستان، بەڵام پاشان دەوڵەتی

عوسمانی لێی داگیر کردەوە و، کە سوڵتان محەمەد خوابەندەی کوڕی شا تەهماسپ دەسەڵاتی وڵاتی ئێرانی کەوتە دەست، لەگەڵ محەمەدیدا زۆر نزیکەوە بوو، تا ڕادەیەک کە حەمزە میرزای کوڕی کرد بەزاوای محەمەدی و بەوجۆرە نێوانیان خۆش بوو... پاش مردنی ئەم محەمەدییە، شا وێردی خانی کوڕی لە جێی دانیشت، ئەم شا وێردی خانە لە سەرەتادا لەگەڵ شا عەبباسدا ژن بەژنی کرد، خوشکە بێوەژنەکەی خۆی دایێ کە لەوەبەر ژنی حەمزە میرزا بوو و، کچەزاکەی بەهرام میرزای ئامۆزای شا عەبباسی خواست.

جا ئێستە بابێینەوە سەر باسی چنگۆڵە، ئەو قەڵایەی کە پاڵەوانێکی ئەبەزی وەکو محەمەدی پەنادا و پێی گەیاند، ئەمڕۆکە پاسگای گومرگی سەر سنووری ئێران و عێراقە ئەکەوێتە ناوچەی میهرانی سەر بەفەرمانداریی گشتیی ئیلامەوە، بەلای خۆرهەڵاتی میهراندا بە ٥٤ کیلۆمەتر... و ئەکەوێتە لا خواری ڕێی میهران - دێ لوڕان... جێگەیەکی چیاییە و، گەرمێنە و، ڕووبارەکەی نزیکیشی هەر ناوی چنگۆڵەیە. بەڵام چونکە ڕووبارەکە شۆڕ و تاڵە، کارێزیان لێ داوە عێلەکانی لوڕ، زستان پەنا ئەهێننە ئەو ناوە، لە ترسی سەرمای چیای لوڕستان، بۆ ڕزگارکردنی ئاژەڵەکانیان. ئێستە چنگۆڵە جێگەیەکی ئاوەدانە... خەڵقی ئەو ناوە خاوەن مێگەل و، خێوی کشتوکاڵن... تا بەرنامەیەکی تری ماڵئاواییتان لێ دەکەین شەوتان خۆش.

١٣٥١/١١/١٢

**وتاری: ٥٦**

# چقل وەندی

گوێگرە بەهەستەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش. کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە... ئێمە لەم وتارەدا دەربارەی (چقلّ وەندی) ئەدوێین، کە یەکێکە لە بەخشەکانی فەرمانداریی گشتی لوڕستان. و لەبەرئەوەی ئەم هەرێمە لە ڕووی مێژووەوە لەگەلّ لوڕستان یەکێکە، ئێمە تەنیا لە ڕووکاری جوغرافیاییەوە لێ ئەدوێین.. جا ئێستە بفەرموون گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

دەوروبەری چقلّ وەندی بەم جۆرەیە: لای خۆرهەلاتی سیلاخور و کێوی شا شین و ملەی نالشکێنە... و درێژە ئەکێشێ بەرەو گەرووی دینارئاوا و کێوی گرێ و، لای باکوریشەوە کێوی گرێی بچووک و گلەزەردە و حوشتر ملەیە... و لای خۆرئاوایشی ڕیملە و بانەبەرزی هەرۆیە.

چیا گرنگەکانی ئەم بەشە ئەمانەن: (گرێ - پونە - ڕێملە - سیاکەمەر - مەخمەلّ کۆە - حوشتر ملە...)

ڕووبارەکانیشی ئەمانەن:

یەکەم: ڕووباری هەرۆ کە سەرچاوەکەی لە خاک مالیکی نزیکی قائید ڕەحمەتەوە هەلئەسێ و، لە کێوەکانی دالەوەندا لە دوو جێگە شەقامی بروجورد - خوڕەم ئاوا دائەبڕێ و، ئەکشێ بەرەو کاسیانە و لەوێ پێی ئەوترێ ڕووباری بابالّی. ئەم ڕووبارە بابالّییە لە دوو جێگە بەبنەوانەی بچووک ئاوەکەی بەربەست کراوە و، سوودێکی گەورەی بۆ ئەو ناو و دۆلانە بووە، کە کیلگەکانیان ئاوییژە بووە. ڕووباری بابالّی لە بێدەلەوە شۆڕ ئەبێتەوە بەرەو کوڕ نۆکەر و لەوێوە ئەچێتە ناو خاکی حەسنەوەندەوە و، ئینجا بەرەو قۆلّی کاکا ڕەزا ئەکشێ و بەناوی ڕووباری وەلّم ئەناسرێ.

ڕووباری دووەم: ئاوی بزەلّە، کە سەرچاوەکەی لەسەر ئاوی مورادەوە هەلئەسێ و، زەویوزاری حەسەن ئاوا و سەوز عەلی ئاو ئەدا و، لەوێوە ئەکشێ لە خوار بروجوردەوە تێکەلّ بەڕووباری سیلاخور ئەبێ...

لێرەدا با لەبیرمان نەچێ دێی کاسیانە کە بەسەر رووباری هەرۆوەیە، هەم شوێنێکی کۆنەوارە و، هەم ناوەکەشی ئێمە ئەخاتەوە یادی کاسییە کۆنەکان، کە لە مێژوودا بەناوی کاشی و کوش و قص و ناوی تری تۆمار کراون... تا دوکتور رەفیق لە کتێبی (تەئریخی عمومی)دا کە بەزبانی تورکی نووسیویە ئەڵێ: (قیصلەر... یفی شمدیکی کوردلەر) کە ئەکات قیصەکان: واتا کوردەکانی ئێستە...

با واز لە ناوی کاسی بهێنین بۆ کاتی خۆی... دانیشتوانی ئەم چقڵ وەندییە، بەپێی کتێبی لورستانی عەلی ساکی لە تیرەی بایران وەندیی لورن، کە شێوەی زمانیان زۆرتر بەکرمانجی خواروو ئەچێ، لە لوری... و بەخشەکە ۲۹ ئاوایی هەیە. کە سێ دێیان گەورە دێن وەک (ملە قوربانی - چهار بورجی - موختەوایی).

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم سێ دێیە شارە دێن، بەڵام هیچیان ناوەندی دێهستان نین... بەڵکو چقڵەوەندی بریتییە لە پێنج دێهستان کە پێیان ئەڵێن: (سەرهەرۆ - هەرۆی ناوەنجی - هەرۆی باکوری - وەرکۆە - و یار ئەحمەد)، سەرژمێری دانیشتوانی ئەم بەخشە کە هەموویان لە لێ و قوڵی جیاجیای بایرانەوەندن لەمەوبەر ۵۰۰۰ کەسێ بوون و، ئێستە زۆرن.

ناوی تیرەی بایرانەوەند لە بنەرەتا، بەگومانی من بایرام وەند بووە، لە سەردەمی سەلجوقی و مەغۆل بەدواوە زۆر لە سەرانی کورد ناویان تورکی بووە... بەڵام وشەی بایرام کە ئەکا جەژن وەرگەڕاوە بە بایران...

دێهستانی سەرهەرۆ جێی تیرەی (قائید رەحمەت)ە دێهستانی (هەرۆی ناوەنجی)ش جێی تیرەی داڵوەندییەکانە و، تیرەی بایرانەوەندییە کۆنەکانیش لە هەرۆی ناوەنجی دائەنیشن و، لقەکانی شەعبانی و شاهوێردیش لە دێهستانی وەرکۆ دائەنیشن و جێی ماڵ قوبادییەکانیش دێهستانی یار ئەحمەدییە بەڵام لەم دواییەدا وەزارەتی کیشوەر بەخشی چقڵوەندی کردووە بەچوار دێهستان: (بابالی - ماڵ ئەسەد - وەرکۆە و ئاو سەردە)...

ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی بەم ناوەدا رابردووە ئەڵێ: رۆژانی ۲-۱۳ حوزەیرانی ساڵی ۱۸۹۱ بوو، کە خورەم ئاوامان بەیانی زوو بەجێ هێشت و، شەومان لە شیوی هەرۆ رابوارد و، چادرەکانی خۆمان تیا هەڵدابوو... ئەم رێیە کورتترین رێی خورەم ئاوا - بروجوردە و دوو قۆناغ ئەبێ، بەڵام رێی کاروانەرێ بەسەر زاغەدا تێ ئەپەرێ، کە بەچوار قۆناغ ئەیبرن. ئەوان لە عێلاتە کۆچەرەکان ئەترسن. لە سەردەمی بنەماڵەی قاجاردا

شۆڕشی ئەم عێلانە دامرکاوە و، چەند کەسێکی دز و جەردەیان لێ سزادراون؛ بەم جۆرە کە دوو کەسیان بەستووە بەگوللە تۆپەوە... دەستی هەشت کەسی تریان بڕیوە و، گوێی دوو کەس، جگە لەمانەش ١٣ کەس لە دار دراون. ئێمە نزیک بەم دەوارنشینانەی کە خەریکی شیوەن و ڕۆڕۆن و پرسەیان گرتووە چادرمان هەڵداوە... ئەم سزایە گەرچی زۆر سەخت بووە، بەڵام بۆ ئەمانە سەرمەشقێکی باش بووە ئەم ناوە تا ماوەیەک لە تالان و بڕۆ و جەردەیی ئەم کۆچەرانە ڕزگار ئەبێت. ئەمە بوو قسەکانی ژاک دومورگان.

پاش دومورگان (ویلسن) بەو ناوەدا ڕابردووە ئەڵێ: (سەرۆکانی بایرانەوەند، کە بیستوویانە ئێمە لەو قوڵەوە ڕائەبوورین ئەیانەوێ جۆرێ ئێمە بەتەنگ بهێنن، کە تکا بکەین لە دەوڵەتی ئێران قەوم و کەسی جەردەیان لە زیندان بەربدەن... و حوسێن خان ناوێکیان زۆر بەمیهرەبانییەوە هاتووە لەگەڵ ئێمە ئەدوێ چونکە بۆی دەرکەوتووە کە ناتوانن ئێمە ڕووت بکەنەوە یا بەدیلمان بگرن...) بەڵام من تکام وایە لە دەوڵەتی ئێران هەر کات دەستی ڕۆیشت بەسەر ئەم بایرانەوەندانەدا و، هێزی نارد بۆ ئاسایش و ئارامکردنەوەی ئەو ناوە... هەرگیز بەزەیی بەئەم بایرانەوەندانەدا نەبێ. لەم وتەیانە بۆمان دەرئەکەوێ کە تاوەکو سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەوی ئەم بایرانەوەندانە سەریان بۆ دەوڵەت شۆڕ نەکردووە.

گوێگرانی خۆشەویست، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین هیوامان وایە کاتێکی خۆشتان لەگەڵ ئەم بەرنامەیە ڕابواردبێ ئێستە شەوتان باش.

١٣٥١/١١/٢١

## وتاری: ٥٧

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان خۆش... کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە.

ئەمڕۆکە لە نووسەرێکی بەڕێزی کوردەوە نامەیەکمان وەرگرت، نووسیبووی ئێوە لە سەرەتای بەرنامەکەتانا بەڵێنتان دابوو بەگوێگرە بەڕێزەکان، کە هەر کات باسی شارێکی کوردەواری یاخۆ دێیەک بکەن، باس لە شیعر و ئەدەبیاتی ئەویش بکەن و، سەرگوزەشتی ئەدیبەکان و خوێندەوارەکانیشی بنووسن، بەڵام ئەم ماوەیە کەمتر ئەم کارەتان کردووە، لەبەرئەوە بیستیارەکان بەتامەزرۆییەوە چاوەڕوانی ئەوەن کە بەڵێنەکانتان بەجێ بهێنن...
جا ئێمەش بەرلەوەی باسی ئەمشەومان دەست پێ بکەین لە وەڵامی ئەو نووسەرە بەڕێزەدا ئەڵێین: وەکو بیستیارانی بەڕێز گوێیان لێیە. ئێمە باسەکەمان جوغرافی و مێژووییە، واتا زۆرتر باس لەوە دەکەین کە فلانە شار یاخۆ فلانە دێ ئەکەوێتە کوێوە؟ و لە کەیەوە هەیە؟ و چ قەوماوەگەلێک تیا ڕووی داوە و، کێ گەلی تیا هەڵکەوتووە و زۆر کەم ڕووئەدا، کە ئێمە لە کتێبە مێژووییەکانا هەڵبەستی کوردی و فارسی خەڵقی ئەو جێیانەمان بەرچاو بکەوێ، بۆیە ئەو کارە ناکەین. ئەگەر لەبیرتان بێت، لە باسی دێی بێتوش و بیساراندا، کە هەردووکیان هەوارگەی دوو هەستیاری بەرزی کورد بوون، لە بێتوشییەوە پارچەیەک هەڵبەستی عەرەبیمان وەرگێڕابوو بەکوردی کە هەڵنانی دێی بێتوشی و ناساندنی بەخەڵقی بوو و، لە بێسارانیشەوە پارچە هەڵبەستێکی گۆرانی شێوەمان بڵاوکردبووەوە، بەڵام جێگەکانی تری، ئەگەر ئەدیب و زانا و نووسەری کوردیان تیا هەڵکەوتبێ، یا شوێنەواریان چنگ ئێمە نەکەوتووە، وەیا هەر نییانە... و ئەوەی بیزانین درێغی ناکەین، ئێستە ئەچینەوە سەرباسەکەمان و لە ڕیزە وتارێکا دەربارەی (حەلەوان) ئەدوێین. جارێ با گوێ بدەینە موسیقایێ.

موزیک

ئەمڕۆکە شوێنەواری شارێکی کۆن ئەبینین بەلای چەپی لێواری ڕووباری ئەلوەندەوە، کە ناوی لە جوغرافیا و مێژووە نووسراوەکاندا بەعەرەبی (حەلەوان) بووە...
ئەم شوێنە ئەکەوێتە باکوری سەر پردی زەهاوەوە کە بەکوردی پێی ئەوترێ (سەرپێڵ).

ئیبن حەوقەل لە لاپەڕە ١١٢ کتێبی (صورەت الئەرض)دا ئەڵێ: (حەلەوان شارێکە بەسەر کێوەوە و، بەسەر عێراقدا ئەڕوانێت، خانووبەرەی لە قوڕ و بەرد دروست کراوە، ئەوەندەی نیوەی شاری دینەوەر ئەبێ، ئەکەوێتە هەرێمێکی گەرمەسێر و گەرمیانەوە، داری هەنجیر و هەناری شیرین و خورما زۆرە، پڕە لە جۆگە و کانیاو، دوو فرسەنگ لە ژوور شارەکەوە شاخەکان بەفراوین... کتێبی (حدود العالەم)یش لە لاپەڕە ٩٠دا ناوی لەم شارە بردووە و، ئەڵێ: حەلەوان شارێکە بەپیت و بڕشت، ڕووبارێ بەناوەندیا ئەڕوات، هەنجیری وشککراوەی ئەوێ ئەنێررێ بۆ وڵاتان... بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ لە حەلی خۆیا شارەکە بەهەردوو بەری ڕووباری ئەڵوەندەوە بووە نەوەک تەنیا بەبەری لای چەپەوە... و بەپێی ئەو بەردەنووسانەی کە لە دەربەندی گاور لە قوپیی قەرەداغ یا (کارداخ)ی نێوانی دوو ئوستانی کەرکووک و سلێمانی دۆزراوەتەوە.

ئەم شاری حەلەوانە ٢٨٠٠ ساڵ پێش زایینی هەبووە و، لەو دەوروبەرانەدا لەلایەن پادشای (لولو و گوتو)وە داگیر کراوە. پاشان لە بەردەنووسەکانی ئاشووریدا بەناوی خاڵمان یا هاڵمان تۆمارکراوە و، مێژوونووسانی دەوری ئیسلام، کە هەموو شتێکیان پاڵشت داوە بەخۆیان، وتوویانە ئەم شارە لە دەوری شاهێتی قوبادی یەکەمی ساسانیدا، دروست کراوە و بۆ یەکەم جار کابرایەکی عەرەبی (حولوان) ناو کراوە بەفەرماندەی ئەوێ و ناوی شارەکە هەر بەناوی ئەوەوە ماوەتەوە. هەر چۆن بێ ئەم شارە تا سەدەی حەتەمی کۆچی هەر ئاوەدان بووە... پاشان هەم بەهۆی زەبروزەنگی مەغۆل و ئیلخانییەوە و، هەم بەهۆی بوومەلەرزە و بەڵای عاسمانییەوە وێران بووە و، خەڵقەکەی بەشوێنە چیاییە سەختەکانا بڵاوەیان لێ کردووە... شاری حەلەوان لە سەردەمی خەلیفەی دووەم حەزرەتی عومەردا بەم جۆرەی داگیر کراوە، پاش ڕۆخانی شاهەنشایی ساسانی بەرامبەر بەسپای ئیسلامی و، هەڵاتنی یەزدی گورد لە هەرێمی پێ دەشتەوە بەرەو چیا، سپای ئیسلام بەدوویان هاتن بەرەو جەلەولا -کە لەوەبەر بەناوی (بێث گالا Bêth qala) دەناسرا و، لەم دواییەدا پێیان ئەوت قەراخان- لەوێ فەرماندەی سپای ئێران کە ناوی خوسرەوی شنوم بوو بەرەنگاری کرد و پاش شەڕێکی سەخت شکا و لەشکری ئیسلام بەرەو حەلەوان پێش کەوتن و لەم دەرفەتەدا هێز لە حەلەوان و عێراقی عەجەمەوە پڕ بەدڵ یاریدەی یەزدی گوردیان ئەدا... پاش شەڕی جەلەولا هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبو وەقاس کە برازای سەعد بوو سپایەکی بەهێزی بەفەرماندەیی جەریر کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی نارد بەرەو حەلەوان... ئەم جەریرە لە سەرەتادا دووچاری شەڕ و بەرەنگاری سەخت بوو لەلایەن

میهرانی سەرداری حەلەوانەوە، بەڵام پاشان بەرێککەوتن و ئاشتی حەلەوان داگیر کرا و، عەزرە کوڕی قەیس کوڕی غەزیەئی بەجەلی کرایە فەرمانڕەوای و، سپای ئێران کشایەوە بەرەو تەنگەی پاتاق کە بەلاتینی پێی ئەوترێ (زاگری پوڵای) واتە کلکەی (زاگروس) و عەرەب پێی ئەڵێن عەقەبەی حەلەوان و کوردەواری پێی ئەڵێن پاتاق، چونکە نزیکی تاق گرایی سەردەمی ساسانییە و، هەستیاری نەمری کورد مامۆستا ئەسیری، لە پارچە هەڵبەستێکیدا کە لامان نییە ئەڵێ:

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تو سەیرانت دەوێ

بت بەمە پاتاق ئەگەر ئاثاری ساسانت دەوێ

ئەمە وەها و موستەوفی قەزوینی لە (نوزهەت القلوب)دا ئەڵێ: حەلەوان ئەکەوێتە ئیقلیمی چوارەمی جوغرافییەوە و، یەکێکە لە حەوت شاری بەناوبانگی عێراقی عەرەب و، ئەمڕۆکە وێرانەیە تەنیا ئەوەندەی داڵیە و مەزرایەکی بەئاوەدانی ماوەتەوە سی دێی بەدەورایە، گۆڕی زانای بەناوبانگ حەمزە کە یەکێ بووە لە حەوت زانای بەناوبانگی زانیاری تەجویدی قورئان لەوێیە و، ئەم شارە لەلایەن قوبادی کوڕی فەیروزی ساسانییەوە دروست کراوە. ئەمە وەها و زۆر سەیرە کە موستەوفی لەلایەکەوە بڵێ: قوبادی ساسانی دروستی کردووە و، لەولاوە بڵێ یەکێکە لە حەوت شاری بەناوبانگی عێراقی عەرەب... لەگەڵ ئەوەشدا کە جوغرافیانووسانی پێش ئەو هەموویان باوەڕیان وایە کە حەلەوان لەسەر چیا دەژمێررێ... واتا ئەکەوێتە بەر کوردستان و عێراقی عەجەم، ئەم شاری حەلەوانە ٨ قەڵا و باروی زۆر سەختی هەبووە و، ٨ دەروازەشی هەبووە بۆ چوونە ناو شار و مزگەوتێکی جومعەی زۆر گەورەشی تیا بووە. جولەکەش لە دەرەوەی قەڵا و باروەکاندا پەرستگایەکیان هەبووە... گوێگرانی بەڕێز ببورن کاتی بەرنامەکەمان تەواوبوو، شەوتان باش و تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥١/١٢/٧

٧/ رەشەمێ/٢٦٧٣

**وتاری: ٥٨**

گوێگره خۆشەویستەکان شەوتان باش! ئاواتی ئێمە شادی و کامەرانیی ئێوەی بەرێزە. لەم وتارەشدا ئێمە لەسەر باسی حەلەوان دەڕۆین... (بەطلەمیوس Batlamus)ی جوغرافیانووسی کۆن لە کتێبەکەیا ناوی حەلەوانی بردووە و ئەڵێ حەلەوان، لە باری جوغرافییەوە ئەکەوێتە پلەی ٧١ی درێژایی و ٣٤ی پانایییەوە... و زۆر لەسەر باسەکە ئەڕوات تا ئەڵێ: حەلەوان لە ئیقلیمی چوارەمی جوغرافی دایە و، کانی و چاوە ئاوی گۆگردیی زۆرە کە ئەوان بۆ زۆر دەرد و نەخۆشی سوودی لێ وەردەگرن، بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ: ئەوەی کە مێژوونووسانی عەرەب داویانەتە قەڵەم گۆیا بەناوی حولوان کوڕی ئیلحاف کوڕی قوزاعەوە ناونراوە، کە ماوەیەک لەوێ فەرمانده بووە... ئەو لافەی ئەوان زۆر بێ بایەخ و بێ نرخ و لە ڕاستەقینەوە دوورە، ئەو شارە کوردە لەوە کۆنترە. ئێستە فەرموون گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

ئەوەبوو وتمان سالی ١٦ و، بەقسەی هەندێ، سالی ١٩ی کۆچی ئەم شارە بەئاشتی و ڕێککەوت، کەوتە ژێردەستی سپای ئیسلامەوە و، نازانین پاش ئەوە بەوردی چی تیا رووی داوە. لە سەردەمی یەزید کوڕی مەعاویەدا، کابرایەک دانراوە بەفەرماندەی حەلەوان و هەرێمی لوڕستان، ناوی کەثیر کوڕی شیهاب کوڕی حوصەین بووە، یەکێ بووە لە دوژمنانی سەرسەختی بنەماڵەی ئیمامی عەلی. ئەم کابرایە نەتەنها حەلەوان بەڵکو (ماسەبزان - میهرجان کوچک - نەهاوەند)یشی هەر لەژێر دەستا بووە، بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە کوردەکان، لەو سەردەمەیدا، زۆرتر بنەماڵەی ئیمامی عەلییان خۆش ویستووە... ئەمە وەها و جگە لەوەی کە حەلەوان یەکێ بووە لە شارە هەرە گەورەکانی ئەو سەردەمەی چیا، وا دیارە خەڵقەکەی زۆر شارستانی بوون، تا ئەندازەیێ کە لە شارەکەدا کاروانسەرای زۆر بۆ بێگانە هەبووە و، کەسیان ڕێ نەداوەتە ناو ماڵ و منداڵیان.

موزیک

کابرایەکی شایەری عەرەب لەسەر ئەمە، سەرزەنشتی خەڵقی حەلەوانی کردووە، ئێمە یەک فەرد لە پارچە هەڵبەستەکەی هەڵئەبژێرین کە ئەڵێ:

(قَومٌ إذا ما أتَى آلأضَيافُ دارَهُمُ
لَمْ يُنْزِلوهُمْ، وَدَلوهُمْ إلى (آلخانِ))

له سەردەمی عەبباسیدا حەلەوان، کە لەپاڵ چیادا و، لەسەر ڕێی (ڕەی) بوو، هاوینەهەوار و، جێی ڕاووشکاری خەلیفە و کاربەدەستانی گەورەی دەوڵەت بوو. بەهۆی پارچە هەڵبەستی کابرایەکی عەرەبەوە کە ناوی (موطیع) بووە چیرۆکێکی سەیر بۆ حەلەوان ڕێکخراوە. (موطیع) کارمەند و مووچەخۆر بووە لە شاری (ڕەی) تەنیا بووە و، کارەکەرێکی زۆر جوانی هەبووە، کاتێ فەرمانیان داوە بەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەغدا داوای لە کارەکەرەکەی کردووە لەگەڵی بڕوات، نەچووە، لەم جیابوونەوەیە زۆر دڵگیر و پەست بووە.

موزیک

له ڕێ کە هاتووە بەر لە کاروانەکە گەییوەتە تەنگەی حەلەوان لەوێ لەسەر کانییەک کە دوو دار خورمای پێکەوە نووساوی دیوە، لەتاو کەنیزەکەی کەوتۆتە هەنسک دان و گریان و، لە داخی جیابوونەوەی لەو کچە کە ناوی (گۆردایە) بووە پارچە هەڵبەستێکی دووردرێژی وتووە؛ ئەم هەڵبەستەی کە ئەڵێ:

[وَآعْلَما إن بَقِيتُما أنَّ نحساً
سَوفَ يَلْقاكُما فَتَفرَقانِ]

[ئەی دوو دار! چاک بزانن! ئەگەر بمێنن یەکێکی شومی نالەبار، لەمەوپاش تووشتان دێ و، بەهۆی ئەوەوە لە یەک جیا ئەبنەوە].

بەڵێ! ئەم دوو دارەی حەلەوان بۆتە سەرمایەی سروشتی زۆر لە هەڵبەستیارانی ئەو سەردەمە و هەر کەسە چەند هەڵبەستێکی بەعەرەبییا وتووە... بەڵام چونکە ئەم پێشبینییەی موطیع هاتۆتە دی، بەنرخەوە سەیری هەڵبەستەکانی کراوە... چیرۆکی بەسەرهاتی ئەم دوو دارە وەکو یاقوتی حەمەوی لە (موعجیم البولدان)دا بۆمان ئەگێڕێتەوە بەم جۆرەیە: پاش موطیع بەسالان، مەهدیی خەلیفەی عەبباسی بەوێدا ڕائەبووری، دەستوور ئەدا لەسەر ئەو کانی و ئاوە و، لەژێر ئەو دارە خورمایەدا یاوەران کۆڕێکی (مەی و نەی) گەرم بکەن و، دەنگی ساز و ئاواز بەرز بکەنەوە... هەرکە مەهدی بەنەشئەی جۆگە و جویەبار و چیای سەوزی کوردستان سەرمەست ئەبێ، دەستوور ئەدا کە ئەو دارانە ببڕن، چونکە سەرەڕێیان گرتووە... بەڵام لەو حەلەدا یەکێ لە کەنیزەکە دەنگ خۆشەکان

بەنەغمەیەکی جوان ئەم هەڵبەستە ئەخوێنێتەوە:

[وَآعْلَما إنْ بَقيتُما أنَّ نحساً
سَوفَ يَلْقاكُما فَتَفرَقانِ]

مەهدی عەبباسی کە گوێی لەم هەڵبەستە ئەبێ، پەشیمان ئەبێتەوە و، ئەڵێ: نامەوێ مێژوو ناوم بەکابرایەکی شوم و نالەبار بداتە قەڵەم... پاش مردنی کە هارون ڕەشید هاتە سەر تەختی خەلافەت و، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەیەویست گەشتێ بەوڵاتەکانی ژێردەستیدا بکات، بڕیاری دا بچێتە ڕەی و لەوێوە بڕوات بۆ توس و خوراسان، کە گەیشتە حەلەوان تووشی نەخۆشیی (جۆشی خوێن) بوو. پزیشکەکەی بڕیاری دا (جومار) بخوات، جومار بەعەرەبی بەو کڕۆکە دار خورمایە ئەڵێن کە ئەکەوێتە تەپەڵاکی و، هەر ساڵە لە کاتی دار ئاوسا ئەچنە سەردارەکە و ئەو جومارەکە وەک (مەمەک) وایە تۆوی خورمای بەسەردا ئەڕێژن کە بەر بگرێ... جا لەبەرئەوەی کە لەو ناوە دار خورمای نزیک نابێ ئەنێرن یەکێک لەو دارانە ئەبڕن... پاشان کە هارون ڕەشید ئەگاتە تەنگەی حەلەوان و دارەکەی تر دەبینێ، سەرنج ئەدا تۆزێکی تاشراوە و لووس کراوە و، ئەم هەڵبەستەی موطیعی لەسەر نووسراوە... هارون ڕەشید لەو کارە زۆر پەشیمان ئەبێتەوە کە بەر پێشبینییەکەی موطیع کەوتووە و ناوی بەشوم ئەدرێتە قەڵەم، ئەمە وەها و ئەم حەلەوانە لە ساڵی حەوت سەدی کۆچی بەدواوە تا ئەمڕۆ وێرانەیە. هۆی وێرانیش شاڵاوی مەغۆل و بوومەلەرزەیە. سەرچاوەی ئاوی حەلەوان لە تەخت گەڕایەوە دێ و لەوێوە ئەکشێ و دەشتی عەلی گوردە ئاو ئەدات و لە دەربەندی پێشکانەوە ئەڕوات بەرەو دەشتی سەرپێڵ و قەسری شیرین و لە خوار خانەقینەوە تێکەڵی ئاوی سیروان ئەبێ. دەوروبەری ئەو ناوە لە عێل و تیرەی کاکەیین...

گوێگرانی خۆشەویست بەرنامەکەمان لێرەدا تەواوبوو شەوتان خۆش.

١٣٥١/١٢/١٢

١٢/ڕەشەمێ/٢٦٧٣

**وتاری: ٥٩**

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بەئاواتەخوازی پێشکەوتن و سەرکەوتنتانین لە ژیانا، ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی (حەلەوان) دەڕۆین. ئەم شارە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا یەکێ بووە لە شارەکانی ژێردەستی فەرمانڕەوایی حەسەن وەیهی کوردی بەرزیکانی... کە حەسەن وەیهی کوڕی حوسێن دامەزراندبوو، پاش مەرگی حەسەن وەیهی حەلەوان لەگەڵ ئەو دوای ولاتدا مایەوە بۆ بەدری کوڕی، کە پیاوێکی گەورە و دلێر بوو و، دەوڵەتی ئال بویە لە تەنگانەدا، هاواریان بۆ ئەبرد. پاش کۆچکردنی بەدر حەلەوان مایەوە بۆ هیلالی کوڕی، پاش ئەو بۆ تاهیری کوڕی هیلال ئنجا بۆ بەدر کوڕی تاهیر کوڕی هیلال... لەم ماوەیەدا کە نزیکەی سەد و پەنجا ساڵی خایاند، زۆرجار دەوڵەتی ئال بویە ئەیویست ولاتەکەی ژێردەستی بنەماڵەی حەسەن وەیهی داگیر بکات و چەند جارێ شەڕیش لە نێوانیا قەوما، بەڵام هەرێمی کوردە حەسەن وەیهییەکان چیای سەخت بوو، هەمیشە لە هەمەدانەوە تا ئەهوازیان، زۆر مەردانە بەڕێوە ئەبرد و، هەر بەناو خۆیان بەخەلافەتی عەبباسی و حکومەتی ئال بویەوە ئەبەست، ئەبولنەجم ناسرلدەولە بەدر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا، شاری حەلەوانی سپاردبوو بەئەبولفەتح کوڕی محەمەدی کوڕی عەییاری سەرداری عێلی شا زەنگانی، ئەم ئەبولفەتح محەمەدە لە ساڵی ٤٠١ کۆچییەوە تا ساڵی ٤٢١ی کۆچی سەرۆکی شاری حەلەوان بوو... پاش خۆی ئەبولشەوکی کوڕی و، پاش ئەو کوڕی دووەمی کە ناوی موهەلهەل بوو، هەموویان هەر سەرۆکی شاری حەلەوان بوون، بەڵام ئەبوماجید موهەلهەل کە پیاوێکی دلێر و ئازا و چاو لە بەرزی بوو، هەرکە دەوڵەتی ئال بویە ڕووخا و دەوڵەتی سەلجووقی جێی گرتەوە، زوو چووە لای توغروڵ بەگی سەلجووقی دامەزرێنەری دەوڵەتەکە و، خۆی خستە ژێر فەرمانی و، دژی ئاخرین فەرمانڕەوای حەسەن وەیهی کە بەدر کوڕی تاهیر کوڕی هیلال بوو -کە سەردارانی برادۆست بەنەتەوە ئەچنەوە سەر ئەو- شۆڕشی هەڵگیرساند و، بەسەریا زاڵ بوو و ڕای ڕفاند و دینەوەری پایتەختی لێ داگیر کرد... ئیبراهیم یەنالی برا بچووکی سوڵتان توغروڵ کە پشتیوانی لەم بەدرە ئەکرد، داڵدەی دا و کردی بەسەرۆک و فەرمانڕەوای کرمانشاه و دەوروبەری و، لەشکرێکی زۆریشی دایێ کە ولاتەکەی لە ئەبو ماجید موهەلهەلی عەییاری وەربگرێتەوە... بەڵام موهەلهەل دلێر و ئازا و نەبەرد بوو، لەشکرێکی باشی

ئامادە کرد و، کەوتە شەڕ لەگەڵ بەدردا و بەسەریا زاڵ بوو و، کرماشانیشی لێ داگیر کرد. و تا ساڵی ٤٣٣ کۆچی لەژێر دەسیا بوو. پاشان سەعدی کوڕی ئەبولشەوکی برازای کە سەرداری هەرێمی (بەندەنیجین) بوو -واتا مەندەلیی ئەمڕۆ، کە مێژوونووسە فارسەکان پێی ئەڵێن (مەرزەلیج)- بەهانەهانەی ئیبراهیم یەنال و بەلەشکری غەزی تورکەوە لێی ڕاپەڕی و لێی داگیرکرد، وتاری ڕۆژی هەینی (واتا خوتبەی جومعە)ی بەناوی ئیبراهیم یەنالەوە خوێندەوە، بەڵام موهەلهەل لەوە نازاتر بوو، کەسێ هەقی بخوا وەیا وڵاتی داگیر بکات لەشکرێکی پێکەوە نا و، حەلەوانی لە سەعدی وەرگرتەوە... پاش ماوەیەک دیسانەوە سەعدی بەلەشکرێکی زۆرەوە دایەوە بەسەر حەلەواندا و، بەم شاڵاوە ناکاوە توانی هەم حەلەوان داگیر بکات و هەم موهەلهەل بەدیل بگرێ... بەڵام سەرگوزەشتی موهەلهەل پاش ئەوە دییار نییە. ڕەنگە لە زیندانا مردبێ، هەلەوان پاش ئەمە ماوەیەک لەژێردەستی سەعدیدا مایەوە. ئەمە وەها و تا دەورانی موهەلهەل سەرداریتیی بەنی عەییار لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی حەسەن وەیهیدا بوون. بەڵام موهەلهەل توانی حەسەن وەیهی لەناوبەرێ و بەم جۆرە توانی فەرمانڕەوایی عەییاری دابمەزرێنێ. پاش موهەلهەل حەلەوان و شارانی تری ژێردەستی فەرمانڕەوایی حەسەن وەیهی مایەوە بۆ فەرمانڕەوایی عەییاری سورخابی کوڕی محەمەدی عەییاری، برای موهەلهەل و، سەعدی کوڕی ئەبولشەوکی برای و، سورخاب کوڕی بەدر کوڕی موهەلهەل و ئەبو مەنسووری کوڕی بەدر، توانییان نزیکی سەد و سێ ساڵ حەلەوان و شارەکانی تری کوردەواری تا دەوروبەری بەغدا بەڕێوەبەرن. و لە سای ئەمانەوە، ئەو ناوە لەوپەڕی خۆشی و هاتدا بەسەر ببەن، لەم سەردەمە بەدواوە، ئیتر حەلەوان کەوتە بەر شاڵاوی مەغۆل و، خەڵقەکەی تەرتەوەرتە بوون و، بوومەلەرزەش، ساختمان و خانووبەرەکانی ڕووخاند و تا ئەمڕۆکە هەر بەوێرانی ماوەتەوە. بەڵام هەر لەم دەوروبەرەدا لە (دەرتەنگ)ی حەلەوان سەرداریتییەکی بەهێزی کورد پێک هات کە ئێمە سەرگوزەشتی ئەو فەرمانڕەوایی و سەرداریتییە ئەهێڵینەوە بۆ باسی (دەرتەنگ).

ئەم حەلەوانە زۆر هەستیار و نووسەر و زانای پێ گەیاندووە کە هەموویان بەرهەمی خۆیان بەعەرەبی پێک هێناوە. خەتیبی بەغدای لە مێژووەکەیا و، ئیبن خەلەکان، لە (وەفەیات الئەعیان)دا و، زۆری تر لە مێژوونووسەکان، ناوی ئەو زانایانەیان هێناوە یەکێ لەوان فەرمایشەوانێکی (واتا مُحَدِّث)ێکی زۆر مەزن بووە و بەناوبانگ کە خاوەنی (صحیحی بوخاری) و خاوەنی (صحیحی موسلم)، هەردووکیان هەم لەلایان خوێندووە

و، هەم لە زبانی ئەوەوە فەرمایشیان، تۆمار کردووە، دوور نییە ئەدەبی گۆرانی، کە لە زۆر کـۆنەوە ئەدەبی یەکگرتووی کـۆنی کـورد بـووە، لەوێ باوبووبێ... بەڵام بەداخـەوە ئێـمـە شوێنەواری کۆنمان لەدەس چووە و هەمـووی لە شاڵاوی تاتار و مەغـۆل و دەورانی ترا... بەر تاڵان و سووتان کەوتووە...

گـوێگرە بەڕێزەکـان لێـرەدا کـاتی وتارەکـەمـان تەواو بوو تا وتاری ئاینندە بەخـواتان ئەسپێرین و، کاتێکی خۆشتان بۆ داوا ئەکەین شەوتان باش.

١٣٥١/١٢/١٤

١٤/ڕەشەمێ/٢٦٧٣

**وتاری: ٦٠**

## قەڵای حەسەن ئاوا

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش! خۆشی و کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامەکانی ڕادیۆی کوردیی ئێرانە. ئێمە ئەمشەو باسی قەڵایەکی کۆنتان بۆ دەکەین، کە ڕۆژگاری سەختترین قەڵای خۆرئاوای ئێران بووە، ئەم قەڵایە ناوی حەسەن ئاوا بووە و، مێژووە فارسییەکان بە(حەسەن ئاباد) تۆماریان کردووە، ئەم قەڵایە، ئەکەوێتە شەش کیلۆمەتری شاری سنەی ئێستەوە. جگە لەم قەڵایە، لە زۆر جێگەی تری کوردنشینی ئێراندا بەم ناوە قەڵای تری هەبووە، دوور نییە، ناوەکەیان لە سەختی و قایمی ئەمەوە وەرگرتبێ. پاش گوێدانە موسیقایێ بەتانی باسەکەدا ئەچین.

موزیک

قەڵای (حەسەن ئاوا)، پێش ئەوەی سنە ببێ بە شار و قەڵا، جێی سەردارانی ئەردەڵان بووە و، مێژووی دامەزرانی ڕوون نییە ڕەنگە لە سەردەمی حەسەن کوڕی خدری سەرداری ئەردەڵاندا بۆ بەرگری لە شاڵاو و هەڵمەتی تاتار و مەغۆلەکان دامەزرابێ... هەر لەبەرئەمە ئێمە بۆ زانینی بەسەرهاتی ئەم قەڵایە، گەلاڵەی ئەو باسە دووروودرێژانەتان بۆ دەگێڕینەوە کە ئەسکەندەر بەگی تورکمان دانەری (عالەم ئارای عەبباسی) و ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی خێوی (شەرەفنامە) و ماە شەرەفخانمی ئەردەڵانی نازناوی (مەستوورە) دانەری (تەئریخی ئەردەڵان) نووسیویانە ئەڵێن: ساڵی ٩٨٦ تەیموورخان کوڕی سوڵتان عەلی کوڕی سورخاب بەگی ئەردەڵانی، پاش کۆچی دوایی مامی کە ناوی بیسات بەگی کوڕی سورخاب بەگ بوو، ڕووی لە دەوڵەتی سەفەوی وەرگێڕا و، خۆی کرد بەدۆستی سوڵتان مورادی عوسمانی لەبەرئەوەی کە پیاوێکی چاونەترس بوو، سوڵتانی عوسمانی کەوتە هاندانی و، نازناوی میری میران و پاشایی دایێ. تەیموورخان هەڵی کوتایە سەر سونقور و دینەوەر و خستییە سەر ئەردەڵان و شارەزوور، کە تەمەنی چوو بەساڵا، پێش هەموو شت وڵاتەکەی ژێردەستی بەش کرد لە نێوانی هەر چوار کوڕەکەیا: (سنە، حەسەن ئاوا، قزڵجە، زەلم) شارەزووری دا بەسوڵتان عەلی کوڕە گەورەی و، هەرێمی قەرەداغی دایە بوداق بەگ و مەریوانیشی دایە موراد بەگ و شاربازێڕیشی دایە ئەمیر عەلەمەدین... پاش ئەم کارانە

ئنجا چاوی بڕیی پەرەدان بەولاتەکەی، کرماشان و زەرین کەمەر و گەڕوسیشی داگیر کرد و، چەند جارێکیش هەڵمەتی تیرە و عێلەکانی کەڵوڕی دا، کە ئەو حەلە سەرۆکیان عومەر بەگ -وەیا کوڕەکەی عومەر بەگ بوو- و هەموو ئەو ناوەی تالآن کرد... سەرداری کەڵوڕ هاواری بردە بەر شاهوێردی خانی سەرۆکی لوڕستان شاهوێردی خان دەماری هاوسێتی و، هاوڕەگەزی تیا هاتە جۆش و هێزێکی گەورەی لوڕی هێنا و لەگەڵ هێزی کەڵوڕدا تێکەڵ دایان بەسەر تەیموورخاندا، لە کاتێکا سپای تەیموورخان حەسابوونەوە و، خەریکبوون تالآنیان بەش ئەکرد... ئا لەم کاتەدا گەمارۆیان دان، دەرۆی ڕزگاریان لێ بەستن، تەیموورخان و هەموو پیاوماقوولانی ئەردەڵانیان بەدیل گرت و لەگەڵ خۆیان بردنیان بەرەو لای خۆیان. بەڵام شاهوێردی خان و عومەر بەگ زۆر لەوە پیاوتر و جوامێرتر بوون، کە تەیموورخان لەناوبەرن، پاش چەند ڕۆژێ گلدانەوە و میواندارای بۆ کردن و، دڵدانەوە تەیموورخان و یارانیان ئازاد کرد و بەناز و فیزەوە بەرێیان خستنەوە بەرەو ئەردەڵان... بەڵام تەیموورخانی لەخۆبایی و خۆپەسەند لەوە پتر بەرزەفڕ بوو، کە بەم جۆرە شکستە تەمێ خواربێ، ساڵی ۹۹۸ کۆچی سپای کۆکردەوە و دای بەسەر (زەرین کەمەر)دا، کە یەکێ بوو لە قەڵا سەختەکانی ژێردەستی دەوڵەتیار سوڵتانی سیامەنسوور...دەوڵەتی سەفەوی بەم شالآوەی زانی، زۆر زوو سپایەکی قزڵباشی نارده فریای دەوڵەتیار خان. بەڵام هێزی سیامەنسووری و سپای قزڵباش لەبەر شالآوی هێزی ئەردەڵاندا خۆیان ڕانەگرت، شکان و کشانەوە خۆیان لە قەڵای قایمی زەرین کەمەردا قایم کرد.

تەیموورخان بڕیاری لەسەر ئەوە دابوو کە قەڵای زەرین کەمەر داگیر بکات، هەڵمەتی قەڵاکەی دا... بەڵام بەمراز نەگەیشت گوللەی قەڵاوانان و دژوانان پێکای... لەشکرەکەی دایانە زاری و زایەڵە... و تەرمەکەیان بردەوە بەرەو ئەردەڵان.

پاش ئەم تەیموورخانە هەڵۆ خانی کوڕی لە جێی بوو بەفەرمانڕەوای ئەردەڵان و، قەڵای حەسەن ئاوای بەجۆرێکی سەخت و قایم ڕێکخست... ئەم کارەی و سەرشۆڕنەکردنی بۆ فەرمانی دەوڵەتی سەفەوی شا عەبباسی شڵەژاند جا بەپەنامەکی حوسێن خانی سەرۆکی لوڕستانی هان دا، کە سپا بنێرێ بۆ سەر هەڵۆ خان و، قەڵای حەسەن ئاوا، بەڵام کە شالآوی کرد، شکستی خوارد... نەوەک هەر هێزی لوڕستان، بەڵکو هێزی قزڵباشیش... ئنجا شا عەبباس لەم بارەوە ڕاوێژی لەگەڵ ئالی بالی خانی زەنگەنە کرد، کە هەم پیاوێکی ژیر و زرنگ بوو، هەم شارەزای کاروباری کورد بوو... با لەبیریشمان نەچێ، ئا لەم ماوەیەدا خان ئەحمەد خان کوڕی هەڵۆ خان لە دەرباری شا عەبباسیدا بوو لە ئەسفەهان

و لەوێ هەم دەیخوێند و، هەم وەکو کوڕانی سەرداره کوردەکانی تری مەشقی سپایی و سەرداریێتی دەکرد. جا ئالی بالی خان داوای لە شا عەبباس کرد کە بەهۆی خان ئەحمەد خانەوە چاری هەڵۆ خان بکات. شا عەبباس بیروڕای ئالی بالی خانی زەنگەنەی پەسەند کرد، زەرین کڵاوی خوشکی خۆی مارە کرد لە خان ئەحمەد خان و پاشان داوای لێ کرد بچێتەوە بۆ ئەردەڵان و کاروباری لە دەس باوکی وەربگرێ و خۆی ببێت بەفەرمانڕەوا... ڕێکەوتیش وەهابوو کە هەڵۆ خان و خانمیش زۆر بیروەسەی کوڕەکەیان دەکرد و، نامەیان نووسیبوو کە خان ئەحمەد بێتە دیتنیان. جا خان ئەحمەد خان هات و ماوەیەک مایەوە و، خەڵات و دیارییەکی زۆری بڵاوکردەوە بەسەر فەرماندە و یارانی باوکیدا...

تا ڕۆژێ کە هەڵۆ خان بەهۆی چاو و سیخوڕەکانییەوە بەم ڕازەی زانی، لەسەر ئەوە خان ئەحمەدی کوڕی لە قەڵای حەسەن ئاوا دەرکرد... بەڵام خان ئەحمەد خان نەگەڕایەوە بۆ ئیسفەهان و بەدزییەوە کەوتە کنەکردن و نامە گۆڕینەوە لەگەڵ دایکی و هاودەسەکانی، هەرکە ڕۆژێ هەڵۆ خان بۆ ڕاوشکار لە قەڵای حەسەن ئاوا هاتە خوارەوە خان ئەحمەد خان هەلی پەیدا کرد و لەگەڵ هاودەسانیدا قەڵاکەیان داگیرکرد و، هەڵۆ خانیان نارد بۆ لای شا عەبباس و لەوێ مایەوە تا لە تەمەنێکی نەوەد ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. ئەوەی ڕاستی بێ خان ئەحمەدخان خۆیشی هەر لە سای قەڵای سەختی حەسەن ئاوا و خۆی ڕاگیر گرت و، سنووری ئەردەڵانی پەرەپێدا، تا شارەزووریشی خستە ژێر دەستی خۆیەوە، هەروا کە توانی ماوەیەک سەر بۆ دوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی شۆڕ نەکات... بەڵام پاش مەرگی خان ئەحمەد خان ئەم قەڵای حەسەن ئاوایە لەسەر فەرمانی شا سەفی سەفەوی چۆڵ کرا و، بەهۆی سلێمان خانەوە وێران کرا. و شاری سنەی ئەمڕۆ لە لایەن سلێمان خانی ئەردەڵانەوە کە لەوەبەر دێیەک و قەڵایەکی بچووک بوو بەسەر سنگی لا پاڵێکەوە، کرا بەناوەندی فەرمانداریی ئەردەڵان، وشەی (غمها) کە ئەکاتە ١٠٤٦ دانرا بەمێژووی دامەزرانی سنە. مەستوورە خانمی ئەردەڵان دەڵێ: لە سەردەمی ئەمانوڵڵاخاندا کە لە ساڵانی ١٢١٤-١٢٤٠دا فەرمانڕەوای ئەردەڵان بوو و باڵیۆزەکانی ڕووس و ئینگلیز ئەهاتن بۆ دیتنی شوێنەواری قەڵای حەسەن ئاوا و سەریان سووڕئەما، لەو قەڵا سەختە بەکەشکەڵانا چووە، ئەمە وەها و گومان وایە کە بەخشی حەسەن ئاوای ئێستەی دەوروبەری شاری سنە کە ٦٢ دێی هەیە، بۆ یادی ناو ئەو قەڵایەی ئەمە وەها و تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥١/١٢/٢١

## وتاری: ٦١

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی (ولاتەکەت باشتر بناسە) کامەرانیتان هیوا و ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەکانی بەشی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە. ئێمە لەم بەرنامەیەدا باسی (خوڕەم ئاوا)تان بۆ دەکەین. کە ئەمڕۆکە ناوەندی فەرمانداری گشتی لوڕستان و پێشکۆیە و، ئەکەوێتە دۆڵێکی کپی سەوز کە بەم چیایانە گەمارۆ دراو (تاف - مەخمەل - یاختە - شایەنشا) و ڕووبارێکی باریک بەناوەندیدا ڕائەبووری و، شارەکە ئەکەوێتە لای خۆرهەلات و لای خۆرئاوای ڕووبارەکەوە... جارێ با گوێ بدەینە موسیقایێ، ئنجا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

موزیک

هەندێ لە مێژوونووسانی خۆرئاوایی خۆرهەلاتناس و، موشیرلدەولە پیرنیاش لایان وایە ئەم خوڕەم ئاوایەی ئێستە نزیک بەشوێنەواری کۆنە شاری خایدالوی کاسی و عیلام دامەزراوە و، ئەوەش ئەزانین کە خایدالو یەکێک بووە لە چوار شارە بەناوبانگەکانی عیلام... بەلام لەگەل ئەوەشدا کە گومان دەکرێ شاری خوڕەم ئاوا پێش ئیسلام هەر بووبێ، نە مێژوونووسانی یۆنانی و نە مێژوونووسانی سەرەتای ئیسلام، کە بەزمانی عەرەبی شتیان نووسیوە، باسیان لێ کردووە... فیردەوسی توسی، هەستیاری ناودار و مەزنی ئێرانی، زیندووکەرەوەی زبانی فارسی، لای وایە کە ئەم خوڕەم ئاوایە لە لایەن شاپووری ساسانییەوە کە عەرەب پێی ئەلێن ذولئەکتاف دروست کراوە و، لەم باسە ئەدوێ ئەلێ: (کرا؟ خرّم آبادید نام شهر ! ازآن بوم خرّم کرا بود بهر؟) و لە جوغرافیانووسانا، ئیبن خوردادبەی خێوی (مەسالیک المەمالیک - مسالك الممالك) ناوی خوڕەم ئاباد دە با، ئەلێ: کەوتۆتە نێوانی کەرەجی لوڕستان و سەیمەرەوە، ئەشێ مەبەستی ئەم خوڕەم ئابادە نەبووبێ و، هەروا حەمدوللا موستەوفی قەزوینیش لە (نوزهەت القلوب)دا، خوڕەم ئاباد ئەبەستێ بەساوەوە... و ناوی خوڕەم ئابادی ئێستەی ناوە خورماباد و لە لاپەڕە ٧٨دا ئەلێ: (خۆرەم ئاوا شارێکی باش بووە، ئێستە وێرانەیە، خورمای زۆرە.).

بەم قسانەی موستەوفیدا بۆمان دەرئەکەوێ کە ناوەکە (خورماباد)ە و، لە زۆری باغی ئەو ناوە، بەو دۆلە وتراوە (خورماوا)... ئەم گومانەش زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە، هیچیەک لە سەرداران و ئەتابەگانی لوڕی گەورە و لوڕی بچووک، نە ناویان و، نە نازناویان

(خورەم) نەبووە... ئەم شارە گەرچی شوێنەکەی دۆڵ و نەوییە و بەکێو و چیا دەوری تەنراوە، بەڵام چونکە زۆرتر جێی سەرداران و ئەتابەگانی لوڕ بووە، گەلێ جار بەر شاڵاوی دوژمن کەوتووە و، خراوکراوە و، ساڵەها بەوێرانی ماوەتەوە. (نوزهەت القلوب) کە لە دەوری مەغۆل بەدواوە، نووسراوە وای تۆمار کردووە کە شارەکە وێرانە بووە، پاش ئەو، بەماوەیەک شەرەفەدین عەلی یەزدی لە لاپەڕە ٤٢٠ بەرگی یەکەمی (ظەفەرنامە)دا ئەڵێ: «ئەمیر تەیموری لەنگ، کە تێگەیی مەلیک عیزەدینی لوڕ سەردانانەوێنێ هەڵی کوتایە سەر خورەم ئاوا و فەرمانی دا بەعومەر شێخی کوڕی، بەسپایەکەوە بکەوێتە دوای مەلیک عیزەدین و بیگرێ... ئەمیر عومەر شێخ هەموو وڵاتی لوڕستانی دایە ژێر سمی ئەسپەوە تا گەیشتە قەڵای مەنگرە بەڵام مەلیک عیزەدینی بەرچنگ نەکەوت و، کەس نەیدەزانێ لە کوێ خۆی شاردۆتەوە و، سپای تەیموور هەموو وڵاتەکەیان تاڵان کرد و، ئاگریان بەردا لە هەرێمەکە و، شار و دێیەکانیان وێران کرد، بەڵام بەقسەی ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی لە لاپەڕە ٦٧ی شەرەفنامەدا، کە هاوباوەڕە لەگەڵ موعینەدین نەتەنزی خێوی (مونتەخەب التەواریخ)دا کە لە لاپەڕە ٦٥ دایە ئەڵێن: مەلیک عیزەدین کوڕی شوجاعەدین مەحموودی سەرداری لوڕستان، بوو بەزاوای شا شوجاع موزەفەری پادشای فارس، وەها و زاوای سوڵتان ئەحمەدی جەلایری فەرمانڕەوای بەغدا... لەسەر ئەمە ئەمیر تەیموور گورگان ڕقی لێ بەستبوو، دای بەسەر خورەم ئاوا و پاش گەمارۆدانێکی دووردرێژ داگیری کرد و، مەلیک عیزەدینی گرت و ڕەهەنەی (سەمەرقەند)ی کرد و، سەیدی ئەحمەدی کوڕیشی نارده دێی ئەندکانی لای هەمەدان کە لەوێ لەناو سپادا بمێنێ و، فێری کاروبار و مەشقی سپایی بێ پاش سێ ساڵ هەردووکیان هێنانەوە خورەم ئاوا و، مەلیک عیزەدین فەرمانڕەوایی لوڕستانی گرتەوە دەست، بەڵام سەرچڵیی سەیدی ئەحمەدی کوڕی و، گوێ نەدانی بەدەسەڵاتی دوژمن... بوونە هۆی ئەوەی کە فەرماندەکانی ئەمیر تەیموور جارێکی تری هەڵ بکوتنە سەر خورەم ئاوا و مەلیک عیزەدین بگرن و، بیبەن لە شاری سوڵتانیە بیکوژن و، پێستی بکەنن و، پێستەکەی پڕ بکەن لە کا و لەوێ بیکەن بەدارا... ئا بەم جۆرە بوو کردەوەی ستەمکارانەی تەیموری لەنگ، پاش ئەوەی ئەمیر تەیموور مرد، ئەم سەید ئەحمەدییەی کوڕی مەلیک عیزەدین کە ١٣ ساڵی ڕەبەق لە چیاکانی لوڕستاندا بەرەنگاریی سپای تەیموری کردبوو، گەڕایەوە خورەم ئاوا و کاروباری گرتەوە دەست و، کەوتەوە ئاوەدانکردنەوەی وڵات و، تا ساڵی ٨١٥ کۆچی ژیا... پاش مەرگی، ئنجا براکەی -کە ناوی شا حوسێن کوڕی مەلیک

عـیـزەدین بـوو- هاتە جـێی و، سـەرداریتی وڵاتەکـەی گـرتە دەست و، کـەوتـە پەرەدان بەقەڵەمڕەوی ژێر دەسـەڵاتی و، کەوتە شـاڵاو بۆ سەر هەمـەدان و جوربادەقان -واتا گوڵ پایەگـان- و دەوروبەری ئەسـفـەهان... و ئەم پەلامـارەش لە خـولی خـۆیا بـوو، چونکە بنەماڵەی تەیموور -واتا کوڕ و کوڕەزا و برازاکانی- لێیان بووبوو بەئاژاوە و بشێونە لەنێو خۆیانا، نەیان ئەپەرژایە سەر یەکتر، چ بگاتە سەر لوڕستان. پاش ڕووداني قەوماوەی ئەبو سەعید گورگان، هەمەدان و دەوروبەری هەموو خستە سەر لوڕستان و پەلاماری هەرێمی شارەزووریشی دا... لەو حەلەدا عـێلی بەهارلو گەورەترین عێل و، دەسـەڵاتداری ئەو ناوە بوو... تەنانەت سەردارەکەی کوێر پیر عەلی شوکور جا ئەم سەردارە، لە تاڵان و بڕۆی شا حوسێن هاتە تەنگ و، لە جێیێکا خۆی دا لە بوسە و کوشتی ئەم ڕووداوە ساڵی ۸۷۳ی کۆچی ڕووی دا...

گوێگرە خۆشەویستەکان، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان خۆش.

**۱۳۵۱/۱۲/۲۶**

**۲۶/ڕەشەمێ/۲٦۷۳**

**وتاری: ٦٢**

گوێگره خۆشەویستەکانی ئەم بەرنامەیە، شەوتان خۆش، کامەرانیتان هیوامانە و، ئاواتەخوازین لەم ساڵی تازەیەدا بەئامانجەکانتان بگەن و بەرەو ژیانێکی خۆشتر و تێروتەسەلتر لە کار و کۆششا بن تەنانەت هاتی ساڵ لە بەهاری دیارە، جا کار لە ئێوە و پشتیوانی لە خوا. و با ئەوەشتان پێ ڕابگەیێنین، کە ئێمە لەم ڕیزە وتارەدا باسی شاری (خۆی) و بەسەرهاتی دەکەین و، پاش گوێدانە مۆسیقایی، لەسەر باسەکەمان دەڕۆین.

موزیک

با لە سەرەتادا بڵێین کە ناوی شاری خۆی ناوێکی کوردیی ڕووتە و، لەبەرئەوەیە کە وڵاتەکە خۆیڵێن و کانگای خوێی زۆرە و، بەزاراوەی کرمانجی ژووروو بەخوێ ئەڵێن خۆی، هەر لەبەرئەمەیە کە جوغرافیانووسانی عەرەبی کۆن ناوەکەیان بە(خووەی Khoway) تۆمار کردووە...

مێژوو بەبیریا نایێ کە شاری خۆی لە کەیەوە هەیە... تەنیا ئەوەندەیان وتووە کە ساڵی ٢٠ کۆچی بەدواوە لە لایەن عوتبە کوڕی فەرقەدەوە داگیرکراوە و، کەوتۆتە ژێر چنگی سپای موسوڵمانان... بەداخەوە لەو سەرچاوەیانەدا کە لەبەر دەستمانان پاش ئەوەی ناوی (خۆی) نەبراوە تا دەورانی سوڵتان جەلالەدین خوارەزم شا ساڵی ٦٢١ کۆچی کە ئەم سوڵتانە هەرێمی ئازەربایجانی داگیرکرد، فەرمانڕەوای ئەو ناوە ئەتابەگ ئوزبەگی مێردی کچەکەی سوڵتان توغروڵ سەلجووقی بوو و، ئەم کچە بەناوی مەلیکە بەناوبانگ بوو... هەرکە جەلالەدین وڵاتەکەی گەمارۆ دا، ئەم مەلیکەیە بۆ ئەوەی لە کوشتار و تاڵان ڕزگار بێ، نامەیەکی نووسی بۆ سوڵتان کە ئەو بێوەژنە و، لە ئوزبەگ تەڵاقی وەرگرتووە و، ئەیەوێ شوو بکاتە سوڵتان و، لە بەرابیدا تکای ئەوە دەکات ڕێی بدرێ کە ئازەربایجان بەجێ بێڵێ و بچێت بۆ گورجستان و لەوێوە خۆی ئامادەی بۆکێنی سوڵتان بکات. بەم جۆرە مەلیکە خاتون تەورێزی بەجێ هێشت و ڕووی کردە شاری خۆی بۆ ناو کوردەکان. سوڵتان جەلالەدین ڕووی کردە نەخچەوان و داگیری کرد و، لەوێ مەلیکە خاتوونی مارە کرد و، پاش مانگی ڕابواردن، لە خۆی لەشکربەزی کرد و بڕیاری دا هەموو گورجستان داگیر بکات، لە خۆیەوە ڕۆیشتە دوین. -زایەگای بنەماڵەی ئەیوبی- لەسەر سنووری گورجستان و، پاش داگیرکردنی وڵاتی جۆرجیا گەڕایەوە بەرەو وڵاتی ڕۆم -واتا ئاسیای

بچووک- کە لەو حەلەدا، لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەیوبیی شام و میسردا بوو... لەسەر سنوور، نامەی لەگەڵ سەردار و فەرمانڕەوا کوردەکانی هەرێمەکانی ئەخلات - موش - وان - دیاربەکر - خرتوپرت -کە ئەمڕۆکە پێی ئەوترێ خەرپووت- گۆڕییەوە و، هەموویانی بانگ کردە لای خۆی. و براکانی مەلیک ئەشرەفی ئەیوبی بەدیل گرت... بەڵام پاشان بەرەڵای کردن، موجیرەدینیان سەرۆکایەتی ئەعزازی گرتەوە دەست... لەم سەردەمەدا قاو گەرم بوو، کە جەنگیزخانی مەغۆل، بەسپای دڕندەی مەغۆلەوە بەرەو ئێران ئەکشێ، سوڵتان لەبەرئەوەی کە سنووری شەڕی پەرەپێدابوو سەری لێ شێوا. ساڵی ٧٥٨ کۆچی خۆی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی چوپانی و مەلیک ئەشرەف کوڕی تەیموورتاش، فەرمانڕەوای ئەو ناوە بوو، جانی بەگ خان قەفچاق شاڵاوی کردە سەری و بەسەریا زاڵ بووە لە خۆی کوشتی.

ساڵی ٧٨٧ کۆچی تەیموورخان گورگان کە بەناوی تەیمووری لەنگ بەناوبانگە، پاش ئەوەی لەگەڵ مەلیک عیزەدین شێری ئەمیری هەرێمی حەکاری کردبی بەشەڕ و قەڵاچۆی خستە نێو کوردانی ئەو ناوە و، پاشان بەئاشتی هەرێمەکەی خستە ژێردەستی مەلیک عیزەدین و، ڕووی کردە خۆی و سەلماس پاش ئەمە، کە عوسمانی دەسەڵاتیان پەیدا کرد و دەوروبەری وانیان خستە ژێردەستی خۆیانەوە سوڵتان مورادی یەکەم (خۆی)ی خستە سەر وڵاتی وان و دای بەسەید محەمەد زاهید بەگی ئەوەی مەلیک عیزەدین شێری حەکاری... ساڵی ٨٧٣ کۆچی خۆی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی قەرەقویونلو... هەرکە جیهان شای کوڕی قەرە یوسف مرد، بیگم خاتوونی ژنی ویستی حەسەن عەلی کوڕی لە جێی ئەو دانێ بەسوڵتان... بەڵام لەبەرئەوەی کە لە سەردەمی باوکیدا دوورخرابووە و، خرابووە زیندان، لەم کارەدا سەرنەکەوتن و، لە خۆی کوژرا. پاشان کە ئاق قویونلو بەسەر قەرەقویونلودا زاڵ بوون و پایتەختیان لە دیاربەکرەوە گوێزایەوە تەورێز، ساڵی ٨٨٣ کوڕەکانی سوڵتان حەسەنی درێژ لەناو خۆیانا لێیان بووە شەڕ، یەعقوبیان بەسەر خەلیلی برایدا زاڵبوو، لە شەڕێکا کە لە لێواری ڕووباری خۆی ڕووی دا و، لەوێدا کوژرا... ساڵی ٩١٠ کۆچی شا ئیسماعیلی سەفەوی ڕووی کردە نورمیە -واتا ڕەزائیەی ئەمڕۆ-... بۆ سەر پێ شۆڕکردنی کوردەکان و، دامرکاندنی شۆڕشی ئەو ناوە و ساڵی ٩١٢ لە خۆی لەشکربەزی کرد و سەردارانی کوردی ئەو ناوەی بانگ کردە لای خۆی بەڵام بەبەهانەیەک هەمووی خستنە زیندانەوە و، لەوێوە سپای قزلباشی نارد بۆ سەر ئەمیر ساریم کوڕی سەیفەدین خان فەرمانڕەوای موکریان، پاش قەڵاچۆکرانی خەڵقی ئەو ناوە و تاڵانکرانیان، براکانی ساریم

بەدیل گیران و، هەڵواسران. و ساڵی ٩١٨ کۆچی، هەر لەم هەرێمی خۆیەدا بوو کە شەڕە سەختەکەی نێوانی عوسمانی و سەفەوی قەوما کە بەشەڕی چاڵدێران بەناوبانگە. ساڵی ٩٥٥ کۆچی سوڵتان سلێمانی عوسمانی کە بە قانوونی بەناوبانگ بوو و، ئەلقاسی مـیـرزای برای شـا تەهمـاسـپی سـەفـەوی پەنای پێ بردبوو، ئەیەویست بەبەهانەی ئەلقاسیەوە، وڵاتی ئازەربایجان داگیر بکات، جا سپایەکی زۆری لەگەڵ چەند فەرماندە خستە ژێر دەسەڵاتی ئەلقاسی و ناردی بۆ سەر سپای سەفەوی لە مەرەند، ئەم سپایە لە خۆیەوە بەرەو مەرەند کەوتنە ڕێ و، سوڵتان سلێمان خۆی شاڵاوی کردە سەر تەورێز... بەڵام لەو شاڵاوەدا شکان و سەرنەکەوتن... لەم دەورەدا سەردارێتی هەرێمی خۆی هی سەردارانی عێلی دونبوڵی بوو، کە یەکێکن لە تیرە کوردەکان و، بەدونبوڵی زازا بەناوبانگن و، ئەمڕۆکە لە دەوروبەری دەرسیمی تورکیا دان. ئەسکەندەر پاشای والیی وان، لە لایەن عوسمانییەوە، هێزی هەموو عێلەکانی کۆکردەوە و، لەناکاو دای بەسەر خۆیدا و حاجی بەگی دونبوڵی هەندێ لە پیاوماقووڵانی دەوروبەری قەڵاچۆکردن. ساڵی ١٠١٤ جارێکی تری (جغالە زاوە)ی سەردار سپای عوسمانی هێزی کوردەکانی خستە ڕێ بەرەو خۆی و مەرەند و پێشەنگیی ئەم هێزانەی سپارد بەمستەفا پاشا... بەڵام جەمشید سوڵتانی دونبوڵی فەرمانڕەوای مەرەند و خۆی زوبەم نیازەی زانی و، پەیامی نارد بۆ شا عەبباس و، لەم شەڕە بەرگرییان کرد و بەرەو دوا هەڵیان برین...

گوێگرانی بەڕێز! دەربارەی خۆی زانیاریی مێژوویی و جوغرافی زۆرە، ئێمە لە وتارێکی ترا بۆتان ڕوون دەکەینەوە ئێستە کاتمان تەواو بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٢/١/١٥

٢٦٧٤/١/١٥

**وتاری**: ٦٣

گوێگرانی بەڕێز شەوتان خۆش، بەهیوایین لەوپەڕی بەختیاری و کامەرانیدا بن لە وتاری پێشوودا باسی (خۆی)مان کرد و، لەم وتارەشا هەر لەسەر ئەو باسە دەڕۆین. جارێ گوێ بدەنە موسیقایێ.

موزیک

ساڵی ٦٢٧ کۆچی کە ئەکات ١٢٣٠زایینی، وەکو لە وتاری پێشوودا دیاردییمان بۆ کرد، جەلالەدین خوارەزم شا ویستی شاڵاو بباتە سەر ئاسیای بچووک و لەگەڵ عەلائەدین کەیقوبادی سوڵتانی ڕۆم کەوتە شەڕەوە، کە سەر بەمەلیک ئەشرەفی ئەیوبی بوو، سپای ڕۆم بەیارمەتی سپای ئەیوبی جەلالەدینی بەرەو دوا گێڕایەوە و، بەسەریا زاڵ بوو، فەرماندەی سپای ئەیوبی لەم شەڕەدا یەکێک بوو لە کوردە حەکارییەکان، ناوی عیزەدین عومەر عەلی بوو... ساڵی ٨٢٤ کۆچی ١٤٢١ زایینی کە شاهروخ میرزای کوڕی ئەمیر تەیمووری لەنگ شاڵاوی کردە سەر ئەرمەنستان هەلی بۆ هەڵکەوت، هەموو سەردارە کوردەکانی بانگ کردە لای خۆی یەکێ لەوانە ئەمیر شەمسەدین بەتلیسی باپیرە گەورەی ئەمیر شەرەفخانی نووسەری (شەرەفنامە) بوو ئەوانی تری مەلیک محەمەد فەرمانڕەوای حەکاری و مەلیک خەلیل سەرداری (حیصن کیفا) و سەرۆکی خیزان و سەردارانی تری بوون، لەگەڵ سەردارانی خۆی و بەم جۆرە توانییان هەرێمەکانی خۆیان و، هۆزەکانیان لە شەڕی ئەم درندەیانە بپارێزن و، لە تاڵان و کوشتار ڕزگاری بکەن...

وە دەبێ لەم سەردەمانەدا خۆی لەژێردەستی سەردارە کوردەکانی جۆڵەمێرگدا بووبێ، چونکە قەلقەشەندی نووسەری (صوبح الئەعشا – صبح الاعشى)، دەڵێت: سەرداری جۆڵەمێرگ و خۆی ئەسەد کوڕی مەکلان پاش ئەو عیمادەدینی کوڕی و، پاش ئەو عیماد بووە... ساڵی ١٠١٣ کۆچی کە سەنان جفالە زادەی سەردار سپای عوسمانی هێزێکی تێکەڵ لە کورد و تورکی نارد بۆ سەر خۆی و مەرەند، سەرۆکی ئەم هێزە مستەفا پاشا ناوێ بوو. پاش ئەوەی خۆیی داگیرکرد، خۆی لە خۆی مایەوە و، هێزە کوردەکانی نارد بۆ سەر مەرەند و بەم جۆرە کوردی ئێرانی بەکوردی ژێردەستی عوسمانی ئەدا بەکوشت و قەلاچۆ و، تاڵانی دەکردن...

ساڵی ١١٧٥ کۆچی، شەڕێکی سەخت لە نێوانی کەریم خانی زەند و فەتح عەلی خانی ئەفشاردا، لە دەوروبەری خۆی و سەلماس ڕووی دا... پاش ماوەیەک کەریم خان سەرکەوت و فەتح عەلی خانی لە قەڵای ئورمیەدا -واتا ڕەزائیەی ئەمڕۆدا- گەمارۆ دا و، نۆ مانگی تەواو مایەوە، ساڵی ١١٧٦ کۆچی فەتح عەلی خان خۆی دا بەدەستەوە و سەرکەوتنی کەریم خان لەم شەڕەدا بووە هۆی ئەوەی سەردارانی تەورێز، مەراغە، خۆی، سەڵماس، هەموویان سەری بۆ دانەوێنن.

لە دەوری قاجاردا فەتح عەلی شا زۆر دەربەستی خۆی دەهات و لەسەر ڕاوێژیی ژەنەراڵ گاردنی ڕووسی، شوورەیەکی زۆر قایمی بەدەوری خۆیدا کێشا، یانی دیوارەکەی چوار مەتر بوو، بەڵام لەپێش شەڕی گشتی هەوەڵدا، کە دەوڵەتی ڕووس لەگەڵ ژاپوندا لە شەڕا بوو دەوڵەتی تورک ویستی سوود لە پەشێویی ڕووس وەربگرێ و هەندێ لە وڵاتی ئێران دابڕێ، بۆ ئەنجامدانی ئەم پیلانە لە سەرەتادا محەمەد پاشای داغستانی فەرماندەی سپای عوسمانی هەڵی کوتایە سەر ئورمیە و شنۆ و سابڵاغ. ڕووسەکان، کە بەمەیان زانی زوو سپایان نارد خۆی و ئورمیەیان خستە ژێردەستی خۆیانەوە و، ئەم هەرێمە کوردەی ئێران بەم جۆرە شڵەژا، ساڵی ١٣٣١ کۆچی کە دەکات ١٩١٣ زایینی بڕیار بوو لیژنەی سنوور ڕێکخستن، ئەم ئاژاوەیە ببڕێتەوە، بەڵام ساڵی ١٩١٤ زایینی هات بەسەرا شەڕی گەورەی یەکەم قەوما و، هەموو جیهان تووشی ئاژاوە و شڵەژان هات.

جا بابێینەوە سەر ئەوەی بزانین ئەمڕۆ خۆی چییە و چۆنە؟ خۆی ئەمڕۆکە یەکێکە لە شارستانەکانی -واتا فەرمانداریی‌یەکانی- ئوستانی چوارەم، ئازەربایجانی خۆرئاوایی کەوتۆتە سەر چەقی ڕێی بازرگانیی (تەورێز و تەرابزون) لە لایەکەوە و، (ڕەزائیە و جلفا) لە لایەکی ترەوە. ئەکەوێتە باکوری خۆرئاوای تەورێز و باکوری ڕەزائیەوە. لە ڕەزائیەوە ١٩٤ کیلۆمەتر و، لە تەورێزەوە ١٤٩ کیلومەتر و لە تارانەوە ٧٧٧ کیلۆمەتر دوورە، ژمارەی دانیشتوانی شاری خۆی ٦٠ هەزار کەسێک ئەبێ و ژمارەی هەموو فەرمانداریی‌یەکە ٢٦٠ هەزار کەسێک ئەبێ. ئاووهەوای لە هاوینا تۆزێ گەرم و لە زستانا، لە چاو دەوروبەرییا ناوەنجییە، چەند مەیدانی گەورەی هەیە، ٥٠٠ دوکان، مەغازە، کاروانسەرا، میوانخانەی تیایە، ١٥ گەرماو، ٣ گەراج، ١٥ قوتابخانەی بەرایی ٤ قوتابخانەی ناوەندی تیایە... لە ساختمانە کۆن و دێرینەکانی ئەو ناوە:

١- مزگەوتی خان، لە لایەن خان ئەحمەد خانی دونبوڵییەوە دروست کراوە، کە لە ساڵی ١٢٠٨دا فەرمانڕەوای ئەو ناوە بووە.

٢- منارەی سەر گۆڕی شەمس ئەلملوکە، کە لە کاتی خۆیا ئەو گۆڕە، گومەزێک و دوو منارەی زێرینی هەبووە و، پاشان وێران کراوە و لەوەپاش لە سەلکی ئاسک و کەڵەکێوی و گیانلەبەرانی تری منارەیەکی بۆ دروست کراوە.

٣- مزگەوتی موتەلیب خانی دونبوڵییە کە ٢٥ مەتر بەرزاییەتی.

٤- پردی خاتوونە کە بەسەر ڕووباری قوتورەوەیە، قوتور لقێکە لە ڕووباری ئەرەس و سێ کیلومەتر لە خۆیەوە دوورە پردەکە ٧ کەمەری هەیە، ٧٠ مەتر درێژایی و، ٦ مەتر پانییێتی... خەڵقی شارەکە ماوەیەکە تورک زبان و لەسەر ڕچی شیعەیێتین و، بەر لە دەورانی سەفەوی هەموو کوردبوون و، سەرداریتیی ئەویش هی سەردارانی عێلی دونبوڵی بوو، کە لە سەرەتا کورد و لەسەر ڕچی یەزیدی بوون، پاشان هەندێکیان فێری تورکی بوون و پەیڕەوی ڕچی شیعەیان کرد و بەشی هەرەزۆریان گواستیانەوە بۆ تورکیا بۆ هەرێمی دەرسیم و ئەمڕۆ کە بەدونبوڵی زازا بەناوبانگن. با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە سەردارانی دونبوڵی، کە لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە تا نیوەی سەدەی سێزدەیەم سەردارانی ئەم ناوە بوون، لە بنەڕەتا -بەقسەی خۆیان- دەچنەوە سەر بەرمەکییەکان و، یەکەمیان ئەمیر محەمەد بووە، کە ساڵی ٣٨٧ سەردار بووە. و ئاخریان سلێمان خان بووە کە لە سەردەمی قاجاردا کرا بەسەرداری بەستام و شارود...

گوێگرانی خۆشەویست لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/١/١٨

**وتاری: ٦٤**

## دەرتەنگ

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، شەوتان خۆش کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ئێرانە. ئەگەر لەبیرتان مابێ، لە چەند بەرنامەیەکا باسی (حەلەوان)مان بۆ کردبوون، ئا ئێستە باسی (دەرتەنگ)تان بۆ دەکەین، کە عەرەب ناویان ناوە عەقەبەی حەلەوان و، بەشێکی گرنگی سەر زەوی حەلەوانی کۆنی داگرتووە و، فەرمانڕەوایانی ئەم دەرتەنگە هەر دوا زنجیرەی ئەو فەرمانڕەوایانەن... جارێ کوێبدەنە ئاوازێکی مۆسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! دەرتەنگ کە دەربەندێکە لەسەرەڕێی قەسری شیرین کرماشان، لە زۆر کۆنەوە مەڵبەندی کورد و، جێی سەردارانی کوردی کەڵوڕ بووە - خاوەنی (شەرەفنامە) لە کتێبەکەیا نووسیویە، وەکو ئێمە بیستوومانە فەرمانڕەوای دەرتەنگ لە ڕۆژگاری پێش ئێمەدا کابرایەکی زوراو (سوهراب) ناوبووە پیاوێ بووە: جوامێر، دلێر، دەست بڵاو، بێ ئازار و بەدەمار دەسەڵاتی بەسەر ئەم قەڵا و دژانەدا هەبووە کە ناویان ئەبەین و، خەڵقی ئەو ناوە ملکەچی فەرمانی بوون قەڵا و دژەکانی ژێردەستی ئا ئەمانە بوون (پاوە - پاسگە - ئالانی - قەڵا زنجیر - ڕەوانسەر - دووان - زەڕماتێکی) و لەناو ئەم جێیانەدا تا ئەمڕۆش پاوە و ڕەوانسەر هەر ئاوەدانن... پاوە شارستانی و ناوەندی فەرمانداریێکە سەر بەئوستانی کرماشان و ڕەوانسەریش سەر بەئەوە... و پاسگە و ئالانی و قەڵا زنجیریش تەنیا شوێنە قەڵاکانیان ماوە. جاوەکو وترا زۆراب خان پیاوانە و مەردانە تا لە ژیانا بووە، وڵاتەکەی بەڕێوەبردووە... پاش خۆی عومەر بەگی کوڕی لە جێی دانیشتووە، ئەم کوڕە لە سەردەمی گەنجیدا کابرایەکی دڕندەی خەڵقکوژی خوێنڕژی شەرابخۆر بووە، خەڵقی ئەو ناوە لە ترسی ئەو ئۆقرەیان نەبووە... بەڵام پاش ئەوە جێی باوکی گرتۆتەوە و، بووە بەمیر، لە هەموو تاوانێکی ئاینی و کۆمەڵایەتی لای داوە و، لە کردەوەی خراپە گەڕاوەتەوە و جوانترین ڕەوشی بۆ خۆی کردۆتە پیشە، ئەم عومەر بەگە ئەوەیە کە لە وتاری پێشترا کە دەربارەی قەڵای حەسەن ئاوا دواین، وتمان تەیموورخانی

ئەردەڵان چەند جارێ دایە سەر وڵاتەکەیا و سەرئەنجام عومەر بەگ هاواری بردە بەر شاهوێردی خانی لوڕستان ئەوە بوو هێزی لوڕ و کەڵوڕ ڕێیان بەتەیموورخان گرت و بەدیل گرتیان... و پاش ماوەیەک ئازادیان کرد و گەڕانەوە... هەرکە سوڵتان سلێمانی قانوونی بەغدای داگیرکرد، ئەم عومەر بەگە کە بەهێزترین فەرمانڕەوای ئەو ناوە بووە خۆی دایە پاڵ عوسمانی و، چووە لای سوڵتان سلێمان و بەنیشان و فەرمانەوە گەڕاوە بۆ بەڕێوەبردنی و لاتەکەی و بەم جۆرە ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە. پاش مەرگی قوباد بەگی کوڕی جێی گرتۆتەوە، لە قسەکانی ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی وەها دەرئەکەوێ، کە بەچاوی خۆی ئەم ئەمیرەی دیبێ چونکە هەڵی ئەنێ و ئەڵێ: «قوباد بەگ گەنجێکە لە سەخێتی و دەس بڵاویدا و، لە ئەمەکناسی و، بەوەفاییدا و، لە دلێری و ئازاییدا و، لە ڕووگەشی و ڕەوشت جوانیدا تاقانەی ڕۆژگاری خۆیەتی، خوا پایەدار و تەمەن درێژی بکات. ئەم گەنجە جگە لەو وڵاتەی کە لە باوکییەوە بۆی بەجێمابوو، دەسەڵاتی تا سنووری بەغدا دەڕۆیشت.» گەرچی ئەمیر شەرەفخان تەنیا سنووری بەغدای وتووە، بەڵام دەبێ لەو حەلەدا هەموو سەرداریێتیی باجەلان واتا شارەکانی خانەقین و قەراخان -کە ئەمڕۆ پێ ئەوترێ جەلەولا ء- و (خضر ئاباد) کە ئەمڕۆکە پێی ئەوترێ سەعدیە و (دەوڵەت ئاوا) کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ دیڵتاوە و (شارەبان) کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ میقدادیە ئەمانەی هەموو لەژێردەستا بووبێ، واتا تا ئاخرین سنووری کوردستانی عێراق... پاش (شەرەفنامە) (عالەم ئارای عەبباسی) دەڵێت: (ساڵی ١٠١١ کۆچی شا عەبباسی سەفەوی لە کاتێکا ئەیەویست بچێت بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان و ئەرمەنستان، کە بەدەست عوسمانییەوە بوون، نامەیەکی لە ئوزون ئەحمەد پاشای والی بەغداوە بۆ هات کە ئەیەویست خۆی لە عوسمانی دابڕێ و، بێتە پاڵ و پەنای شای سەفەوی لەم ڕووە شا عەبباس دەستووری دا بەئەڵلاوێردی خان کە بەهێزەکانی هەمەدان و خوزستان و بڕوات بۆ داگیرکردنی بەغدا... سپای ئێران بەڕێی کوت و عیمارەدا ڕوویان کردە کەربەلا و بەغدا، هەندێ تری هێزی سەفەوی ویستیان لە ڕێی کرماشان قەسری شیرینەوە بەرەو بەغدا بڕۆن، بەڵام کوڕانی قوباد بەگی کەڵوڕ کە هەرێمی دەرتەنگ تا سنووری بەغدایان بەدەستەوە بوو ڕێیان لێ گرتن... سپای قزڵباش لەوان زۆرتر و ئامادەتر بوو، پاش شەڕ و هەرا بەسەر کوڕانی قوباد بەگدا زاڵ بوو. یەکێ لە سەرۆکانی عێلەکان کە ناوی عومەر بەگ کوڕی عیماد بەگ خۆی کرد بەقەلعە زنجیردا. بەڵام هێزی قزلباش بەسەریا زاڵ بوون و دیلیان کرد و، ئەو ناوەیان هەموو تاڵان کرد،... بەڵام لەولاوە لە ئەڵلاوێردی خانی قەوما. ئوزون ئەحمەد پاشا ڕێی

نەدا بچێتە ناو بەغداوە، پاش شەڕێکی زۆر بەنائومێدی گەڕایەوە، بەڵام چەند جارێ شەڕ لە نێوانا قەوما و دەوڵەتی سەفەوی جارێکی تری ئەم ناوانەی خستەوە سەر ئێران، ساڵی ۱۰۲۹ کۆچی دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دەرتەنگ و هەرێمەکانی کەڵهوڕ کە لە لایەن سەفەوییەوە داگیر کرابوون، بدرێتەوە بەعوسمای بەرامبەر بەئاخ سەخەی گورجستان، کە بدرێتەوە بەئێران ساڵی ۱۰۳۱ کۆچی بەکر سوباشی کە سەرۆکی شارەوانی و هێزی بەغدا بوو دژی دەوڵەتی عوسمانی شۆڕشی کرد و، خۆی دایە پەنای دەوڵەتی سەفەوی و نامەی گۆڕییەوە لەگەڵ شای ئێراندا، کە سەربەخۆیی بەغدای جاڕ داوە و، سەری لە فەرمانبەری عوسمانی هەڵچەرخاندووە زوو هێزی سەفەوی بگات بەفریایا... شا عەبباسی سەفەوی گەرچی لەگەڵ عوسمانیدا پەیمانی بەستبوو، لە هەل سوودی وەرگرت و بەرەو بەغدا سپای کێشا... و لە ڕێدا هەرێمی دەرتەنگ و ئەو ناوەی داگیر کردەوە... پاش ئەم دەورە شتێک دەربارەی سەردارێتی فەرمانڕەوایانی دەرتەنگ نەنووسراوە، ئێستە ئەم دەرتەنگە سەر بەڕەوانسەرە کە یەکێکە لە بەخشەکانی پاوەی فەرمانداریی گشتیی سەر بەئوستانی کرماشان.

گوێگرانی بەڕێز... لێرەدا ماوەی وتارەکەمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۱۳۵۲/۱/۲۲

۲۲/نەورۆز/۲٦٧٤

**وتاری: ٦٥**

گوێگرە خۆشەویستەکان! شەوتان باش! ئاواتەخوازی سەرکەوتن و پێشکەوتن و بەختیاری و کامەرانیتانین... یەکێک لەو بەڵایانەی بەسەر هەموو ئێران زەمیندا هاتووە بەگشتی و، بەسەر هەرێمە کوردنشینەکاندا هاتووە بەتایبەتی ئەوە بووە: کە پاش رووخانی شاهەنشایەتیی ساسانی و پەیدابوونی ئیسلام، هەر دەوڵەتێ کە دەسەڵاتی بەسەر خاکەکەدا پەیدا کردووە، چ عەرەب و، چ سەلجووقی و چ مەغۆل و، چ تاتار و ئیلخانی و چ ئاق قویونلو و قەرە قویونلو... و هی تر... بەکەیفی خۆی کەوتۆتە گۆڕینی نێوی شار و شارۆلکە و دێ و، چیا و رووبار و جێگە دیاری و مێژووییەکان و ناوی عێل و تیرەکان... بێ ئەوەی گوێ بداتە بیروباوەڕی مرۆڤی وڵاتەکە و، ڕێزی مێژووی کۆنی ئەو جێیە بگرێ... بۆ نموونە عەرەب لە سەرەتای ئیسلامەوە کەوتنە گۆڕینی ئەو ناوانەی کە پیتی (نا- عەرەبی)یان تیابوو و، ئەوان نەیانئەتوانی بیدرکێنن و، لە زار دەری بێنن.

بەوێنە: وەروگردیان ئەکرد بە (بروجرد)، میهرەگانی بچووکیان ئەکردە بە (میهرجان قذق)، سێیەم رویان ئەکرد بە (صەیمەرە)، کرماژانیان ئەکرد بە (قرمیسین)، گوڵپایەگانیان ئەکرد بە (جورفادەقان)، گۆرانیان کرد بە (جوران)، گەورکیان ئەکرد بە (جورقان)، پەهلەوییان ئەکرد بە (فەهلەوی) تاد... بەڵام ئەم ناو گۆڕینەی عەرەب کەمتر کاری ئەکردە سەر زاراوەی وڵات، چونکە واژەکانی ئەوان ڕەقتتر بوو لە هی خۆ وڵاتی، جگە لەو خوێندەوارانەی کە بەکارهێنانی زاراوەی بێگانەیان بەچەشنێ لە (فەضاحەت و بەلاغەت) ئەدایە قەڵەم، خەڵقی تری فێری نەئەبوون و نەئەکرا بەباو...

بەڵام لە دەورانی سەلجووقی و، مەغۆل و تاتار و ئیلخانی و دواترا... کە جێگەیەکیان داگیر دەکرد، لەباتی هێزی سپایی تیرە و عێلاتی خۆیان لەوێ دادەمەزراند و، مرۆڤی خۆ وڵاتیان دەڕەتاند و، تەرتە وەرتەیان دەکردن و، ناوی تازە بابەتیان بەزۆر بەسەر وڵاتانا دەسەپاند. بۆ وێنە: ناوی جیقەتو کە دراوە بەزەڕینەرود و ناوانی کرایت و بەیات و سەقیز و سەلدوز کە بەزۆر بڕاون بەسەر هەندێ شاری کوردەواریدا و تا ئەمڕۆ هەر ماونەوە، هەموو لەم بابەتە بوون... لەگەڵ ئەوەشدا کە جیقەتو ناوی یەکێک لە بنەماڵەی باپیرانی جەنگیزخانە و (جامیع التەواریخی ڕەشیدی) لەوە دواوە کە ساڵانی ٧٢٩ کۆچی واتا ١٣٢٩ زایینی، هەبوون... و جوەینی لە (تەئریخی جیهان گوشا)دا لە لاپەڕە ١٩ی بەرگی

یەکەمیدا ئەڵێ: ئۆنگ خان لە سەردەمی جەنگیزدا سەرۆکی دوو عێلی زۆر بەهێزی تورک بوو کە ناویان کرایت و سەقیز بوو و، ژمارەیان لەوانی تری زۆرتر بوو. هەروا ڕەشیدی لە لاپەڕەکانی ۱۳۲-۱۳٦دا دوورودرێژ دەربارەی سەلدوس - بایاوت - کرایت) ئەدوێ، وا دیارە کرایت و بایاوتەکان کە لەم دواییەدا پێیان دەوترا (بەیات) لە سەردەمی سەلجووقیدا هێنرانە کوردستان، چونکە موشتەفی خاوەنی (تەئریخی گوزیدە) و نەتەنزی دانەری (مونتەخەب التەواریخ) و شەرەفخان نووسەری (شەرەفنامە) هەر سێیان ئەڵێن: لە لایەن تورکەکانەوە هەندێ لە دەوروبەری لوڕستانْ داگیر کرابوو... دوو بنکەی بەهێزی کریت و بەیاتی تیا دامەزرێنراوە بوو... کە چووبوونە دیمەنی شارستانەوە... سەرۆکی بەیاتی تورکمان جارجارە شالاوی ئەکردە سەر لوڕستان... بەڵام شوجاعەدین خورشیدی کوڕی ئەبوبەکر کوڕی محەمەد کوڕی خورشید کە یەکێ بوو لە پیاوە هەرە بەدەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوایی لوڕستان، فەرمانی دا بەدوو کوڕەکەی کە ناویان بەدر و سەیف بوو، شالاو بکەنە سەر بەیات و کریت و، ڕایان ماڵێ و هەرێمی لوڕستان لە شەڕیان ڕزگار بکەن... ئەوانیش چوونە سەریان و، ڕاویان نان... جوغرافیانووسی بەناوبانگ (لیسترنیگ) کە کتێبی سەر زەوییەکانی بەشی خۆرهەڵاتی خیلافەتی نووسیوە ئەڵێ: «شاری بەیات و کریت بەجۆرێ لەناوبراون کە ئێمە نازانین شوێنەواریان ئەکەوتە کوێوە...» بەڵام بەداخەوە ناوانی وەکو سەلدوز و سەقیز و قەرەداغ سەپێنراون بەسەر وڵاتەکەدا و، تا ئەمڕۆش هەر ماون ناچار هەندێ نووسەری کورد خەریکن خۆیان بخەڵەتێنن و لافی ئەوە لێ بدەن کە سەقیز لەناوی (سکا)وە هاتووە... و قەرەتاغ لە ناوی (کارداخ)ەوە بەجێماوە... بەڵام ئەوەی ڕاستی و جەرگبڕە، ناوی کۆنی ئەو جێگایانەی کوردەواری هەر تیا چووە... با لێرەدا لەم باسە لادەین و دەربارەی (دەڕەیاس) بدوێین... ئەم ناوە تورکییە بڕاوە بەسەر کۆنە شارێکی کوردا، کە ئەمڕۆکە بەشارۆێران ناو ئەبرێت و لە مەهابادەوە چەند کیلۆمەتری ئەبێ: خێوی شەرەفنامە ئەڵێ سەیفەدین خانی موکری کە پیاوێکی ژیر و زرنگ و بلیمەت بوو، لە بێ هێزبوونی دەوڵەتە تورکمانەکان بەهرەی وەرگرت و، هێزێکی لە عێل و تیرە کوردەکان پێک هێنا و دەڕەیاسی لە چنگی تیرەی چابقلوی تورکمان دەرهێنا و دەزگای خۆی تیا دامەزراند و، کردییە ناوەندی وڵات و لەوێوە کەوتە تەنینەوە و پەرەپێدانی دەسەڵاتی... هەرێمەکانی دول باریک و ئەختەچی و ئیل تیمور و سەلدوزیشی هەموو خستە سەر دەڕەیاس. بەڵێ ئەمیر سەیفەدین خانی موکری بەم کارە بەنرخە و، بەم خەبات و نەبەردەی دەری خست کە کورد نایانەوێ پێشێلی لەقەی بێگانە بن... بەڵام بۆچ ناوی

کۆنی ئەو ناوانەی زیندوو نەکردۆتەوە... ئەمەیان جێی داخ و خەفەتە... زۆریش سەیرە لە جوغرافیا و مێژووە کۆنەکانا ناوی ئەم شار و جێ کۆنەیانەمان بۆ نەماوەتەوە. کۆنترین کتێبێکی جوغرای کە ناوی (حدود العالم)ە و بەفارسی نووسراوە دیاردی بۆ چەند جێیەکی نزیک بەرووباری زەرینەرود کردووە... بەلام وا دیارە ناوەکانی بۆ ساغ نەبووەتەوە، لە جێی ناوەکان... نیتکی داناوە... واتا چەند خاڵ و نوقتەیەکی داناوە... ئا ئەمەیە، پێی دەڵێن رەنجی بابردوو...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات. لە وتاری ئایندەدا زۆرتر لەسەر باسی دەرەیاس و سەردارێتی سەیفەدین موکری ئەرۆین... ئێستە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/١/٢٧

٢٧/نەورۆزی/٢٦٧٤

**وتاری: ٦٦**

گوێگره خۆشەویستە بەڕێزەکان شەوتان خۆش، کامەرانیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردییە، لە وتاری پێشوودا کە ئەمانەویست دەربارەی (دەرەیاس) بدوێین ناوی ئەو جێیانەمان برد کە لە لایەن بێگانەوە ناویان گۆڕاوە و، زۆریانیش تا ئەمڕۆ هەر بەو ناوە دەناسرێن و ناوە کۆنە کوردییەکانیان لەبیر کراوە. بەداخەوە مێژوونووس و جوغرافیا دانەرە کۆنەکانیش، یا ئەو ناوە کۆنانەیان هەر تۆمار نەکردووە، یاخۆ بەجۆرێ تۆماریان کردووە کە ئەمڕۆکە لەسەر نەخشە بەرچاو ناکەوێ!... بابێینەوە سەر باسی دەرەیاس... ئەم جێگەیە ماوەیەک ناوەندی سەرداریتیی موکری بووە... پاشان ناوی نەماوە... لە نامیلکەیەکا کە شەهرداریی مەهاباد بەفارسی نووسیویە و ناوی ناوە (مەهاباد: دیروز و ئیمروز) وا دراوەتە قەڵەم کە لەو جێگەیە دابووە کە ئەمڕۆ بە(شەهر ویران) ئەناسرێ. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵقی ئەو ناوە تا ئەمڕۆکە ناوی دەرەیاس هەر دەزانن. دەبێ شەهر ویران چی شارێ بووبێ. کتێبی (حدود العالم) بەداخەوە لە جێی ناوی هەندێ شاری ولاتی کوردەواری، کەناری زەرینەرود و سمینەرود تەنیا نوختەی داناوە. ئێستە کە گوێ ئەدەینە موسیقایێ خۆمان ئامادە دەکەین بۆ گوێدانە باسی مێژوویی ئەم ناوە.

موزیک

وەک لە وتاری پێشوودا دیاردیمان بۆ کرد سەیفەدین خانی موکری کە لە بنەڕەتا لە عێلی موکریی سەر بەشارەزوور بوو، یاخۆ لە بنەماڵەی بابان بوو... پاش ڕووخانی دەوڵەتە زلەکانی جەنگیز و هۆلاکو و تەیموور کە هەستی بەوە کرد دەوڵەتی تورکمانەکانی قەرەقویونلو و ئاق قویونلو کەم هێزن، شۆڕشی لە دژیان هەڵگیرساند و، لە سەرەتادا شالاوی بردە سەر عێلی (چابقلو Chabqlo) و دەرەیاسی لێ داگیرکردن... پاش ماوەیەک کەوتە پەرەدان بەدەسەلاتی خۆی و، بەتەنینەوەی ولات، بەخش و ناوچەکانی دوڵ باریک و ئەختاچی و ئیل تیمور و سەلدوسیشی لە دەست وەرگرتنەوە و، خستییە سەر قەڵەمڕەوی خۆی... ئەگەر باش سەرنج بدەین لە نێوانی ناوی ناوچەکانیشا تەنیا ناوی دوڵ باریک بەکوردی ماوەتەوە، ئەو ناوەکانی تری هەموو بوون بەتورکی چقەتایی ئەمە وەها، (ئەحسەن التەواریخ) و (عالەم ئارای عەبباسی) دەربارەی سەیفەدین خان نادوێن تەنیا (شەرەفنامە) لەم بارەوە دواوە ئەڵێ: ئەم سەردارە کوردە زۆر مەردانە ولاتەکەی

ـەڕێوەبرد...». نامیلکەی مەهاباد ناوی هەندێ لە عێل و تیرەی ئەو حەلەی بردووە، کە ئێ ناویان لەناو خەلقا پشت بەپشت ماوەتەوە کە ئەمانەن: (سەرکەلی - سەلکی- حەلکی- بابۆلی - مەرزینگ - ورمزیار - زەند - لەک - باریک)... پاش مردنی ـەیفەدین خان ئەمیر ساریمی کوڕی لە جێی دانیشتووە، زۆر بەزرنگی و ژیری و ڕامیاری ـەگەڵ خەڵق جووڵاوەتەوە... کە شا ئیسماعیلی سەفەوی لە ساڵی ٩٠٦ بەدواوە، جاری پەدشایەتیی خۆی دا، چەند جارێک هێزی نارده سەر ساریم بەڵام هەموو جار، هێزەکان بەبۆژەیی و شکاوی گەڕانەوە... ساڵی ٩١٢ کۆچی شا ئیسماعیلی سەفەوی خۆی چووە (خۆی) و لەوێوە هێزی عێلی شاملو و چەند عێلی تری نارده سەر ئەمیر ساریم... وەلێ ئەم هێزانە حاڵیان لەوانی تری باشتر نەبوو... هەرچەندە ڕوملو لە کتێبی (ئەحسەن التەواریخ)دا ئەیەوێ: ساریم بەکەم هێز بداتە قەڵەم و ئەڵێ: شا ئیسماعیلی سەفەوی لە ساڵی ٩١٢ کۆچی لە (خۆی) لەشکربەزی کرد و، فەرماندەکان و سەردار سپاکانی گەورەی بانگ کردە لای خۆی و، فەرمانی دانێ کە بەسپای بەهێزەوە شالاو ببەنە سەر کورد ساریم و، تۆڵەی شکستەکانی لەوەبەر بکەنەوە... هەرکە عێلاتی کوردی ئەو ناوە بەم هەواڵەیان زانی پەنایان بردە بەر چیا سەختەکان... بەڵام سەردار ساریم مەیدانی نەدا وڵاتەکەی پێشێل ببێ، لەگەڵ سپای قزلباش کەوتە شەڕەوە و، لە هەردوولا زۆر کەس کوژران و، فەرماندە یان سوپای قزلباش پاش شکست خواردن گەڕانەوە فەریادیان بردەوە بۆ شا ئیسماعیل... وەلێ سەردار ساریم و سەردارانی تری کورد، بۆ ئەوەی خۆیان لە هەڵمەتی سەفەوی بپارێزن خۆیان دایە پاڵ سوڵتان سەلیمی عوسمانی... و بەم جۆرە ماوەیەک مانەوە... کە سوڵتان سلێمانی قانوونی جێی باوکی گرتەوە و، لەسەر تەختی سەڵتەنەتی عوسمانی دانیشت ئەمیر ساریم و هەموو سەردارانی تری کوردی ئەو دەوروبەری حەکارییە چوونە بارەگای و، ئەویش فەرمانی سەردارێتی بۆ مۆرکرد و، ماوەی دا بگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات. پاش مەرگی ئەم سەردارە، بەناوبانگترین سەردارانی بنەماڵەی موکری کە دەسەڵاتی بەسەر دەرەیاسدا بووبێ، شێخ حەیدەری کوڕی ڕۆستەمی کوڕی بابا عەمری کوڕی سەیفەدین بووە... کە (دەرەیاس، دول باریک، سەلدوس و، ئەختاچی) بەدەستەوە بووە... ئەم کوڕە و براکانی ڕوویان لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگێڕا و خۆیان دایەوە پاڵ دەوڵەتی سەفەوی و ساڵی ٩٤٨ کۆچی واتا ١٥٤٢ زایینی کە هەرای ئەلقاسی میرزای برای شا تەهماسپ ڕووی دا، کە خۆی دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی و، دژی شا تەهماسپ شۆڕشی هەڵگیرساند... ئەم شێخ حەیدەرە و براکانی لە شەڕا لە لایەن

سوپای عوسمانییەوە کوژران و هەرێمەکە کەوتە دەستی عوسمانی... پاش ئەم شەڕە لە لایەن سوڵتان سلێمان خانەوە فەرمانی سەردارێتیی دەڕەیاس و عێلەکانی موکری درا بەئەمیر بەگ کوڕی حاجی عومەر ساریم کوڕی سەیفەدین. و ئەم سەردارە ۳۰ سی ساڵی ڕەبەق ئەم ناوەی بەڕێوەبرد. پاش ئەوەی کۆچی دوایی کرد، لە لایەن شا تەهماسپی سەفەوییەوە سەرداری دەڕەیاسی و هەموو موکری درا بەئەمیرە بەگ کوڕی شێخ حەیدەر.

وە لە سەردەمی شا ئیسماعیلی دووەم و سوڵتان محەممەد (خوابەندە)ی سەفەویشا هەر بەدەسیەوە بوو... لە ساڵانی ۹۹۱ کۆچیدا هەموو سەردارانی کوردستان و لوڕستان خۆیان دایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی جا سوڵتان موورادی سێیەم فەرمانی دا، وڵاتی بابانیش خرایە سەر وڵاتی موکریان و لە مەراغەوە تا مووسڵ هەموو خرایە ژێر دەس ئەمیر بەگ، بەڵام حەسەن بەگ کوڕی خەزەر بەگی کوڕی حەیدەر بەگ کە لەو ماوەیەدا سەرداری دەڕەیاس بوو، لێی یاغیبوو و، ڕێی نەدایە قەڵای دەڕەیاس. و ئەمیرە بەگ ناچاربوو گەمارۆی دا... و ڕفاندی بەرەو مەراغە... ئەم ئەمیر بەگە تا ساڵانی ۱۰۰۵ کۆچی هەرمابوو. وڵاتەکانی ژێردەستی ئەمانە بوون: دەڕەیاس - تەرەقە - ئاجری - سار و گورگان - دواو - لیلان. و لەم دەورەدا هێشتا ناوی ساوجبلاغ پەیدا نەبووبوو... وا دیارە ناوی ساوجبلاغ لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەوی بەدواوە پەیدابووبێ و، ناوی دەڕەیاس لە نێوان مابێ. هەر چۆن پێ قەڵایێ بەناوی دەڕەیاس لە جێی ئەمڕۆی مەهاباد و سابڵاغی کۆن ناوچەی موکریان بووە و، دەورێکی زێڕینی هەبووە... بەداخەوە مێژوو هەر ئەمەندەی بۆ تۆمار کراوە و، بۆمان دەرکەوتووە کە لە کاتی خۆیا ئەو ناوە بژوێن و بەپیت و بڕشت بووە...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۱۳۵۲/۱/۲۹

۲۹/نەورۆزی/ ۲٦٧٤

**وتاری: ٦٧**

گوێگره بەڕێزەکان شەوتان خۆش! کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە. ئێمە نامەکانی ئێوە وەردەگرین بەڵام وەرامیان دوائەکەوێت، ببورن... لەبیرتان نەچێ کوردەواری لە قسەی پێشینانا دەڵێن: (کنگر و ماستیش بەوەختی خۆی) و، با لە سەرەتادا پێتان ڕابگەیێنم کاک محەمەد ڕەئووف محەمەد پەنا خەڵقی دێی تیلەکو کە برادەرێکی بەهەستی کورد و، مێژوودۆستە، نامەیەکی بۆ ئەم بەرنامەیە نووسیوە و، دوو پرسیاری کردووە؛ دەربارەی هەندێ جێ وشەی زاراوە کە لە کتێبی (شەرەفنامە)دا بەرچاوی کەوتووە...

پرسیاری یەکەمی ئەوەیە: کە لە سەردەمی سەفەویدا، هەرێمێکی کوردنشین هەبووە بەناوی چەمەشکەزگ ئەم هەرێمە لە کوێ بووە؟ و ئێستە لە کوێیە؟ و ناوی چییە؟

پرسیاری دووەم ئەوەیە: کە جارجار نووسراوە بەفلان ئەمیرزادەی کورد ٥٠٠٠ ئاقچە زەعامەت دراوە، مەبەست چییە؟

لە وەراما ئەڵێین:

١- چەمەشکەزگ هەرێمێکی زۆر پانوپۆڕی کوردە لە تورکیای ئێستە و، ئەمڕۆکە بەهەرێمی دەرسیم بەناوبانگە، مامۆستا نورەدین زازا دەربارەی ئەو هەرایانەی لەوێ ڕووی داوە، کتێبێکی بەتورکی نووسیوە ناوی ناوە (دەرسیم سەنجاغی) و بەلاتینی چاپ کراوە...

٢- ئاقچە وشەیەکی تورکییە، لەباتی دانگی فارسی و کوردی بەکارهاتووە. دەوڵەتی عوسمانی، کاتێ کە خاکی کوردستانی داگیر کردووە و، بەشی کردووە بەچەند سەرداریێتی لە هەمان کاتدا هەندێ هەرێمی بچووکی بەش کردووە بەچەند (زەعامەت) واتا چەند ناوچەی بچووک و، هەر ناوچەی بەشکراوە بەچەند دانگ کە پێیان وتووە (ئاقچە)... ئاقچە هەروەک ناوبووە بۆ دانگێ زەوی لە هەمان کاتدا ناویش بووە بۆ دراوێکی زیوین کە لەبەر سپێتی پێی وتراوە ئاقچە وشەی (ئاق) بەتورکی واتا سپی!.

موزیک

ئا ئێستە ئەمانەوێ لە زنجیرە وتارێکا باسی (دمدم)تان بۆ بکەین، لە جێی دمدم بەو پێیەی کە لە سەردەمی سەفەویدا تۆمارکراوە و، لەناو خەڵقا بەناوبانگ بووە، کۆنە

قەڵایەکی بەر لە ئیسلامی هەبووە لە هەرێمی تەرگەوەری نزیکی ئورمییە -واتا ڕەزائیەی ئەمڕۆ- گوایە ئەم کۆنە قەڵایە هی شاهانی کۆن بووە... لە دەورانی مادەوە تا ڕۆژگاری ساسانی... خاوەنی (شەرەفنامە) لە هەرێمی تەرگەوەردا ناوی قەڵایەکی بردووە بەناوی (داودان) و لە سەردەمی ئەودا قەڵای دمدم هێشتا دروست نەکرابوو.

بەلای ئێمەوە ئەم ناوەی (شەرەفخان) تۆماری کردووە لەگەڵ مێژووی کوردەواریدا زۆر ڕێک و هەموارە... وشەی (داودان) لە سەرەتادا، لە (دەئیڤە)وە، وەرگێڕراوە بە (دێو)، ئنجا بووە بە (دیڤاس) و بووە بە (تاوس) و تا ئێستە لەناو یەزیدییە کوردەکانا تاوس خوایە و، هەر ئەم ناوە تا ئەمڕۆ کە لەناو کاکەییە کوردەکانا ماوە و، (داو) و (داود) خوای کۆنی گۆڕانەکان بوو و، ئەم جۆرە ناوە لە هەرێمەکانی هەورامان و کرماشانا زۆرە. دوور نییە کە لە سەردەمی سەفەویدا، تورک زمانەکان قەڵای داودانیان کردبێ بەقەڵای دمدم... ئێمە لێرەدا نامانەوێ دووروودرێژ لەم باسە بدوێین، مامۆستا تەوفیق وەهبی بەگی بەڕێز، دەربارەی (دینی کۆنی کورد) چەند وتار و نامیلکەی نووسیوە، ئەمانەی هەموو شی کردۆتەوە.

بابێینە سەر قەڵای دمدم. ئەم قەڵا سەختە بەقسەی عالەم ئارای عەبباسی لە لاپەڕە ٧٩٦ بەرگی دووەمدا لە لایەن ئەمیر خانی لەپ زێڕینی سەرداری برادۆستەوە دروست کراوە، سێ فەرسەنگ لەولای ئورمییەوە واتا نزیکەی ٢٠ کیلۆمەتر لەولای ڕەزائیەی ئەمڕۆوە لە هەرێمی تەرگەوەردا لە سنووری ئورمییە و شنۆدا لەسەر کێوێکی یەکجار بڵند و سەخت دامەزراوە. ئەم کێوە شاخێکی بەردی مەڕمەڕییە، وەکو سەرپشتی گا هەڵکەوتووە، پانایییەکەی کەم و درێژاییەکەی زیادە، لای باکوری و لای باشووری شێوێکی قووڵە و، ئەوەندە لا لێژە مەگەر بەپێ پلقەی خەیاڵ بۆی بچییە سەر و، لەبەرئەوەی ئەو زەردە کێوە ئەوەندە لووسە لەولایانەوە، دیوار بۆ قەڵاکە دروست نەکراوە... لای خۆرهەڵاتی ئەم کێوە، بەڕێزە چیاکانی وڵاتەکەوە بەستراوە. لەبەرئەوە شوورەیەکی بەرزی بۆ دروست کراوە، لەگەڵ چەندبار و کونگەرە و، دەرگایەکی گەورە لای باشووری ئەو شوورەیەوە، بۆ ناو شوورەی دووەم دامەزرێنراوە و، لای خۆرئاوای کێوەکە کە تۆزی لەولاکان نزمترە و، بەرەو سەر زەوی شۆڕ ئەبێتەوە لە شوورەکەوە ڕێگەیەکی زۆر تەنگ بۆ خوارەوە هێڵراوەتەوە، کە تەنیا یەک سواری پێیا دەڕوات. و لاپاڵی کێوەکە لە هەموو لاوە بەردی مەڕمەڕی لووسە، کە نە کون دەکرێ و، نە قومشی لێ ئەدرێ و، نەئەتوانرێ پێ پلقەی لێ دروست بکرێ و، بڵندایییشی لە تیر ئاوێژێ بەرزترە.

جگه لەوەش کە ئەوەندە سەختە، بەکەناری چیاکەوە لە هەرلایەکەوە بارووین بۆ پاسەوانانی ئەو لایە دروست کراوە، کە دەرزی ئەبیىن و، ئەم بارووانە، قەلاگەلێکی بچووکن، بۆ پاراستنی قەلا گەورەکان و لە ناوەندی قەلاکەدا لەسەر چیاکە چالاوێکی یەگجار گەورە هەیە کە ئاوی بارانی تیا کۆدەبێتەوە و، بۆ چەند سالێ بەشی ئەکات و، لە کەناری لای باکوری قەلاکەشەوە رێگەیەکی باریک بەرەو شێوە قوولەکە ئەڕوات و، لەوێدا سەرچاوەیەکی ئاوی پاکژ هەلئەقولێ و حەوزێکی لەسەر دامەزرێنراوە، کە پڕ بکرێ، بۆ خواردنەوەی شەووڕۆژێکی هەموو دانیشتوان و، هێزەکانی قەلاکە بەش ئەکات و، لەسەر ئەم حەوزە گومەزێ دروست کراوە، دەرگاکەی ڕوو بەقەلاکە و پشتی لە دەرەوەیە و زۆر سەختە و، بۆ پاراستنی ئەم حەوز و ئاوە بارووێ لە نزیکییەوە دروست کراوە و، لای باشوورییەوە عەماریێ بۆ بەفر دامەزراوە، کەزستانان پڕ دەکرێ لە بەفر بۆ هاوین و قەلاکە لەناوخۆیا بەپێنج قەلایە، کە هەریەکەیان لە سەختییا بەهەزار کەس داگیر ناکرێ...
پاش ئەم هەلنانە دووردرێژە ئەسکەندەر مونشی نووسەری عالەم ئارا ئەلێت: گەلالەی قسە ئەم قەلایە ئەوەندە سەخت بوو، نەوەک گیانلەبەرانی کێوی و جانەوارانیش نەیانئەتوانی بەگژیدا بچن، بەلکو مێروولەش بەخەیال نەیئەتوانی ڕێی بۆ بدۆزێتەوە. ئەم قەلای دمدمەی کە وتمان، ئێستە نەماوە، تەنیا شوێنەواری دیارە و، بەیت وێژانی کورد زۆریان پێیا هەلگوتووە. ئەمە وەها و ئێمە لە وتارەکانی داهاتوودا دەربارەی چارەنووسی ئەم قەلایە ئەدوێین، ئێستە کاتمان تەواو بوو شەوتان باش.

١٣٥٢/٢/١٢

## وتاری: ٦٨

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامە، شەوتان خۆش، کامەرانیتان هیوای ئێمەیە لە وتاری پێشوودا باسی ئەوەمان بۆ کردن، کە لە هەرێمی (تەرگەوەر) لۆز قەڵایەکی کۆنی شاهانی ئێران بووە و، شوێنەواری ماوەتەوە و ئەمیر خانی لەپ زێڕین ویستوویە لەجێی ئەو قەڵایە، دژێکی زۆر سەخت دروست بکات. بۆ دامەزراندنی ئیزنی لە شا عەباس وەرگرتووە، عالەم ئارا وای داوەتە قەڵەم کە ئەو قەڵا کۆنەیە ناوی دمدم بووە، بۆیە ناوی قەڵاکەی ئەمیر خانی لەپ زێڕین بەدمدم ناوبانگی دەرچووە، کەچی ئەمیر شەرەفخان کە پەنجا ساڵ پێش ئەسکەندەر بەگی تورکمان ئەو ناوەی بووە و لەبارەی ئەو ناوەوە شتی نووسیوە، ناوی قەڵای (داودان)ی بردووە، ئێمە ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ناوی (داودان) (داو)، (دیو)، (دیڤاس)، (طاوس) هەموو لە بنەڕەتا لە ناوی (دەئیڤەیەسن)ی خوای کۆنی گەلانی ئاری نژادەوە ماوەتەوە و، ڕەنگە دمدم ناوێ بێ لە لایەن قزلباشەوە درابێ بەو قەڵایە، ئا ئێستە با لەو باسە بگەڕێین و، بزانین ئەمیر خانی لەپ زێڕین کێ بووە؟ ئێمە بۆ ناسینی ئەم سەردارە کوردە، تەنیا سەرچاوەمان هەیە، کە ئەویش (عالەم ئارای عەبباسی)یە، جارێ با گوێ بدەینە موسیقایێ.

موزیک

عالەم ئارای عەبباسی لەلاپەڕە ٧٦٢ بەرگی دووەمدا ئەڵێ: کابرایەکی قەرەتاج ناو لە سەردەمی شا تەهماسپی سەفەویدا بەئازایی و دلێری ناسرابوو... ئەم کابرایە گەرچی لە برادۆستییەکان بوو، بەڵام لەگەڵ شا محەمەد بەگی سەرداری برادۆست نێوانی خراپ بوو، قەرەتاج شادۆست بوو، بەڵام شا محەمەد دژی ئێران، خۆی دابووە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی لەبەرئەمە، شا تەهماسپ ڕێزی نا لە قەرەتاج و سەرداریتیی (ئورمییە - تەرگەوەر - مەرگەوەر- شنۆ)ی دایێ... ئێمە لامان وایە کە (عالەم ئارا) ناوەکەی بەهەڵە نووسیوە، دەبێ قەرەتاج نەبێ، قەرەخان کوڕی ناسر بەگ کوڕی شێر بەگ کوڕی حەسەن بەگشای برادۆستی بێ، کە لە سەردەمی ئەمیر شەرەفخاندا واتا لە ١٠٠٥ کۆچیدا بووە بەسەرداری ئەو هەرێمە...

عالەم ئارا ئەڵێت: ئەم ئەمیر قەرەتاجە لەگەڵ عومەر بەگی فەرمانڕەوای سۆراندا دۆستایەتی بەست، کە عومەر بەگ کەوتە شەڕەوە لەگەڵ دوژمن ئەم قەرەتاجە چووە فریای

و یارمەتی دا تا لەو شەڕانەدا دەستێکی بەر شمشێر کەوت و، بەناوی ئەمیر خانی یەک دەست ناسرا...

وا دیارە (عالەم ئارا) لێرەشدا تووشی هەڵەیەک بووە، چونکە مەبەست لە سۆرانی کۆن لەو حەلەدا ئوستانی ئێستەی هەولێر بووە بەدەست دۆستانی عوسمانییەوە بووە. و لەناو سەردارەکانیدا، ناوی عومەر بەگمان بەرچاو ناکەوێت دەبێ مەبەست عومەر بەگی کەڵوڕ بێت، کە لەو حەلەدا لە حەلەوانەوە تا دەوروبەری بەغدای لەژێر چنگا بووە.

ئنجا عالەم ئارا ئەڵێت: ساڵی ١٠١٨ کۆچی کە شا عەبباسی سەفەوی کەوتە شاڵاو بۆ سەر نەخچەوان و ئێرەوان، ئەم ئەمیر خانی یەک دەستە کە ناوی قەرەتاج بوو، خۆی گەیاندە پێشگای شا عەبباسی و خۆی خستە ڕیزی شا دۆستان و، لەو شەڕانەدا ئەوپەڕی دلێری و ئازایی و جوامێری نواند، لە پاداشی ئەو سەرداریێتییانەدا شا دەستووری بەهونەرکاران دا دەستێکی زێڕین بەگەوهەر و مرواری نەخشێنراویان بۆ دروست کرد و، پاش ئەوە بەئەمیر خانی لەپ زێڕین ناسرا، جگە لەوەش شا فەرمانی سەرداریێتیی ئورمییە و تەرگەوەر و مەرگەوەر و برادۆستی بۆ مۆرکرد و دەستووری دایێ کە ئەو ناوە لە دەستدرێژی سەردارەکانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بپارێزێ. ئەمیر خان کەوتە پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی و، زۆر لە هەرێمە کوردەکانی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی داگیرکرد، بەم جۆرە زۆر لە سەردارە کوردەکان لە دەوری کۆبوونەوە، ناوبانگی دەرکرد و، لە هەموو لاوە ناسرا... بەڵام پاش ئەوە کە سەنان پاشا چەغالە زادەی فەرمانڕەوای عوسمانی هەڵمەتی ئازەربایجانی دا، سەرۆک و مەزنی عێل و تیرە کوردەکانی ئەو ناوە، چوونە یاریدەی سپای قزڵباش، ئەم ئەمیر خانی لەپ زێڕینە سەرەڕای ئەوەش کە لە مەیدانی شەڕەوە نزیک بوو، خۆی تێکەڵی شەڕ نەکرد و، دەرنەکەوت تا حەلێ کە سەنان جەغالە زادە لە شەڕا شکا و، بەسەرشۆڕی کشایەوە ئەو حەلە ئەمیر خانی یەکدەست لەگەڵ سەرانی کوردا ڕووی کردە شارۆلکەی سەلماس و لەوێ گەیشتە پێشگای شا عەبباسی و هەرچەندە بەرامبەر بەدواکەوتن لە شەڕ دەبوو بخرایە زیندان و لە کار بخرێ... بەڵام شا عەبباس چاوی لێ پۆشی و، میهرەبانی لەگەڵ کرد و لەگەڵ باقی سەرداران بەر خەڵات و بەرات کەوت و بەسەربەرزی گەڕایەوە قەڵاکەی خۆی و جارێکی تری کەوتەوە پەرەدان بەقەڵەمڕەوی خۆی... پاش ئەوەی کە خۆی گرت و بەهێز بوو و، سەردارانی کورد لێی کۆبوونەوە و هەوەسی سەرچڵی و یاغیێتی کەوتە مێشکییەوە، بەڵام ئەمەی لەژێر پەردەی دۆستییا دەسپێکرد. لە سەرەتادا نامەیەکی زۆر شادۆستانە و خۆ بەبچووک دانە قەڵەمی

نارد بۆ شا و، تیبیا روونی کردەوە کە قەڵای ئورمییە، قەڵایەکی کۆن و رووخاوە و جێگەی خۆپاراستنی بەرامبەر بەدوژمن نییە و، بەدەردی رۆژگاری ناخوا کە تۆپ و تفەنگی تێدا پەیدابووە... پاش ئەوە داوای لە شا کرد، ماوەی بدا لەسەر دیمەنێکی نوێی بەکەڵک، قەڵایەک دابمەزرێنێ، کە بتوانێ لە رۆژی تەنگانەدا بیکا بەپەناگا و ماڵ و خێزانی تیا قایم بکات کە دوژمن پریان پێ نەبات. شا بەبێ ئەوەی هیچ گومانێ دەربارەی نیازی ئەمیر خان بکات، ماوەی دا... و ئەمیر خان لە جێی ئەو قەڵایە کۆنەی کە وترا، ئەو قەڵا قایمەی دامەزراند، کە بەناوی دمدم ناسرا، بەڵام هەرکە کەوتە دامەزرانی، کەسانی ناحەز کەسانی خراپ بەدەستی کەوتنە گازەندە و سکاڵا و، دڵی شایان لێی رەش کرد.

لە سەرەتادا حەسەن خان و محەمەد پاشا کە هەردووکیان لە سەردارانی سەفەوی بوون، لەگەڵ ئەمیر خان تێکیان دا و بۆ شایان نووسی کە ئەمیر خان نیازی خراپە، شا عەبباس دەستووری دا بەوەزیری خۆی حاتەم بەگی ئوردوبادی بروات و لە چلۆنێتیی کاروباری ئەمیر خان بکۆڵێتەوە و، بیروڕای خۆی بنووسی بۆ شا، ساڵی ١٠١٩ کۆچی حاتەم بەگ رووی کردە قەڵای دمدم بەڵام کە گەیشتە نزیکی ئەو قەڵایە، ئاکامی ناکام چنگی لە یەخەی قایم کرد و کۆچی دوایی کرد، شا عەبباس دەستووری دا ئەبوتالیبی کوڕی لە جێی ئەو ببێ بەوەزیر. ئێمە لێرەدا کاتمان تەواوبوو، بۆ ئەوەی بزانین ئەنجامی ئەم قەڵای دمدمە چی لێ دێ چاوەڕوانی وتارەکانی تریان بن. شەوتان باش.

١٣٥٢/٣/٢٠.

## وتاری: ٦٩

گوێگرە بەرێزەکان، شەوتان باش! کامەرانیتان هیوای ئێمەیە، ئێمە لەسەر باسی دمدم ئەڕۆین واتا ئەو قەڵا بەپشت و هێزەی لە ئەمیر خانی لەپ زێڕین لە هەرێمی تەرگەوەری سەر بەرەزائیەی ئەمڕۆدا دروستی کردبوو و، سەرئەنجام ئەو قەڵایە رووخێنرا و، هەستیارانی ئەو سەردەمە، زۆریان بەیت بۆ ئەو باسە هەڵبەستبوو، جارێ با گوێ بدەینە موسیقایێ ئنجا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

موزیک

لە سەرەتادا وتمان ئەمیر خانی لەپ زێڕین کەوتە بیری ئەوەی لە شوێن قەڵایەکی کۆنی سەردەمی شایانی ئێرانی پێش ئیسلاما، کە جێگەیەکی زۆر سەخت و لەوانەبوو مەگەر بازووشاهێن بەهێزی باڵی بەتینیان پەروازی بەسەرا بکەن قەڵایەکی بەکونگەرە و بازوو دروس بکا کە بتوانێ خۆی و عێلی برادۆست و هێزە چەکدارەکانی تیا بحەوێنەوە و، لە شەڕ و شالاوی سپای عوسمانی و دوژمنانی تری کورد خۆیان بپارێزن.. هەرکە ئەمیر خان کەوتە نامە نووسین بۆ شا عەبباس و تکای ڕوو پێشاندانی لێ کرد و ماوەی درا قەڵاکە دابمەزرێنێ، میری میرانی تەورێز کە ناوی پیر بوداق خانی پەرناک بوو، لەم کارە کەوتە ترس و هەراس و نامەیەکی نووسی بۆ شا عەبباس و تێیدا: بیرورای خۆی بەم جۆرە نیشان دا کە ئەمیر خانی لەپ زێڕین نیازی خراپە و سەرچڵێتی و یاغێتی هەیە، دەستی داوەتە دامەزراندنی قەڵایەکی وەها سەخت و قایم، کە بتوانێ ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆی تیا قەڵابەند بکا و، سەر لە فەرمان هەڵ بچەرخێنێ و، جارِی سەربەخۆیی بدات و، چونکە شاهەنشای بەشکۆ فەرمانڕەوایەتیی ئەم سنوورانەی بەنۆکەری خۆبەختکەری خۆی سپاردووە، ئێمە بیروڕامان وەهایە کە ئەمیر خانی لەپ زێڕین لە دامەزراندنی ئەم قەڵایە قەدەغە بکرێ...

موزیک

پاش ئەوەی کە پیر بوداق خان ئەو نامە دوورودرێژەی نووسی بۆ شا عەبباس، کە دڵی پڕ بکات ل کین دەربارەی ئەمیر خان ئنجا بۆ دروستکردنی بەهانە، یاوەرەکەی خۆی نارد بۆ لای ئەمیر خانی لەپ زێڕین کە ئەم قسانەی پێ ڕابگەیێنێ و پێی بڵێ: ئێوە کە

یەکێکن لە سەرداره مەزنەکانی سەر بەشاهەنشای سەفەوی و، خۆتان بەشادۆست ئەدەنە قەڵەم و، لە سای نەوازشی و میهرەبانیی شادا پەروەردەبوون، دەبێ هەمیشە دڵپاکیتان نیشان بدەن و مەیدان نەدەن بەوەی کە دووزمانان و بەدوێژان بوختانتان بۆ هەڵبەستن و، لەبەرچاوی شا سووکتان بکەن. من دۆستی ئێوەم و، حەز لە سەربەرزیتان دەکەم، قەڵا دروستکردنی ئێوە هەل ئەخاتە دەس بەدوێژان کە ئێوە لەلای شا بەبەدنیازی بدەنە قەڵەم... چونکە ئێوە پێویستتان بەو جۆرە قەڵایە نییە. ئێوە ئەگەر گومانتان وایە سپای ڕۆم -واتا لەشکری عوسمانی- لەناکاو شالاوتان ئەکەنە سەر... ئەم گومانەتان بێ جێیە. دڵنیابن، تا قەڵا گرنگەکانی ئەریڤان و تەورێز و جێیانی تر وەستا بن، سپای ڕۆم بیر لە قەڵای بچووک و، کەم نموو ناکەنەوە و، هەڵمەتی ئێوە نادەن... ئەگەر ترسیشتان لە سەرداره کوردەکانی دراوسێتانە کە هەڵمەتتان بدەن و شەڕەتان پێ بفرۆشن، ئەوا زۆر چاک بزانن کە فەرمانڕەوایەتیی تەورێز و سەرۆک و سەردارانی ئەم دەوروبەرانە، کە هەموویان خۆبەختکەر و گیان فیدای شاهەنشای سەفەوین، ئەمانە لە چاونووقاندنێکا ئەگەنە فریاتان و ئەبنە دیواری پۆلایینی بەرامبەر بەدوژمنان،... جا بەم هۆیانەی کە بۆتانم ڕوون کردەوە و بەباشی ئەزانم کە ئێوە قەڵاکەی ئورمییە سەرلەنوێ ڕێک بخەنەوە و عێل و تیرەکانی برادۆست لە دەوری قەڵاکەدا دابمەزرێنن... ئەم ئامۆژگارییانەی ئێمە هۆی مانەوەی دەسەڵات و پایەبەرزیتانە.

موزیک

پیر بوداق خان، ئەم ڕاسپێرییانەی بەهۆی یەکێک لە یاوەرانی خۆیەوە گەیاندبوو بەئەمیر خان، بەڵام ئەمیر خان نەوەک هەر گوێی نەدابووە ئامۆژگارییەکان، بەڵکو کوردە برادۆستییەکانی دەوروبەری، یاوەرە ئەسپەردەکەی پیر بوداق خانیان کوشتبوو.

و ئەمیر خان زۆر بەجەخت و خەباتەوە کەوتبووە سەخت و قایمکردنی قەڵاکە و، هەموو جۆرە پێتەویستێکی تیا عەمار کردبوو، لە چەک و تفاقی شەڕ، دەغڵودان و خواردەمەنی و بەرگ و جل و پۆشەمەنی... و هی تری... جگە لەوانەش کەوتبووە پەنادانی ئەو کەسانەی سەرچڵییان ئەکرد و لە دەوڵەتی سەفەوی یاغیبوون یەکێ لەوانە خان ئەبداڵ خان برای شێخ حەیدەری موکری بوو، کە لە دەوڵەتی سەفەوی یاغی و شا دەستووری گرتنی دابوو... ئەمیر خان ئەو و بیست کەس لە یارانی لەو قەڵایەدا پەنا دابوو... جگە لەمانە هەر لەو حەلانەدا بوو کە هەندێ لە سەرۆک عێل و تیرەکانی کوردستان -کە بەداخەوە خێوی

(عالەم ئارای عەبباسی) ناوی نەبردوون- لە فەرمانبەری سەرپێچییان کردبوو و شا عەبباس فەرمانی دابوو بەپیر بوداق خان کە هێزێک لە جەلالییەکان پێک بهێنێ و بڕوات بەرەو کوردستان و لە سەرەڕێیا یارمەتی و هێز لە هەموو سەردار کوردەکان، تەنانەت لە ئەمیر خانی لەپ زێڕین وەربگرێ... هەرکە ئەمیر خان ئەم هەواڵەی زانی، سڵەمییەوە لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان: ئەوە بوو کە جەلالییەکان لە عێلە کوردەکانی کوردستانی ژێردەستی عوسمانی بوون و، پاش شەڕوشۆڕ خۆیان دابووە پەنای شای سەفەوی و، هەم بەهێز و ئازابوون و هەم بێ لانە و جێ و ئەترسا کە دەوڵەتی سەفەوی لە هەرێمەکەی ئەوا جێگیریان بکات. جگە لەوەش لەوە ئەترسا کە پیر بوداق خان لە تۆڵەی یاوەرەکەیا، شەڕی هەڵ بگیرسێنێ. لەبەر ئەم هۆیانە ئەمیر خانی لەپ زێڕین نامەیەکی بۆ شا عەبباس نووسی و، پاش دەرخستنی دڵپاکی و شادۆستی تییایدا ڕوونی کردەوە: کە پیر بوداق لەگەڵ ئێمەدا نێوانی ناخۆشە و زۆر بوختانی بۆ ئێمە هەڵبەستووە و زۆر گوزارەی درۆکانی و دەس هەڵبەستی داوەتە دەرباری شاهانە، بۆ ئەوەی خاوەن شکۆ لە ئێمە بڕەنجێ و لە نەوازش و میهرەبانیان بێ بەش بین... جا لەبەر ئەم هۆیە هاوکاریمان لەگەڵ ئەم پیاوە سەختە و، ناشایەستەشە کە بەم جۆرە بەخاکی وڵاتەکەمانا ڕابووڕێ... شا عەبباس کە ئەمیر خانی لەپ زێڕینی زۆر پێویست بوو، فەرمانی دا بەوەی کە حەسەن خان لە سەردارانی ئەراک لە جێی پیر بوداق فەرمانڕەوایەتی هێزی جەلالی و کوردەکانی تر بگرێتە ئەستۆ و، هەروا بۆ ئەمیر خانی لەپ زێڕینیش نووسی: ئەگەر خۆی خەریکی کاروباری قەلاکەیەتی، با یەکێک لە ڕۆڵە پیاوماقووڵەکانی بەردەسی، لەگەڵ چەند سەد کەسێکا بخاتە ژێر فەرمانی حەسەن خانەوە بۆ ڕێ بەدێیی جەلالییەکان، کە لە وڵاتی کوردستانا ناشارەزان...

گوێگرە خۆشەویستەکان! ئێمە لێرەدا کاتمان تەواو بوو، بۆ ئەوەی بزانن کە ئەمیر خان چی دەکات و چارەنووسی قەڵای دمدم ئەبێ بەچی، چاوەڕوانی وتارەکانی ئایندە بن، تا حەوتەیەکی تری کە بەیەک ئەگەینەوە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

٢٨/جۆزەردان/٢٦٧٣

٢٨/خورداد/١٣٥٢

١٨/حوزەیران/١٩٧٣

## وتاری: ٧٠

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان خۆش کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆ ئێرانە... ئێمە هێشتا لەسەر باسی دمدم ئەڕۆین... بەپێی نووسینی ئەسکەندەر مونشی دانەری (عالەم ئارای عەبباسی)... لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەویدا هەندێ لە سەرداره عێلەکانی کوردستانی ئەردەڵان، کەوتبوونە بیری سەرچڵی و سەر لە فەرمان وەرگێڕان... و لە هەمان کاتا ئەمیر خانی لەپ زێڕین یەکێ بووه لە سەرداره کورده مەزنەکانی سەر بەدەوڵەتی سەفەوی و دڵپاکانە و شادۆستانە سەنگەرێ بووه بەرامبەر بەشاڵاو و هەڵمەتی عێلەکانی سەر بەعوسمانی و، بەوهۆیەوە شا عەبباس ڕێی داوه کە قەڵایەکی سەخت دابمەزرێنێ بۆ پاراستنی خۆی و دارودەستەی و عێلی برادۆست و هێزه کوردەکانی ژێردەستی... بەڵام پیر بوداق خان پەڕناکی فەرمانڕەوای تەورێز لەو گوزارەدا کە بۆ شا عەبباسی نووسیوه، نارەزایی خۆی دەربڕی لە کاری ئەمیر خانی لەپ زێڕین وای داوەتە قەڵەم کە ئەمیر خان نیازی خراپە و، گەرنە ئەم قەڵا قایمە بۆچ دروست ئەکا... هەر لەو کاتەدا هەندێ لەو عێل و تیره کوردانەی کە لە عوسمانی یاغی بووبوون و، خۆیان دابووه پاڵ سەفەوی و بەجەلالی ئەناسران، شا عەبباس دەستووری دابوو کە بەفەرمانداریتی و سەرداریتی محەمەد پاشای قەلەندەر ئوغلی کوردا بچن بۆ دامرکاندنی عێلەکانی کوردستانی ئەردەڵان و، دەستووریشی دابوو بەپیر بوداق خان، بەلەشکرێکی قزڵباشەوه لەگەڵ جەلالییەکان بڕوات... بەڵام کە ئەمیر خانی لەپ زێڕین بەم باسەی زانیبوو، نامەی نووسیبوو لە شا عەبباس و بۆی ڕوونکردبووەوه کە لە نیازی بەدی پیر بوداق دوودڵە... شا عەبباس لەبەر دڵی ئەو بەپیر بوداق ئەگۆڕێ و لە جێی ئەو حەسەن خان ئەستاجلو ئەکات بەفەرمانڕەوا... جا هێزی جەلالی ئەکەوێتە ڕێ بەرەو کوردستان و حەسەن خانیش بەلەشکرێکی قزڵباشەوه بەدوایانا دێت و، لە مەراغە یەک دەگرن و، لەوێوە نامەیەک ئەنووسن بۆ ئەمیر خانی لەپ زێڕین کە یا خۆی و یاخۆ یەکێ لە پیاوماقووڵانی بەهێزێکەوە ئامادە بێ بۆ ڕێ بەدێیی کردنی هێزی جەلالی و هێزی قزڵباش و، ئەم نامەیە ئەسپەردەی حەسەن خان ئەستاجلو دەبیا... ئەمیر خان لە وەراما ئەڵێ: ئەوەی ڕاستی بێ ئەم جەلالییانە مرۆڤگەلێکی سەرچڵ و دڕنده و نالەبارن هەرچەنده لە سای قزڵباشیشدا بن، جێگەی باوەڕ نین و دڵ لێیان ئەسڵەمێتەوه لەبەرئەوه نامەوێ

لەگەڵ لەشکرێکی حەوت هەشت هەزار کەسیی جەلالیدا بڕۆم من وەهام پێ باشە کە ئەوان لەپێشەوە بڕۆن و، هەر ڕێگەیەکیان گرتە پێش من بەدوایانا ئەڕۆم...

سەردارانی قزڵباش، ئەم قسانەی ئەمیر خانیان بەسەرچڵی و ڕوو لە فەرمان وەرگێڕان دایە قەڵەم و، بڕیاریان دا کە هەر جۆر بێ بەو کارە ڕازی بکەن و بەبیروڕای هەموویان هەواڵێکی بەم جۆرەیان بۆ نارد: ئەگەر ئەمیر خان، کە یەکێکە لە سەردارە مەزنەکانی دەوڵەتی سەفەوی و، لە شادۆستە دڵپاکەکان، بەم جۆرە وەڵامی ئەسپەردەی ئێمە بداتەوە و، نەیەوێ هێزی قزڵباش و هێزی جەلالی ڕێ بەدێیی بکات، دەبێ ئێمە چی هیوایەک لە سەردارانی تری کورد بکەین؟ ئەوا ئێمە لە مەراغەوە کەوتینە ڕێ بەرەو لای ئێوە و، چەند شەوێ لە هەرێمی ئێوەدا لەشکربەز ئەکەین و، لەوێ لەم بارەوە پێکەوە ئەدوێین. پاشان وەکو ئەسکەندەر مونشی لە عالەم ئارادا ئەنووسێت: ئەمیر خان گوێی نەدایە پەیام و سفارشی حەسەن خان و سەردارانی قزڵباش و، لەسەر سەرچڵی و ملهوڕی خۆی مایەوە... و هەرکە پێشەنگی لەشکرەکە گەیییە سەر سنووری هەرێمی ژێردەستی ئەمیر خان، دەسبەجێ لقێ لە کوردە برادۆستییەکان بەچەک و کەرەسە و تفاقی شەڕەوە ڕێیان بەجەلالییەکان گرت و کەوتنە شەڕەوە و دوو کەس لە جەلالییەکان کوژرا و چەند کەسێکیش بریندار و زامدار کران، هەرکە حەسەن خانی استاجلو و سەردارەکانی تری قزڵباش بەم کارەساتەیان زانی، زۆر گورج دەستووریان دا بەکشانەوەی لەشکر لە هەرێمی ژێردەستی ئەمیر خان و، خۆپاراستنی لە شەڕ و هەرا... و نیو سات دوور لە قەڵای دمدم، لەشکربەز بکەن... هێزەکانی کوردی برادۆستی سەر بەئەمیر خان کە ئەم کارەیان دی، گەڕانەوە ناو قەڵای سەختی دمدم و لەوێوە هێزە جەلالی و قزڵباشەکانیان دایە بەر گوللەی تۆپ و تفەنگ... حەسەن خان ئەستاجلو زۆر بەپەلە ئەسپەردەی نارد بۆ لای ئەمیر خان بۆ تێگەیشتن لە هۆی ئەم گوللەبارانە و تەقەکردنە، ئەمیر خان لە وەراما جۆرە قسەگەل و جۆرە پۆزشێکی هێنایەوە، کە حەسەن خان و سەردارانی تر، لایان جوان و پەسەند نەبوو... دوای ئەوە پەیڕەوانی ئەمیر خان تیپ تیپ و قۆڵ قۆڵ و، لق لق، لە قەڵاکە ئەهاتنە خوارەوە و هەڵمەتی جەلالی و قزڵباشەکانیان ئەدا، کە لە ئوردوگا و لەشکرگاکانەوە ڕوویان ئەکردە دێ و ئاواییەکان بۆ ئازووقە و، پەیداکردنی شتومەکی پێتەویست، ڕووتیان ئەکردنەوە و تالانیان ئەکردن... بەم جۆرە شەڕ و هەرا لە نێوانی هەردوولا دا پەیدابوو... لەم کاتەدا ئەو جەلالییانەی کە لەگەڵ محەمەد پاشا قەڵەندەر ئوغلیی سەرۆکیاندا، نارێک بوون ئەوانیش پەل پەل و لق لق هەڵئەهاتن و خۆیان ئەدایە پاڵ

ئەمیـر خان، تەنانەت مـحەمەد بەگ ناوێک بەداروەدەستەی خۆیەوە کە نزیکی سێ سەد چوارسەد کەس ئەبوون هەمـوویان خۆیان دایە پەنای ئەمیر خان... مـحەمەد پاشا قەڵەندەر ئوغلو لەم ڕووداوانە زۆر ئەشڵەژا... لە ڕقا دوو دەسـتووری دا بەهێـزی جەلالی کە هەموو شـار و دێیـەکانی سەر بەئەمیـر خان داگـیر بکەن... حەسەن خان کە ئەمـەی دی، خۆی و سـەردارانی قـزڵـبـاش زوو گـوزارەیان بۆ شـا عـەبـبـاس نووسی و کـارەسـاتەکـەیان بۆ ڕوون کردەوە... جـا ئەم هەراوهۆریایە سەرئەنجـام وەرگەڕا بەو شـەڕە سـەخـتـەی کە بەیت وێژانی کورد، خستـیانە قاڵبی هەڵبەستی جەنگییەوە (مەلحەمە) و ئێمە لە وتارەکانی ئایندەدا، سـەرئەنجـامی چۆن قەومـانی شەڕەکە و بەچی گـەیینی و، سـەرنوشـتـیان ڕوون ئەکـەینەوە، ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

٦/دروێنە/٢٦٧٤

١٣٥٢/٤/٦

## وتاری: ٧١

گوێگرانی بەڕێز شەوتان باش، هیوای ئێمە کامەرانیتانە.

ئێمە هێشتا لەسەر باسی (دمدم) ئەڕۆین. لە وتاری پێشوودا گەیشتینە ئەوێ کە جەلالییەکان پاش ئەوەی چەند جارێک لەگەڵ کوردە برادۆستییەکانا تەقین بەیەکا و شەڕیان لە بەینا قەوما و چەند پیاوێک لە هەردوولایان کوژرا، کەوتنە داگیرکردنی ولاتەکەی ژێردەستی ئەمیر خانی لەپ زێڕین کە لە قەلاّی دمدمدا خۆی قایم کردبوو. حەسەن خان ئەستاجلو لەم بارەوە پەیامی نارد بۆ شا عەبباس و نارێکی و نالەباریی ئەو ناوەی بۆ ڕوون کردەوە. شا عەبباس فەرمانی دا بەئیعتیماد الدەولە حاتەم خانی وەزیری خۆی کە بچێ بۆ هەرێمی ئورمییە و لەوێوە لەباری ئەو ناوەوە، بکۆڵێتەوە و، باش لە نیازی ئەمیر خان تێ بگات... ئەگەر هەستی بەوە کرد ئەمیر خان شادۆست و نیازی خراپەی لە دلاّ نییە و، نایەوێ هەڵبگەڕێتەوە و، لە فەرمانی شا سەرپێچی بکات، ئەوا نوازشی بکات و دڵخۆشی بداتەوە و قزڵباشی و جەلالییەکان لە دەوروبەری قەلاّکە دوور بخاتەوە و، بەسەر چەند زستانە هەوارێکا دابەشیان بکات و، پێنج هەزار زێڕی سووریان بەسەرا بەش بکات و، بەئەمیر خانیش ڕابگەیێنێ کە ئازادانە بۆ خۆی بژێ و پشتیوانیی خۆی لە دەوڵەتی سەفەویی نیشان بدات... بەلاّم ئەگەر هەستی بەوە کرد کە ئەمیر خان نیازی چاکی نییە، نایەوێ سەر بۆ فەرمانی شا شۆڕ بکات و بیری هەڵگەڕانەوە لە مێشکیا ئەجووڵێ ئەوا هێز بنێرێتە سەری و لە قەلاّکە دەری بکات و گوێی ڕابکێشێ و هەرێمەکەی ژێردەستیشی هەموو لە دەس وەرگرێ و، بەسەر جەلالییەکانا دابەشی بکات...
بەپێی ئەم فەرمانە ئیعتیماد الدەولە حاتەم بیگ ئەردەبیلی بەجێ هێشت و بەرەو تەورێز کەوتە ڕێ و، لەوێ پیر بوداق خانی فەرمانڕەوای تەورێز و بەرخوردار بەگ ئەنیشی سەرۆکی تۆپچییەکان و هەموو تۆپچی و تفەنگچییەکانی ئیسفەهان و خوراسان و تەورێز و بافق و دوو هەزار جەلالی تریش لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بەرەو ئورمییە کەوتنە ڕێ و، لە سەڵماسیشەوە خان ئەمیر خان کوڕی غازی بەگی کوردی فەرمانڕەوای ئەوێ و، ئەولیابەگی کوڕی کوێر سەیفەدینی فەرمانڕەوای ئەنزل و سومایش کەوتنە تەکیان و ڕۆژی سێ شەممە ٢٦ی مانگی شەعبانی ساڵی ١٠١٨ کۆچی، گەیشتە ئورمییە و لە لایەن

حەسەن خان ئەستاجلو و محەمەد پاشای قەڵەندەر ئوغلییە و پێشوازی کران و، لە جێگەیەکی باش لەشکربەزیان کرد.

پاش ئەوەی کە چەند ڕۆژێ حەسانەوە ئنجا ئیعتیماد الدەولە یەکێ لە جێ باوەڕانی خۆی کە زۆر جێی باوەڕی بوو، لەگەڵ مەلیک محەمەدی تەسوجییا کە زۆر دۆستی ئەمیر خان بوو، ناردی بۆ لای ئەمیر خان کە قسەی لەگەڵ بکات و دەمودووی تاقی بکاتەوە و نیازی دەروونی ئەو تێ بگا و داوای لێ بکا لە قەڵاکە بێتە خوارەوە و لە جێگایەکا لەگەڵ ئیعتیماد الدەولە یەک بگرن و پێکەوە بدوێن... ئەم ئەسپاردەییە کە چووە لای ئەمیر خان و لەگەڵی دوا، ئەمیر خان خۆی وەها نیشان دا کە هەمیشە شادۆست و دڵپاک بووە، هەرگیز بیری لە یاغێتی و سەرچڵی نەکردۆتەوە... و تەنیا لەبەرئەوەی کە لە جەلالییەکان دووداڵ بووە و محەمەد پاشا جەلالی ئەوی لەلای شا بەدناو کردووە و، حەسەن خان ئەستاجلویش هەر پشتیوانی لە ئەو کردووە، لەبەرئەوە نەیوێراوە خۆی لەوان نزیک بکاتەوە و، خۆی لە قەڵای دمدمدا قایم کردووە، ئێستەش تکای لە وەزیر و هاوڕێیانی ئەوەیە کە لەلای شا پۆزشی بۆ بهێننەوە و، ماوەی بدەن ئەم زستانە لە قەڵادا بەسەرببات و، لە هەمان کاتا یەکێک لە کوڕەکانیشی بەدیاری و، پێشکەشەوە ئەنێرێ بۆ دەرباری شاهانە...

پاش ئەم قسانە ئەسپاردەکە گەڕایەوە بۆ لای ئیعتیماد الدەولە و، ڕۆژی دوایی لەپاڵ قەڵاکەدا لەگەڵ ئەمیر خانی لەپ زێڕین یەکیان گرت، ئیعتیماد الدەولە پاش ئامۆژگاری کردنی ئەمیر خان بڕیاری دا کە هەموو داخوازییەکانی بگەیێنێ بەشا بەو شەرتەی کە ئەمیر خان بێ خۆنواندن و لەخۆبایی بوون وەک جاران بەژیانی سادەی خۆی درێژە بدات و ڕۆژی دوایێ لە قەڵاکە بێتە خوارەوە بۆ ناو ئورد و سپای قزڵباش و چەند ڕۆژ میوانی وەزیر و سەرداران بێ تا لە یەک باشتر دڵنیابن، پاش ئەوە هەموو سەرداران لەگەڵ وەزیر بچن میوانی ئەمیر خان بن و، قەڵاکەی پیرۆزبایی بکەن. ئەمیر خان بەڵێنی دا کە ڕۆژی دوایی بچێتە خوارەوە، بۆ لای وەزیر بەو شەرتەی کە هیچ کەسێ لە جەلالییان لەوێ نەبێ... ڕۆژی دوایی بەپێی ئەو بەڵێنەی بەیەکیان دابوو ئیعتیماد الدەولە کۆڕێکی گەرمی بەست و، هەموو سەردارانی قزڵباشی بانگ کردە لای خۆی، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەمیر خان دۆستیان بکاتەوە، بەڵام پاش چاوەڕێی دوورودرێژ ئەمیر خان لە قەڵاکە نەهاتە خوارەوە ئیعتیماد الدەولەی وەزیر جارێکی تر مەلیک محەمەد تەسوجی ناردەوە بۆ لای: کە ئێمە چاوەڕێی ئەوین... بەڵام ئەمیر خان لە وەراما بەمەلیک محەمەد تەسوجی وتبوو: کە

ئەمشەو هەموو ڕیش سپی و پیاوماقوولانی برادۆستی کۆکردۆتەوە و پرس و ڕاوێژی لەگەڵ کردوون ئەوان ڕێیان نەداوە کە بێت و، ڕوویان نیشان نەداوە و، بەڵگەشیان ئەوە بووە: کە ئیعتیماد الدەولە خۆی پیاوی شمشێر و تفەنگ نییە... پیاوی قەڵەم و نووسینە... ئەو ناتوانێ ئەمیر خان لە فڕوفێڵ و داو و پیلانی قزڵباشی و جەلالی بپارێزێ. جا ئەمەیە هۆی نەهاتنی و، پالافتەی قسە ئەوەیە کە نایەوێ بەم جۆرە خۆی بداتە دەسەوە و، هەر کات خۆی پێی باش بێ کوڕەکەی بەپێشکەشەوە ئەنێرێ بۆ دەرباری بەرزی خاوەن شکۆ شا... هەرکە ئەسپاردەکە هاتەوە و، ئەم قسانەی ئەمیر خانی بۆ ئیعتیماد الدەولە گێڕایەوە، دەسبەجێ کۆڕێکی لە سەرداران و فەرماندەیان بۆ ڕاوێژ بەست و سەرئەنجام بەو جۆرە بڕیار درا: کە نابێ ڕێ بدرێ بەئەمیر خان بەسەرچڵی و یاغیێتی بمێنێتەوە، کە خەڵقی تر پەیڕەوی لێ بکەن دەبێ سەری پێ شۆڕ بکرێ... لە سەرەتادا قەڵاکەی گەمارۆ بدرێ ئنجا گوزارەیەکی دوورودرێژ بۆ شا عەبباس بنووسرێ دەربارەی سەختی و قایمی قەڵاکە و، ئەوەی کە لە پێشا ئەمیر خان پۆزشی هێناوەتەوە بەو لە پاشا خۆی نەداوەتە دەستەوە... ئا بەم جۆرە شەڕی قەڵای دمدم دەس پێ ئەکا، کە لە وتاری ئایندەدا بۆتان ڕوون دەکەینەوە ئێستە کاتمان تەواوبوو شەوتان باش.

١٣٥٢/٤/١٣

١٣/درەوێنە/٢٦٧٤

## وتاری: ٧٢

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش! کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە.

ئێمە هێشتا لەسەر باسی (دمدم) ئەڕۆین. ئەوە بوو وتمان ئیعتیماد الدەولە حاتەم وەزیری شا عەبباسی سەفەوی، پاش ئەوەی کە چەند جارێ ئەسپاردەی لەگەڵ ئەمیر خانی لەپ زێڕین گۆڕییەوە و، بۆی دەرکەوت: کە ئەمیر خان نایەوێ سەر بۆ هیچ کام لا شۆڕ بکات... نە بۆ دەوڵەتی سەفەوی و نە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و هەر بەو نیازە قەڵای سەختی دمدمی دروست کردووە، نامەیەکی بۆ شا عەبباس نووسی، دوورودرێژ باسەکەی بۆ ڕوون کردەوە و، داوای لێ کرد کە ئاخرین بیروباوەڕی خۆی دەربڕێ و، فەرمانی خۆی بدات... ئەوەبوو دەستووری شا عەبباس هات بەوە کە دەبێ سەری پێ دابنەوێنرێ.

موزیک

جگە لە هیزی جەلالی و هێزی قزڵباشی، کە لەوەبەر لەگەڵ محەمەد پاشا و حەسەن خان ئەستاجلودا هاتبوون و، جگە لەو هێزانەی لەگەڵ خودی وەزیر حاتەم بەگدا هاتبوون، کە بڕیاری گەمارۆی قەڵاکە درا ئەم هێزانەش بۆ یارمەتی گەیشتن: ٥٠٠ تفەنگچیی مازەندەرانی بەسەرۆکایەتیی سەفەرقوڵی بێگ یوزباشی و پاسەوانە قوروچییەکانی چنگنی و، سپای چەکداری تەورێز بەفەرماندەیی گەنج عەلی خان و، بەم جۆرە کە باسی دەکەین کەوتنە گەمارۆدانی قەڵاکە و بەسەر قەڵاکەدا دابەش کران: حەسەن خان ئەستاجلو کە فەرماندەی سپای قزڵباش بوو، بەخۆی و ئەمیرانی ژێردەستییە و هێزەکانییانەوە لەگەڵ میر فەتاحی سەرکردەی تفەنگچییەکانی ئەسفەهانی، کەوتنە لای خۆرهەڵاتی قەڵاکە و، پیر بوداق خان و هێزەکانی لەگەڵ تفەنگچییەکانی خوراسانی و بافیقی لای خۆرئاوای قەڵاکەیان گرت و موراد خان سوڵتان چینی و، خەلیل سوڵتان سوپەر و، محەمەد تەقی بیگ مین باشیی تفەنگچییە ئازەربایجانییەکان، لای باشوور و خوارووی قەڵاکەیان گرتە ئەستۆ کە پێی ئەوترا (قەڵای بەفرخانە) و گەنج عەلی خان دانرا بۆ پارێزگاریی دەرگای قەڵاکە و، تفەنگچییە مازەندەرانییەکان لەگەڵ سەفەرقوڵی بەگ و پاسەوانانی چنگنیدا پاراستنی لای باکوری قەڵاکەیان خرایە ئەستۆ کە بەرامبەر بەقەڵای ئاوەکە بوو...
بەرخوردار بەگ ئەنیس بەگیش لەگەڵ کارگەران و ئەندازیاران، ئامادەکردنی دوو تۆپ و

باڵیمەزێکیان[1] خرایە سەر شان و، تۆپێکی بچووکیش بەرامبەر بەکونگەرەی قەڵاکە دامەزرێنرا. و بەم جۆرە قەڵای دمدم گەمارۆ درا... محەممەد پاشای جەلالی لەم سەردەمەدا تووشی نەخۆشیی دەردە دڵ هات و لە فەرماندەیی جەلالی لادرا و، جەلالییەکان دابەش کران بەسەر ئەم قۆڵانەدا کە دامەزرابوو...

موزیک

ئەمیر خانی لەپ زێڕین، کە ئەم گەمارۆ سەختەی هەست کرد چەندجارێ نامەی بۆ ئیعتیماد الدەولە نارد و، جەختی لەسەر دڵپاکی و شادۆستی خۆی کرد و، داوای ئەوەی کرد هێزەکان لە قەڵاکەی دوور بخرێتەوە... بەڵام وەزیر گوێی نەدایە تکاکەی و قسەکانی بەفڕوفێڵ دایە قەڵەم و لەسەر گەمارۆدان سوور وەستا... هەندێ لە سەردارانی برادۆست کە بەمەیان زانی لای ئەمیر خانیان بەردا و، لە قەڵاکە هەڵاتن و خۆیان دایە پەنای دەوڵەت و، پەیامیان دا بەوەزیر کە ئەمیر خان پەشێوە توانای شەڕی نییە، خەڵکی ناو قەڵاکە پەرۆشن لەبەر بێ ئاوی، ئەمساڵ باران نەباریوە، ئاوی چاڵاوە گەورەکە گەنیوە تەرخان کراوە بۆ ئاژەڵ و گیانلەبەران، ئازووقەش کەمە... کە وەزیر ئەم قسانەی زانی، پتر هەوڵی دا ئەمیر خان تەنگەتاو بکات، ناردی ژمارەیەک کارێزکەنیان هێنا کە بکەونە قوش لێدان بۆ سەرکانی ئاوەکەی ژێر (قەڵای ئاو)ەکە بەڵکو ڕێگای ئاوەکەیان لێ ببڕن... بەڵام سێ مانگەی ڕەمەزان، شەوال، ذیلقەعدەیان بەسەربرد و سوودێکی نەبوو، چونکە ڕێیان بەسەرچاوەی کانی ئاوەکە نەدەبرد... تەنانەت ئەو کانییە لەژێر لێواری چیاکەوە گومەزێکی سێ چوار چینی لەسەرا کرابوو... ئنجا وەزیر دەستووری دا کە گومەزی سەر ئاوەکە بدەنە بەر تۆپ... و ئەوەش هەر سوودی نەبوو... ناچار وەزیر دەستووری دا بەهەریەک لە فەرماندەیانی ئەو قۆڵانە، هەر کەس لەلای خۆیەوە، سەر بەباڵا بۆ بن دیواری قەڵاکە قوش لێ بدەن... بەڵام هێزی ئەمیر خان بەشەو لە قەڵاکە ئەهاتنە خوارەوە و، هەڵمەتی ئەم بنکەیانەیان ئەدا و چەند کەسێکیان لێ ئەکوشتن و ئەگەڕانەوە، هەرچۆن بوو بەتۆپ هەندێکیان لە کەناری دیواری یەکەم قەڵا ڕووخاند و، ئەمەیان بەسەرکەوتن هاتە بەرچاو... پاڵاوتەی قسە، پاش کۆششی زۆر ڕێ بۆ سەر کانی ئاوەکە دۆزرایەوە و لەوێوە پاسەوانەکانی قەڵای ئاویان بەدووکەڵ قانگ ئەدا کە نەتوانن پارێزگاریی ئاوەکە بکەن... بەڵام لەم کاتەدا بارانێکی چەند ڕۆژە باری... ئیتر هێزەکانی ئەمیر خان ئەو ڕێگەیەیان بەست و، پێتەویستیان بەکانی ئاوەکە نەما... شەش مانگێکی تر، هێزی دەوڵەتی

(١) باڵیمەز: مەنجەنیق.

سەفەوی لەگەڵ گەمارۆ خەریک بوون و لەم سەردەمەدا پاراستنی ئەم قەڵایە بەئەستۆی قەرابەگەوە بوو کە یەکێ بوو لە وەکیلانی ئەمیر خان... پاش ئەوەی کە توانییان بەتۆپ کەناری قەڵاکە برووخێنن، یەکەم کەسێ کوژرا ئەم قەرا بەگە بوو. پاش ئەوە قەڵاکان یەک لەدوای یەک خۆیان بەئاشتی دا بەدەستەوە و ئێمە نامانەوێ پتر لەسەر باسی شەڕی هەردوولا بڕۆین. بەیت وێژان کارەساتەکانیان زۆرباش هۆنیوەتەوە و، خاوەنی (عالەم ئارا)ش بەدووردرێژ باسی کردووە...

ئەمیر خانی لەپ زێڕین، پاش ئەوەی کە بینی هەموو قەڵاکان داگیرکران تەنها قەڵای تایبەتی منداڵ و خێزانەکەی بەدەستەوە مابوو یەکێکی نارد بۆ لای محەممەد بیگ بیگدلی شاملو و داوای لێ کرد کە بەهێزێکەوە بێت وەریان بگرێ و، لە حەسەن خان ئەستاجلو و هێزەکەی رزگاریان بکات. محەممەد بەگ زوو بەهێزێکەوە چوو پاسەوانی بۆ قەڵاکەی ئەمیر خان دانا و، ئەمیر خان و دەستەودایەرە و قەوم و کەسانی هەموو بردە خێوەتەکەی خۆی و، لەو چادرەدا دایمەزراندن... کە حەسەن خان ئەستاجلو بەمەی زانی چوو بۆ لای محەممەد بەگ و بەدزییەوە پێی وت: ئەم ئەمیر خانە کە هەموو دەس و پێوەندەکانی چەکدارن، جێی باوەڕ نین، ئەمیر خان و کوڕەکانی ببەرە چادرێ و، نۆکەر و دەستەودایەرەشی با لە چادرێکا بن و لەیەک دووربن، تا سەرانی سپا کۆئەبنەوە و، دەربارەی چارەنووسیان ئەنووسن بۆ شا عەبباس... لەم کاتەدا خان ئەبداڵ خانی موکری کە میوانی ئیلیاسی خەلیفە بوو و، نۆکەرانی خەلیفە ویستبوویان چەکەکانیان لێ دابڕنن، بوو بەهەرا و کێشەیان و لەگەڵ چەند قزڵباشێکا تێک ڕژان و هەندێکیان برینداربوون و هەندێکیان کوژران... هەر لەم کاتەدا کە ئەسپاردەی محەممەد بیگ داوایان لە ئەمیر خان کرد لە هێزەکەی جیا ببێتەوە بچێتە چادرێ تری، ئەم کارە بەتەگبیر و نیازی بەد درایە قەڵەم، لەبەرئەمە دەس و پێوەندەی ئەمیر خان شیریان هەڵکێشا و هەڵمەتیان دا و، بەم جۆرە هێزەکانی ئەمیر خان و هێزی قزڵباشی و جەلالی و ئەو کوردانەی لایەنی دەوڵەتیان ئەگرت، هەموو ڕژان بەیەکا... ئەمیر خان و دەوروبەری و سەدەها لە پیاوانی قزڵباشی کوژران و بەم جۆرە قەڵای دمدم داگیرکرا.

گوێگرانی بەڕێز، لێرەدا ئەم باسە تەواوبوو تا باسێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان خۆش.

٢٤/دروێنە/٢٦٧٤

١٣٥٢/٤/٢٤

# دینەوەر

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش... لەم ڕیزە وتارەدا دەربارەی (دینەوەر) ئەدوێین، ئەو جێیەی کە لە مێژووی کۆنا لاپەڕەیەکی زێڕینی داگیر کردووە و زانای زۆر و فەرمانڕەوای بەناو ، ڕێبەرانی ڕچانی دەروێشی و سۆفێتی گەورەی پێ گەیاندووە، تەنانەت ماوەیەک ناوچەی فەرماندارییە کوردەکانی حەسەن وەیهی و، عەییاری بووە.

ناوی ئەم دینەوەرە بەگومانی هەندێ لە مێژوونووسان لە ناوی (دیونوسوس)ەوە هاتووە، کە خوای ئەدەب و هونەر و، شەراب و، باران و گوڵ و گوڵزاری یۆنانییەکان بووە، گۆیا ئەم ناوە بووە بە (دینو) و پاشان بووەتە (دینەوەر)، کە ئەمەش دوور نییە پاش سەردەمی داگیرکاریی ئەسکەندەر و مانەوەی سلوکییەکان لە ئێرانا بەشێ لە یۆنانییەکان لەم هەرێمەدا لەشکربەزیان کردبێ و، بەرامبەر بەناوی ئاهوراکانی سەر تەپەڵاکی بێستون، ئەوانیش ناوی (دینوسوس)یان بڵاو کردبێتەوە، چونکە لە کولێارییەکان ئەم ساڵانەی دواییەدا، کە لەو ناوەدا کرا حەوزێکی مەڕمەڕ دۆزرایەوە، کە کەنارەکانی بەپەیکەرە و ئابوودەی (سینوس) و (ساتیر) ڕازێنرابووەوە...

پاش ئەم دەورە، بەپێی وتەی مەسعودی کە لە لاپەڕە ٢٥٧ بەرگی یەکەم (مروج الذهب MROJ AL-ZAHAB)دا ئەڵێ: پادشایانی ئەشکانی لە بنەڕەتا لە هەرێمی چیادا ڕاپەڕین، واتا لە وڵاتی (دینەوەر - نەهاوەند - هەمەدان - ماسەبزان - ئازەربایجان)دا. ئەو دوای عێل پاشاگەلی ئەشکانی، کە بە (ملوک الطوائف) بەناوبانگن و لە هەرێمەکانی تری ئێرانا فەرمانڕەوا بوون، هەموویان سەر بەئەمان و، لەژێردەستی ئەمانا بوون و، بەناوی ئەمانەوە پێیان ئەوترا ئەشکانی... پاشان بەپێی لاپەڕە ١١٥ فتوح البولدانی بەلاذوری لە سەردەمی ساسانیدا، کە یەزدی گورد بەرامبەر بەشاڵاوی سپای عەرەب هەڵات و، ساڵی ١٩ کۆچی حەلەوانیشی بەجێ هێشت، خەڵقی شارەکانی (ڕەی، قومس، ئەسفەهان، هەمەدان، دینەوەر) نامەیان لەگەڵ یەک گۆڕییەوە، کە بەرەنگاری سپای بێگانە بووەستن و، پشتیوانی یەزد گورد بکەن، یەزد گورد مەردان شای ئەبروبەندی کرد بەسپاسالاریان... بەڵام ساڵی ٢١ کۆچی ئەبو موسای ئەشعەری

بەسپای بەسرەوە هاتە یارمەتی نوعمان کوڕی موقەڕین و لە نەهاوەندەوە هەڵی کوتا، سەر دینەوەر و گەمارۆی دا.

پاش ماوەیەک خەڵقی ئەو ناوە بەئاشتی سەریان دانەواند و، بەڵێنیان دا کە باج و پیتاک و سەرانە بدەن... بەپێی وتەی مەسعودی کە لەلاپەڕە ۱۰۱ بەرگی سێیەمدا هاتووە کوردە شوهجان (واتا شا جان)یەکان، لە دینەوەر دائەنیشتن و، خەڵقێکی زۆر لەوانەی کە لەو شەڕانەدا کوژران گۆڕیان لە دەوروبەری دینەوەرە، وەک نوعمان کوڕی موقەڕین، عەمر کوڕی مەعدی کەریب... لە سەردەمی خیلافەتی مەعاویەدا کەثیر کوڕی شیهاب کرابوو بەفەرمانڕەوای ئەو ناوە، کەثیر لە دینەوەر تالارێکی پڕ شکۆی بۆ خۆی دروست کردبوو، پێ ئەوترا تالاری کەثیر... پاش شەهاوەتی حەزرەتی حوسێن (ع) کە موختار کوڕی ئەبوعوبەیدەی ثەقەفی ئاڵای شۆڕشی دژی ئەمەوییان هەڵ کرد و، زۆر جێگەی داگیر کرد، بەپێی کتێبی (ئەلئەخبار الطیوال) لاپەڕە ۳۱٤ عەبدوڵڵا کوڕی حاریس کوڕی ئەشتەری کرد بەفەرمانڕەوای دینەوەر کە برازای مالیک کوڕی ئەشتەر بوو(*) و لە سەردەمی خیلافەتی مەئموون کوڕی هارونە ڕەشیددا کە لە ۱۹۸-۲۱۸ کۆچی لەسەر تەختی خیلافەت بوو، بابەکی خوڕەمی دژی عەبباسییەکان ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد مەئموون ناچار بوو لە بەغداوە، سالارسپای خۆی عەبدوڵڵا کوڕی تاهیر کوڕی حوسێن ڕەوانە بکات بۆ بەرەنگاریی و بۆ سەر پێ شۆڕکردنی ئەم عەبدوڵلایە دینەوەری کردە لەشکرگای خۆی و، لەوێ بۆ خۆی تالارێکی پڕ شکۆی دامەزراند.

شاری دینەوەر کە شارێکی گرنگ بوو و، لەو سەردەمەدا کرماشانی ئەمڕۆ، کە پێی ئەوترا (قرمیسین) سەر بەئێرە بوو، لە ساڵانی ۳۲٥ کۆچیدا، لە سەردەمی خیلافەتی ئەلموقتەدیربیللای عەبباسیدا بەهۆی بشێونە و ئاژاوەوە، ڕووی کردە وێرانی پاشان لە لایەن مەرداویچەوە داگیر کرا... لە ساڵانی ۳٥۰ کۆچی بەدواوە دینەوەر بووە ناوەندی فەرمانڕەوایەتیی حەسەن وەیهەیی کورد و ئاوەدان بووەوە، بوو بەجێگەی زانست و زانیاری... تارادەیەک کە خەڵق لە شارە گەورەکانەوە بۆ فێربوونی زانیاری و هونەر ڕوویان ئەکردە دینەوەر، لە سەردەمی فەرمانڕەوای بەدر کوڕی حەسەن وەیهەیدا، یوسف کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی کەجی کەجیی دینەوەری، لەوێ قازی و مامۆستای ئاینی بوو، لەسەر ڕچی شافیعی، زانای بەناوبانگ ئەبو عەلی کوڕی حوسێن کوڕی شوعەیبی سنجی

(*) ساڵی ۱٦۹ کۆچی مەهدی عەبباس هات بۆ ئەم ناوە بۆ گۆڕینی هەوا، بەڵام مرد...

جووە دینەوەر و مـاوەیەک بەهرەی لە زانسـتی ئەو وەرگـرت، ئنجـا پێی وت: نۆی زانا،
کچی ئەبوحامیدی ئیسفرائینی ناوبانگی بەرزبووەتەوە، قـازی یوسف وتی: بەغـدای
بەختی خیلافـەت ناوی ئەوی بەرزکـردۆتەوە و، دینەوەری ناوەندی فـەرمـانڕەوایێکی
بچووک ناوی منی بچووک کردۆتەوە.

لە سەردەمی خیلافەتی ئەلموستەرشیدبیللای عەبباسیدا، سولتان مەسعود کوڕی سولتان
محەممەد کوڕی مەلەکشای سەلجووقی، ویستی لەسەر شێوەی باوک و باپیرانی لە بەغدا
ش ناوی خـەلیـفـە لە خـوتبـەدا ناوی ئەو ببـرێ، بەڵام خـەلیـفـە ڕێی نەدا و، لەشکری
کۆکردەوە بۆ بەرەنگاری... هەردوو لەشکر نزیک بەدینەوەر کەوتنە شەڕەوە، سپای خەلیفە
کە بەشی زۆری تورک بوو لای خەلیفەیان بەڕەڵا کرد و، خۆیان دایە پاڵ سولتان مەسعود
ەرئەمە خەلیفە ئەلموستەرشیدبیللا لە شەڕا شکا و، سپای سولتان مەسعود بەدیلیان
گـرت و، بردیانە لای سـولتـان... ئەویش زۆر ڕێزی لێ نا و، لەگـەڵ خـۆی بردی بەرەو
مەراغە... بەڵام کۆمەڵەی نهێنی ئیسماعیلییە، بەدزییەوە هەڵمەتیان دا و کوشتیان .

پاش ئەوە دینەوەر نەوەک لە سای حەسەن وەیهی و عەییاریدا تەنیا لە ڕووی کشتوکاڵ
و ناوەدانییەوە، پێشکەوتبوو، بەڵکو زانایان و، ئەدیبان و، ڕابەرانی تەریقەتیان ئەوەندە
زۆربوو، کە لاپەڕەکانی مێژوویان ڕازاندەوە ئێمە لەو وتاری ئایەندەدا، هەم باسی دینەوەر
دەکەین کە ئەمـڕۆکـە لە ڕووی ئاوەدانیـیـەوە لە چ پلەیەک دایە و، هەم باسی بەشێ لە
زانایانی دەبەین.

ئێستە کاتمان تەواوبوو، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٤/٣١

## وتاری: ٧٤

گوێگره بەڕێزەکانی ئەم بەرنامەیە شەوتان باش، هیوای سەرکەوتنی ئێوە لەناخی دڵمانایە. ئێمە هێشتا لەسەر باسی دینەوەر ئەڕۆین، لە وتاری پێشوودا وتمان هەندێ لە مێژوونووسان تەنانەت ژاگ دومورگان باوەڕیان وایە کە ناوی دینەوەر لە بنەڕەتا لە دیونوسوسی ناوی خوای ئەدەب و هونەر و، بەزم و شەڕاب و، هەور و بارانی یۆنانییەوە هاتووە... و ناوەکە پاش دەوری سلوکییەکان پەیدابووە و بۆتە دینەوەر... هەروا کورتە مێژوویییەکی دینەوەرمان ڕوونکردەوە و، بەڵێنمان دانێ: کە لەسەر باسەکە بڕۆین و لە وتارەکانی ترا بەسەرهاتی ئەو ناوە تا دواڕۆژ ڕۆشن بکەینەوە...

ئەم دینەوەرە و، دەوروبەری کە لە سەرەتادا وتمان جێی عێلی شاهجانی بووە وا دیارە، پاشان عێلی میشانیی کوردی جێی ئەوانیان گرتۆتەوە، چونکە ساڵی ٣٣ کۆچی هەرێمی دینەوەر بەدەست (وەنداد و غانم) کوڕانی ئەحمەدەوە بوون کە خاڵۆزای ئەمیر حوسێن بەرزینی بوون، کە لەو حەلەدا سەرۆکی بەرزینی و فەرمانڕەوای هەرێمی شارەزوور بوو، ساڵی ٣٤٨ کۆچی ئەم ئەمیر حوسێنە کۆچی دوایی کرد و، حەسەن وەیەی کوڕی لە جێی دانیشت. هەرکە فەرمانڕەوایی گرتەدەست کەوتە پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی ژێردەستی، لە سەرەتادا دینەوەر و قەڵاکانی تری سەر بەوەنداد و غانمی خاڵویی داگیرکرد، ئنجا کەوتە پەرەدان بەوڵاتەکانی ژێردەستی... سوڵتان موعیزالدەولە ئال بویە کە بەمەی زانی دەستووری دا بەیەنال گوشی سەرداری کە لەو حەلانەدا لە دەوری مووسڵ بوو، لە تیرەکانی بەنی تەغلەبی حەمەدانیی عەرەب هێزێ کۆبکاتەوە و بڕوات بۆ سەر حەسەن وەیە... بەڵام حەسەن وەیە لەوە ئازاتر و چاوقایمتر بوو کە بترسێ و، باکی لە یەنال گوشی و بەنی تەغلەب بێ... لەبەرئەوە خۆی بۆ بەرەنگارییان تا هەولێر بەرەو پیرییان چوو و، لەوێ هەردوو لەشکرەکە دایان بەیەکا... یەنال گوشی بەسپای خۆی و بەنی تەغلەبەوە بەرامبەر بەحەسەن وەیە شکا... پاش ئەو سەرکەوتنە حەسەن وەیە گەڕایەوە بەرەو شارەزوور... موعیز الدەولە کە ئەمەی زانی لە ڕقا هاتە جۆش و، لە بەغداوە سپایەکی بەهێزی نارد بۆ سەر وڵاتەکەی ژێردەستی حەسەن وەیە تەنانەت هات و شاری دینەوەر، سپای موعیزالدەولەی ئەو ناوەی داگیرکرد... هەرکە حەسەن وەیە ئەم هەواڵانەی زانی، بەلەشکرەوە ڕێی لەم سپایە گرت و بڕیاری دا، شەڕیان لەگەڵا بکات... بەڵام لەم کاتەدا

سپاکەی موعیزالدەولە ئامادەیی شەڕ بوو لەگەڵ حەسەن وەییا (ڕوکن الدەولە ئال بویە) لەگەڵ عێلاتەکانی دەوروبەری گورگاندا تێک چووبوو داوای یارمەتی لە موعیز الدەولە کرد... موعیز الدەولە بۆ ئەوەی بتوانێ بچێتە یاریدەی ڕوکن الدەولە ویستی لەگەڵ حەسەن وەیدا ئاشت بێتەوە، بەو مەرجەی کە حەسەن وەیە دەستوور بدات بەلایانی وڵات وتاری هەینی (واتا خوتبەی جومعە) بەناو ئەوەوە بخوێنێتەوە. حەسەن وەیە ئەمەی پەسەند نەکرد و بڕیاری دا کە لەسەر شەڕ بڕوات، بەڵام موعیز الدەولە کە سەرنجی دا کار گەییوەتە جێی باریک، تۆزێ خۆی شل کرد و، دەستەیەک لە سەرداران و فەرماندارانی نارد بۆ لای حەسەن وەیە لە دڵی بهێننە جێ و، کارەکە بەئاشتی ببڕنەوە و، لەگەڵیانا پەنجا هەزار دیناریشی بۆ نارد بەناوی دیاری، حەسەن وەیە کە بەم جۆرە ئاشت کرایەوە گورج چووە یارمەتیدانی ئال بویە دژی ناحەزەکانیان. ئەم دینەوەرە تا ساڵی ٣٦٩ کۆچی کە حەسەن وەیە بەمەرگی خوا مرد، یەکێ بوو لە شارەکانی ژێردەستی ئەو، لە سای ئەوا، ڕۆژ بەڕۆژ ڕەونەقی ئەسەند و، ئاوەدانتر ئەبووەوە و زانست و زانیاری تییا بڵاو ئەکرایەوە.

پاش مەرگی حەسەن وەیە ئاژاوە کەوتە ناو کوڕەکانی و عەضودودەولەی ئال بویە، هێزێکی نارده سەریان کوڕەکان سەریان بۆ عەضودالدەولە دانەواند و، بەهۆی ئەبونەسر خواشازەوە لە کرماشان، کە پێی ئەوترا (قرمیسین) چوونە لای عەضودالدەولە و، تا ماوەیەک لەژێر چاودێرییا بوون لە دوایی ئەم عەضودالدەولەی ئال بویە، لەناویانا بەدری هەڵبژارد و کردی بەسەرۆکی بەرزینی و، فەرمانیشی دا کە لە گەنجینە سەرکەوایێکی سەردارانە و، شمشێر و کەمەربەندێکی بەزێر نەخشراوی بدەنێ لەگەڵ ئەسپێکی باش، کە زین و بەرگەکەی بەزێڕ ڕازێنرابووەوە، لەم هەلەدا هێزەکانی عەضود الدەولە دژ و قەڵاکانی حەسەن وەیەیان یەک لەدوای یەک گرت کە بریتی بوون لە قەڵای (بەرزینی، دینەوەر، نەهاوەند، سەرەماج) عەضودالدەولە و دوو کوڕی تری حەسەن وەیەی بەخشی کە ناویان ئەبولعەلاء و عەبدولڕەزاق بوو.

ئەبولنەجم بەدری کوڕی حەسەن وەیە کە جڵەوی کاروباری وڵاتەکەی گرتەدەست لەگەڵ فەخرالدەولەی ئال بویەدا پەیمانی دۆستایەتیی بەست و، قەڵا لە دەستچووەکانی وەرگرتەوە... ساڵی ٣٧٧ کۆچی شەرەف الدەولە ئال بویە لەم دۆستییەی بەدر و فەخر الدەولە ئاڵۆز بوو... سەردار سپاکەی خۆی (قەرەتکین جەهشیاری) بەسپاوە نارده سەر بەدر بەڵام قەرەتکین لە شەڕا شکا و بەدر تا نەهرەوان ڕاوی نا... پاش ئەم سەرکەوتنە بەدر جارێکی تر (دینەوەر - نەهاوەند - ئەسەد ئاباد - بروجورد - ئەهواز - خۆزستان)ی

خستەوە ژێردەست خۆی و ساڵی ٣٨٨ کۆچی خەلیفەی عەبباسی لەقەبی ناسرالدەولەی دایێ... و ئال بویەش زۆرجار یارمەتییان لێ نەخواست، وەک لە وتاری داهاتوودا باسی لێ دەکەین ئێستە کاتمان تەواوبوو شەوتان خۆش.

گوێگرە ئازیز و خۆشەویستەکان شەوتان خۆش، کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە...

لەبەرئەوەی کە دینەوەر ناوەندی فەرمانڕەواییەکی زۆر گرنگ و، شێوەی زەمان و ئەدەبیاتی ئەم هەرێمە گۆرانیی بووە، کە لە سەدەها ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئەم دواییە بەهێزترین شێوەی ئەدەبیی کوردی بووە، لامان پێویستە پتر لەسەر باسی دینەوەر بڕۆین...

وتمان: عەضود الدەولە کە بەهێزترین سوڵتانی ئال بویە بوو پاش مەرگی حەسەن وەیە لەناو کوڕەکانیدا، بەدری بۆ جێی ئەو هەڵبژارد و، فەرمانی سەرداریێتیی عێلی بەرزینی دایێ و خەلاتێکی زۆریشی کرد، ئەم بەدرە زۆر جوامێرانە کەوتە ئاوەدانکردنەوەی قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی لە ڕووی کشتوکاڵ و ئابووری و خوێندەوارییەوە و، دینەوەر لە سەردەمی ئەوا گەشەی کردبوو... بەدر دوو کوڕی هەبوو: یەکێکیان ناوی هیلال و ئەوی تریان ناوی ئەبوعیسا بوو. هیلال لە دایکەوە لە عێلی (شازەنجان) و لە ڕادەبەدەر ئازا و دلێر بوو، بەدری باوکی لێی ئەسڵەمییەوە و کاروباری پێ نەئەسپارد، هەموو کاروبارەکانی سپاردبوو بەئەبوعیسا، هیلال لەم کارەی باوکی قەڵس و تووڕە بوو، بەلام نەیئەوێرا بیدا بەڕووی باوکیا. ڕۆژێ لە ڕۆژان بەدر و هیلالی کوڕی چووبوون بۆ ڕاووشکار... بەدر هەرکە دڕندەیەکی بەگیر بهێنابایە: شێر، پڵنگ، یۆزپڵنگ، بەدەستی خۆی ئەیکوشت... بەلام ئەو ڕۆژە کە شێرێکیان لێ ڕاپەڕی هیلال بێ پرس و ماوەی باوکی هەڵی کوتایە سەر شێرەکە و کوشتی. بەدر لەم کارەی هیلالی کوڕی تووڕە بوو، وتی: لات وا نەبێ کە هونەرت کردووە، سەگ و شێر هیچ فەرقێکیان نییە... پاش ئەم ڕووداوە، بڕیاری دا کە لە خۆی دووری بخاتەوە لەبەرئەمە قەڵای (سامغان)ی دایێ و ناردی بۆ ئەوێ، هیلال هەرکە کاروباری سامغان و عێلاتی ئەو ناوەی گرتەدەست لەگەڵ (ئیبن الماضی) سەرداری شارەزوورا کەوتە ڕقبەرقێ، چونکە ئەم ئیبن الماضییە دەس نێژی بەدر بوو، لەبەرئەوە بەدر نامەیەکی بۆ هیلال نووسی و داوای لێ کرد کە واز لە ئیبن الماضی بهێنێ و شەڕی پێ نەفرۆشێ... بەلام هیلال کەوتە هەڵمەتدانی شارەزوور... بەدر نامەیەکی پڕ لە هەڕەشەی بۆ هیلال نووسی، وەلێ هیلال لەوە سەر ڕەقتر بوو کە چاوی لەم جۆرە هەڕەشەیە بترسێ و هێزێکی زۆرتری کۆکردەوە و شالاوێکی قورسی کردە سەر شارەزوور و

داگیری کرد و ئیبن الماضیشی کوشت... بەدر بڕیاری دا هەڵکوتێتە سەر هیلال و گوێی ڕابکێشێ... بەڵام لەبەرئەوە کە تۆزێ ڕژد و دەس چوقاوبوو و، بەپێچەوانەی خۆی هیلالی کوڕی بەخشندە و جوامێر و دەس بڵاوبوو و، خەڵات و بەراتی زۆری ئەدا بەهێزەکان، هەموو هێزەکانی بەدر خۆیان دایە پاڵ هیلال بۆ بەرەنگاریی بەدر و لەگەڵی کەوتنە شەڕ و گرتیان و بەدیل بردیان بۆ هیلالی کوڕی. هەندێ لە ڕاوێژان و پیاوماقووڵانی ئەو ناوە داوایان لێ کرد بەدری باوکی بکوژێ، بەڵام هیلال بەقسەیانی نەکردن و، گوتی: من ئەوەندە ئەمەک نەناس نیم کە باوکی خۆم بکوژم... بەپێچەوانەی وتەی ئەوان، چوو لەبەردەستیا کڕنووشی کرد و پێی وت: گەورەم تۆ باوکی منی، تۆ ئەمیری وڵات بە، وەک جاران و من بەڕاوێژکاری خۆت و بەفەرماندەی سپاکەت دابنێ.

بەدر وتی: کوڕم زۆر سپاست دەکەم، با ئەمە ڕازێ بێ لە نێوانی من و تۆدا، دوژمن پێی نەزانێ... ئەم قەڵایانە بۆ تۆ... تەنیا یەکێ لە قەڵاکان بۆ من تەرخان بکە، کە من لەوێدا بەخواپەرستییەوە خەریک بم... و بەم جۆرە باوک و کوڕ ڕێک کەوتن. بەڵام بەدر پاش ئەوەی لەو قەڵایەدا جێگیربوو بەدزییەوە نامەی نووسی بۆ ئەبولفەتح عەییار و بۆ ئەبوعیسا شازی کوڕی محەمەدی سەرداری ئەسەد ئاباد کە هەریەکەیان لەلایەکەوە هەڵمەتی وڵاتەکەی هیلال بدات... جا ئەبولفەتح هەڵی کوتایە سەر قرمیسین -واتا کرماشان- و داگیری کرد... و ئەبوعیسا شازیش ڕووی کردە سابور خواست -کە قەڵایەکی یەگجار سەخت و دوازدە کیلۆمەتر لە خوار ئەلیشتەرەوە بوو، ئەمڕۆ شوێنەواری نەماوە- و هەر سامان و گەنجینەیەکی بەدر لەو قەڵایەدا کەوتبووە دەستی هیلالی کوڕی، هەمووی تالان کرد، ئنجا ڕۆیی بەرەو قەڵای نەهاوەند کە لەو کاتەدا لەژێردەستی ئەبوبەکر کوڕی ڕافیعدا بوو، هیلال کە بەمەی زانی کەوتە دوای و شەڕێکی سەختی دامەزراند، بەڵام ڕافیع نەیتوانی ئەبوعیسا شازی لای خۆی گل بداتەوە، ناچار بوو دایە دەستەوە، بەهیلال... بەدر کە بەم کە بەم کارەساتەی زانی هاواری بردە بەر سوڵتان بەهاء الدەولە ئال بویە... سوڵتان هێزێکی گەورەی بۆ نارد بەفەرماندەیی فەخرلمولک ئەبوغالیب و ئەم هێزە پێش کەوت تا قەڵای سابورخواست... لەم کاتەدا هیلال ئەبوعیسا شازی بانگ کردە لای خۆی و ڕاوێژیی لەگەڵ کرد، وتی: سپای بەهاء الدەولە ڕووی لە ئێمە کردووە، تۆ چی بەباش ئەزانی؟ ئەبوعیسا وتی: نامەیان بۆ بنووسە و خۆت وەها نیشان بدە کە سەریان بۆ دائەنوێنی و هەندێکیش باج و پیتاکیان بۆ بنێرە... ئەگەر قایلبوون ئەوا باشە... ئەگەر قایل نەبوون، لەگەڵیان بکەوە شەڕەوە تەنگەتاویان بکە، ئەگەر دەرەقەتیان نەهاتی هەڵ

یێ و خـۆت ڕزگـار بکه... ئەوان ناتوانن درێژە بدەن بەشـەڕ، بەڵام ئەمـان تازە و وچانن، ـحێزن، وەک ئەو سپایە نین کە لە باب نەهاوەند لەگەڵیان کەوتییە شەڕەوە، ئەو سپایە ـدەست باوکـتەوە بۆژە بووبوون... هیـلال ئەم قسانەی ئەبوعیـسای بەئامۆژگاری نەدایە قەڵەم و، بەخیانەتی زانی و، سەرئەنجام کوشتی. پاشان لەگەڵ سپای بەهاء الدەولە کەوتە شەڕ و شکا و، زوو نامەیەکی بۆ فەخرلمولک نارد، تیا نووسی: من نامەوێ شەڕتان لەگەڵ بکەم من هاتووم کە فەرمانبەرێتی خۆم پێشکەش بکەم و، ئێوەش فەرمان بدەن سپاکەتان وڵاتەکەم بەجێ بهێڵن. فەخرلمولک بەقسەکانی هەڵخڕا و ئەسپردەیەکی نارد بۆ لای بەدر کە بیروباوەڕی تێ بگات بەدر ئەسپـردەکەی دەرکرد و، بەیەکێکی ترا پێی ڕاگەیاند کە هیلال درۆ ئەکات، باش وایە گەمارۆ بدرێ، تا خۆی ئەدات بەدەستەوە.

فەخرلمولک دەستووری دا بەسپاکەی کە تەنگەتاوی بکەن، هەرکە شەڕ گەرم بوو هیلال خۆی دایە دەستەوە و، هێنایان بۆ لای فەخرلمولک هیلال تکای لێ کرد کە نەیداتە دەس بەدری باوکییەوە و، خۆ هەر فـەرمانێکی بەسەرا ئەدا، ملکەچە... فەخرلمولک داوای لێ کرد نیشانەیێ بدات، کە پارێزەرانی قـەڵاکە، خۆ بدەن بەدەستەوە ئەویش نیشـانەیەکی دانێ... بەڵام دایکی هیلال قەڵاکەی نەدایە دەستەوە و درێژەی بەشەڕ دا... بەڵام فەخرلمولک پێی ڕاگەیاندن کە نەترسن و، هیچ خراپەیێک نابینن... ئنجا دەرگای قەڵاکەیان کردەوە و فەخرلمولک خۆی چووە قەڵاکەوە و هەموویانی دڵخۆشی دایەوە، پاش ئەوە قەڵاکەی سپارد بەبەدر و لەو حەلەدا گەنجینەکەی چل ملیۆن دراوی زیو و، چوار سەد هەزار دراوی زێڕ و ئەندازەیێ زۆر گەوهەر و مرواری و بەردی بەنرخ و چەک و تفاقی شەڕی تیابوو، هەمووی کەوتە دەس بەدر...

گوێگرە خۆشەویستەکان پاشماوەی باسی دینەوەر مایەوە بۆ وتاری ئاینده، ئێستە کاتمان تەواوبوو، بەخواتان ئەسپێرین شەوتان خۆش.

١٣٥٢/٥/١٠

**وتاری: ٧٦**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش! کامەرانیتان، هۆی شادی و خۆشیی بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە.

ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی دینەوەر ئەڕۆین... لە وتارەکانی ڕابردووا وتمان: دینەوەر یەکێ بووە لە شارەکانی ژێردەستی بنەماڵەی حەسەن وەیهی. ئەم شارۆلکەیە لە سەردەمی ئەبولنەجم بەدر کوڕی وەیەدا گەیشتبووە پۆپەی ئاوەدانی تەنانەت لە ڕووی خوێندەواری و زانست و فەرهەنگەوە. تارادەیەک کە تینووانی زانست، بۆ پاراوکردنی دڵی تامەزرۆیان ڕوویان ئەکردە دینەوەر هەروەک لە کتێبە مێژووییەکانا نووسراوە دەبێ شۆڕشی بنەماڵەی عەییاری دژی بنەماڵەی حەسەن وەیهی بوو بێتە هۆی ئەوەی کە خوێندەواران لە دینەوەر بڕەوێتەوە، چونکە ساڵی ٤٠٥ کۆچی قازی یوسف کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی گەچ کە چاترین مەلای وڵات بوو لە لایەن عەییارەکانەوە کوژرا، عەییارییەکان، لە (ئەلکامیل)ی ئیبن ئەثیردا بە (بەنی عەناز) ناوبراون و، هەندێکیش ناویانی بە (بەنو عەنان) تۆمار کردووە... دامەزرێنەری فەرمانڕەوای عەییاری لە ئەبولفەتح محەمەد کوڕی عەییار و کوڕەکەی کە ناوی ئەبولشەوک فارس بوو و، لە عێلی (شازەنگانی) بوون و خاڵی کوڕەکەی ئەبولنەجم بەدر بوون، لە سەرەتادا لە سپای بنەماڵەی حەسەن وەیهیدا فەرماندە بوون و، هەرێمی شارەزووریان لەژێر دەسابوو... پاشان لەگەڵ تاهیری کوڕی هیلالی کوڕی بەدری حەسەن وەیهیدا تێک چوون و، ئەبولشەوک دژی تاهیر شۆڕشی هەڵگیرساند و، بەسەر تاهیرا زاڵ بوو کوشتی و، بەم جۆرە دواییان هێنا بەفەرمانڕەوایی حەسەن وەیە و لە جێی ئەوا فەرمانڕەوای عەییارییان دامەزراند. عەلاء الدەولە کاکویەی فەرمانڕەوای هەمەدان ویستی بەهرە لە ئاژاوە و پشێوەنەی وڵات وەربگرێ، کەوتە ڕامالینی وڵاتەکە تا دینەوەر و دەوروبەری. ئەبولشەوک کە باش بیری کردەوە لەوەی ناتوانێ بەرەنگاریی هێزی زۆری عەلاء الدەولە بکات، خۆی دایە پەنای وەزیر شەرەف الدەولە ئال بویە و بەوجۆرە کەوتە دامەزراندنی کاروباری وڵاتەکەی.

ساڵی ٤٢٠ کۆچی شالاوی تورکمانانی غوز بۆ سەر ئێران و خۆرهەڵاتی ناوەند دەستی پێ کرد، غوزەکان پاش ئەوەی ڕەی و هەمەدان و شارەکانی تریان داگیرکرد و هەڵمەتی ئەسەد ئاباد و کەنگەوەریان دا و تالانیان کرد و کوشتاریان تیا کرد و، لەوێوە ڕوویان کردە

دینەوەر... ئەبولشەوک فارسی عەییاری، سپایەکی بەهێزی ڕێکخست و بەفەرماندەی ئەبولفەتحی کوڕی ئامادەی کرد بۆ بەرەنگاریی غوزەکان... ئەبولفەتح لەپاش شەڕێکی قورس غوزەکانی شکاند و، بەرەو دوا هەڵی ڕفاندن و، هەندێکی لێ کوشتن و، هەندێکیشی لێ بەدیل گرتن... کە ئەم پەیامە گەیشت بەئەلقادیربیللا خەلیفەی عەبباسی زۆر خۆشحاڵ بوو و، شمشێرێکی بەزێڕ نەخشراوی بەدیاری بۆ ناردبوو ئەبولشەوک و نازناوی حیسام الدەولەشی پێ بەخشی. غوزەکان پاش شکان نامەیان بۆ ئەبولشەوک نارد و، داوایان لێ کرد کە دیلەکانیان بەرەڵا بکات... بەڵام ئەبولشەوک بڕ ...زەی بەتەواوی بەربەستیان بکات، وتی: بەو مەرجە دیلەکانیان بەرەڵا ئەکرێ کە بڕیارنامەی دۆستایەتی مۆر بکرێ... و بەڵێن بدەن کە جارێکی تری دەستدرێژی ناکەن. پاش ئەوە بەری دان.

ئەم ئەبولفەتح کوڕی ئەبولشەوکە کە لە جێی باوکی لە دینەوەر دائەنیشت و، غوزەکانی شکاندبوو، لەخۆی بایی بووبوو، کەوتبووە پەرەدان بەقەڵەمڕەوی خۆی. ساڵی ٤٣٢ کۆچی موهەلهەلی مامی هەڵی کوتایە سەر دینەوەر... ئەبولفەتح لەگەڵ مامی کەوتە شەڕەوە بەڵام هێزەکەی پشتیوانییان لێ نەکرد و سپای موهەلهەل، بەدیل گرتیان و بردیانە بەردەستی موهەلهەل مامی چاوی لێ نەپۆشی، دارکاری کرد و پێوەندی خستە پێی و ناردییە زیندان... بەڵام ئەبولشەوک بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەی کەوتە سپا کۆکردنەوە و، هەڵی کوتایە سەر شارەزوور موهەلهەلی گەمارۆدا، موهەلهەل هاواری نارد بۆ عەلاء الدەولە کاکویەی فەرمانڕەوای هەمەدان کە بگاتە فریای و، لەلای دواوە هەڵ بکوتێتە سەر وڵاتەکەی ئەبولشەوک... عەلاء الدەولە بەهەلی زانی، هەڵی کوتایە سەر قەڵەمڕەوی ئەبولشەوک دینەوەر و کرماشانی داگیر کرد و، تاڵان و کوشتارێکی زۆری کرد. ئەبولشەوک کە بەمەی زانی شارەزووری بەجێ هێشت و بەپەلە گەڕایەوە، بەڵام عەلاء الدەولە لە مێرگ ڕێی پێ گرت، ئەبولشەوک چوو بەرەو قەڵای سیروان و لەوێوە نامەیەکی پڕ لە پەند و ئامۆژگاری و هەڕەشەی بۆ عەلاء الدەولە نووسی؛ ئەمە گەڵاڵەیەتی: وا مەزانە ترساوم و ئەو ناوەم بەجێ هێشتووە! ئەگەر شەڕم لەگەڵت بکردایە و بەسەرتا زاڵ بووایەم دوژمنەکانت پڕیان پێت ئەبرد... ئەگەر تۆش بەسەر مندا زاڵ ببووایەت قەڵاکانی قەڵەمڕەوی من ئەکەوتە ژێردەستی جەلال الدەولەوە، هەرکە عەلاء الدەولە ئەم نامەیەی وەرگرت لەگەڵ ئەبولشەوک بەئاشتی ڕێک کەوت و، دەستی لە وڵاتەکەی هەڵگرت.

لە سەردەمی سەلجووقییەکانیشا دینەوەر هەر ئاوەدان بوو، پلە و پایەیەکی هەبوو، یەکێ بوو لە قەڵاکانی عەییارییەکانی و زۆر قەوماوەی دی... لە سەردەمی مەغۆل و تاتاریشدا

هەروا... بەڵام لە سەردەمی ئەمیر تەیموور گورگاندا کە بە (تەیمووری لەنگ) بەناوبانگە، کە دینەوەر تا هەمەدان بەدەست سەردارانی لوڕستانەوە بوو و، سەریان بۆ تەیموور دانەئەنواند. تەیموور زۆر شارەکانی کوردستانی وێران کرد، یەکێ لەو شارانە دینەوەر بوو، کە خەڵکەکەی قەڵاچۆ کرا و داری بەسەر بەردییەوە نەما و، تەواوبوو بەوێرانە.

دینەوەر جگە لەوەی قەڵایەکی بەناوبانگ بوو، جێی زانست و دەروێشیش بوو، زانایانی دینەوەر و، سۆفیەی دینەوەر، بەر لە جێیانی تری ناوبانگیان بڵاوبۆتەوە. مێژوونووسان کە دەڵێن (سۆفیەی دینەوەر) مەبەستیان ڕچی خواناسی و عیرفانییە. بێ جیاوازی لە نێوانی دەروێشی و سۆفێتیدا وەکو ئەمڕۆ هەیە، چونکە جیابوونەوەی ئەم دوو ناوە دەروێشی و سۆفێتیی لە یەکتر، ئەگەڕێتەوە بۆ دەورانی پەیدابوونی دوو تەریقەتی (قادری و نەقشی) کە هەندێکیان پەیڕەوی زیکر و ئەورادی ئاشکرا و عەلەنین و، هەندێکیان پەیڕەوی زیکر و ئەورادی نهێنین و خەفین، بەڵام سۆفیەی دینەوەر، سێ سەد ساڵ بەر لە پەیدابوونی ئەو دوو ڕچە ناوبانگیان هەبوو.

وەک شێخ مەمشادی دینەوەری، ئەبولحەسەن کوڕی سائیغی دینەوەری، ئەبوبەکر کوڕی محەمەد کوڕی داودی دینەوەری، ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولخالیقی دینەوەری، ئەمانە هەندێ بوون لە شێخە هەرە بەناوبانگەکان.

بابێینە سەر ئەو زانا گەورەیانەی کە نووسەر و، ئەدیب و، مێژوونووس و، فەرمایشەوان، بوون وەک: ئەبو حەنیفەی دینەوەری خاوەنی (ئەخبار الطیوال)، ئیبن قوتەیبەی دینەوەری دانەری (عیون ئەلئەخبار - شیعر و شوعەراء - ئەدەب الکاتب) ئیبن خازین دینەوەری، نەسروڵڵا کوڕی ئیبراهیمی دینەوەری، ئەبو محەمەد دینەوەری، ئەبوبەکر خەرابی دینەوەری، ئەبوعەبباسی دینەوەری و سەدەهای تر.

بەڵام ئەمڕۆکە کە دینەوەر دێیەکە، نزیک بەو شارۆلکە کۆنەیە، ناوەندی دێهستانی، سەر بەسەحنەی کرماشانە. خەڵقی ئەو ناوە لە عێلەکانی گۆرانن... بەکشتوکاڵەوە خەریکن دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە، بەرهەمی ئاژەڵیشیان ماست و ڕۆن و خوری و پێستەیە. میوە و شەقڵەداریشیان هەیە، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٥/١٧

**وتاری: ٧٧**

گوێگرە بەڕێزەکان، شەوتان خۆش. لەوەی کە زۆر بەگەرمی گوێ ئەدەنە ئەم بەرنامەیە و، ڕەخنە و پرسیاری خۆتان ئاراستە ئەکەن، زۆر دڵشادین. ئەمشەو ئەمانەوێ دەربارەی (دزفول) بدوێین کە ناوە بۆ شارۆلکەیەک و بۆ هەرێمێک و لە بنەڕەتا قەڵایەک و پردێک بووە... بەپێی وتەی موستەوفی قەزوینی لە کتێبی (نوزهەت القلوب)دا، پردەکە لەسەر ڕووباری ئاودز لە لایەن ئەردەشێری پاپەکانەوە دروست کراوە... بەڵام لیسترنج لە کتێبی (سەر زەوی خیلافەت)دا لە زاری کتێبە جوغرافی و مێژووییەکانی تریەوە، وای بۆ دەرکەوتووە، کە پردەکە لە لایەن شاپووری دووەمی ساسانییەوە لە خوار کۆنە شاری گوندی شاپوورەوە دروست کراوە... بەڵام (دز)ەکە، واتا قەڵاکە کەی دروست کراوە؟ ئەمەمان بۆ دەرنەکەوتووە. ئیستەخری ناوی پردەکەی ناوە (پل ئەندامش) و، ئیبن سەرابیونیش ناوی ناوە (پل ڕوم)... و ئیبن خوردازبەیش ناوی ناوە (پل زاب)... بابێینە سەر مێژووی کۆنی شارەکە. بوتروس بوستانی ئەڵێ: شاری دز فول لە جێی شاری (سوزا)ی کۆنی عیلامی دروست کراوە... بەڵام لە قسەکانی لیسترنجدا دەرئەکەوێ کە لە خوار کۆنە شاری گوندی شاپوورەوە دروست کرابێ و، جێی ئەوی گرتۆتەوە، کە لە سەردەمی ساسانیدا ناوەندی خوزستان بووە و، تا سەردەمی خەلیفە مەنسووری عەبباسیش هەر بەرپا بووە و، بەخت یەشوعی نەسرانی کە پزیشکێکی گەورە بووە، لەوێ زانکۆی پزیشکی دامەزراندووە.

پردەکەی دزفول گوایا ٤٢ چاوگەی هەبووە، درێژایی ٥٢٠ مەتر و پانایی ١١ مەتر بووە... بەڵام شەرەفەدین عەلی یەزدی لە کتێبی (ظەفەرنامە)دا، کە لە سەردەمی تەیموری لەنگدا نووسیویە و خۆی ئەو ناوەی دیوە ئەڵێ: پردەکە ٢٨ چاوگەی گەورەی هەیە و ٢٧ چاوگەی بچووک و هەمووی ٥٥ چاوەیە. ئەمە وا دەگەیێنێ کە پردەکە یا تێک درابێ و سەرلەنوێ دروست کرابێتەوە و، یا چەند چاوەیەکی لێ زیاد کرابێ. ئەمە وەها و لە سەردەمی موستەوفی قەزوینیدا ئەندیشک و دزفول یەکێ بوون، بەڵام لیسترنج وتوویە: کە ئەمڕۆکە ئەندیشک دێیەکە دە کیلۆمەتر لە دزفولەوە دوورە... با لەبیرمان نەچێ کە دزفول ئەمڕۆ شارۆلکەیە وەک ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی کە ساڵی ١٨٩٠ زایینی بەدزفولدا ڕابردووە، لە لاپەڕەکانی ١٤٥-٢٩٢ی کتێبی جوغرافیای غەربی ئێراندا دەربارەی دزفول ئەڵێ: ئەو سەیلاوانەی کە لە چیاکانی لوڕستانەوە بەرەو خوار

ئەبنەوە، هەندێکیان دەڕژێنە شیوی گاماساب و هەندێکیان ڕووباری لاکور ئەهێننەدی کە ئەڕژێتە ناو ئەو بناوانەیەوە کە پێی دەوترێ (بەجری) و لەوێوە شۆڕ ئەبێتەوە بۆ دزفول و بەناوی (رود ئاب دز) بەناوبانگە جا شارۆلکەی دزفول ئەکەوێتە نزیکی ئەو شەقامەڕێیەوە کە لە تارانەوە ئەچێ بەرەو هەمەدان -دەولەت ئاوا - خوڕەم ئاوا- دزفول، شارۆلکەکە لای باکوری شوشتەرەوەیە لە داوێنی زنجیرە چیای (کەبیر کوە)دا، کە ئەم زنجیرە چیایە لە قەسری شیرینەوە سەرهەلئەدا و، لەسەرخۆ بەرز ئەبێتەوە و لەناو ئەوانا لوتکەی چیای کەبیر کوە لە هەمووی بەرزترە... ئنجا چیاکە نزم ئەبێتەوە، تا وردە وردە ئەنیشێتە زەوی و، لەگەل تەختی زەویا یەکسان ئەبێ... لە کەناری لای ڕاستی ڕووباری ئاودزەوە کاروانسەرایێ هەیە پێی ئەوترێ (باغ شا). لای ژووری شارەکەوە لە دێی ڕوبەند مزگەوتێ هەیە دیەنی لە گۆڕستانی دانیل پێغەمبەر ئەچی کە لە شوشە. دزفول بازاڕێکی گەورەی هەیە بەلام پیس و پۆخلە... ئەم شارە ڕەنگی نیل، قامیشی شەکر، ڕۆنی گەنەگەرچەک و، پەمۆی زۆر پێ ئەگەیێنێ.

عێلەکانی (دەیرە کوەندی - سەگەوەند) زستانان لە دەوروبەری سەیمەرە و دزفول و شوشتەردا مال بەز ئەکەن... پۆست لە نێوانی خوڕەم ئاوا و دزفولدا هەیە بەلام ئەم پۆستە کابرایەکی سەلتە زەلام بەکوێرەڕێکانا ئەیبا و ئەیهێنێ بۆ ئەمسەر و ئەوسەر کران چەند ڕۆژێکی پێ ئەچێ...

لە ڕۆژگاری کۆنا بەلای خۆرهەلاتی شارۆلکەکەوە جۆگەیەک لێ درابوو تا خوار شارەکە، لەوێ ئەگەیشتە کەناری ڕووبارەکە و، ئاعورێکی گەورەی لەسەر دامەزرێنرابوو، ئەم ئاعورە ئاوی لە شیوەکەوە بۆ پەنجا مەتر بەرزی هەلئەکێشا و، بەم جۆرە ئاوی خواردنەوەی شار دابین ئەکرا... بەلام ئەمرۆکە ئاوی لولەیە.

دانیشتوانی شارۆلکەی دزفول ٥٠ هەزار کەسێ ئەبن، لە شارەکەدا چەند قوتابخانەی بەرایی، ناوەندی، مامۆستایی هەیە، ئەخۆشخانە، دەرمانگا، داروخانە، گەرماو، سینەما، هەموو جۆرە شتێکی تری تیایە و، هەموو جۆرە بەڕێوەبەرایەتییەکی دەولەتیشی هەیە و، بنکەیەکی سپاییشی تێدایە، لەم شارەدا جگە لە موسولمان (صوبی)ش هەیە.

دانیشتوانی هەرێمەکە بەلای زۆرەوە لە لوڕە بەختیارییەکانن فەرمانداری دزفول چوار بەخشی هەیە، دێیەکانی سەر بەئەم فەرمانداری و بەخشانە دەگەن بە ٢١٠ ئاوایی. کاریان کشتوکال و ڕاندارییە، ئاوی خواردنەوەی هەندێ لە دێیەکان هی بیر و چالاوە.

هەوای دزفول گەرمە و جارجارە تا ٥٠ پلە سەرئەکەوێ. زستانانیش هەوای وەشت نمناک و تەڕ و گەرمە...

ناوەکە (دژپُل)ە، واتا (قەڵای پرد)، لە لایەن عەرەبەوە (پێ)یەکە گۆڕاوە بە (فێ) و بووتە دزفول و تا ئەمڕۆش هەر بەوجۆرە ئەدرکێنرێ...

هەرێمی دزفول لە سەردەمی کۆنا زانا و خوێندەواری زۆری پێ گەیاندووە. (عالەم ئارای عەبباسی) باسی کابرایەکی دەروێشمان بۆ ئەگێڕێتەوە، کە ئەمیر تەیموری لەنگ لە دزفول تووشی بووە و، بووە بەدەروێش و بەقسەی ئەو دیلەکانی بەرداوە و، چیرۆکەکەی دوورودرێژە، بەڵام ئێمە کاتمان تەواوبوو تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٥/٢٣

٢٣/خەرمانان/٢٦٧٣

## وتاری: ٧٨

گوێگرە بەڕێزەکان! شەوتان باش.

کامەرانی و شادیتان هیوای ئێمەیە. ئەمشەو باسی (دیواندەرە) ئەکەین.

ناوی ئەم دێیە و، ئەم بەشە بریتییە لە دوو پارچە: یەکەمیان وشەی (دیوە) کە پاشان دوورودرێژ لێی ئەدوێین، دووەمیان وشەی (دەرە)یە، کە لە بنەڕەتا وشەیەکی تورکییە، وەکوردییەکەی ئەکا (شیو، خڕ، چەم). هەندێ لایان وایە کە ئەم ناوە لە دیوانەوە هاتووە، کە ئەکات (دێوانخانە)، واتا تالاری دانیشتنی مێوان. کە ئەم وشەیە گەرچی لە بنەڕەتا ئەگونجێ ئێرانی بێ، بەڵام چووەتە ناو عەرەبیشەوە، بەڵام لامان وایە کە ناوەکە، لە وشەی (دێو)ەوە هاتووە و، لە سەردەمی مەغۆل و تورکەکانا پەیدابووە لەوێ شیوێکی قووڵ و سامناک هەبووە، جەنگەڵ و قامیشەڵان و جێیەکی بڕ لە مەترسی بووە، ئەو مرۆڤانەی کە سادە بوون و لە منداڵییەوە لە جنۆکە و مێردەزمە ترسێنراون و، لەو شیوەدا کەوتوونە یادی خێو و دێو، ئنجا ناوی شیوەکەیان ناوە (دێواندەرە)، پاش ئەوە ناوی شیوەکە بووەتە ناو بۆ ئەو دێیەی کە لەو کەنارە دروست کراوە، ئنجا بووەتە ناو بۆ بەخشەکەش.

بابێینەوە سەر وشەی (دێوان) ئەم وشەیە بۆ کۆمەڵە دێو بەکارئەبرێ، واتە وشەکە گەل وشەیە و (دێو) تاک وشەیە -لە زاراوەی هیندۆ ئارییەکانا، واتا بەرلەوەی ئەتەوە هیندۆ ئارییەکان بانی ئێران بەجێ بهێڵن و، لە یەک بپچڕێن و، بەشی هیندۆ ئەورووپییەکان بەرەو ئەورووپا بکشێن و، هیندۆ ئارییەکانیش لە هیندستان و بانی ئێرانا دابمەزرێن- وشەی (دێو) لەجێی پەروەردگار بەکارهێنراوە و، لە بنەچەکەی زمانا بەورشەدار و بروسکە وتراوە. تا ئەمڕۆکەش لە زاراوەی سەنسکریتیی هیندستانا هەر بۆ پەروەردگار بەکارئەهێنرێ و، بووە بە (دەئیڤە)، کە ئاینی زەردەشتی پەیابوو، دێڤ پەرستی قەدەغە کرد و، ناوی پەیڕەوانی ئەو ئاینەی نا (دەئیڤە یەسنا) واتا پەیڕەوانی پووچی و گومڕایی و، کە دەسەڵاتیان پەیداکرد دێوپەرستەکانیان تەنگەتاو کرد و، داوایان لێ کردن بێن بە(مەزدا یەسنا) واتا پەیڕەوانی ڕاستی پەرستی... دیڤ پەرستەکان، وا دیارە لە کوردستانا خۆیان لە هەرێمی زەردەشتی دوور خستۆتەوە خۆیان گەیاندۆتە چیا زۆر سەختەکان، تەنانەت بەشی خۆرئاوای باکوری کوردستان. یاقوتی حەمەوی نزیک بەشاری مووسڵ ناوی چیای (داسن) دەبات کە بەشێ بووە لە چیای (مەقلوب) واتا ئەو هەرێمەی

که ئەمرۆکە ئێزەدییەکان تیا دائەنیشن کوردەکان، لە کۆنەوە بەئێزیدییەکانیان دەوت (داسنی) مامۆستا تەوفیق وەهبی باوەڕی وەهایە کە وشەی (داسنی) لە وشەی (دەئیڤەیەسنا) و داتاشراوە و سووک بووە.

ئێمە هەموو ئەزانین، کە لەو هەرێمەدا، ئێزدی هەن، کە ئاینەکەیان یەکێکە لە ئاینە هەرە کۆنەکانی کوردەواری، کە لە بنەڕەتا (میهرپەرستی) بووە، پاشان لەگەڵ دینی (ئیزەد) پەرستیبیا تێکەڵ بووە و خۆیان بەخۆیان ئەڵێن (ئێزەدی) بەڵام کوردی تر، هەموو پێیان ئەڵێن (داسنی)، بەیتی سەیدیان لەناو کوردا یەکێکە لەو بەیتانەی ناوی داسنی پاراستووە.

وشەی (دیڤ)ی ئاریایی کۆن لە زمانە ئەوروپاییەکانیشا هێشتا هەر ماوە (دیا، دیڤوس، زەرئۆس و تیوس) هەموو لە وشەی (دیو)ەوە هاتووە و، ناوی (طاوس)یش هەر لەوەوە پەیدابووە و، ئێزدییە کوردەکان پەیکەری تاوس بەپیرۆز ئەدەنە قەڵەم و پێی ئەڵێن (مەلەک طاوس). جگە لەمەی وتمان، لە ئاینێکی تری کۆنی کوردا، کە لە سەرەتادا لەناو بەشی گۆرانەکانا باوبووە و، تا ئەمرۆکەش شوێنەواری ماوە لەناو کاکەییەکانا، وشەی (دێو) وەرگەڕاوە بە (داو) و هەندێ بەهەڵە کردوویانە بە (داود)، کە ئەمانە هەمووی لە بنەڕەتا هەریەکن. و ئێمە لە زۆر جێی تری کوردستانی ئێرانا ناوی (دێو)مان بەرچاو ئەکەوێ وەک (دێوجین، دیوەزناو و دیوزەند و دیونە) و هی تری..

موزیک

ئێستە بابێینەوە سەر باسی (دیواندەرە) کە هەم ناوە بۆگەورە دێیەک کە ناوەندی بەخشەکەیە و، هەم بۆ بەشەکە... بەخشی دیواندەرە ئەکەوێتە باکوری شارستانی سنەوە، لای باکوری بەخشی تەکابی سەر بەفەرمانداریی مەراغەیە و، لای خۆرهەڵاتیشی سنووری شارستانی بیجارە، لای باشوور و خواروویشی دەوروبەری سنەیە، لای خۆرئاوایشی ١٥ کیلۆمەترێ لە سنووری وڵاتی عێراقەوە دوورە، لەوێوە کە بەلای شلێرا درێژە ئەکێشێ. هەرێمی دیواندەرە هەرێمێکی چیاییە، بەرزترین چیای کوردستان کە بەچیای (چل چاوە) بەناوبانگە، لەو بەخشە دایە. بەرزترین لوتکەی ئەو ڕیزە چیایە لە زریەوە ٣٤٦٤ مەترە و، نزمترینی چیاکان ١٨٠٠مەترە لە رووی زریەوە. دوو ڕووباری گەورە کە یەکێکیان (سەفیدرود و قزل اوزون)یشی پێ دەڵێن و، ئەوی تریان کە پێی دەڵێن (جغەتو وەیاخۆ زەڕینەرود) هەردووکیان سەرچاوەکانیان لەم بەخشە دایە. سەفیدرود لە دێهستانی

سارالەوە هەڵئەقوڵێ و، جغەتوش لە دێهستانی خورخورەوە شۆڕئەبێتەوە. هەوای ئەم بەخشە زۆر ساردە لە زستانا و، بەهاوین ناوەنجی و فێنکە. ئەم بەخشە چەند دێهستانێکی هەیە: حوسێن ئاوا - قەرەتورە - هوباتو - تیلەکۆە - ساراڵ - کە ناوەکە لە بنەڕەتا ساردال بووە، واتە زۆر ساردە و لە (صاری) تورکییەوە نەهاتووە، هەروا خورخورەش. ئەم بەخشە ٢٦٦ دێی هەیە... و ژمارەی دانیشتوانیشی لە ٥٠ هەزار تێ ئەپەڕێ. دێی دیواندەرەکە ناوەندی ئەم بەخشەیە ١٠١ کیلۆمەتر لە ژوور سنەوەیە و، ١٠٤ کیلۆمەتریش لە سەقزەوە دوورە، بەلای خۆرئاوای باشووریا و ئەکەوێتە سەر شەقامی سەقز - سنە و، ٨ کیلۆمەتر لە سەفیدرودەوە دوورە. دەوروبەری دێی دیواندەرە زورگ و هەڵەتە، هەوای ساردە، ئاوی کانیاوە و، لە ڕێی زەنگینیش کەڵک وەرئەگرن دەسکەوتی ئەم ناوە دەغڵ و دانەوێڵەی ترێیە. خەڵقی ولات خێوی کشتوکاڵ و مێگەلن. شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن و خوری و پێستە یەکێکی تری لە دەسکەوتی خەڵقی ئەو ناوەن لە دیواندەرە و، بەخشەکەدا، چەند قوتابخانە، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، مزگەوت و، بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی، پۆست، تەلگراف و هەموو شتێکی تری تیایە...

دانیشتوانی دێی دیواندەرە؛ سەرژمێریان ئەگاتە ١,٥٠٠ کەسێک. لە دێیەکەدا چەند دوکان و بازاڕێکی بچووکیش هەیە، دێی خورخورە، بەوە بەناوبانگە کە مەلای باشی پێ گەییوون، بەداخەوە ئێمە کاتمان تەواوبوو، کە ناویان ببەین، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٥/٣٠

٣٠/ خەرمانان/ ٢٦٧٢

## وتاری: ٧٩

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە شەوتان خۆش. هیوامان بەرزی و کامەرانیتانە. ئەمشەو باسی (ڕام هورموز) دەکەین. ڕام هورمز ئەمڕۆکە ناوە بۆ هەرێمێک و بۆ شارۆلکەیەک کە ناوەندی شارستانی هەرێمەکەیە... مێژووی ئەم شارۆلکەیە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن. هەندێ لایان وایە کە لە لایەن ئەردەشێری کوڕی بابەکەوە دروست کراوە و، هەندێکیش ئەڵێن هورمزی کوڕەزای ئەردەشێر دروستی کردووە و، کردوویە بەکورە واتا ئوستان... وا دیارە وێنەکێشی بەناوبانگی هەمەدانی مانی کوڕی فاتەکە بۆ چاوەڕاوی ئاینی گەیشتۆتە ئەوێ کاتێ کە لافی پێغەمبەری لێ داوە و، هەر لەوێ کوژراوە. سەلمانی فارسیش، کە یەکێکە لە یارانی بەناوبانگی پێغەمبەر (د.خ) و هەم نووسەری سروش، وەحی بووە و، هەم سەرتاشی تایبەتیی پێغەمبەر و هەم ڕاوێژکاری جەنگی بووە و، لە شەڕی قورەیشدا لەگەڵ پێغەمبەردا پیلانی شەڕی داناوە و، پێشنیاری کردووە بۆ بەرەنگاری دوژمن بەدەوری شاری مەدینەدا کەندالێکی قووڵ لێ بدرێ، کە پاشان ئەو شەڕە بەناوی شەڕی (خەندەق) ناویراوە... ئەم سەلمانی فارسییە، لە بنەڕەتا خەڵقی ڕام هورمزە و لەبەرئەوەیە نازناوی فارسی دراوەتێ چونکە ڕام هورموز لەو سەردەمەدا یەکێ بووە لە شارانی سەر بەفارس...

ڕام هورموز ساڵی ١٧ کۆچی، یا ١٩ کۆچی لە لایەن سپای ئیسلامەوە داگیرکراوە. مێژوونووسان دەڵێن، پاش ئەوەی یەزدی گوردی ساسانی ئاخرین پادشای ئێران، مەدائینی پایتەختی بەجێ هێشت و، بەرامبەر بەلەشکری ئیسلام عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەمی لەدەس دا و، چوو (مەرد)ی کردە پایتەخت لەوێوە کەوتە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ هەرێمی فارسدا هورمزانی فەرماندەی ئەو ناوە کەوتە سپا کۆکردنەوە، بۆ یاریدەدانی یەزد گورد بەهیوای وەرگرتنەوەی ولاتی لە دەست چوو، سپای ئیسلام کە ئەم هەواڵەیان زانی بەفەرماندەی نوعمان کوڕی موقەڕین هەڵیان کوتایە سەر ڕام هورمز و توستەر.

هورمزان، کەوتە بەرەنگاری و ماوەیەک شەڕ درێژەی کێشا پاشان، خۆی دا بەدەستەوە و، بەدیلی برا بۆ مەدینە لەو کاتەدا پۆستنشین خەلیفەی دووەم لەبەر هەیوانی مزگەوتەکەدا نوستبوو و، شوڕکەکەی دەستی کە بە (دِرَّە) (دێرە) بەناوبانگە لەژێر سەریابوو. هورمزان وتی من بەرنە لای پۆستنشین، کە چووە دیار سەری سەری سووڕما، لەوەی وەها سادەیانە

بێ یاوەر و پاسەوان لەو هەیوانەدا لێی نووستووە. پۆستنشین بڕیاری دابوو کە لە خوێنی موسوڵمانە کوژراوەکانا بیکوژێ و، خەریک بوو لەگەڵی ئەدوا. هورموزان وتی بفەرموو: کاسەیێ ئاوم بۆ بهێنن. کە ئاوەکەیان بۆ هێنا وتی: ئەی خەلیفە! بەڵێن ئەدەی تا ئەم ئاوە نەخۆمەوە نەکوژرێم، وتی: تا ئەو ئاوە نەخۆیەوە، ناکوژرێی... هورموزان ئاوەکەی ڕژاند. بەم جۆرە خۆی لە کوشتن ڕزگار کرد. پاشان ئیسلام بوو. بێ گومان ئیسلام بوونەکەی لە ترسی مەرگ بوو، نەوەک لە ناخی دڵەوە، چونکە مێژوونووسان ئەڵێن ئەو یەکێ بووە لەو کۆمەڵەیەی کە ئەبولوئلوئەی هان دا بۆ کوشتنی خەلیفەی دووەم و، تۆڵە لێ سەندنەوەی پایتەختی لە دەس چووی ئێران... هەندێ لایان وایە کە هەرێمی ڕام هورموز و خوزستان لە لایەن خودی سەلمانی فارسییەوە داگیر کراوە. ڕام هورمز لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسیدا زۆر بایەخی دراوەتێ، ماوەیەک لەژێر دەستی بنەماڵەی حەسەن وەیهیدا بووە و، ماوەیەک لەژێردەستی ئال بویەدا لە شاری ڕام هورموزدا، لە لایەن عەضود الدەولە ئال بویە و مزگەوتێکی زۆر بەشکۆ دروست کراوە و، کتێبخانەیەکی زۆریش لە لایەن ئەبولئەسواری دەیلەمییەوە دامەزراوە. وا دیارە ماوەیەک جێگەی پروپاگەندەی پەیڕەوانی موعتەزیلەش بووە. ئەم هەرێمە لە کۆنا زۆر زانای بەرزی پێ گەیاندووە، ئەبو محەمەد حەسەن کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی خەللادی هورمزی قازی خوزستان کە تا ساڵی ٣٧٠ کۆچی لە ژیانا بووە، خەڵقی ئەوێ بووە، هەروا مزدەک کوڕی شەهریاری ناخودای هورمزیش کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا کتێبی (عەجائب الهیند)ی داناوە. لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەویدا لەم هەرێمەدا، لە نێوانی ئەفشارەکان و، ئەو والییەدا، کە لەوێ بوو، زۆر هەرا قەوماوە، بەڵام سەرئەنجام شا عەبباس بشێوەنەکەی دوا پێ هێناوە...

بابێینە سەر ئەم ڕۆژگاری دواییە. ڕام هورمز بچووک بووبووەوە، تا ئەندازەیێ کە بووبوو بەبەخش بەڵام پاشان پایەی بەرزکرایەوە و کرا بەشارستان و، دوو بەخشی هەیە: یەکەم دەوروبەری ڕام هورمز. دووەم خەلەف ئاوا. سنووری ئەم شارستانە، لەلای باکوری خۆرئاوای ئەهوازە و لای خۆرهەڵاتی شارستانی بەهبەهانە و لای باشوور و خوارووشی خورشەهرە و، شارەکە ١٥٠ کیلۆمەتری لە ئەهوازەوە دوورە -وڵاتە گەرمەسێرە سێ ڕووباری گەورەی تیایە: ڕووباری ڕام هورموز کە لای خۆرئاوای شارستانەکەوە بەرەو لای باشوور ئەکشێ و، تێکەڵ بەڕووباری مارون ئەبێ و پێی ئەڵێن جەراحی ڕووباری گویال لە چیای (هەفت گلو)ە دێتە خوارەوە و، بەرەو ئەهواز لێژ ئەبێتەوە، ڕووباری

ئەبولعەبباسیش دیسان ئەرژێتە رووباری مارون.

سەرژمێری هەردوو بەخشەکە ٥٠ هەزار کەسێ ئەبێ و، سەرژمێری شارۆلکەی رام هورموز نزیکەی ٩ هەزار کەسێکە.

لە سەدەی چوارەما، رام هورموز جێگەی پەروەردەکردنی کرمی ئاوریشم و خورما و قامیشی شەکر و، نەوت بووە... چالاوە نەوتەکانی بەکەرەسەی سادەی ئەو حەلە بەهرەی لێ وەرگیراوە.

ئەمڕۆکە هەرێمەکە، کشتوکاڵ و، ڕانداری تیا باوە لەوێ، پەمۆ، دەغڵ و دانەوێڵە پێ ئەگات. قوتابخانەی بەرایی، ناوەنجی، کیژانە و کوڕانەی هەیە، دەرمانگا و، داروخانە و، ئیداراتی دەوڵەتی تیایە. لە دێکانا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە... خورما و پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و، نومی تورش و، ئەو شتانەی زۆرە. خەڵقی ئەو ناوە زۆرتر کوردی لەکن، لوڕیان کەمە...

گوێگرە بەڕێزەکان کاتمان لێرەدا تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٦/٦

٦/گەلاوێژ/٢٦٧٣

**وتاری: ٨٠**

## ڕەوان

گوێگرە بەڕێزەکان، شەوتان باش. کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەشی کوردییە. جارێکی تریش دووپاتی ئەکەینەوە، کە نامەکانی ئێوەمان دەگاتێ، زۆر سپاسی هەستی بەرزتان دەکەین. هاندانی ئێوە بۆ ئێمە هۆی پێش ڕەوت و دڵخۆشییە. بەڵام بەداخەوە ئێمە ناتوانین گوڕجاوگوڕج ویستەکانی ئێوە بڵاو بکەینەوە، چونکە ئەم بەرنامەیە لەسەر شێوە و ڕیزی وشە دامەزراوە... هەروا ئێمە ناتوانین لە خۆمانەوە ناوی هەندێ جێ بیەین، کە لە کتێبە جوغرافی و مێژوویییەکانا نەبێ، یا لەبەرئەوەی کە دەربارەی ئەو جێیانە زانیاریمان کەمە، وەیاخۆ لەو جێیانەدا دەنگوباسی مێژوویی ڕووی نەداوە، جا دەبێ هەم لێمان ببوورن و هەم بۆ ئەو شتانەی داوای دەکەن، چاوەڕوانی ئەوە بن ئێمە، کە دەگەین بەو پیتە.

موزیک

ئێمە ئەمشەو باسی (ڕەوانسەر) ئەکەین، کە هەم ناوە بۆ شارۆلکەیەک و هەم بۆ بەخشێ، کە ئەو شارۆلکەیە ناوەندێتی. ئەم ڕەوانسەرە لە سەرەتادا، قەڵایەک بووە لە قەڵاکانی سەردارانی کەڵوڕ بەتایبەتی ئەو لقەیان کە فەرمانڕەوای هەرێمی دەرتەنگ بوون.

ناوی ڕەوانسەر ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی. ئەم قەڵای ڕەوانسەرە، لەگەڵ قەڵاکانی (پاوە - یاسکە - ئالانی - قەڵا زنجیر - دووان - دەرتەنگ) و هی ترا لە ژێردەستی زۆراب بەگ ناوێکا بوون لە سەردارانی کەڵوڕ کە زۆر سەربەستانە بەڕێوەی بردوون، تەنیا خەرج و باجێکی بەدەوڵەتە گەورەکانی هاوسێی داوە. پاش ئەوەی کە ئەم سەردارە کۆچی دوایی کردووە، عومەر بەگی کوڕی لە جێی دانیشتووە، سەردارانی ئەردەڵان لەسەر ویستی دەوڵەتی سەفەوی شاڵاویان کردۆتە سەر هەرێمەکەیان بەڵام شکاون و سەرنەکەوتوون، پاشان کە عومەر بەگ زانیویە، دەوڵەتی سەفەوی بڕیاری داوە هەرێمەکەی داگیر بکات خۆی ئەداتە پاڵ سوڵتان سلێمان خانی قانوونی، پادشای عوسمانی. سوڵتان سلێمانی ئەمە بەهەلێکی گەورە ئەزانێ زوو دان ئەنێ بەوەدا کە فەرمانڕەوای سەربەخۆیە و، فەرمانی سەردارێتییەکەی بۆ مۆر ئەکات... ئەم عومەر بەگە

گەرچی لە سەردەمی گەنجیدا پیاوێکی دڵڕەق و خوێنڕێژ و، حەز لە بەزم و کەیف و کاری ناڕەوا ئەبێت... بەڵام لە دواییـیا لەو کـارانە لائەدا و، ئەکەوێتـە دامـەزراندنی کـاروباری وڵات و ئاوەدانکردنەوەی و، دامـەزراندنی مـزگـەوت و قـوتابخـانـە و ئەو شـتـانـە... پاش مـەرگی ئەو، ئنجـا قـوباد بەگی کـوڕی جێی ئەگرێتـەوە. ئەم قـوباد بەگـە کـەوتە پەرەدان بەسنووری وڵاتەکە و، هەر لە سنووری دینەوەرەوە، کە لەو حەلەدا تەنیا ناوی هەرێمەکەی مابوو، تا سنووری بەغدای خستە ژێردەستی خۆیەوە، ساڵی ۹۱۲ کۆچی لەبەرئەوەی ئەم قـوباد بەگە سەر بەعوسـمـانی بوو و، کوڕەکـانی ئەیانەویست پەلاماری هەندێ لە وڵاتی سەردارییەکانی ژێردەستی سەفەوی بدەن... لەسەر ئەوە دەوڵەتی سەفەوی بڕیاری دا، کە ئەم هەرێمە بخاتە ژێردەست خۆی و کاروباری بسپێرێ بەو سەردارانەی سەربەخۆی بن، جا ساڵی ۹۱۲ کۆچی، سەردارانی قزڵباشی داگیریان کرد و، خستیانە ژێر دەسەڵاتی یەکێک لە سـەردارانی خـۆیانەوە، پاش ئەوە چەند جاری تر ئەم وڵاتـانە، لە نێـوانی عـوسـمـانی و سەفەویدا دەست بەدەست کراوە... ڕەوانسەر، ئەمڕۆکە هەم شارۆلکەیەکە و هەم بەخشێکە کە ئەم شارۆلکەیە ناوەندێتی. بەخشەکە، لە سەرەتادا بەستـرابوو بەشارستـانی سنەوە، بەڵام ئەمڕۆکە یەکێکە لە بەخشەکانی شارستانی پاوە و، سەر بەئوستانی کرماشانە. ساڵی ۱۳۱۸ فارسی لە خوار ڕەوانسەرەوە بنەوانەیێ بەدرێژایی ۲۰ مەتر بەسترا و لەبەر ئەم سەدوەدا و جۆگـە هەڵگیرا، کـە نزیکەی ۱۰ دێی کـردە بەر ئاو. بەخشی ڕەوانسەر نزیکەی ۵۰ دێی بەدەورایە، سەرژمێری ئەو ناوچەیە پتر لە دە هەزار کەسێکە. شارۆلکەی ڕەوانسـەر ئەکـەوێتـە باشـووری خۆرهەڵاتیی پاوەوە ٦٤ کـیلۆمـەتر لێـیـەوە دوورە، لەلای باکـوری خۆرئاوایی کـرمـانشـا دایە - بەدوورایی ۷٦ کـیلۆمـەتر و، ئەکـەوێتـە کـەناری ئەو شەقامـەرێیەی لە کرمـاشـانەوە بۆ پاوە ئەچێ، نزیک بەنووکی بەشی باشـووری خۆرئاوای زنجیرە چیا شاهۆ، هەوای ئەم ناوە ساردە.

بەرزایی ڕەوانسـەر لەڕووی زریەوە ۱۳۳٦مەترە. دانیشـتوانی شارۆلکەکە ٦۰۰ کەسێ ئەبن. کـاروباریان کـشـتـوکـاڵ و مـێگەل بەخـێـوکـردنە. قـوتابخـانەی بەرایی، دەرمـانگا، مزگـەوت، قـوتابخـانەی بەرەنگاری نەخـوێندەواری تێدایە. چەند دوکـانی هەیە و، هەموو ئیدارەکان دەوڵەتی تیایە. لە هەندێ دێیەکـانی ئەم ناوچەیەشدا، مزگەوت و قـوتابخانە هەیە، لەم ناوچەیەدا خوێندەواری ئاینی و، هەسـتـیـاری باش هەڵکەوتوون. بەداخەوە ئێمە لە بەسەرهاتی ئەوان بێ بەشین و، لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو شەوتان باش.

۱۳۵۲/٦/۱٤

## وتاری: ٨١

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش! کامەرانیتان هۆی شادی و دڵگەشیمانە ئەمشەو دەربارەی (ڕەزائیە) ئەدوێین، کە هەم شارێکی زۆر جوان و ڕازاوە و، هەم ئوستانێکە پانوپۆڕ. بەپێ ئەو کۆنە کەرەسەیانە و، ئەو تفاقە دێرینەیانەی کە لە کۆڵپارییەکان هاتۆتە دەست و، لەو دەوروبەرەدا دۆزراونەوە مێژووی ئەم جێیە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ پێش زایینی عیسا، مامۆستا بوتروس بوستانی لە (دائیرەت المعاریف)کەیا نووسیویە: کە ئەم شارە لە سەرەتادا ناوی (تەبەرما) بووە و، گۆیا (ئەشو زەردەشت)ی پێغەمبەری ئاری ڕەگەز لەم شارەدا هاتۆتە جیهانەوە. پاشان وەکو مێژوونووسە کلدانییەکان، وتوویانە، لەبەرئەوەی کە ئەو ناوە کانیاو و، سەرچاوە و، شیو و، ڕووباری زۆر بووە، ناوی شارەکە بەکلدانی ناونراوە (ئورمیە) و گۆیا (میە) لە کلدانییا، وەکو عەرەبی بە (ئاو) ئەڵێن... واتا وڵاتی ئاوێژە و، ناوی (ئوورومیە) تاوەکو دەورانی سەر ئامەدی بنەماڵەی پەهلەوی ڕەزا شای مەزن، هەر هەبوو بەڵام ئەوان گۆڕییان و ناویان نا (ڕەضائیە). ئەم وڵاتە لە پایانی سەدەی حەوتەمی بەر لە زایینییا، لەژێردەستی فەرمانڕەواییەکی خۆوڵاتییا بوو کە پێی ئەوترا (مەننای)... سارگۆنی دووەمی پادشای ئاشووری هەڵی کوتایە سەر ئەم وڵاتە و دیانوکوی پادشای مەننایی بەدیل گرت... و لە ساڵانی ٦٣٣ی بەر لە زایین ئەم وڵاتە لە لایەن مادەوە ئازاد کرابوو... بەڵام لە کاتێکا کە هووەخشەتەری شاهنشای ماد هەڵی کوتابووە سەر وڵاتی ئاسووری و خەریک بوو ئەینەوای پایتەختیانی گەمارۆ دابوو، ئا لەم کاتەدا سکانەکان هەڵیان دەسکەوتبوو، هەڵیان کوتابووە سەر ئازەربایجان، هەرکە ئەم هەواڵە گەیشتە هووەخشەتەرەی شای ماد، زوو دەستی لە گەمارۆی ئەینەوا هەڵگرت و گەڕایەوە و لەگەڵ سکانەکانا کەوتە شەڕەوە... لەبەرئەوەی سپاکەی ماندووبوو بەرامبەر بەسکاکان شکستی خوارد و، ناچار بوو بەرامبەر بەهەندێ مەرجی قورس لەگەڵ سکاکان ڕێک بکەوێ. ئەم شەڕە نزیک بەزریاچەی ئورمییە ڕووی دابوو. با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە عێلەکانی پارسوا بەر لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینی لە دەوروبەری زەریاچەی ئورمییە دائەنیشتن، پاشان گواستیانەوە بۆ وڵاتی پارس کە ئەمڕۆکە بەئوستانی فارس بەناوبانگە و، بەهۆی ئەوانەوە ناوی پارسی بەسەرا بڕا.

هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن بەرلەوەی ناوی (ئورمی)یە پەیدا ببێ پایتەختی

ئازەربایجان، لە سەردەمی (پارتەکان) واتا ئەشکانییەکانا ناوی (پەرسپە) بووە، کە نزیکی تەخت سلێمانی ئێستە واتا ۲۵ فەرسەنگ بەلای باشووری خۆرهەلاتی ی زەریاچەی ئورمییەدا بووە. و ئا لەم سەردەمەدا بووە کە (ئان تونیوس)ی سەرداری رۆمی هەڵی کوتاوەتە سەر ئەم هەرێمە، ساڵی ٦٢٣ی زایینی خوسرەوی پەروێزی ساسانی شاهەنشای ئێران، لە ئەرمەنستان بەرامبەر بەئیمپراتۆری رۆم شکستی خوارد و، رۆم ولاتی ئورمییەی داگیرکرد و، ئاگری تێ بەردا. پاش ئەوە تا سەرەتای ئیسلام ئاگامان لە مێژووی ئورمییە نییە. بەپێی (فتوح البولدان) لە لایەن عوتبە کوڕی فەرقەدەوە داگیر کراوە، بەلام (ئەلکامیل)ی ئیبن ئەثیر باسێکی دوورودرێژ ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: ساڵی ۱۸ کۆچی، یاخۆ ۲۲ کۆچی ئورمییە لەگەڵ ئەو دوای ولاتی ئازەربایجانا لە لایەن سپای ئیسلامەوە بەئاشتی داگیر کراوە، گۆیا لەو کاتەدا فەرماندەی سپای ئیسلام بەکیر کوڕی عەبدوڵلا بووە، هەرکە گەییوەتە چیاکانی جەرمیدان ئیسفەندیار کوڕی فەرڕوخزادیان لێ دەرپەڕیوە. و لێیان بووە بەشەڕ... وا دیارە مەبەست لە جەرمیدان دەوروبەری جەرمێ بێ کە ئەمڕۆکە سەر بەبەخشی سەلوانای ئوستانی رەزائییەیە، ئەم ئەسفەندیار لە (واج رود) کەوتبووە شەڕەوە و، شکستی خواردبوو و هەلاتبوو و، لێرە رێی بەبەکیر گرتبوو، بەلام لێرەشا شکا و کەوتە داوی دیلێتی. جا بەبەکیری وت: ئەتەوێ بەشەڕ درێژە بدەی یاخۆ هەراکە، بەئاشتیی ببڕییەوە؟ بەکیر وتی حەزم لە شەڕ نییە. ئەسفەندیار وتی: کەوابێ من لەلای خۆت گل بدەرەوە، کە خەڵقی ولات بەئاشتی لەگەڵت رێک بکەون. ئەگەر خەڵق خۆیان لە چیادا قایم بکەن و درێژە بدەن بەشەڕ، هەر تەنیا خوا خۆی دەزانێ کە چی دەقەومێ. بەکر بەقسەی ئیسفەندیاری کرد و، هەراکەی بەئاشتی بڕییەوە، پاش ئەوە عوتبە کوڕی فەرقەد هات بۆ یاریدەی بەکیر و فەرماندەیێتیی گشتیی سپای ئیسلامی لەو ناوەدا گرتەدەست - بەهرام کوڕی فەرڕوخزاد -کە دەبێ برای ئیسفەندیار بێ- رێی پێ گرت و لێیان بوو بەشەڕ، بەلام بەهرام تێنی بەرگری نەبوو، لە شەڕا شکا. پاش ئەوە ولاتەکە بەئاشتی خۆی دایە دەستەوە و، سپای ئیسلام بەرەو ژوورەوە بوون. پاشان لە سەردەمی ئەمەویدا، لە ئازەربایجاندا بەجۆرێکی گشتی و، لە ئورمییەدا بەجۆرێکی تایبەتی، دەستە دەستەی خەڵق دژی دەسەلاتی عەرەب پەیدابوون، ئەمانە ناونران (خەواریج) واتا دەسەلات هەڵگەڕاوەکان. زۆر لەوانەی کە پەیڕەوی (شەبیب) بوون لە تیرە کوردەکان بوون، کە ئەم کوردانە بەناوی (شەرات) ناو ئەبران... لە سەردەمی عەبباسیدا، کە مەئموون کوڕی هارون رەشید، پۆستنشین و خەلیفە بوو (بابەکی خوڕەم

دین) لەم ناوەدا شۆڕشی هەڵگیرساند و، هەموو ئازەربایجانی لەژێردەستا بوو سەرەڕای ئەریوان و بیلقان و کەوتە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ پەترەک و قەشەکانی مەسیحی وڵاتەکانی دەوروبەرا بۆ ئەوەی دژی دەوڵەتی عەبباسی هاوکاری لەگەڵ بکەن...

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئێمە لێرەدا کاتی بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٦/٢٠

٢٦٧٣/٦/٢٠

## وتاری: ٨٢

گوێگره بەڕێزەکان! خۆشی و شادی ئێوە، هۆی شادی و کامەرانی ئێمەیە. لە وتاری پێشوودا وتمان (ڕەضائیە) لە سەرەتادا ناوی (تەبەرما) وەیاخۆ شتێکی تری لەو بابەتە بووە،... پاشان گۆیا لەو ناوەدا ئەرمەنی و کلدانی و ئاسووری پەیدابوون و ناوی ئورمییەی بەسەرا بڕاوە، کە گۆیا نیوەی ناوەکە -واتا (مییە)- لە (میاه)ەوە هاتووە و، لەبەر زۆری کانیاو و ڕووبار و سەرچاوەی ئەو ناوەی دراوەتێ و ئورمییە واتا (ئاوێژە)... بەڵام ئەم لێکدانەوەیەی مامۆستا بوتروس بوستانی و مێژوونووسەکانی تری بۆ ئێمە جێی باوەڕ نییە. بەدووری نازانین پاش ئەو شەڕانەی کە لە نێوانی شاهەنشایی ئێران و، لە نێوانی قەڕاڵێتیی ڕۆمدا، بەر لە پەیدابوونی ئاینی ئیسلام قەوماوە... ناوی ئەم هەرێمەی گۆڕیبێ بە (رومی و ئورومی).

بابێینەوە سەر مێژووی وڵاتەکە... گۆیا لە سەردەمی مەنسووری عەبباسیدا - کە پۆستنشین و خەلیفەی زۆر بەهێزی وڵاتی ئیسلام بووە کابرایەک -کە ناوی سەدەقە کوڕی عەلی کوڕی سەدەقە بووە- و پەیوەندی لەگەڵ وەجنای ئەزدیدا هەبووە و، لەبەرئەوە بەناوی مەولا و کۆیلەی ئەزد بەناوبانگ بووە و، خۆی لە کوردەکانی دەوروبەری مووسڵ بووە. بەسەر ئەم وڵاتەدا زاڵ بووە... لە ئورمییەدا خۆی و براکەی کۆشک و تەلارێکی زۆریان دامەزراند و، کەوتنە ئاوەدانکردنەوەی ئورمییە. پاشان هەر ئەم سەدەقەیە لەگەڵ وەجنای ڕوادییا دژی هارون ڕەشید شۆڕشیان کرد. پاشان مەئموون کوڕی هارون ڕەشید ئەرکی کوژاندنەوەی شۆڕشی بابەکی خوڕەم دینی خستە سەرشانی سەدەقە کوڕی سەدەقە کوڕی عەلی کە بەنازناوی زورەیق دەناسرا... ئەم زورەیقە وا دیارە بابەکی خوڕەم دینی خۆش ویستووە، خۆی نەچووە بۆ سەری یەکێ لە سەردارەکانی خۆی ناردووە کە ناوی ئەحمەد کوڕی جونەید بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەئموون فەرمانداریی هەموو ئازەربایجان و ئەرمەنستانی پێ سپاردبوو.

لە سەرەتای سەدەی چواردەمەوە ئورمییە وەکو شارەکانی تری ئازەربایجان لەژێردەستی بنەماڵەی (سالاری)ی کورد دابوو، کە دژی دەوڵەتی عەبباسی فەرمانڕەوایی خۆوڵاتیان دامەزراندبوو و، هەر بەو ناوە بەپۆستنشینیی و خەلافەتی عەبباسییەوە بەسترابوون. ساڵی ٣٤٦ کۆچی کە مەرزبان کوڕی محەمەد لوڕی موسافیری کەنگەری، کە

دامەزرێنەری دەوڵەتی سالاریان بوو، لە سەرەمەرگدا ڕایسپارد پاش مەرگی جوستانی کوڕی لە جێی دانیشێ، کە مەرگ هاتە مێوانیی و کۆچی دوایی کرد، جوستان لە جێی بووە فەرمانڕەوا و ئەبو عەبدوڵلا نەعیمی کرد بەوەزیری خۆی. براکانی و سەرکردەکانی وڵات، هەموو دەستیان خستە دەستی و سەریان بۆ فەرمانڕەوایەتیی دانەواند... بەڵام جوستانی کوڕی شەرمزەنی کورد کە سەرداری ئورمییە بوو و، لە دڵی خۆیدا بڕیاری دابوو کە پاش مردنی مەرزبان ئیتر سەر بۆ کەس شۆڕ نەکات و خۆی هەرێمەکەی بەسەربەستی بەڕێوە ببات، کە زانی مەرزبان مردووە پشتی لە جوستان هەڵکرد و ڕووی لێ وەرگێڕا و، دەستی نەخستە ناو دەستی و، سەری بۆ فەرمانی شۆڕ نەکرد. بەپێچەوانە کەوتە تەواوکردنی ئەو قەڵا سەختەی لە ئورمییە بناغەی نابوو جوستان کوڕی مەرزبان ئیبراهیمی برای کردبووە فەرمانڕەوای ئەرمەنستان، بەڵام لەبەرئەوەی خۆی نازیرەک و کەم بڕشت بوو، وڵاتەکەی باش بەڕێوە نەئەبرد و، لە خەڵق دوودڵ بوو، تارادەیەک کە نەعیمی وەزیری خۆیشی خستبووە زیندانەوە جوستانی کوڕی شەرمزەن کە زۆر زرنگ و هەلپەرست بوو ئەم هەلەی بەدەرفەتێکی باش زانی، نامەی بۆ ئیبراهیم مەرزبانی برای جوستان نارد کە بێت و شۆڕش هەڵ بگیرسێنێ و لە جێی جوستانی برای ببێ بەفەومانڕەوا. ئیبراهیم مەرزبان لە کاتێکا کە جوستانی برا گەورەی چووبوو بەرەو (بەردەعە) لە گورجستان ئەرمەنستانی بەجێ هێشت و چوو بۆ لای جوستانی شەرمزەن لە ئورمییە. جوستان و ئەبولحەسەن عوبەیدوڵلای خوشکەزای نەعیمی کە نووسەری بوو، هەڵیان خڕاند و، پێکەوە هەڵیان کوتایە سەر مەراغە و داگیریان کرد... جوستان مەرزبان، کە ئەم هەواڵەی پێ گەیشت زۆر بەگورجی گەڕایەوە بۆ ئەردەبیل و لەوێوە نامەی بۆ جوستانی شەرمزەن و ئەبولحەسەن عوبەیدوڵلای نووسی و زۆر بەڵێنی دا بەئەوان، یەکێ لەو بەڵێنانەی بەرەڵاکردنی نەعیمیی خاڵی ئەبولحەسەن بوو... جوستان شەرمزەن کە نامەیە و بەڵێنانەی دی... خۆی و ئەبولحەسەنی نووسەری گەڕانەوە بۆ ئورمییە و ئیبراهیم مەرزبانیان بەتەنیا هێشتەوە. لە مەراغە، ئیبراهیم لەم کارەی جوستان شرمزەن زۆر دڵگران بوو و، لەوەش کە لە جوستانی برای هەڵگەڕابووەوە، زۆر پەشیمان بوو، دەسبەجێ مەراغەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ ئەرمەنستان، بەڵام جوستان شەرمزەن درۆی لەگەڵ هەردوولا دەکرد، نەیئەویست هاوکاری لەگەڵ هیچ کام برا بکات و، سەر بۆ هیچ کامیان دانەوێنێ... ئەیەویست هەردوولایان بخەڵەتێنێ تا قەڵاکەی ئورمییە تەواو دەکات و تا ئەو قەڵایە پڕ دەکات لە کەرەسە و تفاقی جەنگی و، لە خواردەمەنی و جلوبەرگ، کە بتوانی خۆ تیا ڕاگیر بکات، جوستانی

مەرزبان و ئیبراهیمی برای هەردوولایان لەم کەینوبەینە تێ گەیشتن و، بڕیاریان دا جوستان شەرمزەن ڕامالن و، لە هەردوو لاوە سپایان کۆکردەوە بۆ سەر ئورمییە... بەڵام ئا لەم کاتەدا ئاژاوەیێکی تری ڕووی دا... کە بەسوودی جوستانی شەرمزەن تەواوبوو. ئەم ئاژاوەیە بەم جۆرە بۆ کابرایەک فێڵەباز، لە گەیلان ڕاپەڕی و، لافی ئەوەی لێدا کە ئەلموستەجیربیللای عەبباسییە لەم کاتەدا نەعیمی لە زیندان ڕای کرد و، چووە موغان و لەوێوە نامەیەکی بۆ ئەلموستەجیربیللای دەسی هەڵبەستی درۆزنی نووسی و داوای لێ کرد ڕوو بکاتە موغان کە ئەو و دۆستەکانی دەست بخەنە ناو دەستی و پشتیوانی لێ بکەن موستەجیر سێ سەد کەسێکی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و ڕووی کردە موغان و بەم جۆرە پەیڕەوێکی زۆری پەیدا کرد و، جوستان کوڕی شەرمزەنی دانا بەسپاسالاری و بەم جۆرە دەسەڵاتی لە ئازەربایجانا پەیداکرد. بەڵام جوستان کوڕی مەرزبان و ئیبراهیمی برای لە دوو لاوە سپایان کۆکردەوە و هەڵیان کوتایە سەریان و، پاش شەڕێکی زۆر سەخت جوستان شەرمزەن شکا و بەرەو ئورمییە هەڵات... بەڵام موستەجیر دەستگیربوو و، جوستان کوڕی مەرزبان فەرمانی دا بەکوشتنی.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا بەرنامەی ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین.

## وتاری: ٨٣

گوێگرە بەڕێزەکان شاد بژین. بەمراز گەیینی ئێوە، ئاواتی ئێمەیە لە باسی مێژووی (ڕەزائیە)دا کە لەمەوبەر پێی ئەوترا ئورمییە وتمان سالّی ٣٤٩ کۆچی، کابرایەک ناوی خۆی نا ئەلموستەجیربیللای عەبباسی و خەریک بوو لافی خەلافەت و پۆستنشینی لێ بدا... و جوستان کوڕی شەرمزەن خۆی دانا بەسپاسالاری و کەوتنە داگیرکردنی شارەکانی ئازەربایجان... بەلاّم جوستان کوڕی مەرزبان و ئیبراهیمی برای هەستیان بەمەترسی و تەرکزەیەکی سەخت کرد، لەبەرئەوە لە دوو لاوە، واتا لە ئەردەبیل و ئەرمەنستانەوە سپایان کۆکردەوە و هەلّیان کوتایە سەر ئەم خەلیفە درۆزنە کە ناوی ئەلموستەجیربیللای بۆ خۆی هەلّبژاردبوو، پاش چەند شەڕ بەسەریا زالّ بوون و، بەدیل گرتیان و جوستان فەرمانی دا بەکوشتنی و، لەم بارەشەوە نامەیەکی پڕ لە موژدەی بۆ ئەلموطیع بیللا خەلیفەی عەبباسی، لە بەغدا نارد. جوستان کوڕی شەرمزەن کە لەم شەڕەدا شکستی خواردبوو و، خەلیفەی درۆکانی یەکەی بەگورگان خوارد دابوو، ڕای کردەوە بۆ ئورمییە و، لەوێ سەری خۆی دانەواند و ئارام دانیشت و دەستی لە ئاژاوە هەلّگرت، لەم سەردەمەدا وەهسوزان کوڕی محەممەدی سالاری برای مەرزبان لە تارم بوو... ناردی بەشوێن ئیبراهیمی برازایا و، زۆری ڕێزلێنا و بۆ لابردنی دەسەلاّتی جوستانی برای لەگەلّی دووا... بەلاّم ئیبراهیم چونکە جاری پێشوو لێی قەومابوو و، جوستان شەرمزەن و ئەبولحەسەن بەتەنیا لە مەراغە هێشتبوویانەوە، ئەمجارە بەقسەکانی وەهسوزانی مامەی هەلّنەخەلّەتا... وەهسوزان کە دەسی لە ئیبراهیم شووشت، نامەی نووسی بۆ ناسری برازای کە برا بچووکی جوستان و ئیبراهیم بوو... ناسر پێی هەلّخەلّەتا بەدزییەوە ئەردەبیلیی بەجێ هێشت و چووە موغان و لەوێ دژی جوستانی برای، ئالای شۆڕشی هەلّکرد... هێزەکانی جوستانی برای پشتی جوستانیان بەردا و هاتنە لای ناسر بەم جۆرە ناسر هێزێکی گەورەی پێکەوەنا و شالاّوی بردە سەر ئەردەبیلی پایتەختی کاکی. جوستان کە نەیتوانی بەرەنگاری بکات هەلاّت و خۆی لە قەلاّی نیّردا قایم کرد، کە شەش فەرسەنگێ لە ئەردەبیلەوە دووربوو و، ئەمڕۆکە بەم ناوە دێیەک لە جێی قەلاّکەدا ماوە. ناسر وازی لە جوستانی کاکی نەهێنا چوو لەوێ گەمارۆی دا... لەم کاتەدا هێزەکەی داوای مانگانە و بژێویان لێ کرد، ئەویش هیچی لەژێردەستا نەبوو... لەبەرئەوە هێزەکەی لێی هەلّگەڕانەوە و، چوون بەڕێز و شکۆوە

جوستانیان لە قەڵای نێر دەرهێنا و بردیانەوە ئەردەبیل... جوستان و ناسر ئاشتبوونەوە و بڕیاریان دا کە بچن بکەونە دەست و داوێنی وەهۆرانی مامیان کە ئیتر وازیان لێ بێنێ، بەڵام وەهسوزان سەرئەنجام ئەوانی کوشت و لەگەڵ ئیبراهیم کەوتە شەڕەوە ئیبراهیم پەنای بردە ڕوکن الدەولە ئال بویە کە لە ڕەی بوو و زاوای بوو و، لە خوشکەکەی کوڕێکی ئەبولعەبباسی ناوی بووبوو، ڕوکن الدەولە بەم هۆیەوە ئیبراهیمی لاواندەوە و باربووی کرد... بەڵام لە شۆڕشێکا کە هەر لە ڕەی ڕووی دا، ئەم ئیبراهیمە لە ڕێی ڕوکن الدەولەدا بریندار بوو... پاش چاکبوونەوەی ڕوکن الدەولە بەسپایەکەوە و لەگەڵ ئیبن لعەمیدی وەزیریدا ناردییەوە بۆ ئازەربایجان و دەستووری دا بە وەزیر ئیبن لعەمید کە سەر بەهەموو سەرداران شۆڕ بکات تەنانەت جوستان شەرمزەن و، هەموویان بخاتە ژێردەست ئیبراهیمەوە، پاش ئەوە دەوڵەتی سالاری کورد، ناوی لەناو مێژووا نەبراوە... و ناوی ئورمیییەش کەمتر براوە...

ساڵی ٥٨٥ کۆچی توغروڵ کوڕی ئەرسەلان سەلجووقی لەگەڵ قزل ئەرسەلانی برای، لەسەر ئورمییە کەوتنە شەڕەوە، توغروڵ قزلی لە شاری ئورمییەدا گەمارۆ دا و، شارەکەی تاڵان و وێران کرد، بەڵام زۆری نەبرد کە شارەکە ئاوەدان بووەوە... پاشان کە ئازەربایجان کەوتە دەست ئوزبەگ پەهلەوان ساڵی ٦١٧ کۆچی کە یاقوتی حەمەوی ئورمییەی دیوە لەژێردەستی ئۆزبەگ پەهلەواندا بووە کە پیاوێکی کەم دەسەڵات بووە و، خەڵق زۆر لێی ناڕازی بوون ساڵی ٦٢١ کۆچی کە سوڵتان جەلالەدین بەشێ لە وڵاتی گورجستانی داگیرکرد و، دوو کەس لە سەرانی ئاژاوەچییانی، دیلگرت کە ناویان شەلوە و ئەیوانی بوو، هێنانییە ئازەربایجان... پاش ماوەیەک هەرێمەکانی (مەرەند - سەلماس - ئورمییە - ئەشنۆ)ی دایێ، کە بەڕێوەی ببەن و، سپای لێ کۆبکەنەوە بۆ داگیرکردنی ئەو جێیانەی گورجستان کە هێشتا سەریان شۆڕ نەکردبوو... ساڵی ٦٢٨ کۆچی کە سوڵتان جەلالەدین لە لایەن مەغۆلەوە تەنگەتاو کرابوو و، زۆر لە وڵاتەکانی ژێردەستی لێ داڕنرابوو، زستانی لە ئورمییە شنۆ بەسەربرد... بەڵام وڵاتەکە لەبەر شالاوی مەغۆل و تاتار وێران بووە، خشتی بەسەر خشتییەوە نەماوە... تا ڕادەیەک کە خواجە ڕەشیدەدین فەزڵولڵا خانی (جامیع التەواریخ) -کە وەزیری غازان خانی کوڕی ئەرغونی کوڕی هۆلاکۆ بوو- ئەڵێ: بنەماڵەی جەنگیز - هۆلاکۆ - ئەبەقا - ئەرغون - گیخاتو گەرچی ئەیانەویست ئاوەدانی هەبێ لە (ئالاداغ - ئورمییە - سقورلق - سەجاس - خوجان - زەنجاندا) و، چەندین ساختمانیان تیا دروست بکەن... و یا سەرای مەنسوورییەی ئەڕان ئاوەدان بکەنەوە و، یا

ئارەزووی ئەوەیان هەبێ کە بازاڕێ یا شارێ نوێ بهێننەدی یا وێرانەی شار و بازاڕێ ساز بکەنەوە، یا جۆگە ئاوێ هەڵبگرن بەم کارانەیان، نەوەک هەر تەنیا وڵاتیان ئاوەدان نەئەکردەوە بەڵکو وڵاتیان پتر بەلای وێرانیدا ئەبرد... لەم قسانەدا خواجە ڕەشید وا دەرئەکەوێ کە مەغۆل و تاتار جگە لەوەی هێزە سپایی و چەکدارەکانیان قڕان کردووە و، بەزەییان بەنێرومێدا نەهاتووە، بۆ پێکهێنانی کاروباریش بەزۆر بێگاریان بەخەڵق کردووە،... خەڵق لە ترسی ئەوەی بێ نان و بێ ئاو و بێ کرێ بێگاریان پێ بکرێ وڵاتیان چۆڵ کردووە... و دێ و شارەکان چۆڵ و هۆڵ وێران بوون و، خشتیان بەسەر خشتەوە نەماوە.

گوێگرە خۆشەویستەکان ئێمە لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٦/٢٧

## وتاری: ٨٤

گوێگرە خۆشەویستەکان شەوتان باش خۆشیتان ئاواتمانە. ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی (ڕەضائیە) دەڕۆین... وەکو دەزانن لە دەوروبەری ڕەزائیە زریاچەیەک هەیە... ئەم زەریاچەیە ئاوەکەی شینە وا دیارە بەشێوەی گۆرانی (کەوە)ی پێ وتراوە و، بەفارسی بووەتەوە کەبود... گۆیا ئەرمەنییەکانیش بەم زەریاچەیەیان وتووە (کەبۆتان ڕو) کە پارچەی دووەمی ناوەکە، لە (سو)ی تورکییەوە هاتووە. هەروا بەزەریاچەکە (تەلا)ش وتراوە، بەناوی ئەو دوورگە بچووکەوە کە لە ناوەندی زەریاچەکە دایە و، بەسەر کێوی شاهییەوەیە. ئەڵێن ئەوانەی لەو ناوەدا لە دەسەلاتی ولات یاخی دەبوون، هەمیشە خۆیان دەگەیاندە ئەم دوورگەیە ئیتر هێز بەدوایانا نەئەچوو. فەرمانڕەواکانی مەغۆل و تاتار تەنانەت هۆلاکۆ و ئەبەقا لەم دوورگەیەدا نێـژراون بۆ ئەوەی خەڵق گۆڕیان نەناسن و، لە گۆڕ دەریان نەکەن...وە ئەم گۆڕانە نزیک بەدێی دیهخوارەگان بووە و ئەبێ دیهخوارەگانی ئێستە کە بەخشێکە لە بەخشەکانی تەورێز بەناوی ئەوەوە بێ هەروا فەرمانڕەوایانی مەغۆل و تاتار، کە هەرێمی مەراغەیان کردووە بەپایتەختی خۆیان گەنجینەکانیان لە دوورگەی تەلادا، لە ناوەندی زەریاچەی ئورمییەدا شاردۆتەوە، گۆیا ئەم دوورگەیە چووەتە ژێر ئاوەوە سەردارانی مەغۆل زۆر هەوڵیان داوە بۆ ڕزگارکردنی گەنجینەکانیان بەلام بەشێکی کەمیان دۆزیوەتەوە پاش ئەوە هەرێمی ئورمییە و ئەو ناوە هەمووی وێران بووە و، گۆیا پاشان تا سەردەمی تەیموری لەنگ ئاوەدان بووەتەوە و، لەو کاتەدا لەژێردەستی فەرمانڕەوایەکی کوردا بووە، کە لە دۆستانی ئەمیر عیزەدین شێری فەرمانڕەوای حەکاری بووە، بەلام (ظەفەرنامە) ناوی نەبردووە، ئەمیر عیزەدینە لە سەرەتادا گەردنی بۆ ئەمیر تەیموور کەچ نەکردووە و شەڕی لەگەڵ کردووە، پاشان ئەمیر تەیموور کردوویە بەدۆستی خۆی و، فەرمانی سەردارێتی ولاتەکەی بۆ مۆر کردووە... لە سەردەمی قەرەقویونلو و ئاق قویونلودا بەدەس سەردارانی خۆلاتییەوە بووە. ساڵی ٩٠٨ کۆچی کە شا ئیسماعیلی سەفەوی تازە تاجی شاهێتی لەسەر نابوو و، کەوتبووە پەرەدان بەدەسەلاتی خۆی و خەریک بوو ئورمییە داگیر بکات لەو کاتەدا ئەم هەرێمە لەژێر فەرمانی ئەمیر ساریم کوڕی ئەمیر سەیفەدین موکری دابوو... پاش شەڕ و هەراییکی دووروودرێژ شا ئیسماعیل لێی داگیر کرد، بەلام بەکێی سپارد باسی لێ نەکراوە. لێ نەکراوە، پاش مەرگی شا ئیسماعیلی دووەم، واتا

ئیساعیل میرزای کوڕی شا تەهماسپی سەفەوی کە سالّی ۹۸۵ مردبوو، سولّتان محەمەد خوابەندەی سەفەوی لە جێی دانیشت... لەم سەردەمەدا کە ولآت شلّەژاو و پڕ لە ئاژاوە بوو هەندێ لە سەرداره کوردەکان خۆیان دابووە پالّ خوسرەو پاشای فەرمانڕەوای وان کە دەست نێژی دەولّەتی عوسمانی بوو و، پێکەوە هەلّیان کوتایە سەر ئازەربایجان... فەرمانڕەوای تەوریز ئەمیر خانی تورکمان کە نەیتوانی بەرگری لە ولآت بکات، سەردار عێلە کوردەکان جێگە و پایەکانی کۆنی خۆیان گرتەوە... پاشان ئەمیر خان سپای ئەو ناوەی کۆکردەوە و لە لایەن سولّتان محەمەد خدابەندەشەوە هێزی بۆ هات و شەڕ گەرم بوو و، سەرداره کوردەکان خۆیان خستە قەلآکانەوە خۆی و خەلّقی (خۆی - سەلماس - ئورمێ) کۆچیان کرد ولآتەکانیان بەجێ هێشت و، شار و دێ چۆلّ و هۆلّ مانەوە، جگە لەم هەرێمانەی کە لە لایەن فەرمانڕەوا کوردەکانەوە داگیرکرابوو قەلآکانی (گورێ و، تفلیس)ی پایتەختی فەرمانڕەوایانی گورجستانیش کەوتبوونە ژێر دەسەلآتی عوسمانییەوە، بەجۆرێ کە عوسمان پاشای سەرداری دەولّەتی ڕۆم، قەلآی دەربەندی کردبوو بەبنکەی خۆی و زۆر عێل و تیره و سەردارانی ئەو ناوە خۆیان خستبووە ژێر فەرمانییەوە جا کە وەزیری سەفەوی و، فەرماندەیان و یاوەران ئەمەیان دی، زۆر گورج پەیامیان بۆ سولّتان محەمەد خوابەندەی سەفەوی نارد کە باشتر ئەوەیە، خۆیان بەرەو ئازەربایجان بجمێن و هێزی ولآت ڕابدەن و ئەو ناوە لە دوژمن پاک بکەنەوە. بەم پێیە سولّتان محەمەد خوابەندە لە قەزوینەوە کەوتە ڕێ. و هەرا و شەڕ درێژەی کێشا...

سالّی ۱۰۱۷ کۆچی، شا عەبباسی سەفەوی خۆی گورج کردەوە و داوێنی کرد بەدارا، بۆ وەرگرتنەوەی هەرێمە لەدەس چووەکان کە دەسەلآتی عوسمانی، بالّی بەسەرا ڕاکێشابوون و، بۆ سەرشۆڕکردن بەو فەرمانڕەوایەتییانەی کە سەربەستانە خۆیان ئەبرد بەڕێوە و، یاخۆ خۆیان دابووە پالّ دەولّەتی عوسمانی... جا فەرمانی دا بەسەردار سپا و فەرماندەیانی خۆی بەسەردارانی کوردی دەوروبەری ڕابگەیێنن، بەهێزەوە ئامادەی جمان بن بۆ شالآو... تەنانەت بە قوباد خانی موکری فەرمانڕەوای مەراغە و هەرێمەکەی و، بەئەمیر خانی برادۆستی کە بەلەپ زێڕین ناسراوە و، فەرمانڕەوای ئورمییە و هەرێمەکانی تەرگەوەڕ و، مەرگەوەڕ و ناوچەکانی بوو، هەروا شا عەبباس دەستووری دابوو هەر سەرەک عێلی ئامادەی جمان و شالآو نەبوو، سپا لەگەلّ خۆیا بەزۆر بیانبا.

ئەم شالآوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو هەرێم و ناوچەیانەی کوردنشین بوو، کە لە کوردستانی ئەردەلآنەوە تا وان و دیاربەکر هەموو کەوتبوونە ژێردەستی عوسمانییەوە.

بابێــینه ســەر قــەڵای ئورمــیــیــه وا دیاره قــەڵاکــەی ئەوەنده قــایم نەبووه، کــه هیچ فەرمانڕەوایێ پشتی پێ ببەستێ، چونکه عالەم ئارای عەبباسی دەڵێت: کاتێ که ئەمیر خانی لەپ زێڕین ئەیویست قــەڵای دمدم دروست بکات و، ئەمــیــر خــانی فــەرمــانڕەوای تەورێز ناڕەزایی نیشان ئەدا، شا عەبباس ڕای سپاردبوو: که بەئەمیر خانی لەپ زێڕین ڕابگەیێنن، قــەڵای ئورمــیــیــه بۆ پاراســتنی خــۆی و عــێلی برادۆست بەسه، چونکه ئەگەر دوژمنی لاییده -واتا عوسمانی- شالاو بهێنێ، بەرلەوەی بگاته، قەڵای ئورمییه قەڵای سەختی زۆری لەپێش دایه، بۆ بەرگری جا ئەگەر مەبەستی لەپ زێڕین له دروستکردنی قەڵای دمدم خزمەتی وڵاته و یاخیبوون نییه، با بەقەڵای ئورمییه ڕازی بێ...

گوێگره خۆشەویستەکان تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٧/٢

## وتاری: ٨٥

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسه شەوتان باش هیوامان کامەرانیتانه، بەرلەوەی لەسەر باسی (ڕەضائیه) بڕۆین تکاتان لێ دەکەین، هەرگا هەڵەیەکی مێژوویی یا ئەدەبیتان لەم بەرنامەیەدا بەرگوێ کەوت، لە کام ئێستگەوە رووی دا، داوا بکەن لە بەڕێوەبەرانی بەرنامەی ئەو ئێستگەیە، کە خۆیان وەڵامی نامەکەتان نەدەنەوە نامەکەتان بنێرن بۆ نووسەری ئەم بەرنامەیە، کە نووسەر بتوانێ خۆی وەڵامتان بداتەوە و، خۆی بزانێ کە ئەو هەڵەیە بۆچ رووی داوە ئێستە درێژە دەدەین بەباسی ڕەزائیە.

موزیک

وتمان: ڕەزائیـەی ئەمڕۆکە لەمـەوبەر ناوی ئورمـیـیـە بوو، لە سـەردەمی شا عـەبـبـاسی سـەفـەویدا مـاوەیەک لەژێر فـەرمـانی ئەمـیـر خـانی لەپ زێڕینی برادۆسـتـیـیـا بووە... پاش ئەوەی کە ئەو ویـسـتی قـەڵای دمـدم بکاتە ناوەندی فـەرمـانڕەوایەتیـیـەکـەی، فـەرمـانڕەوای تەورێز دژی وەستا و، شا عەبباسی سەفەوی لە عـاستی دڵ کرمێ کرد و، ئەوەبوو شاڵاوی کـرایە سـەر و، بەوجـۆرەی کـە لە باسی دمـدمـدا بۆمـان ڕوون کـردنەوە لەناوچوون... ئنجـا قەڵای ئورمـییە واتا ڕەزائیەی ئێستە کەوتە ژێردەستی قوباد خانی موکری کە کوڕی شێخ حەیدەری مـوکری و فەرمانڕەوای مـوکریان بوو... بەڵام ئەم قوباد خانەش بەر ڕق و قـینی شا عەبباسی سەفەوی کەوت و، شاڵاوێکی سەختیان کرایە سەر، کە ئێمە لە باسی موکریاندا لێی دەدوێین، بنەماڵەی سەرداری موکری و، عێلی موکری تیاچوون و، بەرەو وڵاتانی تری کۆچڕەویان کرد و، ئەو ناوە بەوێرانی و خاڵیـتی مایەوە و، شا عـەبباس ئەو ناوەی سـپا بەکەلب عەلی بەگی ئەفشار کە بەفەرمانی شا بەبیست هەزار کەسەوە لە هەرێمی کەلاتەوە کـۆچیـان کـردبووە هەرێمی ئورمـیـیـە. پاشـان کـە دەوڵەتی عـوسـمـانی هەلی دەس کـەوت ئورمـیـیـەی خـسـتـە سـەر وڵاتی عـوسـمـانی، بەڵام زۆری پێ نەچوو کـە نادر شـا دەسـەڵاتی ئێرانی گرتەدەست و هەرێمی ئورمییە و ئازەربایجانی لە عـوسمـان وەرگرتەوە پاش مـەرگی نادر شا هەرێمی ئازەربایجان شێوا، کابرایەک کە ناوی ئەمیـر ئەسلان خانی فرخلوی بوو، کەوتە لافی پادشـایی، ویـسـتی ئورمـیـیـە و هەمـوو هەرێمی ئازەربایجـان بخـاتە ژێردەست خـۆی بەڵام ئیـبـراهیم شـای برازای نادر شـا -کـە لە بنەڕەتا نـاوی مـحـەمـەد عـەلی بەگ و کـوڕی ئـیـبـراهیم خان ظەهـیـر الدەولەی برای نادر شـا بوو و، نادر شـا پاش مـەرگی باوکی

ناوی گۆڕیبوو و، بەناوی باوکییەوە ناوی نابوو- ئەو ئیبراهیم شایە سپای کۆکردەوە و چووە ئازەربایجان و ئەمیر ئەسلانی ڕاڕفاند و، دەسەلاتی پادشاهێتی ولاتی گرتەدەست، بەلام ئەم ئیبراهیم شایە تەنیا دوو ساڵ شا بوو و کۆچی کرد. پاش ئەوە ئورمییە لە لایەن ئازاد خانی ئەفغانەوە داگیر کرا. بەلام محەممەد حوسێن خانی قاجار ساڵی ۱۱۶۹ کۆچی لێی وەرگرتەوە پاشان ئورمییە کەوتە ژێر دەسەلاتی فەتح عەلی خانی ئەفشار بەلام کەریم خانی زەند کە بەڕێوەبەرایەتی ولاتی گرتەدەست، نەیهێشت فەرمانڕەوایی تیا بکا، زوو لە دەستی دەرکرد، ولاتی لە دەرەبەگ پاککردەوە، ساڵی ۱۲٤٦ کۆچی واتا ۱۸۲۸ زایینی کە نێوانی ئێران و ڕووس تێک چووبوو، ئورمییە چەند مانگێ کەوتە ژێر چنگی ڕووسیای قەیسەرییەوە. پاشان لەگەڵ دەوڵەتی قاجار ڕێک کەوتن و، ئورمییە کەوتەوە دەس دەوڵەتی ئێران. ساڵی ۱۳۲٤ی کۆچی (واتا ۱۹۰٦ی زایینی) هەرێمی ئورمییە لە لایەن عوسمانییەکانەوە داگیر کرایەوە... ساڵی ۱۳۲۹ کۆچی (واتا ۱۹۱۱ زایینی) جارێکی تری ڕووسەکان داگیریان کردەوە. ساڵی ۱۳۳۵ (واتا ساڵی ۱۹۱۷ زایینی) پاش ڕوودانی شۆڕشی بەلشەویکی لە ڕووسیا، کاروباری شارەکە خرایە ژێردەستی ئەنجومەنێکی ئاسوورییەوە، لەژێر چاوەدێری ڕووسیادا و شارەکەیان شلەژاند پاش ساڵی ۱۳۳٦ی کۆچی و ۱۹۱۸ زایینی دەوڵەتی قاجار توانی جارێکی تری وەری بگرێتەوە و، بیخاتەوە سەر ئێران و، پاش ئەوەش چەند ئاژاوەیەکی تری تیا هاتەدی... و تا ئەم کاتانە ناوی شارەکە و دەوروبەری هەر ئورمییە و هەرێمی ئورمییە بوو، کە شاهەنشاهی پەهلەوی دامەزرا ڕەزا شای مەزن بڕیاری دا، ئەو ناوە بێگانەیە بسڕێتەوە. جا لە لایەن پیاوماقوولانەوە وا بەباش زانرا کە ناوبنرێ (ڕەزائیە) بەناوی ڕەزا شای مەزنەوە... بابێینە سەر ڕەزائیەی ئێستە کە ناوە بۆ ئەو شارەی ناوەندی ئوستانی چوارەم، کە بەئوستانی ئازەربایجانی غەربی واتا خۆرئاوایی ناوئەبرێ. شارستانی ڕەزائیە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی چوارەم، لای باکوری سنووری شارستانی شاهپوور -واتا سەلماسی کۆنە- لای خۆرهەلاتی زەریاچەی ڕەزائیەیە، لای باشوور و خوارووی شارستانی نەغەدە و بەخشی شنۆیە، لای خۆرئاواشی سنووری تورکیایە، شارستانی ڕەزائیە سێ بەخشی هەیە: (۱) دەوروبەری ڕەزائیە. (۲) سیلوانە. (۳) سومایی برادۆست کە کەنگچینیشی پێ دەڵێن لە ڕەزائیە و تاران ۹٥۱ کیلۆمەترە و تا زەریاچەی ڕەزائیە کە لەوەبەر پێی ئەوترا (گۆمی ئورمییە) ۱۸ کلیۆمەترە، شارێکی ئاوەدان و ڕێکوپێک و ئاوهەوا خۆشە، سنووری ئوستانی چوارەم -واتا ئازەربایجانی غەربی- کە ڕەزائیە

ناوەندێتی، بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە باکووری خۆرئاوای ئێرانەوە. لای باکوری سنوورەکانی کۆماری شوورەوی و کۆماری تورکیایە، لای خۆرهەلاتی سنووری ئوستانی ئازەربایجانی خۆرهەلاتییە، لای خوار و باشووری سنووری ئوستانی کوردستانە کە سنە ناوەندێتی. لای خۆرئاواشی سنووری دوو کۆماری تورکیە و عێراقە. ژمارەی دانیشتوانی ئوستانەکە تێکڕا بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٥ی فارسی ١.٠٧٨.٧٠٢ کەسە و، ئەمانە سەر بە حەوت (٧) شارستانن کە ١٨ بەخشیان هەیە، وەک لە وتاری ئایندەدا لێی ئەدوێین، ئێستە کاتمان تەواوبوو شەوتان باش.

١٣٥٢/٧/٩

**وتاری: ٨٦**

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش، ئاتەخوازی کامەرانیتانین.

لە زنجیرە وتارەکەدا، باسێکی دووروودرێژی مێژوویی ڕەزائیە واتا (ئورمییە)ی لەمەوپێشمان نووسی. ئنجا بابێینە سەر باسی جوغرافیایی و کۆمەڵایەتی و ئابووری... ڕەزائیە لە ڕووی جوغرافییەوە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای زەریاچەی ڕەزائیەوە کە جاران پێی دەوترا زەریاچەی ئورمییە وەیاخۆ گۆلی ئورمییە. لای باکووریشی سنووری شارستانی شاپوورە کە لەمەوبەر ناوی شارستانی سەڵماس بوو و، لای باشوور و خوارویشی سنووری شارستانی نەغەدە و بەخشی شنۆیە و، لای خۆرئاوایشی سنووری کۆماری تورکیایە. ئاوهەوای شاری ڕەزائیە و دەوروبەری خۆش و سازگارە و لە زستانا زۆر ساردە. و بەرزایی هەرێمی شارستانی ڕەزائیە لە ڕووی زریەوە ١٣٤٢ مەترە... و شوێنە بڵندەکانی دەوروبەریشی ئەم جێیانەن:

١- زنجیرە چیای سەر سنووری ئێران - تورکیا - عێراق، کە هەرسێ وڵاتەکە لەیەک دائەبڕێ و، نیشانەی سنووری هەر سێ لای بەسەرەوە چەقێنراوە.

٢- ڕیزە چیاکانی قوشچی کە ئەکەوێتە لای باکوری شارەکەوە.

٣- چیای باستان کە ئەکەوێتە باشوور و لای خواری شارەکەوە.

بابێینە سەر ڕووبارە بەناوبانگەکانی دەوروبەری ڕەزائیە کە بریتین لەمانە: ڕووباری نازلو - ڕەوضە چای - بەرکەشلو - باراندوز - گدار... یاخۆ (قادر چای)، ئەم ڕووبارانە پاش ئەوەی دەوروبەری ڕەزائیە ئاو ئەدەن ئەڕژێنە زەریاچەی ڕەزائیەوە.

بابێینە سەر زەریاچەی ڕەزائیە لەباری مێژووییەوە: جوغرافینووسی بەناوبانگ (ئسترابون) ناوی (زاپاوتا ZAPAWTA) و هەر ئەوەیە کە وتمان لە (کەبوتا)وە هاتووە و بەتلەمیوس ناوی ناوە (مارگیان))ە و لە ئاویستاشا ناوی بە (چیچەست) بووە کە تا ئەمڕۆکە لە کوردستانا بەیەکێک لە لقەکانی ئەوترێ (چیچەست)... بەڵام ئیبن حەوقەل ناوی ناوە (کەبوذان) و ئیستەخری ناوی ناوە (زەریاچەی شُرات SHURAT) بەناوی ئەو کۆمەڵە کوردانەوە کە لە دەورەی ئەمەوی و عەبباسیدا لە دەوڵەت یاخیبوون و، بەناوی شاری SHARI و شرات ناسراون. پانایی ئەم زەریاچەیە ٤٠ کیلۆمەتر و، درێژایی ١٤٠

کیلۆمەتر و، قووڵاییشی لە هەندێ جێ ٦ مەتر و لە هەندێ جێی تری ١٢ مەتر تا ١٥ مەترە. ئاوی زەریاچەکە لە سوێری و شۆرییا گەییوەتە ڕادەی تاڵی و هیچ جۆرە گیانلەبەرێکی تیا ناژی و، هیچ جۆرە ماسی و شتی تری تیا نییە. ئاوەکەی لەبەرئەوەی گۆگردییە و گەلێ جۆرە ڕەگەزەی کانیی تری تێدایە بۆ نەخۆشیی پێستی و باداری و ڕوماتیسم بەکار ئەهێنرێ.

ئەم زەریاچەیە، چەند بەندەرێکی هەیە: شەرفخانە - گولمانخانە - ئاق گونبەد. و چەند کەشتیی ناوەنجی و بچووکی تیدایە بۆ کاروباری گواستنەوەی بار بەکاردەهێنرێن. دوورگەی شاهی لە ناوەندی ئەم زەریاچە دایە.

ژمارەی دانیشتوانی ڕەزائیە و دەوروبەری بەم جۆرەیە: ساڵی ١٣١٦ فارسی، بەپێی ئەو زانیارییەی بەهمەن کەریمی لە کتێبی جوغرافیاکەیا نووسیویە، سەرژمێری دانیشتوانی ناو شارەکە ٣٠.٠٠٠ هەزار کەس و سەرژمێری شارستانەکە ٧٥.٠٠٠ کەس بووە، بەڵام لەسەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ فارسییا ژمارەی دانیشتوانی شاری ڕەزائیە گەییوەتە ٢٩٧,٣٦٩ کەس و، هەموو شارستانەکە دەبێ ٤٠١,٠٦٩ کەس بێ. و ژمارەی هەموو ئوستانەکەش ١,٠٨٧,٧٠٢ کەسە... ڕەزائیە واتا -ئورمییەی کۆن- هەمیشە جێی خوێندەواری بووە، زانایانی خەڵقی ئەم شارە بەنازناوی (ئەرمەوی) ناسراون، یەکێ لەوان ئەبولفەزڵ محەمەد کوڕی عومەر کوڕی یوسفی ئەرمەوییە کە لە بەغدا خوێندوویە و، پاشان بووەتە سەرۆکی دادگای ئاینی لە شاری ئەلعاقول و، لەسەر ڕچی شافیعی بووە. ساڵی ٤٥٧ کۆچی لەدایک بووە و، تا ساڵی ٥٤٧ ژیاوە... یەکێ تری لەو زانایانەی پاڵشت دراونە ئورمییە، موزەفەر کوڕی یوسفی ئەرمەوی فەرمایشەوانە، کە لە فەرمایشەکانی پێغەمبەری مەزنا زۆر شارەزا بووە و، خۆی یەکێ بووە لە نووسەرانی دیوان و، لە سەردەمی خیلافەتی ناسرەدینوڵڵا عەبباسییا سەرۆکایەتی دیوانی گرتۆتە دەست. ئەمڕۆکەش لە شارەکەدا، بەپێی ڕانومای شارستانەکان کە هی ساڵی ١٣٤٥ی فارسییە لە ڕەزائیەدا پتر لە ٣٠ قوتابخانەی بەرایی، ١٠ قوتابخانەی ناوەنجی، ٢ هونەرستان، ٣ ئامۆژگای موعەلیم و فێرکار پێگەیاندن، ١ ئامۆژگای بازرگانی تیایە... جگە لەوە ٨٠ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواریشی تیایە کە لە لایەن سپای زانستەوە بەڕێوە ئەبرێن و ٧ قوتابخانەی بچووکان -کە پێ ئەوترێ باغچەی منداڵان-یشی تیایە، ڕۆژنامەیەک لەوێ دەرئەچێ بەناوی (پەیامی ڕەزائیە). نامەخانەیەکی گشتی تیایە کە ژمارەی کتێبەکانی ٤,٧٥٠ کتێبە. چەند چاپخانەیێکی تێدایە.

چاوەڕاوکارانی ئاینی ئەمەریکی بەر لە دەورانی پەهلەوی لەویٚ چاپخانەیەکیان هەبوو، نزیکەی ٣٢٣٠ بەرگ کـتـێـبی سـورەیانیی کـۆن و تازەیان چاپ کـرد و چەند قوتابخانەیەکیان بۆ نەستوورییەکانی ئەو ناوە کردەوە، پاشان ڕەزا شای مەزن، کە زانی ئەیانەویٚ پڕوپاگەندەی سیاسی بکەن، لە وڵاتەکە دەری کردن.

لە ڕەزائیەدا، واتا ئورمییەی کۆن- لە دەمێکەوە نەخۆشخانەی هەبووە، بۆ وێنە (عالەم ئارای عەبباسی) باسی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە محەمەد پاشای سەرۆکی جەلالی، کە تووشی نەخۆشیەکی سەخت بووبوو، ڕەنگ زەرد و لاوازی کردبوو، بۆ ئەوەی خۆی تیمار بکات و ماوەیەک بحەسێتەوە چووە ئورمییە... ئێستە لە ڕەزائیەدا چەند نەخۆشخانە، چەند دەرمانگا، چەند داروخانە، چەند جێی دەرزی لێدان، چەند دوکتور و، جێی پەروەردەی ساوا هەیە...

جێی دێرینە و شوێنەواری کۆن لە ڕەزائیەدا:

١- کونگەرەو و کەلوی سێی گومەزە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەلجووقیان و گۆیا لە ساڵی ٥٨٠ کۆچییا دامەزراوە و، مزگەوتی گەورەی جومعەیە، کە خۆی گەرچی چەند جاریٚ دووبارە کراوەتەوە، بەڵام میحرابەکەی هی ساڵی ٦٧٦ی کۆچییە. و قەڵایێ هەیە کە دەبیٚ هی دەورانی ماد بیٚ و تا دەورانی ئیسماعیلیەش هەر مابیٚ و سوودی لیٚ وەرگیرابیٚ. و بەناوی قەڵای (ضەحاک) ئەناسریٚ.

جگە لەمانە وتراوە لە ڕەزائیەدا چەند مزگەوت و چەند کلێسە هەیە ئەمڕۆکە، ڕەزائیە یەکێکە لە شارە هەرە جوانەکانی ئێران. بەڕێوەبەرایەتی تەلگراف، تەلیفون، بیٚ تەلی تیایە، ئێستگەی ڕادیۆ و تەلەویزیونی هەیە. باغچەکانی شار تەنانەت باغچەی نیل وفەڕ و، باغچەی شارداری زۆر ڕەنگینن. ئاوی شار هی لولەیە. چەند سینەمای ڕازاوەی هەیە. بەرق و کارەبا زۆر بەهێزە، چەند هوتێلی پلە یەک و پلە دووی تیایە و، دەیان هوتێل و مێوانخانەی ئاسایشی هەیە، زۆرخانە، وەرزشخانە، مەیدانی یاری تیایە... چەند یانە و باشگای تیایە بۆ مرۆڤ، بۆ ئەفسەرەکان، بۆ کارمەندان و بۆ سازمانەکانی تر... نزیکی ٣٠ گەرماوی تیایە... دەیان خۆراکخانە، چاخانە، مەیخانە و، شتی تری هەیە. بەڕێوەبەرایەتیی دەوڵەتانی هەموو تیایە، چەندین بانک و سەرافی هەیە، کارخانەی پیشەسازی و کاری دەستی بچووکی زۆرە، کارگەی وردەکارانەی بۆ جۆشکاری - تەراشکاری - دارتاشی - ئاسنگەری - جۆڵایی - جلوبەرگ دووری - زۆرە - لە ڕەزائیە

کردی بەرە - جاجم - قاڵی - شاڵ هەیە. تەنانەت شتی عەنتیکەی لە دار دروستکراو وەک، جێ نەرد و، جێی شەترەنج، کە میناکاری دەکرێن، بەسەدەف و شتی تری.

کشتوکاڵ لە رەزائیە و دەوروبەریدا، زۆر بەبردوە تەنانەت توتن - تریاک - دانەوێڵە - چەوەندەر... و لەوێ میوەش زۆرە، تەنانەت ترێ - کشمیشی سەوز لە دوایی وتارەکەمانا ئەتوانین بڵێین، کە رەزائیە یەکێکە لەو شارانەی گەشتیاران و جیهانگەردان، ئەوپەڕی حەسانەوەی تیا دەبینن و، تیا خۆش رادەبوێرن.

گوێگرە بەرێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری داهاتوو بەخواتان دەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٧/١٧

## زاغ

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش، کامەرانی و شادیتان هۆی خۆشیمانە.

لەم بەرنامەیەدا ئێمە لە باسی (زاغە) ئەدوێین،... زاغە ناوە بۆ یەکێ لە بەخشەکانی خوڕەم ئاوای لوڕستان. لای باکوری سنووری بەخشی چقلەوەندییە و، لای خۆرئاوای بەخشی ناوخۆی خوڕەم ئاوایە و، لای باشووری هەرێمی پاپییە، ئەم زاغەیە لە ڕووی مێژووەوە، هەروەک ئەو دوای لوڕستان وەهایە، واتا لە سەرەتای ڕۆژگاریەوە کە مێژوو بەبیریا بێت، لەژێر دەستی ئەم دەوڵەتانەدا بووە... عیلامی - مادی - هەخامەنشی - ئەشکانی - ساسانی - عەرەبی ئیسلام - حەسەن وەیهی - ئەتابەگانی لوڕستان... پاش ئەوە کەوتۆتە ژێردەستی ئەو والییانەی لوڕستان کە سەر بەدەوڵەتەکانی ئێران بوون.

ناوی زاغە، بەگومانی ئێمە کوردییە و، لە فارسییەوە نەهاتووە زاغە لە فارسیدا بەو جێگەیە ئەوترێ کە زستانان بکرێ بەکۆزی ڕان و مێگەل.. بەڵام لە زمانی کوردیدا بەو جێگەیە ئەوترێ کە زیخەڵان و بەردەڵانێکی وەهابێ کە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەیێ...

جا زاغە هەروەک ناوە بۆ بەخشێ لە خوڕەم ئاوای لوڕستان هەروا ناویشە بۆ چەند گوندێ سەر بەناوچەکە یەکێکیان: دێی زاغە باڵا، واتا (زاغەی ژووروو)وە، کە ناوەندی بەخشی زاغەیە.

دووەمیان : دێی زاغەی پائین، واتا (زاغەی خواروەو) کە یەکێکە لە دێیەکانی ئەم بەخشە و، ئەکەوێتە بەشی دێهستانی (داڵەوەند)ەوە. جگە لەم دوو دێیە دێیەکی زاغە ناوی تریش هەیە ئەکەوێتە دێهستانی حیشمەت ئاوادە، لە بەخشی دورودی، سەر بەشارستانی وەروگردا، واتا (بروجوردا).

سەر زەویی بەخشی زاغە دوو جۆرە، هەندێکی پێ دەشت و، ڕاستانە، وەک دەوروبەری ئەزنا و هەندێکیشی زورگ و هەڵەت و، چیایە وەک ئەو دوای سەر زەوییەکە، دانیشتوانی بەخشی زاغە بەپێی نووسینی تیمسار ڕەزم ئارا لە (فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران)دا، کە لە چوار دێهستانا دائەنیشن ئەمانەن، کە ٩٠ دێیان هەیە: داڵەوەندییەکان

سی دێیـــان هەیە و ســەرژمـــاریان ٥٩٠٠ کـەســە. ســەگـەوەندەکـان ٣٥ دێیـان هەیە. سـەرژمـاریان ئەگـاتە ٦١٠٠ کـەس... و ڕازانەکـان ٩ دێیـان هەیە و، سـەرژمـاریان ٩٠٠ کـەسێکە... (قـائیـد ڕەحمـەت)ەکان ١٦ دێیـان هەیە و سـەرژماریان ٢٧٠٠ کـەسـێکە لە مێژووە کۆنەکاندا، جگە لە ناوی (ساکی) ناوی ئەو عێلەکانی تری ئەم هەرێمە نەهاتووە کـە بریتین لە: (سـەگـەوەند - دالـّەوەند - قـائیـد ڕحـمـەت - سـاکی). بەڵام ناوی سـاکی کۆنە، لە کتێبەکانی (تەئریخی گوزیدە - مونتەخەب التەواریخی موعینی - شەرەفنامەی بەتلیسی)دا ناوی هاتووە، کە یەکێکە لەو عێلە کۆنەیانەی لە لوڕستان دانیشتوون و لوڕ نەبوون، دەبێ لە گۆرانەکان بووبن و، لە سەردەمی بنەماڵەی حەسەن وەیهییەوە مابنەوە... بەڵام ســەگــەوەند و تیــرەکــانی تری پاش ئەوە ناویان لە مـێـژوودا بینراوە. تەنانەت لە دەورانی قـاجـاردا ژاک دومـورگـان کـە سـاڵی ١٨٩١ بەو ناوەدا ســووڕاوە، نووســیــویە: دانیشتوانی بەشی زاغە گەرچی عێلاتن، بەڵام زرنگ و ئامادەی تێ گەیشتنن وەک عێلە کۆچەرەکـانی تر بێ ڕەحم نین. سـەرۆکی عێلی سەگەوەند زۆر پیـاوانە هاتە پیـرمانەوە و، بەگـەرم خـێـرهاتنی کـردین و، مـێـوانداری کـردین... جگە لە ژاک دومـورگـان (ئی. ئار. دوراند)یش کە بەلوڕستانا گەشتی کردووە و، چاوی کەوتووە بەمیهر عەلی خانی سەرۆکی سەگەوەند، زۆر ئەو سەرۆکەی هەڵناوە، سـتایـیشی کردووە و، نووسیـویە: سەرۆکی عێل پیاوێکی قۆز و، شۆڕەسوارێکی چالاک و، پۆشتەیەکی جلوبەرگ جوان بوو. لەو حەلەدا کە ئێمە لەوێ بووین گەرچی لەگەڵ عێلی بایرانەوەندا لە شەڕابوون، لەبەر خاتری ئێمە دەستی لە شەڕ هەڵگرتبوو، سەرژمێری ئەو ماڵانەی کە ژێر فەرمانی و پەیڕەوی بوون چوار هەزار ماڵێ بوو.

زاغەی ژووروو کە ناوچەی بەخشەکەیە. ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی خوڕەم ئاوا و، ٣٢ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە. دانیشتووەکانی ٦٠٠ کەسێ ئەبن...

دێ گەورەکانی بەخشی زاغە ئەمانەن:

١- کەریم ئاوا: کە ژماری دانیشتوانی ٤٠٠ کەسێ ئەبن و لە سەگەوەندەکانن و لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن.

٢- بادە: کە دانیـشـتوانی ٤٠٠ کەسێ ئەبن و، خاوەنی کشتوکـاڵ و باغ و، دێرینە و کـۆنە کەلاوەگـەلێکە، دەبێ کـۆنە شار بـووبێ، ئەم دێیـە جێی دار چنارە و، چناری وەهای تێدایە هی بەر لە ٣٠٠ ساڵە. گۆڕی پیر ئەحمەد کە یەکێکە لە پیـاوچاکانی ئەوێ، لەم دێیە دایە، خەڵقی ئەم دێیە تێکەڵن لە سەگەوەند و ساکی.

٣- دێی سەفید کە ئەکەوێتە ئەمبەر و ئەوبەری ڕووباری ئابستانەوە و کاریان کشتوکاڵە و ژمارەیان ٣٦٠ کەسێ ئەبێ.

٤- دێی نیمان ئاوا کە گەورەترین دێی بەخشەکەیە سەرژمێری ٥٠٠ کەسێ ئەبێ جگە لەمانە دێی داڵەوەند دێی چقڵەوەند ڕود و هەندێ دێی تری گەورەی تیایە. لەم بەخشەدا چەند قوتابخانە هەیە و، چەند قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواریشی هەیە. هەروا نەخۆشخانە، دەرمانگا، داروخانە و زۆر شتی تری تیایە.

چیا بەرزەکانی بەخشی زاغە ئەمانەن: (سیاکەمەر - کونگەرە زەرد - سەرنجە - سێ گولاهان - ئەزگەن)... ڕووباری ئابستانیش یەکێکە لە ڕووبارە بەناوبانگەکانی زاغە، کە سەرچاوەکەی لە چیای کەیانەوە دێت و، پاش ئەوەی بەهەرێمی سەگەوەندەکانا ڕائەبوورێ و ئەگاتە کەماڵەوەند لە سنووری خورەم ئاوادا ناوی ڕووباری گورگان پەیدا ئەکا. خەڵقی ئەم بەخشی زاغەیە سوود لە ڕووباری ئابستان و ڕووباری ئەزنا وەرئەگرن بۆ خواردنەوە و، بۆ ئاوەدانی کشتوکاڵ.

بابێینە سەر ئاووهەوای وڵاتەکە، هەندێ جێی گەرم و هەندێ جێی زۆر ساردە میان ڕوکان ئەوەندە ساردە کە شیو و دۆڵەکانی لە هاوینیشا پڕن لە بەفر.

دەسکەوتی خەڵقی ئەو ناوە بەجۆرێکی تێکرا... بریتییە لە دەغڵ و دانەوێڵە و بەرهەمی ئاژەڵی و، میوە و، شەقڵەدار... و ئەوەی لە شارەکانا بیفرۆشن بریتییە لە گەنم، جۆ، میوە، شەقڵەدار، ڕۆن، خوری، پێستە و، مەڕ و بزن.

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٧/٢٤

## وتاری: ٨٨

گوێگرە هێژا و بەڕێزەکان شەوتان باش! بەهیوایین بەرەو کامەرانی بڕۆن، لەم ڕۆژانەدا برادەرێک لە کوردستانی ئەودیوەوە نامەیەکی بۆ ناردووین و، داوای لێ کردووین، باسی (زاگرۆس)ی بۆ بکەین، ئەم ڕیزە چیایە لە کوێوە تا کوێ درێژەی کێشاوە؟ و ناوەکەی لە چییەوە هاتووە؟ ئایا کوردییە؟ یاخۆ زاراوەی یەکێک لە نەتەوە ئارییەکانە؟ یاخۆ زاراوەیەکی بێگانەیە و خۆی چەسپاندووە؟ هەروا داوای لێ کردووین کە بۆی ڕوون بکەینەوە لووتکە بەرزەکانی ئەم ڕیزە چیایە کامانەن؟ و چەند ڕووباری گەورە لەم چیایەوە بەرەو خوار سەرەوژێر ئەبێتەوە؟ و ئەو دەستە گەلانە ناویان چی بووە کە لەپێش نەتەوەی مادا لەم چیایەدا بەناوی گەلانی زاگرۆس ناوبراون و، بەردەنووسە گرنگەکان لە کوێن؟ ئێمە پاش سپاسی ئەو برادەرە لەم وتارەدا، بەکورتی و گەلاڵەیی وەرامی ئەدەینەوە.

موزیک

زاگرۆس، وەیا (زاگرس) ناوە بۆ زنجیرە چیایەکی دوورودرێژ کە لەلای باکوری خۆرئاواییەوە بەرەو لای باشووری خۆرهەڵاتی درێژەی کێشاوە. و لە ئاراراتەوە تا بەندەری گوارتەر کشاوە هەندێ لە جوغرافیانووسەکان وایان بۆ دەرکەوتووە کە ناوی زاگرۆس زۆر کۆنە و، لە بنەڕەتا یۆنانییە و، هەندێ گومانیان وایە کە ناوی (شاە کۆ) کەوتۆتە سەر زمانی یۆنانییەکان و بووە بەزاگرۆس. و بەدووریشی نازانین کە وشەی (زاگرس) لە بنەڕەتا لە وشەی (زورگ)ی کوردییەوە پەیدابووبێ. وشەی (زورگ) کە لە کوردییا ناوە بۆ چیا تا ئەمڕۆکە لەناو هەرێمەکانی (شوانی سەرخاسە و، شوانی کێشک و، ساڵەیی)یا باوە، کە بەو چیایەی ئەکەوێتە نێوانی پردێ و کەرکووکەوە -واتا لای خۆرهەڵاتی باکوری زێی بچووکەوە، تا لای خۆرئاوای خڕی خاسەی نێوانی شاری کەرکووک درێژە ئەکێشێ. لای ژووری چیای زورگەزراو پێ دەشتەکانی ساڵەیی و، شوانە... لای خوارویشی هەرێمی کانە نەوتەکانی پاڵ کەرکووکە، هەر لە دووبزەوە تا کەرکووک کە لەمەوبەر، سەر زدویی تیرەی ساڵەیی بوو، جا دوور نییە پاشماوەی یۆنانییەکان، کە بەفەرماندەیی ئەسکەندەری مەکدۆنی وڵاتەکانیان داگیرکرد و، پاش ئەوە بوونە پاشا تیرە و (ملوک الطەوائیف) و سەردەمێکی دوورودرێژ هەرێمی

کەرکووکیان بەدەستەوە بووە، ئەوان ناوی زورگی کوردیان وەرگرتبێ و، کردبێتیان بە(زگر) و پاشان بووبێ بەزاگرۆس.

ئەمڕۆکە زاگرۆس بەو زنجیرە چیایە ئەڵێن کە ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی تورکیە و خۆرئاوای باشووری ئێران و، باکوری عێراقەوە، درێژەی ئەم زنجیرە چیایە ١,٦٠٠ کیلۆمەتر و، پانایییشی لە ١٦٠ کیلۆمەترەوە تا ٣٢٠ کیلۆمەترە.

ئەو بەشەی زاگرۆس کە ئەکەوێتە تورکیاوە، لە مێژووی کۆنا پێی ئەوترا (ئارارات) و ئەم ناوە لە ناوی دەوڵەتی (ئورارتو)ەوە هاتبوو و، بەهەندێ جێی چیای زاگرۆس ئەوترا چیای نوح و چیای گۆتی و هەر ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ (کەشتییەکەی نوح بەسەر کێوی جودییا رێک وەستا) وشەی (گۆتی) کراوە بەعەرەبی و (گاف)ەکەی وەرگەڕاوە بە (جیم) و بووە بە (جودی)، بەڵام ئەمڕۆکە ناوی ئەم بەشە چیایەی تورکیا (ئاغری داغ)ەکە لە (ئاگری داغ)ی کوردییەوە هاتووە، چونکە جێی ئاگرپژێنی زۆرە. جا بەرزترین بەشی زنجیرەی زاگرۆس لە تورکیا دوو لووتکەی (ئاراراتی گەورە) و (ئاراراتی بچووکە) بەرزایی ئاراراتی گەورە ٥,١٥٦ مەتر و بەرزی ئاراراتی بچووک ٣,٩١٤ مەترە و، دەوروبەری ئەم چیایانە، دوازدە مانگی ڕەبەق پڕن لە بەفر... تەنیا بەشی چیای گڕان کۆ بەفری نییە کە ئاگرپژێنی زۆرە و، ناوی (گڕان) لەوەوە هاتووە کە (گڕ) هەڵئەدا و، زۆرجار بوومەلەرزەشی تیا ڕووئەدات ڕیزە چیای زاگرۆس، گرنگترین جێی سەر زەوییە، لەو ڕووەوە کە بەردەنووسی دێرینە و کۆنی زۆر تیایە. زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی دەستیان بەسەر هەرێمە چیاییەکەدا زاڵ بووە، یادی داگیرکاری خۆیان لەپاڵ شاخێکی وا تۆمارکردووە، وەک ئاسوورییەکان، مادەکان، عیلامییەکان، هەخامەنشییەکان، ئەشکانییەکان، ساسانییەکان، سەلجووقییەکان... تاد...

بەناوبانگترینی ئەم بەردەنووسانەی کە مێژوو تا ئێستە، تۆماری کردوون ئەمانەن: بەردەنووسەکەی کێلەشین، لە هەرێمی پیران و خانە بەردەنووسەکەی داریوش لە هەمەدان کە بە گەنجینە بەناوبانگە و، بەردەنووسەکەی داریوش لەپاڵ چیای بێستوون، بەردەنووسەکەی (ئانوبانینی) لە سەرپێڵی زەهاو، بەردەنووسەکەی (کەل داود) لە هەورامان، بەردەنووسەکەی قوپی قەرەداغ، بەردەنووسەکانی پشت کۆە و پێش کۆە... تا دوایی.

بەرزایی زاگرۆس، لای کەناری ئەرەس، ئەگەر قووڵایی شیوی ئەرەس بخرێتە بەرچاو، لە

هیمالای هیندستان بەرزترە و، لە کوردستانی باکوری عێراقدا بەرزترین لووتکەی زاگرۆس، چیای حەساڕۆست، چیای قەندیل و، چیای پیرەمەگرونە و لە کوردستانی ئێراندا بەرزترین لووتکەی دالّەهۆ و شاهۆیە لە هەرێمی کرماشان و، کەبیر کۆ و زەرد کۆیە لە هەرێمی لوڕستان و بەختیاریيا.

بەشێکی زۆری چیاکە جەنگەڵاوییە، تەنانەت داری بەڕوو و، دارەوەن و مێوەی کێوی زۆرە... ئەمدیو ئەودیوی چیای زاگرۆس زۆر بەبڕشت و، بەرهەمی کشتوکاڵی زۆر چاکە و، لەم چیایەدا و لە بنەپاڵەکانیدا، کانگای نەوت و، بەردی خەڵووز و، گۆگرد و، فسفۆر و، کانی ئاسن و، مس، زۆرە.

ئەو ڕووبارانەی لەم چیایەوە بەرەو خوار ئەبنەوە: ئەو لقانەن کە دەڕژێنە ناو ڕووباری فورات، وەک خاپوور و فیش خاپوور و ئەو ئاوانەن کە دەڕژێنە ناو دیجلەوە وەک زێی گەورە، زێی بچووک، سیروان، ئەلوەند، گاماساپ، سەیمەرە و زۆری تر... و هەندێ لەو ڕووبارانەش بەلای ژوورا ئەکشێن و ئەچنە ناو زریەی ئورمییەوە، وەک جغەتو و، تاتاهو، کە پێیان ئەوترێ زێڕینەرودو سیمینەرود... ئەمە بوو هەندێ زانیاری لەبارەی زاگرۆسەوە...

بابێینە سەر ئەو دەوڵەتانەی کە پێیان وتراوە، گەلانی زاگرۆس ئەمانەن: لولو - گۆتی - کاسی - عیلام - میتانی - نایری - ئورارتو - و چەند نەتەوەیەکی تری بچووک ئەمە بوو وەڵامی ئەو برادەرە.

گوێگرە بەڕێزەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا هەفتەی ئایەندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٨/١

## وتاری ٨٩

گـوێگره بەڕێزەکـان شـەوتان باش... هیـوامـان سـەرکـەوت و بەمـراز گـەیینی ئێـوەیە لە کاروبارتانا، ئەمشەو باسی قـەڵای (زەڕین کەمەر)تان بۆ دەکەین، کە ئەمڕۆکە نە ناوی ماوە و نە شوێنەواری، تەنیا ئەوەندە ئەزانین کە لە هەرێمی (گەروس)ی ئەمڕۆدا بووە و، مەڵبەندی عێلی سیـامەنسوور بووە لە عێلە گۆران زمانەکـانی کۆنی ئێران، (بەهمەنی کەریمی) لە جوغرافیاکەیا، ئەڵێ: ئەم قەڵای (زەڕین کەمەر)ە لە سەدەی حەوتەمی کۆچییا یەکـێک بووە لەو هەرێمـانەی کـە سـەر بەکـوردسـتـانی ئەردەڵان بوون؛ بەڵام جگە لە (بەهمـەنی کەریمی) هیـچ کـام لە دانەرانی جـوغـرافـیـا فـارسی زبانەکانی ئێـران ناویان لەم قەڵایە نەبردووە. جا بۆ زانیارییەکی پتر، پەنا ئەبەینەوە بەر (شەرەفنامە) و (عالەم ئارای عەبباسی)... شەرەفنامە وای ڕوون کردۆتەوە کە بەرلەوەی سەرداری (ئەردەڵان) دابمەزرێ لە ئێـرانا سێ عـێلی زۆر گـەورەی کـوردی گـۆران بەناوبانـگ بوون کـە ئەمـانەن: (سیـامـەنسـوور – چنگی – زەنگەنە) و، لە سەردەمی دەوڵەتی سەفەویدا، بۆ پاراستنی ئاسـایشی و هێـمنی وڵات و، بۆ بەرگـری لە سنوورەکـان، سـوود و کـەڵک لە هێـزیان وەرئەگـیرا، لە سـەردەمی شا تەهماسپدا خەلیل بەگی سیامـەنسوور سـەری بۆ دەوڵەت دانەواندبوو، لە پاداشی ئەوەدا شا تەهماسپ فەرمانی سەرداریتییەکەی بۆ مۆر کردبوو، وردی پێشـان دابوو، کە ئەم هەرێمانە بەڕێوە ببات: (سولتانییە – زەنجـان – ئەبهەر – زەڕین کەمەر) و هەرێمەکانی تری نێوانی ئازەربایجان و عێراقی عەجەم بەو مەرجەی کە هەمیشـە سێ هەزار سواری ئامادەی هەبێ بۆ پاراستنی سنوور و، ڕێکوپێکیی ئاسـایش و هێمنی لە نێوانی تەورێز و قەزوینـدا ئەم خەلیل بەگی سیامەنسوورییە ماوەی سێ ساڵێ کاروباری بەڕێوە برد و، عێـلات و تیـرەگـەلێکی جـیـاجـیـای کوردی لە دەوری کـۆبووەوە... دەس و پێـوەند لەباتی ئەوەی هەوڵ بۆ هێـمنی و ئاسـایش بدەن، کـەوتـنە ئاژەوەنانەوە. لەبەرئەوە شـا تەهمـاسـپ لە خـەلیل بەگ دڵگـیـر بوو و، فـەرمـانی دا ئەو هەرێمـە بەجێ بهێـڵێ و بچێت بەرەو (خـوراسـان) و لەوێ کـاروباری خوار عـێـراق بگرێتە دەس لێرەدا ئەمانەوێ دیاردی بۆ ئەوە بکەین کە ئەمڕۆکە جێ پێ بەناوی (خوار عێراق)ی ناناسین و، لە فـەرهەنگە جـوغـرافـیـاییـەکـانا ناوێکی وەهامـان بەرچاو ناکـەوێ، دوور نیـیـە بەهەڵە یاداشت کرابێ و مەبەست (خەواف) بێت کە یەکێکە لەناوچەکانی خوراسان.

بابێینەوە سەر باسەکە، خەلیل بەگ ناچاربوو قەڵای زەڕین کەمەر بەجێ بهێڵێ و، ئامادەی کۆچ بێ و، عێلات و تیرە کوردەکان دەوروبەری چۆڵ بکەن و لێی بڕەوێنەوە، جا تەنیا بەزۆربەی عێلی سیامەنسوورەوە ڕووی کرد حوراک و لەوێ ماوەیەک ژیا و، کۆچی دوایی کرد...

لەم سەردەمەدا، دەوڵەتیاری کوڕی خەلیل بەگ بەشێ لە چنگی سیامەنسووری لەژێردەست بوو و، خۆی یەکێ بوو لە فەرماندەکانی سپای شا تەهماسپ و، کاتێ کە عێلاتی (تەکلو)ی قزڵباش دژی شا تەهماسپ وەستابوون و شۆڕشیان بەرپا کردبوو، ئەم دەوڵەتیار خانە زۆر نەبەردانە پشتیوانیی لە شا تەهماسپ کردبوو و، خزمەتێکی گەورەی ئەنجام دابوو. شا تەهماسپ لە پاداش خستبوویە ڕیز گەورەیانی (قووروچی)یانەوە و، لەسەر ئەو ڕایە مابووەوە تا سەردەمێ کە سوڵتان محەمەد خودابەندە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانییا نێوانیان تێک چووبوو، جا لەوکاتەدا کە سوڵتان محەمەد خودابەندە لە تەورێزەوە بەرەو مێرگەکانی (سوڵتانیە) ئەچوو و، ساڵیش ۹۹۳ کۆچی (هاوکات لەگەڵ ساڵی ١٥٨٤ی زایینی بوو) و سەردارانی عوسمانی مرخیان لە ئازەربایجان خۆش کردبوو کە داگیری بکەن و، ئەو ناوە پڕ بووبوو لە ئاژاوە و بشێوێنە، ئا لەم کاتەدا دەوڵەتیار خان چووە لای سوڵتان محەمەد، دانرایەوە بەسەرداری عێلی سیامەنسوور و ئەرکی پاراستنی ئازەربایجان و سەر سنوورەکانی خرایە ئەستۆ و کرا بەفەرمانڕەوای ئەم هەرێمانە: (کرشب - زەڕین کەمەر - سەجاس - زەنجان - صورلق - قەیدار - شەبستان - ئەنگوران - قانجوقەی ژووروو - قانجوقە خواروو) کە بەهۆی شەڕەوە تووشی وێرانی بووبوون و، داواش لە دەوڵەتیار خان کرا، هەوڵ بدات بۆ ئاوەدانکردنەوەیان... لەم ڕۆژەوە کرشب جێی زەڕین کەمەری گرتەوە و، بوو بەناوچەی سەرداریێتیی سیامەنسوور...

پاش ئەوە دەوڵەتیار خان، نەوەک تەنیا ئەو ناوانەی ئاوەدان کردەوە، بەڵکو لە هەرێمی ئەنگوران و شەبستاندا قەڵایەکی زۆر سەختی دامەزراند و بەپێی عالەم ئاراوە دەبێ ئەم قەڵایەی لە سەجاس دامەزراندبێ و، بەم جۆرە کەوتە پەرەدان بەدەسەڵاتی خۆی و بەپاراستنی سەر سنوورەکانی نێوانی ئێران و عوسمانی، تا سەردەمی شا عەبباسی سەفەوی لەو دەورەدا کابرایەک بەناوی قولی خانی تورەنانی کەوتە کنەکردن لەلای شا عەبباس و دڵی شای لە دەوڵەتیار خان کرمێ کرد و، شا عەبباس چەند جار هێزی ناردە سەری، بەڵام هیچیان پێ نەکرد، پاشان شا عەبباس لەگەڵی ئاشت بوو و، ناردی بەشوێنیا، هەرکە هاتە لای شا دوستووری دا گرتیان دەستیان کۆت و پاڵەهەنگ و، پاش

ئەو سەرداریتی سیامەنسوور سپێررا بەئەمیر حوسێن قولی سوڵتانی سیامەنسووری. با لەبیریشمان نەچێ لە سەردەمی شا عەبباسیشدا. بەشێکی زۆر لە سیامەنسوور نێرران بۆ سەر سنووری خوراسان ئەفغان... بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە جێی داخە ئەمڕۆکە نازانین کە ئەم زەڕین کەمەرە کەوتۆتە کوێوە و ئایا شوێنەوارێکی ماوەیانە. تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٨/١٢

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، ڕەزامەندیی ئێوە هۆی شانازی و پێشکەوتنی ئێمەیە لە کاروبارمانا، ئەمشەو باسی زەنجانتان بۆ دەکەین، ئەم شارەی کە لە سەردەمی قاجاردا، ناوەندی (ولایەتی خەمسە) بوو و، پاشان ماوەیەک فەرمانداری بوو و، جارێ بەسترابوو بەئوستانی پایتەختی ولاتەوە و، جارێ بەسترابوو بەئوستانی یەکەم (واتا بەگەیلان)ەوە، ماوەیەکە ئەم فەرمانداریيە بووە بەئوستان و، شاری زەنجان بووەتە ناوەندی ئوستانداری...

ئەم شارە یەکێکە لە شارانی کۆنی هەرێمی چیای ئێران و، بەقسەی (بەطلەمیوس)ی جوغرافیانووسی کۆن، کە لە سەدەی دووەمی زایینیدا ناوی بردووە ناوی (ئاگانزانا Aganzana) بووە و، دەبێ ئەم ناوە هەر لە وشەی (زەنگان)ەوە وەرگەڕابێ بە ئاگانزانا پاش ئەوە، ناوی ئەم شارە کاتێ ئەبرێ، لە مێژووا، ک سالّی ٢٤ کۆچی لە لایەن سپای ئیسلامەوە بەشەڕ و هەندێ ئەڵێن بەئاشتی داگیرکراوە... سالّی ٢٥٢ کۆچی، وەیاخۆ پاشتر حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی حەسەنی)، دامەزرێنەری دەوڵەتی عەلەویانی تەبەرستان، کە لە سەرچی ئیسماعیلییە بوون و دژی خەلیفەی عەبباسی هەڵستابوون، دەستووری دا بە حوسێن کوڕی ئەحمەدی کەوکەبی زەنگان لە دەس نێژانی دەوڵەتی عەبباسی داگیر بکات، بەلام سالّی ٢٥٣ سەرداری سپای عەبباسی کە ناوی موسا کوڕی بوغا بوو بەفەرمانی ئەلموعتەزیبیللای خەلیفە سپایەکی گەورەی لە بەغداوە هەڵگرت و کەوتە ڕێ بەرەو چیا و تەبەرستان، بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی عەلەوی و، قەلاچۆکردنی داروودەستەی (داعیی کەبی)، ئا لەم کاتەدا سەرانی دەیلەمانیش بوونە هاوکاری دەستەی (داعی کبیر) بەلام هەموویان لە شەڕا شکان و، موسا بوغا ولاتی لە دەس وەرگرتنەوە. با لێرەدا لەبیرمان نەچێ کە دیاردی بۆ ئەوە بکەین مەبەست لە (دەیلەمان) بنەماڵەی (ئال بویەی) دەیلەمی نییە، بنەماڵەی (دەیلەمان) سەرداریيێ بوون، لە هەندێ هەرێمی چیا و ئازەربایجانا، پاش لەنێوچوونی ئەو سەردارییە بنەماڵەی (جوستانیان) جێی ئەوانی گرتەوە. ئەڵێن: ئەم موسا کوڕی بوغایە پیلانێکی زۆر فێڵبازانەی بۆ قەلاچۆی عەلەوییان پێک هێنا، ئەوەش بەم جۆرە بوو لە کاتێکا لەشکری هەردوولا بەرامبەر بەیەک وەستابوون، موسا ناردی لە پشت لەشکری عەلەویانەوە زوتی ڕشت و ئاگری تێ بەردا،

لەشکری عەلەویان لە نێوانی ئاگر و دوژمنا کەوتنە گەمارۆ... ئەمە وا ئەگەر سەبێنیٚ کە شەڕەکە لە (گەلی)یەکی تەنگدا ڕووی دابێ، وەگەرنە لەو ڕۆژگارەدا چەرخ و کەرەسە وەک ئێستە نەبووە، کە ئەوەندە ئەوتە پەرشوبڵاو بکاتەوە، بتوانێ لای پشتەوە لە هێزێ بگرێ.

سالّی ۳۰۷ کۆچی خەلیفەی عەبباسی هەرێمی زەنگانی دا بە (یوسف کوڕی ئەبوالساج) کە یەکێ بوو لە بنەماڵەی (سالاریان) فەرمانڕەوای ئەران و گورجستان و ئازەربایجان... سالّی ۳۱٤ کۆچی ئەسفار کوڕی شێرویە لە ماکانی سەرداری دەیلەمان هەڵگەڕایەوە و، وڵاتەکەی ژێردەستی لێ دارنی، بەڵام سالّی ۳۱۵ لە لایەن دەستەیەک لەو ئیسماعیلییانەوە کە بە (قەرامیطە) ناو ئەبران، کوژرا و، مەرداویچ کوڕی زیار لە جێی دانیشت و هەرێمەکانی مازەندەران - ڕەی - قەزوین - ئەبهەر - زەنگانی داگیرکرد... لە سەردەمی (هارون ڕەشیدی) خەلیفەی عەبباسیدا، ئەو کوڕەی کە ناوی قاسم بوو، والیی گورگان، تەبەرستان، قەزوین بوو. خەڵقی زەنجان لەتاو ستەمی دەس نێژانی دەولەتی عەبباسی و لەبەر زۆریی دز و جەردەی ئەوان، فەریادیان بردە بەر قاسم و خۆیان دایە پالّی و، بەو جۆرە خۆیان لە ئاژاوە و بشێونە ڕزگار کرد... سالّی ۳۳۰ و لەوە بەدواوە زەنگان و شارانی تری ئەو ناوە کەوتە ژێردەستی وەهسوزان کوڕی محەمەدی کوڕی موسافیر کە بنەماڵەکەی بەناوی (کەنگەریان) بەناوبانگ بوون و، لەگەڵ بنەماڵەی ئال بویەدا لە شەڕا بوون. سالّی ۳۳٦ کۆچی مەرزبان کوڕی محەمەد لە ئازەربایجانەوە هەڵی کوتایە سەر زەنگان و دەوروبەری... ڕوکن الدولە ئال بویە کەوتە پەژارە و نامەیەکی بۆ نارد و تیا نووسیبوی: ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ئازەربایجان و نەبێتە هۆی ئاژاوە، زەنگان و دەوروبەری ئەخاتە سەر فەرمانڕەواییەکەی...

سالّی ۳۵۵ کۆچی وەهسوزان لە تارم و دەیلەمستانەوە لەشکرێکی کۆکردەوە و لەگەڵ یەکێک لە سەرکردەکانی خۆیا ناردی بەرەو ئازەربایجان و ئیبراهیمی مەرزبانی شکاند، کە سەر بەڕوکن الدەولە ئال بویە بوو و، بەپێی هەندێ قسەی ئیبن لئەثیر وا دەرئەکەوێ کە سالّی ۳۷۹ی کۆچی فەخرلدەولە ئال بویەش زەنگانی داگیر کردوە، بەڵام پاش مردنی جارێکی تری کەوتۆتەوە دەس ئیبراهیمی مەرزبان، سالّی ۳٦٦ کۆچی کە ڕوکن الدەولە ئال بویە لەسەرەمەرگدابوو، وڵاتەکەی ژێردەستی بەش کرد لە نێوانی کوڕەکانییا: (ڕەی، هەمەدان، قەزوین، ئەبهەر، زەنجان، ساوە و، ئاوە) و هەندێ لە کوردستانی دابە یەکێکیان...

سالی ٦٠٩ بەدواوە جەلالەدین حەسەن کوڕی محەمەد لە بنەماڵەی حەسەن سەباحی ڕابەری ئیسماعیلییە، چووە یاریدەی ئەتابەگ موزەفەرەدینی ئوزبەگ -کە فەرمانڕەوای ئازەربایجان بوو- و لە شەڕابوو دژی مەنگلی فەرمانڕەوای عێراقی عەجەم و، مەنگلییان بۆژە کرد و، سەریان پێ شۆڕ کرد، پاش ئەوە ئەتابەگ موزەفەرەدین ئەبهەر و، زەنجانی دایە جەلالەدین و، هەر لە ژێردەسیابوو تا سەردەمی جەنگیز خانی مەغۆل...

با لێرەدا باسی مێژوویی زەنجان بوەستێ بۆ وتاری داهاتوو... حەمدوڵلا موستەوفی قەزوینی ئەڵێ: ئەم شاری زەنگانە لە لایەن ئەردەشێر بابەکانەوە دروست کراوە و لەو سەردەمەدا ناوی شەهین بووە... و ئەوەی ناڕاست بێ ئەوەیە کە کتێبی (راهنمای شهرستانهای ئێران) وای داوەتە قەڵەم کە ئەم شارە لە کۆنا ناوی (سوڵتانییە) بووە، بەڵام ئەم وتەیە نیشانەی ئەوەیە کە نووسەرانی کتێبەک ئەوەندە خۆیان ماندوو نەکردووە کە ڕەنجی لێکۆڵینەوەی مێژوو بگرنە ئەستۆ کە بزانن زەنجان شارێکی کۆنە و، سوڵتانییە لە سەدەی حەوتەما لە لایەن ئەرغون خانی مەغۆلەوە دامەزرێنراوە و، پاش ئەو ئەولجاتیوخان بەهۆی فەڕ و قەدەمی لە دایکبوونی ئەبو سەعید بەهادری کوڕییەوە سالی ٧٠٤ی کۆچی دوای هێناوە و کردوویە بەپایتەختی وڵاتەکەی و، خۆی و ڕەشیدەدین فەزلولڵای وەزیری هەوڵیان داوە بۆ ئاوەدانکردنەوە و ڕازاندنەوەی.

گوێگرە خۆشەویستەکان لە وتاری داهاتوودا باسی جوغرافیای زەنگان بەتەواوی روون دەکەینەوە، ئێستە، بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٢/٨/٢٢

## وتاری: ٩١

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە شەوتان خۆش کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە. ئێمە هێشتا لەسەر باسی زەنجان نەڕۆین، ئەوە بوو لە وتاری ڕابردوودا وتمان (بەطلەمیوس)ی جوغرافیانووسی بەناوبانگ کە لە سالانی ١٥٥-١٧٠ زایینیدا ژیاوە ناوی زەنگانی ناوە ئاگانزانا Aganzana... بەلام حەمدوللا قەزوینی لە (نوزهەت القلوب)دا وای دەرخستووە کە ئەم شارە لە لایەن ئەردەشێر بابەکانەوە دروست کراوە، کە لە سالانی ٢٢٦-٢٤١ زایینیەوە شاهەنشای ئێران زەمین بووە... لەم قسانە وا دەردەکەوێ زەنجان بەهۆی کارەساتێکەوە وێران بووبێ و، پاشان ئاوەدان کرابێتەوە و، جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە یاقوتی حەمەوی دەڵێ: ئێرانییەکان بەزەنجان ئەڵێن (زەنگان) واتە هەرگیز بەو (جیم)ە نایدرکێنن؛ کە لە عەرەبییەوە هاتووە، بەپێچەوانەی ئەمڕۆ کە نووسەر و مێژوو ناوی زەنگانی بەدەما نایێ و، هەموو هەر زەنجان ئەڵێن... بابێینە سەر ئەوەی کە ئەم ناوە لە چییەوە هاتووە؟ دوور نییە و ولاتەکە زۆر جەنگەلاوی بووبێ و، (زەنگەن)ی زۆر تیا بەکار برابێ بۆ دار شکاندن... وەیاخۆ لەبەرئەوە بێ کە ڕووبار و زێی زۆرە، واژەکە لە بنەڕەتا (زێ گان) بێ واتا ولاتێکی پڕ لە زێ بێ و، پاشان ناوەکە گۆڕابێ، بە (زەنگان)... یاخۆ وەکو فارسەکان ئەڵێن مەبەست لە (زەنگەن) تیشکی مانگ و تاو بێت، لەبەرئەوەی جێگەکەی بەرزە، باشتر بەر تیشک و پرتە بکەوێ...

بابێینەوە سەر لایەنی مێژوویی، لە سەردەمی شا تەهماسپی سەفەویدا زەنگان یەکێ بوو لە ولاتەکانی ژێردەستی خەلیل بەگی سیامەنسوور و، تا سالی ١٠٠٠ کۆچی لەگەل سولتانیە و ئەبهەر و تارم و دەرگەزین و قەزوین و جێگەیانی تر، بەشێ بوون لە فەرمانڕەواییەکەی... پاش کوژرانی خەلیل بەگ مایەوە بۆ دەولەتیار خانی کوڕی تا کاتێ کە شا عەبباسی سەفەوی ئەویشی لەسەر کار لابرد ئنجا سالی ١٠١٦ کۆچی زەنجانی دایە ئاغا سولتان موقەدەم و، کاروباری سپاییی ئەو ناوەشی سپارد بەکابرایەک کە ناوی کەکەج محەمەد بوو و، گومان وایە کە وشەی کەکەج هەر وشەی کاکەی کوردی بێ و لە لایەن تورکە قزلباشەکانەوە گۆڕابێ بە کەکەج...

زەنجان لەڕووی هەلکەوتی جوغرافیشەوە بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە خۆرئاوای تارانەوە

بەدوورایی ٣١٤ کیلۆمەتر... هەروەک ئەکەوێتە لای باشووری خۆرهەڵاتی تەورێز، بەدوورایی ٣٠٢ کیلۆمەتر... و خۆی لەمەوبەر، هەروەک وتمان ناوەندی ولایەتی خەمسە بووە. واتا (ئەبهەر ڕود - خەر ڕود - زەنجان ڕود - ئایج ڕود - سەجاس ڕود) و لەبەرئەوەی ئەم پێنج بەخشەی هەبووە، پێی وتراوە ولایەت خەمسە... پاشان لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا، کراوە بەشارستان و فەرمانداری و، ماوەیەک سەر بەئازەربایجانی شەرقی و، ماوەیەک سەر بەئوستانی ناوەندی و، تا ئەم دواییییە سەر بەئوستانی یەکەم، واتا ئوستانی گەیلان بوو... ئەم ساڵ کرا بەئوستان و هێشتا سنووری بۆ نەکێشراوە و، بڕیار نەدراوە کام بەخشانە و کام فەرمانداریانەی بخرێتە سەر...

زەنجان لەبەرئەوەی ١,٦٠٠مەتر لەڕووی زریەوە بەرزە، هەوای ساردە و، لە هەندێ جێگاکانی دەوروبەریشیا ناوەنجییە. خەڵقی زەنجان و دەوروبەری، لە سەردەمی موستەوفی قەزوینییا، واتا بەرلەوەی کە مەغۆل شارەکە و شوورە و کونگەرە و قەڵاکانی برووخێنی زبانیان (پەهلەوی) بووە واتا فەیلی و گۆرانی بووە. ئێستە بەشی زۆری ئەو ناوە بەشێوە تورکییەکی تێکەڵ و پێکەڵ قسە دەکەن، کە بۆمان دەرئەخا لە دەوری مەغۆلدا ئەو شێوە زمانە بەزۆر براوە بەسەر خەڵکەکەدا، بۆیە تا ئێستەیش هەر پڕە لە کوردی و فارسی.

دانیشتوانی زەنجان ٦٠,٠٠٠ کەس ئەبێ و، سەرژمێری شارستانەکەش بەپێی ئەو سەرژمارەیەی کە ساڵی ١٣٤٥ فارسی ئەنجام دراوە ٤٦١/٥٨٨ کەسن.

زەنجان، جێگەیەکی بەبڕشت و بەپیت و بەرەکەت و ئاویژەیە و ڕووبارە گرنگەکانی ئەمانەن:

١- ڕووباری زەنجان، کە سەرچاوەکەی لەلای سوڵتانیە و دێ و، بەلای خوارووی زەنجانا ڕائەبورێ و، ئەڕژێتە ڕووباری قزل ئوزونەوە کە کورد پێی ئەڵێن (قزل وەزان).

٢- ئایجرود: لە چیاکانی سێیەمین زنجیرەوە دێت و، بەلای دێی یەنگی کەندا ڕائەبورێ و ئەڕژێتە قزل ئوزون.

٣- سەجاس، خەر ڕود، بزینە ڕود، ئەبهەر ڕود و، زۆر جۆگە و ڕووباری تریشی تیایە.

وەکو وتمان، زەنجان لە هەرێمێکی چیایی دایە... ڕیزە چیاکانی ئەمانەن:

١- ڕیزە چیای ئەلبورز، کە دەکەوێتە لا ژووری قزل ئوزون و بەرزایی ئەم چیایە، لە لووتکەی کەلاسدا ئەگاتە ٢٩٧٤ مەتر.

٢- ڕیزە چیای دووەم کە لقێکە و لە ئەلبورز جیا دەبێتەوە، ئەکەوێتە لای خوار و

باشووری قزل ئوزونەوە، لای بەرزترین لوتکەی کە ناوی (دگا)یە بەرزایی دەگاتە ٢٩٨٩ مەتر و، ئەم ڕیزە نزیک بەبەخشەکانی (تارم - ئەبهەر - زەنجان).

جگە لەم دوو ڕیزە چیایە، چەند زنجیرە چیایەکی تریش هەیە. لە زەنجانا ساختمان و شوێنەواری مێژوویی و دێرینە زۆرە، وەک مزگەوتی شا-مزگەوتی حاجی میرزا ئەبولقاسم-مزگەوتی گەورەی- جامیع مزگەوتی مەلا سەید ئیبراهیمی ئیمامزادە- پردەکانی حاجی میر بەهائەدین و ئەسعەد الدەولە... و گونبەدی سوڵتان کە دوورە لە شارەوە. زەنجان، کە شارستان بوو پێنج بەخشی هەبوو: بەخشی زەنجان و دەوروبەری - بەخشی ئەبهەر ڕود - بەخشی قەیدار - بەخشی ماە نیشان - بەخشی سیردان.

بەرهەمی ئەم فەرمانداریيە، کشتوکاڵ و، میوە و، دەسکەوتی ئاژەڵییە.

لەم شارستانەدا فەرهەنگ و خوێندەواری پێش کەوتووە. حەوت قوتابخانەی ناوەندی، ٣٣ قوتابخانەی بەرایی، ٦٧ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە. لەم شارە و دەوروبەریدا، کارەبا و بەرق، ئاوی لولەکێشی، تەلگراف و تەلیفون و هێڵی ئاسن هەیە، سینمای تیایە، ١٢٩ قاوەخانە و خۆراکخانە و ٢٢ گەرماوی تیایە. چەند هوتێل و مێوانخانەی هەیە، دوو نەخۆشخانە، ١٧ دەرمانگاە، ١٥ جێی دەرزی لێدان، حەوت داودەرمان فرۆشی تیایە کارخانەی گۆگرد و شخارتە و، کارخانەی خشتی سوورەکراو و، زۆر شتی تری وای هەیە.

لە زەنجان خوێندەوار و پیاوی گەورە زۆر هەڵکەوتوون وەکو شێخ ئەخی زەنجانی، ئوستاد عەبدولغەفار سەکاک، عیسای کاشانی زەنجانی و، لە هەموویان بەناوبانگتر سەعید عەبدولوەهاب کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەبدولوەهابی زەنجانی. کە ئەم کتێبانەی داناوە:

١- عیزی (عِزّي) کە بەتەسریفی زەنجانی بەناوبانگە و، فەقێ و مەلای کورد ئەیخوێنن لە زانستی سەرفا.

٢- هادی، لە زانستی نەحودا.

٣- معیار النوظار لە باسی عەرووز و قافیەدا، ئەم زانا مەزنە ساڵی ٦٥٥ کۆچی وەفاتی کرد.

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی زەنگان تا بەرنامەی ئایەندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/٨/٢٧

## وتاری: ٩٢

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش. هیوامان سەرکەوت و پێشکەوتنتانە. ئەمشەو باسی (زیویە)تان بۆ دەکەین، بەڵام کام (زیویە)؟... ئێمە زۆر جێ و شوێنمان هەیە کە ناویان (زێوە) یاخۆ (زێویە)یە... و با لە سەرەتادا بڵێین، کە ناوی (زێوە) لە (زاویە)ی عەرەبییەوە نەهاتووە، کە لە باتی (گۆشە) و (سووچ) و (تەکیە) و (خەڵوەگای) دەروێشان بەکار ئەبرێ... بەڵکو مەبەست پاڵشتدانی ئەو جێگەیەیە بەکەسێ کە ناوی (زیوا) بووە، واتا جوان و شیرین و، ئەم واژەیە لە بنەڕەتا: لە وشەی (زیو) وەرگیراوە، کە جۆرە مایەیەکی کانگاییی، سپێ ڕەنگە، بەکار ئەهێنرێ بۆ خشڵ و، بۆ تفاقی خۆ پێ ڕازاندنەوە و، بۆ دراو... بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە نازانین لە کەیەوە ئەم وشەیە لەناو کوردەوارییا بڵاوبووەتەوە؟ ئێمە هیچ جۆرە فەرهەنگێکی کۆنمان بۆ نەماوەتەوە، نە لە (ماد)ەوە و نە لە (پەهلەوی)یەوە...

موزیک

بابێینەوە سەر ئەو جێگانەی کە ناویان (زیوە) و یاخۆ (زیوتە) ئەمانەن: زیوە یەکێکە لە ئاواییەکانی دێهستانی کەڵخورانی بەخشی ناوەندی شارستانی ئەردەوێل. زیوە دێیەکە لە دێهستانی ئیل تیموری بەخشی ناوخۆی شارستانی مەهاباد. زیوە گوندێکە لە دێهستانی مەنکاریی بەخشی سەردەشت... زیوە گوندێکە لە دێهستانی پیرانی بەخشی ناوخۆی مەهاباد... زیوە گەورە دێیەکە لە دێهستانی (سوگمان ئاوا)ی دەوروبەری شارستانی خۆی... زیوە دێیەکی گەورەیە لە دێهستانی چار ئویماقی بەخشی قەرە ئاغاجی شارستانی مەراغە... زیوە گەورە ئاواییەکە لە دێهستانی فارسینجی سەر بەبەخشی ئەسەد ئاوای سەر بەئوستانی هەمەدان... زیویە دێیەکە لە دێهستانی بیلەوەری بەخشی کامیارانی سەر بەئوستانی کوردستان... زیویە دێیەکە لە دێهستانی ئیسفەند ئاوای بەخشی قوروەی سەر بەئوستانی کوردستان... زیویە دێیەکە لە دێهستانی نەمەشیری سەر بەفەرمانداریی بانە بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە لەم وتارەدا هیچ کام لەم جێگانەمان مەبەست نییە، چونکە ئەم دێیانە، لە مێژوو لە جوغرافیادا هیچ زانیارییێکیان دەربارە تۆمار نەکراوە... ئێمە لەم وتارەدا، لە ئاوایی (زیویە)ی دێهستانی (کوڵ تەپە)ی فەیزوڵڵا بەگی ئەدوێین کە سەر بەفەرمانداریی و شارستانی (سەقز)ە و ناوی کوڵ تەپە لە بنەڕەتا تورکییە... هۆی

ئەوەش کە لێی ئەدوێین ئەوەیە کە ئەم دێیە بەهۆی ئەو شوێنەوارە دێرینەوە کە لێیەوە نزیکە، هەندێ شتی دەربارە تۆمار کراوە... ئەم دێیە ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی سەقزەوە و ٥٠ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، ئەکەوێتە باکوری ئێرانشاهەوە ٣٠ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە. ئەم دێیە لە هەرێمێکی چیایی دایە زۆزان و سەردەسێرە دانیشتوانی کوردن، کاریان کشتوکاڵ و ڕان و ئاژەڵ بەخێوکردنە... قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە، مزگەوتی هەیە، جێگەیەکی ئاوێژە و بەبڕشتە. دەسکەوتی دەغڵ و دانەوێڵە و بەرهەمی ئاژەڵییە، نزیک بەم دێیە کۆڵیاریی کرا، دێرینە و شوێنەواری شارێکی کۆنی تیا دۆزرایەوە و، گەلێ شتومەکی کۆنی تیا بەدەس هێنرا کە نیشانەی پێشکەوتی هونەری و وردەکاری و پیشەیی و خوێندەوارییە، بەپێی قسەی (ئا، گدار A. Gidar) و دێرینەناسانی تری کە لەم زیویەدا کۆڵیارییان بەکارهێنراوە: ئەم جێیە لە بنەڕەتا ناوی (زیبیە Zibye) بووە، کە لەگەڵ ناوی ئێستە یا زۆر لە یەکەوە نزیکن و گۆیا ئەم ناوانە لەو بەردەنووسانەدا نووسراوە، کە سارگۆنی دووەمی ئاشووری کە بەشرۆکێن بەناوبانگە و لە ٧٢٢ - ٧٠٥ پێش زایینی عیسا، ئیمپراتۆری ئاشووری بووە، ئەو سارگۆنە ئەم باسانەی لە ساڵی شەشەمی پادشایی خۆیا یاداشت کردووە و نووسیویە: شاری (ئیزیرتو Izirtu) وێران کرد و سوتاند و، دوو شاری زیبیە و ئارمائیدیشم داگیر کرد... ئەم سارگۆنە... پاش ئەوە لە بەردەنووسێکا دیاردی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم دوو شارەی زیبیە و ئارمائیدیشی سوتاندووە.

ساڵی ١٣٢٥ کە لەم جێگەیەدا کۆڵیاری کرا، گەلێ خشڵ و کەرەسەی زێڕینی تیا دۆزرایەوە، خەڵقی دێیەکانی ئەو ناوە، ئەو خشڵ و شتومەکە زێڕینەیان لەناو خۆیانا دابەش کرد، بەڵام کە بەڕێوەبەرایەتی عەنتیکە خانە و مۆزە و دێرینەگاکان پێیان زانی، چوون و هەندێ لەو شتانەیان لە لادێییەکان وەرگرتەوە. یەکێ لەو شتانەی دۆزرایەوە سینەبەندێ بوو کە هەردوولای بە وێنەی گیانلەبەران و، دەعبای نەناسراو و ئەفسانەیی نەخشێنرابوو، یەکێ تر لەو تفاقانەی دۆزرایەوە، کالانی خەنجەری بوو، لەگەڵ نیزە و پەیکان و چەکی تری شەڕ... هەروا گەردنبەندێکی هەڵقە هەڵقەشی تیابوو کە بەوێنەی کەللەی جانەوەرانی وەکو شێر و، دێو و، دەعبا و، دڕندەی نەناسراوی ئەفسانەیی نەخشێنرابوو... بەگومانی دێرینەناسان ئەم شتانە هەموو، هی سەدەی نۆیەمی پێش زایینن دیوارەکانی کە لەژێر زەوییا دەرهێنراون زۆر سەختن، پێ پلقەکانی بەتاتەبەردی تاشراوی لووس و، خشتی سوورەوەکراوی قاڵب زل دروست کراون... هەندێ لە ساختمانەکان

بەداری (سەرو) پۆشرابوون و، دیوارەکانیان بەکاشیی سوور و ڕەنگاوڕەنگ نەخشێنراوە...
ئەمە وەها و با لە یادمان نەچێ کە زیویە و ئەم شارانەی سارگۆن داگیری کردوون لە شارەکانی دەوڵەتی (مانا) بوون... دەوڵەتی مانا یا (ماندی)، وەکو ئەیزانین یەکێ بوو لە دەستە دەوڵەتەکانی (زاگرۆس)، کە بەر لە ئیمپراتۆریەتی ماد لای باشووری زەریاچەی ئورمییەی لەژێردەستا بوو و، لەگەڵ ئاشوورا لە شەڕا بوون لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا بەرنامەی ئاینده شەوتان باش.

١٣٥٢/٩/٤

وتاری: ٩٣

## ژاوەڕۆ

گوێگرە بەڕێزە خۆشەویستەکان، کامەران بن - خۆشیتان هیوای ئێمەی بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە. ئەمشەو باسی (ژاوەڕۆ)تان بۆ دەکەین. ژاوەڕۆ ناوە بۆ دێهستانێ کە نزیکەی چل دێی پێوە بەستراوە... ئەم دێهستانە لە سەرەتادا بەدێی (ڕەزاو)ەوە بەسترابوو کە ناوەندی بەخش بوو، بەڵام لەم دواییەدا کە سەول ئاوا کە (سەروئاوا)شی پێ ئەڵێن بووە بە ناوەندی بەخش، ئەم دێهستانەی پێوە بەستراوە. سەر زەویی ئەم دێهستانە لە پێنج دۆڵ -واتا پێنج شیو- پێکهاتووە. گەورە دێیەکانی سەر بەئەم دێهستانە ئەمان: ئەوی هەنگ، دەرە هەرسین، پایگەلان، سورەتوو، بیساران، بوریەر، ژان، تەنگی سەر، بالەنگان، دگاگا و هەندێکی ترە...

سەر زەوی ئەم دێهستانە لا لێژە، بەرزترین لقی زنجیرە چیای ئەو ناوە، چیای (چل چەشمەیە) کە لە باشوورەوە درێژە ئەکێشێ و بەلای خۆرئاوای سنەدا ڕائەبووری... گەردەنەی ئارێزە کە دەکەوێتە نێوانی سنندج و مەریوانەوە. نزمترین جێی ئەو ڕیزە چیایەیە، لەو ناوەدا پێن و پلووچی چیای عاشقان هەیە، کە دوو یاڵی لێ جیا ئەبێتەوە:

یاڵی یەکەم: بەرەو خۆرئاوا ئەڕوات و بەلای باکوری ئاوی هەنگدا ڕائەبووری. بەرزترین جێی ئەم یاڵە لووتکەی عاشقانە کە لە ڕووی زریەوە ٢/٧٢٦ مەتر و، بەردە سوورە، کە لە ڕووی زریەوە ٢٦١٣ مەتر و، لووتکەی سیالانە کە بەرزایی لە ڕووی دەریاوە ١٩١٦ مەترە.

یاڵی دووەم: بەرەو باشوور و لا خوار، درێژەی کێشاوە تا ئەگاتە سەر ڕووباری سیروان ئەم ڕیزە چیایە لای خۆرهەڵاتی دێی سەرهو پێی ئەوترێ سەنگەر، لای باشوور و خوارووی ئەم دێیە پێی ئەوترێ کێوی شاهنشین و لای خۆرهەڵاتی دێی میحرابەوە پێی ئەوترێ کێوی زەرینە.

ئەم هەرێمە سەختە لە سەرەتادا بەدەس سورداڕانی کەڵورەوە بووە کە قەڵای پالەنگان و ئەو ناوەیان لەژێردەستا بووە. پاشان کەوتۆتە ژێر فەرمانی سەردارانی ئەردەڵانەوە.

وڵاتەکە ئاوێژە و بەپیت و بڕشتە، دەغڵ و دانەوێڵە، میوە و، سپیایەتی -واتا

بەرهەمی ئاژەڵی- وەک شیــر و مـاست و پەنیــر و، کـەرە و ڕۆن و شـتی تری زۆرە. جگە لەوە توتن و پەمۆ پێ ئەگەیێنێ دارودەوەن و جەنگەڵیش زۆرە، مـازوو، سیچکە، کەتیرە و گوێزیشی هەیە لەگـەڵ میـوە وشکەی ترێ کـاروباری خەڵقی ئەو ناوە زۆرتر کشـتـوکاڵ و مێگەل و ئاژەڵ بەخێوکردنە. تا جەنگەڵەکانیش نەکرابوونە نەتەوەیی، خەڵووزی زۆریان بۆ فرۆش ئامادە دەکرد. لەم دێهسـتـانەدا هەر لە کۆنەوە خوێندەواری هەبووە، مەلای چاک و هەسـتـیاری باشی تیا هەڵکەوتووە یەکێ لەوانە(مەلا مسـتـەفای بێسارانی)یە کە حاجی قادری کۆیی دەربارەی ئەڵێ:

خۆ مەلا مصطەفای بێساران بێ نەظیرە نەظمی لە کوردستان

ئاووهەوای ئەم دێهستانە، لە زستانا زۆر ساردە و، لە هاوینا ناوەنجییە، وڵاتەکە ئاویژە و، پۆلەکـانی و ڕووبارە. زۆر لە ڕووبارەکـانی ئەوێ لە دێهسـتـانی کەلاتەڕرانەوە دێن و، لای باکوری خۆرئاوایی دێهستانەکەوە بەرەو (ڕەزاو) ئەڕۆن...

لەم دێیـانەدا لە کۆنەوە مزگەوت و قـوتابخانە هەبووە. ئێسـتـەش قـوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، لە زۆربەی دێیەکانا هەیە.

شـێـوەی زمـانی ئەم نـاوە: گـۆرانیی کـۆنە، بەداخـەوە هەندێ لە نووسـەران مـێـژووە فـارسـییەکـان بەهەڵە وایان داوەتە قەڵەم کـە دانیشـتـوانی ئەم ناوە لە عـێلی گـۆرانن. بێ ئەوەی بتوانن فەرق بکەن لە نێوانی شێوەی زمانی گۆرانی و خودی عێلی گۆرانا. ئەوەی ڕاستی بێ شێوەی گۆرانی کە لقێکە لە زمانی کوردی. تەنـیا تایبەتیی هەرێمی هەورامان نییە، کە خەڵقی لایان وایە گۆرانی و هەورامی دوو ناون بۆ یەک شێوە زمان...نە نە بەڵکو هەورامیش بەگۆرانی قسە دەکەن وەک زەنگەنە، سیامەنسوور، شێخان، کاکەیی، عێلی، گۆران و شێوەی گۆرانی کە لقێکە لە زمانی کوردی، زۆر عێلی تری کوردیش قسەی پێ دەکەن... بەڵام هەندێ لەو عـێـلانە بەگـۆرانیـیـەکی کـۆنی قـووڵ قـسـە دەکەن. وەک خـەڵقی هەورامـان و زەنگەنە و، سـیـامـەنـسـووری و، شێـخـان و کـاکـەییـیـەکـان و، هەندێ لەگـەڵ کرمانجیی خوارووداتێکەڵیـان کردووە. وەک گەلاڵی و هەندێ لەگەڵ (لوڕ)ییا تێکەڵیـان کردووە وەک لەک، ڕەند، شوانی کیشک،ساڵەیی، شێخ بزێنی و هەندێ لەگەڵ کرمانجیی ژووروا تێکەڵیـان کـردووە وەک (برادۆسـتی)یەکـان و، هەندی تریش لەگـەڵ فـارسـیـیـا تێکەڵیان کردووە... و ئەم جۆرەیان زۆر چەشنن.

گـوێگرە بەڕێزەکـان ببـورن کـە ئێـمـە لە باسـی ژاوەڕۆدا دووورودرێژ دەربارەی هەریەکـە بە دێیەکانی کە دەربارەیان تۆمار کرابێ، ئێستە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان خۆش.

## وتاری: ٩٤

گوێگره بەڕێزەکان شەوتان باش.

خۆشی و کامەرانیتان ئاواتی گەرموگوڕی ئێمەیە... ئێمە ئەمشەو لە باسی (ساوجبلاغ) ئەدوێین و لە بەشی خۆرئاوای ئێراندا بەم ناوە چەند جێگەیەک هەیە. جارێ با لە سەرەتادا ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ناوی ساوجبلاغ کەی پەیدا بووە و، چ گۆڕانێکی بەسەرا هاتووە؟ ئەم وشەیە تورکییە دەبێ لە سەردەمی سەلجووقییەکانا پەیدا بووبێ، چونکە (حەمدوللا موستەوفی قەزوینی) باسی ئەوەی کردووە کە بەشی شاوجبلاغی کەرەج، لەو حەلەدا هەبووە ناوەکانی تری تازە پەیدان و، ناوەکە دوو کەرتە: (ساوج) و (بلاغ) ساوج لە بنەڕەتا (سەووق) بووە کە ئەکات (سارد) و لە فارسییا وەرگەڕاوە بە (ساوج) و (بلاغ)یشی لە بنەڕەتا (بلاق) بووە کە ئەکات (کانی، سەرچاوە) پاشان وەرگەڕاوە بە (بلاغ)، ئەم ناوە لە کوردییا داتاشراوە و، کراوە بە (سابلاخ).

**موزیک**

**لەمەوبەر سێ جێ بەم ناوە هەبوو بەڵام پاش ئەوەی ناوی (سابلاخ) گۆڕا بە (مەهاباد) مایەوە دوو جێ بەم ناوە:**

یەکەمیان: (ساوجبلاغ)ی کەرەجە، کە چیاکانی ئەلقادر و فەشەند ئەکەونە لای باکورییەوە و، لە تالەنان دائیەبڕن...

لای خۆر هەڵاتیشی (ئەرەنگە) و (غار) و لای خواروو باشووری (شەهریار) و لای خێر ئاوای (قەزوین)ە، ئەم سەر زەوییە بەپیت و بە برشتە و کاری خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و مێگەلداری و ئاژەڵ پەروەردە کردنە. ئاوێ کە بەشی لاژووړووی ئەم سەرزەوییە ئاو ئەدات (ڕووباری کوردان)ە کە جادەی تاران - قەزوین ئەبڕێ و بەرەو لای سیەنگی ئیمام ئەکشێ و، لە لای خۆر هەڵاتی گوندەکەوە ئەڕژێتە (خر رود)ی (قەزوین) هەروا ڕووباری (ئەلقادر)یش یەکێ تر لە ڕووبارەکانێتی.

ناوەندی بەخشی (ساوجبلاغ)ی کەرەج دێی هەشت گردە کە ٣١ کیلۆمەتر دوورە لە شاری کەرەجەوە و، ئەکەوێتە سەرەڕێی قەزوین - کەرەج.

زووانی خەڵقی ئەم هەرێمە کوردیەکی تێکەڵ و پێکەڵە کە پێی ئەوترێ (تاتی) ئەم

بەخشە دوو دێهستانی هەیە خود ساوجبلاغ و بەرغان و لە گەورە دێیەکانی ئەم ناوە (سونقور ئاوا و نەجم ئاوا) زۆر پڕ لە خەڵق و، ڕێکوپێکن...

ئەم سەر زەوییە بەپێی ژمارەی لەمەوبەر ١٥٦ دێی هەبووە و، سەرژمێری گشتیشی (.........) کەس بووە.

موزیک

دووەم: دێی (ساوجبلاغ)ە کە ئەکەوێتە دێهستانی (مشکین)ی خۆرئاواییەوە، کە سەر بەبەخشی ناوخۆی شارستانی (خیاوە) کە ئەمڕۆ ناونراوە مشکین شار - و سەر بەئوستانی ئازەربایجانی خۆرهەڵاتییە. ئەمیش وەکو ئەوی تری دیسانەوە جێگەیەکی بژوێن و بەبەرهەمە...

موزیک

بەڵام ئێمە لەم وتارەدا مەبەستمان ئەم دوو جێگەیە نەبوو، مەبەستمان (ساوجبلاغی موکریان) کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ (مهاباد) و سەر زەوییەکەی بە ١٣,٠٠٠ کلیۆمەتری چوارگۆشە دانراوە لای باکووری زریەی ڕەزائیە و، لای باکووری خۆرئاوایی بەشەکانی سەلدوز و شنۆ و، لای خۆرئاوای ڕیزە چیای قەندیل و لای باشوور و خوارووی چیاکانی نێوانی بانە و شلێر و، لای باکووری خۆرهەڵاتی ڕووباری (تاتائو)وە کە پێی دەوترێ (سیمینە ڕود). ڕووباری ساوجبلاغ ئەڕژێتە تاتاهو کە یەکێکە لەو ڕووبارانەی ئەڕژێتە زریەی ڕەزائیەوە. سابلاغ لە ڕووی دانیشتوانی هەرێمەکەوە بەپێنج بەش دابەشکراوە:

بەشی موکری کە جێی موکرییەکان و، دی بوکرییەکانە، ئەم بەشە بریتییە لە شاری سابلاغ و دەوروبەری سابلاغ و شاروێران، ئاختاچی و، بیبی و، تورجان و، گەورک...

بەشی بلباس کە بریتییە لە ئیل تیمور و، ئەعلەین و، مەنگور و، لاهیجانی کۆن و، لاهیجانی نوێ و لە ڕووی ئیداریشەوە: بەخشی سەردەشت و فەرمانداریی سەقز و فەرمانداریی بانەش سەر بە ساوجبلاغن، کە ئێمە ئەم شتانە ئەهێڵینەوە لە باسی ناوی مەهابادا لێی ئەدوێین...

جێی ساوجبلاغی ئێستە لە ڕووی مێژووەوە زۆر کۆنە، بەپێی بەردەنووسێ کە بەچیزی بزماری هەڵکەندراوە و بەزیانی وانی وەیا خەلەدیی و ئورارتویی نووسراوە، هەندێ لە زانایانی لێکۆڵەرەوە ئەو بەردەنووسەیان بەهی (مینوئا) داناوە کە لە ساڵانی ٨١٢ ی بەر لە زایینەوە تا ساڵاتی ٧٧٨ بەر لە زایینی پادشای ئورارتو بووە، جگە لەمە ڕاولینس وای

ڕاگەیاندووە کە کۆنە جۆگاکان و کۆنە قومشی ژێر زەوی و، ئەو پێ پلقە بەردینانەی کە دۆزراونەوە، وامان نیشان ئەدەن کە ئەم دەوڵەتی ئورارتوییەی وان دەسەڵاتی بەسەر ئەم ناوەدا هەبووە و، گەرچی زۆرتری شەڕ و هەرای نێوانی ماد و سەکاکان ئا لەم هەرێمەدا ڕووی داوە، بەڵام بەداخەوە مێژوونووسان کەمتر لەو باسە دواون. لای سابلاخ، کۆنە شارێ هەیە: پێی ئەوترێ وێران شار یا (شەهر وێران) - گومان وایە شوێنەواری یەکێ لە شارەکانی ماد بێ کە بەتلەمیوس لە جوغرافیاکەیا ناوی ناوە (داراوشا) و دەبێ ناوی (دەرەناس) کە لەمەوبەر لێی دوابووین لەم دارارشاوە مابێتەوە. لەلای ئەندەرقاشی دە کیلۆمەتریی مهابادی ئەمڕۆش گۆڕێکی لە بەرد تاشراو دۆزراوەتەوە کە هیرۆفیلد بەهی سەردەمی مادی داناوە. بەڵام ڕاولینسون هی سەردەمی هەخامەنشی داوەتە قەڵەم. ژاک دومورگانیش دیاردی بۆ زۆر شوێنەواری کۆن کردووە، کە لەو ناوەدا کەوتوونەتە ژێر تەپۆلکەی لم و قوم وەیا لە ئەنجامی شەڕەوە یا لە ئەنجامی بوون بەزەوی و وێران بوون، خۆرهەڵاتناسی مەزن ژاک دومورگان بەهی پاش دەورانی بەردە و چی دەورانی ئاسنی داناوە و، لەبیریشمان نەچێ کە هراکلیوسی پادشای ڕۆمی بێزەنتی ساڵی ٦٢٤ی زایینی کە خوسرەو پەروێزی ساسانی لە شەڕا شکاند و دوای کەم بەم هەرێمەدا ڕابوورد. بابێینەوە سەر ئەوەی کە ناوی (سابلاخ) کەی پەیدا بووە؟ بەهمەنی کەریمی لە کتێبی جوغرافی غەربی ئێراندا وای داوەتە قەڵەم کە ئەم شارۆلکەی (ساوجبلاغ)ەی کە ئێستە ناوی مەهابادە، سەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر لە لایەن عێلی دیبوکرییەوە بناغە دانراوە، کە ئەمە هەواڵێکی سەیر و پێچەوانەی ڕاستییە، چونکە دیبوکری کوردن، ناوی شارەکەیان نانێن ساوجبلاخ کە لە دواییا ببێ بەسابلاخ... بەبیری من دەبێ ئەم شارە لە سەردەمی دوایی قزڵباشەکانی سپای سەفەویا، واتا پاش نووسرانی (عالەم ئارای عەبباسی) دێیەک بووبێ و لە لایەن سپای قزڵباشەوە کرابێ بەبنکە و ناوەکەی گۆڕرابێ بەساوجبلاغ... و پاشان بووبێتە سابلاغ و هەروا مابێتەوە تا دەورانی پەهلەوی، ڕەزا شای گەورە کە سەرنجی داوە ئەم ناوە شایانی شارێکی کورد نییە و بیری لەوە کردووەتەوە کە لەو هەرێمەدا پێغەمبەرێکی مەهاباد ناو هەبووە، کە ناوی شارەکەی گۆڕیوە، بەناوی پیرۆزی ئەو پێغەمبەرە و، ناوی ناوە مەهاباد.

**وتاری: ٩٥**

گوێگره خۆشه‌ویسته‌کانی به‌رنامه‌ی ولاته‌که‌ت باشتر بناسه کامه‌رانیتان هیوای به‌ڕێوه‌به‌رانی ڕادیۆ کوردییه‌کانی ئێرانه. خۆمان به به‌ختیار ئه‌زانین که بتوانین به‌هۆی نووسین و ڕاگه‌یاندنی ئه‌م جۆره وتارانه‌وه، دڵی ئێوه به‌ده‌ست بهێنین. ڕاسته ئێمه له‌به‌رئه‌وه‌ی سه‌رچاوه‌مان که‌م له‌به‌رده‌ستایه ناتوانین ده‌رباره‌ی هه‌موو دێیه‌ک و هه‌موو ناوایییه‌ک و هه‌موو کێوێکی ولاته‌که ته‌واو به‌تانی زانیاریبا بچین به‌لام ئه‌وه‌نده‌ی گونجانیشی هه‌بێ، له وزه‌مانایه وه‌لامی پرسیاری گوێگره به‌ڕێزه‌کان بده‌ینه‌وه.

له‌م ڕۆژانه‌دا له لایه‌ن کوردێکی ده‌وروبه‌ری سنه‌وه نامه‌یه‌کمان پێ گه‌یی پرسیاری لێ کردین که ناوی (ساراڵ) کوردییه؟ یا تورکییه؟ و هه‌ندێ وایان داوه‌ته قه‌ڵه‌م که ناوی ئه‌م هه‌رێمه تورکییه و له بنه‌ڕه‌تا (صاراڵ) بووه که ئه‌کات ڕه‌نگ زه‌رد و، که له سه‌رده‌می مه‌غۆلدا کابرایه‌ک به‌م ناوه فه‌رمانڕه‌وای ئه‌و ده‌وروبه‌ره بووه و ناوی ئه‌و به‌سه‌ر هه‌رێمه‌که براوه. هه‌روه‌کو زۆر ناوی تری تورکی به‌سه‌ر هه‌رێمه کوردنشینه‌کانا براوه، جا ئێوه بیروباوه‌ڕتان له‌م باره‌وه چییه؟ بۆمان ڕوون بکه‌نه‌وه؟

موزیک

ئێمه له وه‌رامی نووسراوه‌که‌ی ئه‌و براده‌ره‌دا که ئه‌م نامه‌یه‌ی نووسیوه و، نایه‌وێ ناوی بهێنین ئه‌ڵێین: ناوی (ساراڵ) وشه‌یه‌کی کوردیی په‌تییه و له بنه‌ڕه‌تا تێ هه‌ڵکێشه له دوو وشه‌ی (سارد) و (ئاڵ) واتا جێگه‌یه‌کی نیمچه‌سارد و ئه‌م وشه‌یه له‌گه‌ڵ وشه‌ی (سه‌رده‌سێر)دا بۆ یه‌ک مه‌به‌ست به‌کار نابرێ و، ئه‌م جۆره هه‌سته‌یه و ئێسکه له کوردییا هاوته‌قا و، وێنه‌ی زۆره وه‌ک (مراڵ) که به‌جۆره ئاسکێ ده‌وترێ له سپێتییا له مه‌ڕ ئه‌چێ... و له دوو وشه‌ی (مه‌ڕ) و (ئاڵ)ه‌وه هاتووه و پاشکۆی (ئاڵ) لێره‌دا بۆ پێ چوواندنه واتا (مه‌ڕ ڕه‌نگ) هه‌روا (که‌ژاڵ) که به‌دوو وشه‌ی (که‌ژ) و (ئاڵ)ه‌وه په‌یدابووه که به‌جۆره مه‌ڕێکی چاو سووری سپی واژ ئه‌وترێ واتا (که‌ژ) ڕه‌نگ... و جارجاره وشه‌ی (که‌ژاڵ) بۆ جۆره چاوێکی شین کاڵی سپی واژیش به‌کاردێت ئه‌وترێ (چاو که‌ژاڵ)... جگه له‌مانه وشه‌ی (عه‌وداڵ)یشمان هه‌یه که له بنه‌ڕه‌تا له دوو وشه‌ی (عه‌بد) و (ئاڵ) پێکهاتووه و به‌و که‌سه ده‌وترێ که به‌دوای یاره‌که‌یا، یاخۆ شێخه‌که یا وه‌ک (عه‌بد)ی سه‌رگه‌ردان و وێڵ بێ.

بەلاّم با ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە ئەم وشەیە لە (ئەبدال)ی عەرەبییەوە نەهاتووە کە زاراوەیەکی دەرویشانەیە و یەکێکە لە سێ پلەی (ئەقطاب - ئەوتاد - ئەبدال) کە لە زانیاریی عیرفانی و دەرویشیدا باوە، بەڵکو لە بنەڕەتا لە وشەی (هاودال)ەوە هاتووە کە تێ هەڵکێشە لە دوو کەرتی (هاو) و (داڵ) واتا هەروەکو ئەو داڵەی بەدوای نێچیر و شکاردا وێڵ و سەرگەردان ئەسووڕێ ئەمیش بەدوای (یار)ەکەیا شەیدا و سەرگەردانە، جا بەمەدا بۆمان دەرکەوت کە وشەی (ساراڵ) ناوێکی کوردیی پەتییە واتا جێگەیەکی نیمچە سارد نەوەک زۆر سارد کە دەبێ سەردەسێری بۆ بەکار ببرێ.

موزیک

با ئێستە بگەڕێینەوە سەر ساراڵ کە لە کوێیە؟

ساراڵ ناوی دێهستانێکە سەر بەبەخشی دیواندەرە کە ئەمڕۆ ناونراوە بەخشی میرانشاە و ئەکەوێتە لای باشوور و خوارووی بەخشەکەوە، سینوری بەم جۆرەیە: لای باکوری دێهستانی ئویاتو وە، لای باشوور و خواری دێهستانی کەلاّتە ڕانە، لای خۆرهەلاّتی دێهستانی حوسێن ئاوایە، لای خوار ئاوای دێهستانی خور خورەیە... ئەم دێهستانە جێگەیەکی چیاییە و لە هەموو لاوە چیا و کێوی بەرز گەمارۆی داوە، لە یەکێ لەم چیایانەوە کە ناوی (چیای مەسجید میرزا)یە - سەرچاوەی ڕووباری (قزل وزان) شۆڕ ئەبێتەوە، کە ناوەکەی تورکییە و، ناو کوردییەکەی سەری تیاچووە، ئاووهەوای ئەم دێهستانە ساردە، ماوەی زستانی دوورودرێژە هاوینی فێنکە بەرزترین لووتکەی چیاکانی کە لووتکەی مەسجید میرزا ئەگاتە ٣,٠٥٠ مەتر و، بەرزایی ئەو لووتکەیەش دەکەوێتە ناوەندی گەزمل و مادیانەوە ٢,٨٥٥ مەترە لەم چیایانەوە زۆر چەماو دێتە خوارەوە و هەمووی تێکەڵ دەبێ و ڕووباری گەورەی قزل وەزانی لێ پێک دێ، کە ولاّتی گێلان وەرئەگێرێ بەبەهەشت و، پاشان ئەڕژێتە زریەی (خەزەر)ەوە... ئەم دێهستانی سارا لە ٣٩ دێی گەورە و بچووکی تیایە. سەرژمێری خەڵقی دێهستانەکە تێکڕا ئەگاتە ٥,٠٠٠ کەس و ناوچەی دێهستانەکە ئاوایی (گاوئاهەن تو)وە کە داتاشراوە و سووک کراوەتەوە بووەتە (گەوەنتو). خەڵقی ئەم ناوە خاوەنی کشتوکاڵ و ئاژەڵ و باغ و جەنگەڵن.

دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و سپیایەتی - واتا بەرهەمی ئاژەڵییە کە ئەکات شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن.

جگە لەمانە پەمۆ توتن میوەی کێوی میوەی خۆماڵییان هەیە، لەم دێیانەدا مزگەوت و

قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، زوانی خەڵقی ئەم ناوە کوردیی کرمانجی تێکەڵ بەگۆرانییە کە ئەمڕۆکە پێی ئەوترێ شێوەی سنەییانە، ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی (ساراڵ) تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین. شەوتان باش.

**وتاری: ٩٦**

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش. هیوامان کامەرانی و شادیتانە ئێمە ئەمشەو باسی (سامن) ئەکەین...

ڕەنگە ئەم ناوە بۆ هەندێکتان نەناسراو و بەڵکو نەبیستراویش بێ بەڵام هیوای ئێمە ئەوەیە بەم خزمەتەی! ئێمە گرتوومانەتە سەر شان شارەزای ببن و بەم جۆرە لە سوودی خزمەتەکەمان بەهرەمەند ببین.

موزیک

سامن ناوە بۆ گەورە دێیەک و، بۆدێهستانی و، بۆ بەخشێ وەکو لەم وتارەدا ڕوونی دەکەینەوە... گەورە دێی سامن یەکێکە لە گوندەکانی دێهستانی سامن کە لەمەوبەر یەکێ بووە لە پێنج دێهستانەکەی سەر بەمەلایر، ساڵی ١٣٣٨ی فارسی ئەم دێهستانە کرا بەبەخش و گەورە دێی سامن کرا بەناوەندی ئەم بەخشە و، فەرمانداریی مەلایریش کە لەمەوبەر شارستان و سەر بەفەرمانداریی گشتیی هەمەدان بووە و ئەمڕۆکەش هەر سەر بەئوستانی هەمەدانە...

بابێینە سەر سنووری سامن کە بەم جۆرەیە: لای باکوری چیایەکە ناوی (یەزد گورد)ە کە ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی دێهستانەکەوە و، بەناوی ئەم چیایەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە یەزدی گوردی پادشای ساسانی کاتێ کە لەتاو شاڵاوی سپای عەرەبی ئیسلام پایتەختی شاهەنشاهیی ئێران تیسفونی بەجێ هێشت، ڕووی کردە نەهاوەند، ماوەیەک لە مەلایردا خۆی ڕاگیر کردووە و، لەو قەڵایەدا کە ئەمڕۆ ڕووخانە و بەناوی قەڵای یەزدی گورد بەناوبانگە تا سەردەمی بەرەنگاری سپای عەرەبی کردووە و پاشان بەجێی هێشتووە.

لای باشوور و لا خواری سامن چیایەکە ناوی (سپی کێو)ە کە دەکەوێتە لای خۆر ئاوایەوە ئەم بەخشی (سامن)ە کە کەوتوەتە نێوانی ئەو چیایەوە، وا لە باشووری خۆرئاوایی شارستانی مەلایردا و ١٧ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و سنوورەکانی بەخشەکەش بەم جۆرەیە:

لای باشوور و خوارووی سنووری شارستانەکانی وەروگرد و نەهاوەند.

ئاوی ئەم دێهستانە کارێزە و لە سەراسەری دێهستانەکەدا نزیکەی ١٧ کارێز هەیە جگە لەمانە ڕووبارێکیشی تیایە ناوی (ڕووباری خدر)ە هەوای هەرێمەکە لە زستانا سارد و لە

هاوینا فێنکه لەمەوبەر ژمارەی دێیەکانی بەخشەکە تێکڕا ٤٦ دێ بووە و، ژمارەی کەسانی بەخشەکەش ٣٠ هەزار کەس بووە، کە لەم ژمارەیە ٤.٥١٦ کەسیان لە شارۆلکەی سامن دانەنیشتن، کار و ئیشی خەڵقی ئەم بەخشە ئاژەڵداری و، میگەل بەخێوکردن و، کشتوکاڵ و باغ پێ گەیاندنە. جگە لە دەغڵ و دانەوێڵە، پەمۆ و چەوەندەری شەکر و توتن پێ دەگەیێنن و میوەشیان هەیە؛ تەنانەت ترێ و کشمیش، پیشەی جۆڵایی لە دێیەکانی ئەو ناوەدا تەنانەت لە دێیەکانی عەلەمدار و پیر سواران و سیاکەمەر و ڕاغە و ئاموج و سامندا زۆر باوە، لەوێ خامی جاو، گڵێم، بەڕە، جاجم و، شتی وەها دروست ئەکرێ و مافوور و جاڵی و سوجادەش ئەتەنرێ و، گۆرەوی و پۆزەوانە و شتی تریش ئەچنرێ... لەم دێهستانەدا دێیەک هەیە ناوی (عەلەمدار)ە مافوور و حالیی ئەم دێیە زۆر بەناوبانگە. بەمەدا بۆمان دەرکەوت کە جۆڵایی و تەون و کرد ئەزانن.

شوێنەوارەکانی ئەم ناوە زۆر کۆن نین، یەکێ لەوانە بارەگای هوشەیە لە سیاکەمەر و یەکێ تریان قەڵای ئانوجە لە دێی ئانوج. و یەکێ تریان قەڵای یەزدگوردە کە لەسەر چیای یەزد گوردە ئەمەیان ئەگەر هی ئەو سەردەمەبێ کە یەزدگورد تیسفۆنی بەجێ هێشتووە و خۆی گەیاندووەتە نەهاوەند، ئەگەڕێتەوە بۆ ١/٤٠٠ ساڵێک... دێ بەناوبانگەکانی ئەم بەخشە ئەمانەن: ئانوج - ئەمروکەلو - توچقاز - خوڕەم ئاوا - کەهکەدان - عەلەمدار...

لە شارۆلکەی سامن و بەخشەکەدا چەند قوتابخانەی بەرایی، چەند قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، چەند مزگەوت و حوسێنییە و، دەفتەری ژنخوازی و تۆماری قەواڵەی زەویوزار و خانووبەرەشی تێدایە هەروا بەڕێوەبەرایەتیی بەخشداری و سازمانەکانی دەوڵەتیش هەیە.

خەڵقی ئەم ناوە لەسەر لوڕستانی پێشکو دەژمێررێن، زمانی بنەڕەتییان لوڕییە.

ئێمە ئەگەر چی لە سەرەتادا لەوە نەدواین کە ناوی بنەڕەتی سامن چییە؟ و لە کوێوە هاتووە؟ بەڵام وەنەبێ لەبیرمان چووبێ ئا ئێستە لێی ئەدوێین:

لە سەدەی حەوتەمی کۆچییا لە دێهاتەکانی دەوروبەری دەربەند و گەلیی لوڕستان عێلێ هەبوو بەناوی سامی... وا دیارە ئەم عێلە گواستێتیانەوە بۆ ئەم هەرێمە و بەناوی سامیان ناسراین. پاشان وشەی سامیان لەسەر زمان سووک بووبێ و گەڕا بێ بەسامن جگە لەمە هۆیەکی ترمان بۆ ڕیشە و بنەڕەتی ئەم ناوە بۆ نەدۆزرایەوە... و ئا ئێستە کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/١٠/٤

**وتاری: ٩٧**

گـوێگره بەڕێزەکـانی بەرنامـەی وڵاتەکـەت باشـتـر بناسـە هەمـوو کـاتێکـتـان بەشـادی و کامەرانی ڕابوێرن، ئەمشەو باسی جێگەیەکتان بۆ دەکەین کە زۆر چیرۆک و ئەفسانەی بۆ هەڵبەستراوە ئەم جێگەیە ساوەیە کە لە مێژووی سەرەتای ئیسلاما بەیەکێک لە شارەکانی هەرێمی چیا -یا عـیراقی عـەجەمی- دراوەتە قەڵەم. ئەم شـارە لە زۆر کـۆنەوە هەبووە... گۆیا ئەو ناوە زەریاچە بووە کەیخوسرو لەوێوە ڕابردووە لەسەر ئاوەکە لەشکربەزی کردووە و، حـەسـاوەتەوە و، بەفـەرمـانڕەوای ئەو ناوەی وتووە (ئاو)بی (سـایە) نابێ پاش ئەوە ڕەبیب کوڕی گودەرز شاری ساوەی دامەزراندووە بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە دەبێ ناوەکە لە بنەڕەتا لە دوو وشـەی (سـایە) و (ئاو) پێک هاتبێ و سـەرئەنجـام - داتاشـرا بێ و، سووک بووبێتەوە و، بووبێ بە (ساوە) دووریش نییە لە بنەڕەتا لە دوو وشەی (ساوە) و (ئاو) هاتبێ واتا (سـەراسـەر ئاو) و، سەرئەنجام بووبێ بە (ساوە) و، یاخۆ وشـەکـە لە (سیاە ئاو)ەوە هاتبێ.

شتێکی تری کە دەربارەی ساوە وتراوە ئەوەیە:

کە بەپیرۆزیی لە دایکبوونی محەمەد کوڕی عەبدوڵلاوە، کە پاش لە دایکبوونی بەچل ساڵ بوو بەپێـغـەمـبـەر (درودی خوای لەسـەر بێ) شـەوی لە دایکـبـوونی، ئەم زەریاچەی ساوەیەیە وشک بووە و، حەڵقی ئەو ناوە بێ ئەوەی ئەو ڕووداوە بزانن شڵەژاو و، شێواون و بوەیصیری Buweyssiri هەڵبەسـتەری (قەسیدەی بوردییە) لە یەکێ لە هەڵبەستەکانی ئەو قەسیدەیەدا دیاردی بۆ ئەم باشە ئەکا و ئەڵێ:

[وَساءَ ساوَةَ أنْ غاضَتْ بُحَيْرَتُها          وَرُدَّ وارِدُها بِالْغَيْظِ حينَ ظَمِي]

بەڵام ئایا مەبەستی مێژوونووسان لە وشکبوونەوەی زەریاچەی ساوە زەریاچەیەک بووە کـە لەم هەرێمـەدا بووە؟ کـە وشـکبـوونەوەکـەی بەڕووداوێکی (لە وزە بەدەر) -واتا «مُعْجِزَة»- دراوەتە قەڵەم، وەک تەرەکبردنی (حەیوانی کەسرا)ی پایتەختی شاهەنشاهیی ساسانی... ئەوەی ڕاستی بێ ئەم یاداشتەی مێژوونووسان بۆ ئێمە جێی گومانە! چونکە نابێ مەبەست زەریاچەیێ بووبێ کە لەم ساوەیەدا بووبێ کە لەم ساوەیەدا بووبێ، چون ئەم هەرێمـە بۆ گـەلی عـەرەبی ئەو سـەردەمـە نەناسـراو و، بێ ناوبانـگ بووە... دەبێ ئەو زەریاچەی ساوەیە کە شەوی لە دایکبوونی حەزرەتی محەمەد (درودی خوای لەسەر بێ)

وشک بوویێتەوە، لە جێیەک بووبێ نزیک بەولاتی عەرەب و، لەلای عەرەب ئەوەندەی (هەیوانی کەسرا) ناسراو و بەناوبانگ بووبێ... کە لەگەڵ (هەیوانی کەسرا)دا، لە ناوبانگا بەیەک پایە ناوبراوە.

بابێینە سەر ئەوەی ئایا لەم هەرێمی ساوەیەدا زەریاچەیێ بووە یا نە؟ گۆیا لەسەر رووبارێ کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ(قەرەچای) لە دەورانی کەیانییەکانا بناوانەیێ هەبووە و، پاشان ئەم بناوانەیە ڕووخاوە و، شارەکەی وێران کردووە و، تا ئێستە شوێنەواری کۆن لەو ناوەدا هەیە. گۆیا یەکێ لە پادشایان کە لەو ناوەدا ڕاووشکاری کردووە و، چاوی بەکەلاوە وێرانەی شارێ کەوتووە، پرسیویە: ئەم کەلاوەیانە چییە؟ وتوویانە (خودبود) -واتا هەر بووە- بەڵام پادشاکە وتەکەی وا بەرگوێ کەوتووە کە ناوی دێیەکە (بود)ە، جا بەو هۆیە ناوی (بود) نراوە بەسەر دێیەکا کە تا ئێستە هەر ماوە.

گوێگرە بەرێزەکان ئا ئەم نیکە شیرینەی گوێتان لێ بوو ئەوەمان دەخاتەوە بیر، کە زۆر لە خۆرهەلاتناسان کە بەولاتی ئێمەدا گەڕاون، ناوی هەندێ دێ و چەم و ئاواییان لە کاروانچییەکانیان پرسیوە، کە ئەوان لە وەراما وتوویانە (نازانم) خۆرهەلاتناسەکان (نازانم) یان بەناوی جێگە یاداشت کردووە.

موزیک

ئا ئێستە بابێینەوە سەر باسی (ساوە) کە دەکەوێتە کوێوە؟

ئێمە بەم ناوە چەند جێیەک ئەناسین کە گرنگترینیان ساوەی سەر بەئوستانی ناوەندییە، واتا سەر بەتارانی پایتەختی ئێرانە، لای باکوری ساوە بەخشەکانی (بوئین ڕەهرا و ئاوەج)ی سەر بەفەرمانداریی قەزوین، لای خۆرهەلاتیش بەخشی غاری سەر بەفەرمانداری (رەی)ە و، لای باشوور و خواریشی شارستانی قوم و، بەخشی حەلەجستانی سەر بەشارستانی تەفرەش و، لای خۆرئاواشی بەخشی ڕەزەنی سەر بەهەمەدانە. ساوە ٨٧ کیلۆمەترە لە قومەوە و، لە تارانەوە ١٣٧ کیلۆمەترە و، لە ڕووی زەریەشەوە ٩٦٠ مەتر بەرزە، ساوە جێگەیەکی بژوێن و بەبرشتە دەغڵ و دانەوێڵەی چاک دێتە بەرهەم، باغ و دارستانیشی زۆرە بەناوی (ساوە) زۆر باش و لە هەموو میوەیەکی بەناوبانگترە. هەروا کاڵەک و گوندورەی چاکیشی هەیە.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، بۆ دوایی باسی ساوە چاوەڕوانی وتاری ئایندە بن. شەوتان خۆش.

١٣٥٢/١٠/١٢

**وتاری: ٩٨**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، کامەرانی و شادیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامەی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە...

لە حەوتەی ڕابردووا لە باسی شارۆلکەی ساوە دواین، کە ناوی لە چیەوە هاتووە! هەروا لەو ئەفسانەیانە و، هەواڵە مێژووییانەش دواین کە لە لایەن مێژوونووسانەوە، بێ بیرکردنەوە لە چۆن دەس هەڵبەستران و، داکەوتنیان تۆمار کراون. لەم حەوتەیەشدا هەر لەسەر باسی ساوە دەڕۆین و، تکامان وایە هەر ناتەواوی و ناگزوریێکتان بەرگوێ دەکەوێ و، لەو بارەوە شارەزاییتان هەیە، ڕێ بەدێیمان بکەن و، ئاگادارمان بکەنەوە... هەر لە سەرەتاوە سپاستان دەکەین.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! خۆرهەڵاتناسی مەزن لیسترنگ Lestrngs لە کتێبی (وڵاتانی خەلافەتی خۆرهەڵات)یا کە بەئینگلیزی نووسیویە و بۆ زمانەکانی فارسی و عەرەبی وەرگێڕراوە و، بەفارسی ناوی نراوە (سەر زەمینهای خیلافەت شەرقی) و بەعەرەبی ناونراوە (بولدان الخلافە الشەرقییە)، لەم کتێبەدا کە باسی ساوە دەکات ئەو زانیارییانەی هەموو گەڵاڵە کردووە کە لە کتێبە جوغرافیاییەکانی سەردەمی ئیسلاما نووسراوە، وەک کتێبەکانی (مروج الذهەبی مەسعودی، فتوح البولدانی بەلاذوری، موعجیم البولدانی یاقوتی حەمەوی، تەئریخی گوزیدەی موستەوفی قەزوینی و، نوزهەت القلوبی ئەو و، ئەلبولدانی یەعقوبی و، ئەلمەسالیک و ئەلمەمالیکی ئیبن خوردازبیە، ئەحسەن التەقاسیمی مەقدیسی - ئەلمەسالیک والمەمالیک ئیبن حەوقەل- صوەر الئەقالیم ئیستەخری و دەیان کتێبی تری)... بەپێی ئەم زانیارییە، تارانی ئەمڕۆکە پایتەختی شاهەنشاهیی ئێرانە، لە سەدەکانی ناوەنجییا دێیەک بووە بێ ناونیشان... لەباتی ئەو شاری (ڕەی) بەناوبانگ بووە. جا (لیسترنگ) نووسیویە: شاری ساوە ئەکەوێتە ناوەندی ئەو ڕێیەی کە لە هەمەدانەوە بەرەو ڕەی دەڕوات و، بەکەناری شارێی خوراسانەوەیە. جا مەبەستی لیسترنج لە ناوی خوراسان یا خریسانی نزیکی بەعقوبەیە، بەرلەوەی بگاتە بەغدا، چونکە شەقامەڕێی ڕەی - هەمەدان - کرمانشاە - حەلەوان - بەسەر خریساندا ئەچوو بۆ بەغدا... و یاخود مەبەستی ئەو شەقامەڕێیەیە کە لە بەغداوە بەسەر هەمەدان و

ڕەی و ئەسفەهاندا بەرەو خوراسانی ئەمڕۆ ئەچوو کە مەشهەدی پیرۆزی تیایە... هەرچۆن بێ بەپێی وتەی ئەو جوغرافیانووسانە: شاری ساوە لەو سەردەمەدا تەنانەت لە سەدەی چوارەما شارێکی گرنگ بووە. لە ڕووی سپاییەوە بەهێز بووە و، خێوی دژ و قەڵای قایم بووە، لە ڕووی بازرگانییەوە، گرنگ بووە، زۆر کەسی وا هەبوون، گەلە وشتریان هەبووە بۆ کاروانی حەج بۆ گوێزانەوەی ئەوانەی ویستویانە بچن بۆ ماڵی خوا لە شاری مەککە... هەروا شاری ساوە شارێکی جوان و ڕازاوە بووە، گەرماوی زۆر جوانی تیا بووە، مزگەوتی گەورەی هەبووە، لە ناوەڕاستی مزگەوتی بازاڕدا کتێبخانەیەکی گەورە هەبووە کتێبی زۆر چاکی ئەو سەردەمەی هەموو تیا بووە، هەروا ئەو کەرەسەیانەشی تیابووە، کە بۆ هەستێرە دۆزینەوە و، قیبلەناسین بەکارهێنراوە، کە پێی ئەوترا(ئوسترولاب، گۆی زەوی). جگە لەوە لەم شارەدا نەخۆشخانەی زۆر، قوتابخانەی فرە، خانەقا و تەکیەی زەبەندەی تیا بووە... دەڵێن تاقی هەیوانی مزگەوتە گەورەکەی ئەوەندە بەرز بووە، لەگەڵ تاقی هەیوانی کەسرادا هاوتەقایی کردووە ئەم شارە هەروا گرنگ ماوەتەوە.

سەردارێتییەکانی ڕوادی، سالاری، بەسەر ئەم شاری ساوەیەدا دەسەڵاتیان هەبووە، هەروا دەوڵەتی ئیسماعیلییەش کە حەسەن سەباح دایمەزراندبوو. ساڵی ٦١٧ کۆچی ئەم شاری ساوەیە لە لایەن مەغۆلەوە بەر شاڵاو کەوت و بەتەواوی وێران کرا و، خەڵقی شارەکە و دەوروبەری قڕیان تێ خرا و، کتێبخانەکان و، مزگەوتەکان سووتێنران... بەڵام پاش ماوەیەک لە سایەی خواجە زەهیرەدین عەلی کوڕی مەلیک شەرەفەدین ساوجییەوە ساز کرایەوە و، ئاوەدان بووەوە و، شورەیێکی بەدەور کێشرا، کە درێژایی جغزەکەی هەشت کیلۆمەتر و دووسەد مەتر بوو.

هەروا مێژوونووسان، وتوویانە: بەفەرمانی شا ئیسماعیل بەهادری سەفەوی یەکەم، ساڵی ٩٢٤ کۆچی لە مەیدانی گەورەی شارەکەدا مزگەوتی دروست کرا، لەژێر چاوەدێری و سەرپەرشتیی خواجە شەمسەدین محەمەددا و، خەڵقی ئەم شارە هەموویان لەم سەردەمەشا هەر لەسەر ڕچی شافیعی بوون بەپێچەوانە خەڵقی ئاوە کە هەموویان لەسەر ڕچی جەعفەری) بوون... شوێنەوارە مێژووییەکانی شاری (ساوە)و دەوروبەری ئەمانەن: (منارەی مزگەوتی مەیدان - هی سەردەمی سەلجووقییە و ساڵی ٤٥٣ دروست کراوە، منارەیەکی تری هی ساڵی ٥٠٤ کۆچییە و، چەند بارەگا و خوابگای ئیمام زادەشی تیایە، وەک شاهزادە حوسێن و شاهزادە ئیسحاق و بابا سەلمان و هی تری... ئەم باسانە هی کۆن بوو.

ئەمڕۆکە شاری ساوە شارێکی ئاوەدان و پاک و خاوێنە بازارێکی باشی هەیە، چەند قوتابخانەی بەرایی، دەیان قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و، چەند قوتابخانەی ناوەندی تیایە و، ژمارەیەک کتێبخانەی چاکیشی تێدایە، نەخۆشخانە، دەرمانگا، داروخانە، ئاو و کارەبا و بەرق، تەلیفونخانە، تەلگرافخانە سینەما، گەرماو، میوانخانە، هوتێل، خۆراکخانە، قاوەخانە، چاخانە، جێگەی وەرزش و، زۆر جێگەی تری تێکڕایی تیایە. چەندین کارخانە و کارگەی (جۆلایی، تەونکاری، دارتاشی، ئاسنگەری، جۆشکاری) و، شتی تری تیایە. خەڵقی وڵات زۆربەیان خاوەن کشتوکاڵ و ئاژەڵدارن. دەسکەوتیان دانەوێڵە، توتن، پەتاتە و سێو زەمینی و، بەرهەمی ئاژەڵی وەک ڕۆن، خوری، پێستە و شتی ترە. (ساوە) باغ و باغاتی زۆرە تەنانەت هەناری ساوە زۆر بەناوبانگە.

زبانی خەڵقی ساوە و دەوروبەری لەمەوبەر گۆرانی و فەیلی بووە، ئێستە زۆریان بەفارسی و تورکی قسە دەکەن. ئارامگاکانی شازادە ئیسحاق، بابا سەلمان بۆمان ڕوون ئەکەنەوە لەمەوبەر کاکائییان هەبووە، ئەمە بۆ هەندێ زانیاری دەربارەی ساوە ئیتر بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٢/١٠/٥

## وتاری: ٩٩

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش.

ئەمشەو باسی (سپاهان) دەکەین. بێ گومان هەندێ لە بیستیارانی خۆشەویست لە نوخشە بیستنا ئەم ناوەیان لا سەیر ئەبێ و نایێتیش بەبیریانا کە مەبەست ئەسفەهانی ئەمڕۆیە. بەڵێ وایە، ئێمەش هەر بۆ ئەوەیْ بێتەوە بیریان کە ناوی سپاهانی کۆن لە لایەن عەرەبەوە گۆڕاوە بەئەسفەهان و، هەروەک خۆی هێلراوەتەوە تا ئەمڕۆکە، ئەم باسە ڕوون ئەکەینەوە، وتارەکەشمان لەسەر بناغەیەکی جوغرافیایی کۆن و تازە و مێژوویی دائەمەزرێنین. ئەوەش لەبیر ناکەین کە بڵێین بۆ پێکهێنانی ئەم وتارە چاومان گێڕاوە بەم کتێبانەدا: (موعجیمی یاقوتی حەمەوی، نوزهەی موستەوفی قەزوینی، وڵاتانی خیلافەتی خۆرهەڵاتیی لیسترنج، دائیرەت المعاریفی بوطروس بوستانی، فەرهەنگی دیهخودا، فەرهەنگی ڕەزم ئارا، ڕانومایی شارستانەکان) و زۆر کتێبی تریشدا.

موزیک

لە سەرەتای ئیسلاما (سپاهان) گەورەترین شاری هەرێمی چیا -واتا عێراقی عەجەم- بووە. مێژووی ئەفسانەیی ئەم شارە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە لایەن کیکاوسەوە دامەزراوە هەروا ئەوترێ کە ئەژدیهاش -کە عەرەب ناویان گۆڕیوە بە (زەحاک) و پێنجەمی شایانی- پێشدادیان بووە - هەموو کوشتار و کردەوەی خراپ و نالەباری خۆی لەم شارەدا ئەنجام داوە؛ کە کاوەی ئاسنگەر درەوشی کاویانی هەڵ کردووە و ئاڵای کاویانی گرتووەتە دەستەوە و، خەڵکی بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین دژی ئەژدیها هانداوە و، تەختوبەختی ئەژدیهای ڕووخاندووە و بەسەریا زاڵ بووە و خۆشی بەدیل گرتووە و، ناردوویە لە چیای دەماوەندا خراوەتە زنجیر و پاڵە هەنگ و، هەر بەوجۆرە لەژێر باری سزادا ئەمێنێتەوە تا ڕۆژی پەسڵان (واتا قیامەت) و هەروەک ئەوترێ لە ڕۆژی سەرکەوتنی کاوەوە، کراوە بەیاسا کە هەرگا شاهانی ئێران لەگەڵ دوژمنا کەوتبنە شەڕەوە ئاڵای کاوەیان خستۆتە پێشەنگی سپای شەڕکەر و، ئەیاندا بەدەس سەربازانی سپاهانییەوە...

موزیک

بابێینەوە سەر ئەوەی ناوی سپاهان لە چییەوە هاتووە؟

دەڵێن لە سەرەتادا ئەم جێیە بنکەی (سپاه) بووە و، هەمیشە هەرێمەکە لە لایەن (سپاه بود)ێکەوە بەڕێوەبراوە، بۆیە ناوی نراوە سپاهان و هەندێ لایان وایە کە ئەو جێیە پایەگای لەشکری سوارە بووە و ناوی (ئەسپ دانە) بووە و ناوەکەی لە یۆنانیدا بوو بە (ئاسپادانا Aspadana) و عەرەب گۆڕیویانە بەئەسفەهان... لە دەورانی هەخامەنشیدا نازانرێ کە شار بووە، یا قەلا بووە، هەر ئەوەندە ئەزانرێ کە لە سەردەمی داریوشی سێیەمدا، کە شانامەی فردەوسی ناوی ناوە (دارا) و لەگەڵ ئەسکەندەری کوڕی فلیپنی مەکدونیدا لە شەڕا شکا ئەم جێیە لە لایەن ئەسکەندەرەوە داگیر کراوە. پاش دەورانی ئەسکەندەر کەوتۆتە ژێر دەس سەرەدارانی سلوکییەوە، کە پاشماوەی دەسەلاتی ئەسکەندەر بوون... ئنجا کەوتۆتە ژێردەس بنەماڵەی بەرثی کە بەئەشکانی بەناوبانگن و سالانی ٢٥٥ بەر لە زایینی مەسیح بەسەر سلوکییەکانا زاڵ بوون. پاش ئەوە کە ئەردەشێر بابەکان ساڵی ٢٢٦ پاش زایینی مەسیح شاهەنشاهی ساسانی دامەزراند ئەم سپاهانە یەکێک لە شارەکانی دەورانی بوو.

شاری سپاهان بەوتەی جوغرافیانووسان لە بنەڕەتا، لە کەناری (رایەندە ڕود) دامەزراوە و، دوو بەش بووە: بەشی (گابایەکی) و گەڕەکی (یەهودیە) و ئەم یەهودییانە گۆیا ئەوانەن کە بەخت النەسر ساڵانی ٥٩٧ بەز لە زایینی مەسیح لە ئورشەلیمەوە گوێزانییەوە بۆ کوردستان و هەرێمی چیا، واتا بۆ حەلەوان و جێی تر کە یەکێکیان ئەم یەهودیە بووە و، عەرەب بەناوی گابایەکییان گۆڕیوە بە (جوی) بۆیە ئەوترێ سپاهان لە بنەڕەتا دوو گەڕەک بووە (جوی و یەهودی)یە نێیمە، لامان وایە ئەم بیرورایەی جوغرافیانووس و مێژوونووسان جێی تێبینی و، لێکۆڵینەوەیە، هیچ کات ڕەگەزەکانی ئاری نەژاد بە(جو)یان نەوتووە یەهودی، بەلکو سامییەکان وتوویانە... چونکە بەکوردی پێیان وتووە (جو) و (جولەکە) و، بەفارسی پێیان وتووە (جهود)، جا ناوی جوی دەبێ هەر ناوی ئەو گەڕەکە بێ کە لە سەرەتادا جووەکان تیا دانیشتوون و، لە واژەی (گابایەکی)یەوە گۆڕا بێ.

پاشان ڕەگەزی ئێرانی لە سەردەمی عەرەبدا لە گەڕەکی (جەی) دانیشتوون و جووەکان لە بەشێکی ئەو ناوەدا مانەوە عەرەب ناوی ئەو گەڕەکەیان نابێ (یەهودی).

موزیک

سپاهان لە سەردەمی پۆستنشینی دووەم -واتا خەلیفەی دووەمدا- لە لایەن سپای ئیسلامەوە داگیرکراوە، بەلام بەوردی نازانرێ چ ساڵێ داگیرکراوە! هەندێ وتوویانە ساڵی

١٩ كـۆچی و هەندێ ســاڵ ٢١ و هەندێ ٢٣یان وتووە، ناوی فـەرمـاندەی ئەو لەشکرەی ئیسـلام کە ڕووی کردۆتە سپاهان عەبدوڵلا کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عوتبان Otban بووە فەرماندەی سپای ئێران لە سپاهان (ئاسپیدان) بووە و، پێشەنگی لەشکرەکەش شەهریار کوڕی جازویە بووە کە پیرەمێردێکی دلێر و، نەبەز بووە و لەگەڵ لەشکری ئیسـلامدا شەڕێکی سەختی کردووە، ئنجا داوای ئەوەی کردووە کە فەرماندەی لەشکری ئیسلام خۆی بێتە مەیدانەوە... جا کابرایەک بەناوی عەبدوڵلا کوڕی وەرقا بووە، چووەتە مەیدان و بەسەریا زاڵ بوە و لای دێیەکی نزیک بەسپاهان کوشتویە و سپای سپاهان بڵاوەیان لێ کردووە و، سەرداری شاری سپاهان بەئاشتی ڕێک کەوتن وڵاتەکەی داوەتە دەستەوە و بەم جۆرە سـپـاهان بووەتە ناوەندی هەرێمی چیـا و، لە سـەردەمی ئەمـەوی و عـەبباسـی شـا هەروەها ماوەتەوە - وەکو لە بەرنامەکانی ئایندەدا لێی ئەدوێین. ئێسـتـە کاتمان تەواوبوو شەوتان باش.

١٣٥٢/١٠/٢٦

٢٦/بەفرانبار/٢٦٧٣

گوێگرە خۆشەویستەکان کامەرانیتان هیوامانە.

ئێمە لەسەر باسی (سپاهان) -واتا ئەسفەهان- ئەڕۆین. لە وتاری پێشوودا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ناوی سپاهان -واتا ئەسفەهان- لە کوێوە هاتووە؟ و ئەم شارە لە کەیەوە هەیە؟ و چی بەسەرا ڕابردووە تا ئەو حەلەی ئیسلام بەسەریا زاڵ بووە، ئەوە بوو وتمان کە سپای ئیسلام بە فەرماندەیی عەبدوڵڵا کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عوتبان ڕووی کردە سپاهان و لەگەڵ فەرماندەی سپاهاندا کە ناوی (پاروس پان) بوو، عەرەب پێیان ئەوت (فازوسفان) لەسەر پەیمانی ئاشتی ڕێککەوتن کە خەڵق سەرانە بدەن ئەگەر نەیانەوێ ئیسلام بپەسەندن... پەیماننامەکە، لەباتی ئێران لە لایەن پاروسپان و لەباتی ئیسلام لە لایەن عەبدوڵڵا کوڕی قەیسەوە مۆر کرا، پاش ئەم ماوەیە گەرچی بشێونە لە وڵاتەکەدا زۆرجار ڕووی ئەدا و، خەڵقی وڵات نارەزایی خۆیان لە دەس فەرمانەدەیانی عەرەب دەرئەبڕی و، شۆڕشیان هەڵئەگیرساند بەڵام شۆڕشەکان کەم هێز و جێگەیی بوون و زوو دائەمرکێنران، تەنانەت شاری سپاهان ناوەندی وڵاتی چیا بۆ زۆرتر هێز و سپای ئیسلام و عێلاتی عەرەبی تیا جێگیر بووبوو، لەبەرئەوە بەناوەندی وڵاتی چیا ئەدرایە قەڵەم، لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەویدا تەنانەت لە مێژووی ٦٨ی کۆچیدا کە مەروانی حەکەم لەسەر تەختی خیلافەتی ئەمەوی بوو و، عەتاب کوڕی وەرقاء فەرماندەی سپاهان بوو، شۆڕش لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی لە هەموو گۆشە و کەنارێکی ئێراندا هەڵگیرسابوو، بەڵام شۆڕشگێڕەکان لە چاو پانوپۆڕیی سنووری ئێرانا زۆر کەم بوون و هەمیشە لە هەرێمی چیادا بوون، جارێ لە ئازەربایجان سەریان هەڵ ئەدا جارێ لە کوردستان جارێ لە لوڕستان و جارێ لە خۆزستان لەم ساڵی ٦٨دا خۆیان گەیاندە سپاهان واتا ئەسفەهان و گەمارۆیان دا سەرداری سپاهان کە ناوی عەتاب کوڕی وەرقاء بۆ ماوەیەک لەگەڵیانا جەنگی بەتیر و شەڕە بەرد و، شەڕە ئێسک... شۆڕشگێڕەکان کە زانییان بەسەر شارەکەدا زاڵ نابن و خواردەمەنی و نۆشەی ژیانیان نەبوو ئەسفەهانیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە ئەهواز و لەو ناوە باج و پیتاکێکی زۆریان کۆکردەوە، پاش ئەم دەورە تا سەردەمی ئەبو موسلیم کە خۆی خەڵقی وڵاتی چیایە و بەنازناوی (خوراسانی) ناسراوە، قەوماوەی گەورە لە هەرێمی چیادا ڕووی نەداوە... بەڵێ لەوە پاش کە موسوڵمانان لە هەموو هەرێمەکانی جیهانا لە

دەس ستەم و زۆرەملێوە، فەرمانڕەوایانی ئەمەوی بێزاربوون، وردە وردە خاوەن هۆش و بیران کەوتنە کنەکردن بۆ رووخاندنی دەسەڵاتی ئەمەوی و، بەنهێنی کەوتنە چاوەڕواو و پروپاگەندە و کۆمەڵە پێکهێنان، گەرچی لە وڵاتانی تر پتر، دانیشتوانی چیای زاگرۆس و، خەڵقی ئێران قین و رق لە دڵ بوون و کنەکردن دژی ئەمەوی پتر لە ئێرانا ریشەی داکوتابوو، بەڵام ناوەندی بناغەیی بزووتنەوە شارانی مەککە، مەدینە، کوفە بوو و، لەسەر نامەدانی ئەو پێشەوا ئاینییە مەزنانەی کە پەیمانیان لەگەڵ یەک بەستبوو و، (ئیبراهیمی تەباتەبا)یان بۆ پێشەوایی هەڵبژاردبوو دوو پێشەوای مەزنی رچی ئاینی ئیمامی مالک بوو لە مەدینە و، ئیمانی ئەبو حەنیفە بوو لە کوفە... و لەناو گەنجانی ئێرانی شا ئەو کەسەی بۆ ئەم سپاردەیە هەڵبژێرابوو ئەبو موسلیم بوو. ئەم ئەبو موسلیمە لەبنەڕەتا خەڵقی دەورویشتی سپاهان واتا (ئەسفەهان) بوو، بەرەگەزەش هەر کورد و خەڵقی چیا بوو، لە لایەن ئیمام ئیبراهیم و یارانییەوە ناو و ناوبانگی گۆڕابوو بەخوراسانی، کە نەناسرێتەوە، بەڵام لە بەختی بەدی ئەبو موسلیم (ئیمام ئیبراهیم) بەر هەڵمەتی چنگاڵی مەرگ کەوت و کۆچی دوایی کرد... بەڵام ئەو هێزانەی کە لەگەڵ ئەمەوی کەوتنە شەڕەوە و، فەرماندەی ڕاستەقینەیان ئەبو موسلیم بوو، بەسەر سپای ئەمەوییا زاڵبون و لەسەر زێی بچووک لەوێ کە ئەکەوێتە خۆرئاوای کەرکووک و لەو جێیەدا کە بەماحوز بەناوبانگە و، ئەمرۆکە بەشێکە لە فەرمانداری حەویجە و لەژێردەستی عەرەب دایە سپای شۆڕشگێران بەسەر مەروانی کوڕی محەممەدی کوڕی مەروانی ئاخرین پادشای ئەمەوییا زاڵ بوون و بەم جۆرە لە سایەی خەبات و تێکۆشانی ئەبو موسلیم و کۆمەڵە نهێنییەکانەوە دەوڵەتی عەبباسی دامەزرا... ئەم دەوڵەتی عەبباسییە کە بۆ ئەوە هێنرابوونە سەر تەخت کە وڵات لەژێر ستەمی شۆڤینی عەرەب ڕزگار بکات و ئاینی ئیسلام لە قوڕاوی نالەباری ئەو دیکتاتۆرانە پاکژ بکەنەوە و، موسڵمانەتی وەربگێڕنەوە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی خۆی و دەستووری وڵات بەپێی مرۆڤایەتی و چۆنیەکیی مافی گەلان ببەن بەڕێوە، بەڵام زۆری نەبرد کە ئەبو جەعفەر مەنسووری عەبباسی پشتی کردە ئامانج و کەوتە بەهانەگرتن لە ئەبو موسلیم... و هەرچەندە ئەبو موسلیم هەوڵی دا کە ماوا پەیدا بکات و، بگەڕێتەوە بۆ هەرێمی چیا و بگاتەوە سپاهان، بەڵام مەنسوور ڕێی نەدا و بەخراپترین سزا کوشتی، جا هەندێ لە هەستیارە کاسە لێسەکان کەوتنە سەرزەنشتی پاش مەرگی، یەکێک لەو هەستیارە کاسە لێسانە کە رووپایی کارانە شاڵاویان ئەبردە سەر ئەبو موسلیم کابرایەک بوو ناوی ئەبو دولامە بوو، ئەم کابرایە نەوەک هەر سەرزەنشتی ئەبو موسلیمی دەکرد،

بەڵکو شاڵاوی ئەبردە سەر نەتەوەی کوردیش. ئەم ئەبو دولامەیە نازناوی ئەبو موسلیمی گۆڕی بەئەبو موجریم و، لە پارچە هەڵبەستە عەرەبییەکەیا بەم جۆرە کەوتە سەرزەنشکردنی وتی: (ئەبا موجریم خوا لە هیچ کەس ناگۆڕێ تا خۆی سەر لە خۆی تێک ئەدا... ئەتەویست لە دەسەڵاتی مەنسووردا نهێنی بڕی و ستەم بکەی؟... با پێت بڵێم نهێنی بڕی و ستەم کاری باوک و باپیرانی کوردی تۆیە... تاد...

گوێگرە بەڕێزەکان ئا ئەمە بوو یەکێکی تر لەو قەوماوە گرنگانەی کە ناوی سپاهان، واتە ئەسفەهان - ئەکاتە سەردێڕی مێژوو... جارێ با لێرەدا بووەستێن کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش...

٣/بەهمەن/١٣٥٢

٣/ڕێبەندان/٢٦٧٣

## وتاری: ١٠١

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش و کامەران بێ، لە وتارەکانی ڕابردووا لە مێژووی سپاهان -واتا ئەسفەهان- دواین، تا ئەوێ کە وتمان: لەبەر زۆر و ڕەنگی شوووینیستەکانی سەردەمی ئەمەوی، وڵاتانی ئیسلام، سەرانسەر دژی خەلافەتی ئەمەوی لە جموجۆڵابوون، بەڵام چونکە هەرێمی چیای ئێران کە زۆر سەخت و قاییم بوو پتر، دژی ڕژێمی زۆردارانە و نالەبارانەی دەست و پێوەندە شوووینیستەکانی ئەمەوی هاتبوونە جۆشوخرۆش و، زۆرتر لە شۆڕشا بوون و گەلێ جار وردە شۆڕشیان هەڵئەگیرساند و تیا سەرنەئەکەوتن... سەرئەنجام ئەوەبوو ئەبو موسلیم کە لە بنەڕەتا خەڵقی دەوروبەری سپاهان بوو، بەناوی خوراسانی دەناسرا، خەلافەتی ئەمەوی ڕووخاند و، بووە هۆی دامەزرانی خەلافەتی عەبباسی بەو هیوایەی کە ئاینی ئیسلام لە قوڕاوی خۆپەرستی و شوووینیستی ڕزگاری بێ، بەڵام زۆری نەبرد کە ئەبو جەعفەر مەنسووری عەبباسی پشتی لە ئەبو موسلیم هەڵ کرد و بەو چەشنە پاداشی چاکەکەی دایەوە؛ کە بەخراپترین سارا کوشتی...

موزیک

خەڵقی سپاهان -واتا ئەسفەهان- لە سەردەمی خەلافەتی ئەلمەئمون بیللا عەبباسی و لە سەردەمی ئەلموعتەسەم بیللا عەبباسیدا... هەروا خەڵقی هەمەدانیش زۆریان چوونە سەر مەزهەب و ڕچی خوڕەمییە، ئەم ڕچە لە بنەڕەتا کابرایەک دایمەزراندبوو ناوی جاویدان کوڕی سەهل بوو، خەڵقی دێی خوڕەمی نزیک ئەردەوێل بوو، ئەمانە لە بنەڕەتا پەیڕەوی ئاینی کۆنی ئێرانی بوون... پاش ئەوەی جاویدان مرد بابەک کوڕی مەرداسی دەس نێژی جێی گرتەوە، کە خۆی پەروەردەی کردبوو... ئەم بابەکە گەرچی بەهەتیوی لای جاویدان پەروەردە بوو، بەڵام وای ئەدایە قەڵەم کە لە نەتەوەی ئەبو موسلیمە، پاش مەرگی جاویدانی خوڕەمی ژنەکەی جاویدانی خواست و فەرمانڕەوایی و سەرپەرشتیی (خوڕەمییەی گرتە دەست و، باش سەرکەوت و خەلافەتی عەبباسی خستە لەقەلەق و، بەپەنامەکی لەگەڵ (قەیرالی ڕۆمی بیزانس)یشدا دژی خەلافەتی عەبباس پەیمانی بەست، کە وڵاتی ئازەربایجان و چیای بخاتە ژێردەست و بەو مەرجەی دژی عەبباسی پشتیوانی لێ بکات، بەڵام لەم هەنگاوەدا سەرنەکەوت، چونکە قەیرالی بیزانس زوو نەگەیشتە فریای خەلیفە ئەلموعتەسەم لە ساڵانی ٢١٨-٢٢٣دا، سپایەکی قورسی بەفەرماندەیی

(ئەفشین خیدر Aphsin ¨Xidr کوڕی کاوس توران ئەشرۆ سنەیی) نارده سەری و نزیکەی سێ ساڵ شەڕ درێژەی کێشا و، گەرچی ئەفشین بەسەریا زاڵ نەبوو، بەڵام بەهۆی دڵدانەوە و، ئاشتی و کاغەزی پڕ لە فێڵ و تەڵەکەبازییەوە، دڵنیای کرد و بەئاشتی گرتی و ناردی بۆ بەغدا بۆ لای خەلیفە ئەلموعتەسەمی بیللا، کە بەوپەڕی سزاوە کوشتی پاش ئەوە وەکو بوستانی ئەڵێ: ساڵی ٢٣١ لە سەردەمی خەلیفە ئەلواثیق بیللادا شۆڕشگێرانی کورد سپاهانیان داگیر کردەوە و، خەلیفە وەسیفی فەرماندەی نارده سەریان و، بەسەریانا زاڵ بوو و زۆری لێ گرتن و زۆری لێ کوشتن... بەڵام بەداخەوە بوستانی ڕوونی نەکردۆتەوە کە کوردەکان لەنام عێل و تیرەی کورد بوون؟ لە سەردەمی خەلافەتی (ئەلموەفەق بیللای عەبباسی)شاسپاهان کەوتە ژێردەستی لەیشی سەفارە و لە سەرەتای سەدەی چوارەمەوە تا داویە و پاومانی سەدەی چوارەم لەژێردەستی دوو بنەماڵەی (دەیلەمی) کە بریتی بوون لە بنەماڵەی (مەرداویج و ئال بویە) وەکو مەکۆکی جۆلا لە هاتوچووندا بووە و لە سەردەمی ئال بویەشدا ماوەیەک لەژێردەس کاکەبییەکانا بووە، کە مێژوونووسانی فارس ناویان ناوە بنەماڵەی (کاکۆیە) بەڵام توغرول بەگی سەلجووقی گەمارۆی دا و ساڵی ٤٤٣ لە ئەبو مەنسووری کوڕی عەلائەلدەولەی کاکۆیەی داگیرکرد، کردی بەپایتەختی خۆی و، هەموو قەڵا و کونگەرە و شورەکانی ڕووخاند کە کاکویە دایمەزراند و و لە ساڵانی ٤٩٤ی کۆچیدا ئەم شاری سپاهانە کەوتە ژێر فەرمانی پەیڕەوانی ئیسماعیلییەوە کە پێیان ئەوترا - باطنیە- و لەم سەردەمە بەدواوە شارەکە ڕووی کردە وێرانی و لە سەردەمی مەغۆل و تاتاردا زیانی زۆر دی و، لە سەردەمی تەیموری لەنگدا بەتەواوی وێران بوو هەزار کەسی لە خەڵقەکەش تیا کوژرا و، هەر بەم جۆرە مایەوە و تا سەردەمی سەفەری هەرکە شا عەبباسی چووە سەر تەخت کردییە پایتەختی وڵات و ئاوەدانی کردەوە، ناوچەی بازرگانی لە هەر لاوە ڕوویان تێ ئەکرد، چینی و هیندی و تورک و عەرەب و فەرەنگی و ئەفغانی، بەجۆرێ پەرەی سەند کە دەربارەی ئەوترا (سپاهان نیوەی جیهان)ە لەم سەردەمەدا گەشتیاری بەناوبانگی فەرەنسەیی (شاردن)، چوار ساڵی ڕەبەق کاتی خۆی لەم شارەدا ڕابواردووە و، زۆر جوان ئەم شارەی هەڵناوە... پاش دەورانی سەفەوی ئەفغان داگیریان کرد، بەڵام ساڵی ١١٤٣ کۆچی، نادر شا لێی وەرگرتەوە بەڵام بەو هۆیەوە کە پایتەختی نادر شا لە خوراسان بووە و، پایتەختی ڕەندییەکانیش لە شیراز بووە، سپاهان بێ ڕەونەق مایەوە و، هەروا تا زەمانی فەتح عەلی شای قاجار کە هەوڵی دا بۆ ڕەونەق پێدانی بەڵام لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا کەوتە ڕەونەق و پەرەسەندن و گەشەکردن، ئێمە لە وتارەکانی داهاتوودا کە باسی ئاوەدانی و ئابووری سپاهان دەکەین دوورودرێژ ئەم باسانە ڕوون ئەکەینەوە ئێستە بەخواتان ئەسپێرین. شەوتان خۆش.

## وتاری: ١٠٢

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

هیوامان سەربەرزی و کامەرانیتانە. ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی سپاهان -واتا ئەسفەهان- ئەڕۆین... لە وتارەکانی پێشوودا لە کورتە مێژووی سپاهاندا لە زۆر باسی رۆژگاری رابردوو دواین و، لەم وتارەشدا باسێکی تری روون ئەکەینەوە... سپاهان و دەوروبەری ماوەیەکی سێ سەد ساڵی پچڕ پچڕ لەژێر دەسەڵاتی سەرداران و فەرمانڕەوایانی شوانکارەدا بوو، کە مێژوونووسانی ئێران بە (ملوک شوانکارە) ناویان بردوون. شوانکارە یەکێ لە کۆنترین عێلە کوردەکانی هەرێمی فارسە و، دوور نییە پاشماوەی ئەو عێلە کوردانە بێ کە دەوڵەتی هەخامەنشی لە وڵاتی کوردستانەوە بۆ پارمەتی گواستنییەوە هەرێمی فارس، چون لە مێژووەکانی سەرەتای ئیسلاما وامان بۆ دەرئەکەوێ کە لە سەردەمی ساسانیشا بیست و چوار عێلی زۆر گەورەی کورد هەبوون کە لە هەرێمی فارسدا بەکوردانی فارس و لە مێژووی عەرەب دابە (ئەکراد فارس) بەناوبانگ بوون و، هەموویان کۆچەر و بەناوی ڕەمی کورد یا (رمومی کورد) یادیان لێ ئەکرا...

وا دیارە هەر ئەمەیە هۆی ئەوەی کە فەرمانڕەوایانی شوانکارە خۆیان بەڕەگەز ئەبردەوە سەر شاهانی ساسانی... جارێ با ئەم باسە لێرە بووەستێ لە باسی شوانکارەدا دووبارەی ئەکەینەوە و پالأفتەی باسەکە ئەمەیە:

فەزلەوییەی سەرداری شوانکارە چوو بەگژ ئال بویەدا و هەرێمی فارس و ئەسفەهانی لێ داگیرکردن و فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر هەرێمەکەدا سەپاند... ئەم بنەماڵەی ملوک شوانکارەیە لە ساڵی ٤٤٨ کۆچی بەدواوە تا ساڵی ٧٥٦ کۆچی واتا نزیکەی سێ سەد ساڵ بەدوو دەورەی پچڕپچڕ کاروباری ئەم ناوەیان بەڕێوە ئەبرد، تەنانەت لە دەورانی مەغۆل و تاتاردا توانییان وڵاتەکە لە وێرانی بپارێزن بەڵام پاش ساڵی ٧٥٦ ئەتابەگانی فارس کە بەبنەماڵەی ئال موزەفەر بەناوبانگن وڵاتەکەیان لێیان داگیرکردن و پاش ئەوە لە سەردەمی تەیموری لەنگدا خەڵقی شاری سپاهان بەر کوشتار کەوتن تا ڕادەیەک کە بە فەرمانی تەیموور پتر لە ٧٠ هەزار کەسیان کوژران و لە کەللەسەریان منارە دروست کرا.

موزیک

ئەمە بوو هەندێ لەوەی ڕوون نەکرابووەوە، با ئێستا بگەڕێینەوە سەر باسی جوغرافیی سپاهان ئەمڕۆکە ناوەکە هەر بەو جۆرە ناو ئەبرێ کە عەرەب ناویان بردووە و پێی ئەوترێ ئەسفەهان و ناوەندی ئوستانی دەیەمی کیشوەری پانوپۆڕی ئێرانە... سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای باکور و ژووری شارستانەکانی (نەتەنز و مەحلات)ە.

لای خۆرهەڵاتی، شارستانی ئەردستان و بەخشەکانی نائین و حەزەر ئابادی بەردە، لای باشوور و خوارووی شەهرستانی (ئابادە)یە.

لای خۆرئاواشی، شەهرستانەکانی (نەجەف ئاباد و شەهرەزا)یە...

سپاهان ئەکەوێتە سەر هێڵی جوغرافی ٥١ پلە درێژی و ٣٩ دەقیقە و، ٣٢ پلە پانی و ٣٨ دەقیقە... و لە سپاهانەوە تا تارانی پایتەخت ٤٢٤ کیلۆمەتر و جێگەکەی لە ڕووی زەریەوە ١,٥٠٠ مەتر بەرزە و، ئەکەوێتە داوێنی بەشی خۆرهەڵاتی زنجیرە چیای زاگرۆس و، هەروەک لە سەرەتادا وتبوومان لە سەرەتای ئیسلاما ئەم شارە دوو گەڕەکی (جوی و یەهودیە)یە بووە... و هەروەک لە سەرەتادا وتمان بەگومانی ئێمە (جوی و یەهودی)یە هەر یەک بووە و عەرەب ناوی (جو)ی کوردیان وەرگێڕاوە بە (یەهودی)یە. ئەڵێن شارەکە لە لایەن ئال زیارەوە شورە کێشراوە، بەقسەی ناسر خەسرەوی کەشتیاری ناوبانگ، پێوانەی شورەی دەوری شارەکە ٢١,٠٠٠ مەتر بووە... بەڵام ئەم شورەیە کاتێ کە شاری ئەسفەهان لە لایەن ڕوکن الدەولە ئال بویەوە لە چوار دێی (کەران - کوشک - جوجار - دەردەشت) پێکهێنراوە شورەکە ڕووخێنراوە و، لە جێی ئەوە چەندان دژ و کۆنگەرە و بناروو دروست کراوە ڕوکن الدەولە وتوویە: ئێمە وڵات بەهێز ئەپارێزین نەوەک بە(شورە). گەشتیاری فەرەنسەیی شاردن وتوویە:

کە دەروازەی کەران ئەکەوتە بەشی خۆرهەڵاتی شارەکەوە و، تا ئەمڕۆ ناوی ئەو چوار دێیە لە شاری ئەسفەهاندا هەر ناوی گەڕەکن و ماونەوە... گوێگرە خۆشەویستەکان بۆ پاشماوەی باسەکە چاوەڕوانی وتارەکاتی تری بن، ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

١٣٥٢/١١/١٨

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، کامەرانی و ژینی خۆشتان هیوای ئێمەی بەڕێوەبەرانی بەرنامەی ڕادیۆی ئێرانە... ئێمە هەر لەسەر باسی سپاهان واتا ئەسفەهان ئەڕۆین... لە سەرەتادا با ئەوە ڕوون بکەینەوە کە سپاهان ماوەیەک لەژێر فەرماندەیی ئەتابەگانی لوڕی گەورەشا بووە... ئەویش لە سەردەمی تاتارا... وەکو هەموو لایێ ئەیزانین سوڵتان ئەحمەد نکودار خانی تاتاری کوڕی هۆلاکۆ کە پاش مردنی ئابوغا خانی برای چووە سەر تەختی سەڵتەنەت، هەستی بەوە کردبوو کە بەندی و دیلی و کوشتار، سەر بەگەلان شۆڕ ناکات و، پرووزەی دڵی باوک و برا و ڕۆڵە کوژراوان هەر وەئەگەڕێ بەئاگری بەتەوژمی شۆڕشی پڕ لە قین و قار و، نەتەوەیانی ژێردەست زنجیر و کۆتی کۆیلیی و بەندەیی هەر ئەپچڕن، لەبەر ئەمە ویستی پەردەی شانووی چەپەڵی تاوانەکانی باوک و برای بگۆڕێ و، دەست و داوێنی خوێناویی جەردە پیاوکوژەکانی تاتار بەوە خاوێن بکاتەوە کە هانیان بدات بۆ پەسەندکردنی ئاینی ئیسلام و پەیڕەوی لێ کردنی، بەڵام تاتارەکان لێی هەڵگەڕانەوە و، بەڕابەریی ئەرغون خان کوڕی ئەباقا خانی برای دژی ڕاپەڕین... نا لەم سەردەمەدا ئەتابەگ یوسف شای فەرمانڕەوای لوڕی گەورە جگە لە لوڕستان (خوزستان و فەیروزان)ی لای ئەسفەهان کە ئێستە شوێنەواری نەماوە و گوڵ پایەکان، سپاهانیشی لەژێردەستا بوو... و خواجە شەمسەدین محەمەدیش کە سی ساڵی ڕەبەق وەزیری هۆلاکۆ و ئابوقا و ئەحمەد نکودار بوو، پەنای بردبووە لوڕستان و کچەکەی دابووە ئەتابەگ یوسف شا... هەرکە ئەرغون خان بەسەر ئەحمەد نکوداری مامیدا زاڵ بوو، داوای کرد لە ئەتابەگ یوسف شا بێتە دیدەنی و خواجە شەمسەدین محەممەدیش لەگەڵ خۆی بهێنێ... هەرکە خواجە شەمسەدین محەممەد گەییە بەردەمی دەستووریدا لە ملیان دا. هۆی کوشتنی ئەم وەزیرە نووسەرە هەستیارە بەناوبانگە دانەری سەدەها کتێب و، یەکێ لە کتێبەکانی (شەمسییەی مەنطیق)ە هۆی کوشتنی ئەوەبووە کە سوڵتان ئەحمەد نکودار خانی هانداوە بۆ دەس لە کوشتار هەڵگرتن و پەیڕەویی ئاینی ئیسلام.

موزیک

پاش دەورانی تەیموری لەنگ کە سپاهانی بەجارێ وێران کرد ئەسپاهان کەوتە دەس دەوڵەتە تورکمانەکانی (قەرە قویونلو) و (ئاق قویونلو)... ئینجا کەوتە ژێردەس دەوڵەتی سەفەوییەوە شا ئیسماعیل دوو ساختمانی گەورەی تیا دامەزراندووە هەروەکو ئەزانین

پایتەختی دەوڵەتی سەفەوییە لە سەرەتادا ئەردەوێل و پاشان تەوریز و قەزوین بوو... بەڵام شا عەبباسی سەفەوی بۆ ئەوەی نزیک بەچیای زاگرۆس و ناوەندی وڵاتی بێ شاری سپاهانی بۆ پایتەخت هەڵبژارد، لەوێ کۆشکێکی هەبوو ناوی (نەخش جهان) بوو ساڵی ١٠٠٦ کۆچی (واتا ١٥٩٨ی زایینی) لەو کۆشکەدا جەژنێکی بەشکۆی دامەزراندووە و زەماوەندێکی گەورەی گێڕاوە بەجۆرێکی دیوانی و یاسایی سپاهانی کردە پایتەخت و دەستووری دا بەگەورەکردنەوە و، فراوانکردنەوەی کۆشکەکە و، سەدەها وەستای ساختمانی و هونەرکاری نەخش و نیگار، تیا کەوتنە کار و، بڕیاری شا عەبباسی ئەوەبوو کە کۆشکی پایتەختی شاهی لە هەموو کۆشکەکانی شاهانی جهان ڕەنگامەتر و جوانتر بێ، جگە لەوە، وەزیران و سەرداران و فەرماندەیان و پیاوماقووڵان و سەرمایەداران و دەوڵەمەندانی وڵاتی هاندا کە بەدەوروبەری کۆشکەکە یا هەریەکەیان تەلارێکی ڕازاوەی خاوێن دروست بکەن... ئەم نوێکردنەوەیە بوو بەچاولێکەری و زۆر تالار و خانووبەرە و، مزگەوت و قوتابخانە و، خانەقا و، تەکیە و بازاڕ و مێوانخانە و کاروانسەرا و مەیدان و باغ و پرد و، شەقامی تازە دامەزرێنرا... لەم سەردەمەدا شکۆی شاری سپاهان گەییە لووتکەی ڕازاوەیی وە، شارەکە لە ڕووی پانوپۆڕی و، پەرەسەندنی دانیشتوانییەوە گەییە پۆپنەی بەرزی. بەجۆرێ کە نووسەران و هەستیاران نازناوی (ئەسفەهان نیوەی جیهان)یان بەسەریا بڕی... بەڵام پاش ئەوە، تەنانەت بەهۆی شەڕەکانی نێوانی ئەفغان و ئێرانە و کەوتە کزبوون، لە هەمووی خراپتر ظیل سوڵتان کوڕی ناسرەدین شای قاجار کە ئەیەویست لە تاران کۆشکی دروست بکات، هەموو ساختمانە جوانەکانی لێواری (زایەندە ڕود)ی ئەسفەهانی وێران کرد و کەرەسە و دار و پەردووەکانی[1] گوێزایەوە بۆ تاران ژمارەی دانیشتوانی شاری سپاهان لە سەردەمی شا عەبباسیدا گەییوەتە ٦٠٠ هەزار کەس و هەندێ لە مێژوونووسان ژمارەی دانیشتوانیان گەیاندووەتە میلۆنێک و سەد هەزار کەس. ئەم ژمارەیە لە ئەنجامی شەڕوشۆڕی ئەفغان و ئێران و هەرای ناوخۆی دەوری قاجاردا زۆر هاتە خوارەوە، بەجۆرێ کە ژمارەی دانیشتوان لە سەردەمی نووسەری بەناوبانگ شەمسەدین سامی خاوەنی (قاموس الئەعلام)دا کە بەتورکی کتێبەکەی نووسیوە، ژمارەی دانیشتوانی هاتۆتە خوارەوە بۆ ٨٠,٠٠٠ هەزار کەس، بەڵام لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا جارێکی تری سپاهان ڕەونەقی سەندەوە وەکو لە وتاری ئایندەدا لێی ئەدوێین ئێستە کاتمان تەواو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین.

---

(١) پەردو Pardü: واتا ئەو کەرەسەیەی لە خانووی ڕووخاو بەدەست دێ وەک دەرگا، پەنجەرە، نەخش و نیگاری دامەزراو...کۆڵەکە و ستوونی نەخشێنراو...تاد. کوردەواری ئەڵێن: (نە دار و نە پەرد و-لەعنەت بێ لە هەردوو).

گـوێگره بەڕێزەکـان ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان بەشـادی و کـامـەرانی تێ پەڕی، لە وتارەکانی ڕابردووا لەمێژینەی جوغرافی و دێرێکیی شاری سپاهان دواین - ئەوەبوو وتمان کە ناوی سپاهان بووە بەئەسپادانە و پاشان وەرگەڕاوە بەئەسفەهان و عەرەب کردوویانە بەئەسفەهان. و پاش ئەوەی کە توانیمان هەندێ لاپەڕەی مێژوویی و جوغرافیی کۆنی ئەم شارە بۆ بیستیارانی خۆشەویست بگێڕینەوە ئێستە نۆرەی ئەوەیە کە دەربارەی چلۆنایەتی باری ئەمڕۆی سپاهان بدوێین. ئەمڕۆ ناوی شارەکە ئەسفەهان و شارێکی ڕازاوەی بەربلاو و پانوپۆڕە کـەوتووەتە دوو ڕۆخی ئەمـبـەر و ئەوبەری ڕووباری (ڕایەندە ڕود)ەوە کـە لە چیـای زەردکوی بەختیـاریـیەوە دێ و، لەلای خۆرئاواوە کە لە خـاکی شـار کـوردەوە بەرەو ژوور ئەبێتـەوە بەرەو لای خۆرهەڵاتی ئەکشێ و بەناوەندی ئەسفـەهاندا ڕائەبوورێ. ئەم ڕووباری زایەندە ڕودە هەندێ لە مـێژوونووسـان بەهەڵە ناویان ناوە (زندە ڕود) جا شـاری ئەسـفـەهان، لە نزیکەی ٧٠ گـەڕەک پێـک دێ کـە هەندێکیـان ئەکـەوێتـە ڕۆخی لای خۆرئاوای شارەکەوە و، هەندێکیان لای ڕۆخی خۆرهەڵاتەوە، جێی شاری ئەسفەهان کە پێ دەشتە بەشی خۆرئاوای بەچیا گەمارۆ دراوە و، بەشی خۆرهەڵاتی پێ دەشتێکی پانوپۆڕە کۆنترین بەشی شارەکە دەوروبەری قەیسەری و بازاڕی گەورەی سەرپۆشراوە، کە تا ئێستە کۆڵانەکانی تەنگ و پڕ لە پێچوپلوچە. جەلالەدین تارانی لە لاپەڕ ١٣١٢ (ئاگاهنامە)دا ناوی ٦٦ گەڕەکی ئەسفەهانی بردووە کە هەندێکیـان ئەمانەن: (چهار سوق - مەحەلەی نوێ - بیـد ئاوا - دەرکـوشک - گـولبـار - سـینەپایینی - نیم ئاوەر - دەردەشت - قاوە...).

## موزیک

شوێنە دێرینە و مێژووییەکانی ئەسفەهان ئەوەندە زۆرن نایێتە ژمارە، ئێمە دیاردی بۆ هەندێکیـان دەکەین: ئاتەشکەدەکانی سەردەمی ساسانی، قەڵای ساروق کە هەر ناوەکەی لە هەمەدان هی سەردەمی مادە و، قەڵای تەبەرک و مزگەوتی جۆر جەبر کە هی سەردەمی ئال بویەیە و، منارەکانی سارەبان و ڕەهرەوان کە هی سەردەمی سەلجووقین و دوو منارەی (مـەنار جونبـان) کـە هی پاش دەورانی مـەغۆل و تاتارن و گـۆیاکـە پاڵیـان پێـوە بنێ ئەلەرێننەوە و، هەروا ساختمانەکانی عالی قاپو و چهل ستون و هشت بهشت و مزگەوتی

گەورە کە هی سەردەمی سەفەوین و کلێساکانی دروست کراو لە لایەن ئەو ئەرمەنییانەوە کە شا عەبباس لە (جلفا) وە.

کۆچی پێ کردوونە ئەسفەهان ئەم ساختمانانە هەموو شوێنەواری مێژوویی زۆر گرنگی ئەسفەهانن جگە لەمانە لە شاری ئەسفەهان و دەوروبەری یا سەدەها قوتابخانەی ئاینی، مزگەوت، تەکیە و، خانەقا هەن کە هەموو زۆر کۆنن.

موزیک

بەرزترین چیای دەوروبەری ئەسفەهان چیای (لاسیمان)ە کە ٢٩٣٤ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە و، ڕیزە چیای سوفەش کە دەکەوێتە لای خواروی باشووری ئەسفەهانەوە بەرزترین لوتکەکەی ٢٢٤٠ مەترە لە ڕووی زریەوە.

ژمارەی دانیشتوانی شاری ئەسفەهان بەپێی سەرژمێری سالی ١٣٤٥ فارسی گەییوەتە ٨٦٢,٢٦٢ کەس بەلام ژمارەی سەری کەسانی هەموو نوستانەکە نەگاتە ١,٧٠٤,٧٢٦ کەس کە ئێستە نزیکی دوو ملیون بووەتەوە. شاری ئەسفەهان و دەوروبەری گەرچی لەمەوبەر پیاوانی وەکو عیماد ئەسفەهانی و ساحێب عوببادیی تیا هەلکەوتووە و، زانا و مێژوونووسی و پیاوی گەورەی زۆری پێ گەیاندووە، بەلام لەم دەورەدا لە ڕووی فەرهەنگ و خوێندەواری و پیشەسازییەوە، ئەوەندە پێش ڕەوتی کردووە، بەرەو سەرکەوت چووە کە ناکرێ بەپێنووس تۆمار بکرێ ئێمە لە وتارەکانی ئایندەدا هەندێ لەو پێش ڕەوتانە ڕوون ئەکەینەوە تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

## وتاری: ١٠٥

گوێگره بەڕێزەکان خۆشی و کامەرانیتان هیوای ئێمەی بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە، ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی سپاهان واتا (ئەسفەهان) ئەڕۆین. ئەم شارە ئەمڕۆکە یەکێکە لە شارە هەرە بەناوبانگ و جوانەکانی ئێران، گەشتیاران و گەڕیدەکانی جیهان لە هەموو لاوە بەتاسەوە ڕوو ئەکەنە ئەسفەهان بۆ ئەوەی سۆمای دیدەیان ڕوون بکەنەوە بەسەرنجدان و چاوپیاگێڕان بەشوێنەوارە دێرینە و، مێژوو‌ییەکانییا. منارە بەرز و گومەزە شینەکانی ئەصفەهان، لەناو چنار و سەروە بەعاسمانا چووەکانا وەکو پیرۆزە و زمروت ئەدرەوشێنەوە...

کۆنترین مزگەوت لە ئەسفەهاندا (مزگەوتی جومعە)یە، کە بە (مەسجید جامیع) بەناوبانگە، کەس نازانێ ئەم مزگەوتەکەی دروست کراوە؟ بەڵام لەو شتانەی کە لە مێژوودا دەربارەی ئەم مزگەوتە تۆمارکراوە دەرئەکەوێ لە سەردەمی خەلافەتی ئەلموعتەسەم بیللای عەبباسیدا یەحیا کوڕی عەبدوڵلا مالیک خوزاعی مزگەوتەکەی گەورەتر کردۆتەوە.

لە سەردەمی پۆستنشینی و خەلافەتی ئەلمەوقتەدیر بیللادا ئەحمەد کوڕی مەسرور هەندێکی تری خستە سەر مزگەوتەکە، لەو مزگەوتەدا وەزیری بەناوبانگ و نووسەری پایەبەرز ساحێب کوڕی عەبباد ماوەیەک مامۆستا بووە، سوڵتان محەمەد خودابەندەی ئیلخانی، مزگەوتەکەی فراوانتر کردۆتەوە. لە سەردەمی سەفەویدا جێ ڕووخاوەکانی دروست کراوەتەوە، چەند شەبستانێکی بەدەورا دامەزرێنرا بۆ خەڵوەکێشا و بێ جێیان و، شەونخوونی کارانی پارسا و لە خواترس، ئەم مزگەوتە ئەوەندە زل و، ڕازاوە و، بەشکۆ و پڕ لە نەخش و نیگارە کە ئەوی سەرنجی بدا سەرسام ئەبێ و، واقی وڕئەمێنێ، تەنانەت لە کاشی ڕەنگامەکانی و لە نووسراوە سورمەیی و زێڕینییەکانی، جگە لەم مزگەوتە لەو شارەدا سەدەها مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی و کڵێسا و حوسێنییە و تەکیە و خانەقا هەیە، لە ڕووی عیرفانییەوە لەم شارە لە شارەکانی تری ئێرانا دوو دەستەی (حەیدەری) و (نیعمەتی) هەن، حەیدەرییەکان سەر بەقوتبەدین حەیدەر و نیعمەتییەکان سەر بە شا نیعمەتوڵلای وەلین.

لە نێوانی ئەم دوو دەستەیەدا لە سەردەمی سەفەویدا دووبەرەکییەکی بەهێز هەبوو هەم لە قەزوین و، هەم لە ئەسفەهان. لە سەردەمی شا عەبباسی سەفەویدا وەها ئەزانرا کە ئەم

دووبەرەکـیـیـە کـۆنە، ئەگـەڕێتـەوە بۆ دووبەرەکـیـی نێـوانی (عـەیـیـاران) و (جـەوانمەردان) وەیاخۆ دووبەرەکـیی نێـوانی (لوطی)یان و (مـەشـهـەدی)یان هەروا ئەو دووبەرکـیـیـە لەناو دوو دەسـتـەی (تەوەڵلاتیـان)[1] و (تەبەڕائیـان)یشـدا[2] هەر هەبوو لە شـیـرازیشـدا حەیدەری خانە و نیعمەتی خانە دامەزرێنرابوو ئەمانە لەسەر ئەوەی کە هەریەکەیان ئەتوانێ چەند مـزگـەوت و حوسـێنییـە، بەپەرچەمی پرسـەی حـوسـێنی ڕەشپـۆش بکات و، یا کـام دەستەیان زۆرتر بچێت بۆ زیارەتی بارەگای یەکێک لە پێشەوایان و ئیمامزادەیان، شەڕیان ئەبوو... شا عەبباسی سەفەوی ڕێی نەئەدا کە شەڕ لە نێوانیـانا هەڵ بگیرسێ. ئەم دوو دەستەیە لە سەردەمی زەندییەش و قاجاریشدا هەر هەبوون.

## موزیک

وێرانەی قـەڵای تەبەرەکی ئێستە لە سەردەمی کـۆنا سـەردارانی ئەسفەهان گـەنجـینەی وڵاتیـان تیـا ئەشـاردەوە و گـۆیا لە سـەردەمی ڕوکن الدەولە حـەسـەن ئال بویەدا دروست کراوە. بازاڕی ئەسفەهان تەنانەت قەیسەرییە گەورەکەی زۆر بەناوبانگە لە سەردەمی ناسر خەسرەوەوە تا ئەم سەردەمە هەر گەشتیار و گەڕیدەیێ چووەتە دیدەنیی بازاڕی کە بەتانی خۆشی و جوانی و زۆر و زەبەندەیی دوکان و کاروانسـەراکانیدا چووە. لە سـەردەمی ناسر خوسرەوا لەم بازاڕەدا دووسـەد (سـەڕاف) هەبووە کە ئەمڕۆکە جگە لە سـەڕاف، بانکێکی زۆری تێدایە و هەر بانکە چەند لق و چڵی هەیە. ئەسـفەهان باغـاتی مـیـوەی زۆرە: بەهی و، سێـو و، هەرمێی ئەسـفەهان - نایابترین جۆرە مـیـوەی ئێـرانن. دەغڵ و دانەوێڵـە وەک گەنم جۆ برنج هەروا توتن تەماکو و زەعفەران و شتی تری دەسکەوتی شارەکەیە.

کـردی دەسـتـیی ناو شـار و دەوروبەری: مـافـوور و، بەڕە و کـالای پەمـۆیی و کـاڵای هەوریشـمی تەنانـەت مشـکی و هەوری و، چەتفە، هەروا جۆرجۆری خەنجەر و شـمشـێر و مـێناتوریی ئەسـفـەهان ناوبانگێکی هەیە، تەنانەت ئەو قـوتووە جـوانانەی بۆ شـیـرینی و جگەرە و شتی تر دروست ئەکرێن.

کارخانەی زۆر و زەبەندە لە ئەسفەهان دامـەزراوە گەورە و بچووک کە لە وتاری ئایندەدا لێی ئەدوێین تا وتاری داهاتوو بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەخۆشی و شادی بڕوات.

---

(١) تَوَلّأنیان.

(٢) تَبَرّأنیان.

**وتاری: ١٠٦**

گوێگرە بەڕێز و بەهەستەکانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێران! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەخۆشی و شادی ببەنە سەر و، هۆی شانازییە بۆ ئێمە کە چەپکە گوڵی ڕێزمان بەدیاری وەربگرن.

ئێمە لەم وتارەشا هەر لەسەر باسی سپاهان واتا ئەسفەهان ئەڕۆین.

خۆتان دەزانن کە باس و بەسەرهاتی ئەم شارە و، هەرێمەکەی لەوانە نییە بەچەند وتاری دوایی بێ و، دەبێ چەند بەرگ کتێبی دەربارە بنووسرێ، نەوەک تەنیا ڕیزێ وتار... بەڵام ئێمە بۆ ئەوەی هەمیشە مەبەستی تازەتر بەگوێگرە بەڕێزەکان پێشکەش بکەین بەدوو وتاری ئایندە دوایی باسەکە ئەهێنێن.

موزیک

ئەسفەهان ئەمڕۆکە ناوەندی ئوستانی دەیەمی وڵاتی پانوپۆڕی ئێرانە. سنووری چوار لای بەم چەشنەیە:

لای باکور و ژووری: سنووری ئوستانی ناوەندییە واتا ئوستانی تارانی پایتەختە...

لای باشوور و خوارووشی سنووری دوو ئوستانی هەفتەم و هەشتەم - واتا فارس و کرمانە.

لای خۆرهەڵاتیشی کەویری لووت و سنووری ئوستانی نۆهەم - واتا خوراسانە.

لای خۆرئاواشی سنووری فرمانداری گشتیی چەهار مەحاڵی بەختیارییە، کە ئەمساڵ کرا بەئوستان و سنووری فەرمانداریيەکانی بویر ئەحمەدی و هی ترە.

پێوانەی سەر زەویی ئەم ئوستانە ١٧٣٩٩٩ کیلۆمەتری چوار سوچە و، لە ڕووی جوغرافییەوە هەرێمێکی فراوانی لەسەر زەویی خاکی ئێران داگیرکردووە و لەلایەکەوە ئەکەوێتە نێوانی لای داوێنی خۆرهەڵاتی ڕیزە چیای زاگرۆس و ڕیزە چیاکانی ناوەندیی وڵاتانی ئێران.

ئەم ئوستانە لە ساڵی ١٣٤٥ بەدواوە بەش ئەکرا بەوە ١٠ شارستان و ٢ بەخش مەبەست لە شارستان یەکەیەکی بەڕێوەبەرایەتییە لە ئوستان بچووکتر و لە بەخش گەورەترە و لە کوردستانی ئەودیو پێی ئەوترێ (قائیمەقامیەت)، بەخشیش یەکەیەکە لە شارستان

بچووکتر و لەودیو، پێی ئەوترا (ناحیە). دە شارستانەکە ئەمانە بوون: (١) خود ئەسفەهان. (٢) فەریدن -کە لە کاتی خۆیا پێی ئەوترێ داران-. (٣) شەهرەزا کە لەپێشا پێی ئەوترا (قومشە). (٤) ئەردەستان. (٥) نائین. (٦) نەجەف ئاباد. (٧) گولپایەگان کە عەرەب وەریان گێڕاوە بە (جورباذەقان) وەیا (جورڤادەقان). (٨) نەتەنز. (٩) سەمیرەم. (١٠) یەزد بەڵام ئەمساڵ شارستانی یەزد کرا بەئوستان و چەند شارستانێ لەم شارستانانە خرایە پاڵ ئەو...

دانیشتوانی ئوستانە کە بەپێی ئەو سەرژمێرییەی ساڵی ١٣٤٥ فارسی ئەنجام دراوە ئەگاتە ١,٧٠٤,٧٢٦.

لە ئەسفەهاندا شێوەی خوێندەواری پێشکەوتووە، دانشگای ئەسفەهان یەکێکە لە دانشگا بەناوبانگەکان و، جێی لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژوویی و هونەری و پیشەییە... لەم ئوستانەدا تەنانەت لە خودی شاری ئەسفەهاندا بەپێی ژمارەیەک کە لە کتێبی (راهنومای شەهرەستانها)دا ساڵی ١٣٤٥ فارسی تۆمارکراوە، سەدەها دەبیرستان و قوتابخانەی ناوەندی و قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە هەروا ئاموزشگای پیشەیی، ئاموزشگای هونەری، ئاموزشگای کشتوکاڵیشی هەیە و کتێبخانە بەناوبانگەکانی ئەسفەهان ئەمانەن: کتێبخانەی فەرهەنگ کتێبخانەی دانشکەدەی ئەدەبیات...

لە ئەسفەهاندا چەند ڕۆژنامە و گۆڤار دەرئەچێ: لە هەموویان گرنگتر گۆڤاری دانشگایە ئەو دوای بریتین لەم چاپەمەنییانە:

نیدای شەهرەزا - ئەولیای ئەصفەهان - خەبەرهای روز - حەیات ئیسفەهان - راه نەجات - ستارەی ئەسفەهان - عیرفان - موجاهید - موکەرەم... لە ئەسفەهان و شارستانەکانیدا زۆر گوێ دراوە بەلایەنی بیهداشت و بەرەنگاری لەگەڵ نەخۆشی و، ئەو نەخۆشییانەشی کە هێشتا لە ڕیشە دەرنەهێنراون و ئەمانەن: سورێژە - زگچوون - تەراخومای چاو - کۆکە ڕەشە - و هی تری. لە ئوستانەکەدا نەخۆشخانە زۆرە تەنیا لە شاری ئەسفەهاندا ژمارەی نەخۆشخانە گەورەکان ئەگاتە ١٤ و، دەرمانگا و داروخانە و، جێی تیماری سەرەتایی و، دەرزی لێدان ژمارەیەکی باشی تیا هەیە.

لە ئەسفەهاندا هوتێل زۆرە. هوتێلی شا عەبباس لەو هوتێلانەیە کە گەڕیدە و گەشتیارەکان ئەچنە سەیرانی، سینەما و تیاترو، ڕستورانی ڕازاوە و، گەرماوی ئاینەکاری جوانی تێدایە.

لە ئوستانی ئەسفەهاندا دوو بناوانەی زۆر گرنگ هەڵبەستراوە، یەکێکیان سەدی نادر شایە کە بەسەر ڕووباری مارونەوە دامەزرێنراوە و، ئەوی تریان سەدی شا عەبباسە کە بەسەر ڕووباری زایەندەڕودەوە دروست کراوە و، هێزی بەرق و کارەبا ئەخاتەوە بەڵام لەبەرئەوەی تۆڕی ئاوەکەی کەم بوو، بەفەرمانی شاهەنشا ئاریا میهر کێوی (کارکونان) کون کرا و، ئاوی (کوهرەنگ) تێکەڵ بەزایەندەڕود کرا و، بەم ئاوە پێ دەشتەکانی ئەسفەهان ئاویژە کراوە. لەبەرئەمەیە کە ئوستانی ئەسفەهان دەسکەوتی دەغڵ و دانەوێڵە و پەمۆ و پەتاتە و سێوی زەوی و توتن و میوە و سەوزە و شتی تری یەکجار زۆرە لە ئەسفەهاندا کارگە و کارخانەی پیشەسازیی هەمەچەشنە زۆرە، وەک کارگەی چنین، کارگەی هەلاجی، کارگەی ڕستن، کارگەی جۆڵایی و زۆر جۆرە کارگەی تری هەروا لە ئەسفەهاندا کارخانەی ئاسن تواندنەوەی ئاریا میهر دامەزراوە کە لە خۆرهەڵاتی ناوەندا بێ وێنەیە...

ئێمە لە وتارێکی ترا بەتایبەتی دەربارەی ئەدوێین، ئێستە کاتمان تەواوبوو - شەوتان خۆش.

***

**وتاری: ١٠٧**

گوێگرە بەرێزەکان کامەران و شاد بن، هەروەکو بەڵێنمان دانێ بەم وتارە باسی سپاهان واتا ئەسفەهان دوایی ئەهێنین، ئەم وتارە کورتە و، گەڵاڵەی سەدەها وتار و سیپارەیە، کە دەربارەی کارخانەی ئاسن تواندنەوە، نووسراوە کە لە ئەسفەهان دامەزرێنراوە و، ناوی نراوە (کارخانەی ئاریا میهر).

ئەوەی ڕاستی بێ لە سەردەمی شاهەنشاهی ڕەزا شای گەورە وە، تا ساڵی ١٣٤٤، نیازی دامەزراندنی کارخانەی ئاسن تواندنەوە، لەناوا هەبووە، بەڵام ئیمپریالیزم هەمیشە کۆسپ و قۆرتی ئەخستە ڕێی دامەزراندنی... بەڵام شاهەنشای خاوەن ورەی ئێران، ئاریا میهری ڕاد مەرد کە هەمیشە بەرامبەر بەئیمپریالیزم وەستاون و، پڵنگانە چنگی کردووە بەچنگی دوژمنان و، بەدنیا زانا و، هەوڵی داوە کە نیازەکانی خۆی و گەلی ئێران بسەپێنێ بەسەر ئیمپریالیزم و، زۆردارانا... لەم ڕێیەدا لەگەڵ زۆر لە وڵاتە خاوەن پیشەسازییەکانا، کەوتە دووان و بیروباوەڕ گۆڕینەوە تا سەرئەنجام توانی لەگەڵ کۆماری یەکێتی شورەوی ڕێک بکەوێ لەسەر دامەزراندنی کارخانەی ئاسن تواندنەوە و، ڕۆژی ٢٣ی مانگی دەی ساڵی ١٣٤٤ی فارسی واتا ٢٣ مانگی بەفرانباری ساڵی ٢٦٧٥ی مادی لە شاری مۆسکۆ پەیمانی دامەزراندنی کارخانەی ئاسن تواندنەوە، مۆرکرا: لە نێوانی کیشوەری شاهەنشایی ئێران و کیشوەری کۆماری یەکێتی شورەویدا و، لە (٧) مانگی ئەسفەندی هەمان ساڵا، واتا لە مانگی ڕەشەمێدا فەرمانی شاهانە، لەم بارەوە دەرچوو، لە کۆڕی نوێنەران و پیراندا -واتا لە دوو مەجلیسی شورای میللی و سەنادا - پەسەند کرا سەرئەنجام لە ٢٣ی مانگی ئەسفەندی ساڵی ١٣٤٦ی فارسییا -واتا لە ڕەشەمەی ساڵی ٢٦٧٥ی مادییا بەردی بناغەکەی بەدەستی شاهەنشا ئاریا میهر دانرا و، ئەو تەختە زێڕینەی کە مێژووی ڕۆژی دامەزران و، مەتنی فەرمانەکەی شاهەنشا ئاریا میهری لەسەر نووسراوەس دامەزرێنرا و جێ ساختمانی کارخانەکە لە دەشتی (تەبەس) دیاردی کرا، کە ئەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتیی ئەسفەهانەوە، بەدوورایی ٤٦ کیلۆمەتر و، بەرلەوەی ساڵ بگاتە پایان کاروباری ساختمانەکە دەس پێ کرا.

موزیک

ئەو کارخانە و دەزگایانەی لەبەرا بەناوی ئامادەیی و پێشدەستی دامەزران، ئەمانە

بوون: کارخانەی دارِژتنی بوتون و مەلات... کارخانەی ئارمار تورسازی... عەماری لم و قوم و زیخ... کارگەی ئامادەکردنی شیرەی قسڵ و ئاهەکی (پلێگون) بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کەرت و پارچەیانەی بوتونی لێ پێک دێ... کارخانەی دارتابی و قاڵب دروستکردن... کارخانەی نوێکردنەوە و، دووبارە دارِژتنەوەی ئەو پارچە فلیزییانەی کە لەسەر چەشنێکی سادە و و نائاستاندارد بۆ هەندێ کاروباری کارخانەکە بەکار ئەبرێ...

دەزگای تفاق و شتومەکی تەکنولۆژی... ساختمانی سافی و سەلامەتی و نەخۆشخانە... کارخانەی دروستکردنەوەی ٤٠٠ دەزگایی بۆ خاوێنکردنەوە و سازکردنەوەی ئۆتۆمۆبێل و ماشێن و لۆری و کامیۆنەکانی کارخانەکە... کارخانەی سازکردنەوە و، دروستکردنەوەی ماشێنی گەورەی ساختمانەکە... کارخانەی ئامادەکردنی قوم و زیخ و بەرد هارین... عەمارگەلی گەورە و زل بۆ جێی ئەم کەرەسە و تفاقانە.

موزیک

پاش ئەوەی ئەم پێش دەستی و کارە پێشەکییانە ئەنجام درا، ڕۆژی ٢٣ ئەسفەندی ساڵی ١٣٥٠ فارسی واتا ٢٣ ڕەشەمێی ساڵی ٢٦٧٩ی مادی، کە هاوکات بوو لەگەڵ یادی دامەزرانی... کارخانەکە، مەفازی یەکەمی کارخانەی ئاریا میهر کەوتە (چدن) خستەوە و ئەمە یەکەم بەهرەی کارخانەکە بوو...

موزیک

ئەو کەرەسە خاوانەی ە بۆ ئەم کارخانەیە پێویستە ئەمانەی خوارەون، کە لە زۆر جێی خاکی ئێران بەدەس ئەهێنرێن و بەزۆر ڕێدا ئەگەنە کارخانەکە...:

- یەکەم (بەرد ئاسن) کە لە (جغارەت بافق) دەرئەهێنرێ کە ئەکەوێتە لای باشووری خۆرهەڵاتی کارخانەکەوە، بەدوورایی ٤٦٦ کیلۆمەتر...

- دووەم: (ڕەزوبەرد): واتا خەڵوز بەردی کانییە، کە لە کانگاکانی (ژێرئاب) و (سەنگ ڕود) و (شا ڕود) دەرئەهێنرێ کە ئەکەونە باکووری وڵات و لاپاڵەکانی چیای ئەلبورز و هەرێمی کرمان... کە دوورترینیان لە کارخانەکەوە ٧٠٠ کیلۆمەترە.

سێیەم: بەردی ئاهەک کە لە پیر بەکران دەرئەهێنرێ کە ئەکەوێتە باکوری کارخانەکەوە بەدوورایی ٥٠ کیلۆمەتر.

چوارەم: بەردی مەنگەنیزە کە لە دەوروبەری قوم دەرئەهێنرێ.

پێنجەم: کوارتزیتە کە لە دەوروبەری مەتەکستانی ئەردەکانی یەزد بەدەس دێ.

شەشەم: خۆڵی نەسوتە، کە لە سمیرەم دەردێ...
حەوتەم: دولمیتە کە لە کانگای لاچولە دەرئەهێنرێ کە ئەکەوێتە ١٠٠ کیلۆمەتری کارخانەکە و، جگە لەمانە زۆربەی پێتەویستیی کارخانەکە هەر لە خود وڵاتی ئێرانا دابین ئەکرێ.

موزیک

بابێینە سەر بەشە گرنگەکانی کارخانەی ئاسن تواندنەوەی ئاریا میهر کە لەمانە پێک دێ:

یەکەم: کارگەی بەرهەمهێنانی کێکە کە جۆرە گارێکی سووتەمەنییە لەگەڵ بەرهەمە وەچییە کیمیاییەکانی... وەک قەتران - سولفات ئالومینیم - فنل - ئاکسلین - تۆلوئین.
پاش ئەوەی ئەم شتانە لە گاری کێک هێنرانە بەرهەم، گاری کێک وەرئەگەرێ بەسووتەمەنی و ئەکرێتە پاترییەکانەوە. کارخانەکە لەم قۆناخە سەرەتاییەدا ساڵانە ١٠٠٠٠٠ تومان کێک ئەهێننە بەرهەم کە ٧٦ هەزار تۆنی لێ ئەفرۆشرێ و ئەو دوای لە خود کارخانەکەدا ئەبێ بەسووتەنی.
دووەم: کورە بەرزەکەیە: کە ناونراوە(دڵ و هەناوی کارخانەی ئاریا میهر) ئەم بەشە گرینگترین بەشی کارخانەکەیە و، ناوەندی بەدیهێنەری جموجۆڵ و کردەوەی کارخانەکەیە رۆژانە نزیکەی ١,٨٠٠تون (چدن) ئەخاتەوە. ئەم کارخانەیە ئاوێکی زۆری ئەوێ لە ساتێک ٣٩,٠٠٠ هەزار مەتری چوارینیی قووڵ، ئاوی ئەوێ لە بنەوانەی شا عەبباسی گەورە، وەرئەگیرێ.
پلەی گەرما ئەم کورەیە بۆ تواندنەوەی چدن ئەگاتە ١,١٠٠ هەزار و سەد پلە... کارگە و کارخانەی وەچی، لەناو ئەم کارخانەیەدا زۆرە: گرنگتریان کارگەی داڕێتنی پۆڵا و کارگەی لوولکردنی ئاسن و پۆڵایە.
بەرهەمی کارخانەکە لە ساڵا ٥٥٠ هەزار تۆنە و، ئەم بەرهەمە ساڵ بەساڵ بەرەو تەنینەوە و، پەرەسەندن ئەڕوات.
لەم کارخانەیەدا ٢٤ هەزار کەس کار ئەکەن ٧٠٠ کەسیان ئەندازیارە ٥٤٨ کەسیان پسپۆری کارزانە ١١ هەزار کەسیان کارگەری کارە و شارەزایە.
ئیتر کاتمان تەواوە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ

٢٢ رەشەمێ ٢٦٨١

***

**وتاری: ١٠٨**

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان خۆش. ئێمە ئەمشەو باسی (سەراب) دەکەین. (سەراب) ناوە بۆ چەند جێیەک. لە بەشی باکور و خۆرئاوای ئێراندا...

بەناوبانگترینیان ئەمانەن:

(سەراب فشن) کە سەر بەبەخشی کەنگاوەری کرمانشانە... (سەراب خودابەندەلو) سەر بەبەخشی قروەی کوردستانە... (سەرابی لیلاخ) سەر بەکوردستانە... (سەرابی بیجار سەر بەکوردستانە... (سەرابی دلفان) سەر بەلوڕستانە و (سەرابی بیهیی) لای بوکانە... و (سەرابی لای تەورێز)... کە ئێمە لەم وتارەدا لێ ئەدوێین.

موزیک

سەراو شارۆلکەیەکە لە خۆرهەلاتی چیای سەبەلان دایە بەلای باشوور و قیبلەیەوە... مێژووی کۆنی نادیارە، بەلاّم لە کاتی کاکە سپای ئیسلام ئازەربایجانی داگیر کردووە هەر هەبووە... جوغرافیانووسانی عەرەب بەهەڵە ناویان ناوە (سەراە) و بە (تێی) خڕ نووسیانە...

ئیبن حەوقەل ناوی ئەم شارۆلکەیەی بردووە و ئەڵێ: سەراو شارۆلکەیەکی قنجیلانەیە. دەوروبەری ئاوێژەیە و پڕە لە کیلگە و باغ ئاسیاویشی زۆرە... بازاڕێکی گەورەی هەیە... میوانخانەکانی پاکوخاوێن... لە سەردەمی فەرمانداریەکانی (شەدادی و ڕوادی و سالاری)یا کە کوردەکان فەرمانڕەوایان بوون و، لە سەردەمی دەسەلاّتی عەبباسییا پێکیان هێنابوون، ئەم سەرابە لەژێردەس ئەوانا بوو... ساڵی ٦١٧ کۆچی مەغۆل وێرانیان کرد و خەڵقەکەیان قڕان کرد. بەلاّم سەد ساڵێکی نەبرد خەڵق لەو ناوەدا کۆبوونەوە شارەکەیان ئاوەدان کردەوە لە سەرەتای سەدەی هەشتەمدا واتا سەد ساڵی پاش وێرانبوونی موستەوفی قەزوینی لێی دواوە و، دەربارەی نووسیویە: شاری (سەراو) کە ئەکەوێتە لای خۆرهەلاّتی چیای سەبەلانەوە، بەلای قیبلەیا، شارێکی سەردەسێر و ئاوێژەیە ئاوی ڕووباری (سەراو) پاراوی دەکات. ئەم ڕووبارە ئاوی سەرچاوەکانی چیای سەبەلانە... بەرەو زەریاچەی ڕەزائیە کە لەمەوبەر ئورمێیە و چیچەستیشی پێ ئەوترا... ڕەوانە سەد پارچە دێی بەدەورایە کە سەر بەچوار ناحیەن (وەرزند - دەرەند - بەراغوش - سقهیر) بەلاّم ئەمڕۆکە لەم چوار ناحیەیە کە لەو سەردەمەدا هەبووە تەنیا (بەراغوش) ماوەتەوە کە

یەکێکە لە دێهستانەکانی دەوروبەری سەراب.

شاری سەراب ١٧٠٠ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە، ئاووهەواری ئەو ناوە بەپێی بەرزی و نزمی سەر زەوییەکەی دوو جۆرە: هەوای پێ دەشتەکە ناوەنجییە و، هەوای چیاکە زۆر ساردە - ڕووبارەکانی سەراب ئەمانەن: ڕووباری پشو و ڕووباری نسویون کە هەردووکیان لە چیای سەبەلانەوە دێتە خوارێ و ڕووباری وانقا لە چیای بزگوش سەرچاوە وەرئەگرێ...

جا سەراب هەروەکو ناوە بۆ شارۆلکەیەک، ناوە بۆ ئەو شارستان یا ئەو فەرمانداریەش کە سەراب ناوەندێتی...

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٥ فارسی ژمارەی خەڵقی ئەم شارستانە تێکڕا ١١٥.٩٣٢ کەسە، خەڵقی ئەم ناوە ئێستە بەشێوەی ئازری قسە دەکەن... بەڵام بەر لە دەورانی مەغۆل لەم خاکەدا یەک تورکمانیش نەبووە، هەموویان بەشێوەی کوردی قسەیان دەکرد کە برێتییە لە شێوە زمانێکی فەیلی و گۆرانیی تێکەڵ و پێکەڵ...

لەو ساختمانە دێرینەیانەی کە زۆر کۆن بێ تەنیا مزگەوتە گەورەکەیە ئەڵێن هی سەردەمی خەلیفەی دووەمە... لەم شاری سەرابە و لە دەوروبەریا دەیان قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. هەروا چەند قوتابخانەی ناوەنجی و مامۆستایشی هەیە، قوتابخانەی کشتوکاڵی و باغچەی مناڵانیشی هەیە و تیایە.

جێی وەرزش... نەخۆشخانە... دەرمانگا... داروخانە... سارمانی خێراتی تیایە... ئاوی شار هی لوولەیە... بەرق و کارەبا و تەلگراف و تەلیفۆن و پۆستەی تیایە... چەند خۆراکخانەی باش و ٢٠ خۆراکخانەی ناوەنجی تێکڕایی و چەند گەرماوی خاوێن و چاخانە و چەند مێوانخانە و هوتێلی تیایە.

در ئامەدی ئەو ناوە هی دەسکەوتی کشتوکاڵی وەک گەنم، جۆ، برنج، توتن، پەتاتە و سێب زەمینی، پەمۆ، شتی تر و هەروا هی ئاژەڵییە وەک خوری، پێستە، ڕۆن، ماست، شیر و، شتی تری...

کردی دەستیی ئەو ناوە بەڕە، جاجم، مافوور و قالییە...

کارگە و کارخانەی نەجاڕی و، دارتاشی، ئاسنگەری و، جۆشکاری و، کەوشسازی و، خشتی سوورکراوە و موزائیک و شتی تری تیایە... تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و کاتێکان خۆش.

## وتاری: ١٠٩

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

ئەمشەو باسی (سەربێڵ) دەکەین. ئەم ناوە کە وەرگەڕاوە بەکوردی، لە بنەڕەتا فارسییە لە وشەی سەر پولەوە هاتووە کە ئەکات (سەر پرد) و لەوێوە بڕاوە بەسەر شارۆلکەکە و، بەخشەکەدا کە بەسەر ئاوی ئەڵوەندەوە کە حەلەوانیشی پێ ئەوترێ پردێکی زلی دوو چاوە بەسەر ئاوەکەوە دامەزراوە... و پاشان ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکە بووە بەشارۆلکە و ناونراوە (سەربێڵ) و دەوروبەریشی ناونراوە بەخشی (سەربێل). ئێمە لە سەرەتادا باسی شارۆلکەکە دەکەین. ئەم جێیە لە سەردەمی زۆر کۆنا شار بووە. ناوی خەڵمانو بووە لە دەورانی فەرمانڕەواییەکانی ناو چیاکانی کوردستانا تەنانەت لە سەردەمی پادشایەتی (ئانوبانینی) پادشای (لولوبی)دا هەبووە...

پاشان خەڵمانو کەوتۆتە ژێر چنگی ئاشوورییەکان، ئینجا ماد و بەخت النەسری فەرمانڕەوای دەوڵەتی کلدانی، بابلیش، شالاوی کردۆتە سەر خاکی ئورشەلیم و جولەکەکانی بەدیل گرتووە و هێناونییە بابل و پاشان بەکوردستان و هەرێمە چیاییەکانا تا ئەسفەهان تەرتە وەرتەی کردوون، هەندێ لەو جولەکانە لە شاری حەلەواندا ژیاون و ئەم شارە لە دەورانی ساسانیدا زۆر ئاوا و ڕێکوپێک بووە و لە دەورانی ئیسلامدا بەناوی حەلەوان بەناوبانگ بووە و لە دەورانی مەغۆل و تاتاردا وێران کراوە تا ئێستەش وێرانە و کەلاوە دێرینەکانی بەم بەر و بەوبەری ڕووبارەکەوە هەر ماوە...

مۆزیک

ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسیش کە بەبەشی خۆرئاوا و باشووری وڵاتی ئێرانا گەڕاوە و سەر زەوییەکانی کوردستانی پشکنیوە لە ئەنجامی کۆششی پشکنینا تاشەبەردێکی لەسەر نووسراوی دۆزیوەتەوە کە بەر لە ئەو کەس ڕێی پێ نەبردووە، ئەم کێلە بەردە نووسراو و وێنەگەلێکی لەسەر هەڵکەندراوە و کراوە بەچوار بەش:

بەشی یەکەم کە بەلای چەپ دایە (ئانوبانینی) پادشای (لولوبی) وەستاوە. قەمچییەکی بەدەستەوەیە و کابرایەکی لەسەر پشت خستووە و بەچزمەوە پێی ناوە بەسەر سنگییا. لە بەشی لای ڕاستەوە خواچە -واتا ئیلاهـ- (نی نا) - وەستاوە و خەریکە دوو دیل ئەسپێرێ بەئانوبانی. یەکێ لە دیلەکان قەرازە کراوە، هەڵقەیێ خراوەتە لووتی و پەتی

یا زنجیریکی پێوە بەستراوە، بۆ سەر ڕاکێشان. بەشی لای خواری بەردەنووسەکەشی کردووە بەدوو بەش، لای چەپەوە وێنەی شەش دیل هەڵکەندراوە کە یەکێکیان بەپێی تانج و ئەفسەرەکەی پادشایەک بووە. بەرامبەر بەئەوان لای ڕاستەوە نووسراوەیێ نەخش کراوە.

٢٣ دێڕی ستوونییە لە سەرەوە بەخوار، بەشێوەی نووسینی مێخییەوە بەشی پاوەمانەکەی سڕاوەتەوە نازانرێ باران کاریی تێ کردوە یاخو دەستی نەخوێندەوارانی پێگەیشتووە و لە ناوی بردووە - ئەم بەردە نووسەی ئانوبانی بەقەدپاڵی کێوی هەزار جەریبەوەیە... بەردەنووسێکی تری ئەو سەردەمەش بەلای چەپی چیاکەوەیە... بەردەنووسی سێیەم بەسەر کێوەکەوەیەوە بەناوی کێلی ئەردەیانی ئەشکانی بەناوبانگە... جگە لەمانە بەدووراییی سێ کیلۆمەتر بەلای باکوری کێوی هەزار جریبەدا گۆڕستانێ هەیە گۆڕەکانی کوتوموت لەو گۆڕانە ئەچێ کە لە پەرس پولیس هەیە نووسراوەکە کەمتر بەسەر کێلەکانەوە ماوە هەمووی لە لایەن خەڵقی ئەو ناوەوە لەناوبراوە... لەنێو ئەم گۆڕستانەدا کێلەبەردێکی چوارگۆشە هەیە وێنەی ڕابەرێکی ئاینی ئەم سەردەمەی لەسەر کێشراوە کە بەپێوە وەستاوە چەپکێکی بەدەستەوەیە. وا دیارە خەریکی ڕازونیازە و کوردە گۆڕانەکانی ئەو ناوە پێی ئەڵێن (کەڵ داود) واتا داودی گەورە و، گرینگترین جێگای ڕازونیازی دەستەی (ئەهلی حەقە). بێ گومان ئەم (کەڵ داود)ە کە دوکان (داود)یشی پێ ئەڵێن هەر داو و دیباوسی خوای کۆنی ناری ڕەگەزەکانە، کە ناوەکەی گۆڕاوە و لای کاکەییەکان بووە بە (داو) و لای یەزیدییەکان بووە بەدیاووس و تاوس و لە هەزاران ساڵەوە تا ئەمڕۆ ئەم خوا کۆنەی کورد لە چەند بەشێکی کوردستانا بەشێوەی جۆراوجۆر ئەپەرسترێ و بەجۆرێکی تایبەتی لە لایەن کاکەییەکانەوە بەڕێز ناو ئەبرێ و سوێنی پێ ئەخورێ... وشەی (کەڵ)یش کە بووەتە پێشبەند، نازناوی مەزنایەتی و گەورەییە و ئێمە کە دەربارەی وشەی (کەلهوڕ) دوابووین ئەوەمان ڕوون کردبووە کە (کەلهوڕ) بریتییە لە دوو وشەی (کەڵ هوڕا) -واتا ئاهوڕای مەزن پاشان وشەکە داتاشراوە بووەتە (کەلهوڕ) (کەلوڕ)...

جگە لەم سێ بەردە نووسە، جێگەیەکی تری هەیە ناوی (تاق فەرهاد)ە ئەم تاقەش هی دەورانی مادە، بەڵکو کۆنتریشە و، ئەم تاق فەرهادە بۆمان دەرئەخا کە باسی فەرهادی کێو کەنی قارەمانی کەلوڕ زۆر لە سەردەمی ساسانی کۆنترە، تەنیا ئەو چیرۆکی دڵدارییەی کە بەسەر زمانانەوە بووە، ماوەتەوە تا سەردەمی ساسانی و لەو سەردەمەدا جارێکی تری بەناوی فەرهادی دڵداری شیرین سار و بەرگێکی تازەی کراوە بەبەرا...

گوێگرە خۆشەویستەکان باسی (سەرپێڵ) زۆری ماوە تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەو کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

**وتاریک -١١٠**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە شەوتان باش. هیوامان کامەرانی و بەختیاریتانە. لە وتاری پێشوو باسی (سەرپێڵ)دا گەیشتینە ئەوێ کە وتمان: (مسیو ژاک دومورگانی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی) یەکەم کەس بووە کێلی بەردەنووسی سەرپێڵی دۆزیوەتەوە و، نووسراوەکەی سەر کێلەکەی خوێندۆتەوە... و ئێستە بگەڕێینەوە سەر باسەکە...

موزیک

لە ڕووی جوغرافییەوە شارۆلکەی سەرپێڵ ئەکەوێتە سەر شەقامە ڕێی (قەسری شیرین - گێلانی غەرب - کرماشان) و ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی قەسری شیرین بەدووراییی ٣٠ کیلۆمەتر، ڕ لە خوار کرماشانەوەیە بەدووراییی ١٤٧ کیلۆمەتر. بەرزاییی سەر زەوییەکەی لە ڕووی زریەوە ٥٣٤ مەترە. ڕووباری (ئەڵوەند) کە ڕووباری حەلەوانیشی پێ ئەڵێن بەناوەندی شارۆلکەکەدا ئەڕوات. بازاڕی شارۆلکەکە و خانووەکانی ئەکەونە لێواری شەقامە ڕێی کرماشان - قەسر کە بەکەناری ڕووبارەکەدا، تێ ئەپەڕێ. ژمارەیماڵەکانی سەرپێڵ ئەگاتە ٦٠٠ ماڵێ و، دانیشتوانی ئەگاتە ٣,٥٠٠ کەسێ. ژمارەی دوکانەکانی بازاڕەکەش ئەگاتە ٣٠٠ دوکانێ، جگە لەمانە گەراجی ئۆتۆمۆبێل و، مێوانخانە و، خانی کاروانچیشی تیایە. ئەم شارۆلکەیە ناوەندی بەخشی سەرپێڵە و سەر بەشارستان و فەرمانداریی قەسری شیرینە... دەزگا دەوڵەتییەکانی ئەم شارۆلکەیە بریتییە لە بەخشداری، شارداری، ژاندرمێری، پۆست و تەلگراف و تەلیفون و، نەخۆشەوانی... هەروا چەند قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و، قوتابخانەی ناوەنجیشی تیایە، مزگەوت و، حوسێنییە و، گەرماو و، بانگیشی هەیە... خەڵقی شارۆلکەکە و دەوروبەری هەموو کوردن، ڕچی ئایینییان شیعە، سوننی، کاکەییە و، چەن ماڵ جولەکەشیان هەیە. دانیشتوانی شارۆلکەکە زستانان لە هاوینان زۆرترن چونکە بەشی زۆریان خاوەن ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتن، بەهاران و هاوینان ئەچنە چیا و خەریکی کۆکردنەوەی خەلە و خەرمان ئەبن.

موزیک

ئاووهەواوی سەرپێڵ زۆر سازگار و خۆشە، گەرما و سەرماشی ناوەنجییە... لەم بارەوە (ژاک دومورگان) کە لە ٢٤ی مانگی شوبات -واتا فەبروەرییەوە- تا مارتی ١٨٩١ بەو ناوەدا گەڕاوە، بیروباوەڕی خۆی دەربڕیوە و ئەڵێ: ئێمە لە گەردەنەی (تەخت گەڕا)وە بەیەک قۆناغ گەیشتینە سەرپێڵ و لە زمهەریری سەرماوسۆڵە ڕزگاربووین و، کەوتیە بەهەشتی بەهارەوە، هەتاوی گەرمی میهرەبانی پێ دەشتی سەرپێڵ، ڕچی چوار مانگی زستانی سەختی چیاکانی لەلەش دەرکردین و، ماندوویتیمان حەسایەوە... لە بەهارا پێ دەشتی سەرپێڵ وەک ڕایەخی سەوزە، ولاتەکە پڕە لە دارودرەختی چنار، بی، میوە، تەنانەت هەنجیر، ترێ، سێو، لیمۆ و، پرتەقاڵ و نارنج و خورما... ئێمە کە بەم ناوەدا ڕائەبوورین ئەکەوینە یادی باغ و کۆشکی ئەفسانەیی خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی، کە ئەمڕۆکە هیچ جۆرە دێرینە و نیشانەیەکی بەرچاو ناکەوێ... لێرەدا قسەکانی ژاک دومورگان تەواوبوو...

## موزیک

بەخشی سەرپێڵ چوار دێهستانی هەیە:

یەکەم: دێهستانی بشیوەیە، کە ١٣ دێی بەدەورایە.

دووەم: دێهستانی پاتاقە، کە ١٣ دێی هەیە.

سێیەم: دێهستانی زەهاوە، کە ٣٩ دێی بەدەورایە.

چوارەم: قەڵای شاهینە، کە ٢٦ دێی هەیە.

ژمارەی سەرانی هەموو بەخشەکە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٥ گەییوەتە ١٤،٠٠٠ کەس.

ڕووبارەکانی ئەم بەخشە ئەمانەن:

ڕووباری حەلەوان (ئەڵوەند)، کە لە کێوی سپاهانەوە دێ، کە لە خوار ڕێژاوەوەیە و دێهستانی بشیوە ئاو ئەدا.

ڕووباری پاتاق: کە لای باکوری پاتاقەوە دێ و، لە ژوور کەڵ داودەوە تێکەڵ بەڕووباری ئەڵوەند ئەبێ...

ڕووباری سەراوی قەڵا شاهین، دێهستانی قەڵا شاهین ئاو ئەدات ئینجا ئەڕژێتە ئەلوەند.

ڕووباری سەراو گەرم: تەنیا سێ دێ سوودی لێ وەرئەگرێ.

ڕووباری قورەتو: کە لە چەند شیوێ پێک دێ.

کێو و چیاکانی بەخشی سەرپێڵ ئەمانەن:

کێوی شاڵەگوش... کێوی بەرزە کێو... و چەند زنجیرە کێوی ترە. بەرزایی لووتکەی کێوەکان لە ۱۹۳۰ مەترەوە تا ۱۰٦۸ مەتر، بەرزتر و نزمترە. بارەگای ئیمام حەسەن کە لەسەر یەکێ لە لووتکەکانە ۱۱٤٤ مەتر بەرزاییێتی...

لەم ناوەدا، هەروەک گەنم، جۆ، توتن، پەتاتە و سێو زەوینی و نیسک و نۆک ئەچێنرێ... هەروا چەلتوکیش زۆر ئەچێنرێ ئەمە بوو هەندێ زانیاری لە بارەی سەرپێڵەوە... تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۱۳۵۳/۱/۲۰

۲۰/نەورۆز/۲٦۸۲

## سەردەشت

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ، ئاواتەخوازی پێشکەوتن و سەرکەوتنی ئێوەین.

لەو حەوتەیەدا... ئێمە باسی (سەردەشت) ئەکەین و، لە سەرەتادا ئەڵێین: سەردەشت ناوە بۆ چەند جێیەک لە بەشی خۆرئاوا و لا خواری کیشوەری ئێرانا: یەکێ لەوانە سەردەشتی سەر بەمەهابادە کە ناوە بۆ بەخش و بۆ شارۆلکەیەک کە ناوەندی بەخشەکەیە و، بەستراوە بەشارستانی مەهابادەوە و لەسەر ئوستانی ئازەربایجانی خۆرئاوایە... یەکێ تریان سەردەشتی دزفولە، کە ناوە بۆ بەشێک و بۆ گەورە دێیەک کە ناوەندی بەخشەکەیە و سەر بەشارستانی دزفولە و کەوتۆتە ئوستانی خوزستانەوە جگە لەمانە ناوە بۆ دێیەک سەر بەشارستانی (لار)یش کە هەر سەر بەئوستانی خوزستانە... و ناوی دێییەکیشە سەر بەبەخشی فەریمانی شارستانی مەشهەدی ئوستانی خوراسان... و ئێمە لەناو ئەمانەدا، لە سەردەشتی سەر بەمەهاباد ئەدوێین...

موزیک

سەردەشت، بەخشێکە سەر بەشارستانی مەهاباد و ئەکەوێتە باشووری خۆرئاوای مەهابادەوە، باکوری دێهستانی مەنگوڕ، باشووریشی ڕووباری زێی بچووک، کە سنوورە لە نێوانی ئێران و عێراقدا... خۆرهەڵاتیشی دێهستانی گەورکی سەر بەشارستانی مەهاباد و نەمەشێری سەر بە بانەیە، خۆرئاواشی دیسان ئەو سنوورەیە کە بۆ ئێران و عێراق دانراوە... لە بەخشەکەدا ۱۹۰ دێی بچووک و گەورە هەیە... حەوت دێهستان پێک ئەهێنن، ژمارەی دانیشتوانی بەخشەکە تێکڕا ئەگاتە ۳۰ هەزار کەسێک... سەر زەوی شەش لە دێهستانەکان واتە بەشی زۆربەی خاکی سەردەشت چیایی و کوێستانییە و، بەجەنگەڵ و گژوگیا پۆشراوە... تەنیا سەر زەویی دێهستانی کەلاس پێ دەشت و ڕاستانە... ئاوی بەشی زۆری دێهاتی ئەم بەخشە هی ڕووباری (سەردەشت) و (بادین ئاوا)یە و، هی هەندێ کانی و سەرچاوەیە... بەپێی وتەی ژاک دومورگان سەر زەوی بەخشی سەردەشت: کانی (گرانیت خال دلیل) و چاترین مەرمەری سپی و، ئاهەکی زۆرە... کار و پیشەی

خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و فەلاییتی و، ڕان و ئاژەڵ بەخێوکردنە...

دەسکەوتی دانیشتوان: بەرهەمی کشتوکاڵییە، وەک گەنم، جۆ، برنج، توتن، پەمۆ، پەتاتە و سێو زەوینی و، نیسک و نۆک... ئەم بەخشە میوەشی زۆرە. تەنانەت ترێ، هەنجیر، هەرمێ... بەرهەمی جەنگەڵیش هەیە وەک: گوێز، بەڕوو، مازوو، سیچکە، قەزوان...

بەرهەمی ئاژەڵیش ئەمانەن: خوری، پێستە، شیر، ماست، پەنیر، ڕۆن... جگە لەمانە زۆر کەس هەنگیان هەیە و هەنگوین...

ئاووهەوای سازگارە... بەڵام زۆربەی هەرێمەکە سەردەسێرە بەجۆرێ کە لەمەوبەر لە ١٥ی کانوونی یەکەم بەدواوە، لەبەر بەفر زۆری ڕێگاکان ئەبەسترا تا بەهار... بەڵام لەم ڕۆژگارەدا بەهۆی تراکتۆر و بلدۆزەرەوە ڕێگەکان زوو ئەکرێنەوە... لە کۆندا عێلەکانی دەوروپشتی سەردەشت بریتی بوون لە: مەنگوڕ، گەورک، ئالانی، مەلکەری... و هی تری، کە ئێستە وازیان لە کۆچەری هێناوە و، لە دێکانا نیشتەجێن.

موزیک

بابێینە سەر شارۆلکەی (سەردەشت) کە هەڵکەوتی جێی خود ئەم شارۆلکەیە بووەتە هۆی ناوی خۆی و ناوی بەخشەکە، گوایە جێی بەرزە و بەسەر پێ دەشتەکەدا دەنوارێ و، زۆریش لەمێژ نییە دیەنی شاری بەخۆی گرتووە... گوایە سەردار عەزیز خانی موکری پەرەی پێ داوە... هەندێ لایان وایە کە جێی ئەم شارۆلکەیە کۆنە، لەبەرئەوەی کەوتۆتە سەرەڕێ ئەو کاروانە ڕێیەی لە تیسفونەوە بەسەر نیم ئەزرایدا هاتووە بۆ زایەگای زەردەشتی پێغەمبەری مەزنی ئاری نژاد، کە زایەگایەکەشی ناوی (گەزن) بووە و، پاشان ناونراوە (شیز) و شارێ بووە کەوتۆتە نێوانی مەراغە و زەنگان و ئەمڕۆ ناونیشانی نەماوە... خەڵقی لایان دایە ئەم سەردەشتە هەر ئەوێیە و، ئەم دێیە زیندووکەرەوەی ناوی (زەردەشت)ە... هەر چۆن بێ جێی ئەم شارۆلکەیە ماوەیەکی زۆر بەدەست سەردارانی موکرییەوە بووە... بەرزایی سەردەشت لە ڕووی زریەوە ١٤٨٠ مەترە.

جۆگەیەک ئاو بەناو شارەکەدا ڕێ ئەکات، هەم باغوباغاتی ناو شارەکە ئاو ئەدات و، هەم ئەو ئاشانە ئەگێڕێ کە ئەکەونە بەر ڕەتی... ژمارەی خەڵقی شاری سەردەشت لەو سەردەمەدا کە ژاک دومورگان پێیا ڕەت بووە، واتا لە ساڵانی ١٨٨٩-١٨٩٠دا گەییوە ١,٥٠٠ کەسێ... پاش ئەوە بەسێ ساڵ تیمسار ڕەزام ئارا لە جوغرافیاکەیا بە ٢,٠٠٠

کەسێ داناوە. نزیکترین شار لە سەردەشتەوە بانەیە... و لە مەهابادەوە ١٣٩ کیلۆمەتر دوورە... لە شاری سەردەشتدا چەند مزگەوت هەیە: یەکێکیان مزگەوتی گەورەیە و تایبەتی نوێژی هەینییە، چەند قوتابخانەی ئاینی و، قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی ناوەنجی تیایە. سەرەڕای قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری کە دانراون لە سەردەشت، گشت جۆرە ئیدارەیەکی دەوڵەتی هەیە... هەروا چەند نەخۆشخانە و گەرماو و سینەماشی تیایە... بازاڕێکی پەنجا دوکانیشی هەیە. لە دێهستانەکانیشیا قوتابخانە و مزگەوت هەیە... ئەوەش شتێکی ئاشکرایە کە ئەم هەرێمە کورد و کورد زبانن، هەندێکیان فارسی و تورکیش ئەزانن.

ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی سەردەشت. تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٣/١/٢٧

٢٧/نەورۆز/٢٦٨٢

وتاری: ١١٢

## سەقز

گوێگرە بەڕێزەکان شەوتان باش. کامەرانیتان هۆی دڵخۆشیمانە ئێمە ئەم حەوتەیە دەربارەی (سەقز) ئەدوێین... دەمێ بوو لەم بارەوە نامەی زۆرمان بۆ دەهات، کە سەقز لە کەیەوە هەیە؟ و ناوی سەقز لە چییەوە هاتووە؟ و ئایا ڕاستە کە وشەی سەقز وەرگەڕاوی (سکا)یە یا نە؟ بەڵام ئێمە وەرامی نامەکانمان نەئەدایە و ڕامان ئەگرتن بۆ کاتی خۆی...

موزیک

هەرێمی سەقز لە کۆنەوە ئاوەدانە، بێ گومان ئەم هەرێمە لە سەردەمی مادا لە هەرێمە بەبڕشت و پڕ لە خێر و بێرەکانی وڵات بووە. بەڵام خود شاری سەقز، بەم ناوە نەبووە... دوور نییە لە ڕابردووی زۆر دوورا (زێویە Zêwiye) ناوچەی ئەم هەرێمە بووبێ... بەڵام بەداخەوە نووسراوێکمان بەدەسەوە نییە بیکەینە بەڵگە... کتێبی (حدود العالم) باسی جێگەیەک دەکا بەکەناری چۆمێکەوە، ئەو جێیە کوتوموت سەقزە. بەڵام نووسەری (حدود العالم) ناوی شارۆلکەکەی نەزانیوە لەباتی ناوەکە تەنیا خاڵ و نیتکی داناوە. ناوی سەقز نەوەک هەر لە کتێبە جوغرافیایی و مێژووییە کۆنەکانا نییە، بەڵکو لە (عالەم ئارای عەبباسی)شا، کە هی سەدەی یازدەیەمی کۆچییە، ناوی نەهاتووە.

(جیهان گوشای جوەینی) ناوی هەندێ لە عێلەکانی تورک و تاتار دەبات وەک (ئەفشار - سەلدوز - بەیات...) تاد... و لەگەڵ ئەم ناوانەدا ناوی سەقزیش دەبات کە یەکێک بووە لە عێلە تورکەکان... لەم ناوانە بۆمان دەرئەکەوێ کە عێلی سەقزی مەغۆلی، دەمێکی زۆر لەم دەوروبەرە ماونەوە و هەروەک عێلی سەلدوز و عێلی بەیات بوونە هۆی ئەوەی دوو جێ بەناویانەوە بناسرێ، هەروا عێلی سەقزی تورکیش بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم جێیە بەناوی سەقز بناسرێ.

ئەوانەی لایان وایە کە وشەی سەقز لە وشەی (سکا)وە هاتووە، بەهەڵەداچوون، چون (سکا)کان لە هێرش و ڕاوڕووتەکانیانا، نەگەیبونە ئەم ناوە... جگە لەوەش ئەگەر ئەم شارە هی ئەو سەردەمە بوایە، وەک (هەگمەتانە) (هەمەدان) ناوی ئەمایەوە و، مێژوو تۆماری دەکرد... هەندێ لایان وایە کە ناوی سەقز لەوێوە هاتووە کە دەوری شارەکە

دارەبەنی زۆرە و، لە سەردەمی قاجاردا بەجاجک و بنێشت ئەوترا سەقز و ناوەکە لەوێوە هاتووە. ئەمەش جێگای گومانە...

جوغرافیای سیاسی کەیهان: وای داوەتە قەڵەم کە سەقز یەکێکە لە تیرەکانی عێلی کەلوڕی کورد و، هەروا یەکێکیشە لە تیرەکانی عێلی بەهارلوی فارس... ئەمە بۆمان دەرئەخا کە سەقز لە ناوی عێلەوە هاتووە، نەک لە ناوی جێگە و هەرێم و دار و درەختەوە...

موزیک

هەروەک وتمان: (زیویە) و ئەشکەوتی کەرەفتو بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم هەرێمە لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بووە و ئەگەر لەبیرتان مابێ، ئێمە لەمەوبەر لە باسی (زیویە) دووایین و ئەوەمان ڕوون کردەوە کە زیویە کۆنە شاری (ئیزبلییە Iziblye) بووە، کە لە دەورانی دەوڵەتی (مانا)دا جێگەیەکی سەخت و قەڵایەکی قایم بووە و، بەفەرمانی سارگۆنی دووەم پادشای ئاشوور، بەر لە حەوت سەد ساڵ پێش زایینی مەسیح ئاگری تێ بەردرابوو. هەروا ئەشکەوتی کەرەفتوش کە یەکێکە لە جێگە هەرە سەیرە باستانییەکان و، بەقەدپاڵی کێوێکەوەیە و، لەناو ئەشکەوتەکەدا چەند ژووری لە بەرد تاشراو هەیە، گۆیا بەر لە دوو هەزار ۲،۰۰۰ ساڵ پەرستیشگای هیراکلیوس Heraclis بووە... ئێمە لە باسی پیتی کافدا دووروودرێژ دەربارەی ئەم ئەشکەوتە ئەدوێین...

بابێینە سەر سەقزی ئەمڕۆ، کە ناوە بۆ شارۆلکەیەک و بۆ شارستانێ کە ئەم شارۆلکەیە ناوەندێتی... شارۆلکەی سەقز لە پلەی سێیەم دایە و، سەر بەئوستانی کوردستانە و سنووری چواردەوری بەم جۆرەیە: لای باکووری شارستانەکانی (مەیان دوئاوو) و (مەهاباد)ە، لای خۆرهەڵاتیشی بەخشی دیواندەرەی سەر بەئوستانی کوردستانە. لای باشووری شارستانی مەریوانە و، لای خۆرئاواشی سنووری شارستانی بانەیە...

ئەم شارستانە تەنیا یەک بەخشی هەیە، ئەویش دەوروبەری سەقزە، کە بەخشی (حەومە)ی پێ دەڵێن...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

۱۳۵۳/۲/۲

## وتاری: ١١٣

گوێگره خۆشەویستەکان. کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە. لە وتاری پێشوودا، لەوە دوابووین کە هەندێ لایان وایە ناوی (سەقز) لە ناوی (سکا)وە هاتووە، کە بەر لە سەردەمی ماد و لە دەورانی مادیشا خەریکی شالاوی ڕاووڕووت بوون لە ئازەربایجان و دەوروبەری کوردستانا، بەڵام هۆوەخشەترەی پادشای ماد بەرەنگاریان وەستا و قڕی تێ خستن و، لە بەشی باکور و لای خۆرئاوا دەریکردن و کشان بەرەو خۆرهەڵات و، لای باشووری خۆرهەڵاتیی ئێران هەندێکیش لایان وایە کە ناوی سەقز لە وشەی (سەقیز)ی تورکییەوە هاتووە کە بە(بنێشتو جاجک) دەڵێن، گۆیا لەبەرئەوەی ئەو ناوە دارەوەن و قەزوانی زۆرە، ئەم ناوەی لێ نراوە... بەڵام ئێمە ئەم بیروباوەڕانەمان بەلاوە بێ فەڕ و پڕوپووچە و لامان وایە کە ناوی (سەقیز)، لە عێلی سەقیزی تاتارەوە هاتووە... خاوەنی (تەئریخی جیهان گوشای جوەینێ) ناوی ئەم عێلانەی تاتار ئەبات، کە لە شالاوەکانی مەغۆل و تاتارا بۆ سەر ئێران و کوردستان و ئاسیای بچووک هاوبەش بوون: (بەیات - سەلدوز - ئەفشار - سەقز - قاجار... و دەیانی تری... عێلی بەیات لە دەوروبەری لوڕستان دامەزرابوون و بەناوی ئەوانەوە شاری بەیات هەبوو... بەڵام لوڕەکان نەوەک هەر ئەو بەیاتانەیان لەو ناوەدا نەهێشت، بناغەی ئەو شارەشیان هەڵتەکاند... تا ڕادەیەک کە لیسترنج ئەڵێ: ئێمە ناتوانین بزانین شاری بەیات لە کوێدا بووە! خۆ ئەوەش دیارە کە شاری سەلدوزی لای ڕەزائیە ناوی ئەوانی وەرگرتووە... مەحاڵی هەوشاریش، لە دەوروبەری کوردستان ناوی عێلی ئەفشاری تورکی بەسەرا براوە، کە لەو ناوەدا بوون... ئەمانە لای ئێمە گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ناوی سەقز لە عێلی سەقزی تاتارەوە ماوەتەوە، بەڵام هەر لەبەرئەوەی کە سەقز جێگەیەکی بچووک و بێ پشێونە بووە، لە سەردەمی سەفەویدا کەمتر ناوبراوە، بۆیە (عالەم ئارای عەبباسی) بەهیچ جۆر ناوی لێ نەبردووە.

موزیک

شارستانی سەقز، کە سەر بەئوستانی کوردستانە، لە ساڵی ١٣٢٠ بەدواوە دوو بەخشی هەبووە: یەکەم بەخشی دەوروبەری کە بەفارسی (حەومە)ی پێ ئەڵێن... دووەم بەخشی بانە... بەڵام پاشان بانە کرا بەشارستان و، سەقز چەند بەخشێکی تازەی درایێ... شارستانی سەقز لەم دێهستانانە پێکهاتووە: (سەرشیو - خوڕخوڕە - تیلەکۆ -

کولتەپەی فەیزوڵلا بەگی - میرە دێی گەورک) و چەند دێهەستانی تری کە تێکڕا ٣٣٨ دێیان تێدایە... ژمارەی سەری دانیشتوانی شارستانەکە لە ساڵی ١٣٣٠ فارسی نزیکەی ٧٥ هەزار کەس بووە و، ساڵی ١٣٤٥ فارسی گەیبووەتە ٩٢ هەزار کەس... بەڵام ئێستە دەبێ زۆرتر بێ. لە بەشی زۆری دێی ئەم شارستانەدا قوتابخانەی بەرایی، یا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، دانیشتوانی ئەو ناوە (گەورک، دێبوکری، تیلەکۆ، جاف و، تیرەگەلی تری کوردن).

بابێینە سەر خود شاری سەقز ژاک دومورگان ساڵی ١٨٨٩ بەدواوە بەم ناوەدا ڕابردووە ئەڵێ : شاری سەقز شارێکی جوانکیلەیە و هەزار ماڵێ ئەبێ، کەوتۆتە کەناری چەمی سەقزەوە، نزیکی ئەو ڕێیانەیە کە لە سنەوە ئەچێ بۆ مەیاندواو و بۆکان و مەهاباد... وەیا ئەڕوا بەرەو بانە... بەرزایی شاری سەقز لە ڕووی زریەوە ١٤٧٤ مەترە و، لە سەقزەوە بۆ ڕەزائیە لە ڕێی مەهابادەوە ٢٧٢ کیلۆمەترە و بۆ تەورێزیش لە ڕێی میاندواوە ٢٦٠ کیلۆمەترە - ئەم ڕێیانە هەندێکیان خۆڵەیەتان و، هەندێکیان چەو و قوم و، هەندێکیان قیرتاوکراون... سەقز لەبەرا حەوت گەڕەک بوو کە ناویان ئەمانە بوو: (ناو قەڵا... چنارستان... سەرقەبران... سەرپەچە... ناو چەم... کازم خان... کانی گەرمک ناو...) پاشان شارەکە پەرەی سەند... لە ناوەندی گەڕەکی ناو قەڵادا شوێنەواری دێرینەی قەڵایەکی کۆن هەیە و، بەبەری خۆرهەڵاتی چەمی سەقزیشەوە قەڵایێ هەیە کە لە کاتی شەڕوشۆڕدا عوسمانییە داگیرکەرەکان دروستیان کردبوو... ئەم چەمی سەقزە هاوینان ئاوی کەمە بەڵام زستانان زۆرە...

لە سەقزدا چەند مزگەوت و، چەند قوتابخانەی ئاینی و، چەند خانەقا و، حوسێنییە هەیە، بازاڕێکی ٦٠٠ دوکانی قەیسەری ئاسای هەیە. لەسەر شەقامەکانیش بازاڕ و دوکان و چاخانە و قاوەخانە و خۆراکخانە هەیە. شارەکە سینەما و گەرماو و هوتێل و، مێوانخانە و، خانی کاروان و، گەراجی ئۆتۆمۆبێلی تیایە.

ئاوی خواردنەوەی شارەکە لوولەیە... بەرق و کارەبای هەیە، پۆست و تەلگراف و، تەلیفۆن و نەخۆشخانە و قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی ناوەنجی تێدایە، هەموو دائیرەیەکی دەوڵەتی تیایە...

لەم شارەدا مەلای چاک و خوێندەواری باش هەڵکەوتوون هەندێکیان بەعەرەبی و، هەندێکیان بەفارسی و، هەندێکیانیش بەکوردی بەرهەم و بڕشتیان بووە... وەک قازی

کەوسەری و، مەلا ئەحمەدی موفتی سەدر العولەماء و، سالحی سەقزی و، شائقی سەقزی و، شێخ ئەحمەدی بستی و، مەلیک الکەلامی مەجدی و، عەبدوللا ناهیدی ئیفتخار، کە خێوی زۆر نووسراو بووە تەنانەت ئەوانەی بەفارسی نووسیویە وەک (چی گۆنە بەمریخ رەفتەم؟... پهلەوان گومنام... موصاحەبە ناشەیطان...) و هەروا ئەم ئیفتخارە وێنەکێش و نەقاشێکی بالادەس و، چاک بووە و، جۆری نەقاشیی ئەو ئێستەش لە مەجلیسی شورای میللیدا هەیە... ئەمرۆش سەقز چەند گەنجێکی نووسەر و هەستیاری باشی هەیە، کە ئەیانەوێ بەنووسین و بەهەڵبەست ناوی سەقز بەرز بکەنەوە. یەکێ لەوانە مستەفا کەیوانی ناوە، گۆیا دەربارەی مێژووی سەقز زانیارییەکی کۆکردۆتەوە. هەروا نافیعی مەزهەر کە گۆیا بەهەڵبەست ناوی ناوداران و هەستیاران و هۆنەران و، هونەرمەندانی سەقزی تۆمار کردووە... بەلام بەداخەوە ئێمە لەم بارەوە هیچمان دەس نەکەوتووە... تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش

١٣٥٣/٢/٥

٥/گولان/٢٦٨٢

**وتاری: ١١٤**

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامە کوردییەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش. هۆی شانازی و بەختیارێمانە کە ئێوەی بەرێز بیروباوەڕتان دەربارەی بەرنامەکانمان دەربڕن و، ڕەخنەی بەکەڵکتان ئەنێرن، کە ئەبێتە هۆی دڵگەرمیمان و، سوورمان ئەکات بۆ جەخت لەسەر لێکۆڵینەوەی قوولتر... ئەوەش بزانن کە ئێمە ئەمشەو باسی جێگەیەک دەکەین بەناوی (سەگمەن ئاباد)... ئەم جێیە گەرچی ئەمڕۆ ناوەندی دێهستانێکە بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە لە دەورانی عەبباسی بەدواوە دەورێکی گرنگی گێڕاوە... تەنانەت لە سەردەمی (ئاق قویونلو) و (سەفەوی)دا...

موزیک

سەگمەن ئاوا، لەو کاتەوە کە سەردارانی عێلی دونبوڵی هاتوونە ناوی... پتر لە هەموو کات ناوبانگی دەرکردووە... وەکو لە نووسراوی (رياض الخولد)دا هاتووە، کە نووسەرەکەی عەبدولڕەزاق کوڕی نەجەف قولی دونبولییە و، هەروا لە (شەرەفنامە) و زۆر کتێبی تری مێژوویی بۆمان دەرئەکەوێ: کە ئەم دونبولییانە بەڕەگەز و ڕەسەن خۆیان دەبەنەوە سەر بنەماڵەی (بەرمەکی) و گۆیا کاتێ کە خەلیفەی عەبباسی هارون ڕەشید ڕقی لەم بنەماڵەیە هەستاوە و کەوتۆتە قڕان و قەلاچۆیان، موسا ناوێکیان ڕزگار بووە و، خۆی گەیاندۆتە کوردستان و لەناو عێلی دونبولی ئیزەدیی کوردا خۆی شاردۆتەوە... پاشان عێلی دونبولی بەر ڕق و تووڕەیی یەکێک لە پاشایانی ئەو حەلە کەوتوون و، ئەم بنەماڵەی فەرمانڕەواییە لەگەڵ عێلەکەیانا گوێزراونەوە سەگمەن ئاوای سەر بە (خۆی) کە لەو حەلەدا ناوی ولایەتی هەبووە و، ئەم فەرماندەوایانەی دونبولی پیاوانی گەورە و بەناوبانگ بوون کە ناویان دەبەین:

- ئەمیر محەمەد، سەردەمی فەرمانڕەوای ولاتی شام بووە و، لەوێوە دەسەلاتی پەرەی سەندووە، هەندێ لە قەلاکانی حەکاریی خستۆتە ژێردەست خۆیەوە و و، زۆر ساختمانی خێرییە دروست کردووە. تەنانەت قەلای بای کە خۆی دروستی کردووە و، خۆیشی پاش مردن ٣٨٧ کۆچی تیا نێژراوە.

- ئەمیر سلێمان: کە جگە لەوەی سەرداری عێلەکەی بووە، دەسەلاتی بەسەر هەندێ

جێی کوردستان و ئازەربایجانیشا بووە زۆر ساختمانی پیاوانەی دروست کردووە، تەنانەت قوتابخانەی ئاینی و خانەقا و، لە هەموویان گرنگتر (سەرای سلێمانی) بووە کە لە چیای سنجار دروستی کردووە.

سالّی ٤١٠ کۆچی مردووە و، زۆر پیاوانی گەورەتریان هەبووە، کە لەم وتارەدا جێی باسیان نییە... یەکێ تری لە سەردارانی دونبولّی ئەمیر جەعفەر شەمس لمولکە کە هەستیاری مەزن خاقان زۆری پێیا هەلّگوتووە و، هەروا ئەمیر بەگ ک مولانا جەلالەدین رۆمی یەکێ لە دۆستانی بووە. و لە سەردەمی ئاق قویونلودا سەگمەن ئاوا و قەلاّی بای و بەشێ لە حەکاری لەژێردەستی شێخ ئەحمەد بەگی دونبولّیدا بووە. پاش ئەوە لە سەردەمی شا تەهماسپی سەفەویدا بەفەرمانی شا ئەم سەگمەن ئاباده و خۆی درا بەحاجی بەگی کوڕی شێخ بەهلول بەگ... و لەم سەردەمەدا عێلی دونبولّی چونکە لەسەر سنووری دوو دەولّەتی سەفەوی و عوسمانی بوون، جارێ ئەکەوتنە پالّ دەولّەتی سەفەوی و جارێ ئەکەوتنە پالّ عوسمانی.

بنەمالّەی سەردارانی دونبولّی لە سەردەمی نادر شا و کەریم خانی زەندیشا پیاوانی زۆر گەورەیان بووە، تەنانەت نەجەف قولّی خان کە یەکێ بووە لە فەرمانده‌یانی هێزای سپای نادر شا و، پاشان لە سەردەمی کەریم خانی زەندا سەرداری ئەم جێیانە بووە:

(ئەتراپ - ئالان - بەراغوش - ئەرەونەق - میهران ڕود - سەرد سەحراء - حاکم ڕود - بروجرد - دیهخوارەگان - ئاوجان - گەرمرود - سەراب - هەشت ڕود - مەرەند - گەرگەر)

و ناوچەی فەرماندەیەکەشی لە شاری تەوریز بوو... لە سەردەمی قاجاریشا ئەم بنەمالّەیە زۆر پیاوی گەورەیان تیا هەلّکەوتووە. ئەوەی لەم باسەدا دەبێ زۆرباش سەرنج بدرێ ئەوەیە کە عێلی دونبولّی و سەردارەکانی، کە لە کاتی خۆیا لە سنجار و دەوروبەری شام و، دەوروبەری جزیر و بۆتان و، چیاکانی باکووری مووسلّ دائەنیشتن، ئەو حەلە هەموویان لەسەر ڕچی یەزیدی ئاینی کۆنی کورد و ئێران بوون... لە سەردەمی ئاق قویونلو و سەفەویدا، کە لە خۆی و سەگمەن ئاوا و ئەرجیش و ئەو جێیانەدا بوون، فێری تورکی کراون و، ڕچی ئاینیشیان گۆڕیوە، موسولّمان بوون و، پەیرەوییان لە ڕچی ئاینیی شیعە کردووە...

موزیک

بابێینە سەر باسی (سەگمەن ئاوا) یەکێکە لە دێهستانەکانی سەر بەبەخشی دەوروبەری (خۆی) ئەکەوێتە لای باکوری خۆرئاوایی بەخشەکەوە، لای ژووری دێهستانی باباجیگ و چالدێران و لای خۆرهەلاتی چای پارە و ئێونۆغلییە... ئەم دێهستانە ٤٠ دێی تیایە، سالی ١٣٣٠ فارسی سەرژمێری دانیشتوانی دە هەزار کەسێ بووە. رووباری ئاق چای کە لە چیاکانی سنوورەوە دێت، نزیک بەئاواییەکانی مەلحەملی و دام داما ئەگاتە ئەم دێهاتە و، پاش ئاودانی دێهاتەکانی دێهستانەکە، ئنجا ئەو رووبارە ئەکشێ بەرەو دێهاتی چای پارە. کاروباری خەلقی ئەم دێهستانە، مێگەل بەخێوکردن و ئاژەلداری و، کشتوکالە...

ئەوەی ئەینێرنە شارەکان بۆ فرۆشتن بریتییە لە: پەز، رەشەولاغ، خوری و پێستە و، رۆن و پەنیر و، دەغل و دانەوێلە...

لەم دێیانەی دێهستانەکەدا، قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەل نەخوێندەواری هەیە.

ئەم هەرێمە زۆر ساردە، لە زستانا لەبەر بەفری زۆر، رێی هاتوچۆ، زۆرجار ئەبەسترێ. دێ گەورەکانی دێهستانی سەگمەن ئاوا ئەمانەن: شوریک - عەلی شێخ - زیوە - ئاچای - کردیک بالا... (زۆر ئاباد) کە ناوچەی دێهستانەکەیە.

گوێگرە بەرێزەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە شەوتان باش.

١٣٥٣/٢/١٠

١٠/گولان/٢٦٨٣

**وتاری: ١١٥**

## سەلدوس

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ و، بەهیوایین لەوپەڕی کامەرانی و خۆش وەختییا بن... بەشانازیەوە پێتان ڕادەگەیێنین کە ئێمە ئەمشەو باسی (سەلدوس) ئەکەین.

ناوەکە لە بنەڕەتا (سەلدوز)ە و هەندێ (سەلدوس) و، هەندێکیش (سوندوس، ئەڵێن... مێژوونووسان و جوغرافیانووسان بۆیان ڕوون نەکردووینەوە کە ئەم شارۆلکەیە و هەرێمەکەی لە بنەڕەتا ناویان چی بووە؟ بەڵام ئێمە ئەوەندە ڕوون ئەکەینەوە کە ناوی سەلدوس لە بنەڕەتا تورکی مەغۆلییە و، پاش دەورانی جەنگیز براوە بەسەر ئەم هەرێمە و ئەم شارۆلکەیەدا... (سەلدوز) لە بنەڕەتا ناوی یەکێ بووە لە عێلە هەرە بەهێزەکانی مەغۆل کە لە چەند تیرەیێ پێکهاتبوو بەم ناوانە: (سورغان شیرە - جیلاوغان - سودنویان - تودان - مەلیک بەهادر - چوپان)... لەناو ئەم تیرانەدا سورغان شیرەیان زۆر لای جەنگیز خان خۆشەویست بووە... هۆی ئەوەش ئەوە بووە کە جەنگیز لە هەرەتی جوانییا، لە شەڕێکا شکاوە و کەوتۆتە داو. بەڵام ئەم تیرەی سورغان شیرەیە گەییوەتە فریای و لە چنگی دوژمن دەری هێناوە و ڕزگاری کردووە... پاش جەنگیز هۆلاکۆ لەم تیرەیە ژنێکی هێناوە و ئاباقای کوڕی لەو ژنەیە و، بەم تیرەیە پشتی خۆی ئەستوور و بەهێز کردووە... و کاتێ کە شاڵاوی هێناوە بۆ سەر ئێران و، ئاسیای ناوەندی، ئەم عێلی سەلدوزە یەکێ بووە لە عێلە دڕندەکانی هێزەکەی هۆلاکۆ و، نزیک بەهەرێمی سەلدوزی ئێستە جێی داونێ و، جێگیری کردوون، وەکو کوردەکانی خاوەن هەرێمەکەی لە وڵات ڕەتاندووە و، زۆری لێ کوشتوون و قەڵاچۆی کردوون.

ئەم عێلە تورکە مەغۆلە، گەرچی پاش بڕانەوەی بنەماڵەکانی (جەنگیز - هۆلاکۆ - تەیموور) گەڕانەوە بۆ مەغۆلستان و تورکستان بەڵام هەندێ عێلی پەیڕەو سەر بەئاق قویونلو و قەرە قویونلو جێی گرتوونەوە... بەڵام هەر لەم سەردەمەی ئاق قویونلودا یەکێ لە سەردارانی یەکەم بنەماڵەی بابان کە ناوی ئەمیر بوداق کوڕی ئەمیر ئەبدال بوو و، لەو حەلەدا هەم موکریان و هەم ئەردەڵان و هەم بابانی بەدەستەوە بوو... کە ئێستە بابان بوودتە

دوو ئوستانی سلێمانی و کەرکووک - ئەو سەرداره عێله تورکەکانی ڕامالّی و، هەرێمەکەی لێ پاک کردنەوە، بەڵام ناوی (سەلدوز) نەسڕایەوە، هەر مایەوە. پاشان دیسان لە لایەن عێلە تورکمانەکانی قزلّباشەوە داگیر کرا، بەڵام (ئەمیر سەیفەدین موکری) لێیان ڕاپەڕی و لە هەرێمەکە دەری کردن و، دووری خستنەوە. شا ئیسماعیلی سەفەوی کە دەسەڵاتی شاهێتیی ئێرانی گرتەدەست، ویستی ئەم هەرێمە لە دەست ئەمیر سەیفەدین دەربکات. بەڵام ئەمیر سەیفەدین خۆی دایە پاڵ سوڵتان سەلیمی پادشای عوسمانی و، ئەوە بوو پاشان شەڕی چاڵدێران قەوما... پاش ئەمیر سەیفەدین مایەوە بۆ ئەمیر سارمی کوڕی... بەڵام ئەمیر سارم زۆر نەژیا و، بێ وجاغ سەری نایەوە و کۆچی دوایی کرد، سەلدوز و موکریان مایەوە بۆ شێخ حەیدەری موکری کە لە ئامۆزایانی بوو... پاش هەرای موکریان و هەرای قەڵای دمدم ئەو هەرێمە لە لایەن سەفەوییەوە ئەدرا بەسەرەک عێلەکان. لە سەردەمی قاجاریشا عەبباسی میرزا نائیب سەڵتەنە ٨٠٠ ماڵی قەرە پاپاخی هێنایە ئەوێ...

موزیک

بابێنە سەر باسی جوغرافیی ئەم هەرێمی (سەلدوز)ە... لەمەوبەر بەش بوو و سەر بەخود شارستان ڕەزائیە بوو... ناوەندی بەخشەکە شاری نەغەدە بوو... بەڵام پاشان نەغەدە کرایە شارستان و، سەلدوز کرا بەبەشی حەومە و دەوروبەری... و سنووری بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە لای باشووری خۆرهەڵاتیی ڕەزائیەوە، لای باکوری دێهستانی (دۆڵ) و لای باشووریشی شارۆیران و لای خۆرئاوایشی شنۆیە... سەلدوز باشترین خاکێکی بەبڕشتە بۆ کشتوکاڵ... و بەرهەمی دەغڵ و دانەوێڵەیە. پەتاتە و سێو زەمینی و توتنو برنج و چەوەندەر پێ ئەگەیێنێ... ڕووباری گدار کە پێی دەڵێن (قادرچای) ئەم دەشتە ئاو ئەدات...

لەم بەخشەدا، چەند قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری گەلێ نەخوێندەواری هەیە. گوێگرە خۆشەویستەکان تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

١٣٥٣/٢/١٦

### وتاری: ١١٦

گـوێگره بەڕێزەکـانی وڵاتەکەت باشـتـر بناسـە، ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان بەشـادی ڕابووری، ئـاواتمان پێـشکەوتـن و سـەرکـەوتـنی ئێـوەی بەڕێزە ئێـمـە ئەمـشـەو دەربارەی (سلسـیلە) ئەدوێین کـە یەکـێکە لە نەخشـەکـانی لوڕسـتـان و سـەر بەشـارسـتـانی خـوڕەم ئاوایە... ئەم هەرێمی سلسـیلەیە لە مـێـژووی کـۆندا بەهەرێمی ئەلیـشـتـەر ناسـرابوو، تا ئەمـڕۆش هەر شارۆلکەی ئەلیشتـەر ناوەندی نەخشـەکەیە. بەڵام ئەمڕۆ ناوی ئەلیـشتـەر گۆڕاوە بەقـەڵای موزەفـەری... هۆی گۆڕانی ناوەکەش ئەوەیە: کە لە دەورانی ئەم دواییەی قـاجـاردا «سـید مـەهدی خان و مـیـر عـەلی خانی حەسنەوەند» هەشـتـا ساڵێ لەمـەوبەر، قەڵایەکی زۆر گرنگ و سـەختـیـان دروست کرد، بۆ ئەوەی بتـوانن هەرێمـەکەیان لە شـەڕی عێلاتی هاوسێ بپارێزن... بەڵام کاربەدەستانی دەوڵەتی قاجارە دڵی شای ئەو سەردەمەیان لێیـان خـستە گومان... و دەستـوور درا بەوەی لەشکرێ بچێتە سـەریان و تەمێیـان بکات کە لەشکر هەڵمەتی بردە سەریان، ئەوان هیچ خۆیان لێڵ نەکرد و، سەرکەشییان نیشان نەدا... جا دەوڵەت بەوەندە وازی هێنا کە قەڵاکەی داگیرکرد و، ناوی قەڵاکەی نا (موزەفەرییە) و ئەگـەر گوێگرانی خۆشەویست لە یادیان بێ ئێـمـە لە چەند وتارێکا دەربارەی ئەلیـشتـەر دوابووین، کە ئەمڕۆ شوێنەوارەکەی لای ئەم شاری موزەفـەرییە لەناو باغـەکانا مـاوەتەوە... کە یەکێک بوو لە ناوچە هەرە گرنگەکانی لوڕسـتـان و، لە سـەدەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا لەژێردەس فەرمانڕەوایی بنەماڵەی (حەسەن وەیهی) کوردا بوو...

موزیک

بابگەڕێینەوە سەر سنووری جـوغرافی بەشی (سـیلسـیلە) کە بەم جۆرەیە: لای باکـوری کێوی گرێن... لای باشوور و خوارووی سپێ کۆ و بەخشی چنگییە... لای خۆرهەڵاتی بەشی چقلـوەندییە... لای خۆرئاوای بەخشـی دلفـانە و، هەرێمەکـە خۆی ئەکەوێتـە لای باکور و باکوری خۆرهەڵاتیی شارسـتـانی خوڕەم ئاواوە و، ٥٤ کـیلۆمـەتر لێیەوە دوورە. هەرێمـەکە زورگ و هەڵەت و چیای سەختی هەیە و بانەبەرزێکی پانوپۆڕیشـی هەیە ٣٠٠ کـیلۆمـەتر ئەبێ.

لە ڕووی بەشکردنی کیشوەرییەوە بریتییە لە چوار دێهستان:

یەکەم: حەسەنەوەند کە ٥٧ دێی هەیە و، سەرژمێری دانیشتوانی هەموو دێیەکان ئەگاتە ٨،٩٠٠ کەس...

دووەم: دێهستانی کولییەوەند کە لە ٤٣ دێ پێکهاتووە و، سەرژمێری خەڵقەکەی ٨،٥٠٠ کەس ئەبێ...

سێیەم: دێهستانی یوسف وەند کە ٣٥ دێی تیایە و، دانیشتوانیان ٧،٨٠٠ کەسن...

چوارەم: (هەنام، بەستام) کە ٢٣ دێی تیایە خەڵقەکەی ٤٩٠٠ کەسن...

بەڵام لە ڕووی بەشکردنی ناوخۆیانەوە، ئەم هەرێمانەن: (ڕەبات - قاکارەمنا - بەستام - دوئاو - ئەلیشتەر - کولییەوەند - هەنام - پریسک و هی تری...

خود ئەلیشتەر کە ناوی گۆڕاوە بەقەڵای موزەفەری، چوارسەد ماڵێ ئەبێ، ١٥٠ دوکانی تێدایە، لەگەڵ چەند مزگەوت و قوتابخانەی ناوەندی و، قوتابخانەی بەرایی کچانە، کورانە و، چەند گەرماو و هەموو سازمانە دەوڵەتییەکان. سەرژمێری دانیشتوانی شارۆلکەکە نزیکەی دوو هەزار کەسێکە و، سەرژمێری دانیشتوانی هەموو بەخشەکەش ٣٠ هەزار کەسێکە...

چیا بەرز و سەختەکانی بەخشی سیلسیلە بریتین لە (گرون - کیو سورخە - ڕێمڵە - سپی کۆ - سیاکەمەر)...

ڕووبارەکانیشی ئەمانەن:

ڕووباری کاکە ڕەزا، ئەم ڕووبارە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی حەسەن وەیهییەکان، بەدر کوڕی حەسەن وەیهی پردێکی لەسەر کردووە تا ئێستە ئەم پردە ماوە.

ڕووباری هەنام کە ئەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتیی ئەلیشتەرەوە.

ڕووباری کۆمان، کە لە کێوی (گری)وە دێتە خوارێ.

دانیشتوانی هەرێمەکە لوڕن زبانیان لوڕییە کوردییە لەم عێل و تیرەیانە پێکهاتوون: کاکەوەند - مەعفەر - خەمسە - بەستام - وەیسی - دکاموند - ترکاشەوەند - جان جان - مومن - گاوکوش - ئەسلانشا - فەڕوخ شا - کەرەم شا و چەند تیرەیەکی تری... جگە لەمانە کە هەموو لە بنەڕەتا لقوبۆیی یەک عێلن ئەمانەشی تیایە: ساکی - سوری تەرهان - سیاهپۆش - ئاهەنگەر - و هی تری.

ئاووهەوای هەرێمەکە، زۆر سازگارە... لە زستانا سارد و لە هاوینا فێنکە...

خەڵقی سیلسیلە بەڕەوشت و ئاسای ئاینییەوە زۆر بەستراون. باو و یاسای کۆنی ناریشیان لەناوا ماوە. جگە لەمانە ڕچی (صروفی)یەتیش، کە جۆرە ڕچێکی دەروێشانەیە، لەناویانا بڵاوبووتەوە.

کار و پیشەی خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە.

بانەبەرزەکان، زەویوزاری بەبڕشتی تیایە بۆ کشتوکاڵ.

گوێگرە خۆشەویستەکان باسەکەمان لێرەدا تەواوبوو و، کاتمان بەسەرچوو خواتان لەگەڵ، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

۱۳۵۳/۲/۲۲

## وتاری: ۱۱۷

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ و بەکامەرانی و سەرفرازی کات بەسەر بەرن... ئەمشەو باسی جێگەیەک دەکەین کە ئاخرین سەردارانی مەغۆل کردیان بەشار و بەپایتەخت و، ئەم جێیە زوو وێران بوو و، شوێنەواریشی نەما...

بنەماڵەی مەغۆل، کە هەستیان بەوە کردبوو: گەلی ئێران لە دەست زۆروستەمیان هاتوونەتە تەنگ، لە سەرەتادات، ویستیان بەوە شۆڕشی گەلی ئێران کەم بکەنەوە کە خۆیان موسوڵمان بکەن... و بەناوی موسوڵمانییەوە ئاگری ڕقوقینی گەل بکوژێنەوە... بەڵام ئەوە سوودی نەبوو... ئنجا کە (غازان خان) بۆی دەرکەوت پایتەختی تەورێز زۆرتر جێی شۆڕشی نهێنی و پەنامەکییە، ویستی بەجێی بهێڵێ و پایتەختێکی تازە هەڵبژێرێ... خۆی چەند گەشتێکی کرد بەوڵاتا... لە نێوانی سەرچاوەی دوو ڕووباری ئەبهەر و زەنجاندا، کە یەکەمیان بەرەو دەشتی قەزوین ئەکشێ و، دووەمیان بەرەو ڕووباری قزل ئوزان ئەڕوات، چیمەنێکی سەوزی پانوپۆڕی پەیداکرد... کە لەو کاتەدا مەغۆلەکان پێیان ئەوت (فەنغور ئالانگ Fangur Alang) جێگەیەکی خۆش هەوا و سازگار بوو... غازان خان بڕیاری دا بیکا بەشار و بەپایتەخت و بۆ ئەم نیازە دەستووری دا بەنەخشەکێش و ئەندازیاران کە بەو کارە هەڵبسن، بەڵام گورگی مەرگ کە لە بۆسەدا بۆی دانیشتبوو، شاڵاوی کردە سەری و لە گیانی کرد... مردنی غازان خان ساڵی ٧٠٤ کۆچی بوو... پاش مەرگی غازان ئولجاتیوخانی برای لە جێی دانشت... ئەویش هەر ئەو هەستەی هەبوو، کە کاکی هەیبوو... ئەیزانی کە تەورێز بووەتە جێی ئەو نیشتمانپەروەرە ئێرانیانەی نایانەوێ وڵاتیان لەژێردەستی بێگانە دابێ... جا بڕیاری دا، لەسەر هەمان بەرنامە بڕوات.

جا نەخشەکێش و ئەندازیاری نارد و لەسەر گەڵاڵەیەکی جوان شارێکی ڕێکوپێک دامەزرێنرا... ئەم چیمەنە گەرچی مەغۆل پێیان ئەوت (فەنغور ئالانگ) بەڵام شارەکەیان ناونا (سوڵتانیە) سەرا و کاخی سوڵتانی، ساختمانی چاک و گەورە، مزگەوتی زل، قوتابخانەی ئاینیی باش، بازاڕی دووردرێژ، گەرماوی خاوێن و هەموو جۆرە پێویستێکی شارییان تیا ئامادە کرد و، خەڵکێکی زۆریان لە هەموو شارەکانەوە کۆچ کردە ئەوێ و، خانووبەرەی زۆری تیا کرا... ئنجا شوورەیەکی چوارگۆشەیی دە هەزار مەتر درێژایی، سێ مەتر پانی بەدەورا کێشرا، کە سێ سوار لە یەک ڕیزا بەسەر دیوارەکەیا ئەڕۆیشت... و

لەناو ئەم شار و شوورەیەدا دژ و قەڵایەکی زۆر سەخت و بەباروو و کونگەرەی دامەزراند و لە ناویا مزگەوتێکی دروست کرد، کە تا ئەمڕۆ ماوە و، بەناوی گومبەزی سوڵتانییە بەناوبانگە، لە جوانی و ڕازاوەیی و بەرزی گومەتەکەیا لە جیهانا بەناوبانگە... و ئەم ساختمانانە بە ١٣ ساڵ تەواوبوون واتا لە ٧٠٣وە تا ٧١٦ ئنجا تەواوبوون - ئەم گومەزە پێنج فەرسەنگ ڕۆژ لە زەنجانەوە دوورە و بەرزایی ١٣٠ مەترە هەموو دەوری ژوورە، ئەم ژوورانە وا دیارە بۆ ئاپۆرە و، فەقێ و مەلا و دەروێش دروست کراون. گومەزەکە بەکاشیی شینی پیرۆزەیی ڕووکەش کراوە... ئولجایتوخانی مەغۆل کە ناوی خۆی نابوو «سوڵتان محەمەد خودابەندە» لەم مزگەوتەدا نێژراوە... جگە لەمانە وترا، لە شاری سوڵتانییەدا چەندین نەخۆشخانە، تیمارخانە، داروخانە، خانەقا، تەکیە، زانکۆی مانەندی، زانکۆی موستەنسیریەی Mustansirye بەغداش دروست کرا. ئەم نەخشەیە لە لایەن وەزیران و فەرماندەیان و سەردارانەوە دائەڕێژێنرا... یەکێ لەوانەی کە سەرپەرشتیی کاروباری ئەم شارەی دەکردخواجە ڕەشیدەدین فەزڵوڵا بوو کە هەم وەزیر و هەم مێژوونووس و، هەم مەلا چاکی ئەو سەردەمە بوو.

جگە لەمانەی وترا زۆر زەویوزار و، خانووبەرە و، ساختمانی کردە وەقفی مزگەوت و خانەقا و قوتابخانە و زانکۆیە... و سەرپەرشتی هەمووی دایە خواجە ڕەشیدەدین.

ئەم شارە، لە سەردەمی ئەولجاتیوخان و، لە سەردەمی ئەبو سەعید خاندا زۆر لە ڕەونەقا بوو... پاش تەورێز لە هەموو شارەکانی وڵاتی ژێردەستی خانانی مەغۆل بەڕەونەقتر بوو... بەڵام پاش ئەوان زۆر بەگورجی کەوتە ویرانی و، چۆڵ بوون...

ئەمە بۆمان دەرئەخات ئەو بناغەیانەی کە بەزۆری گورز و کوتەک و قەمچی و شەق دائەمەزرێ، زۆر زوو ویران ئەبێ و پایەدار نامێنێ و، شوێنەواریشی نامێنێ... ئەویش کە بمێنێتەوە تەنیا بۆ پەند و عیبرەت ئەمێنێتەوە...

بەڵێ هەندێ لە شاری سوڵتانییە تا دەورانی (تەیمووری لەنگ) مایەوە و ئەو لە بناغەوە ویرانی کرد... گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان تەواو، خواتان لەگەڵ، ژیانتان خۆش.

١٣٥٣/٣/٢٢

## وتاری: ١١٨

گوێگرە خۆشەویستەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە خۆشی و شادی بێ... ئەمشەو باسی (سولتان ئاباد) ئەکەین... وا دیارە پاش دەورانی (ئال بویە) و (سەلجووقی) کە ناوی (سولتان) لە ئێران بەگشتی و، لە بەشی خۆرئاوای ئێران و بەشی باشووریا بەتایبەتی، بڵاوبووەتەوە خەڵقی زۆریان پێ خۆش بووە ناوی دێ و شارەکان بنێن سولتان ناوا. هەر هی ئەوەیە، پاش ئەوەی کە ئولجاتیوی مەغۆل شاری سولتان ئابادی دامەزراند... ئیتر خەڵقی ئەم ناوەیان لەسەر زار خۆش بوو و نزیکەی ٤٥ دێ و شارۆلکە بەم ناوەوە ناوبرا. بەشی زۆری ئەو شارۆلکە و دێهاتانەی کە ناویان نراوە سولتان ئاباد لە فەرهەنگی (کەیهخودا)دا ناوبراون...

موزیک

یەکێ لەو جێیانەی کە ناوی سولتان ئاباد بووە و، لە مێژوودا دەورێکی گرنگی هەبووە، ماوەیەک ناوەندی (کوردستان) بووە، لەباتی (بەهار)ی لای کوردستان... ئەو سولتان ئابادییە (جەم چهال)ەیە، کە ئولجاتیوخانی مەغۆل لە دەشتێکی بژوێن و بەبرشتی هەمیشە سەوزی داوێنی بێستوندا دروستی کرد، شەش فەرسەنگ لە کرمنشاوە دوور و چوار فەرسەنگیش لە مشەختەوەیە کە جارجارە، لە سولتانیی لای زەنجان بێ و جارجارە لەم سولتان ئاوایەدا... (نوزهەت القلوب)ی موستەوفی قەزوینی و، زەفەرنامەی عەلی یەزدی، ناوی ئەم سولتان ئابادەیان بردووە و، باسی سازگاری و، ئاووهەوا خۆشییان کردووە. شارەکە تا ئەو حەلەی تەیووری لەنگ شاڵاوی بردە سەر کوردستان و هەمووی وێران کرد مابوو...

یەکێ تر لەو جێیانەی ناوی سولتان ئاباد بوو، (سولتان ئاوای عێراق) بوو. ئەم شارە گەرچی بەجۆرێکی ڕۆشن نازانرێ کە لە بنەڕەتا ناوی چی بووە و، تەنیا بەناوی (عەراق) بەناوبانگ بووە، بەڵام لە مێژووەکان وا دەرئەکەوێ کە لە نێوانی ساڵانی ١٢٢٣-١٢٢٧دا، ئەم شارە لە لایەن یوسف خان گورجییەوە کە فەرماندەی پادگانی ئەو ناوەبووە، تازە کراوەتەوە و، لەسەر جۆرێکی چوارگۆشەیی درێژ -کە بەعەرەبی پێی ئەوترێ (موستەطیل) دامەزرێنراوە و، ناونراوە (سولتان ئاباد) و، تا ماوەیەک لەسەر ئەو نەخشە ڕێکوپێکە، پەرەی پێ درا. بەڵام پاش ئەوە زۆرتر پەرەی سەند و، نەخشەکە تێکچوو. ئەم

شاری سولتان ئاوایه له سەردەمی قاجاردا ناوەندی ولایەتی عێراق بووه، حاکمی عێراق لەوێوه هەرێمەکەی بەڕێوه بردووه... بەڵام له سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا، له میهر ماهی ساڵی ۱۳۱٦دا، بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی وەزیران، ناوەکە گۆڕرا و، برایەوه سەر بنەڕەتەکەی و ئێستە پێی ئەوترێ (ئەراک) و، جۆری درکاندنی بەهەمزەیە نەوەک بە (عەین).

## موزیک

ئەمڕۆ ئەو سولتان ئابادە کە بووه به (ئەراک) شارستانه و سەر بەئوستانی پایتەختە. بەپێی کتێبی (ڕاهنومای شەهرستانها) کە ساڵی ۱۳٤٥ نووسراوه، سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای باکورەوه هاوسنووره لەگەڵ بەخشەکانی ئاشتیان و فەرهەمین... لای خۆرهەلاتەوه هاوسنووره لەگەڵ بەخشی خەلەجستان و شارستانی قوم و مەحلات... و لای باشوورەوه هاوسنووره لەگەڵ شارستانی خومەین و بەخشی چاپلقی سەر بەشارستانی ئەلیگودەرز... و لای خۆرئاواشه و هاوسنووری شارستانی مەلایره. پێوانەی سەر زەوی ئەم شارستانه ۸۷٦٤ کیلۆمەتری چوارگۆشەیه، شوێنەکەی پێ دەشتە بەرزایی لەسەر ڕووی زریەوه ۱۷٦۰ مەتره، دەوروبەری ئەم شارستانه بەزنجیرە چیایەکی بەرز، ئابڵووقەوه گەمارۆ دراوه و له ناوەندی سەر زەویی (ئەراک)دا: کە وێڕێ هەیە ناوی (کەوێری میغان)ە یەکێ له لووتکە هەرە بەرزەکانی چیاکانی ئەراک لووتکەی کێوی (دوخواهەران) و (ڕاسوەند)ە کە ۳۳۸۹ مەتر بەرزاییەتی؛ یەکێ له ڕووبارە گرنگەکانی ئەم شارستانه ڕووباری قەرە چایە کە له چیاکانی بەخشی سەربەندی گەزازەوه شۆڕئەبێتەوه و، کە له بەخشەکەدا سێ ناوی هەیە (طوڕە و نورئاباد و ئاستانە). ئاووهەوای ئەراک سازگاره بەلام له زستانا یەگجار سارده و، له هاوینا ناوەنجی و فێنکە...

ژمارەی دانیشتوانی شارستانی ئەراک بەپێی سەرژمێریی ساڵی ۱۳٤٥ گەییوەتە نزیکەی چوارسەد هەزار کەسێک... بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییەدا زۆرتر پەرەی سەندووه، شارستانی ئەراک سێ بەخشی هەیە کە ئەمانەن: (۱) حەومە، واتا دەوروبەری ئەراک. (۲) فەس (کەمیجان). (۳) سەربەند (ئاستانە).

له کۆنا دانیشتوانی هەرێمی ئەراک لوڕبوون و، له لایەن ئەتابەگان و، والیانی لوڕەوه بەڕێوه ئەبران... بەلام له دەورانی سەفەوی و قاجاردا ڕاستەوڕاست له لایەن کارمەندانی دەوڵەتەوه بەڕێوه ئەبرا. لەم دواییەدا زبانی خەڵقی دێهستانەکانی (فەس - شیراع علیا

- گوزاز - قەرە کاریز- فەرە - کاریز - فەراهان - مشک ئاباد - ئاشتیان - تەفرەش) لە سایەی خوێندن و هاتوچۆی هاوسێ فارسەکانیانەوە، وەرگەڕاوە بەفارسی... هەروا دێیەکانی (ڕودبار - بزچەلو - شیراع سوفلا - سەربەند) و هەندێ دێی تری بەتورکی قسە دەکەن و، فارسیش باش ئەزانن.

ئەراک لە دەورانی شاهەنشاهی پەهلەویدا، تەنانەت لە ١٣١٦ بەدواوە کە هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەری تیا دامەزرا و قەتار بەلایا ئەڕوات، زۆر پەرەی سەندووە... (کارخانەی قەندسازیی شاهوەند) ساڵی ١٣١٧ نزیکی دێی قەریەی ئاستانە دامەزراوە. کارخانەی دروستکردنی کەرەسەی تراکتۆر بەهاوکاری دەوڵەتی ڕۆمانی دامەزراوە... کارخانەی ئەلەمینیوم و ڕوح توتیای تیایە.

لە ڕووی فەرهەنگ و خوێندەوارییەوە زۆر پێشکەوتووە. لەم شارستانەدا بەهەرسێ بەخشەکەیەوە ٦١ قوتابخانەی بەرایی کوڕانە و کچانەی تیایە، کە جیاجیان و، ٥٩ی تێکەڵاویشی تیایە. لەگەڵ ٢٢٢ قوتابخانەی بەرەنگاری، کە لە لایەن سپای زانستەوە بەڕێوە ئەبرێ... هونەرستانێکی پیشەیی... قوتابخانەی مامۆستایانی کە پێی ئەوترێ (مەدرسە عالی مەرجال)... و ٦ قوتابخانەی ڕانومائی کوڕانە و ٥ قوتابخانەی ڕانومائی کچانەی تیایە...

بازاڕێکی ڕێکوپێکی هەیە، هوتێل، مێوانخانە، گەرماو، باغچەی مناڵان، باغی بەزم و یاری تیایە. ئیدارە دەوڵەتییەکانی هەموو تیایە. کتێبخانەی زۆرە، تەنانەت کتێبخانەی پەهلەوی کە ٦٠٤٥ کتێبی تیایە، ڕۆژنامەیەکی تیا دەرئەچێ بەناوی ڕۆژنامەی (ئەراک).

شوێنەواری کۆن و دێرینەی تیایە، وەک (چار تاقی برزو) کە هی سەردەمی ساسانییە، گۆڕی ئیمامزادە سەهل کوڕی عەلی هی سەردەمی سەفەوییە، گۆڕستانێ دۆزراوەتەوە، گۆیا هی سەردەمی هەخامەنشییە، وێرانەی شاری ئەبودولەف (کەرەج) لای باشووری شارستانەکەیە مزگەوت و خانەقا و تەکیە و قوتابخانەی ئاینی تیایە... ئەمڕۆ ئەراک کە لە پێشانا ناوی (سوڵتان ئاباد) بوو، یەکێکە لە شارە جوانەکانی ئێران.

گوێگرە خۆشەویستەکان خواتان لەگەڵ شەوتان باش.

**وتاری: ١١٩**

## سەڵماس

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێران، کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە و، هۆی بەختەوەریمانە کە ئێوەمانان بەلوتفەوە گوێ ئەدەنە ئبەرنامەکانمان و ڕەزامەندی خۆتانیش بەنامە و نووسراو دەرئەبڕن. ئێمە لەم وتارەدا باسی سەڵماس ئەکەین، کە ئەمڕۆ ناوێکی دیوانی و ڕەسمی نییە و، تەنیا لەناو خەڵقا ئەبیسترێ کە بەشارۆلکە و بەخشی(شاهپور) دەڵێن. جوغرافیانووسانی سەدەی چوارەمی کۆچی، ناوی (سەڵماس)یان بردووە، مەقدیسی لە کتێبەکەیا باسی بازاڕ و مزگەوتەکەی سەڵماسی کردووە، کە بەبەرد دروست کراون. لە سەردەمی یاقوتی حەمەویدا شارەکە وێران بووە و، لە سەردەمی موستەوفی قەزوینیدا، گۆیا بووژاوەتەوە، چونکە لە دەوران ی(غازان خانی مەغۆل)دا شوورە و بارووەکەی دووبارە دروست کراوەتەوە، وا دیارە ناوی سەڵماس لە دەورانی سەلجووقیدا پەیدابووە و، دوور نییە عێلێ لە عێلەکانی تورکە غوزەکان بەسەر ئەم هەرێمەدا زاڵبووبێ و ناوی خۆی بڕیبێ بەسەر هەرێمەکەدا... چونکە لە کۆنا بەم هەرێمە دەوترا (دەیەلەمەکان). ناوی سەڵماس لەو حەلەوە مایەوە تا سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەوی. ساڵی ١٣٠٩ سەڵماس بەهۆی بوومەلەرزەوە وێران بوو. لە مانگی گولانی هەمان ساڵدا -واتا لە مانگی ئوردیبەهیشتدا- شاهەنشای مەزنی ئێران ڕەزا شای گەورە فەرمانی دا بەئەندازیار ئەسەدوڵلا خاوەرزەمین کە شارەکە نوێ بکاتەوە. ساڵی ١٣١٤ پاش نوێکرانەوەی شارەکە، کە سەڵماس دیمەنێکی تازەی گرتەخۆی، ئیتر کۆڕی وەزیران بڕیاری دا ناوی شارەکە بنرێ (شاپور)... ڕەزا شای گەورە، هیچ کات پێی خۆش نەبوو لە ئێراندا ناوی شای غەیرە ئێرانی ببینێ، هەر لەبەرئەوەبوو، ئەو ناوانەی ئەگۆڕی کە لە لایەن بێگانەوە درابووە هەندێ لە شارەکان.

شاری سەڵماس ناوچەی بەخشێ بوو سەر بەشارستان و فەرمانداری (خۆی)، لە سەدەی چوارەم بەدواوە زۆر جار تووشی بوومەلەرزە هاتبوو و، زۆر جاریش لە لایەن دوژمنانی وڵاتەکەوە وێران کرابوو، تەنانەت لە دەورانی مەغۆلدا.

لە دەوروبەری ئەم بەخشەدا، کەلاوە و دێرینە و شوێنەواری سەردەمی خەلەدی

دۆزراوەتەوە بەسەر تەپەی زنجیر قەلعەوە نزیک بەناوایی (تەمەر) هەروا بەردەنووسی سەردەمی ساسانیش دۆزراوەتەوە... لە گورجین قەلاش دێرینە و شوێنەواری کۆن دۆزراوەتەوە.

خەڵقی هەرێمی سەڵماس لە کۆنەوە هەموو کورد بوون، پاش دەورانی مەغۆل و تاتار تورک هاتوونەتە ئەو ناوە و، زۆر لە خەڵقی ئەو ناوە فێرە زمانی تورکی بوون.

سەڵماس بەوە بەناوبانگ بووە، کە کانییەکی گۆگردی هەبووە، خەڵق بۆ چارەکردنی نەخۆشیی گەڕی خۆیان تیا دەشووشت و چاک دەبوونەوە. لە سەردەمی موستەوفی قەزوینیدا باج و پیتاکی سالانەی سەڵماس سی و نۆ هەزار دیناری ئەو حەلە بووە... هەرێمەکە بژوێن و بەبڕشتە، کشتوکاڵی تیا ئەکرێ و، مێگەل و ئاژەڵی تری تیا بەخێو دەکرێت...

ئاووهەوای سەڵماس، ساردەسێرە و، ئاوی ئەو ناوە لە چیاکانی کوردستانەوە دێت و، لەوێوە ئەڕژێتە زریاچەی چیچەست (واتا زریاچەی ڕەزائیە).

گوێگرە خۆشەویستەکان، باسی دوورودرێژی ئەم سەردەمەی سەڵماس لەژێر ناونیشانی شاپوردا بلاو دەکەینەوە، چونکە ئێستە شارۆلکە و بەخشەکە ناویان (شاهپور)ە، تا وتارێ تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

## وتاری ١٢٠ و ١٢١

## ون بوونە بۆ ئاگاداریی خوێنەرانی بەڕێز

## سنە

گوێگرە بەڕێزەکـان، ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان خۆش بێ. لەم وتارەدا باسی (سنە) ئەکەین، کە ئەمڕۆکە ناوەندی ئوستانی کوردستانی کیشوەری ئاوەدانی ئێرانە...

دەربارەی ناوی (سنە) زۆر قـسـە و قـسـەڵۆک ڕێکخـراوە کـە دوورن لە ڕاسـتی و ڕاستەقینەوە. یەکێ لەو قسەڵۆکانە ئەوەیە کە هەندێ وایان داوەتە قەڵەم وشەی سنە لە بنەڕەتا (سان)ە بووە کە لە شێوەی هەورامیی گۆرانیدا لەباتی (سوڵتـان) بەکاردێت و، دوای ئەوە پاشبەندی (دژ)ی پێوە بەستراوە بۆتە (سان دژ) و، لە زبانی فارسییا وەرگەڕا و، بە (سنەدج) و دوای ئەوەبووە بە (سنندج)... بەڵام ئەم بیـــروباوەڕانە ڕەنگە لە ڕاستییەوە دوورین(*)... چونکە بنەماڵەی خانانی ئەردەڵان هیچ کاتێ نازناوی (سان)یان، بەخۆیان نەداوە.

بنەمـاڵەی ئەردەڵان و بابان هەردووکیـان لە سـەرەتادا بنەمـاڵەیەکی ئاینی بوون و، نازناوی (بابا)یان هەبووە و لە (باوە)کانی گـۆران بوون، وەک نازناوی (بابا) ئەردەڵان، پاشان کە کەوتوونە پاڵ دەوڵەتی عوسمـانی نازناوی بەگیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە وەک (مەئمون بەگ و، پەیکە بەگ) و لە سەردەمی سـەفەویشـا نازناوی (خان)یان بۆ خۆیان هەڵبـژاردووە وەک (خـان ئەحـمـەد خـان و، سلێـمـان خـان) و ئەو دوایان. ئەم خـانانەی ئەردەڵان لە سەرەتادا ناوەندی فەرمانڕەواییـیـان، لەگەڵ باباندا شارەزوور بوو، پاشـان کە دەوڵەتی عوسمانی بەتەنگیان هێنان بنەماڵەی ئەردەڵان لە بنەماڵەی بابان جیابوونەوە و، لە ٩٠٠ کۆچی بەدواوە لقی سەرداریتی ئەردەڵان پەیدابوو... هەڵۆخان کوڕی سوڵتان عەلی کـوڕی سورخـاب پاش مـردنی تەیموورخانی برای... بڕیاری دا قـەڵای زەڵم بەجێ بهێڵێ. لەبەرئەوە سێ قەڵای زۆر قـایم و سەختی دروست کرد کە ئەمانە بوون: قەڵای پاڵەنگان لە هەرێمی گۆران، قەڵای حەسەن ئاوا نزیک بەشاری ئێستـەی سنە و، قەڵای مەریوان... و لەو قەڵایانەدا دەسی کردە بەڕێوەبردنی وڵات بێ ئەوەی گوێ بداتە عوسمانی یا سەفەوی

(*) چونکە لە بەرگی نۆیەمی (الکامل ابن الاثیر) لاپەڕە ٥١٢دا ناوی سنەدا (سەندە)یە...

و، کە شا عەبباس ویستی شالآو بکاتە سەر ئەردەلآن ئەمیری زەنگەنە (عەلی بالّی خان) کە باوەڕپێکراو و، ڕاوێژپێکراوی شا عەبباس بوو، داوای لێ کرد: شالآو نەکات و هەولّ بدات بەرێککەوتن هەلّۆخان بکات بەدۆستی خۆی، شا عەبباس نامەیەکی بۆ هەلّۆخان نووسی کە ئەحمەدی کوڕی بنێرێ بۆ ئەسفەهان بۆ ئەوەی لە دەربارا پێ بگات و شارەزای کاروبار بێت و، مەشقی شێوەی سپایی بکات.

هەلّۆخان ئەحمەدی کوڕی نارد و، دیاری و خەلآتێکی زۆری بۆ نارد. ئەحمەدی کوڕی هەلّۆخان لە کۆشک و بارەگای سەفەوییا مایەوە و، شا عەبباس زۆر ڕێزی لێ نا و، (زەڕین کلآو)ی خوشکی خۆیشی لێ مارە کرد و، پاش ماوەیەک تەگبیری لەگەلّ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و، لە جێی باوکی سەرداریتی و فەرمانڕەوایی ئەردەلآن بگرێتە دەست و، نازناوی خانیشی دایێ بوو بە (خان ئەحمەد کوڕی هەلّۆخان) و لەناو ولآتا بە (خان ئەحمەد خان) بەناوبانگە و، بەرلەوەی بگاتەوە کوردستان هەلّۆخان بەو کەینوبەینەی زانیبوو و، بۆی دەرکەوتبوو کە شا عەبباس هەر بۆ لابردنی ئەو ئەحمەد خانی کردووە بەزارای خۆی، جا ڕێی نەدا بچێتە ناو قەلآی حەسەن ئاواوە و، فەرمانی دایێ کە لە قەلآیەکی تر، دابنیشێ. خان ئەحمەد ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی کرد، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان هەلّۆخان چووبوو بۆ ڕاووشکار، دایکی خان ئەحمەد خان هەوالّی بۆ کوڕەکەی نارد و، لەو هەلّەدا خۆی کرد بەقەلآی حەسەن ئاوادا هەرکە هەلّۆخان لە ڕاووشکار گەڕایەوە، خان ئەحمەد خان دەستگیری کرد و، ناردی بۆ ئەسفەهان بۆ دەرباری شا عەبباس و، لەوێ زۆر بەڕێزەوە دانرا و، تا کۆچی دوایی کرد لەوێ مایەوە... خان ئەحمەد خان بەئازایی و جوامێری خۆی پتر لە هەموو سەردارانی ئەردەلآن، پەرەی دا بەسنووری ولآتەکەی و، بەو هۆیەوە چەند جارێ لەگەلّ دەولّەتی عوسمانیدا کەوتە شەڕەوە و، هەروا چەند جارێکیش پشتی کردە دەولّەتی سەفەوی... شا سەفی سپایەکی گەورەی ناردە سەری و، پاش ماوەیەک بەسەریا زالّ بوو، خان ئەحمەد خان دووبارە خۆی دایەوە پالّ عوسمان و لە شاری مووسلّ دانیشت تا کۆچی دوایی ١٠٤٦ و لە گۆڕستانی یونس پێغەمبەردا کە بە «نەبی یونس» و «نەینەوا» بەناوبانگە نێژرا. پاش ئەوەی کە خان ئەحمەد خان لە ولآت دەرچووبوو شا سەفی فەرمانڕەوایی ئەردەلآنی دایە ئەمیر سلێمان کوڕی ئەمیر عەلەمەدین خان و، دەستووری دایێ قەلآی حەسەن ئاوا بڕووخێنێ و، لە دژی سنە دابنیشێ... ئەم (دژی سینە)یە بەپێی بیروباوەڕی موعتەمەدی و نووسەرانی کۆنی ئەردەلآن، چونکە بەلاپالّی کەژ و چیاکەوە بووە، بەناوی (دژی سینە) ناسراوە. پاشان وشەی (دژی سینە)

له زمانی فارسییا بووه به (سنەدژ) و لەویوه وەرگەڕاوه به (سەنندج)... ئەمەش نابێ بەشتێکی سەیر بزانرێ، له نێوانی زمانی کوردی و زمانی فارسییا زۆر واژه، ئەم جۆرە گۆڕانەی بەسەرا هاتووه، بۆ وێنه: ناوی (مەندەلی) له بنەڕەتا (بەندەزگان) بووه، واتا خاوەنی بنەوانەی ئاوی زۆر، یاخود بەندەنی ناو زورگ و هەڵەت... عەرەب وەریان گێڕاوە به (بەندەنیجان) و لایان وابووه که وشەی دوو کەسییه، که عەرەب پێی ئەڵێن (موثەننا) و کردوویانه به (بەندەنیجین) و تاکەکەیان کردووه به (بەندەنیج) و پاش ئەوه له فارسییا بووه به (مەندەلیج)... جا لەبەرئەوەی کە مەرگی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان و، ڕووخاندنی قەڵای حەسەن ئاوا و گوێزانەوەی ناوەندی وڵات بۆ سنه هەموو له یەک ساڵا ڕووی دا، مێژوویییەکەیان بەپیتی ئەبجەد وت و بووه (غەمها) که ئەکاته ١٤٦... لەبەر ئەم هۆیانەی کە وتمان، ئێمە لامان وایه که وشەی (سنندج) له (سانان دژ)ەوه نەهاتووه و، له (سینەدژ)ەوه هاتووه...

و له وتاری داهاتوودا، پتر لەسەر باسی سنه ئەڕۆین، ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٣/٤/١٦

١٦/خەرمانان/ ٢٦٨٣

گوێگرە خۆشەویست و بەنرخەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و کامەرانی ڕابووریَ، لە وتاری ڕابردووودا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە شاری (سنە)ی ئێستە کە بەفارسی پێ ئەوترێ (سەنەندج) ساڵی ١٠٤٦ی کۆچی لە لایەن ئەمیر سلێمان عەلەمەدینی ئەردەڵانەوە دروست کراوە و، هەروا ئەوەمانیش ڕوون کردەوە، کە ئەوەی دەوترێ لە بنەڕەتا تا ناوی (سەنەندج) و (سانان دژ) بووە، واتا قەڵای سوڵتانان، باوەڕێکی دوور لە ڕاستەقینەی مێژووییە... چونکە لە ئەمیر سلێمان خانی ئەردەڵانەوە تا دوایی هیچیەک لە سەرداره ئەردەڵانەکان نازناوی (سوڵتان)یان نەبووە...

بابێینە سەر جوغرافیانووسی بەناوبانگی فەرەنسی ژاک دومورگان ئەو لە بەرگی یەکەم و دووەمی جوغرافیاکەیا ناوی شاری سنەی ناوە: (صەحنە) و لە پەراوێزی لاپەڕە ٤٩دا نووسیویە: (صەحنە) یا (صیحنە) کە (سنە)ش ئەنووسرێ، شارێکی زۆر کۆنە و، ناوی خۆی بڕیوە بەسەر هەموو دەوروبەریا... وەکو ئەبینن ئەم باوەڕەی ژاک دومورگان لە ناوی (صەحنە)ی کرماشانەوە بەهەڵە چووە، ئەو ناوی (صەحنە)ی لە کتێبە مێژووییەکانا دیوە: کە ٦١ کیلۆمەتر لە کرماشانەوە دوورە و، ئەکەوێتە نزیکی شەقامەڕێی کرماشان تاران و، بەلای باکووری خۆرئاوایا و، ئێمە لە باسی پیتی (صادا) لێی ئەدوێین.

ئەوەی ڕاستی بێ لیسترنج باشترین جوغرافیانووسێکە لە ناوی سنەی کۆڵیوەتەوە. ئەو لەو کتێبەدا کە دەربارەی جوغرافیا بەئینگلیزی نووسیویە و، گۆڕاوە بۆ عەرەبی و، بۆ فارسی... بەناوی «سەرزەمین های خیلافەتی شەرقی» لە لاپەڕە ٢٠٥یدا ئەڵێ:

ناوەندی تازەی ولایەتی کوردستان کە ناوی (سحنە)یە هیچ کەس لە جوغرافیانووسانی سەدەکانی ناوەنجی -چ ئێرانی چی عەرەب- لە کتێبەکانیان ناوی ئەم شارەیان نەبردووە... و لە سەردەمی ئیبن خوردادبی و قەدامە و یاقوتی حەمەویدا لەم جێگەیەدا شارێکی (سیسەر) ناو هەبووە - کە گومان ئەکرێ دێی (سیسی) ئێستە بێ کە ٣٦ کیلۆمەتر لە سنەوە دوورە و لای خۆرهەڵاتییەوەیە، پاشماوەی ئەو شارە کۆنە بێ چونکە لەوێ جێیەک هەبووە، لەبەر زۆریی کانی و کانیاو و سەرچاوە پێی ئەوترا «صەت خانی»... ئەمین کوڕی هارون ڕەشیدی خەلیفەی عەبباسی لەوێ قەڵایەکی دامەزراندبوو، هەرکە لەگەڵ مەئمونی برایا تێکچوو مەئمون ئەو قەڵایەی لێ داگیرکرد و سەرداره کوردەکانی ئەو هەرێمەی لە

خۆی کۆکردەوە و، بەهۆی ئەوانەوە بەهێزبوو و، لەگەڵ ئەمینی برای کەوتە شەڕ و بەسەریا زاڵبوو و، لە تەختی خیلافەت هێنایە خوارەوە ئەم (سیسەر)ە کە ناومان برد، لە سەردەمی مەئموندا یەکێ لەو بیست و چوار (بەخشە) -یا (ڕۆستا)یەیە- کە لەوحەلەدا سەر بەهەمەدان بوون و، دوور نییە ناوی (صەد خانی) وەرگەڕابێ بە (سەدخانە) و پاشان بووبێ بە (سەحنە). بەڵام ئێمە بەڵگەیەکمان بۆ ئەم گۆڕانە بەدەست نەهێناوە... ئەمەبوو وتەی لیسترنج.گوێگرە خۆشەویستەکان جا وەکو بۆمان ڕوون کردنەوە، ئەم لێکۆڵینەوەیەی میستەر لیسترنج زۆر زانایانە و، مێژوونووسانە بووە تا ئێستە با بگەڕێینەوە سەر ئەوەی کە سنە پاش دەورانی سلێمان ئەمیر عەلەمەدین خان چی بەسەرهاتووە؟ و تا چ ڕادەیەک پەرەی سەندووە... بەپێی ئەو زانیارییانەی کە مێژوونووسە تورکەکانی عوسمانی بڵاویان کردبووەوە: پاش مەرگی خان ئەحمەد خان و دانیشتنی ئەمیر سلێمان خانی، ئەردەڵان، لەسەر کورسیی فەرمانڕەوایی سلێمان بەگی بابان هەڵی کوتاوەتە سەر ئەو هەرێمانەی، کە لە حەلی خۆیا خان ئەحمەد خان خستبوویە سەر ئەردەڵان، هەمووی لەژێردەس ئەمیر سلێمان دەرکردبوو، واتا هەرێمەکانی: (شارەزوور، مەریوان، هەورامان و بانە)ی لە ئەردەڵان دارنی بوو. هەروا دوو عێلی سیامەنسووری و جافیشی کردبووە سەربەخۆی... ئەمەش لەبەرئەوەی لە سەردەمی سوڵتان مورادا ڕووی دابو، تا ئێستە بەجافەکانی کوردستانی ئەودیو ئەوترێ جافی مورادی و، گەرچی ئەمیر سلێمان ئەیەویست هەوڵ بدات ئەو هەرێمانە لەژێر چنکی سلێمان بەگی بابان دەربکات، بەڵام شا سەفی لێی کەوتە گومان و، ناردی بەشوێنیا بردی بۆ ئەسفەهان و، دەستووریشی دا فەرمانڕەوایی ئەردەڵانیان لە نێوانی کوڕەکانی دابەش کرد: سنە و دەوروبەری خرایە ژێردەستی کەلب عەلی خانی کوڕی و، مەریوان و دەوروبەریشی خرایە ژێر فەرمانی خوسرەو خانی کوڕی و، چەند هەرێمێکی تریش درایە سورخاب سوڵتانی کوڕی و، هەرێمەکانی بانە و هەورامانیشی درایەوە بەفەرمانڕەوا کۆنەکانی خۆیان، کە لەوەبەر خان ئەحمەد خان لێیانی داگیرکردبوو و، سەرۆکایەتی جافیش درایە ئەمیر خان سوڵتان و قەڵای پاڵەنگانیشی درایە کەڵوڕەکان و سپێررایەوە دەس مورید خانی سەرۆکی کەڵوڕ و، لەو چەند ساڵەدا، هەر ئەوەبوو کە سنە دامەزرابوو و، گەرنە هیچ پێشکەوت و پێش ڕەوتێکی نەکردبوو.

لە وتارەکانی نایندەدا باسی چۆن پێشکەوتنی سنە ئەکەین... ئێستە کاتمان تەواوبوو، بەخواتا ئەسپێرین شەوتان باش.

١٨/٤/١٣٥٣ - ١٨/خەرمانان/٢٦٨٢

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆشی بێ. لە وتارەکانی پێشوودا وتمان: ناوی (سنە) دەبێ لە ناوی (سینەدژ)ەوە هاتبێ، بەناوی ئەو دێ و قەڵا کۆنەوە کە بەپاڵی کێوەکەوە بووە، واتا بە (سینە)ی کێوەکەوە بووە... هەروا ئەوەشمان ڕوون کردەوە کە هەندێ وتوویانە ناوی سنە لە بنەڕەتا (سەنان دژ) بووە بەناوی قەڵای ئاسنین و، هەندێ وتوویانە (سانان دژ) بووە، واتا قەڵای سوڵتانەکان و، هەندێکیش وتوویانە لە بنەڕەتا (صەت خانی) بووە، سووک بووە و داتاشراوە و، بۆتە (صەت خەنە) و ئنجا بووەتە (سنە)... و هەندێکیش لایان وایە کە لە بنەڕەتا (سەهەندە) بووە، واتا جێگەیەکی سێبەر و، خۆرنەگرتوو و، سارد... کە ئەم باوەڕەی دواییەیان زۆر لە ڕاستییەوە نزیکترە... بابێینە سەر ئەوەی کە ئەمیر سلێمان کوڕی عەلەمەدین خان لە سنەدا چی کرد؟ و چۆنی کردە شار.

ئەو هەروەک چەند خانوومان و سەرا و قەڵای دروست کرد، هەروا بازاڕێک و چەند مزگەوت و چەند قوتابخانەی ئاینی دروست کرد. هەروا کە سەرنجی دا، ئاوی کانیاوی ناو شار، بەشی خەڵقەکە ناکات، ئاوی ئەو کارێزەی ڕاکێشا بۆ ناو شار کە بەکارێزی پردی بەن بەناوبانگ بوو... جێگەی ئەو کارێزە زۆر لە شارەکە بەرزتر بوو، ئەو ئاوەی بەهۆی کونج و تەموژەوە -کە جۆرە لوولەیەکە لە قوڕی سوورەوەکراو دررست ئەکرێ- ڕاکێشا بۆ ناو شار و، بۆ کۆشکی سەردارێتی... ئەم ئەمیر سلێمانە پاش ئەوەی چەند ساڵێ سەردارێتی کرد -وەکو لە وتاری پێشوودا دیاردیمان بۆ کرد- شا سەفی بانگی کرد بۆ ئەسفەهان... ئنجا کەلب عەلی خانی کوڕی لە جێی دانیشت. ئەو پیاوە، وەکو باوباپیرانی خۆی ئەبوو، کە دەس بڵاوبێ... توانی لە ماوەیەکی کەمدا ڕەونەق بداتە شارەکە و گەنجینەی وڵات و، بازاڕی تری دروست بکات و هەرێمەکە بکات بەچەند بەشەوە: مەریوان بسپێرێ بەخوسرەو خانی برای و، سەقز بسپێرێ بەزۆراب سوڵتانی کوڕی و ئەورامان بداتەوە دەس سانانی ئەورامان... و پاڵەنگان بخاتە ژێردەستی مورید وەیسی سوڵتان و، جوانڕۆش بدات بەسەفی خان سوڵتان و، گەڵباغیشی بدات بەمحەممەد سوڵتان گەڵباغی و، سەردار و پیاوماقووڵانی تری وڵاتیش، هەریەک بخاتە سەر کارێکی دیوانی... سەردارێتی ئەردەڵان لە سەردەمی ئەم ئەمیرەدا ئەوەندە بەهێزبووە، کە سەفی شای سەفەوی لە کاتی شۆڕش پەیدابوون لە خۆزستان، داوای لە ئەو کردووە بەهێزی

ئەردەڵانەوە بڕوات بۆ دامرکاندنی شۆڕشەکە و بەم جۆرە ئەمیر کەلب خانی کوڕی ئەمیر سلێمان نزیکەی ۲۲ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد... بەڵام پاشان شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی ڕقی لە بنەماڵەی ئەردەڵان هەستا، دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە دەس دەرکردن و ساڵی ۱۱۱۳ لە جێی ئەم کەلب عەلی خانە، محەمەد خان گورجی کرد بەسەرداری ئەردەڵان. ئەم کابرایە گەرچی کوردستانی نەبوو بەڵام بەپێی قسەی مەستوورە خانم لە ڕووی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەوە زۆر هەوڵ و کۆششی داوە، تا ڕادەیەک لای بازاڕە کۆنەکەوە نزیک بەسەرای سەردارێتی، مزگەوتێکی دروست کردووە و، کاروانسەرایەکی دوو نهۆمیی شەست ژووریی ساز کردووە و، چونکە ئەم کاروانسەرایە لە ناو زەوی مەلا عەبدولکەریم قازیدا بووە، مزگەوتەکە و ئەو کاروانسەرایەی سپاردووە، بەمەلا عەبدولکەریم کە هەندێ لە دەرئامەد و دەسکەوتەکەی بۆ خۆی بێ و، هەندێکی بەخت بکات بۆ مزگەوتەکە و، بۆ ئاستان و بارەگا خاوێنەکانی نەجەف و کەربەلا و مەشهەد و، ئەویش زۆر پیاوانە و موسوڵمانە ئەو دەرئامەد و دەسکەوتەکەی لە جێی خۆیا بەخت نەکرد... بەم جۆرەی کە وتمان شاری (سنە)ی ئێستە بوو بەشارۆلکەیەک خێوی بازاڕ و کاروانسەرا و، گەرماو و، مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی... ساڵی ۱۱۱٦ کۆچی، شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی ئەم محەمەد خانی گورجییەی لە سەردارێتی ئەردەڵان لابرد و، حەسەن عەلی خانی کوڕی محەمەد مومین خانی ئیعتیماد الدەولەی لە جێی دانا... بەڵام ئەم کابرای دواییەش تەنیا دوو ساڵ، فەرمانڕەوای ئەردەڵان بوو... پاش ۱۱۲۲ جارێکی تری وڵاتی ئەردەڵان کەوتەوە دەس بنەماڵەی سەردارانی ئەردەڵان و، لە وتارەکانی ترا باسی ئەوە دەکەین، کە چ جۆرە ئاوەدانییەکیان لە وڵاتەکەدا هێناوەتە دی...

تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

۲٤/خەرمانان/۲٦۸۲

۲٤/تیر/ ۱۳۵۳

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، لە وتارەکانی پێشوودا بەڵێنمان دانێ کە زۆرتر لەسەر باسی (سنە) بڕۆین، کە لە سەرەتای دامەزرانییەوە تا ئەمڕۆ چی جۆرە دامودەزگاییێکی تیا دامەزراوە و چۆن پەرەی سەندووە؟ و چەند جار نووشستی دیوە و تووشی وێرانی بووە؟... پاش ئەوەی کە لە سەردەمی شا سوڵتان حوسێنی سەفەویدا، سەرداریتیی ئەردەڵان لە دەس بنەماڵەی خانانی ئەردەڵان دەرکرا، جارێکی تری دەسەڵاتی وڵاتەکەیان کەوتەوە دەستیان ساڵی ١١٣٢ی کۆچی عەبباس قوڵی خانی کوڕی محەمەد خانی ئەردەڵان کە بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی وڵاتی ئەردەڵانی گرتەوە دەست، کەوتە هەوڵدان بۆ پەرەدان بەشاری سنە... بەڵام لەم کاتەدا بنەماڵەی شاهانی سەفەوی بێ هێز و پێز بووبوون و، لە ڕۆخانا بوون... لای خۆرهەڵات و، لای باشووری خۆرهەڵاتییەوە، ئوزبەگ و ئەفغان شاڵاویان کردە سەر ئێران و، مرخیان لێ خۆش کرد، هەر لەم کاتەدا سەردارەکانی عوسمانیش هەڵیان کوتایە سەر خۆرئاوای باکوری ئێران و، وان، ئێرەوان، شێروان، ئازەربایجان تا مەراغەیان داگیرکرد... ئێران بەتەواوی شڵەژا و، سوڵتان حوسێن خۆیشی کە ئەیەویست لە هێزی عێل و سەردارییە کوردەکان سوود وەربگرێ بۆ پاراستنی وڵات کوژرا... خان محەمەد پاشای بابانیش کە لەوەپێش لەگەڵ سەردارانی ئەردەڵاندا لە هەرادابوون، هەڵی کوتایە سەر ئەردەڵان و داگیری کرد و، عەبباس قولی خانی ئەردەڵانیش لە شەڕا کوژرا...

موزیک

خان پاشا، کە سنەی داگیرکرد، کەوتە بیری ئاوەدانکردنەوە... نەک وەک داگیرکەران، کە ئەکەونە وێرانکردن. بەپێی قسەی مەستوورە خانم دیل و زیندانییەکانی هەموو بەخشی بەمەلا عەبدولکەریمی قازی نەوەک هەر ئەوانەی کە لە دەوروبەری سنە کەوتبوونە داوی دیلی... بەڵکو ئەوانەش کە لە دەوروبەری هەمەدان و کرماشان لە شەڕا دیل کرابوون... و لەبەرئەوەی خان پاشا زۆر مەلا و خوێندەواری خۆش ئەویست و بەئاینەوە بەسترابوو، جگە لەوانەی وتمان نزیک بەسەرای سەرداریتیش لەو پارچە زەوییەدا کە پاشان وەرگەڕا بە (باغی فیردەوس)، مزگەوتێک و قوتابخانەیەکی ئاینی دروست کرد و، منارەیەکی

بەرزیشی بۆ دامەزراند و، ئەمانەی هەموو خستە ژێر دەسەڵاتی مەلا عەبدولکەریمی قازییەوە...

پاشان مەستوورە خانم ئەڵێ: من ئەم مزگەوت و قوتابخانەی ئاینییەم دیبوو، بەڵام ئەمانوڵڵا خانی دووەم کە دەسەڵاتی وڵاتی گرتەدەست، چاوی بەرایی نەدا، دامودەزگایێ ببێنێ کە لە لایەن داگیرکەرانی وڵاتەوە دامەزرابێ، هەمووی رووخاند و، لە جێی ئەو باغی فیردەوس دروست کرا... تا لەم دەورەدا بوو، کە نادر شای کەڵەمێرد راپەڕی و، شاهەنشایی ئێرانی زیندووکردەوە و، کەوتە رامالینی دوژمن، لای خۆرهەڵات و لای باشووری خۆرهەڵاتییەوە (ئوزبەگ و ئەفغان)ی راڕفاند و، کەوتە پاککردنەوەی باکوری خۆرئاوا و، بەشی لای خۆرئاوای وڵات -کە گەیشتە سنە و خەڵقی وڵات پێشوازیان لێ کرد، بەپێی راوێژی پیاوماقوولان سبحان وێردی خانی ئەردەڵانی دانا بەفەرمانڕەوای ئەردەڵان... ئەم سبحان وێردی خانە پیاوێکی زرنگ و جوامێر بوو، لای خەڵقی کوردستانی ئەردەڵان خۆشەویست بوو، لە شەڕ لەگەڵ ئەفغانەکان و، لەگەڵ عوسمانییەکانا زۆر ئازایانە و مەردانە بوو، نادر شا زۆری رێز لێ ئەنا... و لە کاتێکا کە لەشکری ئەفغان هەڵیان کوتابووە سەر هەمەدان و سوبحان وێردی خان چووبوو بەرەنگاربیان، حەسەن عەلی خانی ئەردەڵان کە کوڕی عەبباس قولی خان بوو، هەلی دەسکەوت و هەڵی کوتایە سەر سنە و ناوەندی فەرمانداریێتی لە سوبحان خان داگیرکرد... سوبحان وێردی خان کە بەمەی زانی، نەیویست بەشەڕی خێزانییەوە، وڵات خوێناوی بکات. هەرکە لە شەڕ لەگەڵ ئەفغانەکاندا سەرکەوت، چوو لە هەمەدان دانیشت و، تا کۆچی دوایی هەر لەوێ مایەوە... بەڵام حەسەن عەلی خان هەرکە دەسەڵاتی لە ئەردەڵان، وەرگرتە دەست کەوتە پەلاماردانی هەرێمی زەند، کە لەگەڵ سنە هاوسنوور بوون... ئەوحەلە سەرانی زەند بریتی بوون لە کەریم خان و شێخ عەلی خان و، ئەسکەندەر خان ئەمانە بەرەنگاری سپای ئەردەڵان بوون و ساڵی ١١٦٢ نزیک بەمەلایر هەردوولا کەوتنە شەڕەوە، دلێرانی زۆر، لە ئەردەڵانییەکان و زەنگەنەکان و زەندەکان کوژران...

سەرئەنجام کەریم خانی زەند ئەردەڵانی داگیرکرد... و ئەم شەڕانە بووە هۆی وێرانبوونی شاری سنە... لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٣/٤/٢٦

**وتاری: ١٣٦**

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، کامەرانیتان ئاواتی ئێمەیە. لە وتارەکانی پێشوودا هەندێکمان لە مێژووی جوغرافی سنە بۆ ڕوون کردنەوە و، هێشتا هەر لەسەر ئەو باسە ئەڕۆین... شاری سنە کە ناوەندی ئوستانی کوردستانە و، لەوەبەر بەناوەندی (ئەردەڵان) بەناوبانگ بوو، لە ڕۆژگاری هەندێ لە خانانی ئەردەڵاندا بەرەو ئاوەدانی چووە و، مزگەوت و قوتابخانە و بازاڕ و، سەرا و کاروانسەرا و، گەرماو و، داروخانە و نەخۆشخانەی تیا دروست کراوە... و لە دەورانی هەندێ لەوانەشا کە بەشتی پڕوپووچەوە خەریکبوون و، لەسەر مالیات و سوروسات نەدان لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزیبا تێکچوون، وڵاتەکەیان تووشی تەنگوچەڵەمە هێناوە... ئەوەی وتمان، ئەوەک لە سەردەمی سەفەوییدا ڕوویداوە، بەڵکو لە سەردەمی ئەفشارییە و، زەندییەشا هەر ڕوویداوە،... چون پادشایانی زەند بەر لە ڕۆژگاری پاشاییتییان لەگەڵ سەردارانی ئەردەڵاندا، لەبەرئەوەی هاوسنووربوون و جارجارە خانانی ئەردەڵان شاڵاویان کردۆتە سەر هەرێمی کرماشان و لوڕستان، ناکۆک بوون و نێوانیان ناخۆش بووە... خوسرەو خانی دووەم کە ساڵی ١١٧٠ کۆچی وڵاتی گرتۆتە دەست کەوتۆتە ئاوەدانکردنەوەی وڵات و، بووژاندنەوەی خەڵکی هەرێمەکە. جا لەبەرئەوەی کە شاری سنە بەهۆی شاڵاوی دوژمنانەوە وێران بووبوو خوسرەو خان بەجۆرێکی دەمی قەڵا ڕۆخێنراوەکەی حەسەن ئاوای تازە کردەوە و گوێزایەوە ئەوێ، بۆ ئەوەی مەیدان چۆڵ بێ بۆ ئاوەدانکردنەوەی شاری سنە. خەڵقی وڵاتەکە، کە ئەم بەخەمی و دەربەست هاتنەی خوسرەو خانیان دی، پڕ بەدڵ خۆشیان ویست و سەری کڕنووشیان بۆ دانەواند، بەڵام عوسمانی و ئەفغان وازیان لە شاڵاو بۆ سەر خاکی ئێران نەدەهێنا... لە دوولاوە ئاژاوەیان ئەخستەوە، ئازادخانی ئەفغان لەولاوە بەرەو کوردستان شاڵاوی هێنا و، لەملاشەوە سلێمان پاشای بابان شاڵاوی هێنا... هەم سنەیان گەمارۆدا و، هەم قەڵای حەسەن ئاباد... هەرکە خوسرەو خان هەستی بەکەم دەسەڵاتی کرد نامەیەکی نووسی بۆ شێخ عەلی خان زەند کە سەرداری هەمەدان بوو، بگاتە دەنگی،... و بەم جۆرە توانی هێزی هەردوولایان بشکێنێ و، هەرێمی کوردستان لە چنگی داگیرکەران دەربکات... ئەم باسەی کە بۆمان ڕوون کردنەوە، مەستوورە خانمی ئەردەڵانی، لەو کتێبە تەئریخییە وەری گرتووە، کە خوسرەو بەگ ناوێ دایناوە و، بەداخەوە ئێمە ئەم کتێبەمان بەرچاو نەکەوتووە و، زۆر

کتێبی تری وەک ئەم کتێبەش لە مێژووی کوردستان و کورد و شارە کوردەوارییەکانا نووسراوە و، ئێمە لێی بێ ئاگاین.

بابێینەوە سەر خوسرەو خان، ئەو پیاوە گەورەیە پاش ئەوەی لە شەڕا بەسەر ئەفغان و عوسمانییا زاڵ بوو و، وڵاتی کوردستانی ئەردەڵانی لێ ڕزگارکردن، ئنجا خۆی کەوتە پەرەدان بەهەرێمەکەی ژێردەستی، (ئەسەد ئاوا، سونقوڕ، دینەوەر و کرماشان)ی خستە سەر ئەردەڵان... ئنجا کە لە دەسدرێژی دوژمنان دڵنیابوو، کەوتەوە ئاوەدانکردنەوەی شاری سنە، لە سەرەتادا بەرامبەر بەو جێیەی کە (تەپولە)ی ناوە، سەرایەکی بۆ سەرداریێتی دامەزراند و، مزگەوتێکی گەورەی دروست کرد و، گەرماوێکی ڕازاوەی دروست کرد و باغێکی زۆر جوانیشی دامەزراند کە بەچوار باغ و باغی مەیدان ناسراوە.

ئا لەم دەورەدا بوو، کە شەڕ لە نێوانی زەندییەکان و، قاجارەکاندا دەستی پێ کرد و، زەندییەکان بەسەر حەمە حوسێن خانی قاجاردا زاڵ بوون و، پادشایەتیی بنەماڵەی زەندییە دەستی پێ کرد و، کەریم خانی زەند ناوی خۆی نا (وەکیل الرعایا) و لەبەرئەوەی کە خوسرەو خانی ئەردەڵان لە شەڕ و هەرای نێوانی بنەماڵەی زەندییە و قاجاردا، لای قاجاری گرتبوو، کەریم خان سەرداریێتی ئەردەڵانی لە دەس خوسرەو خان داڕنی و سلێمان پاشای بابانی کرد بەسەرداری ئەردەڵان کە لەو حەلەدا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕابوو و، خۆی دابووە پاڵ دەوڵەتی ئێران و، لەگەڵ دەوڵەتی زەندییەدا هاوبیر و هاوکار بوو... ئەم سلێمان خانی بابانە گەرچی خۆی جارجارە لە شارەزوور دائەنیشت و جارجارە لە سنە بەڵام ئەردەڵانی سپاردبوو بەکوڕێکی خۆی کە ناوی حەسەن بەگ بوو... و ئەو کوڕەکەی تریشی کە ناوی عەلی خان بوو ناردبوویە شیراز کە لە دەربارەی کەریم خانی زەندا بێ... بەڵام لە ساڵانی ١١٧٩-١١٨٠دا، خوسرەو خانی توانی لەگەڵ کەریم خانی زەندا ئاشت بێتەوە، بەوهۆیەوە کە پیاوماقووڵانی شاری سنە چوون بۆ شیراز و تکایان لە کەریم خان کرد، بەزەیی بێتەوە بەخەڵقی ئەردەڵان و بەشاری سنەدا و، کاروباری وڵات بداتەوە دەس کوڕی شایەستەی بنەماڵەی ئەردەڵان، کە بەژیر و هۆشی خۆی وڵات بەڕێوە ببات و سایەی داد بەسەر مرۆڤی وڵاتا بڵاوبکاتەوە... و دەستی ئاوەدانکردنەوە درێژ بکات بۆ وڵات.

بەم جۆرە خوسرەو خان کەوتەوە بەڕێوەبردنی وڵات و، ئاوەدانکردنەوەی شار و لادێکان و هەر ئەوبوو کە داوای لە شێخ عەلی خانی زەند بکات وێرانەکانی شاری هەمەدان ئاوەدان بکاتەوە. ئیتر کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٣/٥/٥

## وتاری: ١٢٧

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش، کامەرانیتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامەکانی ڕادیۆی کوردیی ئێرانە... لە وتارەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە شاری سنە لە دەورانی هەندێ لە سەردارانی ئەردەڵاندا بەدامەزراندنی ساختمانی جوان و، دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە و بازاڕ، شارەکە ئاوەدان کرایەوە... مەستوورە خانم لە تەئریخی ئەردەڵاندا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە ئەمانوڵڵا خانی گەورە کاتێ کاروباری وڵاتی ئەردەڵانی لە ساڵی ١٤١٤ی کۆچیدا گرتۆتە دەست دیەنی شاری سنەی بەتەواوەتی ڕازاندۆتەوە، تالاری دڵگوشای دروست کردووە کە ساختمانێکی بەرز و بەربڵاو و خاوەن ژوور و هەیوانی زۆر بووە و، بەچەند گومبەزی فەرەنگییانەی جوان دروست کراوە، کە لەو حەلەدا وێنەی زۆر کەم بینراوە... و ئەم تالارە تا ساڵانی ١٣٤٠ کۆچی هەر ماوە و، پاشان لە لایەن شەرف الدەولەوە وێران کراوە. یەکێ تری لەو ساختمانە هەرە گرنگانەی کە یادگاری ئەمانوڵڵا خانی گەورەیەوە تا ئێستا هەر ماوە و، یەکێکە لە شاهکارەکانی میعماریی ئەو حەلە، مزگەوتی دارلئیحسانە، کە تا ئێستە، هەر مزگەوتی جومعەی سنەیە و بەجوانترین نەخش و نیگار و کاشیی هەمەڕەنگ ڕازاوە و زانای بەرزی کورد شێخ مەعرووفی نۆدییە، کە یەکێ بووە لە ڕابەرانی تەریقەی قادرییە و، نزیکەی نەوەد کتێبی بەهەڵبەست و پەخشان، لە زانستی جیاجیادا داناوە و، یەکێ لەوانە کتێبی (ئەحمەدی)یە، فەرهەنگۆکی کوردی عەرەبییە و بەهەڵبەستە و منالانی کوردەواری زۆریان خوێندوویانە... ئەو زانا مەزنە مێژووی دروستکرانی ئەو مزگەوتەی بەپارچە هەڵبەستێکی عەرەبی وتووە کە ئێمە لێرەدا یادی لێ دەکەین، چون ئەم پارچە هەڵبەستە لەو کتێبەدا نییە کە زانای بەرێز مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەربارەی شێخ مەعرووف و شوێنەوارەکانی نووسیویە... پارچە هەڵبەستە عەرەبییەکە ئەمەیە:

تَعالَوا، وَأَنْظُروا، يا قَوْمِ هذا الجامِعَ العالي
بِه لِلْبالِ تَفريحٌ، وَتَفريحٌ لِبَلْبالِ
مَقامٌ طَيِّبٌ ذو نَزهَةٍ يَزْهو بِتَزيينٍ
وَإِحكامٍ وَتَرصيصٍ، عَلى آلافِ أَمْثالِ

فَصَلّوا فيه وَاتلوا فيه قُرءاناً وَأذكاراً
جَماعاتٍ وَأفذاذاً، بأبكارٍ وَآصالِ
بَناهُ الخان على الجاه قَرمٌ ضَيْغَمُ التهجا
أمانُ اللّه وَهّابُ العَطايا باذلُ المالِ
مُحبُّ السّادَةَ الأشراف وَالأحبار، موليهمُ
منَ الخيّراتِ ما فيه لَهُمْ إصلاحُ أحْوالِ
ألا فادْعوا لَهُ طَرّاً بإقْبالٍ وَإجْلالِ
وَإفْلاحٍ وَإصْلاحٍ وَإنجاحٍ لآمالِ
وَلَمّا قيلَ أرِّخْ عامَ تَكْميلِ البنا قُلْنا:
لجَدٌّ أفْلَحَ الوالي بِهذا الجامعِ العالي

٣٨ × ١١٩× ٧٨ × ٧٠٨ × ١٤٤ × ١٤٣ = ١٢٢٨

بەپێی ئەو مێژووەی کە بەپیتی ئەبجەد لە نیوە هەڵبەستی دواییدا دایڕشتووە. ساڵی ١٢٢٨ ئەم مزگەوتە، کاروباری دروستکردنی بەتەواوی پێکهاتووە. جگە لەمانە ئەمانوڵڵا خان لەبەردەم سەرای سەرداریتییا مەیدانێکی زۆر بەربلاوی دامەزراندووە، کە بەدار و گوڵ ڕازاوەتەوە... ساختمان و باغی خوسرەو ئاواشی دامەزراندووە بەناوی (خوسرەو خانی) کورییەوە، ئەم ساختمان و باغە کەوتبووە خۆرئاوای شاری سنەوە و، ئەمانوڵڵا خان خۆی هاوینان لەم تالارەدا کاروباری وڵاتی بەڕێوە بردووە. جگە لەمانە چووەتە تەماشای دیمەن و چاوئەندازەکانی چیای ئاویدەر و، لەوێ کانی شیفای بەناوبانگی دیوە کە جێیەکی خۆش و دڵگیر بووە، دەوروبەری ئەو کانییەی کردووە، چەمەن زارێکی دڵگیر و دڵڕاکێش، هەروا لە حەسەن ئاوایش باغ و کۆشکێکی ڕێکوپێکی بەپاڵ گردێکەوە دامەزراندووە... قەڵا و ساختمانی قسلانیش هەر لە شوێنەوارە گرنگەکانی ئەوە.

ئەم سەردارە گەورەیە، لە ڕۆژگاری دەسەڵاتییا نەوەک هەر شاری سنەی کردبووە گوڵزار، بەڵکو هەموو وڵاتەکەی ژێردەستی وەرگێڕابوو بەبەهەشتی بەرین... پەرەی دابوو بەخوێندەواری و، ئاسایش و دادی بەوڵاتا بڵاوکردبووەوە... لەبەرئەوە خەڵقی لە هەموو لاوە باریان ئەکردە شاری سنە و بوو بەشارێکی قنجیلە و، جێی بازرگانی و ئابووری و خوێندەواری.

جگە لەمانە ئەمانوڵڵا خان کاروباری عێلاتی کۆچەریشی باش بەڕێوە دەبرد و، مەیدانی نەدا لە وڵاتا تاڵان و بڕۆ و جەردەیی و دزی بکرێ... ئەم سەردارە، مەردە ساڵی ١٢٣٧ کۆچی، کۆچی دوایی کرد. مەستوورە خانمی مێژوونووس لەو ڕۆژەدا ئەم هەڵبەستەی بەفارسی بۆ کۆچی دوایی وت:

شبی دروادی فکرت فتاده
زبهر مصرعی اندرتک ودو

پی تأریخ سال فوت والی
هم ازبهر جلوس والی نو

خرد گفتا که در ملک ایالت
امان الله شد، ونبشت خرو

تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین شەوتان باش.

١٣٥٣/٥/٨

## وتاری: ١٢٨

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ، ئاواتمان سەرکەوت و کامەرانیتانە.

ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی (سنە) دەڕۆین و، ئەمانەوێ بەم وتارە باسی کۆنی سەردەمی سەردارێتی ئەردەڵان و، باسی ڕۆژگارانی والییەکانی دەورانی قاجار دوا بهێنین. چون ئێمە نامانەوێ لە هەموو سووچ و گۆشەیەکی مێژوویی ئەو ناوە بکۆڵینەوە ئەم کارە لە چوارسەد ساڵ لەمەوبەرەوە کراوە... ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی، لە شەرەفنامەدا، لە باسی ئەردەڵاندا لەم هەرێمە دواوە، گەرچی ئەو حەلە سنە دروست نەکرابوو... مەلا شەریفی ئەردەڵانی و، محەمەد حوسێنی ئەردەڵانی و، مەستوورە خانمی ئەردەڵانی و، میرزا شوکروڵڵای سنەیی و، بەدیع الزەمانی و چەند کەسی تریش، لە مێژووی سنە دووان... مامۆستا ئایەتوڵڵا مەردوخیش لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا، دووردرێژ دەربارەی سنە و زانایان و نووسەرانی و هەستیارانی دواوە... ئیتر پێتەویستی ئەوە نییە کە ئێمە لەم بارەوە پتر درێژە بدەین بەزنجیرە وتارەکەمان و، لەم وتارەدا تەنیا لە چەند ڕووداوێکی گرنگ ئەدوێین. یەکێ لەو ڕووداوە مامۆستا ئایەتوڵڵا مەردوخ لە لاپەڕە ١٦٣ بەرگی دووەمی کتێبە مێژووەکەیا ئەڵێ: «ساڵی ١٢٤٦ کۆچی، لە سەردەمی سەردارێتیی خوسرەو خانی ناکام»دا شا موراد بەگ ناوێ کە ئەمیری هەرێمی ڕەواندز بووە و، شارانی کۆیە و حەریر و ئەو ناوەی لەژێردەستا بووە کەوتۆتە پەرەدان بەسنووری وڵاتەکەی و سەردەشت و سابلاخ و موکری و لاهیجانی داگیرکردووە... فەتح عەلی شای قاجار لەم دەسدرێژییە تووڕەبووە و شڵەژاوە و، داوای لە خوسرەو خان ناکام کردووە، هێزی کوردستان کۆبکاتەوە و، بچێت بۆ تەمێکردن و سەر پێ شۆڕکردنی شا مورادبەگ... جا خوسرەو خان بەسپایەکی قورسەوە چووە و شکستی بەشا موراد داوە و، پاشان بەجۆری ئاشتی شەڕەکەیان بڕیوەتەوە و سی هەزار تومان زەرەر و زیانی شەڕیان لە شا موراد بەگ وەرگرتووە و گەڕاونەوە»...

ئەم هەواڵە گرنگەی کە مامۆستا مەردۆخ وەری گرتووە، دەبێ هی کتێبی (ناسیخ التەواریخی قاجارییە) بێ، کە ئەو لە دەنگوباسی ساڵی ١٢٤٧دا شتێکی وای وتووە. بەڵام ئەم باسە جێی دوودڵی و لێکۆڵینەوەیە، چونکە ماه شەرەف خانم مەستوورە کە ژنی

خوسرەوخان بووە، ئەم باسەی نەهێناوە هەروا لە ساڵی ١٢٤٦ و ١٢٤٧دا، پاشا کوێرەی بەناوبانگ کە ناوی حەمە پاشای کوڕی مستەفا پاشا بووە، سەرداریتی و فەرمانڕەوایی سۆرانی لەژێردەستا بووە واتا ئوستانی هەولێری ئێستە کە دەکەوێتە نێوانی دوو زێی گەورە و بچووک و، لەو حەلەدا تا شنۆش هەر بەدەستی ئەوەوەبووە... و پاشا کوێرە لەگەڵ دەولەتی ئێراندا نێوانی خۆش بووە و، لەگەڵ دەولەتی عوسمانیدا لە شەڕدا بووە... جگە لەوەش، لە نێوانی سەردارانی سۆران شا موراد بەگ ناویان نەبووە،... مێژووی میرانی سۆرانی حوزنی، خولاسەی تەئریخی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ... گەشتەکەی میستەر فرایزەر... گوزارشەکانی دوکتۆر ڕۆسی پزیشکی چاو، لە بالیۆزخانەی ئینگلیز لە بەغدا کە ساڵی ١٨٣٣ی زایینی ١٢٤٩ کۆچی چووەتە ڕەواندز بۆ تیمارکردنی چاوی ئەمیر مستەفا بەگ سۆرانی - باوکی حەمە پاشا کوێرە - ئەمانە هەمووی بۆمان دەرئەخات کە شتی وەها ڕووی نەداوە و، ساڵی ١٢٤٥ بەدواوە حەمە پاشای بەناوبانگ میری ڕەواندز و هەموو سۆران بووە.

یەکی تر لەو هەوڵانەی کە هۆی وێرانی و ناخۆشی بووە لە شاری سنەدا، بشێونەیەک بووە، کە لە سەردەمی ئەمانوڵڵا خانی دووەمدا ڕووی داوە، کە نازناوی غوولام شا خان بووە و، لە ١٣٧١دا ڕووی داوە، ئەو کارەساتە بۆتە هۆی ئەوەی کە زانایان و ئەدیبان و نووسەران و، مەلایانی ئاینی بەناوبانگ بەرابەرایەتی و پێشەوایی شێخ عەبدولقادری مەردۆخی سنەیی دانەری (تەهذیب الکەلام) وڵاتەکە بەجێ بهێڵن و، شارەکە بەوێرانی و شڵەژاوی بمێنێتەوە.

یەکێ تر لە ڕووداوانی سنە هی سەردەمی سەرداریتی و فەرمانڕەوایی ئەمیر نیزامەدین گەروسە، کە ناوی حەسەن خان بووە و، لە تیرەی کوردی گەروس بووە. ئەم پیاوە مەزنە کە ساڵی ١٣٠٩ کۆچی کراوە بەفەرمان فەرمای بەشی خۆرئاوای ئێران و کاروباری سنە و کرماشان و هەرێمەکانی تری ئەو ناوەی گرتۆتە دەست... بەوپەڕی پیاوەتییەوە کەوتۆتە ڕاستکردنەوەی ئەو چەوتی و نالەبارییەی سەردارانی پێشوو پێکیان هێنابوو... و بەزۆر بەسەر وڵاتا سەپاندبوویان... بۆ وێنە ئەوەی کە یاسابوو، ساڵانە چەند ئەسپ و بارگیر و هێستر بەپێشکەش بدرێ بەفەرمانڕەوا... ئەمانەی هەموو لابرد... باج و پیتاکی لەسەر خەڵک لادا... پێشوازیکردنی والی کە یاسابوو بەدهۆڵ و زوڕنا و تەپڵ و دەف و تۆپ تەقاندن ئەنجام بدرێ و، لە ڕێی فەرمانڕەوادا قوربانی بکرێت... ئەمانەی هەموو لابرد... و ئەم کارە چەپەڵانەی پووچ کردەوە...

شێخ عەبدولحەمیدی کانی مشکانی سنەیی، لە ستاییشی ئەم والییەدا پارچە هەڵبەستێکی عەرەبی زۆر بەرزی وتووە بەعەرەبی و ناوی ناوە (لامیەت الکورد)...

ساڵی ١٣٣٤یش کوردستانی سنە و دەوروبەری کەوتە بەر شاڵاوی سپای رووسی تزاری، هەموو تاڵان کرا، وێران کرا... سەرانی عێلات و تیرە کوردەکان... بەڕابەرێتی شێخ مەحموودی حەفید لە سپای رووس ڕاپەڕین و کوشتارێکی گەورەیان لێ کردن وڵاتیان لێ دارنین، شێخ عەبدولحەمیدی کانی مشکانی، دەربارەی ئەم شەڕە پارچە هەڵبەستێکی (هەمزیە)ی بەعەرەبی لە ستایشی و هەڵنانی شێخ مەحموودی مەزن نووسیوە، کە جوانترین و بەرزترین شێوەی عەرەبییە و، نووسەری ئەم بەرنامەیە لەسەر ئەو دوو پارچە هەڵبەستە شەرحێکی نووسیوە...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو تا بەرنامەی ئایندە شەوتان خۆش.

١٣٥٣/٥/١٥

## وتاری: ١٣٩

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ. لە وتارەکانی پێشوودا لە دەورانی کۆنی (سنە) دواین، تا سەردەمی شەڕی گشتیی یەکەم و پاومانی دەورانی قاجار، ئنجا لەم وتارانەی دواییەدا لە باسی سنە و، پێش ڕەوتەکانی دەورانی شاهەنشایی پەهلەویی ئەدوێین... لە سەرەتادا کوردستان و کرمانشاهان، پێکەوە ناونرابوون ئوستانی پێنجەم، پاشان ئوستانی کوردستان لە کرمنشاهان دابڕا و، ناونرا ئوستانی دوازدەیەم و، لەم دواییەدا، واز لەوەش هێنرا کە ژمارە بۆ ئوستانەکان دابنرێ. ناوی نرا ئوستانی کوردستان. چون ژمارەی ئوستانەکان پەرەی پێ درا و، لە ١٤ەوە گەیشتە زیاتر لە بیست.

موزیک

وەکو لە وتارەکانی پێشوودا وتمان، سالی ١٠٤٦ کۆچی شاری سنە بناغە نرا و، لە لایەن ئەمیر سلێمان کوڕی ئەمیر عەلەمەدینەوە کرا بەناوەندی فەرمانڕەوایەتی، کە لەو حەلەدا، سەرداریتیی ئەردەلان هەبوو، لە پاشان وەرگەڕا بەوالیتی و، لە پاش شەڕی گشتیی یەکەم وەرگەڕا بەئوستانداریتی ئەمڕۆ شارس سنە ناوەندی ئوستانەکەیە و، سنووری جوغرافیای ئوستانەکە بەم جۆرەیە: لای باکوری هاوسنوورە لەگەڵ ئازەربایجانی خۆرئاوا و، زەنجان. و لای خۆرهەلاتی هاوسنوورە لەگەڵ هەمەدان. و لای باشووری خۆرهەلات و، باشووریش هاوسنوورە لەگەڵ کرمانشاه و سنووری کوردستانی عێراق.

موزیک

ئوستانی کوردستان، لە ڕووی هەڵکەوتی جوغرافیاییەوە هەرێمێکی چیایی سەختە، پیا ڕابووردنی ناخۆشە... ئەکەوێتە ڕیزی ٤٧ پلەی درێژایی و، ٣٥ پلەی پانایی و، بەرزترین چیای چل چەشمەیە کە ٣٤٦٤ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە -لە بەشی ناوەند و مەرکەزەکەدا دوو زنجیرە چیای هەیە، لەلای باکوری خۆرئاواوە بەرەو لای باشووری خۆرهەلات درێژە ئەکێشن... ئەم دوو زنجیرە چیایە، پاش زنجیرە چیای شاهۆ بەرزترینی چیاکانی ئوستانی کوردستانن... گەردەنەی (ئارێز) کە لای خۆی نزمترین بەشی ئەم هەرێمە چیاییە ٢٢٢٦ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە و، ئەم گەردەنەیە نزیکەی ٤٥ کیلۆمەتر لە سنەوە دوورە و، ئەکەوێتە باشووری خۆرئاوای. گەردەنەی «سەلەوات»یش کە

٢٣ کیلۆمەتر لە سنەوە دوورە و، ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی، ئەویش هێشتا ٢٢٧٠ مەتر لە رووی زریە بەرزترە. ئاووهەوای سنە و زۆربەی جێگەکانی دەوروبەری ساردالە... بەڵام ئاووهەوای ئەو بەشانەی کە ئەکەونە کەناری رووباری قشلاقەوە، لە چاو جێگەکانی ترا ناوەنجییە، واتا زۆر سارد نییە.

رووباری قشلاق گەورەترین رووباری ئوستانەکەیە، سەرچاوەکەی لە بانە بەرزەکانی لای باکور و خۆرئاوای دێهستانی حوسێن ئاواوە دێت و، بەلای خۆرهەڵاتی شاری سنەدا بەدوورایی ٦ کیلۆمەتر رائەبوورێ و، کە ئەگاتە دێی قشلاق و، ناوی قشلاق ئەگرێتە خۆی... و ٣٦ کیلۆمەتر لە خوار سنەوە نزیک بەدێی بزەڵانە تێکەڵ بەرووباری گاورو ئەبێ... ئەم گاورویە لە بەرزە بانەکانی بەخشی خۆرهەڵاتی سونقورێ کولیاتییە دێ و بەبەخشی کامیارانا رائەبوورێ و لەگەڵ قشلاقدا تێکەڵ ئەبن و، ئەبن بەروخانەی ژاوەرۆ... و هەرێمە چیاییەکان ئەبڕن بەرەو بەشێ لە هەورامان و لەگەڵ رووبارەکانی رەزاو و مەریواندا بەیەکا تێکەڵ دەبن و (سیروان)یان لێ پەیدا بێ، کە بەرەو خوار ئەکشێ بەرەو کوردستانی عێراق و، لە هەرێمی کوردستان بەخوار بەناوی (دیالە) ئەناسرێ.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ، کە «قزل ئوزون»یش، کە گرنگترین و بەناوبانگترین رووباری ئێرانە، سەرچاوەکەی لە چیای چل چاوە (کوە چل چشمە)ی کوردستانەوەیە ئاوەکانی گەروس و، سەهەند و، چیاکانی هەمەدان لەگەڵ خۆی ئەبا و، بەرەو لای باکور ئەکشێ چەند رووبارێکی تری وەکو (هەشت رود و رودمیان) و ئەو ئاوانەی کە لە هەندێ جێی ئەلبورزەوە دێتە خوارەوە ئەمانە هەمووی رائەپێچی و، بەتەنگەی (مەنجیل)دا رائەبوورێ، ئنجا شاهرود تێکەڵی ئەبێ و روو ئەکاتە زریەی خەزەر و، ئەرژێتە ناوی هەروا ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە رووبارەکانی جغەتو و تاتائوش کە ساڵی ١٣١٦ فارسی فەرهەنگستانی ئێران ناویانی گۆڕی بە (زەرینە رود) و (سیمینە رود)، ئەو دوو رووبارەش هەر لە ئوستانی کوردستانەوە سەرچاوەیان هەڵئەسێ... جغەتو کە ئەمڕۆ ناوی زەرینە رودە لە چیای چل چاوەوە پاش وەرگرتنی ئاوی رووباری خورخورە، ساروق لیلان، بەشاهین دژ و میاندواودا ئەڕوا ئەرژێتە زریاچەی رەزائیەوە هەروا تاتائو کە ناوی بووە بە (سیمینە رود) ئەویش لە چیاکانی سەقز و بانەوە سەرچاوەی هەڵئەسێ و ئەکشێ مەهاباد و، لەوێوە ئەچێ بەرەو زەریاچەی رەزائیە و تێی ئەرژێ.

وەک وتمان سەرچاوەی ئەم رووبارانە هەموو، لە کوردستانەوە هەڵئەسێ، بەڵام

لەبەرئەوەی هەرێمەکە چیایی و سەختە و، ئەم ئاوانە بەشیو و دۆڵی زۆر قووڵدا ڕائەبووڕێ، کەمتر سوودیان بۆ ئوستانەکە هەیە، ئەوەی زۆر گرنگ بێ ئەوەیە بۆ ئاوی خواردنەوەی سنە کە زووتر لێی دوابووین و، هەروا بۆ ئاودێریی باغ و باغات و زەویوزاری سنە و دەوروبەری، بناوانێکی زۆر گرنگ -واتا سەدێکی زۆر گەورە- دائەمەزرێ و، ئێستا خەریکی دورسکردنی ئەو سەددەن.

گوێگرە بەڕێزەکان، لەبەرئەوەی ئێمە کاتمان تەواوبوو لێرەدا باسەکە ئەبڕینەوە، چاوەڕوانی وتاری ئایندەین ئەم کاتەتان خۆش.

## وتاری: ١٣٠

گوێگره بەڕێزەکان، کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەشی کوردی ڕادیۆی ئێرانە.

ئەمانەوێ بەم وتارە باسی (سنە) دوا بهێنین... لە وتارەکانی پێشوودا، باسی دامەزرێنەری شاری سنەمان بۆ کردن کە ئەمیر سلێمان کوڕی ئەمیر عالەمە دین ئەردەڵانی بووە و، ساڵی ١٠٤٦ کۆچی بناغەی شارەکەی لەپاڵ قەڵایەکی کۆندا داناوە و، هەروا ئەوەشمان بۆ ڕوون کردنەوە، چون هەر ئەو ساڵە خان ئەحمەد خان مردبوو و، قەڵای قایمی حەسەن ئاوا لە بناغە و، تەحمەڵ دەرهێنرا و، ڕووخابوو و، زۆر کاری تریش پێچەوانەی دڵی خەڵقی وڵات ڕووی دابوو، مێژووی ئەو ساڵە بەپیتی ئەبجەد کرابوو بە (غەمها) و لەم بارەوە هەندێ لە هەستیاران، بەهەڵبەست هەستی دەروونی پڕ لە سۆزی خۆیان دەربڕی بوو. و هەروا باسمان کردبوو لەو مزگەوت و سەرا و، قوتابخانەی ئاینی و، مەیدان و، کۆشک و باغ و باغات و، ئاوی چیا هێنان بۆ ناو شار بەگونج و، لوولە گلێنە و دامەزراندنی کاروانسەرا و گەرماو و، بازاڕ و ساختمانی ترە، کە پەی دەرپەی ئەبووە هۆی پەرەسەندنی شارەکە، کە ناوچەی وڵات بوو، لەوەش دوابووین، کە نوستانی کوردستانی ئێستا لە سەردەمی مەغۆلدا بەناوی سەرداریتی ئەردەڵان دەناسرا، پاشان وەرگەڕا بەوالیتیی ئەردەڵان و، لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا لە ساڵی ١٣١٦ کۆچی فارسی بەدواوە لەگەڵ کرماشانا ناونران ئوستانی پێنجەم و، بەم جۆرە مایەوە تا ساڵی ١٣٣٦، پاش ئەوە لە ئوستانی پێنجەم جیاکرایەوە و، بوو بەئوستانی دوازدەیەم، بەڵام هەر بەناوی ئوستانی کوردستان ناسراوە...

ئێستە بابێینە سەر بەشکرانی ئوستانەکە بەشەش شارستان:

سنە کە سێ بەخشی هەیە: دەوروبەری - کە پێی دەوترێ حەومەسە کامیاران - میران شا کە (دیوان دەرەی پێ دەوترێ)...

مەریوان پێنج بەخشی هەیە: دەوروبەری - خاوو میرئاو - کەڵاتەزران - سەرو ئاوا (کە بەشێکە لە هەرێمی هەورامان) - سەشیوی مەریوان...

قوروە دوو بەخشی هەیە: (دەوروبەری - ئیلاق - «کە دێ گۆنی پێ ئەڵێن»).

دەربارەی ئەو سێ شارستانەکەی تری، کە (سەقز - بیجار- بانە)ن، ئێمە وتاری تایبەتیمان نووسیبوو و گوێگران، بیستویانن.

ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی ئێران -واتا ئەم ئوستانەی کە شاری سنە ناوەندێتی، ئەوە تێکڕای جێگا کوردنشینەکان- ساڵی ١٣٤٥، بەپێی ئاخرین سەرژمێر، گەییوەتە ٦٢٤٦٢٥ کەس کە دەبێ لەم شەش ساڵەدا گەییبێتە نزیکەی ٩٠٠ هەزار کەسێ. بەڵام ژمارەی خود شارستانی (سنە) کە ناوەندی ئوستانەکەیە هەر بەپێی ئەو سەرژمێرییە کە کتێبی ڕاهنومای شەهرستانها نووسیویە، لە ساڵی ١٣٤٥دا ٢٠٤،٦٧٦ کەس بووە. ڕەنگە ئێستە لە دەوری ٣٠٠ هەزارا بێ؛ بەڵام دەبێ ئەم ژمارەیە هی شاری و دەوروبەری بێ... نەک تەنیا هی شار.

لەم ئوستانەدا، وەکو ئوستانەکانی تری ئێران، خوێندن و پێ خوێندن پەرەی پێ دراوە، ئەم ژمارەیانە هی ساڵی ١٣٥١ە ئەیدەین بەگوێی خوێندەوارانا: لە ئوستانەکەدا ٤٠١ قوتابخانەی بەرایی. ٥٣٣ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و ١٨ قوتابخانەی ناوەنجی ڕێنومایی ٢٦ قوتابخانەی ناوەنجیی پاومانی ٢ قوتابخانەی هونەری ناوەنجی ٥ زانستیی مامۆستای دێهات پێگەیێنەر، کە لەمانەدا ژمارەی ئەوانەی فێری خوێندن ئەبن و، فێری زانست ئەبن، تێکڕا هەر لە باغچەی منداڵانەوە، تا زانستی خانە (دانش سەرا) ٦٣ هەزار کەسێ بوون، بێ گومان ئێستە پترە.

لە ئوستانی کوردستانا، وەک ئوستانەکانی تری ئێران، (خانەی ئینساف) هەیە، ئەم خانەی ئینسافە لە دێیەکانا کاروباری دادگایی دەبینی، بۆ ئەوەی هەراوهۆریا و ناکۆکی نێوانی مسکێن و ڕەنجبەرەکان، هەر لە جێی خۆیا ببڕێتەوە جا لە ئوستانەکەدا ٣٣١ خانووی ئینساف هەیە.

لە سەرەتادا شاری سنە لەم ئاوانە کەڵکی وەرئەگرت هەم بۆ خواردنەوە و، هەم بۆ ئاوەدانی باغ و باغچەکانی:

١- کارێزی دارولئیحسان.
٢- کارێزی موشیرولدیوان.
٣- کارێزی ئاسەف ئەعظەم.
٤- کارێزی سادات.
٥- کارێزی حاجی ئەبولحەسەن.
٦- کارێزی نەسرولدیوان.
٧- کارێزی پیر محەمەد.
٨- کارێزی خوسرەو ئاوا.
٩- کارێزی مەسیحی.

ئەمڕۆ ئاوی ناو شار بەلوولە و بۆڕی ئەهێنرێ... کارەبا و بەرقی هەیە. شەقامەکانی قیرە، لە شاری سنەدا، سینەما، هوتێل، مێوانخانە، کاروانسەرا، چێشتخانە - کەبابخانە- و شتی وا زۆرە.

مزگەوت و تەکیەکانیشی ئەمانەن: مزگەوتی دارولئیحسان کە مزگەوتی نوێژی هەینییە - مزگەوتی دارولئەمان - مزگەوتی حاجی خاتوون - مزگەوتی ڕەشید قەلعە بەگی - و چەند مزگەوت و خانەقا و تەکیەی تری تیایە. لە شاری سنەدا خوێندەواری ئاینی و دیوانی زۆر هەڵکەوتوون.

بنەماڵەی مەردۆخی و کانی مشکانی و دشەیی و نودەشی لە بنەماڵە ئاینییە بەناوبانگەکانی ئەو ناوەن.

خەڵقی ئوستانی کوردستان، هەر بەناوی ئوستانەکەدا دیارە، کە کوردی ئاری نژادن، ڕچی ئاینیشیان موسوڵمانەتییە، خەڵقی ئەو ناوە فارسیش باش ئەزانن، لەوێ هەندێ مەسیحی و کەلیمیش هەن، کە زۆر دەمێکە لەوێن. لە ئوستانی کوردستانا، دوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی کاری زۆریان کردۆتە سەر بیروباوەڕی خەڵقی... پەیڕەوانی قادری بەناوی (دەروێش) ئەناسرێن و، پەیڕەوانی نەقشبەندی بەناوی (سۆفی) و، مێژووی تەریقەت لە کوردستانا زۆر کۆنە، بەر لە بڵاوبوونەوەی ئەو دوو تەریقەتە بەسەدان ساڵ شێخانی گەورەی وەکو (دینەوەری)یەکان هەبوون خۆ شێخی (سورە وەردی ) و (شێخ حەبیبی عەجەمی) کە زۆر بەناوبانگبوون... خەڵقی خاکی کوردستانن.

بۆ کوردستان، زۆر پڕۆژە و بەرنامە دانراوە کە پتر دەبێتە هۆی پەرەسەندن و پێشکەوت و ئاوەدانی وڵات تەنانەت سەد قشلاق کە پێ بگا، لە ڕووی بێ ئاوییەوە پێتەویستی شاری سنە کەم دەکاتەوە. گۆمی زرێ واریش کە ئێستە کراوە بەجێی گەشتوگوزار... پتر پەرەی پێ ئەدرێ.

واژەی (زرێ) لە کوردی و فارسیی کۆنا، ئەکاتە (دەریا) لە فارسی ئەمڕۆدا... ئەوەش ئاشکرایە کە واژەی (وار) کە نووساوە بە (زرێ)وە هاوتایە لەگەڵ (وێنە، مانەند) وەک دەوتری (بەهەشت وار) واتا (بەهەشت وێنە) (پڵنگ وار) واتا (وەک پڵنگ) بەڵام کە ناوی (گۆم) دراوە بە (زرێ بار) خەڵقی لە بیری چۆتەوە کە زرێ وار وار واتا (دەریاچە)، خەڵقی واتای تریان بۆ وشەی زرێ دۆزیوەتەوە و، کردوویانە بەزەرێ کەچی ئەو وشەی (زرێ)یە زۆر کۆنە، لە سەرەتادا خەلیجی فارسی ئەمڕۆ ناوی (زرێی ئەوڕەنگ) بووە...

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا باسی (سنە)مان دوا هێنا. خواتان لەگەڵ... بۆ حەوتەی ئاییندە چاوەڕێی باسی جێگەیەکی تری بن ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

**وتاری: ١٣١**

گوێگره بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە کامەران بن، سەرکەوتن و پێشکەوتنتان ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە.

ئێمە لەم بەرنامەیەدا باسی شارۆلکەی (سونقور) دەکەین... وشەی (سونقور) تورکییە، لە بنەڕەتا بەبازی تیـژباڵ دەڵێن و، ڕەنگە لە بنەڕەتا (شمقار)ی کوردی بووبێ و، کەوتبێتە تورکییەوە و گۆڕانی بەسەرا هاتبێ و بووبێ بەسەنقور... بێینە سەر خود «سەنقور» لە سەرەتادا شارۆلکەیەکی جوانکیلە و ناوچەی بەشی سونقوری کولیائی بوو و، سەر بەشارستانی کرماشان بوو. پاشان کرا بەیەکێ لە شارستانەکانی ئوستانی کرماشان و، خۆی تەنیا بەخشێکی هەیە. شاری سونقور ٩٧ کیلۆمەتر لە کرمنشاوە دوورە و، ئەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتییەوە و، لە بێستونیشەوە ٥٨ کیلۆمەترە. و لەوێشەوە بۆ تاران ٦٠٤ کیلۆمەترە و، دەوروبەری شاری سونقور ڕیزە تەپۆلکە و زنجیرە زورگ و هەڵەتێکی خاکییە... و ئەکەوێتە پلەی ٤٧ی درێژایی و ٣٤ی پانایی جوغرافیائییەوە و، سەر زەویی ئەم ناوە ١٧٠٠ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە.

خانووبەرەی ئەم شارە زۆر جوان دامەزراوە، کۆڵان و شەقامەکانیشی، پانوپۆڕن و، هەندێ لە گەڕەکەکانی بەم ناوانەن: (پییرە - هادرە - سەرچقا). ئاوی لوولەی هەیە و، کارەبا و بەرقی تیایە و، پۆست و تەلیفۆن و تەلگراف و دەزگاکانی تری هەیە، وەک: دەرمانگا و، نەخۆشخانە و شتی تر. چەند قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و قوتابخانەی ناوەنجی لە شارۆلکەکەدا هەیە.

بابێینە سەر سنووری شارستانەکە، بەم جۆرەیە: بەلای باکوری سنووری قوروەی سەر بەئوستانی سنەیە، لای خۆرهەڵاتی سنووری ئەسەد ئاوای سەر بەهەمەدانە، لای خۆرئاوای سنووری شارستانی کرماشانە.

ئەو ڕیزە چیایانەی کە دەوری شارەکە و شارستانەکەیان داوە، ئەمانەن:

چیای داڵاخانی کە بەرزایی لە ڕووی زریەوە ٣١٢٦ مەترە و، کەمەر زەرد بەرزایی ٢٢٧٣ مەترە. چیای هەزارخانیی خوارین ٣٤٢٠ مەترە... چیای هەزارخانیی سەروو بەرزایی ٢٨٠٢ مەترە، لووتکەی چیای بەدر، لە باکوری دێی چەرمەڵەدا ٣٢٦٥ مەتر

بەرزە. لووتکەی چیای پەنجە عەلی، کە ئەکەوێتە بەشی لای باکووری خۆرئاوای گردەکانەوە، بەرزایی ٢٨٨٣ مەترە، بەرزایی لووتکەی چیای گەرقەلا ٢٤٢٠ مەترە... لووتکەی چیای حەلەماسە بەرزایی ٢٣٧٣ مەترە... گەردەنەی ملەماسی ١٨٥٠مەتر بەرزە... لە کێوی بەهلولدا، لەمەوبەر ئەشکەوتێکی بەر بەرەلای گەورە هەبوو، کانیاوێکی تێدابوو، خزانی چیاکە دەرگاکەی بەستووە.

ڕووبارەکانی شارستانی سونقور ئەمانەن:

١- ڕووباری گاوە ڕود: سەرچاوەکەی لە دەرە تولان و مێولەوە سەرچاوەکەی هەڵئەسێ و، بەکەناری دێیەکانی ئاو باریک - باولە - خان جەمال - قەلاجق و ئاگادا تێ دەپەڕێ، بەرەو دێهستانی مەیان دەربەند و بەشی ناوەندی کرماشان. پاشان ئەم چەم و شیوانەشی تێکەڵ ئەبێ (دەرەی هەزارخانی - دەرە چومەلە - دەرە مەیخوان و چەندی تری)... ئەم ڕووبارە لە زستان و بەهارا ئاوی زۆرە، بەڵام لە هاوینا بەجۆگە و جۆگەلە هەڵئەگیرێ بۆ ئاودانی باغ و بێستان و سەوزە... ئاوی ڕووبارەکە کز ئەبێت.

٢- ڕووباری شیوی سونقور: لە سنووری دێی ئەلیاس تەپەڕەشەوە بەرەو لای باشووری سونقور ئەڕوات و چەند ڕووبار و شیو و چەمی تێکەڵ ئەبێ، دەربەندی گامیشاندا ڕائەبووری کە (جامیشان)یشی پێ ئەوترێ و، بەرەو دێهستانی دینەوەری سەر بەبەخشی سەحنەیە.

سەرچاوەکانی ئەم ڕووبارە ئەمانەن : شیوی گەزنەهلە - شا جوب - گەویچ.

ژمارەی دانیشتوانی سونقور بەپێی سەرژمێریی ئابان مانگی ساڵی ١٣٤٥ (٦٥,٤٥٥) کەس ئەبێ و، ئێستە بێ گومان زۆرترە. ئەم ژمارەیەش هی شارستانەکەیە، نەوەک هی شارۆلکەی سونقور.

لەم هەرێمی شارستانەدا ژمارەیەکی باش قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری نەخوێندەواری و، قوتابخانەی ناوەنجیی ڕێنمایی و قوتابخانەی ناوەنجیی پاومانی هەیە.

خەڵقی ئەم ناوە بەکشتوکاڵ و ڕانداریەوە خەریکن، هەندێکیش هەن بەکرد و چنین و تەنینەوە خەریکن، مەبەست کردنی مافوور و سوجادە و قالیە، لەگەڵ چنینی گورەبی و، بلووز و دەستەوانە و، ویوزەوانە و، تەنینی جاجم و بەرماڵ و، ڕانکوچۆخە... هەروا لەم ناوەدا هەلاجیش هەیە، کە لباد و نەوو و، فەرەنجی و پەستەک دروست ئەکەن.

لە سەرەتادا، گەرچی جووت و کێلان بەهۆی ئاژەڵەوە ڕووی ئەدا وەک هێستر، گا جووت و، گوێ درێژ... بەڵام ئەمڕۆ ئەم کارە زۆرتر بەهۆی تەراکتەر و، ماشێنی جووت و، کومباینی دەرەوە، کاروباری فەلایی و کشتوکاڵ ئەهێنرێ.

دەسکەوتی خەڵقی وڵات، لە کشتوکاڵ، جۆ، گەنم، دانەوێڵەی ترییە، هەروا برنج و توتن و، سێوی ژێر زەوی کە پێی ئەوترێ پەتاتە... و بەرهەمی تری... لە مەڕوماڵات و ئاژەڵیشەوە ڕۆن و، خوری و، پێستە و، ئەو ئاژەڵانەیە کە بۆ گۆشت پێ ئەگات وەک گیسک و کاوڕ و گوێرەکە و شتی تر...

ئەم شارستانە وەکو هەموو شارستانەکانی تری دەزگا دەوڵەتییەکانی هەموو تیایە... شێوەی زمانی خەڵقی ئەم ناوە، کەڵوڕییە... واتا ئەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ بەناوی کرماشانی و، لەکی ناو ئەبرێت.

لەم ناوەدا خوێندەوار و، خاوەن شیعر و هەڵبەست زۆر هەڵکەوتووە... بەداخەوە ئێمە کەمتر شارەزای ئەو ناوەن و لە سەرچاوەکانی بەردەستیشمان، کەمتر لەم بارەوە شت یاداشت کراوە. تا بەرنامەی تری بەخواتان ئەسپێرین. خواتان لەگەڵ.

**وتاری: ١٣٢**

گوێگره بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەمـوو کـاتێکتـان خـۆش، هیـوامـان کـامـەرانیـتـانە نووسـراوەکـانتـان دەگـات، هەروەک بارەها وتوومـانە، ئێـمـە بەپێی پیـتی ئەلف بێ، وتارەکـانمان دامـەزراندووە، کـە لە ئایندەدا وەک فـەرهەنگێ سـوودی لێ وەربگیـرێ، لەبەرئەوە ئێمە هەر کات گەیشتینە پیتی (ک = کاف)، وەرامی ئەو کەسانە ئەدەینەوە کە دەربارەی (کرماشان) پرسیاریان کردووە... ئێمە لەم وتارەدا باسی (سۆمار) دەکەین...

(سۆمار) ناوی بەخشێکە سەر بەشارستانی (قەسری شیرین) ئوستانی کرماشان، هەروا ناوە بۆ ئەو دێیە، کە ناوەندی بەخشەکەیە، ناوی سۆمـار، هەندێ لایان وایە لە وشەی (سوعەمباری)یەوە هاتووە، کە هەمیشـە لەوێوە ئاو پەنگان دراوەتەوە بۆ باغاتی ئەو ناوە و، بۆ مەندەلی و لە نێوانی دەوڵەتی عوسمـانی و قـاجاردا جارجارە، بۆ ئەوەی ئاو بەرەڵا بکرێت بۆ مەندەلی، وتوێژکراوە و، ئەوجێیە ناونراوە (سوعەماری Suamarî واتا عەماری ئاو)... بەڵام بەلای ئێـمەوە وایە کە سۆمـار مـەبەست کونامار، چونکە ئەو هەرێـمە مـاری زۆرە. تەنانەت لە سـەدەکـانی ناوەندیی کـۆچیـدا لەو نـاوە قـەڵایی هەبووە بەناوی قـەڵای ماران گەرچی بەتەواوی شوێنەواری ئەو قەڵایە دیاردیی نییە.

با لە بیریشـمان نەچێ: ئیبنولئەثیر لە کتێبی (الکامل)دا، لە بەرگی ٩ لاپەڕە ٢٦٨دا کە باسی شالاوی سپای (غوز) دەکات بۆ سەر مەندەلی و بەندنی مەندەلی کە بەعەرەبی پێی وتراوە لحف – Lihf ئەڵێ: «لە مـانگی زیلحـیـجـەی سـاڵی ٤٣٩ دا کـۆمـەڵێ لە غوزەکان هەڵیانکوتایە سەر شارەکەی عەلی کوڕی قاسمی کورد و، کەوتنە تالان و بڕۆ و خرابکاری. بەڵام عەلی کوڕی قاسمی کورد دەربەندەکەی لێ گرتن و، کەوتە کوشتاریان و حەشری پێ کردن و، هەموو تالانەکەی لێ وەرگرتنەوە»...

جا لەم قـسـانە بۆمـان دەرئەکـەوێ کـە ئەو (تەپۆلکەیەی سۆمـار)، کـە ئێـسـتـە سـەرای ژاندارمری لەسەر دروست کراوە، بەپێی قسەی دێرینەناس و شوێنەوارناسەکان، کۆنە شار بووە، دەبێ ئەو شارەی عەلی قاسم بێ کە غوز لە پشتی دەربەندەکەی مەندەلییەوە هەڵیان کـوتاوەتە سـەری. بەڵام بەرامـبـەر بەهێـزی کـوردەکـانی ئەو ناوە شکان و سـەرشـۆڕانە گەڕاونەوە... بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ جێی ئەو کۆنە شارۆلکەیەکە هێشتا هەڵ نەدڕاوە و، کارناسان کۆڵیارییان تییا ئەنجام نەداوە...

جا دێی سۆمار ئەکەوێتە لای باشووری قەسری شیرین و ١٠٠ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە. هەروا ئەکەوێتە لای باشووری خۆرهەڵاتی نەفت شاوە و ٢٨ کیلۆمەترە لێیەوە دوورە و، لە سۆماریشەوە بۆ سنووری ئێران - عێراق ٧ کیلۆمەترە و، بۆ شاری مەندەلیش پازدە کیلۆمەترە ئەم شاری مەندەلییەی ئێستە یەکێکە لە شارەکانی کوردستانی عێراق، لە سەرەتادا ناوی (بناوانەکان Binewanekan) بووە و، بووە بە (بەندەنەگان) و لەوێوە عەرەب کردوویانە بە (بەندەنیجەین) و (بەندەنیج) و پاشان لە فارسیدا بەناوی (مەندەلیج) ناسراوە... ئەم شارە دێی سۆمارە ئەکەوێتە کەناری شیوی گەنگیرەوە کە لە سۆمارەوە بەرەو خوار ئەبێتەوە بۆ مەندەلی و قازانییە و لەوێوە کە بەرەو خوارتر ئەبێتەوە بەناوی شیوی (حەڕان Heran) بەناوبانگە لە زستانا ناوی باراناو سەیلاوی زۆرە... لە هاوینا ئەخرێتە چەند جۆگە بۆ ئاودانی باغ و باغچە، پاش ئەوەی کە دەوڵەتی پادشایی لە عێراقدا دامەزرا و، دەوڵەتی شاهەنشایی پەهلەوی لە ئێرانا بەهێز بوو... ئێران لە سۆمار (سەد)ێکی دروست کرد و، ئەو ناوەی کرد بەبەراو، ئێستە جێیەکی خۆش و ئاوێژەیە.

دانیشتوانی ئەو ناوە لە تیرەی (باوەندپوور)ە عێلی کەڵوڕن، شێوەی زمانیشیان هەر شێوەی کەڵوڕییە. با لێرەدا بیخەینەوە بیری خوێندەواران، کە قەلقەشەندی خێوی (صوبح الئەعشا) ئەمیر شەرەفخان نووسەری شەرەفنامە بەر لە چوارسەد ساڵ، زمانی کوردییان بەچوار شێوەی گەورە داناوە: کرمانج... کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ کرمانجی ژووروو، کرمانجی خواروو... گۆرانی، کە پێی ئەوترێ هەورامی... کەڵوڕی کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ شێوەی لەکی و کرماشانی... هەروا لوڕیش کە بەشی ئەبێ بەدوو شێوەی فەیلی و بەختیاری... جا شێوەی ئەو کوردانەی کە لە کرماشان بەرەو خوارن، تەنانەت دەوروبەری مەندەلی و قزرابات و شارەبان و بەدرە و کوت و نەعمانیە و ناحیەی بەنی سەعد و کوردەکانی دەوروبەری عیمارە... هەمووی شێوەی کەڵوڕییە، کە تۆزێک لەگەڵ شێوەی لوڕیی فەیلیدا تێکەڵاوبوون.

ئاوی (نەوت شا) بەلوولە، لە چەمی گەنگیرەوە کێشراوە. بەخشی سۆمار ١٨ دێی هەیە، ژمارەی دانیشتوانی هەموو بەخشەکە ئەگاتە ٦ هەزار کەسێک، ناوچەی بەخشەکە لە سۆمارەوە گوێزراوەتەوە بۆ نەوت شا... دێیەکانی ئەم بەخشە وەک وتمان، هەموویان بەکشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە خەریکن، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و بەرهەمی ئاژەڵییە.

سنووری بەخشەکەش بەم جۆرەیە: لای باکوری لەگەڵ قەسری شیرین هاوسنوورە، لای باشووری هاوسنوورە لەگەڵ دوو بەشی ساڵح ئاوا و میهران، کە سەر بەشارستانی عیلامن، لای خۆرهەڵاتیشی ئەکات بەسنووری بەشەکانی ئەیوان و گەیلانی شا ئاباد. لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ کیشوەری عێراق.

هەوای ئەو ناوە گەرمە. لای ژووری بەخشەکە چیایە، لای خواری زورگ و هەڵەتی کلکەی زنجیرە چیایەکە کە لە دەوروبەری خانەقینەوە لا لێژبووەتەوە... کاتمان تەواوبوو تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین...

١٣٥٣/٦/٤

## وتاری: ١٣٣

گوێگره بەڕێز و خۆشەویستەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ، کامەرانیتان هۆی شادیمانە. ئێمە لەم وتارەدا باسی (سورەوەرد) ئەکەین... کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا شارۆلکەیەک بووە جێی زانست و زانیاری و، زایینگەی پیاوانی ناودار بووە... ئیبن حەوقەل لە لاپەڕە ١١٣ی کتێبی (صورەت الئەرضی)دا - کە لە نێوانی ساڵانی ٣٣٠و ٣٧٠ کۆچیدا نووسیویە، وتوویە: سورەوەرد، شارێکە وەک شارەزوور خێوی قەڵای قاییم وەکو کونگەرە و باروی ئەستوور و بەهێزە. خاکەکەی بژوێن و بەپیت و بڕشتە، هەوای ساردالّە و، زۆربەی دانیشتوانی کوردن.

هەروا موستەوفی قەزوینیش لە لاپەڕە ٦٩ی کتێبی (نوزهەت القلوب)دا ئەڵێ: سورەوەرد، ئەکەوتە ئیقلیمی چوارەمی جوغرافی، ڕۆژە ڕێی لە خوار سوڵتانییەی زەنجانەوەیە، بەلای خۆرئاوایدا. لە سەرەتادا شارۆلکەیەکی جوانکیلەی خاوەن کشتوکاڵ و خاوەن باغ و میوە بووە، پاشان مەغۆل وێرانیان کردووە و، ئێستە کوێرە دێیەکە.

ئەمڕۆ سورەوەرد یەکێکە لە دێهستانەکانی بەخشی قەیدار (خودابەند)ی شارستانی زەنجان و، ئەکەوێتە ناوەندی بەخشەکە و، لە داوێنی لای باشووری چیای قەیدار دایە،... ئەم دێهستانە لە ٢٥ دێ پێکهاتووە، ناوەندی دێهستانەکە ئاوایی (کرسف)ە کە لەسەر کۆنە شارەکەی سورەوەرد دامەزراوەتەوە و دانیشتوانی ئەم دێیانەی کە دێهستانەکەی پێک هێناوە ١٣ هەزار کەسێ دەبن... ئەوەی ناوی ئەم شارۆلکەیەی بەرز کردۆتەوە، یا بەجیهانی ناساندووە، ئەوەبوو کە لەم هەرێمەدا گەورەترین بنەماڵەی زانست و زانیاری و دەروێشی هەڵکەوتووە یەکێ لەوانەی لەم هەرێمەدا هەڵکەوتوون: «ئەبولفەتوح یەحیا شهابەدین کوڕی حەبەشی کوڕی ئەمیرەک سورەوەردییە» کە بە (شەیخی ئیشراق) بەناوبانگ بووە. ئەم پیاوە گەورەیە یەکێک لە زانا بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلام بووە، لە سەدەی شەشەمدا، لەلای مامۆستا مەجدەدینی گەیلانی -کە مامۆستای فەخرەدینی ڕازیش بووە- لە مەراغە ئوسووڵی فیقهی خوێندووە. و لە عیلمی حیکمەت و فەلسەفەدا زۆر شارەزا بووە، گەشتی وڵاتی عێراق و شام و ئەو ناوانەی کردووە... لە شاری حەلەب لەگەڵ مەلاکانا لەسەر هەندێ باسی فەلسەفی بووە بەکێشە و هەرایان لەسەر ئەوە لە لایەن پادشای ئەیوبی (ئەلمەلیک الظاهیر)ەوە گیراوە و، لەسەر فتوای مەلاکانی ئەو ناوە لە

تەمەنی ٣٨ ساڵیدا کوژراوە... ئەم پیاوە گەورە کوردە بەعەرەبی زۆر کتێبی داناوە، وەک (حیکمەت الئیشراق - تەلویحات - موطارەحات).

یەکێ تری لەو زانایانە کە خەڵقی سورەوەردین ئەبولنەجیب عەبدولقاهیر زیائەدینی سورەوەردی کوڕی عەبدوڵلایە لە ساڵانی ٤٩٥-٥٦٣دا ژیاوە، لە قوتابخانەی نیزامییەی بەغدادا خوێندوویە، پاشان لە نیزامییە بووە بەمامۆستا و، لە خانەقاکەی خۆیدا بەپەند و ئامۆژگاری خەڵک خەریک بووە و، لە فەرمایشاتی پێغەمبەرا زۆر شارەزا بووە و، یەکێ بووە لە موریدانی شێخ ئەحمەدی غەزالی.

یەکی تر لە سورەوەردییەکان ئەبو حەفس عومەر شهابەدین کوڕی محەمەدی سورەوەردی بووە، لای ئەبولنەجمی مامی خوێندوویە، پاش فێربوونی زانستییەکانی ئیسلامی، بووە بەهاودەمی شێخانی تەریقەتی ئەو سەردەمە... و بەدانەری تەریقەتی سورەوەردییە ناوبانگی دەرکردووە. ئەم تەریقەتە ئەچێتەوە سەر بنەماڵە کوردە دینەوەرییەکان، وەک مەمشادی دینەوەری و ئەحمەد ئەسوەدی دینەوەری... ئەم پیاوە نەوەک هەر لەناو زانایان و، شێخاندا پیاوێکی خۆشەویست و گەورە بوو، بەڵکو لەلای خەلیفەی عەبباسی و فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمەش هەر بەڕێز بووە.

ناسری خەلیفەی عەبباسی، بۆ ئەوەی کە سوڵتان محەمەدی خوارەزم شا شاڵاو نەکاتە سەر وڵاتەکانی ئیسلامی ئەم شێخ شەهابەدین سورەوەردییەی ناردە لای... ئەم پیاوە گەورەیەش زۆر کتێبی داناوە وەک: (جەذب القلوب - ڕەشف النەصائیح - عەوارف المەعاریف)... شێخی سەعدی شیرازی لە بەغدا چووەتە خزمەت ئەم پیاوە گەورەیە و، لە بوستاندا ناوی بەڕێزەوە بردووە، ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی شارە دێی (سورەوەرد) کە ئەمڕۆکە کەلاوەکانیشی نەماوە و، تەنیا دێهستانی سورەوەرد ناوی زیندوو ئەکاتەوە، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتەتان باش.

**وتاری: ١٣٤**

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ. ئێمە لەم وتارەدا باسی (سیامەنسوو) ئەکەین... سیامەنسوور یەکێکە لە حەوت دێهستانەکەی شارستانی (بیجار)... لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی ماە نیشانی سەر بەشارستانی زەنجان و، لای خۆرئاوایشی دێهستانی تەکابە و لای باشووریشی دێهستانی قەراتوری بەخشی دیواندەرەیە و، لای خۆرهەڵاتیشی دێهستانی کرانی شارستانی بیجارە...

هەرێمی سیامەنسوور، لە لایەن ئاووهەواوە (سەردەسێرە) چیا و کێوی زۆرە، بەرزترین لووتکەی چیاکانی لووتکەی کێوی زەرنیخیە کە ئەکەوێتە باکوری ئاوایی چیچەک و ٣٠٩٠ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە، هەروا لووتکەی کێوی ئیمامزادە ئەیوبی ئەنسارەش ٢٥١٢ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە.

دێهستانی سیامەنسوور نزیکەی ٣٥ ئاوایی گەورە و بچووکی هەیە، کە دانیشتوانی، تێکڕا ١٥ هەزار کەس ئەبن. لەم دێیانەدا قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، کە فێرکاران و، سپای بەرەنگاریی لەگەڵ نەخوێندەواری، بەڕێیانەوە دەبەن. جگە لەمانە سپای بیهداشت و سپای پەرەدان بەکشتوکاڵ، لەم دێیانەدا ئەرکی خۆیان ئەگرنە سەر شان.

دانیشتوانی دێهاتەکان، خێوی کشتوکاڵ و، ئاژەڵ بەخێوکردنن... ئافرەتانی هەرێمەکە خەریکی کرد و تەونیش ئەبن، سوجادە، بەرە، جاجم، دروست ئەکەن... بلوز و گۆرەوی و دەستەوانە و پووزەوانە و شتی تریش ئەچنن.

ناوی دێهستانی سیامەنسوور لە ناوی عێلی سیامەنسوورەوە هاتووە، کە بەپێی شەرەفنامە لە سەرەتادا لەگەڵ زەنگەنە و چنگن و چەند تیرەیەکی ترا لە یەک ڕەگەزن و، زمانیان گۆرانیی کوردییە و، گوایە لە سەرەتادا یەکەم سەرداری زۆر بەناوبانگیان ناوی سیامەنسوور بووە و، ئەوەش ئاشکرایە کە لە کوردیدا، هەم (سیاە) و هەم (ڕەش) جارجارە ئەبن بەپێشبەند و پاشبەندی ناوی پیاوانی بەجەوهەر و کەڵەمێرد. عێلی سیامەنسوور لە سەدەکانی هەشت و نۆی کۆچیدا زۆر بەهێز بووە، هەندێ شار و قەڵاکانی ئوستانەکانی کوردستان - ئازەربایجانی خۆرئاوا - زەنجان - هەمەدان-یان لەژێردەستا

بوو، بەڵام تەنیا (عالەم ئارای عەبباسی و، شەرەفنامە) ناویان لێ بردووە.

لە دەوروبەری ۹۶۰ی کۆچیدا شا تەهماسپی سەفەوی کە سەرنجی دا خەلیل بەگی سیامەنسوور، پیاوێکی بەدەسەڵات و ئازایە، بانگی کردە لای خۆی و بەڕێوەبەرایەتی و سەردارێتیی (سوڵتانیە - زەنجان ئەبهەر - زەڕین کەمەر) و زۆر هەرێمی تری لە نێوانی ئازەربایجان و عێراقی عەجەمی بۆ مۆر کرد و، فەرمانی دایێ کە لەشکرێکی سێ هەزار کەسیی هەمیشەیی لە تیرە کوردەکان پێک بهێنێ و لەژێر فەرمانی خۆیا ڕێکوپێک، ئامادەیان بکات و ئەرکی پاراستنی ڕێ و بان و سنوور بگرێتە سەر شانی خۆی.

خەلیل بەگ کەوتە هێز دامەزراندن و، قەڵا و باردو دروستکردن، ئەمەبووە هۆی بەغیلی و ناڕازیێتی فەرماندە و یاوەرانی شا تەهماسپ و، لەلای ئەو کەوتنە دووزمانی، تا دڵی شا تەهماسپ بەتەواوی لە خەلیل بەگ کرمێ بوو و، کەوتە ڕق و، هێزی نارده سەری وڵاتەکەی ژێردەستی لێ دارنی... و فەرمانی دایێ کە بەهێزی عێلی سیامەنسوورەوە بچێت بەرەو خوراسان و لەوێ فەرمانڕەوای خوار عێراق بێ. خەلیل بەگ ڕۆیی و، تا مردن لەوێ مایەوە... ئەمە بووە هۆی ئەوەی عێلی سیامەنسوور تەرتەوەرتە بێن و هەر بەشەیان بکەوێتە هەرێمی ئەمرۆکە هەروەک دانیشتوانی دێهستانی سیامەنسووری ئوستانی کوردستان، پاشماوەی عێلی سیامەنسوورن، هەروا تیرەگەلێکی سیامەنسووری، لە کەلاتی نادری و لە هەندێ جێی ئەفغان جێگیربوون و، هەندێکیانیش لە ئوستانی کەرکووک لە کوردستانی عێراق دائەنیشن.

پاش مردنی خەلیل بەگ، دەوڵەتیار خانی کوڕی لە جێی دانیشت، کە یەکێ بوو لە سەرداره هەره مەزن و بەدەسەڵاتەکانی کورد لە سەردەمی سەفەویدا. ناوبراو هەم لە ڕۆژگاری شا تەهماسپ و هەم لە ڕۆژگاری شا محەممەد خودابەندە و، هەم لە ڕۆژگاری شا عەبباسیدا گشت هەرێمەکانی (زەڕین کەمەر - سوجاس - زەنجان - سیورلق - قەیدا کرمێ بوو و، - شەبستان - ئەنگلاوران) و هی تری بەفەرمانی ئەوان خرابوونە ژێر دەسەڵاتی... سەرەڕای سەردارێتی ئەو تیرەیانەی عێلی سیامەنسوور، کە لە عێلەکە بەجێمابوون، وەیا پاش تەرتەوەرتە (پژک و بڵاو) بوون، گەڕابوونەوە جێگە و شوێنەکانی خۆیان. بەڵام دەوڵەتیار خان لە باوکی بەخت ڕەشتر بوو، بەدگۆیان و دووزمانان لای شا عەبباس جۆرێ لێی کەوتنە خراپە وتن و، دووزمانی، کە شا عەبباس لێی کەوتە گومان و، سپای نارده سەری بەدیل گرتیان و بردیانە قەزوین، لەوێ کوژرا... پاش ئەو میر حوسێن

قولی سولتانی سیامەنسوور دانرا بەفەرماندە و سەرداری عێلی سیامەنسوور و، بەڕێوەبەری ئەو شار و قەڵایانەی کە لەوەبەر بەدەس خەلیل بەگ و دەوڵەتیار خانەوە بوو.

ئەمڕۆ سیامەنسوور وەک لەپێشا وتمان دێهستانێکی ٣٥ گوندییە، کە گەورەترین ئاواییەکانی ئەمانەن (شەهرەک عەرەب شا - ئاغ گوند - قزل بلاغ - تەغامین - چەتاق).

دێیەکانی ئەم دێهستانە سوود لە دوو چەم وەرئەگرن، کە هەردووکیان تێکەڵ ئەبن بەیەکا و، پێ ئەوترێ (قەمچەقای) ئەم دوو چەمە، یەکێکیان لەسەر سنوورەکانی دێی (چیچەکلو)ەوە دێت و، ئەوی تریان لەسەر سنووری کوتانەوە و، ٨ کیلۆمەتر لە خۆرئاوای قەمچەقایەوە ئەبن بەیەک و ئەرژێنە ناو ڕووباری قزل ئوزان. وڵاتەکە بژووێنە، هەم دەغڵودانی باش ئەهێنێ و، هەم ئاژەڵی باش پێ ئەگەێنێ.

ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی سیامەنسوور، تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٣/٧/١١

## وتاری: ۱۳۵

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ. ماوەیەک لەمەوبەر، گوێگرێکی بەڕێز «کاک وریا» ناو، نامەیەکی بۆ ئەم بەرنامەیە ناردبوو، پرسیاری ئەوەی ئەکرد، کە واژەی (سیروان) لە چییەوە هاتووە؟... ئایا لە سێ ڕوانەوە هاتووە، یا لە سپی ڕوانەوە... ئێمە لە کاتی خۆیا وەڵامەکەی کاک وریامان دواخست، بۆ کاتێ کە نۆرەی بگات، چونکە هەروەک بارەها وتوومانە، ئێمە وتارەکانمان بەپێی ئەلف و بێ، دەنووسین کە لە ئایندەدا ببێتە فەرهەنگێکی جوغرافی کوردی. جا ئێستە وەڵامی کاک وریا ئەدەینەوە.

مۆزیک

سیروان، کە ئەمڕۆ ناوە بۆ ڕووبارێکی گەورە، لە سەرەتادا ناویش بووە شارۆلکە و قەڵایەک کە ئەمڕۆکە شوێنەوارەکەی، لە دەوروبەری کرماشان، بەناوی (شیروان) ئەناسرێ. ئەم سیروانی گەورە شاری هەرێمی (ماه سەبەزان) بووە و، کەوتۆتە ٥٠ میلی خۆرئاوای سەیمەرەوە کە ئەویش شارۆلکەیەک بووە و ناوەندی هەرێمی میهرەگانی کوچەک بووە کە عەرەب لە سەرەتای ئیسلاما پێیان وتووە (میهرەجان قزەق) و ئەمڕۆ شوێنەواری سەیمەرەش هەر نەماوە و، بەناوی هەرێمەکەی ئەناسرێ... ماه سەبەزان پێ دەشتێکی بڵاوبوو، ئەکەوتە لای خواری ماه دشت. وا دیارە وشەی (ماه) کە لە کاتی خۆیا نووساوە بە (ماه سەبەزان) و بە (ماه دەشت)ەوە، لە وشەی (ماد)ەوە هاتووە، چونکە کوردەکان پێیان وتووە (مای)... وەک (مایدەشت).

شارۆلکەی (سیروان) بەقسەی جوغرافیانووسی بەناوبانگ ئیبن حەوقەل شارۆلکەیەکی قنجیلانە بووە، ساختمان و خانووەکانی بەگەچ و قسڵ و بەرد، دروست کراوە و، بەوێنەی شاری مووسڵی ئەو حەلە چووێنراوە. خاکی وڵاتەکە بەپیت و بڕشت بووە، هەم دەسکەوت و بەرهەمی گەرمەسێریی هەبوو، وەک گەنم - جۆ - برنج - دانەوێڵەی تری... و مێوەی هەمەجۆر... تەنانەت زەیتون و خورما... هم خێوی بەرهەمی سەردەسیری بووە، وەک گوێز و، هەرمێ و، بەهێ و شتی تر...

خەڵقی وڵاتەکەش، کە عێلاتی کورد بوون، لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریک بوون... سەرەڕای ئەو بەرهەمانە، کانی قسڵ و، گەج و، گۆگرد و، زاخ و شتی تریشی

تیابووە... خوێڵێنەکانی ماە سەبەزانیش لەو ناوەدا زۆر بەناوبانگ بوون...

قەڵای سیروان لە سەردەمی حەسەن وەیهیەکان و عەییارییەکاندا هەبوو... و لەو قەڵایانە بووە کە هەمیشە سپای ئەم سەردارییانە، ئەگەر بەرامبەر بەسپای خەلافەتی عەبباسی شکستیان بخوردایە، پەنایان پێ دەبرد و خۆیان تیا قایم دەکرد... ئەمە دەربارەی شارۆلکەی سیروان کە نزیک بەڕووباری گاماساو بوو...

بابێینە سەر سیروان کە ڕووبارێکە و، لە سەرەتادا ناوی (تورنات) بووە، ئەم ڕووبارە هەندێ ئەڵێن ناوەکەی لە (سێ ڕوان)ەوە هاتووە چونکە لە سەرەتادت ئەم ڕووبارە بریتییە لە سێ لقی گەورە:

یەکەمیان: (گاورۆ)یە، کە سەرچاوەکەی لە چیای شەریش کانی لای گەردەنەی ئەسەد ئاوای هەمەدانەوە شۆڕئەبێتەوە بەرەو خوارئاوا و، لە نێوانی دوو چیای شاهۆ و قاڵی سەرەوە، تێ ئەپەڕێ و، بەرەو خۆرئاوای باشووری ئەکشێ... ئەم بەشە زۆر ڕووباری بچووک و گەورەی تێکەڵ ئەبێ کە لە هەموویان گەورەتر ڕووباری قشلاقی لای سنەیە.

دووەمین: لقەکانی سیروان (ژاوەرۆ)یە کە بەڕووباری هەورامانی تەخت بەناوبانگە و لقی زۆری هەیە...

لقی سێیەمیان: ڕووباری (زمکان)ە کە لە کرندەوە تێکەڵی ئەبێ و ئەمیش لقی زۆرە.

هەندێ ئەڵێن ناوی سیروان لە بنەڕەتا (سپی ڕوان) بووە، دووریش نییە ئەمە ڕاست بێ، چونکە ژاگ دومورگان ناوی لقێ زۆر لەو ڕووبارانە ئەبا کە بچووک و گەورەیان تێکەڵ بەلقە گەورەکان دەبن...

ئەم ڕووباری سیروانە لە سەردەمی ماد و هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانیدا خاکی دوو ئوستانی گەورەی کوردنشینی ئاو ئەدا، کە ناویان (شاد قوباد و شاد هورمز) بووە، ئێستەش شوێنەواری ئەو دوو ڕووبارە لە نێوانی (گزرئاباد و گاڵوڵا)دا دیارە. مەبەست لە گزرئاباد هەر ئەو شارۆلکەیەیە کە لە سەردەمی مەغۆلدا پێی ئەوترا (قزڵرەبات) و عەرەب گۆڕییان بە (سەعدی)یە، بەناوی سەعد کوڕی وەقاسەوە. گاڵوڵاش، کە لە سەردەمی کۆنا بەشێوەی کلدانی پێی دەوترا (بێث گاڵولا) و، لە سەردەمی مەغۆلدا ناونرا (قەراخان) عەرەب سەردەمێ پێیان ئەوت (کەرخ جدان) و پاشان گۆڕییان بە (جەلەولا).

جا ئەو دوو ڕووبارە گەورەیەی لە سیروان هەڵ ئەگیرا سەر زەویی دوو ئوستانی کوردنشینیان ئاو ئەدا بەم ناوانە:

(١) ئوستانی شاز قوباد کە بریتی بوو لە دەستی ڕاستی ئاوی سیروان، واتا بەشێ لە خاکی ئوستانەکانی کەرکووک - دیالە - بەغدای دائەگرت... ئەمڕۆکە زۆربەی ئەم هەرێمە دەشتێکی چۆڵ و هۆڵە پێی ئەوترێ (قرفە)... و جگە لە شارۆلکەی دەوڵەت ئاوا کە عەرەب پێیان ئەوت دەڵتاوە و پاشان گۆڕییان بە خالس ئاوەدانی تری کەمە...

(٢) ئوستانی شاز هورموز کە ئەکەوتە دەستی چەپی سیروان و ئەو سەر زەوییانەی ئاو ئەدا کە ئەکەوتنە خاکی فەرمانداریەکانی مەندەلی - کە لەوەبەر ناوی (بەندەنیجین) بوو- و خاکی شارەبان و دەسکەرە و دەشتی بەدرە و گەرگەرایا کە بەناوی ئوستانی کوت ئەناسرا و، لەم دواییەدا گۆڕاوە بە واسیت و، ئەمڕۆکە لە خۆرهەلاتی بەغدا بەرەو ژوور تا مەندەلی و ئەعمانیە قومەلانێکی بیابانی بێ ئاو و چۆڵە...

ئا ئەمەبوو، وەلامی کاک وریا... بەهیوایین گوێی لێ بووبێ. تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین هەر بەشادی بژین.

١٣٥٣/٧/١٨

## وتاری: ١٣٦

گوێگرە بەهەست و خاوەن هۆشەکانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ. ئێمە ئەمشەو باسی (سەیمەرە) دەکەین، کە ناوە بۆ شارێکی کۆن و بۆ ڕووبارێ... عەرەب ئەم ناوەیان بە(صاد) نووسیوە لەباتی (سین)... و ناوەکەیان گۆڕیوە بە (صەیمەرە) و بە (صەدمەڕە)... شاری سەیمەرە لە پێش پەیدابوونی ئیسلامدا هەبووە، دوور نییە، کە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عیلام...

ژاک دومورگان دەڵێ: لە دەوروبەری ناوچەی سەیمەرەدا، ئێمە شوێنەواری سەردەمی هەخامەنشینمان نەدۆزییەوە... بەڵام شوێنەواری سەردەمی ساسانی لە ڕادەبەدەرە. وا دیارە ئەم وێرانەیانە هەر لەسەر وێرانەکانی سەردەمی عیلام دامەزرابن....

سەیمەرە، وا دیارە، تا سەردەمی سەلجووقی هەر هەبووە، ئەم شارۆلکەیە لە سەرەتای ئیسلامدا، ناوەندی هەرێمێ بووە بەناوی (میهرەگانی کوچەک)، کە عەرەب وەریان گێڕاوە بە (میهرەجان قذف)... و هەروەک بارەها ڕووغان کردۆتەوە، لە سەرەتای ئیسلاما، هەرێمی لوڕستانیان بەدوو بەش دائەنا... بەبەری پشتکۆیان دەوت (میهرگان کوچەک) و ناوەندی شاری سەیمەرە بوو و، بەبەشی پێشکۆیان دەوت ( ماسەبەزان) و ناوەندەکەی شارۆلکەی (سیروان) یاخۆ (شیروان) بوو، کە ئەکەوتە لای خواری ماهیدەشت.

جا سەیمەرە ئەکەوتە لای خۆرئاوای باشووری خوڕەم ئاواوە ٧٠ میلێک لێیەوە دووربوو، هەرێمی سەیمەرە هەرێمێکی بژوێن و بەبڕشت بوو، هەم بەرهەمی گەرمەسێری هەبوو، هەم بەرهەمی سەردەسێری... وا دیارە پێ دەشتەکەی زۆر گەرم بووە و، ژاک دومورگان دەڵێ: دۆڵی سەیمەرە، ئەوەندە گەرماکەی بەتین و تاوە، لەبەر تیشکی هەتاوا پیاو خۆی ناگرێ، بۆیە بووە بەدەشتێکی چۆڵ و هۆڵی سوتاو.... بەڵام لە هەمان کاتا بەشی چیای ئەو ناوە لەوپەڕی سەرووی دایە، بۆیە خەڵقی ئەو ناوە لە دوو جۆرە میوە کەڵک وەرئەگرن: «خورما، پرتەقاڵ، لیمۆ زەیتون و شتیی گەرمەسێر... و گوێز و بادام و پستە و میوەی تری ساردەسیر...

لە کاتی خۆیا خانووبەرەی سەیمەرە بەقسڵ و گەچ و بەرد دروست کراوە، بەسەر کەناری ئەورووپاوە کە تا ئەمڕۆ هەر پێی ئەوترێ (صەیمەرە)... پردێ بەسەر ڕووباری سەیمەرەوە

هەبووە، لە نێوانی سەیمەرە و تەرهان، لە پردەکەی خانەقین زۆر درێژتر و پانوپۆڕتر بوو، ئەشێ هی سەردەمی ساسانی بووبێ.

خەڵقی شاری سەیمەرە و دەوروبەری خوێندەواری و هەستیار و وردەکاریان زۆر پێ گەیاندووە... گوایە لە ڕۆژگارێکا هەندێ لە خەڵقی سەیمەرە باریان کردۆتە دەوروبەری بەسرە و، لەوێ لە کەناری ڕووباری مەعقیل شارۆلکەیەکیان بەناوی سەیمەرە دروست کردووە، ساڵی ٤٥٠ کۆچی کابرایەکی فروفێڵ زانی تەڵەکەباز، کە ناوی ئیبن شەباس بووە، چۆتە ناویان و کە هەستی بەسادەیی و دڵپاکی و نەخوێندەواریان کردووە، لە سەرەتادا خۆی بەپێغەمبەر داوەتە قەڵەم و، پاشان لافی خوایێتی لێ داوە خەڵقەکە لەبەر سادەیی خۆیان، سەریان بۆ دانەواندووە و، فەرمانبەرییان کردووە.

وا دیارە سەیمەرە لە دەورانی سەلجووقیدا، بەهۆی بوومەلەرزە، یا بەڵایەکی ترەوە ڕووخابێ -وە شوێنەواری نەما بێ- لەوە بەدواوە، ئەم مەحاڵە، هەر بەناوی ڕووباری سەیمەرەوە ئەناسرێ... بابێینە سەر ڕووباری سەیمەرە ئەم ڕووبارە لە سەرەتادا، سەرچاوەکەی لە چیای ئەڵوەندی هەمەدانەوە لێژ ئەبێتەوە، لە سەرەتادا ناوی (گاماساو) یا (قەمیشە)یە... بەدەشتی ئەسەد ئاوا و نەهاوەندا تێ ئەپەڕێ و چەمی دینەوەری لەگەڵ تێکەڵاو ئەبێ و، بەرەو چیای بێستون ئەڕوا و پاش ڕابردن بەپێچوپلووچەکانی ناو چیای بێستوندا ئاوی (سیا ئاو) تێکەڵی ئەبێ، هەروەک ئاوەکانی مایدەشت، پالاوە و، هەڵیلان و کرند... و پاش تێ پەڕین بەدەوروبەری شارۆلکەی سیروانی کۆنا -کە پێی ئەوترێ شیروان- لەگەڵ ڕووبارەکانی لوڕستانا تێکەڵ ئەبێ و، بەناووی سەیمەرەی کۆنەوە ناوی سەیمەرە پەیدا ئەکات و ئەو لقانەش تێکەڵی ئەبێ: (ڕودبار) کە لەلای چەپەوە تێکەڵی ئەبێ... و (کەشکان) و (کەهمانە ڕود)... پاش تێکەڵ بوونی ئەمانە لەگەڵ سەیمەرەدا و پاش ئەوەی کە ئەم ڕووبارە ئەچێتە هەرێمی خۆزستانەوە، دوو ڕووباری (ئاب زال و تەلا ڕود)ی تێکەڵ ئەبێ و ناوی (کەرخە) پەیدا ئەکات. ئەم کەرخەیە سەرئەنجام ئەڕژێتە ناو هەوراوی (گامش)، کە عەرەب پێی ئەڵێن (الهور العظیم AL Hor AL A´zîm)...

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم ڕووبارە سەیمەرەیە لەبەر توندوتیژی و، لەبەرئەوەی کە بەقووڵایی تێ ئەپەڕێ، کەمتر سوودی لێ وەرئەگیری بۆ ئاودان...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا کاتێکی تر بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/٧/٢٧

## وتاری: ١٣٧

گوێگره بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ... هیوای ئێمە کامەرانی و بەختیاریی ئێوەیە. لە وتاری پێشوودا هەندێ زانیارییان دەربارەی (سەیمەرە) بڵاوکردەوە و، لەم وتارەدا درێژە ئەدەین بەباسەکە...

ئەوەبوو وتمان، هەرێمی سەیمەرە لە سەردەمی عیلامەوە هەر هەبووە، گوایە عیلامەکان، ماوەیەک سەیمەرەیان کردووە بەپایتەخت پاشان قەڵای قایی (مادا کتو)یان دروست کردووە، کە شوێنەوارەکەی بەناوی (دەرە شەهر) بەناوبانگە... ئێمە گەرچی زانیاریی تەواومان دەربارەی بەسەرهاتی ئەم شارۆلکەیە نییە، بەڵام ئەوەندە ئەزانین، کە ناوەندی هەرێمی میهرەگای کوچک -واتا پێشکۆ- بووە... لە سەرەتای ئیسلامدا، کە سپای عەرەبی ئیسلام شاڵاویان کردە سەر کیشوەری شاهەنشایی ئێران و، بەشی عێراقیان داگیر کرد، ئەوەبوو یەزد گوردی پادشای ساسانی تیسفۆنی بەجێ هێشت و، هات لە نەهاوەند خۆی گرتەوە و، کەوتە سپا بەهێزکردن... بەڵام نەیتوانی درێژە بەبەرەنگاری بدات، چونکە سپای عەرەب بەفەرمانڕەوایی سەعد لە هەرێمەکانی جەلەولا و کەرخ جدان و حەلەوانەوە... و هێزێکی تر لە هەرێمی خوزستان و لوڕستانەوە، بەفەرمانڕەوایی ئەبو موسا و سەلمانی فارسی، خەریکی شاڵاو بوون. ئەوەبوو هورموزانی فەرمانڕەوای خوزستان و لوڕستان شکا و گیرا و، بەدیلێتی برا بۆ مەدینە...

ئەم هورموزانە زۆر جار لە سەیمەرە دائەنیشت بۆیە سپای عەرەب پتر هەوڵ و کۆششی ئەوەی دەکرد کە داگیری بکات...

هورموزان کە بەدیل گیرا، برایەوە بەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب خەلیفەی دووەم، بەجلوبەرگێکی گرانباوە، کە بەنیشانگەلی زێڕین پۆشرابوو. داوای لێ کرا ئیسلام بێ قەبووڵی نەکرد بڕیار لەسەر کوشتنی درا... پێش ئەوەی (شیرکێش) -واتا جەللاد- لە سەری بدات داوای ئاوی کرد، کە ئاوەکەیان هێنا، بەحەزرەتی عومەری وت: دڵنیابم تا ئاوەکەم دەخۆمەوە ناکوژرێم؟ وتی دڵنیابە، هورموزان کە جامە ئاوەکەی وەرگرت بەرلەوەی بیبا بۆ دەم ڕژتی... خەلیفە وتی: بەفێڵ خۆت لە کوشتن ڕزگار کرد... هورموزان، بەرامبەر بەم ڕەوشت بەرزییەی خەلیفەی دووەم موسوڵمان بوو و، هەر لە مەدینە مایەوە...

مێژوونووسان باوەڕیان وایە، کە هەر ئەو بوو پیلانی کوشتنی حەزرەتی عومەری دانا و، ئەرکی بەڕێوەبردنی خستە سەر شانی (فیروزان ئەبو لوءلوء)ی کۆنە ئێرانی...

ئەم شاری سەیمەرەیە گەرچی لە کاتی بەرەنگارییا بەرامبەر بەسپای عەرەبی ئیسلام وەستا و، خۆی نەدا بەدەستەوە. بەڵام زیانێکی زۆری دی... وەڵێ تا ساڵی ۲۵۸ کۆچی هەر مابوو. لەم سەردەمەدا بەپێی وتەی ئیبن ئەلئەثیر بوومەلەرزەیەک دایگرت، گرمەگرم و ناڵەناڵی و، قڕەی لە خەڵقی بڕی، بەجۆرێ شارەکەی هەژاند، کە خانووبەرە و دیوارەکانی ڕووخاند و بەشی گەورە شارەکەی وێران کرد و، بیست هەزار کەسێکی لە خەڵقی شارەکە کوشت پاش ئەوە، وا دیارە هێشتا ئاوەدانی تیا مابوو... چونکە مەسعودی ئەڵێ: شاری سەیمەرە لە بەرواری ۳۳٤ی کۆچییا بوومەلەرزە وێرانی کرد...

ئێستە کە ناوی سەیمەرە دراوە بەڕووبارەکە، هەرێمی سەیمەرە بووەتە بەخش و بەناوی دەرەشەهر یاخۆ (دارا شەهر) بەناوبانگە... سەر زەوی ئەم بەخشە ۲۵۰ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، درێژایی ۹۰ کیلۆمەتر و پانایی لە هەندێ جێ ۱۲ کیلۆمەتر و لە هەندێ جێ ۲٤ کیلۆمەترە... ژمارەی خەڵقی ناوچەکە ۱۲ هەزار کەسێ ئەبێ و، ۳۷ دێی تێدایە، گەورەترین دێی ئەو ناوە (هاشم ئاباد و چەم کەلان و شێخ مەکان و مازین و دەرەشەهر)یش ناوەندی بەخشەکەیە...

دانیشتوانی دەرەشەهر لە تیرەکانی میر و زەینی وەندن. و کاروباریان کشتوکاڵ و، ئاژەڵ بەخێوکردنە... شوێنەواری کۆنی شاری ماداکتو لەم ناوە دایە.

دانیشتوانی شێخ مەکان جگە لە میر زەینی وەند... تیرەکانی غەیاث وەند و (لەک)یشی تیایە.

دانیشتوانی چەم کەلان لە تیرەکانی سورخەمیری و یارکەن جگە لەم تیرەیانە، لە بەخشەکە (کولی وەند) هەیە لە شا کەرەمی دائەنیشن. دەسکەوتی ئەم دێهاتانە بەرهەمی کشتوکاڵە وەک گەنم، جۆ، برنج، نیسک، نۆک، ماشن... هەروا بەرهەمی ئاژەڵی وەک ڕۆن، پەنیر، پێستە، خوری، مو...

لەم بەخشەدا، قوتابخانە زۆرە، بەرایییەکان لە لایەن فێرکەران و مامۆستایانەوە، بەڕێوە ئەبرێن... ئەوانی تری لە لایەن سپای دانشەوە بەڕێوە ئەبرێ کە خەریکی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەوارین.

با ئەوەش بهێنینەوە یاد... هەرێمی سەیمەرە لە سەدەکانی بەرووی ئیسلامییا بەدەس

بنەماڵەی حەسەن وەیهـیـیەوە بووە، پاشـان کەوتۆتە دەس بنەمـاڵەی مـیـرانی لوڕی بچووک تیرەی (میر) خۆیان بەنەتەوەی شاهوێردی خانی ئاخرین ئەمیری لوڕستـان ئەدەنە قـەڵەم، کە هاوسـەردەمی شا عـەبباسی سـەفەوی بوو... و بنەمـاڵەی شـاهوێردی خـان، لە دەورانی سەفەویدا نازناوی خۆیان گۆڕی بە (عەبباسی) و، تا دەورانی شاهەنشـای مەزنی پەهلەوی ڕەزا شای گەورە هەر مابوون، لەوە بەدوا ناونیشانیان نەما...

گوێگرە خۆشەویسـتـەکـان بەرنامـەکـەمـان لێرەدا دوایی هات تا وتاری ئاینده بەخـواتـان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش بێ

١٣٥٣/٧/٢٩

**وتاری: ١٣٨**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەو کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ، هیوای ئێمە بەختیاری و خۆشیی ئێوەیە.

ئێمە لەم وتارەدا باسی (شا ئاباد) ئەکەین، لە بەشی خۆرئاوای ئێران و لە جێگەکانی ترا سەدەها جێگەمان بەم ناوە هەیە ڕەنگە ئەم جێیانە هیچیان لە لایەن شاهەوە دروست نەکرا بن، تەنیا لەبەر خۆشەویستی شایە کە ئەو ناوەی دراوەتێ. ئاری نژادەکان لە دەورانی ئیمپراتۆریەتی ماد و هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانییەوە تا ئەمڕۆ کە ئەکاتە ٢/٨٠٠ ساڵ زبانیان بەناوی پیرۆزی (شا) ڕاهاتووە، لەگەڵ هەموو شتێکی بەفەڕ و شکۆدانە لەگەڵ هەموو شتێکی جوانا تەرکیبی ئەکەن و، ئەیکەن بەپارچەی پێشووی ناوی ئەو شتە: وەک (شانشین) لەباتی کۆشکی شایی، وەک (شانازی) لەباتی ئیفتیخار... وەک (شاڕێ) لەباتی ڕێگای پانوپۆڕ وەک (شاگام) واتا هەنگاوی زل، کە وشەی (شەقام)ی کوردی لێوە پەیدابووە و، هەزارەهای تری...

با ئێستە بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لە ئوستانی کرماشان دوو جێمان هەیە بەناوی (شا ئاباد)... لە ئوستانی خوزستان سێ جێ هەیە بەناوی (شا ئاباد) لە ئوستانی ئازەربایجانی غەربی. (شا ئاباد) هەیە و لەزۆر جێی تریش، ئێمە لەم زنجیرە وتارەدا باس لە دوو شا ئاباد ئەکەین، کە لە ڕووی مێژووییەوە ناونیشانێکی کۆنیان هەیە.

یەکەم: شا ئاباد غەربە، کە شارۆلکەیەکی جوانکیلەیە و ناوەندی شارستانیشە...

شارستانی شا ئاباد یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی کرماشان سنووری دەوروبەری بەم جۆرەیە: لای باکورەوە، هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی پاوە و خود شارستانی کرماشان و، لای باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئیلام و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ خود شارستانی کرمانشا و لەگەڵ بەخشێ لە بەخشەکانی خوڕەم ئاوا، کە ڕووباری سەیمەرە لە یەکیان دائەبڕێ و، لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی قەسری شیرین... ئەم شارستانی شا ئابادە سێ بەخشی هەیە:

١- دەوروبەری خۆی کە پێی دەوترێ (حەومە) و ١٣٠ دێی هەیە کە لەم دێهستانانە پێکهاتووە: باوەند پوور - مەنسووری - شیان - برەسیمێن...

٢- کرند کە لە دێهستانەکانی بیونج و شیوە و خود کرند پێک هاتووە و ٤٠ دێی هەیە.
٣- گێلان غەرب کە پێکهاتووە لە دێهستانەکانی (گێلان - نەیوان - نەوئاوا و هی تری).

ژمارەی دانیشتوانی خەڵقی ئەم شارستانە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٣٠ فارسی ١٠٧،٠٠٠ کەس بوون، بەڵام لە سەرژمێری ١٣٤٥دا ژمارەی دانیشتوان گەیبوەتە ١٢٨،٠٠٠ کەس، واتا لە ١٥ ساڵدا ٢١ هەزار کەسی زیاد کردووە.

کەشوهەوای شارستانی شا ئاباد، بەپێی هەرێمەکانی ئەگۆڕێ... هەندێ بەشی گەرمەسێرە و، تەنیا ٨٠٠ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە. هەندێ لاشی گەرمەسێرە پتر لە ١،٥٠٠ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە... هەندێ جێشی ناوەنجییە خاکی ئەم شارستانە بژوێن و بەبڕشتە، جەنگەڵ و باغ و باغاتی زۆرە تەنانەت بەخشی کرند. ئاوی دێهاتەکان، چەم و، جۆگە و، کانی و، کارێزە. شێوەی قسەکردنی ئەم هەرێمە کوردیی کەڵوڕییە. بەشی زۆری دانیشتوان لە کاکەییەکانی ئەهل حەقن. با بێینە سەر شارۆلکەی شا ئاباد، کە ناوەندی شارستانەکەیە و پێ ئەوترێ شا ئاباد غەرب... ئەم شارۆلکەیە لەمەوبەر دێیەکی بچووک بووە بەناوی (هارون ئاوا)... ئەم جێیە لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامدا ئاوەدان بووە، لە سەردەمی عەبباسیدا لێرەدا شارۆلکەیەک هەبووە بەناوی (زوبەیدی)یە... دەبێ زوبەیدەی ژنی هارون ڕەشید بۆ ڕقەبەری لەگەڵ شیرین... ناوی خۆی نابێتە سەر ئەم شارۆلکەیە، کە ببێتە هاوتای قەسری شیرین. ئەم زوبەیدەیە شەش فەرسەنگ لە ژوور تەزەر (تەهەزەڕ)ەوە بووە کە لای (مورج) یا مێرگی دەشتی کرماشان بووە کە عەرەب ناویان نابوو (مورج القلعە) و ئەمڕۆ شوێنەواری ئەم قەڵا و شارانە نەماوە...

دێی هارون ئاوا ئەکەوتە بەخشی باوەند پوور، وا دیارە کوردەکانی ئەو ناوە، ناوی زوبەیدەیان گۆڕیوە بەهارون ئاوا جا ئەم دێیە لەبەرئەوەی ئەکەوتە سەرەڕێی خانەقین - کرماشان و کاروانەڕێ بوو. شاهەنشای مەزن خاوەن شکۆ ڕەزا شا دەستووری دا، ساختمانی باشی تیا دابمەزرێنن، سەرا و، بازاڕ و، گەرماو و، مزگەوت و قوتابخانەی تیا دروست بکەن، شەقامی تیا بکێشن... بەم جۆرە بوو بەشارۆلکەیەکی جوانکیلە... تەنانەت کە کارخانەی شەکری تیا دانرا... شارۆلکەکە کەوتە برەو و ناسرا...

لەم شارۆلکەیەدا، بەرق و کارەبا هەیە، ئاوی شارکە هی لولەیە... مێوانخانە، قاوەخانە، چاخان، کەبابخانە، چێشتخانە و، هەموو جۆرە جێگەیەکی حەسانەوەی تیایە،

چەند لقـێکی بانکەکـانی تیـایە... وەک بانکی مـیللی - بانکی سـادرات - بانگی کشاوەرزی.

کاروباری خەڵقی ئەم ناوە، لە یەکەم پلەدا، کشـتوکاڵە، لەبەرئەوەی خاکەکە بەپیت و بڕشتە، بەرهەمی کشـتوکاڵ فراوانە، دەسکەوتی زۆرە. جگە لە کشـتوکاڵ ئاژەڵداری زۆر بەبرەوە. کـاروباری تەون، چنین، جـۆلایی، هەللاجی زۆر پێـشکەوتووە، لەبەرئەوە لەوێ سوجادە و قـاڵی و بەڕە و جاجم و لبادی باش دروست ئەکرێ... جگە لەوە، لەبەرئەوەی کە لەو هەرێمـەدا جـەنگەڵ زۆرە، ڕەژوو خـەڵووزیش یەکـێکە لەوانەی لەوێوە ئەنێـررێ بۆ جێیانی تر.

## وتاری: ١٣٩

گوێگرە بەڕێز و خاوەن هەستەکان، بیستیارانی خۆشەویستی بەرنامەی ولاتەکەت بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

لەم وتارەدا باسی (شاهپور) دەکەین. ئەم ناوە زۆر لەمێژ نییە، ساڵی ١٣٠٩فارسی بەفەرمانی شاهەنشای مەزنی پەهلەوی ڕەزای شای گەورەی بەهەشتی - ئەم ناوە پەیدا بووە...

شاهپور، بەر لە ساڵی ١٣٠٩ بەناوی دیلمقان یا (دەیەلەکان - سەلماس) ئەناسرا... ناوی (سەلماس) لە سەرەتای ئیسلامەوە هەر هەبووە ئەگەر ناوەکە کوردی نەبێ، دەبێ ئەرمەنی بێ، یا کلدانی. ئەمەش دوورنییە... چونکە یاقوتی حەمەوی وامان بۆ دەرئەخات کە ناوی ئەوێ نەخۆشیی گەرۆتی لابردووە... کەوابێ پەیوەندییەکی لەگەڵ سەلامەت ئاوەر هەبووە...

مێژووی ئەم هەرێمە، بەپێی ئەو دێرینە و شتە کۆنانەی دۆزراوەتەوە ئەگەرێتەوە بۆ سەردەمی خالدییەکان، لە تەپەی زنجیر قەلا نزیکی ئاوایی تەمەر شوێنەواری ئەوان دۆزراوەتەوە. هەروا بەردەنووسی ساسانی و شتی تریش لە (گورچین قەلا) و ئەو ناوانە دۆزراوەتەوە... مەقدیسی لە کتێبەکەیا زۆر لە سەلماس دواوە و نووسیویە: سەلماس شارۆلکەیەکی خۆش بووە، بازاڕ و مزگەوتی بەبەرد دروست کراوە، لە سەدەی چوارەما هەموو دانیشتوانی کورد بوون... جگە لە ئەو یاقوتی حەمەویش لێی دواوە، بەلام وای نیشان داوە کە لە سەردەمی ئەوا شارەکە وێران بووە، نەک ئاوەدان... بەلام پاش ئەو بەپێی قسەی موستەوفی قەزوینی، لە دەورانی مەغۆلدا ئاوەدانی تیا پەیدا بووە،... چونکە موستەوفی ئەڵێ: غازان کونگەرە و بارووەکانی ئاوەدان کردۆتەوە... لە سەردەمی سەفەوی شا شاری سەلماس بەهۆی ڕوودانی شەڕ و هەرا لە نێوانی عوسمانی و سەفەویدا زۆر جار دووچاری کارەساتی وێرانی بووە... لە دەوروبەری ئەمیرخانی لەپ زێڕینیشدا، ساڵی ١٠٣٤ کۆچی، کوردانی سۆران و، برادۆست و، عێلاتی تری لە سەلماس لەگەڵ جەلالییەکان لە شەڕا بوون... ئەم شارۆلکەی سەلماسە، کە ئێستە ناوی شاهپورە زۆر جار بەهۆی بوومەلەرزەوە وێران بووە، لە سەردەمی قاجاردا ماوەیەک ناوی سەلماس خۆی شاردۆتەوە، دەیلەمەکان جێی ئەوی گرتۆتەوە...

له سـەرەتای شاهەنشاهیی پەهلەویدا، دیسانەوە ئەم شارۆلکەیە بەر بوومەلەرزە کەوتووە، وێران بووە. لەبەرئەوە شاهەنشای مەزن، ڕەزا شای گەورە فەرمانی داوە بەئەندازیاری کارەبا ئەسەدوڵلا خاوەرزەمین، شارەکەی سەرلەنوێ دروست کردۆتەوە و، ناوی ناوە (شاهپور).

موزیک

ئەمڕۆ شاهپور هەروەک ناوە بۆ شارۆلکەیەک، هەروا ناوە بۆ ئەو شارستانەش کە ئەم شارۆلکەیە ناوەندێتی. سنووری چوار لای شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای باکوری سنووری شارستانی (خۆی)ە. لای خۆرهەڵاتی سنووری بەخشی کیلە شینە شارستانی ڕەزائیەیە، لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ تورکیا.

شارستانی شاپور تەنیا یەک بەخشی هەیە، ئەویش دەوروبەری شارستانەکەیە -کە بەفارسی پێی دەڵێن (حەومە). لە هەشت دێستان پێکهاتووە، کە ئەمانەن (شاهپور - چهریق - لەکستان - گەردیان - شپیران - کەڕەسوننی - شینطال...) ئەم دێهستانانە نزیکە ١٤٠ ئاوایی گەورە و بچووکیان تیایە.

زەویوزاری ئەم ناوە بژوێن و بەپیت و بڕشتە، ئاووهەوای خۆشە... ناوە کانییەکانی بەکەڵکی ئەخۆشیی پێست دێن زۆر بەناوبانگن وەک:

- ئاوگەرم درێک: ئەکەوێتە ٣٠ کیلۆمەتری لای خۆرئاوای شارەکەوە.

- ئاوگەرمی ئیسی سو: ئەکەوێتە ناو چیای (زین دەشت) نزیک کەلی قوشچی، ئەویش ١٩ کیلۆمەتر لە شاپورەوە دوورە و نزیک بەدێی (ئیستی سو)وە.

- ئاوی سیدقیان: ٧ کیلۆمەتر، لە شاپورەوە دوورە و ئەکەوێتە نێوانی چیمەنێکی جوان... ئەم ئاوە ئەوەک هەر بۆ پێست باشە... تامیشی باشە و بەکەڵکی خواردنەوەش دێ.

- ئاوی دام داما: کە ئەکەوێتە داوێنی چیاکانی بەشی باشووری لای خۆرهەڵاتی شارستانەکە و، ٧٥ کیلۆمەتر لە شاپوورەوە دوورە.

جگە لەم کانییانە کە ئاوەکانیان کانگایی و گەڕاوە، لە شارستانەکەدا دوو ڕووبار و، یاخۆ دوو چەمی گەورە هەیە، بۆ ئاوەدانی زەویوزار و، باغ و باغات و، دەغڵ و سەوزە، کەڵکیان لێ وەرئەگیرێ:

یەکەم: ڕووباری (زولا)یە کە سەرچاوەکەی لە دێهستانی (شەپیر)ەوە بەرەو خوار

ئەبێتەوە و، تێکەڵی چەم و جۆگەکانی دەوروبەری ئەبێ و لەوێوە بەرەو دێهستانی لەکستان ئەکشێ...

دووەم: ڕووباری (زەڕین دەرە)یە کە سەرچاوەکەی لە چیاکانی دێهستانی (شینتال)ەوە سەرچاوە ئەگرێ و زەویوزاری تازە شەهر ئاو ئەدا... و تێکەڵ بەڕووباری زولا ئەبێ...

بابێینە سەر شارۆلکەی شاپور کە ناوەندی شارستانەکەیە شارۆلکەیەکی قنجیلەیە، تازە دروست کراوە، چوار شەقامی پانوپۆڕی ٣٠ مەتری تیایە...، ١٣ شەقامی ٣٠ مەتریشی هەیە... بازاڕێکی قنجی تیایە، چەند قوتابخانەی بەرایی... چەند قوتابخانەی ناوەنجی تیایە، چەند میوانخانەی هەیە. بەرق و کارەبا و ئاوی لولەی هەیە. چەند نەخۆشخانەی تیایە... لە دێهستانەکانیشا قوتابخانەی بەرایی، یاخۆ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە... سپای زانستی و سپای میهداشت و سپای پەرەپێدان بەکشتوکاڵ، لەم ناوەدا خزمەتی خۆیان بەجێ ئەهێنن...

خەڵقی شار و دێهستانەکان هەم بەکاسبی و هەم بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن... بەرهەمی ئەم ناوە دەغڵودان... توتن و دەسکەوتی ئاژەڵییە وەک پێشتە، ڕۆن، خوری...

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو... تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

١٣٥٣/٨/١٥

**وتاری: ١٤٠**

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ... لەم بەرنامەیەدا باسی (شاهین دژ) ئەکەین... شاهین دژ ناوی بەخشێک و شارۆلکەیەکە کە ناوەندی بەخشەکەیە و، سەر بەشارستانی (مەیاندواوە) کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی ئازەربایجانی غەربی...

شاهین دژ، لە بنەڕەتا ناوی (قەهود) بووە، کە مەغۆل داگیریان کردووە، ناویان ناوە (صاین قەلا)... و لەبەرئەوەی کە باتوخان -یا (بایدوخان)ی- نەوەی جەنگیز ماوەیەک تیا فەرمانڕەوا بووە، باتوخانیشیان پێ وتووە.

سنووری چوار لای شاهین دژ بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنووره لەگەڵ دێهستانەکانی ئاجورلو - و چهار دۆڵی... و لای خوارەوە، واتا باشووری هاوسنووره لەگەڵ شارستانی سەقز و، لای خۆرهەلاتیشی دێهستانی ئەحمەد ئاوا و بەخشی تەکابە. و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی بۆکانی سەر بەشارستانی مەهاباد... لە ڕووی کردکاری و سروشتییەوە جێی بەخشی شاهین دژ کوێستانە و، هەوای ناوەنجییە. دەسکەوتی دەغڵ و دانەوێڵەیە کار و کاسبی خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و، ئاژەڵ بەخێوکردنە ئەوەی ئەینێرنە شارەکان بۆ فرۆشتن گەنم و جۆ و پەتاتە و سێوی زەوی و چەوەندەری شەکر و، بەرهەمی ئاژەڵییە وەک شیر و ماست و پەنیر و پێستە و خوری... هەندێ لە ژنانی ئەو ناوە خەریکی کرد و تەون و چنین ئەبن. هەم بەڕە و مافوور و جاجم و شت دروست ئەکەن، هەم گۆرەوی و فانیلە و بلوز و پووزەوانە و شتی وەها ئەچنن.

زەویوزاری شاهین دژ بەپیت و بڕشتە. هەندێکی بەر ئاوە، بەهۆی چەماوەی (ساروق)ەوە ئاو ئەدرێ کە یەکێکە لەو لقانەی لە زەرێنە ڕود جیا ئەبێتەوە و، پاش ئاودانی زەویوزاری ئەم دێیانەی سەر بەشاهین دژن، ڕوو ئەکاتە بەخشی تاکاو، جگە لە ساروق لەو ناوەدا کانی و چەمی تری زۆرە، هەموویان ئەرژێنە ناو زەرێنە ڕود.

شاهین دژ، لە دوو دێهستان پێکهاتووە، یەکەم حەومەی شاهین دژ، واتا دەوروبەری... دووەم کوی ئاغاج... ئەم بەخشە نزیکەی ٨٥ دێی هەیە. گەورەترین دێی ئەم ناوە: هۆڵەسو - هاچەسو - قوزلو - مینبەر - چوبلو - سەفاخان - گوێی ئاغاجە، سەرژمێری هەموو بەخشەکە بیست هەزار کەسێ ئەبێ.

لای باشووری بەرەو لای خۆرئاوای بەخشەکە، هەرێمێکی چیاییە، کێوی کەرەفتو یەکێکە لەو کێوانەی پڕە لە ئەشکەوت... ئەم ئەشکەوتانە بەردەنووسی کۆنیان پێوەیە. ئەگەڕێنەوە بۆ سەدەی سێیەم و چوارەمی زایینی.

شارۆلکەی شاهین دژ، کە ناوەندی بەخشەکەیە، لەسەر دێهستانی حەومە دێتە ئەژمار... شارۆلکەیەکی قنجیلانەیە، نزیکەی ٢٥٠ دوکانی تیایە. قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی ناوەنجی، چێشتخانە - قاوەخانە - گەرماو - و زۆر جێی تری... مزگەوت و خانەقا و تەکیەشی هەیە.

شارۆلکەی شاهین دژ چەند کاریزی هەیە کە خەڵک سوودی لێ وەرئەگرن بۆ ئاودانی دەغڵ و دانەوێڵە و، سەوزە و بێستان و شتی تر... کاریزەکان ئەمانەن:

کاریزی خان... کاریزی میرزاجان... کاریزی حاجی... کاریزی چهل پا... کاریزی شا محەمەد... جگە لەم کاریزانە، ئاوی مزگەوتەکە هی کانی ئاوی (ناودان)ە...

لەم شارەدا بەرق و کارەبا، پۆست و تەلگراف و تەلیفۆن هەیە... ڕێگەکانی هەندێکی قیر کراوە و، هەندێکی خاکییە. و خەڵقی ئەو ناوە هەموو کوردن... دانیشتوانی شارۆلکەکە، تێکەڵن لە کورد و تورک و فارس، کە هەموویان لە ڕەگەزی پاکی ئاریان...

لەو شارۆلکەدا، جۆری خانووبەرە پێشکەوتووە، ژمارەی دانیشتوانی شارەکە بەپێی سەرژمێریی چەند ساڵێ لەمەوبەر ٤٠٠٠ چوار هەزار کەسێ بووە.

جگە لە شارەکە لە دێهستانەکانیشدا قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، ئەمانە لە لایەن سپای زانستی و، سپای بیهداشت و، سپای پەرەدان بەکشتوکاڵەوە بەڕێوە ئەبرێ.

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئەمانە هەندێ زانیاری بوو کە دەربارەی شاهین دژ بەدەسمان هێنابوو، تا وتاری تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش بێ

١٣٥٣/٨/٢١

## وتاری: ١٤١

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن...

ئێمە لە چەند وتارێکما دەربارەی (شوانکارە) ئەنووسین... واژەی (شوانکارە) ناوە بۆ زۆر شوێن... هەم لە بەشی خۆرئاوا و خوارووی کیشوەری ئێراندا... و هەم لە کوردستانی ئەودیودا، لەمەوبەر فەرهەنگنووسەکان، وایان ڕۆشن ئەکردەوە کە مەبەست لە شوانکارە هەرێمێکە لە فارس... بۆ وێنە بورهانی قاتیع و ئەنجمەن ئارا و ئانەندراج و دائیرەت المعاریفی بوستانی و دەیانی تر نووسیویانە کە (شبانکارە) یەکێک بووە لە هەرێمەکانی فارسی و شاری داراب گرد -یاخۆ «داراب کەرد»- ناوەندی بووە... ئەم هەرێمە لە دەورانی ساسانی و ئیسلامیشا لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی شوانکارەدا بووە، کە لە مێژووی ئێراندا بەناوی (ملوک شبانکارە) ناویان ئەبەن...

لە سەردەمی پادشایەتیی ملوکی شوانکارەدا، کە لە ٤٤٠ی کۆچییەوە تا ٧٥٠ی کۆچی فەرمانڕەوا و ئەمیری ئەم ناوە بوون، شوانکارە: بریتی بوو لەو هەرێمە لەژێر دەستیان بوو، ناوەندی پادشایەتی قەڵای ایگ بوو... و هەرێمەکانی داراب گرد، فەیروز ئاوا، فەسا، اصطهبانات و تا هەندێ جێی ئوستانی کرمانی ئێستە وەک (فراگ و طارم و سیرجان و لای خواریشەوە تا ولایەتی هورموزی کەناری خەلیجی فارس ئەتەنییەوە. بەم هۆیەوە دیاردی بۆ پاسێکی سەیر دەکەین، کە هەم ڕەخنەی تیایە و، هەم ڕۆشنکردنەوە... کونگەرەی لێکۆڵینەوەی ئێرانی، شەهریوەری ئیمساڵ کتێبێکی دەستنووسی وێنە گرتبوو. ناوی بە باخی تاجەدین ئەحمەد وەزیر بوو، ئەم چونکە دەسنووسە هی ساڵانی ٧٦٠ و لەوە دواترە و، ڕوونووسی دەسنووسی چەند خۆشنووسێکی ئەو سەردەمەیە. لەم جونگەدا، لە لاپەڕەکانی ٦١ تا ٦٤دا نووسراوە: کاتێ کە ساریە کوڕی زەنیم لە تاو کوتەکی کوشەندەی کافرانی داراب گرد خەریکی شکست خواردن و، هەراکردن بوو. حەزرەتی عومەر کە لە مەدینەی مونەوەرە خەریک بوو وتاری ڕۆژی هەینی دەخوێندەوە، هەستی بەم شکستەی سپای ئیسلام کرد و، پڕ بەدەنگ هاواری کرد: ساریە ئاگاداری لای چیاکە بە... «ساریە لەوێوە گوێی لە قسەکەی بوو، لای چیاکەی داگیر کرد و، بەسەر کوردە کافرەکانی فارسدا زاڵ بوو و، هەموویانی قەڵاچۆ کرد و، بەدەمی تیژی شمشێر لەناوی بردن...»

ئەم وتارەی تاجەدین ئەحمەد وەزیر گەرچی گەواه لەسەر ئەوەی کە کوردەکانی فارس - واتا عێلی شوانکارە- زۆر بەهێز بوون، تا ڕادەیەک کە سپای عەرەبی ئیسلامیان هێنابووە تەنگ... بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ جگە لە تاجەدین ئەحمەد وەزیر کەس نەیوتووە، ساریە ئەم شەڕەی لە داراب گرد کردووە. مێژوونووسان، هەموویان ئەم باسەیان کردووە و، کەرامەتی حەزرەتی عومەریان دەرخستووە بەڵام هەموو لایی یەک قسە، وایان ڕوون کردۆتەوە کە ئەم شەڕەی ساریە و هێزە کوردەکان لە نەهاوەند ڕووی داوە.

بەداخەوە، دانشگای ئیسفەهان کە ئەم بەیازەی بلاوکردۆتەوە، هیچ جۆرە پەراوێزێکی لەسەر ئەم باسە نەنووسیوە.

## موزیک

بابگەڕێینەوە سەر شوانکارە جا هەروەک وتمان، گەرچی ئەمڕۆکە شوانکارە ناوە بۆ دێهستانی، بەڵام لە هەمان کاتا ناوە بۆ چەند جێگەیەک و، بۆ چەند تیرەیەکی پەراگەندە لە عێلی شوانکارەی کۆن:

١- شوانکارە: دێهستانێکە لە یازدە دێهستانەکەی سەر بەبەخشی برازجانی سەر بەشارستانی بوشەهر... کە لەوەبەر سەر بەئوستانی فارسی بوو، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٣٥٣ فارسییا بوشەهر بوو بەناوەندی ئوستانی بەنادر و جەزائیری خەلیج... بەخشی بەرازجانیش وەرگەڕا بە شارستانی نەوێ و، ناونراوە شارستانی دەشتستان.

٢- شوانکارە: ناوە بۆ دێیەک لە دێهستانی مەیەندی سەر بەبەخشی ناوەندی شارستانی فەیروز ئاوا کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی فارس.

٣- شوانکارە: یەکێکە لە دێیەکانی بەخشی کوهەکی سەر بەشارستانی جهرمی سەر بەئوستانی فارس.

٤- شوانکارە: یەکێکە لە دێیەکانی ناوچەی جەوانڕۆ سەر بەشارستانی پاوەی ئوستانی کرماشان.

٥- شوانکارە: یەکێکە لە دێیەکانی دێهستانی مەیان ویلایەت لە بەخشی حومە و دەوروبەری شارستانی مەشهەدی ئوستانی خوراسان.

٦- هەروا ناوە بۆ چەند جێگەیەک لە کوردستانی ئەودیودا... هەم لە ئوستانی کەرکووک و هەم لە ئوستانی سلێمانی.

جا ئەم دێیانە، پاش پەراگەندەبوونی عێلی شوانکارەی گەورە، بەرامبەر بەشالاوی

مەغۆل و تاتار و تێکچوونی فەرمانڕەواییەکان، بوون بەمەڵبەندی ورده بڕکە و تیرەی عێلی شوانکارە و، ئەم ناوەیان گرتۆتە خۆیان.

ناوی عێلی شوانکارە هەروەک ئاشکرایە و، ئیبن البەلخیش لە فارستامەکەیا جەختی لەسەر کردووە، لەوێوە هاتووە کە ئەم عێلە خاوەن ئاژەڵی زۆربوون و، لە سەرەتادا ڕۆژگاری خۆیان بەکۆچەرێتی و ئاژەڵ لەوەڕاندن بەسەربردووە با ئەمەش ڕوون بکەینەوە کە مەبەست لە ئاژەڵ، لە کوردییا ناوێکی گشتییە بۆ هەموو جۆرە چوار پێیەکی سوودبەخش و کەڵکدار وەک (بزنەل - مێگەل - گاگەل - گەلە وشتر) هەروا ڕەوەی ماین و ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژیشی لەگەڵە...

گوێگرە خۆشەویستەکان تا بەرنامەی تری بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/٨/٢٥

## وتاری: ١٤٢

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ. ئێمە بارەها وتبوومان بڕیار وەهابوو کە نووسینی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە تایبەتیی شار و دێهاتە ناسراوەکانی بەشی خۆرئاوا و باشووری کیشوەری ئێران بێ، تەنانەت ئەو جێیانەی کە کوردزمانیان تیایە لەبەرئەوە، وەها بەباشتر زانرابوو، کە باسی شار و دێهاتەکانی کوردستانی خواروو، -واتا کوردستانی باشووری- دوا بخرێت بۆ پاش دواهاتنی ئەم زنجیرە وتارەی، کە دیمەنێکی (فەرهەنگی وڵاتناسی) دراوەتێ.

بەڵام لەم حەفتەیەدا، چەند نامەیەکمان بۆ هات لە بارەی ناوی سۆرانەوە نووسەرانی نامەکان داوایان لێ کردووین: کە بۆیان ڕوون بکەینەوە، ناوی سۆران لەچییەوە هاتووە؟ سنووری سۆران کوێ بووە؟ شارەکانی هەرێمی سۆران کام شارگەل بوون؟ هەروا داوایان لێ کردووین بۆیان دەربخەین لە کەیەوە ناوی شێوەی سۆران زمانی کوردی براوە بەسەر کرمانجیی خوارووا؟ کە تایبەتی ئوستانەکانی هەولێر - کەرکووک - سلێمانی - لە کوردستانی خواروو و، ئوستانی کوردستان و هەرێمی موکریانە لە کوردستانی ئێران...

سەرەڕای ئەو نامانەی بۆمان هاتووە، یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بەرنامە کوردییەکان، لەم ڕۆژانەدا چاوی کەوتووە بەنووسەرێکی زۆر گەورەی کورد، کە هەم لە ڕووی نووسین و هەڵبەست دانانەوە، لەناو کوردەواریی کرمانجی خوارووا، سەرنامەدە... و هەم لەو ڕووەوە کە هەڵسووڕێنەر و خێوی چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی بووە و، لە مێژوو و، لەسەر زەوی ناسینی هەرێمی کوردەوارییا زۆر شارەزایە... جێگەی پێیا ڕاپەڕموونە... جا دەربارەی هەندێ لەم زاراوانەی بەهەڵە کەوتوونە ناوەوە، پێکەوە دواون...

ئنجا لەبەرئەوەی لە سەرەوە وترا، گەرچی زنجیرە وتاری بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە گەییوەتە پیتی شێ، ئێمە وامان بەباش زانی بۆ ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵە، ئەم وتارەی سۆران بخەینە سەر زنجیرە وتارەکە.

موزیک

لەبارەی ناوی سۆرانەوە کە کەی پەیدابووە... لە مێژووی کۆنی ئێراندا، دوو بنەماڵەی (سورەن) ناو هەبووە، یەکێکیان لە سەردەمی ئەشکانییا... و ئەویتریان لە سەردەمی

ساسانیدا بەڵام بەڵگەمان بەدەستەوە نییە یەکەم ئەم دوو بنەماڵەیە گەیشتبنە هەرێمی سۆرانی ئێستە.

زۆر لە مێژوونووسانی عەرەبی نووسیش وەک مەسعودی خێوی (مروج الذهەب) و هی تر... ناوی سۆرانیان بردووە بەڵام بەو چەشنە کە ناوی عێلێکی کورد بووە و، جێی نیشتەنی ئەم عێلەیان ڕۆشن نەکردۆتەوە... دوورنییە عێلی سورچی کە ئەمڕۆ هەن، پاشماوەی ئەو سۆرانە بن.

بەڵام بۆ یەکەم جار فەزلوڵڵا عومەری دانەری کتێبی (مەسالیک الئەبصار) خوفتیان - واتا هەودیان- و شەقلاوە لە شارانی سۆران ئەداتە قەڵەم... قەڵقەشەندی دانەری کتێبی (صوبح الئەعشا)ش، لە زبانی ئەوەوە هەودیان و شەقلاوە بەشارانی سۆران دائەنێ. بەڵام هیچیان لەوە نەدواون، کە ناوی سۆران لە چییەوە هاتووە...

ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی کە ساڵی ۱۰۰۵ هەزار و پێنجی کۆچی (شەرەفنامە)ی داناوە، واتا پاش ئەوان ژیاوە، لەبارەی ناوی سۆرانەوە شتێکی دەرخستووە ئەڵێ: عیسای کوڕی کولوس، لە یاریەکی (میرمێرین) -کە میر و کزیریشی پێ ئەڵێن- لە لایەن گەنجانی کوردەوە بۆ گاڵتە هەڵبژێردرا بەئەمیر... ئەو کۆمەڵەی هەڵیان بژاردبوو، هەستیان بەقورسی سایەی فەرمانی بێگانە ئەکرد -مەبەستی پاشماوەی ئاق قویونلووە- جا هەڵیان کوتایە سەر قەڵای ئاوان کە لە بەردی سوور دروست کرابوو... قەڵاکەیان داگیر کرد و جاڕی سەرداریێتی کوردیان دا و... بە (سەنگ سورخی)یان ناسران... و لەبەرئەوەی کورد لەم هەرێمەدا بە (سورخی) فارسی ئەڵێن (سوهر) ئەمانە بە (سوهران) ناسران... جا ئەگەر ڕاست بێ وشەی سەنگ سورخی بەکار هاتبێ... دەبێ بکەوینەوە یادی وتەکەی (گەزەینفون)، کە لەو کاتەدا بەسپای دە هەزار یۆنانییەوە بەکوردستان تێپەڕبووە، وتویە کوردەکان سوخمەی سووریان لەبەر ئەکرد... کەوابێ دەبێ ناوەکە (سەنگ سورخی) نەبێ و، (سنگ سوور) بووبێ و، ئەمیر شەرەفخان خراپی وەرگرتبێ، ئەمەش دەربارەی ناوی سۆران بوو.

موزیک

بابێینە سەر باسی سنووری سۆران لە دەورانی کولوسدا وا دیارە ناوی ئاوان گۆڕاوە بە (ڕووان - دز) و، هەرێمی خوفتیان -واتا هەودیان- و باڵەکیانیش خراوەتە ژێر دەسەڵات. پاش ئەوە پەرە دراوە بەسنووری سۆران... حەریر و شەقلاوەشی خراوەتە سەر...

لە دەورانی نۆیەمینی سەرداری سۆران ئەمیر عیزەیدن شێردا شاری هەولێر کرا بەناوەندی سۆران. بەم هۆیەوە زانای کوردی مەزن ئیبن الحاجی شارەزووری لە کتێبی (رەفع الخیفاخ شەرح ذات الشیفا)دا کە باسی سولتان موزەفەری هەولێر دەکات ئەڵێ: ئەربیل ناوەندی ولاتی سۆرانە... لە دەورانی محەمەد پاشا کوێرەی رەواندزدا سنووری ولاتی سۆران پەرەی سەند و بەجۆرێکی رەسمی ئەم سنوورە قەبووڵ کرا: لای خۆرهەلاتی بووە زێ بچووک کە سنووربوو لە نێوانی سۆران و باباندا. لای خۆرئاوای بووە زێ گەورە کە سنووربوو لە نێوانی سۆران و بادیناندا... لای باشوور و خوارووی بووە چیای حەمرین واتا قەرەچوغ... لای باکوری تا شنۆ بوو... جا شارەکانی سۆران بریتی بوون: لە مەغمور - دیبەگە - هەولێر - شەقلاوە - حەریر - رەواندز - باڵەکیان - تا شنۆ. کەوابێ لەو حەلەدا لای خۆرهەلاتی سۆران سنووری سەردارێتیی بابان بوو. لای خۆرئاوای سنووری سەردارێتی بادینان بوو... لای باشووری چیای حەمرین و عێراقی عەرەب بوو... لای باکوری، سنووری ئیمارەتەکانی (موکریان - ئەردەلان - حەکاری) بوو.

لەو حەلەدا، ناوەندی بابان قەلاچوالان، پاشان سلێمانی و جارجارە کەرکووک بوو. ناوەندی بادینان عیمادییە بوو، ناوەندی ئەردەلان سنە بوو، ناوەندی موکریان دەرەیاس پاشان سابلاخ بوو، بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ شاری سلێمانی هەرگیز بەشێ لە سۆران نەبووە...

بابێینە سەر ئەوەی ناوی سۆرانی بۆچ دراوە بەکرمانجیی خوارووی؟ وەک وتمان، شێوەی سۆرانی تایبەتی ئیمارەتی سۆران بوو. شێوەی سۆران وەک شێوەی موکریان لە وشەدا دەوڵەمەندە. چونکە هەردوویان لە دوو شێوەی کرمانجی ژووروو و کرمانجی خواروو پێکهاتوون... شێوەکانی ئەردەلان و بابان لە گۆرانییەوە نزیکتر بوون، لە کرمانجی... بەلام لە دەورانی باباندا کە ئەدەبیات پەرەی سەند کرمانجی بەسەر گۆرانییا زاڵ بوو، کە گەشتیارانی ئەوروپایی، پاش ئەوەی فەرمانرەوایی شێخ مەحموود لە ولاتی بابانی کۆندا دامەزرا -کە تورکی عوسمانی ناویان نابوو ولاتی شارەزوور- گەشتیارە ئەوروپاییەکان، کەمتر ئەگەیشتنە هەرێمی بابان و زۆرتر ئەگەڕان بەسۆران و بەیادیناندا. لەبەر ئەوە ئەوان بەهەڵە یا لەبەر نەزانی خۆیان ناوی سۆرانییان بڕی بەسەر کرمانجی خوارووودا کە بریتی بوو لە شێوەکانی (موکریان - ئەردەلان - بابان - سۆران) و ناوی بادینانیشیان بڕی بەسەر کرمانجی ژووروودا کە بریتییە لە شێوەی هەرێمەکانی (بادینان - بارزان - حەکاری - ئورمییەی کۆن - وان - دیاربەکر - بەتلیس - و کوردی ئەریڤان - و گورجستان).

جا کۆمیتەی ناوەندیی بەرنامە کوردییەکان هیوای ئەوەیە کە ئەم زانیارییانەی لەم وتارەدا کۆکراوەتەوە، ببێتە سەرمەشقێ بۆ ئەو گەنجانەی تازە دەس ئەدەنە قەڵەم، جارێکی تری ناوانی سۆرانی و بادینانی بەکار نەبەن... و لە باتی ئەوانە کرمانجی خواروو و کرمانجی ژووروو بەکار بهێنن... هەروا لەباتی هەورامیش هەمیشە گۆرانی بەکار بێنن.

تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین، شاد بژین.

١٣٥٣/٨/٢٨

## وتاری: ١٤٣

گوێگره بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسه هەموو کاتێکتان شادبێ بەختیاریتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانه.

لە وتاری پێشوودا، ئەوەمان ڕوون کردەوە، کە لە سەردەمی ساسانی و سەرەتای ئیسلامدا، ناوی شوانکارە بەو جێگەیانە ئەدرا کە لەژێر دەسەڵاتی تیرە و عێلەکانی شوانکارەدا بوون و، قەڵەمڕەوی ماڵبەزی خێڵاتیان بووە... بەڵام پاش سەدەی چوارەمی کۆچی تا نیوەی سەدەی هەشتەمی کۆچی ناوی شوانکارە ئەبڕا بەسەر ئەو سەر زەوییانەدا کە لەژێردەستی فەرمانڕەوایانی شوانکارەدا بوون وەک هەرێمەکانی ئێیگ - داراب کەرد - یا داراب گورد - ئیستەهبانات - فراک - تارم - فەیروز ئاباد - فەسا - لار... تاد...

ناوەندی فەرمانڕەوایەتییەکەیان، زۆر جار قەڵای ئیگ بوو، کە (ئیج)شیان پێ دەگوت. فەرمانڕەوای بەناوبانگی شوانکارە فەزلویە کوڕی عەلی کوڕی حەسنویە ئەم قەڵایەی کرد بە شار و ئاوی بۆ قەڵاکە ڕاکێشا و، پیچ و دەوری ئەو قەڵا بەرزەی کرد بەباغ و جۆبار... ئەم سەردارە، لە دەوری گەنجییا بووبوو بەسپا سالاری ساحێب عالی ئیسماعیل کوڕی عەببادی طالەقانی وەزیری دەیلەمیان ساڵی ٤٤٠ کۆچی ئەم وەزیرە عادیلە بەدەسەڵاتە زانایە، بەفەرمانی ئەبو مەنسوور فولادستون کوڕی ئەبو کالیجاری دیلەمی لەسەر دیاردیی خەرسویە دایکی کوژرا... فەزلویە لەم کارە نالەبارە، هاتە قاروقین و، دژی ئەبو مەنسوور ڕاپەڕی و، گرتی و لە قەڵای پەهن دز - یا بیهنزاردا قەڵابەند و زیندانی کرد، تا مرد دەری نەهێنا... هەروا خەراسویەی دایکیشی لە گەرماوێکی داغی بێ ئاوا زیندان کرد، تا لە گەرمان پرووکا دەری نەهێنا.

### موزیک

ئەم ئەمیر فەزلویەیە، هەروەک شوانکارەی زۆر پەرە پێ دا، هەروا توانی هەرێمەکەی ژێردەستی، بپارێزێ و مەیدان نەدا بەدەسەڵاتی دەیلەمی و سەلجووقی بەسەریا زاڵ بێ... (قاوورد)ی برای سوڵتان ئەلپ ئەرسەلان کە فەرمانڕەوای کرمان بوو، ویستی بەشی زۆری هەرێمەکانی ژێردەستی فەزلویە داگیر بکات، بەڵام کە ئەمیر فەزلویە بەوەی زانی، کە بەهێز ناتوانێ بەرەنگاری لەگەڵ بکات زوو خۆی گەیاندە سوڵتان ئەلپ ئەرسەلان و ئەو ناوەی بەقەواڵە بەرامبەر بەسامانێکی زۆر، لێ وەرگرت، گوایە بەڵێنی دابووێ کە ساڵانە

٣ ملیۆن درهەم پیتاکی بداتێ... ساڵی ٤٥٩ قەرا ئەرسەلان بووبووە فەرمانڕەوای کرمان و لە سوڵتان ئەلپ ئەرسەلان یاخی بووبوو... سوڵتان ئەلپ ئەرسەلان خۆی بەسپا و شاڵاوی بردە سەر کرمان و داوای یارمەتیشی لە فەزلۆیە کرد. لە سەرەتادا فەزلۆیە سەری بۆ ئەلپ ئەرسەلان دانەواند و، لە قەڵای (پەهن دزدا) خۆی قایم کرد... نیزام الملوکی وەزیری ئەلپ ئەرسەلان توانی پاش ١٦ ڕۆژ گەمارۆدان، قەڵای پەهن دز بەئاشتی داگیر بکات و، بەفەرمانی سوڵتان فەزلۆیەی دانا بەفەرمانڕەوای هەموو فارس...

گەلاڵەی قسە... ملوک شوانکارە نزیکەی سێ سەد و پەنجا ساڵ، ئەم هەرێمی شوانکارەیەیان، بەجۆرێکی پیاوانە بردووە بەڕێوە... لە هەرێمی شوانکارەدا، گەلێ زانا و، هەستیاری بەرز هەڵکەوتووە قازی عەضودەدین ئەیجی کە خەڵقی قەڵای ئیج (واتا ئیگ) بووە و ماوەیەکی زۆر لە خوراساندا ژیاوە و، پاشان گەڕاوەتەوە فارس یەکێک لە ناودارانی شوانکارە... هەروا محەممەد عەلی شوانکارەیی کە مێژوونووس بووە و، دەربارەی عێلی شوانکارە کتێبی مەجمەع الئەنسابی داناوە ئەویش پیاوێکی گەورەبووە.

خاوەنی (نوزهەت القلوب) موستەوفی قەزوینی، کە مێژوونووس و جوغرافیانووسێکی بەناوبانگە بەم جۆرە هەرێمی شوانکارە بەئێمە ئەناسێنێ و ئەڵێ: شوانکارە، شەش جێگەیە و گەرمەسێرە و، لە ئیقلیمی سێیەم ئەژمێردرێ، سنووری لایەکەوە فارس و لایەکەوە کرمان و لایەکەوە زریەی فارسە، دەسکەوت و دەرئامەدی ئەم هەرێمە زۆربوو... ئەو باج و پیتاکەی ساڵانە ئەدرا بەدەوڵەتی دەسەڵاتدار بەسەر خاکی ئێرانا، تەنانەت لە سەردەمی سەلجووقیدا، ئەگەیشتە دووسەد تومانی ئەو سەردەمە... مەبەست لە تومانی ئەو حەلەش دە هەزار درهەم بووە، کە دەیکرد نزیکەی دوو ملیۆن تومانی ئێستە...

ئەمڕۆکە شوانکارە دێهستانێکی لە ٣٦ دێ پێکهاتووە، سەر بەبەخشی بەبەرازجانی فەرمانداری و شارستانی بوشەهرەکە ناوەندی ئوستانی بەنادیر و جەزائیرە، ئەم ناوە گەرچی لە دەورانی مەغۆل و تاتاردا زۆر وێران بوو... بەڵام پاشان خۆی گرتەوە... لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا زۆر دەربەستی هات ڕا و ئیهتیمامی پێ درا... قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواریی تیا دامەزرا... سپایانی بیهداشت و پەرەپێدەر بەکشتوکاڵیش لەو ناوەدا بەخزمەتی خەڵق و بەرێ بەدێیی کردنیان خەریکن.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات، تا کاتێکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

١٣٥٣/٩/١٠

## وتاری: ١٤٤

گوێگرە بەڕێزەکانی ولاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

لەم وتارەدا دەربارەی شوش ئەدوێین... کە ڕەنگە پێتەویستی بەزنجیرە وتارێک بێ... لە مێژوودا زۆر جێ، ئەم ناوەی هەبووە، تەنانەت لە خاکی ئێرانی ئەمڕۆ و کوردستانی شا... بۆ وێنە شوش جێگەیەک بووە لە هەرێمی لە دوورگەی ئیبن عومەر کە بەجزیر و بۆتان بەناوبانگە... و شوش قەلایەکی بەناوبانگ بووە لە دەوروبەری عەقرە بەلای بەشی خۆرهەلاتی دیجلەوە و، شوش جێگەیەک بووە لە هەرێمی گورگان و شوشی خوزستان بەناوبانگترین جێگە بووە لە ئێراندا. ئێمە لەم وتارەدا، باسی ئەم شوشەی خوزستان دەکەین. کە پایتەختی کاسی و عیلام و بابل و هەخامەنشی و ساسانی بووە.

واژەی شوش لە کوردییا بەو شتە ئەڵێن کە زۆر جوان و ڕێکوپێک بێ، جا ئەبێ لەبەر جوانیی ئەم شارە بووبێ، کە ناونرابێ شوش تەنانەت لە تەوراتیشدا پێی وتراوە شوش و شوشەن. هەندێ لە مێژوونووسانیش وتویانە کە ناوی (سوس - سوسێن - سوسیانە - سوزیا ) بووە... دوورنییە ناوی سوزیاش هەر لە کوردییەوە هاتبێ و لەبەر ئەوە بێ کە شارەکە لە دەشتێکی گەرمەسێرا بووە و، لە هاویندا هەوای گڕە و سەبوونی ئەوەندە بەتاوبووە کە ڕێبواری تینووی بێ ئاوی پڕووکاندووە...

شوش، کە ئەمڕۆکە هەم ناوە بۆ بەخشێک و هەم بۆ شارۆلکەکەی ناوەندی، لە دەورانی کاسی و عیلامدا جێگەیەکی ناسراوی بەناوبانگ بووە... تەنانەت کە بووەتە پایتەختی (عیلام)... شوشەن لە سەردەمی پادشایەتیی شەلخاک کوڕی شوشیناکدا پایتەختی دەوڵەتێکی زۆر بەدەسەلات بووە و شارێکی زۆر ئاوەدان و بەڕەونەقیش بووە ساڵی ٦٤٥ بەر لە زایینی مەسیح، ئەم هەرێمە بەر شالاوی سەختی ئاشوور پانیپاڵ کەوت و، بەرەو وێرانی ڕۆیشت و کەوتە نوشوستی و تا دەورانی هەخامەنشی خۆی نەگرتەوە... لە دەورانی شاهەنشایی هەخامەنشییا کەوتەوە ڕەونەق و بەرەو ئاوەدانی هەنگاوی نا لە سەردەمی داریوشی گەورەدا پڕبوو لە کۆشک و سەرا و تەلاری بەرز و بەشکۆ... کۆشکی ئاپادانای بەناوبانگ، کە لەم شارەدا دروست کرابوو و، هەواری زستانەی داریوش بوو... یەکێک بوو لە پایتەختەکانی شاهەنشایی هەخامەنشی... ئەم کۆشکە لە ساختمانە زۆر سەیرەکانی جیهان بوو، وا دیارە لە دەورانی داریوشدا ڕازاندنەوەی تەواو نەبووبوو، لە سەردەمی

ئەردەشێری کوڕی بەهمەن و ئەردەشێری دووەمدا، ئنجا ساختمانەکە دوایی هات. و لەسەر فەرمانی ئەردەشێری دووەم مێژووی بناغە و بنچینە داڕێژرانی لەلایەن داریوشی گەورەوە و، تەواوکردنی ئەو ساختمانە لەلایەن خۆیەوە، یاداشت کراو و لەسەر بەرد هەڵقەندرا... ئەو بەردەنووسانەی بەچوار زمان نووسرابوو و، بەکۆڵەکە و ستوونەکانی کۆشکەکەوە دامەزرێنرابوو: یەکێکیان ڕووی بەرەو باشوور بوو، بەزبانی فارسیی کۆن بوو، یەکێکیان ڕووی بەرەو خۆرئاوا بوو و بەزبانی عیلامی بوو... یەکێکیان بەرەو خۆرهەڵات دامەزرێنرابوو بەزبانی ئاسووری بوو...

هیردوتی باوکی مێژوونووسان، لە مێژووەکەیا ناوی شوشی براوە و نووسیویە: شاری شوش ئەکەوێتە کەناری ڕووباری خواسپ -و مەبەستی لە ڕووباری خواسپ ڕووباری کەرخەیە- ئەم شارە پایتەختی شاهەنشاییە و، گەنجینەکانی شاهەنشا هەموو لەوێیە.

جگە لەو ناساندنە... لەبەرئەوەش کە ئەردەشێری دووەم پیاوێکی هوشیار و زرنگ بووە، یۆنانییەکان بەپیاوی بەهۆش و بیر تیژیان وتووە مەمنون، هیردۆت ناوی مەمنونیشی بردووە و نووسیویە: (هەرکە گەیشتییە ڕووباری خواسپ -واتا ڕووباری کەرخە- لەوێوە سواری کەشتی ئەبێ و لە ڕووبارەکە ئەپەڕییەوە ئەوبەر و ئەچێ ناو شاری شووشەوە...) هەروا هیردوت لەسەر باسەکەی ڕۆیشتووە و نووسیویە: لە شاری ساردسەوە تا کۆشکی مەمنون کە جێگەی شاهەنشایە سێزدە هەزار و پێنج سەد ١٣٥٠٠ (استادیا)یە. کە دەبێ مەبەستی لە (استادیا) (پێ) بێ، کە بەئینگلیزی (فوت)ی پێ ئەڵێن. پاشان ئەم شارە لەلایەن ئەسکەندەری مەگدونییەوە داگیر کرا، دەڵێن ئەو گەنجینە و گەوهەر و شتە بەنرخانەی لە کۆشکی شوشدا هەبوو ئەسکەندەر تالانی کرد، ئەگەیشتە بایی دوازدە ملیۆن لیرەی ئینگلیزیی ئەم کاتە، پاش داگیرکرانی ئەم شارە لەلایەن ئەسکەندەرەوە، کەوتە نوشووستی و، ئەسکەندەر و جێنشینانی وازیان لە شوش هێنا و بابلیان کردە پایتەختی خۆیان، بەڵام ساڵی ٣١٥ بەر لە میلاد ئەنتیخونوس شاڵاوی بردەوە سەر شوش و داگیری کردەوە و گەنجینەکەی تاڵان کرد، کە ئەگەیشتە بایی سێ ملیۆن و نیو لیرەی ئینگلیزی ئێستە. ساڵی ٣٣١ بەر زایینی مولو لە ئەنتیخونوس یاخی بوو و، هەوڵی دا داگیری بکات، بەڵام قەڵای شوش زۆر قایم بوو، بۆی داگیر نەکرا، لەوە بەدوا ڕوو بەکزی ڕۆیشت.

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتارێکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٣/٩/٢٠

## وتاری: ١٤٥

گوێگره بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کامەرانی بێت... لە وتاری پێشوودا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە مێژووی بەسەرهاتی شوش دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵ پێش... واتا بۆ دوو هەزار ساڵ بەر لە زایینی... چون هەروەک وتمان ئەم شارە پایتەختی کاسی و عیلامییەکان بووە، هەخامەنشییەکانیش کردوویانە بەپایتەختی زستانیی خۆیان و، کۆشکی ئاپادانای بەشکۆ و ڕازاوەیان تیا دروست کردووە... پاشان ئەم شارە لەلایەن سپای ئەسکەندەرەوە وێران و تالآن کراوە و، دووبارە لە لایەن جێ نشین و پەیڕەوەکانیشییەوە وێران و تالآن کراوە.

ئێراناسی بەناوبانگ (پرۆفیسۆر گیرشمەن) -کە یەکێکە لە شوێنەوارناس و دێریناسەکان، خەریکی کۆڵیاری بووە لەشاری شوشدا، دێرینە و شوێنەوارەکانی ئەو شارەی لەژێر زەوییەوە هێناوەتەوە دەر، جا دەربارەی شاری شوش بیروباوەڕێکی زۆر سەیری نیشان داوە و، وتوویە: کە خەریکی کۆڵیاری بووم لە شاری شوش، بۆم دەرکەوت کە ئەم شارە پانزە جار وێران بووە و، ئاوەدان کراوەتەوە، هەر لە هەمان جێگەدا... بۆیە ناوی ئەم شارەم ناوە (شوێنەواری پانزە شاری)، چونکە شوێنەواری هەر پانزە شارەکە لەسەر یەک و چین لەسەر چین دەرهێنراون، کۆنترین شاریان هی دوو هەزار ساڵ بەر لە زایینی مەسیح بوو... تازەترین دێرینەیان هی سەدەی پێنجەمی کۆچی بوو...

### موزیک

دەستەی کۆلیاریی شوێنەوار و دێرینەناسی فەرەنسی کە شەست و پێنج ساڵە خەریکی کۆڵیارین لە شوش، شتی زۆر بەنرخیان دۆزیوەتەوە، تا ڕادەیەک کە مێژووی هەندێ لەو شتانەیان بردۆتەوە بۆ هەشت هەزار ساڵ بەر لە زایینی مەسیح، کە لەوێ دۆزراونەوە مەبەست لە هەشت هەزار ساڵ، دەورانێکە مس نەدۆزراوەتەوە و نەناسراوە و، هێشتا لەباتی چەقۆ و کەرەسەی تری، سوود لە بەرد وەرگیراوە...

جوغرافیانووسانی دەورانی ئیسلامیش ناوی شوشیان بردووە، بەڵام بیروڕای جیاجیایان نیشان داوە... بۆ وێنە ئیبن موقەفەع وتوویە: «پاش تۆفان و لافاوەکەی سەردەمی حەزرەتی نوح نوخشە دیوارێ کە دامەزراوە شوورەی شوش بووە...». ئەم قسەیەی ئیبن

موقەفەع ئەوە دەگەیێنێ کە لەو حەلەدا شاری شوش بەپێی ئەو هەواڵانەی کە لە تەورات و قورئانا هاتووە، تەوفان و لافاوەکەی سەردەمی نوح، ئەو هەموو خاکەی داپۆشیوە، کە بەجیهانی ئەو سەردەمە ناسراوە.

ئیبن موستەوفی قەزوینیش لە (نوزهەت القلوب)دا لە باسی شاری شوش دواوە و نووسیویە: شوش یەکەم شارێکە کە لەسەر زەویی خۆزستانا دامەزراوە، پاش ماوەیەک هۆشەنگی پادشای ئێران زەمین پەرەی پێ داوە و، دژ و قەڵا و کونگەرەی قایمی تیا دروست کردووە، بەڵام وێران بووە و، شاپوری (ذو الئەکتاف) کەوتۆتە ئاوەدانکردنەوەی و لەسەر دیەنی باز دایمەزراندۆتەوە. ساڵی حەودەی کۆچی لە لایەن، سپای ئیسلامی عەرەبەوە داگیر کرا، فەرماندەی سپای ئیسلام کە هەرێمی خۆزستانی داگیر کرد، ئەبو موسای ئەشعەری بوو، هەندێ ئەڵێن سەلمانی فارسی بوو... مێژوونووسان بیروباوەڕیان وەهایە کە هورمزان زۆر کەم بەرەنگاریی سپای ئیسلامی کردووە... شاری شوش چەند سەدەیێک بەئاوەدانی لەژێردەستی عەرەبی ئیسلامدا مایەوە. بەڵام ئەو حەلە ناوەندی هەرێمەکە نەبووە... عەرەب ئەهوازیان کردبووە ناوەندی هەرێمەکە.

شوش لە مێژووا بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە قامیشی شەکری زۆر پێ گەیاندووە و، هەوریشمی زۆر بووە و، کاڵای جوانی شوش بۆ زۆر لا نێرراوە. لە سەدەی چوارەمی کۆچی بەدواوە، ئەم شارە وێران بووە، هۆی وێرانەبوونیشی بوومەلەرزە بووە... لەبەرئەوەی بارەگا و خوابگای دانیالی پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل لەوێیە، جولەکەکان حەزیان ئەکرد ئەوێ بکەن بەنیشتەجێ. بونیامینی تەتەللی کە جولەکەیێکی مێژوونووسی بەناوبانگە لە سەدەی شەشەمی کۆچی بەدواوە بەو ناوەدا تێپەڕیوە و، لەو حەلەدا ٧٠٠٠ جولەکەی تیا بووە، کە ١٤ کەنیشتەیان هەبووە. لەم شارەدا مەسیحیش هەبووە، لە ساڵی ٤١٠ زایینییەوە تا ساڵی ٦٠٥ی زایینی ئوسقوفی مەسیحی تێدابوو... کە بەرزترین پایەی ڕابەرانی ئاینیی مەسیحییە پاش پاپا. وا دیارە پاش ئەوەی ئەو شارە تووشی بوومەلەرزە بووە، خەڵقەکەی کۆچیان کردۆتە دزیل (دزفول)، شوش هەروەک هەرێمێکی کشتوکاڵی بوو، ناوەندێکی بازرگانی و جەنگیش بووە چونکە لە نێوان دوو لقی ڕووباری کەرخەدا بووە... ئەمە بوو دەربارەی شوشی کۆن. پاشان دەربارەی شوشی ئێستە ئەدوێین. خواتان لەگەڵ.

## وتاری: ١٤٦

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ و، کامەران بن... لە وتارەکانی پێشووا هەندێ هەواڵمان دەربارەی شوشی کۆن ڕوون کردەوە، با ئێستە باسی شوشی ئەمڕۆ بکەین. ئەم شارە پاش ئەوەی لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بەبوومەلەرزە وێران بوو، جگە لە خوابگاکەی دانیال پێغەمبەر هیچی نەمابوو، ئەم خوابگایە لە ماوەی هەزار ساڵی وێرانیی ئەم شارەدا چەند جارێ دروست کرایەوە...

ساڵی هەزار و دوو سەد و شەست و شەشی کۆچی کە دەکاتە ١٨٦٠ی زایینی، هەندێ لە خۆرهەڵاتناسانی ئینگلیزی گەیشتنە شوش و چەند جێگەیەکیان هەڵکۆڵی و هەندێ شوێنەوار و دێرینەی کۆنەیان دەرهێنا. ساڵی ١٣٠٠ کۆچی دیولافوا کە یەکێ بوو لە خۆرهەڵاتناس و دێرینەناسانی فەرەنسی، ئیمتیازی هەڵکۆڵینی کۆنە شارەکەی لە دەوڵەتی ئێران وەرگرت و تا ساڵی ١٣١٦ کۆچی ئەو دەستەیە خەریکی کۆڵیاری بوون کە سەر بەدیولافوا بوون، ساڵی ١٣١٦ کۆچی، ئیمتیازی کۆڵیاری درا بەژاک دومورگانی فەرەنسەوی، جا هەڵدرینی کۆنە شاری شوش بەکۆششی دیولافوا و ژاک دورمورگان و گیرشمەن هاتە دی... ئەم دەستە کۆلیارە ئەورووپاییە، کە باسی دز و جەردەی ئەو ناوەیان بیستبوو، لەبەرئەوەی ئەترسان کە بەشەو هەڵمەتیان بدەن، هەم تالانیان بکەن و هەم بیانکوژن، نزیک بەخوابگاکەی دانیال پێغەمبەر لەسەر گردێکی بەرز قەڵایەکیان دروست کرد و لەوێ نیشتەجێ بوون و کەوتنە هەڵدرینی شاری شوشی کۆن... بەهۆی قەڵاکەی ئەوانەوە، خەڵکی شاری دزپول، چون لەوێ چەند دوکانێک و کاروانسەرایەکیان دروست کرد، ئنجا باغێکیان لێدا و داروودرەختیان ناشت و، ئاشێکی ئاویان دامەزراند، ئا بەم جۆرە ١١٤ ساڵ لەمەوبەر بناغەی شاری شوشی تازە دامەزرا. ئەمڕۆکە شارۆلکەی شوش ناوەندی بەخشی شوشی سەر بەشارستانی دزپولە. سنووری بەخشەکە بەم جۆرەیە: لای باکوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئەندیمەشک. لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی دەشت میشان. لای باشوور و خوارووەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئەهواز. لای خۆرهەڵاتیشی ڕووباری دزە. جێی شاری شوش ئەکەوێتە باشووری بەرەو خۆرئاوای دزپل و ٦٥ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، لە شەقامی ئەهواز - دزپلیشەوە نزیکە... ڕێی ئاسنی شەمەنەفەریش بەنزیکیدا ڕائەبوورێ...

شارۆلکەی شوش ئەمرۆکە پتر لە هەزار ماڵە، چەند شەقامی ڕێکوپێکی تیایە ئاوی لوولە و، بەرق و کارەبا و تەلگراف و تەلیفون و شتی تری تیایە، چەند میوانخانە و کەبابخانە و چێشتخانە و جێی نانخواردن و کاروانسەرا و گەرماو و قوتابخانە و مزگەوت و دەرمانگا و نەخۆشخانەی تیایە...

بەخشی شوش، لە پێنج دێهستان پێکهاتووە : (حوسێن ئاوا - بن ناظر - بن فەعەللا - چەنانە - زیویە) کە تێکڕا ٧٠ دێیان هەیە. ژمارەی دانیشتوانی ئەم دێیانە ئەگاتە ٥٠٠٠ کەسێک، خەڵقی ئەم ناوە لوڕی فەیلین و، لەو ناوە هەندێ ماڵە عەرەبیش کۆبوونەوە، ئەمانە هەموویان فارسی باش ئەزانن و، خوێندەوارییان بەزمانی فارسییە، سپای زانست و، سپای بەرەنگاریی لەگەڵ نەخۆشی و، سپای پەرەپێدان بەکشتوکاڵ لەم ناوەدا خزمەتی خۆیان بەجێ ئەهێنن بەخشی شوش لەبەرئەوەی گەرمەسێرە، ئەو میوەیانە پێ ئەگەیێنی کە تایبەتی گەرمەسێرن، وەک خورما، پرتەقاڵ، لیمۆ، نارنج، کەبات. خەڵقی ئەو دێیانە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ پەروەردە کردنەوە خەریک ئەبن... بەهاران دەشتی شوش هەزاران جۆرگوڵ و گوڵەک و گژوگیا پێ ئەگەیێنێ. بێ گومان ئەمڕۆ بەهۆی ئەو سەدەوە کە لەسەر ئاوی دز واتا (کەرخە) بەستراوە، ئەو ناوە پتر بووژاوەتەوە گەشتیار و گەریدەی زۆری وڵاتانی جیهان بۆ تێگەیشتن لە شکۆی کۆنی شوش سەر لەو ناوە ئەدەن.

هەروا موسوڵمانان و جولەکە و مەسیحییانیش بۆ زیارەتی قەبری حەزرەتی دانیال پێغەمبەر ڕوو ئەکەنە ئەوێ. تەنانەت لە دەوروبەری خوابگاکەی حەزرەتی دانیال چەند ئیمام زادەش نێژراون و، خوابگاکانیان لە بوومەلەرزە، ڕزگار بووە.

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەمەبوو هەندێ زانیاری دەربارەی شوش تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

## وتاری: ١٤٧

گوێگره بەڕێزەکان، شادی و کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانه...

لەم وتارەدا باسی (شنۆ) دەکەین، یاقوتی حەمەوی ناوی ناوه (ئەشنه) و موستەوفی قەزوینیش ناوی ناوه (ئەشنەوەیه) و، ئەمڕۆش کوردەواری پێی ئەڵێن (شنۆ) بەڵام نووسەرانی فارسی زمان هەر ئەشنەویەی پێ دەڵێن. له قسەکانی بوتروس بوستانی وا دەرئەکەوێ کە (ئەشنه) جۆره گیایەکی داروییه و، ناوەکه لەو گیایەوه هاتووه که لەو ناوەدا زۆر بووه و حەکیم و پزیشکانی کۆن کەڵکیان لێ وەرگرتووه. قسەکانی موستەوفی قەزوینیش که ئەڵێ دەوروبەری هەرێمی شنۆ بەڕیزه چیای (دەگیا) گەمارۆ دراوه، لەگەڵ قسەکانی بوتروس یەک ئەگرنەوه. بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا، کەس ناوی چیای (دەگیا)ی نەبیستووه و، هەواڵی ئەو جۆره گیایەشی نەبیستووه. ئیبن حەوقەل وتوویه: له سەدەی چوارەمی کۆچیدا هەرێمی (شنۆ) هەرێمێکی بژوێن و دەوڵەمەند بووه، تا ڕادەیەک کوردانی ئەو ناوه ئاژەڵ و چوار سمەیان بۆ فرۆش ئەنارده شاری مووسڵ و شارەکانی نێوانی دوو ڕووباری دیجله و فورات.

موزیک

وا دیاره شاری شنۆ لەوه کۆنتره که ئەم مێژوونووس و جوغرافیانووسانه دەربارەی دواون و، ئەگەڕێتەوه بۆ دەورانی (هۆری و خەلەدی)یەکان...

بەهرام چوبین که دژی هورمزی ساسانی شای ئێران و، دژی خوسرەوی پەروێزی کوڕی هەستا، سپای ڕۆم و سپای ئێران، له دەوروبەری شنۆ سەرکوتیان کرد و پاش ئەوەی شکا پەنای برد، خاقانی تورکی ئەو سەردەمه... ساڵی ٦٢٢ زایینیش (واتا ساڵی یەکەمی کۆچی) هیراقلیوسی قەیسەری ڕۆم که شاڵاوی کرده سەر ئێران، هەرێمی شنۆی وێران کرد و ڕووی کرده ئاتەش کەدەی ئازەر گوشتاسپ و ئەویشی وێران کرد... بەڵام ئەوەبوو شکا و بەسەر نەینەوا و (مووسڵی) ئێستادا گەڕایەوه...

پاش ئەم دەوره، کەمتر ناوی شنۆ له مێژووەکانا بەرچاو دەکەوێ تا دەورانی غازان خان که هەرێمی شنۆی سپاردبوو بەیەکێ له فەرماندەیانی تاتار و، ئەوەبوو ئەو ناوه بەهۆی شەڕوشۆڕەوه تووشی وێرانی و چۆڵ بوون هات.

ساڵی ٩٠٩ شا ئیسماعیلی سەفەوی ئەو ناوەی لە سارم بەگی موکریان داگیر کرد، پاش ئەوە شا تەهماسپ دایە ئەمیرخانی برادۆست و هەر بەدەس ئەوەوە مایەوە، ئەم ئەمیرخانی برادۆست. ئەو ئەمیرەیە کە لە دەورانی شا عەبباسدا یەکێ بوو لە ئەمیرە مەزنەکانی سەر بەئەو و، لەگەڵ شا عەبباسدا لە شەڕی گورجییاندا دەستێکی بەر شیر کەوت، ئەوەندە ئازا و مەرد بوو. شا عەبباس دەستووری دا دەستێکیان لە زێڕ بۆ دروست کرد و، بەخانی لەپ زێڕین ناسرا...

موزیک

گەلاڵەی قسە، ئەمڕۆکە شنۆ هەم بەخشە و هەم شارێکە ناوەندی ئەم بەخشەیە، سنووری بەخشەکە کە سەر بەشارستانی نەغەدەیە بەم جۆرەیە: لای خۆرئاوای سنووری عێراقە، لای خۆرهەڵاتیشی سنووری بەخشی سەلدوزە و لای باشوور و خواروی بەخشی لاهیجانە و، لای باکوریشی باراندوزچای -واتا شیوی باراندوزە- ئەم بەخشە دوو دێهستانی هەیە، کە لە ٦٠ دێ پێکهاتوون و، دانیشتوویان نەگاتە ١٤ هەزار کەسێ.

شارۆلکەی شنۆ کە ناوەندی بەخشەکەیە ١١٠ کلیۆمەتر لە خوار ڕەزائیەوەیە و، نزیک بەشەقامە ڕێیە. ناوی شاری شنۆ و دێهاتەکان، کانیاو، کارێز، چەمی گەدیرە، کە پێی دەڵێن قادر. دێ گەورەکانی بەخشەکە بریتین لە (حەسەن نوران و خالد ئاوا و سەنگان و نالیوان و نالوس و هەندێ تری).

شنۆ بەوە ناسراوە کە لە مێژووا زۆر مەلای باش و زانای بەرزی تیا هەڵکەوتووە، یەکێ لەوانە:

١- ئیمام سەدرەدین مەحموود ئەشنەهی، هاودەمی ئەبوبەکر سەعد کوڕی زەنگی فەرمانڕەوای شیراز بووە، مەلایەکی گەورە و موریدی شێخ شەهابەدین عومەری سوورە وەردی بووە، چون زۆر لە فەلسەفە و حیکمەتدا شارەزابووە، ئەمیر ئەبوبەکر ڕقی لێی هەڵساوە دەری کردووە، ئەم چوار خشتەکییە فارسییە هی ئەوە:

از صحبت تو، کنون، فراق اولیتر
بر درگە تو زرق و نفاق اولیتر
چون پردەء راست مخالف کردی
ماراپش ازاین راه عراق اولیتر

٢- عەبدولعەزیز کوڕی عەلی ئەشنەهی، یەکێ بووە لە زانایانی ئاینی، لەسەر ڕچی

ئیمامی شافیعی و، له زانستی فەرمایشت و حەدیسی پێغەمبەردا زۆر شارەزا بووه و، کتێبێکی دەربارەی میرات داناوه.

٣- عەلی کوڕی حامیدی ئەشنەوێ، خێوی کتێبی (تەسریفی مەلا عەلی)ش زۆر بەناوبانگ بووه.

ئێستەش له هەرێمی شنۆ و له شارەکەدا، چەند قوتابخانەی بەرایی و، چەند قوتابخانەی ناوەنجی هەیه.

هەروا له شارەکەدا بازاڕێکی خاوێن، چەند گەرماو، میوانخانه، مزگەوت، کەبابخانه، قاوەخانه هەیه... ئاوی لوولەکەش و تەلیفون و تەلگراف و بەرق و کارەبای تیایه، نەخۆشخانه و دەرمانخانه و، داروخانه و شتی وای هەیه.

هەرێمێکی بەپیت و بڕشته، کشتوکاڵ و باغ و میوەی زۆره، خەڵقی ئەو ناوه لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن. له هەرێمی شنۆ چاندنی توتن زۆر باوه، تا ڕادەیەک که جگەرەی (ئەشنەویه) که له توتنی ئەوێ دروست ئەکرێ و کارخانەکەی له سەقزه، بەناوی ئەوێوه ناو ئەبرێ.

تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاته و هەموو کاتێکتان باش بێ.

١٣٥٣/١٠/٩

## وتاری: ١٤٨

گوێگره بەڕێزەکان، شادی و کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە. لە وتارەکانی پێشووا باسی (شوش)مان کرد ئنجا نۆرەی (شوشتەر)ە، وتبوومان کە (شوش) لە کوردی و لە فارسییا واتا ڕێکوپێک و جوان... دیارە ئەم ناوە لەبەر ئەوە بەسەر شوشدا براوبوو کە زۆر جوان دامەزرابوو. پاش ئەو کە شوشتەر دامەزرا، چون لە ئەو جوانتر بوو، جێگەکەی بەرزتر بوو، ناونرابوو (شوشتەر). مێژوونووسانی عەرەبی نووس، هەروەکو ناوی شوشیان گۆڕیبوو بە (سوس) هەروا ناوی شوشتەریشیان دەسکاری کردبوو، بەڵام لەباتی ئەوەی ناوی بنێن (سوستەر) ناویان ناوە (توستەر)... ئەم شاری شوشتەرەش وا دیارە هەر هی دەورانی عێلان بێ، چونکە گومانی دێرینەناسان وەهایە کە لەسەر کەلاوەکانی شاری خایدالو دامەزراوەتەوە، کە بەر شالاوی ئاشوور پانیپاڵی ئاشووری کەوتبوو وێران بووبوو. حەمەدڵڵا موستەوفی قەزوینی لە (نوزهەت القلوب)دا وتویە: کە ئەم شارە لە لایەن هۆشەنگی پێشدادیانەوە دامەزراوە... پاشان لە سەردەمی ساسانیاندا کەوتۆتە پەرەسەندن، ئەردەشێری بابەکان و شاپوری کوڕی زۆر دەربەستی ئەم جێیانە هاتوون و هەوڵیان بۆ ئاوەدانی و ڕازاوەییان داوە. بەقسەی مێژوونووسان شاپوری کوڕی ئەردەشێر کە بەشاپوری یەکەم، بەناوبانگە و دووەمین پادشای ساسانی بووە حەزی کردووە ئاو بگەیێنێتە شاری شوشتەر کە جێگەکەی بەرزبووە، لەبەر ئەوە بڕیاری داوە بناوانێک لەبەر ئەو بەشەی ڕووباری کارون ببەستێ کە بەنێوانی شوشتەر و کارواندا ئەڕوات و عەرەب هەم (شەطیط) و هەم (عوظەیم) و هەم (دوجەیل)یان پێ وتووە، لەم سەردەمەدا شاپور لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمدا لە شەڕا بوو، ساڵی ٢٦٠ زایینی بەسەر ڤالەرینی قەیسەری ڕۆمدا زاڵبوو و بەدیل گرتی و، زۆری لە هێز و پەیڕەوانی بەدیل گرت، لەناو دیلەکانا زۆر ئەندازیاری باش هەبوون، جا ئەمانە خرانە کار بۆ دامەزراندنی ئەو بناوانەیە کە لە مێژوودا پێی ئەوترێ (شازەروان شاپور) ساختمانی ئەم بناوانەیە کە لە خوار شاری شوشتەرەوە بوو، بەیەکێ لە ساختمانە هەرە سەیرەکانی جیهان ئەدرایە قەڵەم، دیوارەکەی یەک میل درێژایی بوو، لە بەردی تاشراوی زل دروست کرابوو، کە تاتە بەردەکان بەشیشی ئاسن پێکەوە لکێنرابوون و، درزی نێوانیان بەقوڕقوشم پڕ کرابووەوە هەروا ناو بناوانەکەش، واتا زەوی ناو کەفەکەشی دیسان تەختەپۆش کرابوو بەقوڕقوشم داڕێژرابوو

کە ئاو نەدەڵێنێ، ئەم ئاوە کە دەپەنگایەوە هەم جۆگەی لێ هەڵ ئەگیرا بۆ شاری شوشتەر و، هەم چەند جۆگەیەکی لێ هەڵ ئەگیرا بۆ ئاودانی دەشتی شوشتەر و دەشتی شوش و ئەو ناوە. لەسەر ئەم ڕووبارە پردێکیش بەکەشتی و قایغ بەسترابوو، بۆ پەڕینەوەی مرۆڤ بەرەو شەقامی لای خۆرئاوا بەرەو عێراق. تا ئەمڕۆش شوێنەواری ئەو شازەروانە هەر ماوە. ساڵی ١١٠٦ کۆچی، یەکێ لە سەردارانی سەفەوییە کە ناوی فەتح عەلی خان بووە، ویستبووی ئەو بناوانەیە دووبارە دامەزرێنێتەوە، بەڵام تەنیا پایە و بناغەکەی دامەزراندبوو. نادر شای هەوشار کە چووە دیدەنیی هەرێمی خوزستان دەستووری دا ئەو بناوانەیە ببەسترێ، بەڵام لافاوی بەهێز ئەو سەدەی برد... لە دەورانی قاجاریشدا هەوڵ درا بۆ دامەزراندنەوەی ئەو بناوانەیە بەڵام سەرنەکەوتن ئێستە بەو دوو بەشەی کارون کە بەدوو لای شوشتەردا، ڕائەبوورن ئەوترێ (گەرگەر) و (پەندقیر)، ئەمانە ئەم دوو لقە ٣٥ میل لە خوار شوشتەرەوە تێکەڵ ئەبنەوە و ئەبن بەکارون.

## موزیک

هەرێمی شوشتەر لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەر کوڕی خەتاب داگیر کرا، ئەو فەرماندەیەی داگیری کرد ناوی بەراء کوڕی مالیک بوو. ئەم بەرائە لەوێ کوژرا... لە سەردەمی ئەمەویدا لە شوشتەر و دەوروبەری، شۆڕش بەرپابوو دژی ئەوان. هەرێمەکە لەژێردەست شۆڕشگێرەکان مایەوە، کە عەرەب پێیان دەوتن (خەوراج)، (شەبیب)ی سەرداری خەوراج شوشتەری کردە پایەگا و بنکەی خۆی، پاش مەرگی شەبیب حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی کە لە مێژووا بە (حەجاج ظالم) بەناوبانگە شوشتەری داگیر کرد و خستییە ژێردەست ئەمەوی... لە سەردەمی عەبباسیدا بۆ یەکەم جار مزگەوتێکی تیا دامەزرا، لە سەدەی چوارەم و پێنجەمدا، شوشتەر لەژێر فەرمانڕەوایی بنەماڵەی حەسەن وەیهیدا بوو، پاشان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەتابەگەکانی لوڕی گەورە، ساڵی ٧٠٥ی کۆچی ئیبن بەتوتە، جیهانگەرد و گەشتیاری تەنجەیی بەناوبانگ لە سەردەمی ئەتابەگ ئەفراسیاب کوڕی ئەتابەگ نوسرەتەدین ئەحمەددا بەوێدا ڕابردووە و، زۆر ئەم وڵاتەی هەڵناوە، کە وڵاتێکی هێمن و پڕ لە ئاسایشە و، لە سایەی دادگوستەرێتی ئەتابەگەکان دایە.

پاش دەورانی ئەتابەگانی لوڕی گەورە کەوتە ژێردەستی تاتار ئنجا ئیلخانییە تەیمووریەکان و، تا ساڵی ٨٢٠ی کۆچی هەر بەدەست تەیمووریەکانەوە مایەوە...

ئەم هەرێمە پاش ئەوەی موسوڵمانەتییان وەرگرت، زۆر لە موسوڵمانەتییا سەخت گیربوون، تا ڕادەیەک کە شوشتەر پەنجەی لەگەڵ قوم لێ ئەدا... لە سەدەی چوارەمدا، گەرچی هەرێمەکە هەموو شافیعی مەزهەب بوون کابرایەک کە ناوی ئەمیر نەجمەدین مەحموود ئاملی بوو و، خۆی بەسەید و ئەولادی پێغەمبەر ئەدایە قەڵەم، هاتە شوشتەر و لەوێ ڕچی شیعەیێتی پەرە پێ دا، خەڵقەکە بێ ئەوەی جیاوازی بخەنە نێوانی سونێتی و شیعیی هەموو پەیڕەوییان لێ کرد... لە سەردەمی سەفەویدا شوشتەر لەژێر دەستی والییانی لوڕستانا بوو...

لەبەرئەوەی کە ئەمیری لوڕستان خۆیشی شیعە بوو، لەگەڵ شا ئیسماعیل نەجەنگی و شەڕی نەکرد، لەوێ مزگەوت و تەکیە و حوسێنییەی زۆر دامەزرا و، قوتابخانەی ئاینی پەرە پێ دا لە شوشتەر جگە لە موسوڵمان، (سابئی)ش هەن. سابئی یەکێکە لە ئاینە سەیرەکانی جیهان، کتێبی پیرۆزیان (سیدرا)یە کە بەزبانی ئارامی و بەپیتی سریانی نووسراوە، ئەمانە خۆیان بەپەیڕەوی حەزرەتی یەحیا پێغەمبەر ئەدەنە قەڵەم و، لەبەرئەوەی زۆربەی کاروباری ئاینییان لە کەناری ئاوا بەجێ ئەهێنن هەمیشە لەو جێیانە دائەنیشن کە ڕووباری هەبێ، لە کۆنا سەر ژماری (صوبی) زۆر بوو... تەنیا لە شاری بەسرە دە هەزار ماڵ بوون... لە شارەکانی ئەهواز و ئابادان و خوڕەم شەهریش هەر زۆر بوون. بەڵام ئێستە کەمبوونەوە، وا دیارە هۆی کەمبوونەوەیان ئەوەیە کە ژن لە گەلانی تر ناخوازن و، ژنیش بەبێگانە نادەن.

گوێگرە بەڕێزەکان ئێمە نامانەوێ لەم وتارەدا بەدرێژە دەربارەی سابئە بدوێین، کاتمان تەواوبوو، باسی شوشتەر مایەوە بۆ وتارێکی تر، بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/١٠/١٦

گـوێگره بەڕێزەکـانی وڵاتەکەت باشـتـر بناسـە، ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان شـاد بێ هەندێکمان لە مێژووی کۆنی شوشتەر، لە وتارەکانی پێشوودا ڕوون کردەوە، ئێستە نۆرەی دووانە دەربارەی شـوشـتـەری ئەمـڕۆ... شـوشـتـەر یەکـێکە لە شـارسـتـانەکـانی ئوسـتـانی خوزستان، لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سەردەشتی سەر بەشارستانی ئیزە، لای خۆرهەڵاتیشەوە هەر هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی هەفت گوڵی سەر بەشارستانی ناوبراو و بەخشی ناوخۆی شارستانی دزیل و، لەلایەکیشەوە ئەگاتە سنووری شارستانی ئەهواز.

ناوەندی ئەم شارسـتـانە، خود شاری شوشتەرە، کە ناوی بڕاوە بەسەر شارستانەکەدا... هەرێمـەکـەی پێ دەشـتـێکی نەوییـە، تەنهـا ١٥ مـەتر لە ڕووی زریە بەرزترە، بەڵام خـود شـاری شـوشـتـەر، جـێگەکـەی بەرزە و بەشی زورگ و هەڵەتەکـەشی هەر بەرزە، بۆ وێنە بەرزایی کێوی تەفت ٣٠٥مەترە لە ڕووی زریەوە و، کێوی سـیـاش ٦٠٦ مەترە لە ڕووی زریەوە... ئەم شارستانە دوو بەخشی هەیە: یەکەم حەومە، واتا ناوخۆ و دەوروبەری، کە لە شەش دێهستـان پێکهاتووە و، ٩١ دێی هەیە و، لە سەرژمێریی سالی ١٣٤٥دا ژمارەی دانیشتوانی ئەم بەخشە گەییوەتە بیست هەزار ٢٠٠٠٠ کەسێک، دوو لقەکەی کارون کە ناویان (شەطیط) و (گەرگەر)ە بەم بەخشەدا ڕائەبوورێ...

بەخشی دووەم کە ناوی گەتوەندە، دوو دێهـسـتـانی هەیە: یەکـێکیـان دێی گـەتوەندە و ئەوی تر ناوی تیمچەیە و، بەخشەکە هەشت دێی هەیە.

شوشتـەر هەرێمـێکی گەرمەسێرە، ئاووهەوای زۆر گەرمـە، هەندێ جار وا ڕوو ئەدا کە ڕادەی گەرما ئەگاتە ٦٠ پلە...

ڕووبارەکانی شارستانی شوشتەر ئەمانەن: ڕووباری کارون کە سەرچاوەکەی لە چیاکانی بەختیارییەوە هەڵئەقوڵێ و ئەڕژێ بەرەو خوار و، لەلای باکوری خۆرئاوای شوشـتـەرەوە ئەبێ بەدوو بەش: بەشی گەرگـەریان بەلای باکـوری خۆرهەڵاتیی شـارەکەدا ئەڕوا ئەڕژێتـە بەند میزات و لە نـاو شاری شوشتەردا چەند تاڤگە و سۆلاڤ ئەهێنێتە دی و، کارخانەی کارەبا و بەرقی شوشتەریش لەسەر ئەم لقە دامەزراوە...

موزیک

ژمارەی دانیـشـتـوانی شارسـتـانەکە تێکڕا، بەپێی سەرژمـێریی سالی ١٣٤٥ هەتاوی

گەیشتۆتە نزیکەی ٨٠ هەزار کەس.

دێرینە و شوێنەواری مێژوویی ئەم شارستانە ئەمانەیە:

١- پردی سەردەمی ساسانی.

٢- مزگەوتی گەورەی جێ نوێژی هەینی و منارەکەی، کە هی سەدەی سێیەمی کۆچییە.

٣- خوابگای ئیمامزادە عەبدوللا کە ساڵی ٦٢٩ کۆچی دامەزراوە.

٤- قەلا و دژی سەلاسیل کە ٣١٥ کۆچی دروست کراوە.

٥- سەد میزان.

٦- سەد محەمەد عەلی میرزا دولشاهی.

٧- پرد و سەدەکەی شاپوری یەکەم.

٨- پردی گەرگوت.

بابێینەوە سەر خود شاری شوشتەر کە ئێستە شارێکی قنج و رێکوپێکە و، ناوەندی شارستانەکەیە. ئەم شارە ٨٥٠ کیلۆمەتر، لە تارانەوە دوورە و ئەکەوێتە نێوانی شەتیت و گەرگەر، کە وەک وتمان - هەردووکیان لقی رووباری کارۆنن و، لەسەر تەختە بەردەکان کەناری کارون دامەزراوە. ئەم شارۆلکەیە بازارێکی باشی تیایە، حەوت مزگەوت و حوسێنییەی هەیە، چەند ئوتێل و مێوانخانەی تیایە، لە هەموویان خاوێنتر و رێکوپێکتر میهمان سەرای سازمانی گەشتیارانە، چەند قاوەخانە و چەند چاخانە و چێشتخانە و، چەند کارگەی مافوور و قالی دروستکردن و چەند کارخانەی خشتی سوورەوەکراو موزائیک و چەند قوتابخانەی بەرایی کوڕان و کچان و قوتابخانەی ناوەنجی و، یەک سینەما و سێ یانەی وەرزش و زۆر خانەی تیایە... هەروا دوو دەرمانگا و، دوو داروخانە و دوو نەخۆشخانەی تیایە... تەلگراف و تەلیفون و ١٤ گەرماوی تیایە، ئاوی شارەکە هی بۆرییە و پێنج بانکی تیایە، پردێکی تازەی تیا دروست کراوە.

لە رووی فەرهەنگی و کۆمەلایەتی و بازرگانی و کشتوکاڵیشەوە زۆر پێشکەوتووە. لە بەخشەکان و دێهاتەکانیشدا قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. زۆربەی خەڵقی ئەو ناوە خەریکی کشتوکاڵ و، مێگەل بەخێوکردنن، بەرهەمی ولاتەکە، دەغڵ و دانەوێڵەیە، لە کۆنا ئەم هەرێمە قامیشی شەکری پێ گەیاندووە و، لەوێ دیباوکالای هەوریشمی چاک پێ گەییوە، خەڵقی ئەو ناوە لوڕ و بەختیارین هەندێکیان فارسیش ئەزانن، گوێگرە خۆشەویستەکان خواتان لەگەڵ.

## وتاری: ١٥٠

گوێگره بەرێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە کامەرانیتان هیوامانە. لەم وتارەدا باسی (شولستان) دەکەین، واتا جێگەی تیرە و عێلەکانی (شول). واژەی (شول) لە بنەڕەتا گەرچی بۆ زۆر مەبەست بەکارهێنراوە، بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە بۆ پیاوی ئازا و بەکار و گورجوگۆڵ بەکارهێنراوە...

با جارێ لە سەرەتادا باسێکی مێژوویی دەربارەی شول ڕوون بکەینەوە، ئنجا لە جوغرافیای شولستان بدوێین. وتمان شول بەمرۆڤی ئازا و گورجوگۆڵ وتراوە، بۆیە ئەم ناوە دراوە بەتیرەی شول کە تیرەیەکی شەڕانی و ئازا و دلێر بوون. هەڵبەستێ پاڵشت دراوە بە فەخرەدین ئەسعەدی گورگانی نووسەری داستانی (وەیس و ڕامین) گۆیا بەفارسی وتوویە: (جهان آسوده گشت ازدزد و طرار * زکرد و شول و ترک ومرد عیار) ئەم هەڵبەستە گەرچی توانجە لە کورد و شول و ترک، بەڵام لە هەمان کاتا نیشانەیە بۆ ئازایەتیی ئەم هۆز و گەلانە. بەڵام ئەوەی کە (وەیس و ڕامین) باسی شۆڕشنانەوەی تورک بکات، ئێمە لامان سەیرە، چون ئەو حەلە ئێران لەژێر دەسەڵاتی سوڵتان توغروڵ بەگی سەلجووقی تورکدا بووە. هەروا ئەو حەلە هەرێمی شولستان لەژێر فەرمانڕەوایی ملوکی شوانکارەدا بووە، کە نموونەی دادگوستەری و ڕەوشتی بەرزبوون... بابێینە سەر (فەرهەنگی دیهخودا) لە باسی شولدا ئەڵێ: شول یەکێکە لە عێلەکانی فارس لە سەرەتادا لە لوڕستان بوون و، لە دەوروبەری ساڵی ٣٠٠ی کۆچیيا نیوەی لوڕستانیان داگیر کردبوو و، لەو حەلەدا سەرداریان سەیفەدین ماکان ڕۆزبەهانی) بوو... بەداخەوە مامۆستا دیهخودا لێرەدا بەهەڵەدا چووە، چونکە تەئریخی گوزیدەی (موستەوفی قەزوینی )و تەئریخی شوانکارەی (موعینی نەتەنزی) هەردووکیان ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە شەڕ و هەرای نێوانی لوڕ و شول لە ساڵانی ٥٠٠ی کۆچیيا بووە، لە سەردەمی نەسیرەدین محەمەد کوڕی هیلال ئەتابەگی لوڕستاندا، کە عێلی شول بەسەرداریێتی سەیفەدین ماکان ڕۆزبەهانی نیوەی خاکی لوڕستانی تا گوە گیلویە داگیر کردووە... بەڵام نەسیرەدین محەمەد بەسەر سەیفەدین ماکان ڕۆزبەهانیدا زاڵ بوود و کوشتوویە و، ئەو بەشەی لوڕستانی ژێردەستی سەیفەدینی داوە بەنەجمەدین ئەکبەر ناوێ کە دەبێ نەوەی سەیفەدین بووبێ. لە ساڵانی ٥٥٥ کۆچییەوە تا ساڵی ٦٢٦ کۆچی کە ئەتابەگ هەزار ئەسپ کوڕی ئەبو تاهیر فەرمانڕەوای

لوڕستان بوو و، پیاوێکی بەدەسەلات و لەگەڵ فەرمانڕەوایانی فارسدا نێوانی ناخۆش بوو، هەڵی کوتایە سەر شولستان و داگیری کرد و، بەهۆی کارێز لێدان و جۆگە ڕاکێشان و، هاندانی قەلا و کیشاوەرزەکان بۆ کشتوکاڵ و باغ و باغات دامەزراندن، ئەوێی ئاوەدان کردەوە. بەلام ئەتابەگ تیگلەی کوڕی ئەتابەگ زەنگی کە لە نێوانی ٥٧١-٥٩١دا بیست ساڵی ڕەبەق فارس بوو و، پشتی بەدەسەلاتی مەغۆل بەهێز بوو، لەگەڵ لوڕ کەوتە شەڕەوە و، هەندێ لە عێلە لوڕەکانی لە هەرێمی کوە گیلویە دوورخستەوە و شولەکانی لەوێ جێگیر کردەوە. بەپێی وتەی قازی غەفارێ لە تەئریخی جیهان ئارادا لەم شەڕەدا عەلی فەرمانڕەوای لوڕستان کوژراوە، کە ئەمەش وا دیارە دیسان هەڵە بێ چونکە لەو سەردەمەدا ئەتابەگ هەزار ئەسپ فەرمانڕەوا بووە نەوەک عەلی. ئەگەر قسەکانی قازی غەفاری ڕاست بێ، دەبێ عەلی یەکێ بووبێ لە فەرماندەکانی سپای لوڕستان، کە لەژێر دەسەلاتی ئەتابەگ هەزار ئەسپدا بوو. شولەکان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەتابەگ موزەفەرەدین تیگلەی کوڕی ئەتابەگ هەزار ئەسپیشدا دیسانەوە شەڕیان بەلوڕستان فرۆشت... بەلام موزەفەرەدین تیگلە شکستی دان و سەری پێ شۆڕکردن. لە سەردەمی ئەتابەگ یوسف شا کوڕی ئەلپ ئەرغونی برازای هەزار ئەسپیشدا دیسانەوە هەرا لە نێوانی شول و لوڕدا هەبوو و، یوسف شا لە سنووری بەشی خۆرهەلاتی کوە گیلویە دەری کردن.

موزیک

ساڵی ٧٤٨ کۆچی، ئیبن بەتوتە، جیهانگەرد و گەشتیاری بەناوبانگی تەنجەی هەرێمی شولستانی دیوە و نووسیویە: کە شولستان یا هەرێمی شول ئەکەوێتە دەوروبەری کازروون و ئەم شولانە پیاوی باشیان زۆرە، تەنانەت باسی ئەوەی کردووە کە بەهلول شولی پیاوێکی زانا و خواناسێکی بەناوبانگ بووە.

شولەکان هەم بەهێز بوون و هەم قەلا و دژی سەخت و، هەم کونگەرەی قاییان هەبوو. بۆ وێنە ساڵی ٧٥٤ کۆچی کە ئەمیر موبارزەدین محەمەد لە بنەماڵەی ئال موزەفەر، کە بەرەگەز تورک بوون، هەڵی کوتایە سەر شاری شیراز و گرتی، ئەمیر شێخ ئەبو ئیسحاق ئینجو کە فەرمانڕەوای شیراز بوو، هەلات و ڕای کرد و خۆی گەیاندە ناو شولەکان و، لەو ناوە مایەوە تا ساڵی ٧٥٧ کۆچی، پاشان ڕووی کردە ئیسفەهان لەوێ گرتیان و بردیانەوە شیراز و کوشتیان.

ساڵی ٧٥٥ کۆچی کە هێشتا ئەمیر شێخ ئەبو ئیسحاق لەناو شولەکان بوو، ئەمیر

غیاثەدین مەنسووری زاوای، کە لەو حەلەدا فەرمانڕەوای شولستان بوو ویستی شالاو بکاتە سەر شیراز بۆ ئەوەی ئەمیر ئیسحاقی خەزووری بباتەوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی بەڵام سەرنەکەوت.

لە سەردەمی سەفەویدا، شولستان لەژێر فەرمانی یەعقوب خانی شولدا بوو، لە سەردەمی نادر شادا محەمەد خانی بلوچ ڕووی کردە شوشتەر، بەڵام نادر شا زوو بەسپاوە بەرەنگاری بوو شکاندی و لە دەربەندی شولستان ڕای فڕاند.

شولستان لە سەردەمی قاجاردا، بلوکی بوو، سەر بەشاپوری کازرون و، ئەمڕۆکە نیشتەجێی تیرەی مەمەسنییە سەر زەوی شولستان سەد میل درێژاییتی و شەست میل پانایی سنووری لای خۆرهەڵاتی ئەگاتە کام فیروز و ئەردەکان و، لای باکور و خۆرئاوای زەرگەرد و لوڕستان و کوهـ کیلویە و، لای باشوور و خوارووشەوە ئەگاتە کازرون و کێوی مرە شکەفت، هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە شول بەشێکن لە شوانکارە. بەڵام فەزڵوڵڵا عومەری لە مەسالیک الئەبساردا شولی بەبەشێکی تایبەتی کورد داناوە، وەک لوڕ...
ئەمڕۆ لە هەرێمی ئوستانی فارسدا چەند دێ و دێهستان هەیە کە شولەکانی تیا دائەنیشن و هەموویان ناویان شولە: وەک شولی نزیک شیراز کە نۆ فەرسەنگ لێیەوە دوورە. شولی پالەنگەری کە چوار فەرسەنگ لە پالەنگەرییەوە دوورە، شولی گاوگان... شولی فەتح ئاوا... شولی نێوانی گوڵستان و سەنگەر... شولستانی شاپوری کازرون...

ئەمڕۆکە لەم دێیانەدا، قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، دەرمانگا، داروخانە... و ساڵی ١٣٥٠ کۆچی لەوێ لقێکی لژیونی خزمەتی بەشەر دامەزرێنرا، کە زۆر هەوڵ ئەدات بۆ بەرزکردنەوەی پایەی خوێندەواری و ساغێتی ئەو ناوە.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواو بوو، ئەم کاتەتان خۆش.

١٣٥٣/١٠/١

## وتاری: ١٥١

گـوێگره بەڕێزەکـان ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان کـامـەران و شـاد بێ. لەم وتـارەدا باسی (شەراء) ئەکەین. ڕەنگە ئەم ناوە بۆ هەندێ لە ئێوە بێگانە بێ...

(شـەراە) نـاوی دوو ئاوایـیـیـە لە دەوروبەری هەمـەدان و ئەراک، ئەم ناوانە لە هی کۆمەڵەیەکی خارجییەوە هاتووە، کە ناوی (شاری) و (شەراء)یان بەسەر خۆیانا ئەبڕی. خەوارج گـەرچی لەو ڕۆژەوە پەیدابوون کـە داوەری لە نێـوانی ئیـمـامی عـەلی کـوڕی ئەبو تالیب و لە نێوانی مەعاویەدا دەستی پێ کرد و، ئەوان بەو داوەرییـە ڕازی نەبوون و، لە هەردوو لایان یاخی بوون و سـەریان بۆ هیـچیـان دانەنواند... بەڵام پاشـان خەوارج تەنیـا بەوانە ئەوترا کە دژی ئیمپراتۆریەتی ئەمەوی بوون. ئەم خەوارجانە، لەبەرئەوەی زۆربەیان عـێـلاتی کـورد بوون، لەم دەوروبەرانەوە سـەریان هەڵ ئەدا... (شـوشـتـەر - ڕام هورمـوز - مەندەلی - تاوق - نەهاوەند - هەمەدان - ئەراک - ئازەربایجان)

ڕابەری خارجییەکـان لە سـەرەتادا کابرایەک بوو ناوی سـالح کوڕی مەشروح بوو... پاش ئەو ڕابەرێتی کەوتە دەس شەبیب کوڕی یەزید ناوێ... ئەم شارییـانە لە سەردەمی حەجاج کـوڕی یوسفی سـەقـەفی والیی بەغدادا، کەوتنە شاڵاو و هێرش دژی دەسەڵاتی ئەمەوی، جارێک هەڵیـان ئەکوتایە دەوروبەری کوفە و جارێک داقـوقیـان داگیر ئەکرد و جارێک لە ئازەربایجان شۆڕشیان بەرپا ئەکرد. ئەمـانە نەوەک هەر لە شەڕا ئازا و دلاوەر بوون، بەڵکو خـوێندەواری باش و هەسـتـیـاری گـەورەشـیـان هەبوو... لە شـەڕێکا کـە لە نێـوانی سـپـای ئەمەوی و، کۆمەڵەی شارییـەکانا قەوما، زۆر لەم خارجییـانە کوژرا. جوعدی کوڕی ئەبو سەممام زوهەلی کە یەکێ لە هەستیـارەکانیـان بوو، بەهەڵبەستی عـەرەبی کەوتە سەر شیوەن بۆ کردنیان: کە ئەمە هەندێ لەو هەڵبەستەیانەیە:

(شَبـابٌ أطاعوا اللّه حَتَى أحَبَهُمْ
وكُلُّهُم «شـارٍ» يَخـافُ وَيَطْمَعُ
فَلَمّـا تَبَّـووا منْ (دَقـوقـا) بِمَنْزِلٍ
لِمِيعـادِ إخوانٍ تَداعَـواْ فَأجْمَعوا)

جا کابرای هەستیار وتی:

(گەنجانێ، کە ملیـان بۆ فەرمانی خـوا کەچ کرد تا لێـیان ڕازی بوو و خۆشی ویستێ، ئەوان هەموویان (شاری)ن و لە خوا ئەترسن و هیوایان بەخوا هەیە...)

جا ئەم کۆمەڵەیە کە ناویان شاری بوو، وایان ئەدایە قەڵەم بەو یاخێتی و شەڕوشۆڕەی دژی ئەمەوی ئەیکەن، خۆیان لە خوای پاکیزە کڕیوە و، بێ گوناهن و، ڕۆژی ڕستاخیز پرس و جوێیان لەگەڵ ناکرێ.

ئەم شارییانە پاش ئەوەی لە دەقوقا لێیان قەوما و، زۆریان لێ کوژرا، ڕوویان کردە چیا تا ئازەربایجان و لە دەورانی مەئمونی عەبباسیشدا دیسان هەر شەڕی خۆیان کردووە. بۆ ئاگاداری تەواو لەم باسـە چاو بگێـڕن بە (تەئریخی تەبەری) و (تەئریخی ئەلکامـیل) و (شەرحی نەهج البەلاغە)دا کە ئیبن ئەبی الحەدید نووسیویە.

## موزیک

جـا شـەراء بەناوی (شـەراهـ)کـانەوە ناونراوە... ئەمـڕۆ بەم ناوە دوو جێ هەیە. شـەراء ژووروو، ئەکەوێتە بەخشی وەفەسی سەر بەشارستانی ئەراک و نزیکەی ١٠٨ دێی تیایە، ژمارەی دانیشتوانی ئەم دێیانە ئەگاتە ٥٠٠٠٠ کەس، دەسکەوتیان بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵە، ئاویان هی ڕووبار و، میوەیان زۆرە تەنانەت ترێ.

شەرای خواروو، ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی هەمەدان، ئەم دێهستانی شەرایە ئەکەوێتە نێوانی سێ بەخشـی (سیـمـینە ڕود - ڕەزەن - کەبود ڕاهەنگ) ئەم دێهـسـتـانە ٤٧ دێی تیـایە، ئەمانیش خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنن. ژمارەیان ئەگاتە ١٧ هەزار کەس.

ئاووهەوای ئەم دێهـسـتـانانە لە هاوینا گـەرم و لە زسـتـانا سـاردە، لە دێهـاتەکـانا قـوتابخـانەی بەرایی، مـزگـەوت، حـوسـێنیـیـە هەیە، لە هەندێکیـانا سـینەمـا، گـەرمـاو، مێـوانخـانە، قـاوەخـانە، کەبابخـانە هەیە. سـپـایانی کـشـتـوکـاڵ و بیـهـداشت و سـپـای بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، لەم هەرێمەدا خەریکی هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشینێ.

زەویوزاری هەندێ لە دێیەکان بەراوە، خاکەکەی بۆ دەغڵ و دانەوێڵـە و، بۆ پێگەیاندنی میوە زۆر بەبرشتە.

گـوێگرە خۆشـەویسـتـەکـان لێرەدا بەرنامـەکە دوایی هات تا بەرنامـەی ئاینده بەخـواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

## وتاری: ١٥٢

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کامەرانی بێت، لەم وتارەدا ئەمانەوێ دەربارەی (شارەزوور) بدوێین. گەرچی ئەمڕۆکە شاری شارەزوور نەماوە و، شوێنەواریشی لەژێر بناوانەی دەربەندیخان دایە لەژێر ئاوا سەیرتان لێ نەیێ کە ئێمە لێی ئەدوێین... لە کۆنەوە پێشینان وتوویانە: (ئەوەی دێرینەی نەبێ و تازەکینەی بێ پشتیوانەیە) ئەوەی ڕاستی بێ کاک دڵشاد ناوێک نامەیەکی بۆمان نووسیوە و پرسیویە: شاری شارەزوور کەی دامەزرا...؟ کێ دروستی کرد؟ لە کوێدا بوو؟ چی دەورانێکی دی؟ کەی وێران بوو؟

هەرچەندە وەڵامی پرسیارەکانی ئەم برادەرە زۆری دەوێ و باشتر وایە چاو بگێڕی بەکتێبی (تەئریخی سلێمانی وڵاتی)یا، کە بەهەشتی ئەمین زەکی بەگ نووسیویە، بەڵام ئێمە وەڵامێکی گەڵاڵەی ئەدەینەوە...

سەرەتای دامەزرانی شاری شارەزوور نادیارە، ئیبن خەلەکان بردوویەتییەوە بۆ دەورانی ئەفسانەیی. گۆیا زور کوڕی ضەحاکی پێشدادیانی ڕوپۆشی کردووە و، ئێمە لەناو شایانی پێشدادیانا، ناوی (زۆر) گومان نابەین، چونکە ضەحاک خۆی بەکوتەکی ئاسنینی کاوەی ئاسنگەر سەری پانەوەبوو و، فورەیدون لە جێی دانیشت و بنەماڵەی کوێرەوە بوو.

خاوەنی (نوزهەت القلوب) موستەوفی قەزوینی کە باوەڕی بەقسەکانی ئیبن خەلەکان و مێژوونووسانی تری لەم بارەوە نەبووە، وتوویە ناوی شارەزوور لەوێوە هاتووە کە عێلاتی کورد هەر کامیان پتر بەهێز و بەدەسەلات بوو، ئەو عێلە داگیری کردووە، لەبەر ئەوە پێی وتراوە (شاری: زور).

هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە شاری (شارەزوور) لە لایەن قوبادی کوڕی فیروزی ساسانییەوە دروست کراوە... هیرەقلی قەیسەری ڕۆم لە نامە و گوزارشتێکا بۆ سەنا و ئەنجوومەنی پیرانی وڵاتەکەی خۆی نووسیویە، ناوی ناوە (سیازور) ئێمە لامان وایە کە ناوەکە لەوێوە هاتووە، کە هەرێمەکە ئاوەزێ و زونکاوی زۆرە و، چیاکانیشی بە (زۆرو) و (جەنگەڵ) ئەنراوە... هەر لەبەرئەوەیە پێی وتراوە (شارەزۆر) -واتا شاری جەنگەڵ و زۆنکاو... بەڵام مامۆستا تەوفیق وەهبی کە وتارێکی دوورودرێژی دەربارەی ناوی شارەزۆر

هەیە ئەڵێ: لەبەرئەوەی جێی شارەکە لە چاو چیاکانی دەوروبەری زۆر قووڵە، وەک ژوور = ناوەوەی ماڵەوە وەهایە (شاری ژوور) واتا شاری ناوەوە... هەرچۆن بێ ناوەکە گرنگ نییە. گرنگ ناوەڕۆک و بەسەرهات و ڕابردووی شارەکەیە.

موزیک

لە سەردەمی دەوڵەتەکانی گوتو و لولودا بەهەرێمی شارەزوور ئەوترا (زاموئا) ناوی شاری ناوچەکە بەجۆرێکی ئاشکرا نەزانراوە. تەنیا ئەوەندە ئەزانین کە ئاشوور ناسر پاڵ بیست و پێنج شارێکی لە لولو داگیر کرد و، هەمووی وێران... لە سەردەمی ساسانیدا هەرێمی شارەزوور بەناوی ئەردەشێر خۆرە بەناوبانگ بوو، واتا (کورەی شارەزوور) یا هەرێمی شارەزوور.

ئەم شاری شارەزوورە، ئەکەوێتە سەرەڕێ تیسفون، شیز... پادشاهانی ساسانی لە کاتی تاج لەسەر نانا، لە شاری تیسفونەوە کە ئەمڕۆکە تەنیا شوێنەواری تاقی کیسرای ماوە، بەسەر ئەم شارەزوورەدا ئەهاتن بۆ شیز، کە زایەگای زەردەشت و گەورەترین ئاتەشکەدەی ئادەر گوشنەسپی تیا بوو و، ئەمڕۆ ئەو جێیە بەتەخت سلێمان بەناوبانگە لە نێوانی مەهاباد و ڕەزائیە دایە، هەر لەبەرئەوەی کە وترا ناوی شارەزوور بە (نیم ئەزرای) بەناوبانگ بوو.

مێژوونووسی بەناوبانگ میسعەر کوڕی موهەلهەل وتوویە: لە کورەی شارەزووردا چەند شارێ هەبوو، لە هەموویان گەورەتر (نیم ئەزرای) بوو، ئەکەوتە دەشتێکی ساکار، خەڵقەکەی سەربەخۆ ئەژیان و، زۆر بەهێزبوون، شوورەی شارەکە ٨ مەتر پان بوو، غاردانێی بەسەردا ئەکرا. زستانان عێلاتی (گەلاڵی - بازیان - حیکەمیە - سولیە) تیا ئەبەزین. کە ژمارەیان پتر لە ٦٠ هەزار ماڵ بوو. ولاتێکی بژوێن و بەپیت و بڕشت بوو، دوو ڕێزە چیای نزیکی هەبوو:

یەکەم (زەڵم). و دووەم (شەعەران) - کە هەڵەیە و، مەبەستی (شمێران)ە.

لە سەرەتای ئیسلامدا ساڵی ٢٢ کۆچی بوو، کە حەزرەتی عومەر کوڕی خەتاب داگیرکردنی شارەزووری خستە ئەستۆی عەزرە کوڕی قەیس کە فەرماندەی حەلەوان بوو، بەڵام پڕی بەشارەزوور نەبرد و بۆی داگیر نەکرا... ئنجا ئەو ئەرکە خرایە سەر شانی عوتبە کوڕی فەرقەد... ئەو بەئاشتی داگیری کرد، بەڵام پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە سپای ئیسلام کوژران و تیاچوون و، مار و دووپشک لە ناوی بردن.

دەنگوباسی شارەزوور تا سالی ٤١ کۆچی، لە مێژوودا نییە... بەڵام لەم ساڵانەدا فەروە کوڕی ئەشجەع کە لای خۆی والی و فەرماندەی ئەو ناوە بوو، دژی دەسەڵاتی مەعاویە وەستا و، شۆڕشی هەڵگیرساند و، بەهێزی کوردی شارەزوورەوە ئەو ناوەی تا کوفە راماڵی... و ساڵەهای ساڵ لەگەڵ سپای مەعاویەدا لە شەڕا بوو، تا موغیرە کوڕی شوعبە بەسەریا زاڵ بوو کوشتی و لەشکرەکەی گەڕایەوە بۆ شارەزوور و، لە پاومانی دەسەڵاتی ئەمەویدا عوسمانی کوڕی ئەبو سوفیان بەسەر شارەزوورەوە فەرمانڕەوا بوو... ئەبو موسلیمی خوراسانی لە ئەهاوەندەوە لەشکرێکی گەورەی بەفەرماندەیی قوحتوبە کوڕی شەبیب نارده سەر شارەزوور، ئەم قوحطوبەیە شارەزووری داگیر کرد و، بەهێزی وڵاتی شارەزوورەوە چووە یارمەتی سپای ئەبو موسلیم خوراسانی کە لەسەر ئاوی زێی بچووک لەگەڵ سپای مەروان کوڕی محەمەدی ئەمەویدا لە شەڕا بوو... ئەوەبوو ئەمەوی لە ماحوز شکان و بەم جۆرە دەوڵەتی عەبباسی دامەزرا...

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/١١/١٥

## وتاری: ١٥٣

گوێگره بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە، شادی و کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە...

لەوتاری پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە کاک دڵشاد ناوێ نامەیەکی بۆ نووسیوین و، لە بارەی شارەزوورەوە هەندێ پرسیاری لێ کردووین... ئەوە بوو لە وتاری پێشوودا ڕوونمان کردەوە کە هۆی ناوی شارەزوور چییە... هەروا مێژووی ئەو هەرێمەمان ڕوون کردەوە تا دەورانی ئەبو موسلیمی خورسانی، کە سەردارێکی نارده شارەزوور و، ئەو سەرداره بەهۆی هێزی کوردەوە لە ماحوز نزیکی ڕووباری زێی بچووک سپای ئەمەوی شکاند... پاش ئەم سەردەمە، گەرچی شارەزوور بەناو دائەنرایە ژێر فەرمانی خیلافەتی عەبباسی بەڵام لە ڕاستییا وڵاتەکە لەژێر دەستی فەرمانڕەوایانی سەربەخۆی کورددا بوو... بەپێی قسە مێژوونووسان گەورەترین عێلاتی کوردی (شارەزوور) لە سەدەی چوارەمدا گەلالی و بازیانی و چەند عێلێکی تر بوون... و سەر زەوی شارەزووریش لە سەرەتای پەیدابوونی موسوڵمانەتییا پڕبووه لە شار و قەڵا و دژ... وەک (دزدان) -کە دەبێ لە جێی (دزەیشی) ئێستەدا بووبێ- و تیران شا و کینا و دەیلەمستان و نیم ئەزرای و هی تر... کە ئەمڕۆکە ناونیشانیشیان نەماوه.

ساڵی ٣٣٠ کۆچی... حوسێن بەرزیکانی کە سەرۆکی عێلی بەرزینی بوو و، ئەم عێله یەکێک بوو لە عێله گۆران زمانەکان و، لە سەرەتادا لە گۆرانەکانی دەوروبەری هەرسین بوو... ئەم حوسێن خانە توانی لە شارەزوور فەرمانڕەواییەکی کورد دابمەزرێنێ، کە لە ساڵی ٣٤٩ کۆچییا بەمەرگی خوایی شادبوو... کوڕە گەنجەکەی لە جێی دانیشت کە ناوی حەسەن وەی بوو، ئەم کوڕە ئازا و جوامێر پەرەی دا بەسنووری وڵاتەکەی، بەلای خۆرهەڵاتا تا هەمەدان و بەلای خۆرئاوادا تا زێی گەوره... واتا ئەم سەر زەوییەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوه کە ئەمڕۆکە بریتییە لە ئوستانەکانی هەمەدان- کرماشان - کوردستان - سلێمانی - کرکوک - هەولێر) و بەشێ لە ئوستانی دیاله و کوت... ئەم هەرێمانە بەناو، لەژێر فەرمانی خیلافەتی عەبباسیدا بوون، بەڵام یارای ئەوەیان نەبوو کە پێیا ڕابورن...

شارەزوور و شارەکانی ژێردەستی فەرمانڕەوایی حەسەن وەی لە ڕووی زانست و زانیاری و کشتوکاڵ و ئاوەدانی و پێشکەوتەوە نموونە بوون، مەلا گەورەکانی شارەزووری نژاد کە

له مێژووا بەناوبانگن، وەک سۆفیەی دینەوەر و، زانایانی حەلەوانی... هەموویان هی ئەو سەردەمە بوون ئەمیرانی ئال بویە و سەلاتینەکانیان، کە دەسەلاتیان لە خیلافەتی عەبباسی داگیر کردبوو... بۆ بەرەنگاری دوژمنان و بۆ ڕزگاری لە هەرای ناو خۆیان، هەمیشە یارمەتییان لە حەسەن وەی وەرئەگرت... سالی ٣٦٩ کۆچی کە حەسەن وەی بارەگای لەم جیهانە دەگوێزایەوە بۆ ئەو جیهان (عەضود الدەولەی ئال بویە) هەلی دەسکەوت، بشێوەنەی خستە نێوانی کوڕەکانی حەسەن وەیە و هەموویانی کرد بەگژ یەکا و دەسگیری کردن و قەلاچۆی کردن... تەنیا بەدری هێشتەوە جلەوی فەرمانداری ولاتەکەی پێی سپارد... بەدر گەنجێکی وشیار و ژیر بوو. فەرمانڕەوایی شارەزووری دا بەئیبن المازی و سامغانیشی دا بەهیلالی کوڕی خۆی...

هیلال لای دایکەوە لە عێلی شازەنجانی بوو، خوارزای سەردارانی بەنی عەییار بوو، کە لەژێر دەسەلاتی حەسەن وەیهیدا بوون... هیلال لەگەل بەدری باوکی نێوانی ناخۆش بوو، هەلی کوتایە سەر شارەزوور و داگیری کرد و ئیبن المازیی دەسنێژی بەدری باوکی کوشت و، ئەم کارەی بوو بەهۆی ئەوەی باوکی لەشکری بکاتە سەر... شەڕ و هەرای نێوانی باوک و کوڕ بووە هۆی شلەژانی شارەزوور. ئەمیر بەدر شارەزووری خستە ژێر دەستی سولتان بەهاء الدەولەی دەیلەمی، جا سپایێ بەفەرماندەیی فەخر الدەولە کەوتە شەڕ لەگەل هیلال و بەدیل گرتی. ئەم شەڕانە شارەزووری وێران کرد، سالی ٤٠٤ کۆچی ئەمیر تاهیر کوڕی هیلال سپای بردە سەر شارەزوور و لەژێر دەسەلاتی ئال بویە ڕزگاری کرد... پاشان هەرێمی شارەزوور کەوتە ژێر دەس بەنی عەییارەکان، ئەوانیش لە ناوخۆیا تێکچوون، بوونە پتر شلەژاندنی شارەزوور لەم هەلەدا سەلجوقییەکان بەسەریان زالبوو... بەردەوامی شەڕ لە نێوانی غوز و کوردا، ولاتەکەی وێرانتر کرد. ولاتەکە ماوەیەک کەوتە ژێر دەست بنەمالەی ئەیوبی پاشان سولتان سەلاحەدین شارەزووری دا بەسولتان موزەفەر گوگبوری سولتانی هەولێر...

سالی ٦٣٢ کۆچی بوومەلەرزەی سەخت شارەزووری وێران کرد کە مەغۆل شالاویان هێنا کوشتاریان تیا کرد، تالانیان کرد وێرانیان کرد، گۆیا لەم هەلەدا دوو عێلی گەورەی کورد کە ناویان (لازیان و بازیان) بووە - یاخۆ (لادین و بادین) کۆچیان کردووە بۆ جەزائیر. لەم دەورەدا دەولەتی بابە ئەردەلان لە شارەزوور دامەزرا. بابا ئەردەلان قەلای سەختی (ظەلم) دروست کرد. چونکە قەلا و شارەکانی (شیز - نیم ئەزرای - تیرانشا - سامغان - دزدان) نەما بوون... (قەلای ظەلم - ئەوسود - شمێران - هاوار - شێخان - دووئاوان

- گولعەنبەر) جێی ئەوانیان پڕ کردەوە.

لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچییا تەیموری لەنگ هەموو شاری شارەزووری بەتورەکە بێژا... ئیتر ئاوەدان نەکرایەوە.

ســـەرداریتی ئەردەڵان بوو بەدوو بەش: بەشی شـــارەزوور کـــەوتە بەر بابان بەشی کوردستانی ئێران کەوتە بەر ئەردەڵان، پاشان عوسمانی شارەزووری داگیر کرد، ناوی شارەزوور درا بەولایەتی شارەزوور - واتا ئوستانەکانی ئەمڕۆی کەرکووک سلێمانی دیالە و هەولێر.

شوێنەواری شاری شارەزوور ئەکەوتە نێوانی عەربەت و قزقەڵا. ساڵی ١٩٥٠ بەدواوە دەوڵەتی عێراق بۆ ڕزگارکردنی باغات و کشتوکاڵی بەغدا و دیالە لە لافاوی چیای زاگرۆس بناوانەی دەربەندیخانی دامەزراند، ئەم سەدە زریاچەیێکی دروست ئەکرد شوێنەواری شارەزووری کۆن و زۆر جێی دێرینەی نوقووم ئەکرد... مامۆستا تەوفیق وەهبی لە کۆڕێکا وتارێکی خوێندەوە، ڕەخنەی گرت، داوای کرد بەر لە تەواوبوونی سەدەکە شوێنەوارە کۆنەکان هەڵ بدرن، دێرینەکان دەربکەن... بەڵام ئاسنی سەردی ئەکوتا، زریاچەکە وەک سەدی دوکان بۆ وێرانکردنی کوردستان بوو.

بەهیوام کاک دڵشاد مەرامەکەی خۆی وەرگرتبێ ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٣/١١/٢١

**وتاری: ١٥٤**

گوێگرە بەڕێزەکان، شاد بژین، خۆشی و کامەرانیتان تاقانە هیوای ئێمەیە، لەم وتارەدا باسی (شەهرەزا) دەکەین... (شەهرەزا) ناوە بۆ شارۆلکەیەک و بۆ شارستانێ کە ئەم شارە بچووکە ناوەندێتی. جارێ با لە ڕووی جوغرافیاییەوە باسی شارستانەکە بکەین. ئەم شارستانە سەر بەئوستانی ئیسفەهانە، سنووری چوار لای بەم جۆرەیە:

لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئەسفەهان لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی یەزد، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانەکانی سەمیرەم و ئابادە... و لای خۆرئاواشەوە ئەگاتە ڕیزە چیای شتور میهران و شارستانی بروجنە. ناوەندی شارستانەکە شارۆلکەی شەهرەزایە کە ئەکەوێتە سەرەڕێی ئیسفەهان - شیراز... ئەم شارستانە دوو بەخشی هەیە: یەکەم ناوخۆ و دەوروبەری... دووەم بەشی سەمیرمی خواروو. بەخشی ناوخۆ کە بەفارسی پێ ئەوترێ حەومە سێ دێهستانی هەیە و لە ١٣٦ دێ پێک هاتوون... و بەخشی سەمیرەمیش لە ١١٥ دێ پێکهاتووە.

ژمارەی دانیشتوانی شەهرستانی شەهرەزا بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥، کە ئاخرین سەرژمێرییە، گەییوەتە ٩٥٢٢٣ کەس. ئاووهەوای شارستانەکە سێ جۆرە:

١- بەخشی ناوەندی و دەوروبەری کە ئەکەوێتە داوێنی چیای قەمیشلو و بیدگان هەوای ناوەنجییە.

٢- دێهستانەکانی جەرقویە چون نزیک بەکەویرە هەوای گەرم و گڕەی سووتێنەرە.

٣- بەخشی سەمیرەمیش کە بەخشێکی چیاییە لە هاوینا فێنک و لە زستانا زۆر ساردە.

شارستانی شەهرەزا چەند ڕووبارێکی تیایە، بەشی لە زەوییەکان ئەکەن بەئاویژە ڕووبارەکان ئەمانەن: (ڕووباری گەندمان - ڕووباری شەمس ئاوا - ڕووباری سەمیرەم - ڕووباری حەنایا) کە پاشان هەموویان تێکەڵ ئەبن و ئەبن بەیەک.

شارستانی شەهرەزا هەرێمێکی چیایشە... چیاکانی قەمیشلو و بیدگان ئەکەونە لای خۆرئاوای و، چیاکانی زەردکوە و تالەخونی و سفید کوە ئەکەونە ناوەندی شارستانەکە. چیای کوە کولاە قازیش ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی باشووری شارستانەکەوە.

موزیک

شەهرەزا، لە بنەڕەتا ناوی (قەمشە) بووە... هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە ئەم ناوە لە بنەڕەتا (ئەقوام شا) بووە، گوایە ساڵی ۷۷۳ کۆچی لە سەردەمی قوتلوغ شادا دروست کراوە و، خوێش و خزمەکانی شای تیا دانیشتووە، لەبەر ئەوە بەناوی ئەقوام شا ناوبانگی دەرکردووە. ئێمە لامان وایە، کە ئەم بیروباوەڕە هەڵەیە، چونکە ناوی قەمشە لە چەند جێی تریدا هەیە... هەم لە کرماشان و هەم لە لوڕستان و ئەمانە لە سەدەی پێنجەما هەبوون و، قەمشە جارجارە پایتەختی فەرمانڕەوایی بەنی عەییاری کوردیش بووە... جا دەبێ ناوی ئەم شارە لە چیای قەمشەوە هاتبێ، کە شارەکە نزیکێتی و جەنگەڵ و قامیشەلانی زۆر زۆرە... لە سەردەمی ڕەزا شای مەزن ناوی گۆڕاوە بەشەهرەزا.

شاری شەهرەزا شارێکی قنجیلە و ڕێکوپێکە، شەقام و بازاڕێکی باشی هەیە، سینەمای تیایە، بانکی هەیە تەلگراف و تەلیفۆن و بێ تەلی هەیە بەرق و کارەبای هەیە، ئاوی لوولە و بۆڕییە، نەخۆشخانە، داروخانە، دەرمانگای تیایە. کارخانەی بەن و ڕستنی تیایە کە لە شەش هەزار دووک و تەشی پێکهاتووە، کارخانەی خشتی سوورەوەکراوی هەیە، دارتاشی تیایە. گەراجی تەعمیراتی ئۆتۆمۆبێل و زۆر کارخانەی تری تێدایە.

لە شارستانەکەدا تێکڕا، لە ساڵی ١٣٤٥دا، کە سەرژمێری کراوە ٣٦ قوتابخانەی بەرگری لە نەخوێندەواری، ١٤ قوتابخانەی بەرایی، ٤ قوتابخانەی ناوەنجی و، ٣ ئاموزشگا، ١٢ دەرمانگا، ٩ عیادەی پزیشکی، ٣ داروخانە هەبووە، کە لەم چەند ساڵە دوو بەرابەر زیادی کردووە، لە شارەکەدا شەش قاوەخانە ١٩ خۆراکخانە، ٢٣ گەرماو، ٢ ئوتێل، ٥ میوانخانەی تیایە هەرێمەکە، هەرێمی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە، بەرهەمی کشتوکاڵی گەنم - جۆ - نیسک - نۆک - پەتاتە و سێو زەمینی - لۆبیا - پاقلە - برنجە. میوەش ئەمانەیە: ترێ - کشمیش - قەیسی - قۆخ - بادام - گوێز - کەتیرە و مازو و بەڕوشی هەیە. بەرهەمی ئاژەڵیش: شیر، ماست، کەرە، ڕۆن، پەنیر، پێستە و خوریشی بۆ شارەکان ئەنێرێ.

لە شاری شەهرەزا و شارستانە ژمارەیەک مزگەوت و حوسێنییە هەیە، کە هەندێکیان کۆنن و بوون بەئاثاری. زبانی خەڵقی ئەم ناوە لوڕیَ و بەختیارییە، فارسیش ئەزانن.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکە دوایی هات، تا کاتێکی تری بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/١١/٢٩

گوێگره بەڕێزەکان، شادی و کامەرانیتان هیوای ئێمەی بەڕێوەبەرانی بەرنامەکانی کوردیی ڕادیۆی ئێرانە. ئەم حەوتەیە باسی (شەهر کورد) ئەکەین. لە مێژووی کۆندا، زۆر جێی وا هەبووە ناوی (شەهر کورد) بووە... لە دەورانی ساسانی شاری شەهر کورد هەبووە لە ناوەندی هەولێر و تاوغدا. کلدانییەکان پێیان وتووە (شەهر قورد) خەڵقی ئەم شارە گۆیا پەرستشی دار و دەوەن و بوتی مسینیان کردووە و، (رابە مارمار)ی ئورفە. خەڵقی ئەم شارە و پادشای ئەوێی ساڵی ٢٢٦ پاش زایینی هیناوەتە سەر ئاینی مەسیحی...

مامۆستا تەوفیق وەهبی باوەڕی وایە کە ئەم شەهر کوردە نزیک بەدەربەندی بازیان بووە، هەر چۆن بێ ئێمە مەبەستمان ئەو شەهر کوردە نییە... چونکە ئەو شەهرکوردە ئەمڕۆکە ناونیشانی نەماوە، ئێمە مبەستمان شەهریکوردی بەختیارییە... مێژوونووسانی ئێرانی وایان داوەتە قەڵەم کە ئەم شاری کوردە لە بنەڕەتا ناوی دێ کورد بووە، لە سەدەی حەوتەمی کۆچییا دامەزراوە، لە سەرەتادا بنکەی پاسەوانان بووە... پاشان پەرەی سەندووە، بەهۆی ئەوەوە کە دوو زیارەتگای (حەلیم خانم و حەکیم خاتوون)ەوە... و بووەتە شار و لە سەردەمی شاهەنشای مەزن ڕەزا شای گەورەدا، ناوی دێ کور گۆڕراوە بەشەهرکورد... من لام وایە، دێ کورد، یەکێک لە قەڵاکانی لوڕستان بووە، لە سەدەی پێنجەمدا و، لەو حەلانەدا کە هەرا و ناخۆشی لە نێوانی شوڵ و شوانکارە و لوڕدا هەبووە،... چونکە لە سەدەی شەشەم و حەوتەمدا کوشتار و هەرای مەغۆل و تاتار ڕێی بەوە نەئەدا ئاوەدانی پەرە پێ بدرێ، بەپێچەوانە ئەو دەورە کوننەبەبۆی شەڕ بەسەر وڵاتا قووقووی ئەکرد...

موزیک کوتا

شەهر کورد هەم ناوە بۆ شارستانێکی پانوپۆڕ و هەم ناوە بۆ شارێ کە ناوەندی فەرمانداریی گشتی چار مەحاڵ بەختیارییە. سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای باکور و ژوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی داران (واتا فەرین)ی سەر بەئوستانی ئیسفەهان لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی فەلاوەرجانی سەر بەشارستانی ئیسفەهان، لای باشوور و خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی بروجنی بەختیاری و لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئیزەی لوڕستان. ئەم شارستانە چوار بەخشی

هەیە: (١) ناوخۆ و دەوروبەری - کە بەفارسی پێی ئەوترێ حەومە. (٢) شوراو. (٣) میزدەج. (٤) کەیار... ئەم شارستانە و بەخشەکانی لە چەند دێهستان و پتر لە ١٥٠ ئاوایی پێکهاتوون. دانیشتوانی ئەم ناوە لە تیرە و بەرەکانی عێلی بەختیارین... تەنانەت بەشی حەوت لنگی بەختیاری، کە ئەمانە لەمەوبەر زۆرتر کۆچەر بوون و، ئێستە بەشی زۆریان هەوارنشین، کاروباریان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە، ژمارەیان بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ فارسی ئەگاتە ١٧٨٦٠٧ کەس. هەرێمەکە کەم ئاوە، زۆرتر لە کارێز و کانیاو و بیر کەڵک وەرئەگرن. چیاکانی شەهر کورد ئەمانەن: کێوی تلەجان... گودال چەشمە... شا مەنزەر... لەم چیایانەدا کانی خوێ... کانی گەچ... کانی نەوت هەیە.

شاری شارکورد ئەکەوێتە ٥٠ پلەی درێژایی جوغرافی و پانایی ٣٢ پلەیی و، لە ڕووی زریەوە ٢٠٤٠ مەتر بەرزە و لەسەر بانە بەرزێ دروست کراوە. (١٤٢ کیلۆمەتر) لە ئەسفەهانەوە دوورە و ئەکەوێتە لای خۆرئاوای. و لە تارانیشەوە بۆ شەهر کورد ٥٤٣ کیلۆمەترە. ئاووهەوای شەهرکورد زۆر ساردە... لە هاوینا فێنکە.

ئاوی ناو شار لوولە و بۆڕییە و، ئەم کارێزانە لە ناو شارەکەدان کارێزی خیری، کارێزی حاجی ئاوا، کارێزی باقر ئاوا... کارێزی ئاب چا، ڕۆخانەی شەهر کورد... شارەکە کارەبا و بەرقی هەیە، تەلگراف و تەلیفۆن و داروخانە و دەرمانگا و، نەخۆشخانەی تیایە. چەند مزگەوت و حوسێنییەی هەیە، ١٠ قوتابخانەی بەرایی، ٤ قوتابخانەی ناوەنجی ١ قوتابخانەی کشتوکاڵ، ٣٠ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و چەند کتێبخانەی گشتی تیایە، چەند هوتێل و مێوانخانەی هەیە. گەرماوی تیایە، سینەمای هەیە، نزیکەی ٣٠٠٠ دوکان و مەغازەی تیایە. کار و کاسبی خەڵقی ناو شاریش زۆرتر کشتوکاڵە. ژنانی ئەو ناوە بەکردەوە خەریکن: وا بەتەون و چنین و ئەو کارانەوە وەک دروستکردنی سوجادە و مافوور و بەڕە و جاجم و بلوز و گورەوی و دەستەوانە، قالی و فەرشی بەختیاری زۆر بەبرەون. جێی کۆن و دێرینە: پردی زەمان جان و، زیارەتگاکانی حەلیمە خانم و حەکیمە خانمە. چیاکان جەنگەڵیان زۆر کەمە... لە شەهرکورد ٧ کورەی خشت سوورەوەکردنی ماکینەیی، ١٣ کورەی خشت سوورەوەکردنی ئاسایی هەیە، ٤ کارخانەی موزائیک هەیە، چەند کارخانەی تەعمیری ئۆتۆمۆبێل هەیە... چەند خۆراکخانە، کەبابخانە، قاوەخانەی تیایە. بەرهەمی کشتوکاڵ تەنیا دانەوێڵەیە. بەرهەمی ئاژەڵی خوری پێستە و شیرەمەنییە. گوێگرە بەڕێزەکان تا بەرنامەیەکی تر بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

## وتاری: ١٥٦

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، کامەرانیتان هیوای ئێمەیە.

لەم بەرنامەیەدا بەڕیزە وتارێ باسی شیراز دەکەین... لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ. ناوی شیراز بەپێی باوەڕی یاقوتی حەمەوی لە دوو وشەی شیر و ئاز پێکهاتووە، کە ئەکات (هەناوی شێر)... بەڵام ئەم مەبەستە کەمتر لە فەرهەنگە فارسییەکانا هەیە. و هەندێ ئەڵێن وشەی شیراز، هەر وشەی شیراژی کوردییە کە بەدۆی کوڵاوی لە کیسەدا خەستکراو ئەڵێن کە لەگەڵ تۆراخ تێکەڵ ئەکرێ و کەشکی لێ دروست ئەکرێ. و هەندێ ئەڵێن شیراز لە شیرازەوە هاتووە، چونکە پێ دەشتەکە بەکەناری چیاکانی دەوروبەریدا وەک (شیرازە) وایە... هەر چۆن بێ مەبەستی ناو زۆر گرنگ نییە. دیهخودا ئەڵێ: دێرینە زانەکان وایان داوەتە قەڵەم کە ناوی شیراز لە بەردەنوسەکانی ڕۆژگاری هەخامەنشییا دۆزراوەتەوە... هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە شاری شیراز لەلایەن شیراز کوڕی تەهمورشاوە دروست کراوە، پاشان چەرخی چەپگەرد وێرانی کردووە و، ئاوەدان نەکراوەتەوە تا سەرەتا ئیسلام، لە سەردەمی ئەمەویدا لەلایەن محەمەد کوڕی قاسمەوە دروست کراوە کە ئامۆزای حەجاج کوڕی یوسفی ئەقەفی بووە -کە بەناوی حەجاجی ظالم بەناوبانگە- ئەویش لە ساڵی ٦٤ کۆچیدا.

موزیک کوتا

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە هەندێ مێژوونووس تۆماریان کردووە وا دیارە عەرەبی ئیسلام، کە دەسەڵاتیان بەسەر عێلاتە کوردەکانی وڵاتی فارسدا نەبووە و، شارەکانی ئیستەخر و داراب و فەسا و ئیگیان بۆ داگیر نەکراوە، بۆ خۆیان شاری شیرازیان دامەزراندووە، بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ هونەری شارسازییا ئاشناییان نەبووە، کۆڵان و گەڕەکەکانیان بەست و پیس و پۆخل بووە و، دەلاقە و پەنجەرەکانی نزم بووە و، شارۆلکەیەکی چەپەڵ و بێگەن بووەو تا نیوەی سەدەی سێیەمی کۆچی هەر بەو جۆرە بووە. پاش ئەوەی دەوڵەتی سەفاری ساڵی ٢٥٤ کۆچی بەدواوە دامەزرا، بنەماڵەی سەفاری شیرازیان کردە پایتەخت و پەرەیان پێ دا، لە نیوەی سەدەی چوارەمدا شاری شیراز یەک فەرسەنگ پانوپۆڕبوو. پاش دەورانی سەفاری کەوتە ژێردەستی بنەماڵەی ئال بویە

ماوەیەک عماد الدەولە عەلی ئال بویە فەرمانڕەوای بوو... پاش مردنی عەلی ئال بویە پەنا خوسرەوی کوڕی ڕوکن الدەولە حەسەن ئال بویە لە جێی دانیشت، کە نازناوی عەضود الدەولە بوو... ئەم عەضود الدەولەیە شاری شیرازی ڕازاندەوە. کۆشکێکی زۆر گەورەی تیا دامەزراند و، نەخۆشخانەیەکی زۆر گەورەی تیا دروست کرد کە بەبیمارستانی عەضودی بەناوبانگ بوو. جگە لەوە نیو فەرسەنگ ڕێ لە خوار شیرازەوە بناغەی شارێکی تازەشی دامەزراند، ناوی نابوو کەرد فەنا خوسرەوی لەم شارەشا کۆشکێکی دامەزراند باغێکی گەورەی بەدەوریا دروست کرد، پانوپۆڕی یەک فەرسەنگ بوو. پاش ئەو ئەبو کالیجاری دەیلەمی شوورەیەکی زۆر سەختی بەدەوری شیرازدا کێشا و ئەم دەروازانەی هەبوو: (دەروازەی ئیستەخر - دەروازەی شوشتەر - دەروازەی بەند ئاستانە - دەروازەی غەسان - دەروازەی سەلم - دەروازەی کوار - دەروازەی مەندەر - دەروازەی مەهەندەر)، کوردەکانی شوانکارە لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەبو کالیجاردا لە شەڕدا بوون و، ئەوان گەرچی کۆچەریش بوون بەڵام شارەکانی (داراب - ئیستەخر - ئیگ - فەسا - فەیروز ئاباد)، لەناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەواندا بوو...

ئەبو کالیجار کە ئیستەخری داگیر کرد، وێرانی کرد و هەموو خەڵکەکەی بەزۆر گوێزایەوە بۆ شیراز و بەم جۆرە شاری شیراز پەرەی سەند پاش مردنی ئەبو کالیجار ئال بویە، فولاد ستونی کوڕی لە جێی دانیشت و بەدەستووری دایکی ساحێب عادلی لە ناوبرد کە وەزیرێکی مەرد و خێوی ڕەوشت و خوی بەرزبوو... فەزلویە کوڕی عەلی کوڕی حەسنویەی ئەمیری شوانکارە، لەسەر ئەوە دژی فولاد ستون ڕاپەڕی و، گرتی و لە قەڵای پەهن دژ زیندانی کرد و تا لەوێدا مرد دەری نەهێنا. و خەراسویەی دایکیشی بەسیاسەت لە گەرماوێکی بێ ئاودا زیندان کرد، تا لە گەرما هەڵقرچا و ڕەش هەڵگەڕا... و بەم جۆرە شیرازیشی خستە ژێردەست خۆیەوە.

ساڵی ٤٥٩ کۆچی. سوڵتان ئەلپ ئەرسەلانی سەلجووقی شیراز و بەشی زۆری وڵاتی فارسی داگیر کرد، بەڵام سەرداریێتی ئەو ناوەی سپارد بەفەزلویەی شوانکارە و، هەروا بەدەسیەوە بوو تا ساڵی ٤٦٤ واتا ١٥ ساڵێک، بەڵام پاشان ئاشوب گەران و دووزمانان دوژمنایەتیان خستە نێوانی فەزلویە و ئالپ ئەرسەلان، جا بەبەهانەی ئەوەی کە فەزلویە باج و پیتاک نادا بەدەوڵەتی سەلجووقی، ئالپ ئەرسەلان دەستووری دا خواجە نیزام الملک حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق عەباسی توسی وەزیری خۆی، وڵاتەکەی داگیر

بکات. نیزام الملک هەڵی کوتایە سەر شیراز و هەرێمەکانی ژێردەستی فەزڵویە و پاش شەڕێکی سەخت فەزڵویە شکا و بەدیل گیرا...

گوێگرە خۆشەویستەکان... لێرەدا کاتی بەرنامەکە تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەو کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٣/١٢/١٤

**وتاری: ١٥٧**

گوێگرە بەڕێزەکان شادی و کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە...

لەم وتارەدا ئێمە لەسەر باسی شیراز دەڕۆین، جارێ با لە سەرەتادا گەلالەیەکی وتاری پێشووتان بۆ دووبارە بکەینەوە.

وتمان هەندێ دامەزرانی شاری شیرازیان پالشت داوەتە شیراز کوڕی تەهمورشا و، هەندێ وتوویانە ناوی شیراز لە بەردەنووسەکانی تەخت جەمشیددا هەلکەندراوە... بەلام زۆربەی مێژوونووسان ئەوەیان بەڕاست داوەتە قەلەم کە شیراز لە لایەن محەمەد کوڕی قاسمی عەقیلی ئامۆزای حەجاجی ظالمەوە دروست کراوە، چون لەو حەلانەدا عێلاتی فارسی، تەنانەت کوردەکانی شوانکارە لە ئیستەخر و ئێگ و داران و جێگە چیاییەکانا دژی سپای عەرەبی لە شۆڕشدا بوون جا شیراز هەم لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی و هەم ماوەیەک لە سەردەمی خیلافەتی عەباسشا هەر لەژێردەستی نوێنەرانی سپای ئیسلامدا بووە. بەلام سەفارییەکان شیرازیان لەژێردەست دەرهێنان و کردیان بەپایتەخت پاش ئەوە ئنجا کەوتە ژێردەستی ئال بویە، بەلام فەزلویەی ئەمیری عێلی شوانکارە بەسەر فولادستونی کوڕی ئەبو کالیجاردا زال بوو و لێی داگیرکرد و گرتی و خستییە زیندان و زۆر دادگەرانە هەرێمەکەی برد بەڕێوە... بەلام لە ٤٤٨ بەدواوە سولتان ئالپ توغرولی سەلجووقی کە شالاوی کردبووە سەر ئێران و، خەلافەتی عەبباسی، شیرازی بەباج و پیتاکی سالانە دایە فەزلویە... بەلام فەزلویە پاش چەندین سال لە دانی باج و پیتاک سەرپێچی و، خواجە نیزان الملکی وەزیری سولتان توغرول شالاوی کردە سەری، بەلام شەڕەکەیان بەناشتی بڕییەوە، لە سەدەی شەشەمدا ئەتابەگەکانی فارس بەویژ، بنەمالەی زەنگی کە ئەوانیش وەک سەلجووقییەکان بەرەگەز تورک بوون، شیرازیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان و کەوتنە بووژاندنەوە و، پەرەپێدانی... وا دیارە خواجە شێخ موسلیحە دین سەعدی شیرازی کە لە سەردەمی سەلفەرییەکانا، بەویژە ئەتابەگ سەعدی زەنگی و ئەبوبەکری کوڕیدا زۆر بەڕێزانە و بەدەسەلاتەوە ژیاوە هەر لەم دەورەدا وتوویە:

(دران مدت کەمارا وقت خوش بد * زهجرت ششصد و پنجاه و شەش بد)

بەلام دەبێ شێخی سەعدی ئەم هەلبەستەی چەند مانگێ بەر لە شالاوی مەغۆل و تاتاو

بەرابەرێتیی هۆلاکۆ بۆ سەر بەغدا وتبێتی... چونکە سەلفوورییەکان خۆیان سەر بەبنەماڵەی جەنگیز و غازان بوون، بەڵام لەگەڵ هۆلاکۆدا، بەهاوپەیمانی و هاوکاری ئەتابەگانی لوڕستان، شەڕی باشیان کرد... هەر بەو هۆیەوە بووە کە سەعدی شیرازی، بۆ زانا و مەزنەکانی موسوڵمانی شاری بەغدا، گریاوە کە قەڵاچۆ کراون و، بۆ ئەو کتێبخانەیانە فرمێسکی ڕژتووە کە خراونە ڕووباری دەجلەوە... بەڵێ سەعدی شیرازی کە ساڵی شەش سەد و پەنجا و شەشی کۆچی، بەڕۆژگاری کامەرانێتی خۆی داناوە، هەر لەو ساڵەدا، لە قەسیدەیەکی عەرەبیی زۆر بلیمەتانەدا، کە زۆر زانایانە هۆنیویەتییەوە ئەڵێ:

(حُبِسَتْ بِجُفْنَيَّ المَدامِعُ لا تجری
فَلَمّا طَغى الماءُ استطالَ عَلَى السَّكْرِ
نَسيمَ صَبا بَغْدادَ بَعْدَ خَرابِها
تَمَنَّيْتُ لَو كانَتْ تَمُرُّ عَلى قَبْري

لەو پارچە هەڵبەستەدا بەکوڵترین شین و بەسۆزترین سەر شیوەنی هێناوەتە بەرهەم...

پاش ئەم ڕۆژگارە ڕەشە، جارجارە شەڕ لە نێوانی لوڕ و، شوانکارە و، ئەتابەگانی فارسدا ڕووی داوە... سوڵتان جەلالەدین خوارەزم ویستی شیراز و ئەو دوای وڵات لە چنگی مەغۆل دەربکا، بەڵام سەرنەکەوت... پاش دەورانی مەغۆل و تاتار، ماوەیەک شیراز لەژێردەستی بنەماڵەی جەلایری و ئال موزەفەردا بووە...، بەڵام لەم ڕۆژگارانەدا چەند جار وێران بووە و، چەند جار تووشی بوومەلەرزە بوو.

بەختیارترین ڕۆژگاری شاری شیراز سەردەمی دلێری قارەمان، کەریم خانی زەند بووە، لەم دەورەدا، شارەکە ئاوەدان بووەتەوە. بازاڕێکی گەورەی تیا دامەزراوە کە بەناوی (بازاڕی وەکیل) بەناوبانگە، سەرای شیراز کە لە سەردەمی کەریم خاندا دروست کراوە و، بەناوی ئەرگ بەناوبانگە... ئەو باغە جوانەی کە بەفەرمانی کەریم خان دامەزرا... ئەو مزگەوتە گەورەیەی کە دروستی کرد ئەمانە هەمووی شاری شیرازی ڕازاندەوە. لە سەردەمی کەریم خانی زەندا، ئاسایش و ئەمنی جورێ بوو، لە شیراز کە دەرکی دوکان و مەغازەکان نەئەبەسترا، خەڵقی دەرکی ماڵی خۆیان نەدەبەست و، دز و جەردە خۆیان لە دزی و خراپی لائەدا. لێرەدا با چیرۆکێکی کورت بگێڕینەوە کە پاڵشت دراوەتە دادگەرێتیی کەریم خانی زەند... دەڵێن: بەیانیانێ کابرایەک چووە لای سەرۆکی شارەوانی گشتی و سکاڵای کرد: کە ماڵەکەی دزراوە... سەرۆکی شوانکارە پێی وت: قسەی وەها مەکە، کەس دزی

ناکات... کابرا تووڕە بەگریانەوە لە ڕێی کەریم خانی زەند وەستا ، کە لە سەرا گەڕایەوە وتی: ماڵم دزراوە! کەریم خان وتی: چۆن دزرا؟ کابرا وتی: نوستبووم، کەریم خان پێی وت: بۆچ نوستی؟... کابرا وتی: وامزانی جەنابتان وشیار و بێدارن... کەریم خان لە قسە ڕاستەکەی ئەو شەرمەزار بوو... دەستووری دا گورج ماڵەکەی بۆ بژێرن.

گوێگرە خۆشەویستەکان... کاتمان تەواوبوو. تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

١٣٥٣/١٢/٢٢

## وتاری: ١٥٨

گوێگرە خۆشەویستەکان، کامەرانیتان هیوامانە. ئێمە هێشتا لەسەر باسی (شیراز) ئەڕۆین... لەبەرئەوەی لە دەورانی حوکمی کەریم خانی زەندا شاری شیراز گەرد و خاکی نوشوستی لە ڕووی خۆی لاداوە و، بووژاوەتەوە و، کەوتۆتە پەرەسەندن و بەباغ و باغچە بۆتە گولزاری ئیرەم و، بەبازاڕی ڕەنگین و کاروانسەرای جوان ڕازاوەتەوە و، شەقامی پانوپۆڕی تیا کێشراوە و، قەڵا و ئەرکی سەختی بۆ پاراستن تیا دروست کراوە و، بووە بەپایتەختی ئێران... لەبەر ئەوە بەباشی ئەزانین لە سەرەتادا دیاردیێکی کورت بۆ بەسەرهات و ژیانی ئەو حوکمدارە مەزنە دادگەرە، بکەین...

کەریم خان کوڕی ئیماک بوو... یەکێک بوو لە سەرانی عێلی زەند... ئەم عێلە لە عێلە هەرە کۆنەکانی کوردی ئێرانە، هەندێ وایان داوەتەوە قەڵەم کە (لوڕی فەیلی)ن وەیاخۆ (لەک)ن... بەڵام ئەوانەی کە ئەم جۆرە شتانە دەنووسن، لە خۆڕا و بێ چاو گێڕان بەهیچ سەرچاوەیەکی مێژووییدا، ئەم جۆرە شتانە تۆمار ئەکەن... مێژوونووسانی سەدەکانی هەشتەم و نۆیەمی کۆچی ناوی عێلەکانی لوڕستانیان بردووە، وەک موستەوفی قەزوینی لە تەئریخی گوزیدەدا و، موعینی ئەتەنزی لە مونتەخب التەواریخی شوانکارەدا و، پاش ئەوان مێژوونووسی کورد ئەمیر شەرەفخان لە (شەرەفنامەدا)، عێلی زەندیان بەیەکێک لە عێلە گەورەکانی کوردی ئێران بردووە کە لە هەرێمی لوڕستاندا نیشتەجێ بوون و، دیاردیش بۆ ئەوە کراوە، کە ئەم عێلانە (زەنگەنە - سیامەنسووری - چنگنی - زەند - لەک - ڕۆژبەهان...) و دەیان عێلی تری، ئەمانە لە عێلە کوردەکانی ئێرانن و، لە بەشی گۆرانن نەوەک لوڕ...

بابێینە سەر خود کەریم خان ئەم حوکمدارە مەزنە لە زەندەکانی قەلعەیەریی دەوروبەری مەلایرە... عێلی زەند لە سەردەمی نادر شادا دووچاری ستەمی چەرخی چەپگەرد بووبوون. بابا خان چاپشلو کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی دەورانی نادر شا ڕقی لە عێلی زەند هەڵگرتبوو، زۆربەی سەرۆکەکانی کوشت و زەندەکانی بەتەنگ هێنا و دووری خستنەوە بۆ هەرێمی خوراسان، لەوێ لە هەرێمی ئەبیوەرد مانەوە تاوەکو نادر شا کوژرا... کەریم خان گەرچی پیاوێکی نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆر وشیار و زرنگ و ئازابوو، لە سەردەمی نادر شادا پایەیەکی بەرزی نەبوو... بەڵام پاش کوژرانی نادر سوودی لە ئاژاوە وەرگرت... و

لەگەڵ عەلی مەردان خانی بەختیاریدا پەیمانیان بەست و، کەوتنە بیری پاراستنی تەختی شایی... بنەماڵەی نادر بێ دەسەڵات بوون لە هەر گۆشەیەکی ئێراندا یەکێ ڕاپەڕی بوو دەسەڵاتی گرتبووە دەست، عەلی مەردان خان و کەریم خان بڕیاریان دا یەکێک لە بنەماڵەی نادر شا لەسەر تەخت دابنێن و خۆیان بەناوی وەزیر و سەردار جەنگ، وڵاتەکە بپارێزن و، بۆ ئەم کارە لەگەڵ سەردارە ئەمەگ نەناسەکان، کەوتنە شەڕەوە، بەڵام عەلی مەردان خان کە ئەسفەهانی داگیرکرد و والییەکەی کوشت کەوتە بیری داگیرکردنی تەختی شایی... ئەم کارە بووە هۆی شەڕ لە نێوانی کەریم خان و عەلی مەردان خان... ساڵی ۱۱٦۰ کۆچی ۱۷۵۳ زایینی عەلی مەردان خان لە شەڕا کوژرا... ئیتر کەس نەما بتوانێ چنگ بکات بەچنگی کەریم خاندا، جگە لە ئەسەد ئەفغانی و، محەمەد حوسێن خانی قاجار... پالاڤتەی قسە ئەسەد خان ئەفغانی هەڵات و چوو خۆی دایە پەنای والی بەغدا... و محەمەد حوسێن خانیش کوژرا... پاش ئەوە کەریم خان شیرازی کردە پایتەخت و سادق خانی برای نارد بۆ داگیرکردنی شاری بەسرە... سادق خان ماوەیەک بەسرەی گەمارۆ دا و، گرتی... لەم دەورەدا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی مەلای کوردی بەناوبانگ لە بەسرە بوو، لە کتێبی (ئەلکیفایە)دا باسی ناخۆش و گرانیی ئەو دەورە دەکات... هەر چۆن بێ کە کەریم خان بەتەواوی ئێرانی لە شۆڕشیان پاک کردەوە، خۆی لەسەر تەخت دانیشت. بەڵام ئەو حوکمدارە مەزنە، دادگەرە، ئەوەندە ڕەوشت جوان و خۆ بەبچووک زان بوو... خۆی ناونا (وەکیل الرەعایا). و توانی لە سەردەمی فەرمانڕەواییدا، وڵاتی ئێران ئاوەدان بکاتەوە.

کەریم خان، نەوەک هەر دەربارەی گەل دادگەر بوو، بەڵکو زۆریش هەوڵی ئەدا، کە پلەی زانست و زانیاری بەرز بکاتەوە... هەر لەبەر ئەوە بوو کە لە شیرازدا کەوتە زیندووکردنەوەی ناوی (سەعدی و حافظ) و لەسەر گۆڕەکانیان گومبەزی دروست کرد و، جوانترین بارەگای بۆ دروست کردن، یەکێک لەوانە مەدرەسەی (حافظ) بوو.

بابێینە سەر باسی دێرینەی شیراز، لەوێ سێ مزگەوتی گەورەی کۆن هەیە:

یەکەم مزگەوتی عەتیقە گۆیا ئەم مزگەوتە لە ساڵانی دووسەد و پەنجای کۆچی بەدواوە، بەفەرمانی عەمر کوڕی لەیثی سەفاری دروست کراوە.

دووەم مزگەوتی نوێ لە ساڵانی پێنج سەد و پەنجای کۆچییا لە لایەن ئەتابەگ سەعد کوڕی زەنگی سەلفوورییەوە دروست کراوە.

سێیەم مزگەوتی سونقورە... سەعدی شیرازی هەستیار و نووسەری بەناوبانگی شیرازی،

لە دەرباری ئەتابەگ ئەبو بەکر کوڕی ئەتابەگ سەعدی ناوبراودا پایەیێکی بەرزی هەبووە، لەو باغە گەورەیەدا، کە پاشان تیا نێژرا و گومبەز و بارەگای بۆ دروست کرا، لەو باغەدا چەند حەوزێکی زۆر جوانی لە مەڕمەڕ تاشراوی دروست کرد، لە کەناری جۆگەی ڕوکن ئاوای بەناوبانگ، بۆ ئەوەی ژنانی شار لەوێ جلوبەرگیان بشۆن... وا دیارە هەر دەربارەی ئەم جێگە جوانەیە کە حافیزی شیرازیش دڵی هاتۆتە جۆشوخرۆش وتوویە:

(ئەی ساقی مەیێکی جاویدانیم بدەیێ کە لە بەهەشتیشا ناتوانی کەناری ئاوی ڕوکن ئاوا و، گوڵزاری موسەڵلا بەدەس بهێنیێ...).

وە فارسییەکەشی ئەمەیە:

(بره ساقی میی باغ کەدر جنت نخواهر یافت
کـەناراب ڕکن آباد و گلکشت مـصـدورا)

گوێگرە خۆشەویستەکان، باسی شیراز و پیاهەڵگوتنی لە دەمێکەوە نووسەرانی بۆ خۆی تەرخان کردووە. ئێمە لێرەدا کاتمان تەواو ئەبێ، چاوەڕوانی پاشماوەی ئەم باسە بن لە وتاری ئایندەدا بەخواتان ئەسپێرین.

١٣٥٣/١٢/٢٧

**وتاری: ١٥٩**

گوێگرە بەرێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، لە وتارەکانی پێشوودا زۆر باسی مێژوویی و جوغرافیمان لە بارەی شیرازەوە ڕوون کردەوە، ئێستە باسی ئەو شتانە دەکەین کە لێی نەدوابووین.

شاری شیراز کە ناوەندی ئوستانی فارسی و، ناوەندی شارستانە، یەکێکە لە یازدە ئوستانی فارسی، لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئابادە، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانەکانی (فەسا - تەبریز - ئیستەهبانات) و لای باشوور و خوارووی شارستانی فەیروز ئابادە، لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی کازرون، کە نزیکترین شارە لێیەوە و نێوانیان ١١٣ کیلۆمەترە و، لە شیرازیشەوە بۆ تارانی پایتەختی ئەمڕۆی ئێران (٩١٩) کیلۆمەترە.

جێی شاری شیراز بەرزەبانێکە ١٦٠٠ مەتر لە ڕووی زەریا بەرزترە و، لە ڕووی جوغرافیشەوە ئەکەوێتە درێژایی پەنجا و دوو پلە و سی و دوو دەقیقە و، پانایی بیست و نۆ پلە و بیست و شەش دەقیقە و، دەوروبەری چیای زۆرە. چیاکانی لای باکوری بەرزتر و چیاکانی لای خوارووی نزمترە، چیاکان ئەمانەن:

١- ڕیزە چیای برەم فەیروز، لە نزیکی دێهستانی کەم هەڕ و کاکانەوە دەس پێ ئەکا و بەرزترین لوتکەی چیاکە ٤٠٠٠ مەترە و، پێی ئەڵێن چیای دونیا - وەیا کۆهی دنیا، کۆهی ئیمامزادەش کە بەرزایی ٣١٢٥ مەترە هەر لەم ڕیزە دایە، کە هەمیشە بەلوتکەکانییەوە بەفر ئەمێنێ.

٢- ڕیزە چیای بەمو کە ڕاستە بانی شیراز لە ڕاستە بانی مەرودەشت جیا ئەکاتەوە و، لە باکوری شاری شیرازەوە درێژە ئەکێشێ بەرەو خۆرهەڵاتی، بەرزترین لوتکەی ئەم ڕیزە، بەفۆ و باباکۆهییە کە لە ژوور شیرازەوە بەرزییان ئەگاتە ٢٦٥٦ مەتر... گەردەنەی تەنگی گەلیی (ئەڵڵاە، ئەکبەر) لەم ڕیزەدایە.

٣- ڕیزە چیای (مەهارلو) ئەکەوێتە لای باشووری بەرەو خۆرهەڵاتی شیراز بەرزترین لووتکەی ٢٧٢٧ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە.

٤- کێوی کوهمەرە سورخی کە بریتییە لە زورگ و هەڵەتەکانی کە بریتییە لە چیاکانی

بەخشی ئەرژەن و بن ڕود و، بەرزترین لووتکەکانی موسقان و دالو کە یەکەمیان ٣١٨٠ مەتر بەرزە و دووەمیان ٣٠٦٠ مەتر.

## موزیک

بابێینە سەر ڕووباری شیراز:

١- ڕووباری کوڕ، لە چیای سیربانو و بەرزاییەکانی خوسرەو شیرینەوە دەڕژێتە خوار و، دێهستانەکانی کام فیروزە - ئەبرە - ڕامگورد ئاو ئەدات و، نزیکی پردی پل خان لەگەڵ ڕووباری سیوەند ئەبن بەیەک و پاش ئاوێژەکردنی دێهستانی کریال ئەچێتە بناوانەی ئەمیرەوە کە لە کاتی خۆیا عەضود الدەولە ئال بویە دروستی کردووە، ئنجا ئەڕژێتە نێو زریاچەی بوختەکان.

٢- ڕووباری سیوەند لە بەرزاییەکانی دەلونەزەر و چوار دانگەوە ئەڕژێتە خوارەوە پاش ئاودانی دێهستانی مەشهەدی مورغاب بەگەلیی تەنگ بولاغیدا تێئەپەڕێ و دێهستانی کەمین ئاو ئەدا و بەرەو بەخشی مەرودەشت ئەکشێ، نزیکی پردی خان (پل خان) ئەڕژێتە ڕووباری کوڕ...

٣- ڕووباری قەرەئاغاج، لە بەرزاییەکانی مەمەسنی و، بن ڕودەوە دێتەخوارەوە، پاش ئاودانی دێهستانی کوە مەرە سورخی و کوار و ئنجا ئەکشێ بەرەو هەرێمی (خضر) لە شارستانی جهرم.

٤- ڕودخانەی شەش پیر سەرچاوەکەی لە چیاکانی لای خواری ئەردەکانەوە دێ و دێهستانی هومایجان ئاو ئەدا و، لەوێوە ئەکشێ بەرەو خاکی شەمس زیاری و مەمەسنی و، بەپێی هەرێمەکانی ناوی ئەگۆڕێ، سەرئەنجام ئەڕژێتە خەلیجی فارس.

٥- ڕووباری قەرەباغ لە چیاکانی سیاخەوە ئەڕژێتە خوار و، پاش ئاوێژەکردنی دێهستانی قەرەباغ ئەڕژێتە زریاچەی مەهارلو.

## موزیک

شاری شیراز، کە ناوەندی ئوستانی فارسە، خۆی شارستانە و پێنج بەخشی هەیە: ١- دەوروبەری -واتا حەومە-. ٢- بەیضا -واتا ئەردەکان-. ٣- زەرقان. ٤- سەروستان. ٥- مەرودەشت...

دانیشتوانی شاری شیراز و بەخشەکانی بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٥ فارسی نزیکەی شەش سەد هەزار کەس بوون و، ئێستە حەوت سەد هەزار کەس ئەبن. زبانی

خەڵقی شیراز فارسییە و، زبانی دەوروبەری بەختیاری و لوڕ و زبانی ترە، ڕچی ئاینیشیان هەم موسوڵمانی و هەم کەلیمی و هەم مەسیحی و هەم زەرتوشتییە.

شیراز لە ڕووی فەرهەنگەوە زۆر پێشکەوتووە، زانستگەیەکی گەورەی تیایە کە هەموو زانکۆکانی هەیە، نزیکەی ١٠٠ قوتابخانەی بەرایی، ٣٠ قوتابخانەی ناوەندی، ٦ باغچەی منالان، ١٨٠قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری ١٠ ئاموزشگای جۆراوجۆری تیایە.

لە شیرازدا، چەند نەخۆشخانەی گەورە، دەرمانگا، داروخانە، شیرخۆرگا، پەروەرشگا، ئەرزەرزگا، سازمانی خەیرییە هەیە. هەروا چەندین سینەما، خۆراکخانە، گەرماو، هوتێل، مێوانخانە هەیە. ئاوی شار لوولەیە، کارەبا و بەرقی تیایە، تەلگراف، تەلیفۆن، بێ تەل، ئێستگەی ڕادیۆ و تەلەویزیون و زۆر جێی گشتی تیایە وەک یانەی وەرزشی زۆرخانە و شتی تری.

لە ڕووی کارخانە و کارگە و شتی ترییەوە زۆر دەوڵەمەندە و ئەوەندە کارخانە و کارگەی بچووکی تیایە نایێنە ژمارە. خەڵقی ولات لەگەڵ ئاژەڵداری، کشتوکاڵ و، کرد و تەون و جۆلایی خەریکن.

جێی دێرینە و شوێنەواری کۆن لە شیرازدا و لە ئوستانی فارسیدا زۆرە. تەخت جەمشید لە دێرینە بەناوبانگەکانی جیهانە پازارگاد و، ماوەر سلێمان و نەقش ڕۆستەم و نەقش بەهرام و ئاتەشکەدە کۆنەکان و، مزگەوت و خانەقا و مەدرەسەی کۆن و تازە و، ئارامگاکانی سەعدی و، حافیز و، شێخ ڕۆزبەهان و، بوقعە بەناوبانگەکانی (شا چراغ و، شا میر حەمزە و ئیمامزادە میر سەید مەحموود و سەید عەلائەدین)، جێی هاتوچۆی هەزاران خەڵکن لە ڕۆژا، تەنانەت گەشتیارانی جیهانی... هەروا بازاڕی وەکیل و قەڵای وەکیل و، حەمامی وەکیل کە ئەمانە هەموویان بەدەستووری کەریم خانی زەند دروست کراون کە نازناوی خۆی وەکیل الرعایا بوو چاو ئەندازی چاکن.

لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا، شیراز کەوتە پێشکەوتن و، ئەو گەرد و تۆزی نەگبەتییەی لەسەر خۆی لادا کە لە سەردەمی قاجاریدا، نیشتبووە سەری.

گوێگرە خۆشەویستەکان باسی شیراز چەند کتێبی ئەوێ... ئێمە بەمەندە واز ئەهێنین تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/١/٢٤

**وتاری: ١٦٠**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت چاتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، لەم وتارەدا باسی (ساڵح ئاوا) دەکەین. لە ئوستانەکانی کوردستان (کرماشان و پشتکۆ)دا، زۆر جێگەی (ساڵح ئاوا) ناو هەیە، هۆی ئەم ناوانەش کە بۆ جێگەکان هەڵبژێرراوە، هەر ئەوەیە کە کوردەواری لە وشەی (ساڵح) خۆشیان دێت و، هەمیشە دژی خراپە بوون... جا.

ساڵح ئاوا... ناوی دێهستانێکە سەر بەبەخشی سیمینەرودی شارستانی هەمەدان. ساڵح ئاوای فەیزوڵڵا بەگی، دێیەکە سەر بەبەخشی ناوەندی سەقزی ئوستانی کوردستان.

ساڵح ئاوای: سوڕسوڕ، سەر بەبەخشی کامیارانی شارستانی سنەیە. ساڵح ئاوای دەر و فەرامان، دێیەکە سەر بەبەخشی ناوەندی شارستانی کرماشان.

ساڵح ئاوای دەشتە تاڵ، دێیەکە سەر بەفەرمانداریی بانەی سەر بەئوستانی کوردستان.

ساڵح ئاوا، ناوەندی یەکێ لە بەخشەکانی سەر بەشارستان و فەرمانداریی میهرانە، کە سەر بەئوستانی ئیسلام و پشتکۆیە ئێمە لەم وتارەدا باسی ئەم ساڵح ئاوایە دەکەین، جا ساڵح ئاوا هەم ناوە بۆ بەخشەکە و، هەم ناوە بۆ دێیەکە، کە ناوەندی بەخشەکەیە.

سنووری بەخشەکە بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی چوار، لای باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی شارستانی میهران... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئەرکەوازی... لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ فەرمانداریبەکانی (مەندەلی - بەدرە). سەر بەکوردستانی عێراق، لە دوو ئوستانی دیالە - کوتدا.

سەر زەویی ئەم بەخشە، هەرێمێکی شاخاوییە، لای باکوری، زنجیرە چیای کەپر کوە واتا (گەورە کێو)ە و، بەرزترە لەلای باشوور... کێوی (مانشت Manshit) کە یەکێ بووە لە قەڵا هەرە سەختەکانی دەورانی ئەتابەگەکانی لوڕستان و لە شەرەفنامەدا زۆر جار ناوی هاتووە، یەکێکە لە لووتکە هەرە بەرزەکانی ئەم زنجیرە چیایە و بەرزایی لە ڕووی زریەوە ٢٦٥٨ مەترە... بەشی لای خۆرئاوای زنجیرە چیایەکە ناوی شەلەمە و ٢٢٠٨ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە... کێوە بەناوبانگەکانی تری سەر بە ساڵح ئاوا ئەمانەن:

- کۆە شا نەخچیر، ١٨٧٠ مەتر لە زریە بەرزترە.

- کۆە مەرەک سورخ ١٠٠٦ مەترە، لە ڕووی زریەوە.

- کوە کولە لەک و چەند کێوی تری تیایە... کە هەموو کێوەکان بەجەنگەڵ داپۆشراون، زۆرتری دارودەوەنیـــان دار بەڕوو، دار گــوێز، دار مـــازو، دار قـــەزوان، دار تورش و، جۆراوجۆری میـوەی کێـوین. و ناو جەنگەڵەکـان پڕن لە گـیـانلەبەرانی کێـوی وەک: کەڵەکێوی، بزنە کێوی، ورچ، پڵنگ، بۆز، گورگ، کەمتیار...

ساڵح ئاوا، هەرێمێکی پڕ لە چەم و شیوە... هەندێ لە شیوەکان ئەوەندە قووڵن، سوود لە ئاویان وەرناگیرێ. بۆ وێنە ڕووباری کونجان چەم، سەرچاوەکەی (سەراب ئافتاب)ەوە دێ. بەڵام هێندە بەشیـو و دەڕەی قـووڵدا ڕائەبوورێ، کەڵک لە ئاوەکەی وەرناگـیـرێ، مەگەر سەدێکی سەختی لە بەرا هەڵبەسترێ.

- ڕووباری تەنگ گەڕاو، سەرچاوەکەی لە دەوروبەری دێیەکانی پێنج ستوونەوە دێ، پاشان زەویوزاری دێی (چەم ئاو) ئاو ئەدات، ئنجا ئەڕژێتە ڕووباری گەدار خوش.

- ڕووباری چەم سورخ سەرچاوەکەی نزیک بەسنووری ئاب گەرمە هەڵئەسێ و، سوودی لێ وەرناگیرێ و، بەرەو عێراق ئەکشێ.

ئەم بەخشـە لە ٢٨ ئاوایی پێکهـاتووە، هەندێکیـان گـەورە و هەندێکیـان بچـووکن، گرنگترین دێیەکانی ئەمانەن:

هەفت چەشمە - شاد ئاباد - بانقەلان - چاڵە سەرا - چەشمە کەبود...

لەم دێیانەدا، قوتابخانەی بەرگری لە نەخوێندەواری هەیە دێی صالح ئاوا، کە ناوەندی بەخشـەکەیە، ئەکەوێتە باشووری خۆرئاوای ئیلام و ٥٤ کیلۆمەتری لێیەوە دوورە و ٥٦ کیلۆمەتریش لە هەمەدانەوە دوورە لەم دێیەدا، قوتابخانە هەیە، زۆر شتی بەکەڵک هەیە.

خەڵقی وڵاتەکە لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن زبانی خەڵقی ئەو ناوە کوردی لوڕییە. فارسیش ئەزانن.

دانیشتوانی دێیەکە ٦٠٠ کەس ئەبن، ڕچی ئاینییان شیعەییە کۆنترین جێگە لەوێ ئارامگای «ئیمامزادە خاص عەلی»یە هەر لەبەرئەوە، هەروەک ساڵح ئاواشی پێ ئەڵێن، دێی خاس عەلیشی پێ ئەڵێن.

خەڵقی دێیەکە هاوینان، زۆربەیان کۆچ ئەکەنە چیاکان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ و، دێیەکە بەخاڵیتی ئەمێنێتەوە... هەیئەی بەڕێوەبەرایەتی بەخشـەکە، هاوینان لە ئیلام دائەنیشن. لێرەدا بەرنامەکە تەواوبوو ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

## وتاری: ١٦١

گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە. ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ... لەم وتارەدا باسی (صەحنە)تان بۆ دەکەین.

وا دیارە ناوی سەحنە لە بنەڕەتا (سەهەن)ە، واتا ئەو جێگەیەی کە لەبەر جەنگەڵ و چیای بەرز، خۆر کەمتر ئەیگرێ... پاشان کە عەرەبی ئیسلام وڵاتیان داگیر کردووە، ناوەکە گۆڕاوە بە (صەحنە)،... دووریش نییە لەبەرئەوەی کە هەرێمەکە، مەیدانی شەڕ بووبێ لە نێوانی سپای عەرەبی ئیسلام و هێزە کوردە خۆییەکانی وڵاتدا، عەرەب ناویان نابێ (صەحنە) واتا مەیدانی شەڕ...

بێ گومان ئەم ناوە، زۆر لە سەردەمی ئیسلام کۆنترە و، دەبێ ئەم شارۆلکەیە لە سەردەمی ماددا هەبووبێ... چون دەوروبەری پڕە لە دێرینە و شوێنەواری سەردەمی ماد، وەکو لەمەودوا باسی لێ دەکەین.

سەحنە هەم ناوە بۆ شارۆلکەیەک و هەم ناوە بۆ بەخشێ کە ئەم شارۆلکەیە ناوەندێتی و، سنووری ئەم بەشە بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە باکووری لای خۆرئاوای شارستانی کرماشانەوە، لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سونقوری کولیائی، لای باشوورەوە بەلای خۆرهەڵاتا هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی نەهاوەند و، لەگەڵ بەخشی هەرسینی سەر بەکرماشان... شارۆلکەی سەحنە ٦١ کیلۆمەتر لە کرماشانەوە و، نزیک بەشەقامەڕێی تاران – کرماشانە.

خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی دومورگان کە بە بەشی خۆرئاوای ئێراندا گەڕاوە و زۆر تیا شارەزا بووە، بەداخەوە ناوی (سەحنە و سنە)ی لێ تێکچووە و، سەحنەی هەر بەسنە داناوە. کەچی سنە لە ساڵی ١٠٤٦ کۆچیدا لە لایەن ئەمیر عەلەمەدینەوە، لە دژییەوە کراوە بەشار... و سەحنە زۆر لەوە کۆنترە و هەر شار بووە و، ناوی لە زۆربەی کتێبە جوغرافیاییەکاندا هاتووە، تەنانەت لە (مەسالیک الممالیک)ی ئیستەخریدا...

بەخشی سەحنە چوار دێهستانی هەیە:

- یەکەم: ناوخۆی کە پێی ئەوترێ حەومە و ١٠ دێی هەیە.
- دووەم: خودابەندەلو کە ٢١ دێی تیایە.

- سێیەم: دینەوەر کە ٨٣ ئاوایی تیایە.
- چوارەم: چەمچەماڵ کە ٩٧ دێی تیایە...

بەخشی سەحنە، چیای زۆرە، زنجیرە چیای پەڕاو کە بێستون بەشێکە لە ئەو، لای باکوری دێی بێستونەوەیە، بەرزترین لوتکەی ٢٧٩٤ مەترە لە ڕووی زریەوە و، بەرزترین لووتکەی لای خۆرهەڵاتی ئاوایی کوفەوە ٣٣٥٢ مەتر بەرزە... و زنجیرە چیای کێوی (ئەمرۆڵە)ش کە بەرزترین لووتکەی ئەمرۆڵەیە بەرزایی ٣١٩٣ مەترە، لە ڕووی زریەوە، ونخود چال ٣٢٦٧ مەتر بەرزە و، دالاخانی ٣١٣٨ مەترە... زنجیرە چیای بەرزی تریش زۆرە.

خود سەحنە لە ڕووی زریەوە ١٣٤٢ مەتر بەرزە، دێی بێستون ١٣١١ مەتر و دێی میان ڕاهان ١٣٥١ مەترە لە ڕووی زریەوە...

دێهاتەکانی سەر بەسەحنە کەڵک لە دوو ڕووبار وەرئەگرن، یەکەم ڕووباری گاماساو زۆر بەتەوژم، کە لە ئەسەد ئاوا و چیای ئەلوەندەوە بەرەو خوار ئەبێتەوە و، بەهەرێمی کرماشاندا لێژ ئەبێتەوە بۆ سەیمەرە و لەوێوە ئەڕژێتە کارون. دووەم ڕووباری دینەوەرە کە ئاوێکی زۆر بەخێروبێرە و، برنج و توتن و پەمۆ کشتوکاڵی تری دێنێتە بەرهەم، توتن و، چەوەندەریش زۆر پێ ئەگەیێنێ، لەمەوبەر تیریاکیشی پێ ئەگەیاند.

ئاووهەوای بەخشەکە لە چیاکان زۆر ساردە، لە دەشتی دینەوەر و چەمچەماڵدا ناوەنجییە.

بیستون و، دینەوەر و، بیلەوەر و، چەمچەماڵ لە گوندە کۆن و مێژووییەکانی ئەم بەخشەن،... بێستون بەهۆی بەردەنووسەکانی چیای بێستونەوە، ناوبانگی خۆی بیستۆتەوە، دینەوەر هەم ناوەندی فەرمانڕەوایی حەسەن وەیهی بووە و، هەم جێی بنەماڵەی شێخ و مەلای دینەوەر، کە لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا جێی شانازی بوون. بیلەوەریش یەکێکە لە قەڵا گرنگەکانی فەرمانڕەوایی کەڵور، کە لە شەرەفنامەدا بەهەڵە نووسراوە (تیلەوەر)... چەمچەماڵیش یادی ئەو شارەمان ئەهێنێتەوە بیر، کە غازانی مەغۆل و جێ نشینەکانی لە داوێنی بێستوندا دایەزراند، بەڵام چون مەغۆل دوژمنی ئادەمیزاد بوون سەری نەگرت.

دانیشتوانی بەخشی سەحنە بەپێی سەرژمێریی کۆن کە جوغرافیای تیمسار ڕەزم ئارا باسی کردووە، نزیکەی ٥٠ هەزار کەس بوون. زمانی خەڵقی بەخشەکە، کوردی کەڵوڕی و

گۆرانییە، فارسیش ئەزانن، ڕچی ئاینییان کاکەیێتی و، سوننییەتی و شیعەیێتییە. لە زۆربەی ئەم دێهاتانەدا، قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە.

دانیشتوان، بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن، هەرێمەکە بژوێن و بەپیت و بڕشتە خود شارۆلکەی سەحنە نزیکەی ٨٠٠ ماڵ ئەبێ، ٢٥٠ دوکان و چەند چاخانە و قاوەخانە و خۆراکخانەی تیایە، چەند قوتابخانەی بەرایی و ناوەنجی کچان و کوڕانی هەیە... مزگەوت و خانەقا و حوسێنییە و تەکیەی تیایە. پۆست و تەلگراف و تەلیفۆن و بەرق و کارەبای هەیە، ئاوی لوولەیە.

لە دەوروبەری شوێنەواری کۆن هەیە: لە چیاکەی نزیکی سەحنەدا ئەشکەوتێکی دەستکردی دەورانی ماد هەیە، کە بەفارسی پێی دەوترێ (دەخمە) لە زەوییەوە ٣٠ مەتر بەرزە و تاق و کەوانەیی دروست کراوە لەناو ئەشکەوتەکەدا دوو گۆڕ هەیە وێنەی فریشتەی باڵداری (فەرەوهەر)یشیان بەسەر سەرەوە هەڵکەندراوە. جگە لەمانە شوێنەواری تری کۆن زۆرە. گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٤/٢/٨

٨/گوڵان/ ٢٦٨٣

## وتاری: ١٦٢

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، سەربەرزی و شادیتان هیوامانە. لەم وتارەدا باسی (سومای) دەکەین.

سومای، یەکێکە لە بەخشەکانی شارستانی ڕەزائیەی نوستانی ئازەربایجانی لای خۆرئاوا...

ئەم هەرێمە لە سەردەمی دەوڵەتەکانی ئاق قویونلو و قەرەقویونلودا لەژێردەستی سەرداریتی عێلی برادۆستدا بووە... بنەماڵەی فەرمانڕەوایانی برادۆست لە بنەڕەتا گۆران بوون و بەڕەگەز ئەچوونەوە سەر فەرمانڕەوایانی حەسەن وەیهی... گۆیا پاش ئەوەی هیلال کوڕی بەدر کوڕی حەسەن وەیە لەگەڵ شەمس الدەولە ئال بویە کەوتۆتە شەڕەوە و، لە شەڕا کوژراوە، کوڕەکانی بەعێلەکانیانەوە کۆچ و ڕەویان کردووە و، بەکوردستانا بڵاوبوونەوە، یەکێ لەم کوڕانە بەعێلەکەیەوە قەڵای خان ئەڵماسی نزیک ڕەزائیەی داگیر کردووە و عێلەکەی تیا دامەزراندووە و، لەو ناوەدا جێگیربوون و پەرەیان داوە بەدەسەڵات و قەڵەمڕەویان... بەڵام بەداخەوە مێژوو ئەو سەرگوزەشتەی تۆمار نەکردووە. لە دەورانی دوایی دەسەڵاتی ئاق قویونلو و قەرەقویونلودا لەم بنەماڵەیە سوڵتان ئەحمەد ناوێ فەرمانڕەوای هەرێمی سومای بووە، عێلی برادۆست لە سایەیا زۆر خۆش بەخت و بەختیار بوون... بەڵام زۆر زوو کۆچی دوایی کردووە و، قڕانی کوڕی لە جێی دانیشتووە... ئەم قڕانە پیاوێکی ئازا و ئەبەرد بووە، کە شا ئیسماعیلی سەفەوی سەری هەڵداوە و دەسەڵاتی دەوڵەتانی ئاق قویونلو و قەرەقویونلوی لەسەر ئێران لاداوە، لەو کاتەدا قڕان پیاوێکی بەدەسەڵات بووە... لەگەڵ سەردارانی تری کورددا چوونە پیرۆزبایی شا ئیسماعیل بەهۆی تاج لەسەر دانانییەوە... شا ئیسماعیل دانی بەوە دانا کە سەرداری سومایە و، ماوەی ئەوەشی داوەتێ کە تەرگەوەریش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی... بەڵام کە شا ئیسماعیل لەگەڵ سەردارانی کورد نێوانی تێکچووە، قڕانیش وەکو سەردارانی تری کورد بەهۆی پروپاغەندە و چاوەڕاوی مەلا ئیدریسی تبلیسییەوە، خۆی داوەتە پاڵ سەڵتەنەتی عوسمانی یاوز سوڵتان سلیم زۆری ڕێز گرتووە و، کردوویە بەجێ باوەڕ و جێی ڕاوێژی خۆی و، چەند هەرێمێکی لە نوستانەکانی هەولێر و دیاربەکر و بەغداشی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی... و ناوی ناوە غازی قڕان... هەر لەبەر ئەوە خاوەنی کتێبی عالەم ئارای

عەبباسی زۆری شالاو کردۆتە سەری و قسەی خراپی پێ ڕەوا دیوە و بەئاژاوەچی ناوی بردووە.

سومای، پاش ئەوە هەر لەژێردەست ئەم بنەماڵەیەدا ماوەتەوە کە جارجارە سەر بەسەفەوی و جارجارە سەر بەعوسمانی بوون.

لە فەرمانڕەوایانی بەناوبانگی ئەم بنەماڵەیە شا محەمەد بەگ و بوداق بەگ و حەسەن بەگ و عەلی بەگی غازی قڕان و ئەولیا بەگ کوڕی بوداق بەگ بوون، ئەوی هەرە دواییبیان ساڵی ١٠٠٥ کۆچی فەرمانڕەوای سومای و دەوروبەری بووە

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئەوەندەی کە بۆمان گونجا لە مێژووی سومای تۆمارمان کرد... ئێستە با ئەوە ڕوون بکەینەوە کە سومای لە کوێیە؟

سومای ناوی گەورە دێیەکە ناوەندی بەخشی سومایی سەر بەشارستانی ڕەزائیەیە. سنووری بەخشەکە بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە بەشی باکوری لای خۆرئاوای ڕەزائییەوە، هاوسنوورە لەلای باکورەوە لەگەڵ بەخشی شاهپوردا کە سەر بەشارستانی (خۆی)ە و، لای باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سیلوانا و لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی ڕەزائییە و لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ خاکی تورکیە...

سەر زەوی ئەم بەخشە زورگ و هەڵەتاوی و، شاخاوییە هەوای لە زستانا سارد و لە هاوینا فێنکە... دوو ڕووباری تیایە ناویان (سەرو و هەشتیان)ە، لە پاومانی سنووری بەخشەکەدا ئەم دوو ڕووبارە تێکەڵ بەیەک دەبن و، ناوی ڕووباری (نازلو)یان بۆ پەیدا ئەبێ. خاکی دێیەکانی بەخشەکە، بەئاوی ئەم ڕووبارانە و، بەئاوی بەفروباران پڕ ئاو ئەبێ.

ناوەندی بەخشەکە دێی هەشتیانە کە ٦٤ کیلۆمەتر لە ڕەزائییەوە دوورە... بەخشەکە لە ٣ دێهستان پێکهاتووە: کە ١٧ دێیان تیایە. دانیشتوانی تێکڕای بەخشەکە ئەگاتە ١٨ هەزار کەسێک، گەورەترین ئاواییەکانی بەخشەکە ئەمانەن: (مەمەکان - گونبەت - قەسریک - زین دەشت - کەنگچین - ئیشگەسو - مستەکان).

خەڵقی سومای کوردن و زمانیان کرمانجیی ژوورووە، فارسیش ئەزانن... کار و پیشەیان، کشتوکاڵ و، ئاژەڵ بەخێوکردنە بەرهەمی کاریان، دەغڵ و دانەوێڵە، توتن، پەمۆ، سێو زەمینی و پەتاتەیە... بەرهەمی ئاژەڵیشیان ماست و شیر و کەرە و ڕۆن و،

پەنیر و ژاژی و، پێستە و خورییە.

لە بەخشەکە و دێهاتەکاندا، قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە... لە هەندێ دێیەکاندا مزگەوت و تەکیەش هەیە، لە دێی هەشتیاندا کە ناوەندی بەخشەکەیە، چەند دوکان و مەغازەشی هەیە، هەندێ لە ئاواییەکان باغ و دارستانیشی هەیە.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین شادیتان هیوایە.

١٣٥٤/٢/١٦

**وتاری: ١٦٣**

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ. لەم حەوتەیەدا دەربارەی (تاق بوستان) ئەدوێین، کە بەکوردی (تاق وەسان)ی پێ دەڵێن. تاق بوستان هەم ناوە بۆ دێیەک سەر بەبەخشی ناوەندیی شارستانی کرماشان، کە ٩ کیلۆمەتر ڕێ لە کرماشانەوە دوورە و، ئەکەوێتە لای باکوری خۆرهەڵاتی کرماشانەوە، نزیک بەجادەی تاران - کرماشان، هەم ناوە بۆ ئەو دوو تاقە کە لە چیای بێستون هەڵکۆڵراوە و داتاشراون و، هەندێ نەخش و نیگاریان تیا هەڵکەندراوە و، بەردەنووسەکانیان ئەگەڕێتەوە بۆ دەورانی شایانی ئێرانی بەر لە ئیسلام، وەک دووروودرێژ لێی دەدوێین.

بەڵام دێی تاق بوستان دێیەکی هەشتا ماڵییەوە ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە چوار سەد کەسێک... خەڵقی دێیەکە کوردن فارسیش ئەزانن، کار و پیشەیان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە. هەندێکیان کرد و جۆلاییش ئەزانن... ناوبانگی ئەم دێیە هی ئەو شوێنەوارە دێرینەیە، کە بەدرێژە لێی ئەدوێین. دێیەکە لەبەرئەوەی گەشتیاران ئەچنە سەرلێدان و دیتنی ئەم شوێنەوارانە، چەند قاوەخانە و چاخانەیەکی هەیە.

با ئێستە بگەڕێینەوە بۆ دووان لە دێرینەی تاق بوستان... وا دیارە ناوی تاق بوستان لە بنەڕەتا (تاق بوغستان) بووبێ، بەو پێیەی کە لە داوێنی بێستون دایە و، ئەم دەوروبەرە جێی پەرستشی بوغان بووە، لە سەردەمی ئاریا کۆنەکاندا، بەرلەوەی ناوانی (میر و، ئاهورا و، ئیزەد و، یەزدان) بێتە ناو بۆ خوا...

تاق بوستان بریتییە لە دوو تاقی گەورە و بچووک... تاقە گەورەکە ٩ مەتر بەرزە، کەمەری تاقەکە حەوت مەتر و چل و چوار سانتە و قووڵایی ناو ژوورەکەی حەوت مەتر و حەوتا سانتە... تاقە بچووکەکە پێنج مەتر و سی و یەک سانت بەرزاییەتی و، کەمەرەکەی پێنج مەتر و نەوەد سانتە و، قووڵایی ژوورەوەی سێ مەتر و شەش سەد و شەش سانتە.

هەردوو تاقەکە نزیک بەیەکن، لە دەرەوەی تاقەکە وێنەی سێ کەس کێشراوە، نووسینی لەگەڵ نییە کە بزانرێ هی کێن، هەندێ لە مێژوونووسان گومانی ئەوەیان کردووە کە هی دەورانی ساسانی بێ... و هەندێ لایان وایە زۆر لەوە کۆنترە و هی سەردەمی میهرپەرستییە... وا دراوەتە قەڵەم، یەکێ لە سێ وێنەکان شایە و، ئەوی ناوەندیان

فریشتەی کاروبار بەدەستە و خەریکە گۆچانی فەرمانڕەوایی، وەیاخۆ چەپکێ بەرسیم واتا دەستەیەک شولی گەز کە نیشانەی ڕۆژی تاج لە سەرنانەئەدا بەدەس ئەو شایەوە و، هەردووکیان بەسەرپەرشتی دیلیکەوە وەستاون، کە نیشانی زاڵێتی و سەرکەوتنە، وێنەی سێیەم پیاوێکە سەری بەتیشک گەمارۆ دراوە، هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە وێنەی (ئاشو زەردەشت)ە، بۆ پیرۆزی کێشراوە و، هەندێکیش لایان وایە ئەوە وێنەی میترایە - واتا میهرە- و یادگاری سەردەمی میهرپەرستییە و، بەپێی باوەڕی ئێمە ئەم بیروڕایەی کە وێنەی سێیەم: بەهی میهر دابنرێ، زۆر لە جێی خۆیەتی، چونکە ئەو وێنەیانەی میهر کە لە حەضەر دۆزراوەتەوە و، هەروا لە ئەشکەوتێ لەو ئەشکەوتەیانەش کە لەلای یەزیدییەکان پیرۆزن دیسان وێنەی میهر هەیە و، لەگەڵ ئەم وێنەیە لەیەک ئەچن، جگە لەمانەش وێنەی میهر لە گۆڕستانی ئانتیوخوس گەماژنیدا بینراوە، کە لەگەڵ ئەم وێنەیە زۆر لە یەک ئەچن.

هەندێ وایان داوەتە قەڵەم، کە ئەم سێ وێنەیە هی ئەردەشێری دووەم ساسانی و، هورمزد و، زەردەشتە، گوایە هورمزد خەریکە تاجی شاهەنشاهی ئەبەخشێ بەئەردەشێر و زەردەشتیش بۆ پیرۆزبایی وەستاوە. بەڵگەشیان ئەوەیە کە جلوبەرگی پەیکەرەکان، لە هی سەردەمی ساسانی دەچێ.

## موزیک

لای چەپی ئەو پەیکەرانەوە کە لێی دواین و هەندێ ناویان ناوە ئاهەنگی بەزمی تاج لە سەرنانی ئەردەشێر، دوو تاق هەیە، گۆیا تاقە بچووکەکەیان هی سەردەمی شاپوری سێیەمی پادشای ساسانییە کە لە سالانی ٣٨٣ - ٣٨٨ی زایینی مەسیحدا هەڵکەندراوە و تاشراوە.

لەم تاقەدا دوو بەردەنووس هەیە و دوو پەیکەری هەڵتۆقیو... بەپێی بەردەنووسەکان، پەیکەرەکان هی شاپوری دووەمە کە لە نێوانی ٣١٠-٣٧٩ی پاش زایینی مەسیحدا کێشراوە و هی شاپوری سێیەم.

ئەو بەردەنووسەی ئەکەوێتە لای ڕاستەوە، نۆ دێرە... و پەهلەوییەکەی بەم جۆرەیە: (پاتیکاری ایرانانی... مزدیسن وهیا... شاپوری مەلکا... مەلکا ایران وانیران... منوچتری یزدان برمن مزدیسن... وهیا اورمزد ملکان... ملکان ایران وانیران... منوچتری مسن یزدان نەبی وهیا... نرسی ملکا...)

واتا: ئەم پەیکەرە هی پەرستی جوان شاپور، شای شاهانی ئێران و غەیری ئێران، ڕەگەزی عاسمانی، لە لایەن خواوە کوڕی خواپەرستی جوان هورمزد شا، شاهان ایران و غەیری ئیران نژادی عاسمانی لای خواوە، نەوەی جوانی نەرسی شاهی شاهان)...

بەردەنووسەکەی لای چەپیش بەهەلوییەکەی سێزدە دێرە و بەم جۆرەیە:

پاتیکاری... ایرنانی فردیسن... وهیا... شاه پووری... ملکان ملکا... ایران و انیران... منوچتری مسن یزدان؛ برمان فردیسن وهیا... شاهپوری ملکا... ملکان ایران و انیران... منوچتری مسن یزدان... وهیا اورمزدی... ملکان ملکان...).

واتا ئەمە بەیکەرەی خواپەرستی جوان شاه پور شاهی شاهان ئێران وغەیری ئێران نژادی عاسمانی لای خواپەرست کوڕی خواپەرستی جوان شاپوری شاهی شاهانی ئێران و غەیری ئێران نژادی عاسمانی...

بۆ باسی تاقە گەورەکە، چاوەڕێی وتاری ئاینده بن، لێرەدا هەر ئەوەندەتان بۆ ڕوون دەکەینەوە لە بەردەنووسەکان کە بەزمانی پەهلەوی نووسراون بۆمان دەرئەکەوێ کە زبانی پەهلەوی وشەی ئارامی زۆری تێکەڵ بووە. تا وتاری ئاینده خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/٢/٢٣

## وتاری: ١٦٤

گوێگره بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ...

ئێمە لە وتاری ڕابردووا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ناوی دێی (تاق وەسان) لە بنەڕەتا (تاق بوغستان) بووە و، هەروەک ناوی بوغستان کە گەڕاوە بەبێستون ئەم تاقانەش کە لەپاڵ چیاکەدا هەڵکەندراون، ئەو ناوەیان وەرگرتووە. ئەوەش ئاشکرایە، کە هەندێ لە گەلە ئارییایی نژادەکانی کۆنی پێش ماد کە لە چیای زاگرۆسدا ژیاون، بەخواکانی خۆیان وتووە (بوغ) یا (بەغ) و، پەیکەری ئەم بوغانەیان لەسەر تەپەڵاکی چیای بێستون داناوە، کە لە شاڵاو و هەڵمەتی دەسەڵاتە هاوسێکانیان بەدووربن و، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناوی بوغستان بەجۆرێ تووشی گۆڕان بووە کە ڕیشە بۆ تێکڕای مرۆڤی وڵات ڕوون نییە بەڵام نموونەی ئەو ناوە هێشتا لە بەغ پور و فەغفور و بەغدا و بوغەدا هەر ماوە.

لە وتاری پێشوودا ئەوەمانیش ڕوون کردەوە کە تاقەکان دووانن: یەکێ بچووک - یەکێ گەورە، تاقە بچووکەکە، هەردوو بەری بەردەنووسە و، بەچیری پەهلەوییە. نرخی مێژوویی و دێرینەیی و وهونەری ئەو بەردەنووسانە هەر لەوە دایە کە قسەی دوو شایان پێ تۆمارکراوە، وەگەرنە لە هەڵکەندن و نەخشەکانا وردەکاری و هونەر بەخەرج نەدراوە.

بەڵام تاقە گەورەکە، لە ڕووی ئەو وردەکاری و هونەرەوە کە بۆ هەڵکەندنی نیگارەکان لەسەر ئەو بەردە ڕەقە بەخەرج دراوە گەییوەتە ئەوپەڕی کارامەیی... ئێمە دیاردی بۆ هەندێ لەو نەخش و نیگارانە ئەکەین:

لای ڕاستی ناو تاقەکە دیمەنی مەدانێکی پانوپۆڕە، کە جێی ڕاووشکاری شایە و بەکوردی و فارسی هەر پێی ئەوترێ (شکارگەه). لەو پەردەیانەی کە نیشانی داوە، وامان بۆ دەرئەکەوێ کابرای نیگارکێش بەر لەوەی کارەکەی بگەیێنێتە ئەنجام لێی قەوماوە و، پەردەکەی تەواو نەکردووە و نیوەچڵ هێشتوویەتییەوە. بەڵام لەوەندەدا کە ئەنجامی داوە، زۆر بەڕوونی دیارە، شا لە مەیدانی ڕاودا بەسواری ئەسپێ وەستاوە، تەماشای شکارگەهەکە ئەکات، سوارێ لە پشتی سەرییەوە وەستاوە، چەترێکی بۆ هەڵداوە، کە لە تەوژمی خۆر بیپارێزێ...

لە نیگاری مێگەلی کاکێوی و، کەڵەکێوی و، بزنەکێوی و، ئاسک و، مامز کە لە تاوی غار و ڕاکردنا وێنەکێشراون، مرۆڤ واقی ورئەمێنێ.

هەر لە ناوەندی شکارگەهەکەدا تەختانێک بەدی ئەکرێ، کە ماڵ و خێزانی شای لەسەر وەستاون سەرنجی شکارگە ئەدەن... وێنەی تاقمی ئەسپ و فیل و وشتریش کێشراوە دەبێ تایبەتی بنەماڵەی شا بن کە پاش شکار پێیان بگەڕێنەوە بۆ کۆشکی پادشایی. دیمەنی لای ڕاست بەم جۆرە بوو. بابێینە سەر سەرنجی لای چەپی تاقەکە، کە ئەم نەخش و نیگارەی تیا کێشراوە: زەلکاوێکی پانوپۆڕی پڕ لە بەراز بەدی ئەکرێ... شاسواری بەلەمێکی -واتا قایقێکی- زل بووە، کابرایەکیش، سواری قایفێکی تری بووە، دەبێ کەمانداری تایبەتیی شا بێ، کەمانی خۆی لێ ڕاکێشاوە، خەریکە بەرازەکان ئەداتە بەر تیر. بەرازەکانیش لە ترسی تیر، کەوتوونە لوقە و غار بەناو زەلکاوەکەدا... لە قایقێکی تریشدا، دەستەیەک چۆپی کێش و سەماکەری سەر و سنگ لاق ڕووت، بەکەرەسەی ساز و سەمتوورەوە دیارن خەریکی بەزم و چەپڵەڕێزانن... لە خوار ئەوانەوە دەستەیەکی تری لە خزمەتکاران و نۆکەران خەریکن نچیر و شکارەکان پێست ئەکەنن و گۆشتیان ئەکەن بەکەباب، ئەم پەردەیەش هێندە وردەکارانە کێشراوە، کە بەقەڵەم و پەڕیش لەسەر کاغەز هەر بەوجۆرە ئەکێشرێ.

لای بنەوەی تاقە گەورەکە، نیگارێکی زلی شا بەسواری ئەسپێ کێشراوە، شا خۆی پڕ چەک کردووە، کڵاو زرێی لەسەرە، کراسێکی زرێی لەبەرە، ڕمێک و شمشێرێکی پێیە، لەگەڵ قەڵغان و سوپەر و، بەرگێکی جوانی لەبەردایە.

ئەوانەی ئەم نەخش و نیگارەیان دیوە بڕیاریان داوە کە ئەم وێنە پەیکەرە هی خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانییە و ئەسپەکەش (شەودێز)ی بەناوبانگە.

بەمیچی تاقەکەشەوە وێنەی دوو فریشتە کێشراوە، ئەم دوو فریشتەیە ڕوویان لەیەکە، خەریکن تاجی ئەدەن بەیەک... ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەسپ سوارەکە تاجە و، فریشتەکان، پارێزەری تەخت و تاجی پادشاهن. ئەم دروشمە لە سەردەمی ئەشکانی و ساسانیدا باوبووە.

بەپێی پاشماوەی دێرینەی کۆن وا دیارە لەپاڵ ئەم تاقەدا، باغێکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگ هەبووە، بەئاوی ئەو کانی و سەرچاوەیە ئاو دراوە کە لە ژێر چیاکەوە هەڵئەقوڵێ... هەر لەو تاقەدا، وێنەی درەختێ کێشراوە، کە پێی وتراوە (درەختی ژین) ئەم درەختە، زۆر لە (عەصا)ی میترا ئەچی کە لە لایەن میهرپەرستەکانەوە نەخش کێشراوە. وا دیارە هەر ئەو داری ژینەیە، کە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئەمڕۆکە یەزیدییەکان پێی ئەڵێن (کورسیی مەلەک تاوس)...

هەرچۆنێ بێ، ئەم جیهانە کۆنە، ولاتی ئێمە دێرینەی باستانیی زۆرە. ڕۆژگار لەسەرخۆ بۆ زانایان و ڕۆشنبیـرانی ڕوون ئەکاتەوە. لەم دوو تاقـەدا نیگاری تر زۆرە ئێمـە لێرەدا باسیان دوا پێ ئەهێنین، لە بیرمان نەچێ هەروەک پیرێژنێ بەگلۆڵەیی بەنەوە خۆی خستە ڕیزی کڕیارانی یوسف، هەزرا کابرایەکیش نیگارێکی هەر لە تاقە گەورەکەدا بۆ محەمەد عەلی میـرزای دەوڵەتشا و دوو کـوڕەکەی و غـەنی ئاغـای یاوەری کـێشـاوە، لێرەدا، دوعاخوازی لە گوێگرە خۆشەویستەکان دەکەین خۆشی و شادی بۆ هەموو لایێ.

١٣٥٤/٢/٢٩

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن لەم حەوتەیەدا باسی (طەرهان) دەکەین. تەرهان کە هەندێ لە جوغرافیانووس و مێژووناسان پێیان وتووە تەرخان ناوە بۆ بەخشێ لە بەخشەکانی شارستانی خورەم ئاوای هەرێمی لوڕستان.

وا دیارە ناوەکە لە بنەڕەتا تەروخان، یا تەرخان بووبێ، بەلام عەرەبی تێ بەسەریا زاڵ بووبێ و تووشی گۆڕانی هێنا بێ. جا هەروەک تەرهان دێهستانێکە لە بەخشەکەدا، هەروا ناوی تەرهان بڕاوە بەسەر بەخشەکەشا و ئەوەش ئاشکرایە کە تەرهان لەگەڵ تیرهانی کۆنە جێی سامەڕادا هیچ کۆنە پەیوەندییەکیان لەگەڵ یەک نییە، ئەم تەرهانە بەپێی باوەڕی هەندێ لە مێژوونووسان جێی بنەڕەتیی و بنچینەیی بنەماڵەی ئەتابەگەکانی لوڕستان بووە، کە پێنج سەد ساڵێ فەرمانڕەوای هەرێمی لوڕستان بوون.

موزیک

تەرهان هەرێمێکە پانوپۆڕ و بەربلاو، ئەکەوێتە بەشی باکوری خۆرئاوایی لوڕستانەوە... سنووریشی بەم جۆرەیە لای باکور و خۆرئاواوە ئەگاتە سەر ڕووباری سەیمەرە...

لای باشووریشەوە ئەگاتە سەر ڕووباری کەشکان و لای خۆرهەلاتیشەوە، هەر ئەگاتەوە سەر ڕووباری کەشکان لەگەڵ هەرێمی بەخشی چنگنی. پێوانەی خاکی تەرهان دووسەد فەرسەنگی چوارگۆشەیە، بەشێکی پێ دەشت و زەویوزاری کشتوکاڵییە و، بەشێکی چیا و زورگ و هەڵەتە.

بەخشی تەرهان لە سێ دێهستان پێکهاتووە: کۆە دەشت - ڕومشکان - تەرهان...

لە دێهستانی کۆە دەشتدا (٧٠) ئاوایی بچووک و گەورە هەیە، کە ژمارەی دانیشتوانیان ئەگاتە ٥٥٠٠ کەس لە دێهستانی ڕومشکاندا ٣٣ ئاوایی هەیە، سەرژمێری دانیشتوانیان ئەگاتە ٨٠٠٠ کەس.

لە دێهستانی تەرهاندا چل دێ هەیە، سەرژمێری دانیشتوانیان ئەگاتە ٨٥٠٠ کەس.

گەورەترین دێیەکانی ئەم بەخشە، شارۆلکەی کۆە دەشتە کە ناوەندی بەخشەکەیە، بازاڕێکی بچووکی تیایە، قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی ناوەنجی و دەرمانگای هەیە. هەروا دێی سەراب میرییە کە تیرەی ئازاد بەختی تیا دائەنیشن... دێی (ئەبو الوەفا)ش

دێیەکی گەورەیە. گۆڕی ئەبو الوەفای پیری کاکەییەکان ئەهلی حەق لەوێیە، دێی ڕومیانیش لە گەورە دێیەکانە، دانیشتوانی لە تیرەی ئومەرائین. دێی سەر تەرهان دێیەکی گەورەیە، دانیشتوانی لە تیرەی کونانین.

زبانی خەڵقی بەخشی تەرهان لوڕی و لەکییە، مەبەست لە لەکی شێوەیەکە لە کەڵوڕی و گۆرانی پێکهاتووە. ئەو تیرەیانە کە بەلەکی قسە دەکەن ئەمانەن: (ئادینەوەند - کونانی - ئازاد بەختی - قوبادها...)

ئەوانەش کە بەزبانی لوڕی قسە دەکەن ئەمانەن: (سووری و ئومەرائی و کوشکی و قەرعەلیوەند و خوشنامەوەند و گەرمەری)...

بەرز چیاکانی تەرهان ئەمانەن: گەراز - سورخ دم لوڕی - هیزم ئاوا - سورخ دم لەکی - بلوران و هەندێ تری...

ڕووبارەکانی تەرهان ئەمانەن: (ڕووباری سەیمەرە و ڕووباری کەشکان، کە نزیک بەکۆنە پردەکەی گارمێشان تێکەڵاو ئەبن... و چەند شیو و جۆگەی تری وەک مادیان ڕود - سیاب - قەڵعە ئاستان... بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ هەندێ لە پێ دەشت و سەر زەوییەکانی کەناری ڕووبارەکان لەبەرئەوەی شێوەکان قووڵن، ئەبوون بەبەر ئاو و هەر بەدەیی ماونەوە...

خەڵقی ئەم بەخشە خاوەن کشتوکاڵ و خێوی ئاژەڵن، لەمەوبەر بەشی هەرەزۆریان کۆچەر بوون، بەڵام دێ نشین کران.

دانیشتوانی دێهستانی ڕومشیان زۆربەیان سووری و ئومەرائین، وشەی سووری ئەوەمان دەخاتەوە بیر کە بەشێ لە خەڵقی لوڕستان لە سەدەی پێنجەم بەدواوە لە چیای سماقی سوریاوە هاتوونە لوڕستان...

«سیروپسن»ی ئینگلیزی لە ١٩١١ زایینییدا چۆتە تەرهان لەو حەلەدا نەزەر عەلی خان فەتح سوڵتانی سەرۆکی عێلی غەزەنزەری زیندوو بووە و، لای مێوان بووە، باسی ئازایی و نان بدەیی ئەوی کردووە.

ئەمڕۆ شارۆلکەی کۆە دەشت ناوەندی بەخشی تەرهانە... بازاڕێکی تیایە، چەند قوتابخانە و مزگەوت و گەرماوی هەیە.

لەم بەخشەدا دێرینە و شوێنەواری باستانی و کۆن زۆرە وەک: (١) قەڵای پای ئوستان، کە پاشان نەزەر عەلی خان قەڵای وەهەنی لە پاڵیا دروست کردووە. (٢) قەڵای سەنگی،

لەسەر چیای ڕیسان کە پێی ئەوترێ قەڵای فەلەک ناز... (٣) قەڵای ساسان لە چیای واکلە... دێرینەی شارێکی کۆن لە ڕومشکان.

لە یادمان نەچێ شوێنەواری قەڵای (سمها) کە لە سەردەمی ئەتابەگانی لوڕستاندا بەناوی قەڵای (دژ سیا) بەناوبانگ بووە، ئەکەوێتە خاکی تەرهان... هەر لەم ناوەدا هاوینە هەوارێکی بەناوبانگ بووە بەناوی کوردلاخ، ئەتابەگ شوجاعەدین خورشیدی دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی لوڕستان زستانان هەر لەم هەرێمەدا کاتی بەسەر بردووە و، شارێکی گەورەی تیا دامەزراندووە، ئەمڕۆ تەنیا شوێنەواری ماوە...

لەم هەرێمی تەرهانەدا... دوو جێی تر هەیە ناویان هولەیلان و پاپییە و عێل و تیرەکانی (باڵاوەند، زەردلایی، مورادی، یەعقوب وەند، مەدهەنی، داڵ ژیر، لیریائی و کیشوەری) لەم جێیانەدان... قەڵای تەنگی کریتیش کە حیسامەدین خەلیل عیزەدین گەرشاسفی ئەتابەگی لوڕستانی تیا کوشت کە زاوای شەهابەدین سلێمان شای والی و فەرمانڕەوای کوردستان بوو، بەرلەوەی مەغۆل وڵاتەکە داگیر بکات، لەم بەخشی تەرهانە دایە.

گوێگرە بەڕێزەکان کاتمان لێرەدا تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەر بەرن.

١٣٥٤/٣/٦

**وتاری: ١٦٦**

گوێگرە بەرێزەکان، ئاواتمان شادیتانە... لەم وتارەدا دەربارەی (طارم) ئەدوێین، کە چەند جێگەیەکە.

وشەی (تارم) بەزبانی فارسی بەعاسمان و بەگونبەز و بەهەیوان و بەو خانووانە دەڵێن کە بەداربەست دروست بکرێ وەک کەپر و چەرداغ.

بەڵام لە کوردییا بەو تاقانە کێوانە دەوترێ کە درێژ هەڵکەوتبن نەوەک گردۆڵ و خڕ... هەروا خەرمانیش کە بۆ شەنە با ئامادە کرابێ، چونکە لەو جۆرە تەپەیانە ئەچێ، پێی ئەوترێ تارم. بەڵام لە کوردییا بەهەیوان ئەوترێ تارمە... جا دەبێ هۆی ناوی ئەو جێیانە ئەوە بێ، کە کەوتوونە پاڵ کێو و زوورگەزراوی تارم ڕەنگ.

تارم ناوە بۆ دوو دێهستان سەر بەبەخشی سیروان شارستانی زەنجان پێیان ئەوترێ (تارم باڵا و تارم پایین) جا ئەم دوو جێیە هەم کۆنن و، هەم لە مێژوودا ناوێکی دیاردیان هەیە، چون لە قەڵا هەرە گرنگەکانی دەوڵەتی ڕوادیی کورد و دەوڵەتی سالاری کورد، لەم هەرێمەدا بوون.

ساڵی ٢٨٨ کۆچی یوسف کوڕی ئەبو ساج - کە یەکێ بوو لە سەرانی کورد وڵاتی ئازەربایجانی لە چنگی سەردارانی خەلافەتی عەبباسی دەرکرد، بەڵام خەلیفە ئەلموقتەدیربیللا (المقتدر بالله) سەرداری سپای خۆی کە مونسی خادمی ناوبوو، بەسپای زۆرەوە نارده سەر یوسف کوڕی ئەبو ساج و هەرێمەکانی دەیلەم و ئازەربایجانی لێ سەندەوە... بەڵام یوسف کوڕی ئەبو ساج کە زۆربەی پەیڕەوانی کورد و دەیلەم بوون ئازەربایجانی لە چنگ خەلیفە دەرهێنا و دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کوردی کردە فەرمانڕەوای.

دەیسەم یەکێ بوو لە کوردە قارەمانەکان و، سەر بەڕچی (شراة) بوو... پەیڕەوانی ڕچی شرات دژی خەلافەتی عەبباسی بوون، پێیان دەوترا (خەوارج) -واتا یاغییەکان- ئەم دەیسەمە زۆربەی لە تارم ڕادەبوارد، چون هەرێمی تارم پڕبوو لە قەڵای سەخت... دەوڵەتی سالاری کە سالار مەرزبان دایمەزراند، جێگری دەوڵەتی ڕوادی کورد بوو کە دەیسەم دایمەزراندبوو و، سالار مەرزبان لێی داگیر کردبوو. جا شەڕ و هەرا لە نێوانی ئەم

سەرداریتییە کوردانەدا، بووبووە هۆی ئەوەی کە فەرماندەیانی عەبباسی جارجارە بەسەریانا زاڵ بن، پاش دەیسەم و سالار مەرزبان ئەم تارمە و قەڵاکانی کەوتە ژێر دەسەڵاتی وەهسۆزان کوڕی مەملان، کە یەکێ تر بوو لەم بنەماڵەیە.

بابێینە سەر هەرێمی تارم، جوغرافیانووسی بەناوبانگ لیسترنج ئەڵێ: لای باکوری زەنجانەوە، لە پاڵی چیاکەدا بەدرێژایی هەرێمی تارم هەیە، جوغرافیانووسانی ئیسلامی ناویان ناوە (طارمەین) -واتا دوو تارم- کە مەبەستیان تارمی سەروو و تارمی خواروەوە... ئەم دوو هەرێمە لە سەدەی چوارەمی کۆچییا لەسەر (دەیلەم) -واتا وڵاتی ڕەشت و گیلانی ئێستا-دەژمێررا... ناوەندی هەرێمی تارمی باڵا قەڵای فەیروز ئاوا بوو و ناوەندی تارم پایینیش قەڵای شمێران بوو، ئەم دوو قەڵایە لە قەڵاکانی سالارەوەند بوون... ناسر خوسرەو ساڵی ٤٣٨ کۆچی بەم ناوەدا ڕابردووە، نووسیویە: لە خەندانەوە تا شمیران ٣ فەرسەنگە، ڕێگەکەی سەخت و زورگ و هەڵەتە، شەمیران ناوەندی ویلایەتی تارمە، لەپاڵ ئەم شارەدا قەڵایەکی زۆر سەخت هەیە کە بەسەر کێوێکی بەردی مەرمەڕەوە دروست کراوە، سێ شوورەی هەیە، ئاو براوەتە ناو قەڵاکەوە. هەزار کەس لە پیاوماقووڵانی هەرێمی تارم لەو قەڵایەدا ئەژین، لە ترسی ئەوان هیچ کەس ناتوانێ پیاوخراپی و دزی و درۆزنی بکات.

یاقوتی حەمەوی لە سەدەی حەوتەما بەو ناوەدا ڕابردووە، وتوویە: قەڵای شەمیران، کە زۆر بەپشت و قایم بووە، وا دیارە بەفەرمانی مەلا حیدەی ئیسماعیلی وێران کراوە و، لە بنچینە دەرکراوە... هەروا یاقوت باسی چەند قەڵایەکی تریش دەکات لە هەرێمی تارم یەکێ لەوانە قەڵایێ بوو، بەناوی (قەلاط) لە ناو چیاکانی تارمدا، لە نێوانی قەزوین - خەلخال - دەیلەمدا ئەم قەڵایەش شارێکی لەپاڵدا هەبوو، گۆیا سەرداری مەلا حیدە واتا سەرداری پەیڕەوانی حەسەن سەباح لەم قەڵایەدا ئەژیا.

ئەمڕۆ تارم ناوە بۆ دوو دێهستان سەر بەبەخشی سیروان. تارمی باڵا ئەکەوێتە خۆرئاوای بەخشەکەوە، لە ١١١ دێ پێکهاتووە، ئاواییەکانی ئەکەونە هەردوو ڕۆخی ڕووباری قزل ئوزون، گەورەترینی ئاواییەکان ئەمانەن: هەزار ڕود - ئاب بەر - چورزق - دەرام - سیا ڕود - گەوهەر - ئەرەشت - ئیچ.

تارمی پایین ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی بەخشەکەوە، بەکەناری ڕووباری قزل ئوزون و ڕووباری یوزباشییا درێژای کێشاوە، لە پتر ٩٠ دێ پێکهاتووە، دێ گەورەکانی ئەمانەن:

- سیردان، کە ناوەندی بەخشەکەیە - نیازک - سیاهپوش - ماهین - حەسار - کەشکور - قەبرەچەم - چیزە.

جە ژمارەی دانیشتوانی هەردوو دێهستانەکە ئەگاتە ٧٠ هەزار کەس. لەم دێیانەدا، قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، مزگەوت، حوسێنییە هەیە. خەڵقی دێیەکان، بەکشتوکاڵ و مێگەلدارییەوە خەریکن، خاکی وڵاتەکە بەپیت و برشتە. چیاکانی جەنگەڵاوییە، جڕ و جانەوەری کێوی زۆرە. لە هەندێ جێی ئەو ناوەدا کانی (مس - مز - قەڵایی - زاخ) هەیە.

تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٤/٣/١٣

## وتاری: ١٦٧

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت چاتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کامەرانی بێ... هیوای ئێمە بەختیاری ئێوە و ڕەزابوونی بیستیارانە لە بەرنامەکان و، بەهرەوەربوون و سوود لێ وەرگرتنیان.

ئێمە لەم وتارەدا باسی (طالش) دەکەین... بەڵام بەرلەوەی دەس بەوتارەکەمان بکەین وەڵامی نامەی گوێگرێکی بەڕێز ئەدەینەوە... بیستیاری بەڕێز نەجات حەمزە ناو نامەیەکی نووسیوە، لەو نامەیەدا ئەڵێ: (وەسفی قەڵای جولەندیان بۆ بکەن کە ئەکەوێتە خوار چەمی ڕەزانەوە لە ناوچەی ئاغجەلەر و پێوەندی بە...)

ئێمە لە وەرامی نامەی ئەو برادەرەدا ئەڵێین: ببورن، ناونیشانەکەتان زۆر ڕوون نەبوو... بەشی دوایی نامەکەشمان بۆ نەخوێندرایەوە ئێستە گوێ بگرن لە وەڵامی نامەکەتان...

ئێوە خۆتان وەصفێکی جوغرافی قەڵای (جولەندی)تان کردووە... ئێمەش هەر ئەوەندە ئەتوانین بەتانیا بچین کە بەپێی جوغرافیا و مێژوو شارەزاین.

قەڵای جولەندی، ئەکەوێتە چەمی ڕەزانەوە، لە خوار دێی عەودالانەوە، بەبەری خۆرهەڵاتی زێی بچووکەوەیە، نزیک بەو کاروانە ڕێیەی لە دێی عەسکەرەوە بەرەو ژوور ئەبێتەوە بۆ عەودالان... وا بەسەر گردێکی بەرزەوە، بەشوێنەوارەکەیا وەها دیارە لە کاتی خۆیا قەڵایەکی قایم و سەخت بووە.

بابێینەوە سەر ئەوەی جولەندی کێ بووە، لە ناو خەڵکا وەها باوە کە ئەو پیاوە سەردارێکی کوردی جەردەی ڕێگری دڕی پیاوکوژ بووە، هەمیشە دەستی بۆ وڵاتی سەردارە کوردەکانی هاوسێی درێژ کردووە.

هەرێمی عەودالانیش جێی موغەکان بووە. لەو ناوەدا عەودالانی وێڵ و سەرگەردانی ئەڤینی خوایی زۆربوون، ئەوان هەمیشە ئامۆژگاریی ئەو کابرا خوێنڕێژەیان کردووە سوودی نەبووە و، گوێی بەپەند و ئامۆژگارییان نەداوە. ئەوان ناویان ناوە (جولەندی) -واتا پیاوخراپی ڕێگری خوێنڕێژ-.

بەرامبەر بەدێی عەودالان، یا زۆرتر بەلای خۆرئاوای زێی بچووکەوە بەکەناری کەندەڵانە زۆر بەرزەکەی لێواری ڕووبارەکەوە بەقەد تاشەبەردێکی زۆر بەرزەوە کە دووسەد مەتر پتر بەرز ئەبێ.

خەڵوەتگای موغێ ماوە... ئەم موغانە ڕابەرانی ئاینە کۆنەکانی کورد ئاری نژادەکان بوون - وەک (میهرپەرستی - شیداپەرستی - دیڤپەرستی - زەردانی - زەردەشتی).

یەکێ لەو موغانە جولەندی لە ڕێی خراپە لاداوە، بۆ سەر ڕێگەی چاکە ڕێ بەدێی کردووە. جولەندی دەستی لە خراپە هەڵگرتووە تۆبەی کردووە، ئەڤینی خوایی چەقیوەتە هەناوی، لە پادشایی و سەرداریتی وازی هێناوە، دەستی داوەتە کەشکۆڵ و عەسایێ و چۆتە ریزی عەودالانەوە... کوردەواری پاش ئەوە هەزاران بەیتیان بۆ هەڵبەستووە. لەو حەلەوە تا ئەمڕۆ بەیتی جولەندی لە دیوەخانان و، لە کۆڕی خواناساندا ئەخوێندرێتەوە، تەنانەت لە کوردستانی موکریاندا بەیتی جولەندی بەناوبانگە، ئەمەبوو، وەڵامی نامەکەی نەجات حەمزە... هیوامان وایە گوێی لێ بووبێ.

## موزیک

با بگەڕێینەوە سەر باسی (طالش)... تالش لە بنەڕەتا ناوە بۆ تیرەیەکی ئاری نژاد... پاشان ئەم ناوە دراوە بەنیشتمانی ئەم تیرەیە لەبەرئەوەی لە چەند دێهستانێکا نیشتەجێ بوون، بەهەرێمەکەیان وتراوە (تەوالش). جا شارستانی تەوالش یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی گەیلان... سنووری چوار لای بەم جۆرەیەک: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئاستارا... لای باشوور و خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی فومەن، لای خۆرئاوایشەوە ئەگاتە نووکی سەرەوەی ئەلبورز کە سنوورێکی گردگارییە لە نێوانی تەوالش و شارستانی خەلخالدا.

پێوانەی سەر زەویی تەوالش ئەگاتە چوار هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیی، ناووهەوای ئماکە، لە ڕووی گەرما و سەرماوە ناوەنجییە، بارانی زۆرە، ریزە کێوی ئەلبورز لە سنووری تالش، لە ۱۲۰۰ مەترەوە تا ۲٤۰۰ مەتر لە ڕووی زەریە بەرزترە، بەرزترین لووتکەی مایسولەی ناو ئەم ڕیزە چیایە بەجەنگەڵ پۆشراوە، یەکێکە لە شوێنە هەرە سەوزەکانی گەیلان و، جوانترین هاوینەهەوارە و پڕە لە جانەوەرانی کێوی و لە گیاندارانی شکاری وەک کەڵە ئاسک و بزنە کێوی و، گا کێوی... تەوالش سێ دێهستانی هەیە، کار و کاسبی خەڵقی ئەو ناوە کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن و ڕاوە ماسییە. دەسکەوتی ئەو ناوە برنج و دانەوێڵەی ترە، هەروا پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و، میوەی تری...

بەخشەکانی ئەم شارستانە ۱۵۵ دێیان هەیە، لە بەشی زۆریانا قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. لەم هەرێمەدا یاسایەکی زۆر سەیر هەیە بۆ کڕین و فرۆشتن، وا دیارە ئەم یاسایە هی دەورانی کۆچەرێتی بێ...

هەر ڕۆژە بازاڕی کڕین و فرۆشتن، لە بەشێکی هەرێمەکەدا پێک دێ... بۆ وێنە ڕۆژی شەمە بازاڕ لە ماساڵ ئەبێ ڕۆژی سێ شەمە لە پەرەسەر ئەبێ ڕۆژی چوارشەمە لای ڕەزاوەندە ئەبێ ڕۆژی پێنج شەمە لای شەرەف شا ئەبێ...

خەڵقی تالش، فارسی و تورکی و کوردی ئەزانن. ساڵی ١٢٢٨ بەپێی موعاهەدەی گوڵستان تالش کەوتە ژێردەستی ڕووس، ساڵی ١٢٤٢ پەیمانی گوڵستان هەڵوەشایەوە و تالش کەوتەوە ژێر دەسەلاتی ئێران.

گوێگرە بەڕێزەکان تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٤/٣/٢٢

## وتاری: ١٦٨

گوێگرە بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و خۆشی بەسەر بەرن لەم وتارەدا لە (طالەقان) ئەدوێین کە ناوە بۆ زۆر جێگە و، لە هەریەک لەم جێگەیانەدا پیاوانی گەورە و بەناوبانگ هەڵکەوتوون.

بۆ وێنە تالەقان ناوی شارێکە لە نێوانی خوراسان و گوزگاناندا. هەروا شارێکە لە نێوانی (بەلخ) و (مەروالروز)دا و، شارێکە لە نێوانی تەخارستان و خەتلاندا. دێیەکە لە دێهستانی شەفت سەر بەشارستانی فومەن شارۆلکەیەکە لە نێوانی قەزوین و ئەبهەردا... کە ئێمە دەربارەی ئەمەی دوایی ئەدوێین...

ئەم تاقانە لە سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچییا یەکێ بوو لە شارەکانی ژێردەستی فەرمانڕەوایی ڕوادی کورد... پاشان کەوتۆتە ژێردەستی بنەماڵەی ئەمیرانی باتینی لە جێنشینانی حەسەن سەباح... لە سەردەمی ئاق قویونلو و قەرە قویونلو و سەفەویدا، یەکێ بوو، لە شارەکانی ژێردەستی سەردارانی سیامەنسووری.

نێوی ئەو تالەقانە لە (حدود العالم) و (موعجیم البولدان) و (نوزهەت القلوب) و زۆر کتێبی تری جوغرافیای مێژوویی داهاتووە... موستەوفی قەزوینی بەم جۆرە پێیا هەڵگوتووە: تالەقان هەرێمێکی سەردەسێرە، ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی قەزوینەوە، لە ناو چیاکە دایە، دێی بچووک و قەڵای زۆر تیایە، ئاوایی گەورەی زۆر کەمە، دێ گەورەکانی تالەقان ئەمانەن: (سەران ڕود - جرود - کوهپایە - کەن - کەرخ) بەرهەمی وڵاتەکە دەغڵ و دانەوێڵەیە، گوێز و مێوەی تریشی هەیە... ئەم باسەی موستەوفی هی سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچییە.

بەڵام خاوەنی (جوغرافیای سیاسی کەیهان) لە نیوەی سەدەی چواردەی کۆچی بەدواوە نووسیویە:

تالەقان: یەکێکە لە بەخشەکانی نوستانی تاران، سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای باکور و خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ مازەندەران - لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ساوجبلاغ کە مەبەستی ساوجبلاغی سەر بەکەرەج - و لای خۆرئاواوە سنووری ئەگاتە قەزوین. بەشی زۆری خاکی تالەقان ئەکەوێتە دۆڵی شاهرود و شاهرود ڕووبارێکە

سەرچاوەکەی لە گەردەنە و ملەی چیای کەندوانەوە دێتە خوارەوە، ڕووەو خۆرهەلات ئەکشێ بەشی زۆری دێیەکانی هەرێمی تالەقان ئاو ئەدا، تەنانەت دێیەکانی (شەهرەک - فەسا - مەحمود ئاوا)... ئاواییەکانی سەر بەتالەقان هەموو بەکەناری ڕووبارەکەوەن و بەهەوا خۆشی بەناوبانگن... ژمارەیان ئەگاتە ٨٠ ئاوایی، ژمارەی دانیشتوانیان ئەگاتە ٣٥٠ هەزار کەسێک.

موزیک

تالەقان ئەمڕۆکە، بەخشێکە سەر بەشارستانی کەرەج... لە بەشی زۆری دێیەکاندا قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. هەندێکیان بازاڕ و مزگەوت و حوسێنییەی تیایە. خەڵقی دێیەکان بەکشتوکاڵەوە خەریکن و، ئاژەڵیش بەخێو دەکەن، هەندێ لە ژنانی دێیەکان تەون دەکەن - واتا خەریکی کرد دەبن، بەڕە، مافوور، قاڵی دروست دەکەن... گورەیی و بلووز و شتی تریش دەچنن. مێوەیان زۆرە... لەم هەرێمی تالەقانەدا بنەماڵەی زۆر گەورە پێ گەییون: صاحیب ئیبن عەیاد کە ناوی ئیسماعیل بوو و، ساڵەهای ساڵ وەزیری بنەماڵەی ئال بویە بوو لە بنەڕەتا خەڵقی تالەقان بوو، ئەم ئیسماعیلە کوڕی ئەبو الحەسەن عەباد کوڕی عەبباس کوڕی عەبباد بوو، کە زانایەکی گەورە و یەکێ بوو لەوانەی کە لە زانستی فەرمایشەوانی و حەدیشدا زۆر شارەزابوو... جا ئەم ساحێب کوڕی عەببادە یەکێ بوو لە نووسەرە عەرەبییە هەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی خەلافەتی عەبباسی. یەکێ تر لە زانایانی طالەقانی ناوی ئەبو عەبدوڵلا سەیدی بوو، ئەویش زانایەکی گەورەی فەرمایش و حەدیثی پێغەمبەر بوو...

لە هەرێمی تالەقاندا شوێنەواری کۆنی قەڵا و بارو زۆرە، هەروا لەم هەرێمەدا کانگای خەڵووزی بەرد هەیە...

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەو زانیارییانەی دەربارەی تالەقان وەدەسمان هێنا لێرەدا دوایی هات، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی ڕابوێرن...

١٣٥٤/٣/٢٥

**وتاری: ١٦٩**

گوێگرە بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەخۆشی و شادی بەسەربەرن لەم وتارەدا باسی (تاق گەرا) دەکەین، کە دەکەوێتە نزیکی شەقامی قەسری شیرین - کرماشان... ئەم ناوە لە دوو وشە پەیدابووە یەکەم (تاق) واتا هەیوان و دووەم (گەڕا) کە گۆیا وشەیەکی فارسی دەرییە، واتا (کەڵەشاخ گر)... و هەندێ مێژووناسی عەرەبی ئیسلامیش بەوپێیە ناویان ناوە تاق حەجام... بەڵام ئێمە ئەم مەبەستانە لە ڕاستی بەدوور ئەزانین و، دوور نییە ناوەکە هەر لە سەرەتاوە کوردی بێ... چون لە هەندێ شێوەی کوردییا بەشتی بچووک و کەم غود ئەوترێ گەڕ جا لەبەرئەوەی کە ئەم تاقە لە چاو تاق تاق وەسان و ئەو نەخش و نیگارانەی تیا هەڵکەندراون، هەم نارێک و هەم هیچ و پووچ هاتۆتە بەرچاو، کوردە گۆرانەکان ناویان ناوە تاقەگەر... پاشان نووسەران و گەشتیاران بەپێی بیروباوەڕی خۆیان مەبەستی ناوەکەیان گۆڕیوە...

بابێینە سەر ئەوەی کە تاق گەڕا لە کوێیە؟ ڕێگەی کۆنی قەسری شیرین بۆ کرماشان، کە هەزاران ساڵە هەر هەیە لە دەورانی ماد و هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانیدا زۆر گۆڕانی بەسەرا هاتووە... بەڵام ئەو ڕێیە، تا ئەمڕۆ هەر شارێیە. جا ئەم شەقامەڕێیە لە ژوور سەرپولی زەهاوەوە کە کوردەواری پێی دەڵێن سەرپێڵ، وردە وردە بەرز ئەبێتەوە، تا ئەو جێگەیەی کە پێی دەوترێ کەلەملە و گەردەنەی پاتاق کە ئەم جێگەیە دەروازەی زاگرۆسیشی هەر پێ دەوترێ، جا لە کەناری ئەم ڕێگەیەدا، نزیک بەدێی پاتاق کە هەر بەناوی ئەو تاقەوە ناونراوە؛ هەیوانێ هەیە، دوور نییە پاشماوەی ئەشکەوتێکی دەستکرد بێ... هەندێ لە مێژوونووسان وایان داناوە کە ئەم جۆرە تاقە جێی ڕێوانان بووە کە پاسەوانی هەرێمی چیا لە هەرێمی (میزۆپۆتامیا)...

لە بیرمان نەچێ، کە لە دێی پاتاقی خوار گەردەنەی پاتاقدا شوێنەواری کۆشکێکی کۆن هەیە، ئەکەوێتە بەرامبەر ئەم تاقە دوور نییە ئەم تاقە جێی پاسەوانانی ئەو کۆشکە بووبێ. دێی پاتاق کە بەناوی ئەم تاقەوە ناونراوە، یەکێکە لە چوار دێهەستانی سەر بەبەخشی سەرپێڵ. کیلۆمەترێ لەلای خۆرهەڵاتی سەرپێڵەوە دوورە و، ئەکەوێتە لاپاڵی گەردەنەکەوە... لە خۆرهەڵاتی ئەم تاقەوە، بەدوورایی ٢٥ مەترێ، تاشەبەردێکی لووسکراو

هەیە، وا دیارە بۆ ئەوە ئامادە کراوە، کە نەخش و نیگاری لەسەر هەڵ بکەندرێ، وەیاخۆ مێژووی ئەو دەورەی لەسەر بنووسرێ.

خەڵقی دەوروبەری تاق گەرا کوردی گۆرانن، کاروباریان کشتوکاڵ و مێگەل بەخێوکردنە، زۆربەیان لە جەنگەڵەکانی چیاکە سوود وەرئەگرن بۆ زوخاڵ و قڵیشەدار... لە دێهاتەکانی ئەو ناوەدا (پاتاق - فولاوی - مهراماد) بەناوبانگن... دانیشتوانی لە کاکەییەکانی گۆرانن، جگە لە کوردی فارسیش ئەزانن.

لەو ناوەدا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو تا کاتێ تری بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٤/٤/٣

**وتاری: ١٧٠**

گوێگرە بەڕێزەکان! ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ. ئێمە لە ڕیزە وتارێکا لە باسی مێژوویی و جوغرافیایی (تاران) ئەدوێین، زۆربەی فەرهەنگی جوغرافیایی نووسەکان تارانیان بە(طێ)ی گەورە نووسیوە، هەر لەبەر ئەوە ئێمەش باسی تارانمان هێشتەوە بۆ پیتی (طێ) گەرچی خۆمانیش لەگەڵ ئەوان هاوباوەڕ نین. کۆنترین نووسەرانی کە باسی (طەهران)یان کردبێ و ناویان بردبێ، یاقوتی حەمەوییە لە (موعجیم البولدان)دا و، موستەوفی قەزوینییە لە (نوزهەت القلوب)دا هەندێ لە نووسەران وتوویانە: تاران لە بنەڕەتا دوو وشەیە (تەه) واتا بن و (ران) واتا زەوی. ئەمانە بیروباوەڕی خۆیان بەم جۆرە پاڵشت کردووە: گۆیا خەڵقی ئەم دێیە خاوەنی ڕان و کشتوکاڵ بوون و، هەمیشە بەر شاڵاوی ڕاووڕووتی دوژمن کەوتوون، لەبەر ئەوە خانووەکانیان لە غار و ژێر زەوییا دروست کردووە و، ئەگەر خۆیان ڕێیان نەدابێ کەس نەیتوانیوە بچێتە ناو دێی تارانەوە. ئەم بیروباوەڕە زۆر لە ڕاستییەوە دوور نییە، چونکە تا ئەم ساڵانەی دواییەش، هەندێ غاری زۆر زل هەبوو، لای خوارووی شاری تارانی ئەمڕۆوە کە هەزارەها خێزان تیا ئەژیان... بەڵام شەهرداریی تاران، هەندێکی پڕ کردەوە و کردی بەزەریاچە و بەباغ و باغچە و جێی سەیران و بەزم و یاریی منداڵان.

هەندێ تر لە مێژوونووسان دەڵێن وشەی (تاران) لە دوو واژە پێکهاتووە، (تەه) واتا گەرم و (ران) واتا سەر زەوی. گۆیا ئەم ناوە بەرامبەر بەشەم ڕان دانراوە کە ئەکا سەرد زەوی و، مەبەست گەرم سێر و سەردسێرە.

بەڵام ئێمە لامان وایە کە وشەی (تاران) لە بنەڕەتا کوردییە و لە واژەی (تاراندن)ەوە هاتووە کە ئەکات دوورخستنەوە و، بەم هۆیەوە ئەو ناوەی بەسرا بڕاوە، کە خەڵقی ئەو دێیە لە شاری ڕەی تەریک خراونەوە و، بەکاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکبوون و لە شارستانی بەدووربوون.

تاران، لە بنەڕەتا دێیەکی بچووک بووە، لە دەورانی دەوڵەتی ئال بویەدا هەبووە، بەڵام ناوبانگی نەبووە. پاش ئەوەی ساڵی ٦١٧ کۆچی شاری (ڕەی) کەوتە بەر شاڵاوی مەغۆل و خاکی بەتورەکە بێژرا وێران بوو، ناوی تاران و وەرامین کەوتە سەر زمانان، بەڵام تاران لە وەرامین بچووکتر بوو. یاقوتی حەمەوی پاش وێرانبوونی ڕەی دەربارەی تاران

نووسیویە: تاران لە دوازدە گەڕەک پێکدێ زۆربەی خانووبەرەی ئەم شارە لەژێر زەوی دایە، باغ و جەنگەڵی زۆرە، کەمتر، دوژمن ئەتوانێ دێیەکە بدۆزێتەوە، خەڵقەکە لە ترسی دوژمن کەمتر بەکشتوکاڵەوە خەریک ئەبن، چون جەردە گاجووتەکانیان ئەفڕێنن.

پاش یاقوتی حەمەوی، قازی عیمادەدین ئەبو یەحیا زەکریای ئەنساریش لە کتێبی (عەجائیب البولدان)دا، ئەم قسانەی پاڵشت کردووە و، نووسیویە: تاران دێیەکە سەر بەشاری ڕەی خەڵقەکەی دەوڵەمەندن، خانووەکانیان لەژێر زەوی دایە، هەر کات دوژمن شاڵاو بکاتە سەریان ئەچنە ژێر زەوییەکان و دەرناچن، دوژمن پڕیان پێ نابات، ئەگەر ماوەیەکی زۆریش گەمارۆی دێیەکە بدات خەڵقی تاران باکیان نییە، چون ئەوان هەموو جۆرە زەخیرەیەکیان لەبن زەوی دایە. ئەوان لە ترسی دوژمن ئاژەڵ بەخێو ناکەن...

ساڵی ٦٩٤ کۆچی، سوڵتان غازان خانی مەغۆل بەم تارانەدا ڕەت بووە و ماوەیەک تیا ماوە...

موستەوفی قەزوینی لە سەدەی هەشتەمی کۆچییا باسی ئاوەدانی تارانی کردووە.

لە سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچییا تاران، جێی فەرمانڕەوای هەرێمی ڕەی بووە و کلادیخوی ئیسپانی پێیا تێپەڕیوە بۆ دیتنی ئەمیر تەیموری لەنگ...

بەڵام لە سەردەمی شا تەهماسپی سەفەویدا، تاران کەوتە ڕوو ئەم شاهە کە پایتەختی قەزوین بوو، لە کاتی ڕۆیشتندا بەرەو مەشهەد یا بۆ شەڕ کران، بەتارانا ڕائەبورد و ماوەیەک تییا ئەحەسایەوە بەم هۆیەوە ساڵی ٩٦١ کۆچی فەرمانی دا شوورەیەکیان بەدەوری تارانا کێشا، چوار دەرگا و ١١٤ کونگەرەیان بۆ دروست کرد، دەڵێن ژمارەی کونگەرە و بورجەکان... بەپێی ژمارەی سورەتەکانی قورئانی کەریم بوو، بۆ پیرۆزی... قوڕ و خشتی شوورەکە و کونگەرەکان لەو جێیانە ئامادە کرابوو کە ئەمڕۆ بەناوی (چاڵە مەیدان) و (چاڵە حەسار) بەناوبانگن. شوورەکە، بەجۆرێکی گۆتیرەیی، نەوەک ڕاست و ڕەوان ئەکەوتە ناوەندی ئەم جێیانە... واتا لای باشوور و خوارووی شوورەکە شەقامی مەولەویی ئەمڕۆ بوو... لای خۆرهەڵاتی شوورەکە، شەقامی ڕەیی ئەمڕۆ بوو... لای خۆرئاوای شوورەکە شەقامی شاهپوری ئەمڕۆ بوو، لای باکوری شەقامی ئەمیر کەبیری ئەمڕۆ و مەیدانی سپا بوو... لە ناوەندی تاراندا سەرای دەوڵەتی دروست کرابوو، کە پێی ئەوترا (ئەرگ دەوڵەتی). دەوروبەری چوار دیواری شوورەکە خەندەق بوو، واتا تارانی دەورانی شا تەهماسپ بریتی بوو لە گەڕەکەکانی (عەولا جان - چاڵە مەیدان - و بازاڕی گەورەی ئێستە).

سالّی ۹۹۸ کۆچی، شا عەبباسی سەفەوی کە لە قەزوینەوە بەلەشکرەوە گەیشتە تاران و نەیەویست بچێت بۆ بەرەنگاریی عەبدولمومین خان ئوزبەگ، لە تاران نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکە قورس بوو، تا چاک بووە، ئوزبەگ خوراسانیان داگیرکرد لەبەر ئەوە شا عەبباسی ڕقی لە تاران هەستا و، پایتەختی ئێرانی لە قەزوینەوە گوێزایەوە بۆ ئیسفەهان و، کەمتر بەشاری تاراندا ڕائەبوورد، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی ئەدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی و کاخ چوار باغی تیا دامەزراند... و تاران بەبازاڕ و خان و کاروانسەرا کەوتە ئاوەدانبوونەوە.

گوێگرە خۆشەویستەکان باسی تاران دوایی هەیە تا وتاری ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

۱۳۵٤/٤/۱۰

## وتاری: ١٧١

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن، لە وتاری پێشوودا وتمان شاری تارانی ئێستە، کە پایتەختی وڵاتی ئێران و، بەبووکی ڕازاوەی خۆرهەڵات ناوئەبرێ، لە سەدەی چوارەمەوە تا نیوەی سەدەی دەیەم دێیەکی بچووک بووە پاش ئەوە کەوتۆتە برەو و پەرەی سەندووە.

هەندێ لە مێژوونووس و فەرهەنگی جوغرافیائی نووسەکان مێژووی تەهرانیان کردۆتە پێنج بەشەوە:

بەشی یەکەم باسی تەهران لە کۆنەوە تا سەردەمی سەفەوی و، لە پێشا هەندێکمان لێ ڕوون کردەوە.

بەشی دووەم باسی تارانە لە سەردەمی سەفەوییەوە تا سەردەمی بنەماڵەی ئەفشاریە...

بەشی سێیەم باسی تارانە لە سەردەمی ئەفشارییەکان و زەندییەکاندا...

بەشی چوارەم باسی تارانە لە سەردەمی قاجارەکانا...

بەشی پێنجەم باسی تارانە لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەوییا...

موزیک

وەک وتمان لە سەردەمی سەفەویدا، بۆ یەکەم جار، شا تەهماسپی سەفەوی دەستووری دا بەوەی شوورەیێ بەدەوری تاراندا بکێشرێ، بۆ شوورەکە چوار دەرگای زل دروست کرا و، ١١٤ بورج و کونگەرەشی، بەژمارەی سوورەکانی قورئان بۆ پاراستنی دامەزرێنرا. لە ناوەندی تارانی ئەو حەلەدا سەرای دەوڵەتی دروست کرا، کە پێی وترا (ئەرگ دەوڵەتی).

بەچوار دەوری سەراکەدا، هەم شوورە کێشرا و، هەم چوار خەندەقی قووڵ لێ درا، کە هەمیشە پڕ بوون لە ئاو، بۆ ئەوەی ڕێی دوژمن بەربەست بکرێ لە شاڵاوی ناکاو بۆ سەر سەراکە. خەندەقی لای خۆرهەڵاتی سەراکە، ئەکەوتە ئەو جێگەیەی ئێستەکە بۆتە شەقامی ناسر خوسرەو... خەندەقی لای خۆرئاوای سەراکەش ئەکەوتە جێگەی شەقامی خەیامی ئێستەوە، کە لای ژووری شەقامی سپەهی ئێستە بوو... لای خواریش چوار ڕێیانی ئێستەی گەلوبەندەک بوو خەندەقی باشووری سەراکەش ئەکەوتە ئەو بەشەی بۆ ژوور جومهەری کە لە چهار ڕێی گەلوبەندەک بەرەو ژوور، تا کلکەی خوارووی ناسر خوسرەوە.

بەشی لای خۆرئاوا و، باکوری خۆرئاوایی تاران، کە لە ناو شوورەکەدا بوو، هەموو باغ و چنار بوو. بەشی نیشتەجێی خەڵقی دێیەکە کە پەرەی ئەسەند و ئەبوو بەشار، گەڕەکەکانی (عەوڵا جان و، چاڵە مەیدان و، سەنگلەج) بوو... بەدەستووری شا تەهماسپ بازاڕێکی گەورەش دامەزرابوو، کە پێی دەوترێ (چهار سوق بزورگ) ساڵی ١٦١٨زایینی کە ئەکات ١٠٢٨ی کۆچی کابرایەکی ئیتالیائی کە ناوی (پیترو - دلا - واله) بووە بەتەهراندا تێپەڕیوە، شاری تارانی بە ٣ هەزار ماڵ داوەتە قەڵەم، وای نیشانداوە کە لەو سەردەمەدا شاری تاران لە کاشان بچووکتر بووە و، دانیشتوانیشی زۆر کەمتر بووە.

شا عەبباسی سەفەوی کە ویستبووی بچێ بۆ بەرەنگاریی مەلیک ئەشرەفی ئەفغان، چون لە ڕێ لە تاران نەخۆش کەوتبوو و بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە، لە شەڕ دواکەوتبوو و، ئەشرەف خوراسانی داگیرکردبوو، شا عەبباس بڕیاری دابوو، پایتەخت لە قەزوینەوە بگوێزێتەوە بۆ ئەسفەهان و هیچ کاتێ بەنزیک تارانیشا ڕانەبوورێ. شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی، شەوی شاڵاوی ئەفغان بۆ سەر ئەسفەهان، لە تاران بوو، لەوێ دوڕی ئەفەندی عوسمان باڵیۆزی سوڵتان ئەحمەدی سێیەمی پادشای عوسمانی وەرگرتە حضور... بەڵام ئەفغان بەسەر شا سوڵتان حوسێندا زاڵ بوون...

پاش ئەوە شاسەفی سەفەوی، تارانی کردە بنکەی سپای و پادەگان نیزامی و، دوو بورج و کەلوی گەورەی تیا دامەزراند...

موزیک کوتا

نادر شای ئەفشار ساڵی ١١٥٤ کۆچی، تارانی خستە ژێر دەسەڵاتی ڕەزا قولی خانی کوڕە گەورەی خۆی، پاش مەرگی نادر شا و، ئاژاوە کەوتنەوە لە نێوانی کوڕەکانیدا عادل شا ئەفشار ڕای کردە تاران ویستی خۆی تیا قایم بکات... بەڵام کە دەوڵەتی ئەفشار ڕووخا، قاجارەکان هەوڵیان دا تاران بکەن بەبنکەی خۆیان... بەڵام کەریم خانی زەند مەیدانی نەدان، لەگەڵ محەممەد حەسەن خان قاجار کەوتنە شەڕەوە و ئەو هەرێمانەی پاک کردەوە، ساڵی ١١٧٢ک کەریم خان زەند گەیشتە تاران و فەرمانی دا کە لە تاران، کۆشکێکی شاهانە و دیوانخانەیەکی گرنگ و حەرەمسەرایێ دروست بکرێ و خەیاڵی وەهابوو کە تاران بکاتە پایتەختی دەوڵەت... بەڵام ساڵی ١١٧٦ کۆچی، دامودەزگای دەوڵەتی زەندی بردە شاری شیراز... بەڵام تارانی لەبیر بردەوە، دەستووری دا لەو باغە چنارە زۆر گەورەیەدا، کە بەر لە عەهدی سەفەوی لای خۆرئاوای باکوری تەهران هەبوو و،

شا تەهماسپ خستبوویە ناو شوورەی شارەکە قەڵا و بورج و بارویەکی زۆر بەشکۆی تیا دروست بکرێ و، ساختمانێکی بچووکیش بەناوی (خەڵوەتخانەی کەریمی) بۆ ئەو دروست بکرێ.

ئەمە بوو باسی مێژوویی تاران، تا سەردەمی دەورانی قاجار، لە وتاری ئایندەدا باس لە تارانی سەردەمی قاجار و سەردەمی پەهلەوی دەکەین، ئێستە کاتمان تەواوبوو، خواتان لەگەڵ.

١٣٥٢/٤/٢١

## وتاری: ١٧٢

گـوێگرە بەڕێزەکـان ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان هەر شـادی بێ... لە وتـاری پێشـوودا گەیشتینە ئەوێ کە کـەریم خانی زەند لە سەرەتادا بڕیاری دابوو تاران بکاتە پایتـەخت، بەڵام لە دوایییـا گـواستییـەوە شـیراز... تەنیـا لەو باغـە گەورەیەی تاراندا، کە پێی دەوترا (باغی جەننەت) دیوانخانە و حەرەمسـەرایەکی دامەزراند، بۆ ئەوەی هەر کات ڕێی کەوتە تاران لەوێدا بمێنێتەوە. ئەو جێگەیە تا ئەمڕۆش هەر مـاوە، ئەکەوێتە بەشی باکووری لای خۆرئاوای باغی کـاخی گـوڵسـتـانەوە و پێی ئەوترێ (خـەڵوەتی کـەریم خـانی)، بەتەک ساختمانی مۆزە، واتا دێرینە خانەکەوەیە.

پاش کـۆچی دوایی کـەریم خـانی زەند، ئاغـا مـحـەمـەد قـاجـار بڕیاری دا تاران بکاتە پایتەخت، چون نزیک بەگورگان و ئەستەر ئاباد بوو، کە عێڵاتی قاجارییان تیابوو... بەڵام لە سـەرەتادا نەیتـوانی بگاتە تـاران چون ناحـەزانی شـەش سـاڵی ڕەبەق ڕێیـان نەدا و، خەڵقی تارانیش بەرەنگارییـان کرد. ئەوەبوو ڕۆژی ٣٠ مـانگی سەفـەری سـاڵی ١١٩٣، واتا دووسـەد و دوو ساڵ لەمەوبەر بەسپاوە هاتە شا عەبدولعەظیم - واتا شاری ڕەی و لەوێ لەسـەر تەختی پادشـایی دانیشت، بەڵام خۆی ئەمەی بەکـارێکی دەمی و مـوەقـەتی دایە قەڵەم و، شـاری تارانی گـەمارۆدا... سەرئەنجام سـاڵی ١٢٠٠ کۆچی تاران خۆی دا بەدەستـەوە و ئاغـا مـحـەمـەد قـاجار هاتە ناوی و کردی بەپایتـەختی خۆی و، بەجـۆرێکی ڕەسـمی و دیوانی تاجی لەسـەرنا... ئەو حـەلە تاران شـارۆلکەیەک بـوو... دانیـشـتـوانی لە ٢٥٠ هەزار کەس تێ نەپەڕی...

ئاغـا مـحـەمـەد خان، زۆر شـانازی بەنـازایی عێلە قـاجارەکانەوە دەکرد بەڵام کە قـاجاری ئاشـا قـەباش لە هەرێمی قەفقـاز بەرامبـەر بەسپـای ڕووس شکان، ئاغـا مـحـەمـەد ڕقی لێ بەستن، تیـرەی ئەشـا قـەباشی لە تاران دامـەزراند، لای خۆرهەڵاتی تارانی ئـەو حـەلەوە و، هەمـوو پیـاوەکانی خـستـە بەردەمی شـمشـێر و قڕانی کـردن، ئەو گەڕەکەی مـاڵە قـاجارەکـانی تیـا مـابوونەوە، تا ڕۆژگـاری موشـیر الدەولە حەسـەن پیرنیـا هەر ئاوەدان بوو... بەڵام موشـیر الدەولە ئـەو گـەڕەکـەی بەنەنـگ ئـەزانی بـۆ تـاران، وێـرانی کـرد و، مـاڵەکـانی گـواسـتـەوە بـۆ لایانی تری.

ئاغـا مـحـەمـەد، کـە هەمـیـشـە لە دوژمنان و ناحـەزانی ئەترسـا، بەچوار دەوری ئەرگی

سەڵتەنەتییا -واتا بەدەوری سەراکەدا- خەندەقی لێ دابوو... ئەم خەندەقە ڕێی لەو دوژمنانە ئەگرت کە بیانەوێ لەناکاو شاڵاو بکەنە سەر ئەرگی سەڵتەنەتی. ئەم خەندەقە تا سەردەمی ناسرەدین شای قاجار هەرمابوو، ئەو فەرمانی دا بەپڕکردنەوەی، شوێنی خەندەقەکە بریتییە لە شەقامەکانی (سپە - خەییام - بوز و جومهەری. ناسر خوسرەو)...

## موزیک

لە ساڵانی ١٢١٢- و تا ١٢٥٠ کۆچی، کە سەردەمی پادشاهی فەتح عەلی شا قاجار بوو، هەندێ گەڕەک و ساختمان خرایە سەر تارانی کۆن... (مزگەوتی شا) کە ئەکەوێتە ناو بازاڕ و، مزگەوتی سەید عەزیزوڵلا و، مەدرەسەی مەروی و، کاروانسەراکانی نێوانی چوار سوق تا سەید ئیسماعیل و گوزەری بابا نەورۆز عەلی لە گەڕەکی چاڵەمەیدان... و بازاڕچە و تەکیەی مەنوچەهر خان، لە بەشی لای خۆرئاوای بازاڕ و باغەکانی قەسر قاجار -کە ئەکەوتە کەناری جادەی شمیرانی کۆن- و باغی نیگارستان -کە ئەکەوتە نێوانی شەقامی کەمال الملک و پاومانی لای باشووری شەقامی عەلائی و لالە زاری ئێستەوە. ئەمانە هەمووی لەو جێیانە بوون، کە لە سەردەمی فەتح عەلی شادا، لە دەرەوەی شاری تاران دامەزرابوون.

لە سەردەمی محەمەد شای قاجاردا کە لە ١٢٥٠ و تا١٢٦٤ کۆچی پادشابوو، حاج میرزا ئاغاسی وەزیری هەوڵی دا، چەند گەڕەکێکی خستە سەر تاران وەک گەڕەکی عەباس ئاباد کە ئەکەوێتە لای خوارووی بازاڕەوە و گەڕەکی محەمەدییە کە نزیکی مەیدان ئیعدامی ئێستە بوو ئەمانە هەمووی لە سەردەمی محەمەد شا قاجاردا هاتەدی هەروا بازاڕی بەین الحەرەمەین کە ئەکەوتە نێوانی دوو حەرەمی مزگەوتی شا و مزگەوتی جومعەوە، لە سەردەمی محەمەد شادا دروست کراوە. لە سەرووی تارانیشەوە، باغی لێ درابوو بەناوی باغ عەبباس ئاباد.

لە سەردەمی پادشاییی ناسرەدین شای قاجاریشدا، کە لە ١٢٦٤ەوە تا ١٣١٣ پادشا بوو، ئەم کارانە ڕێک خرا... سەرای دەوڵەتی دووبارە تازە کرایەوە، جۆگەیەکی گەورە لە کەرەجەوە ڕاکێشرا بۆ تاران و، لای ژووری باغی نیگارستانەوە ئەهاتە ناو شارەوە و بازێڕی کەوش درووەکان -کە لە نێوانی سەوزە مەیدان و ئیمامزادە زەید دایە- و بازاڕی ئەمیر کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ بازاڕی بەزازەکان و، سەرای ئەمیر کە سەرای ئەتابەگییەشی پێ ئەڵێن، ئەمانە هەمووی لەو سەردەمەدا پێکهێنراوە کە ئەمیر کەبیر سەرەک وەزیری

دەوڵەت بوو. جگە لەمانە دروستکرانی (دار الفنون) کە یەکەم باک بوو بۆ پەیدابوونی بیر و دامەزرانی زانکۆ و زانستگا... لەم سەردەمەدا بوو.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

## وتاری: ۱۷۳

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، سەربەرزی و پێشکەوتنتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆ ئێرانە... لە وتارەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کردبوو کە شاری تەهران لە سەرەتادا شارۆلکەیەک بوو شوورەدار، پاش ئەوەی کە ساڵەها بەپایتەختی مایەوە و پەرەی سەند و، خەڵق لە دەرەوەی شوورەکە خانوو و کۆشک و تەلار و ساختمانی زۆریان دروست کرد، ساڵی ۱۲۸٤ کۆچی کە ساڵی بیست و یەکەمی پادشایەتی ناسرەدین شا بوو، بڕیار درا بەڕووخاندنی شوورە کۆنەکە و، کێشانی شوورەیەکی تازە بەدەوری شارەکەدا... جا لە هەر چوار لاوە بەم جۆرە، پەرە بەشارەکە درا... و دەروازە تازەکان دامەزرێنرا و، خەندەقی تازە لێ درا... خەندەقەکان، لای باکورەوە ۱۸۷۲ مەتر، لە شارەوە دوور و، لای سەلای خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باشووریشەوە هەریەکە ۱۰٤۰ مەتر دووربوون. لە هەرلایەکەوە سێ دەروازەی بۆ ناو شار دامەزرێنرا، ئەم دەروازانە لەسەر دیمەنی خۆرهەڵاتی پەتی بوو... واتا بەوێنەیەکی کاشیکاری جوان و، بەمنارەی بچووک ڕازاندرابوونەوە... دەروازەکان ئەمانە بوون: لای باکوری شاری تەهرانەوە، دەروازەی شمیران، دەروازەی دەوڵەت، دەروازەی یوسف ئاباد هەبوو... لای خۆرهەڵاتی شاری تەهرانەوە دەروازەی دەوشان تپە -دەروازەی دولاب- دەروازەی خوراسان هەبوو... لای خۆرئاواوە دەروازەی باغشا، دەروازەی قەزوین - دەروازەی گومرگ- و لای باشوور و خواری شاریشەوە بەرەو لای ڕەی ئەم دەروازانە هەبوون: دەروازەی شا عەبدولعەظیم -دەروازەی غار- دەروازەی خانی ئاباد هەبوو. خەندەقەکانی دەوری شار، لەسەر چەشنێکی هەشت سووچی لێ درابوون... ئەم دیمەنە لە دیمەنی شاری پاریسی ئەو حەلەوە، نەخشە کێشرابوو. پاشان شەقام گەلێکی تری دامەزرا، لە دەرەوەی خەندەقەکان، ئەم شەقامانەی ئەمڕۆ بەم ناوانە بەناوبانگن: شاهرەزا لای باکورەوە... شەهباز لای خۆرهەڵاتەوە... سی مەتری نیزامی لای خۆرئاواوە... شوش لای باشوورەوە. ئەم پەرەسندنەی شاری تاران بوو بەهۆی ئەوەی کە باغی نیگارستان و، باغی لالەزار و، باغە گەورەکانی تری بنبڕ بکرێن...

باغە بەناوبانگەکانی سەردەمی فەتح عەلی شا و، ناسرەدین شا ئەمانە بوون:

- پارکی ئەتابەگ، میرزا عەلی ئەسغەری خانی سەرەک وەزیر، دایمەزراندبوو، ئەکەوتە

جێگەی باڵیۆزخانەی جەماهیری شوورەوی ئێستە...

- باغی بەهارستان، کە پاشان مزگەوتی سپاهسالاری و، قوتابخانەی ئاینیشی لەپاڵدا دروست کرا، ئەم باغە لە لایەن حاج میرزا حوسێن خان سپاهسالاری سەرەک وەزیری سەردەمی ناسرەدین شاوە دورست کرابوو لە جێگەی ئەمڕۆی مەجلیسی شورای مللی و، کتێبخانەی مەجلیسدا بوو...

- پارک مەسعودییە: هی سوڵتان مەسعود میرزا ظل السلطان کوڕی ناسرەدین شا بوو، لە جێگەی ئەمڕۆی وەزارەتی فەرهەنگدابوو. بەدرێژایی لە شەقامی خەیامی ئێستەوە، بەرەو ژوور ئەکشا، لایەکی شەقامی سەفی عەلی شا و لایەکی شەقامی خانەقا خەیامی ئێستە بوو. لە ژوور شەقامی ژاڵەی ئەمڕۆوە، پارکی یەکجار زل هەبوو، هی حاج میرزا عەلی خان ئەمین الدولە لە سەرەک وەزیری سەردەمی و موزەفەرەدین شا بوو... سەرتاسەری شەقامی ئەمیرییەی ئەمڕۆ باغی بوو، پێی ئەوترا پارکی ئەمیرییە، هی کامەران میرزا نائب لسەڵتەنە کوڕی ناسرەدین شا بوو - باغی گوڵستان، کە ئەمڕۆ بەکاخی گوڵستان بەناوبانگە، لە سەردەمی سەفەوییەوە تا ئەمڕۆ هەر لەسەر وەزعی خۆی ماوە، تەنیا ئەو ساختمانی کاخ و تالارانەی تیا کراوە، کە هەندێکیان هی سەردەمی کەریم خانی زەند و هەندێ هی سەردەمی ئاغا محەمەدی قاجار و، هەندێ هی سەردەمی فەتح عەلی خان و، هەندێ هی سەردەمی ناسرەدین شایە.

- باغی وەلی ئاباد ئەکەوتە ئەمبەر و ئەوبەری شەقامی هیدایەتی ئەمڕۆ، هی محەمەد وەلی خان خەلعەتبەری سپەهسالاری ئەعزەم بوو ئەمڕۆ جێگەی ئەو باغە پێی ئەوترێ گەڕەکی (وەلی ئاباد).

- لای خۆرئاوای شاری تەهرانەوە، باغی شعاع السەڵتەنە هەبوو، هی کوڕی موزەفەرەدین شا بوو، ئەگەیشتە دەروازەی باغ شای ئەمڕۆ.

- باغی لالەزار: ئەکەوتە نێوانی شەقامی ئەکباتان و، چوار ڕێیانی موخبر الدەولە و، شەقامی ئەمڕۆی لالەزار و، سەعدی. لە سەرەتادا ئەم باغە، جەنگەڵی جانەوەرانی کێوی و کەوی بوو. لە هەر جۆرە گیانلەبەرێ نموونەیەکی تیابوو... لە سەردەمی قاجاردا بەشەقامی سەعدی ئەمڕۆیان دەوت (شەقامی باغ وەحش) پاش ئەوەی گیانلەبەرەکانیان گوێزایەوە، بۆ باغی دەوشان تەپە، ئنجا ناوی ئەم شەقامەیان نا (شەقامی لوختی)...

- باغی ئیلخانی: باغێکی زۆر گەورە بوو، لە ناوەندی شاری تەهرانی کۆندا بوو،

ئەکەوتە نێوانی شەقامی سێیەمی ئەسفەند و شەقامی شاوە، ئەو جێی کە پێی دەوترێ شەقامی نادری. جگە لەمانە لە دەوروبەر و ناو تەهراندا باغ و باغچەی زۆربوو، بەڵام لە چل ساڵ لەمەوبەر بەرەوە، ئیتر زەوی کەتە برە و، زەوی خۆران کەوتنە کڕینی زەویوزار و، بڕینی باغ و باغچەکان و، خانووکردن تیانا... بەم جۆرە باغەکانی کۆنی تەهران، زۆربەی لەناوچوو، لە باغە گەورەکانی تەهرانی کۆن، باغی نیاوەران ماوە، کە پێی ئەوترێ (ساحێب قڕانیە و باغی سورخە حەصار) و باغی شەهرستانەگ و باغی توغروڵ لە شا عەبدولعەظیم.

گوێگرە بەڕیزەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو، لە وتاری ئایندەدا باسی ساختمان و کۆشک و تەلارە گرنگەکانی تەهرانی کۆن دەکەین جارێ بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٤/٥/٨

**وتاری: ١٧٤**

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان کامەرانی و شادی بێ...

ئێمە لەسەر باسی تەهران ئەڕۆین. لە وتارەکانی پێشوودا وتمان تەهران بەرلەوەی ببێ بەشار و بەپایتەخت دێیەکی گەورە بوو باغ و دارستانی زۆربوو، تەنانەت چنار... تا ئێستەش لەو چنارە کۆنانە هەر ماوە، یەکێ لەوانە دارە زلەکەی حەوشی ئەرکە کە لەمەوبەر وەزارەتی کیشوەر وەزارەتی ئیتلاعاتی تیابوو و، ئەمڕۆ بەشی بەدی هێنەری رادیۆکانی ئێرانی تیایە.

ئەوە بوو لە وتارەکانی پێشوودا، ناوی هەندێ لەو باغ و باغچەیانەمان برد کە ئەمڕۆکە لە جێی ئەوان بازاڕی لالەزار و، مەجلیسی پەرلەمانی وکەلا و، باڵیۆزخانەی شوورەوی و کاخی گوڵستان و، هی تری دامەزراون... بەڵام هەندێ لەو باغانەی کە لە سنووری تارانی کۆن بەرەوەوەبوون، ئەمڕۆ چەند باغێکیان ماوە... و چەندێکیان لەنێو براوە... بۆ وێنە: لەو باغە گەورەیانەی کە لای خۆرئاوای تارانەوە بوون، ئەمڕۆ تەنیا باغ شا ماوە... گەرچی ئەمڕۆ شوێنی ڕابواردن و، کەرەسەی یاری منداڵانی تیا دروست کراوە، وەک: هەڕەزانی، دیلانی، چەرخ و فەلەک و شتی تر... بەڵام ئەو جوانییە و، ئەو دارە میوە گرانەی تیا نەماوە کە لە کۆنا هەبووە. لای خۆرهەڵاتی شاری کۆنی تارانەوە، باغی ڕەوشان تەپە و، فەرەح ئاباد هەر ماون، نزیک بەکێوی سێ پایەن... لای باشووری قەسری قاجارەوە -کە ئەمڕۆ بەزیندانی قەسر بەناوبانگە- باغێکی زۆر گەورە هەبوو، لەسەرەتادا بەشێکیان لێ دابڕی بۆ سەربازخانە و، پاشان ئیستگای (بێ سیم) واتە بەبێ تەلی شار و، بارەگای ئەرکانی سپا -کە پێی ئەوترێ ستادکل- تیا دامەزرا و، بەشێ لە باغە کۆنەکە لە حەوشەکەیا هەر ماوە. لای باکوری خۆرهەڵاتیی کۆنە شاری تارانەوە، باغێکی گەورە هەبوو پێی ئەوترا (عشیرەت ئاباد) ئەمڕۆ جێگەکەی سەربازخانەیەکە، لە سەرەڕێی شمیران -کە پێی ئەوترێ جادەی قەدیم و، ئەمڕۆ ناوی شەقامی کۆرشی گەورەیە- و ڕێگەکە بەرەو نیاوەران ئەچوو باغێ گەورە هەبوو نێوی (باغی سەڵتەنەت ئاوا) بوو، گەرچی هەندێ لە دارەکانی هەر ماوە، بەڵام کارخانەی چەکسازی سپای تیا دامەزرابوو...

ئەمانە زۆرتر لە لایەن دەوڵەتەوە ئیدارە ئەکران... باغی بچووکی تایبەتی خەڵقی ئەو ناوەش زۆر هەبوون، وەکو باغی سەبا کە ئەکەوتە لای خۆرئاوای شەقامی کورشەوە... و

باغی فیردەوس کە ئەکەوتە گۆشەی لای باشووری شەقامی پەهلەوییەوە و، باغی کامەرانییە کە هی کامەرانی میرزای کوڕی ناسرەدین شا بوو، لە نێوانی دز ئاشوب و نیاوەراندا بوو. هەروا باغی گەورەی عەباس ئاباد کە ئەو حەلە ئەکەوتە لای باکوری تەهران و، تا ئەمڕۆش بەشێ لەو باغە هەر ماوە... و لای بەشی باکووری خۆرئاوای تارانەوە، دوو باغی گەورە هەبووە پێیان ئەوترا باغی بەهجەت ئاباد و باغی یوسف ئاباد کە هەردووکیان هی میرزا یوسف موستەوفی مەمالیک بوون کە سەرەک وەزیری سەردەمی ناسرەدین شای قاجار بوو. و جێی ئەم دوو باغە ئەمڕۆ دوو گەڕەکی زۆر گەورەی شاری تارانن و، هەندێ لەو باغانەی دەوری تاران کە لە لایەن زەوی خۆرەکانەوە فرۆشران، گەڕەکی گەورەیان لە جێ دروست کراوە، وەک گەڕەکی وەلی ئاباد کە لە پێشا باغ بوو. وەیا گەڕەکی فەخر ئاباد و گەڕەکی باغی سپاسالاری...

جگە لەم باغانە لە ناوەندی تاراندا سێ پارچە زەوی هەبوو، تەرخان کرابوون بۆ سەوزەکاری و شینایی و چەمەنکاری یەکێکیان پێی ئەوترا (تەخت زومروت) چون هەمیشە سەوز بوو.

یەکێ تری لە باغەکانی سەڵتەنەتی کۆن کە تا ئەمڕۆ هەر ماوە، باغی سورخە حەسار، کە ئەکەویتە سەرەڕێی دەماوەند و، هەروا باغی نیاوەرانیش کە پێی ئەوترا ساحێبقڕانییە هەر ماوە و، باغی شەهرستانەکیش کە ئەکەوتە لای خۆرهەڵاتی پایتەخت و باغی توغرولیش لە شاری ڕەی، ئەم دووەش لەنێوچوون...

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین شادیتان هیوامانە.

١٣٥٤/٥/١٣

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

لە بەرنامەکانی پێشوودا لە مێژووی تەهران دواین، ئینجا باسی باری جوغرافیایی و ئابووری و ڕێکوپێکی و ئاوەدانی و، پێشکەوتی ئەم شارە دەکەین...

وتمان شاری تەهران لە سەردەمی ئاغا محەمەد خانی قاجارەوە بووە بەپایتەخت و، لە دیمەنی لادێیی دەرهاتووە و، دیمەنی شاری گرتۆتە خۆی و، پەرەی سەندووە و، ساختمان و کۆشک و تەلار و، باغ و باغچە و مەیدانی تیا دروست کراوە و، یەکەم قوتابخانەی بەرزی تیا دامەزراوە بەناوی (دار الفنون) ئەویش لە سەردەمی ناسرەدین شا قاجاردا و یەکەم نەخۆشخانەی ئاسایی تیا دامەزراوە لە جێی ئەمڕۆی بیمارستانی سینا. هەروا بۆ ڕۆشنکرانەوەی پایتەخت، لە شەقامی ئەمیر کەبیری ئەمڕۆ ماکینەیێ دامەزرا بەناوی (چراغ گاز)، بۆ ئەوەی فانووسەکانی شار لەوێ ئامادە بکرێ و، ببرێ بۆ هەڵواسین، پاش ئەوە ماکینەی چراغ گازەکە گۆڕدرا بەماکینەی کارەبا و بەرق و بۆیە تا ئەمڕۆش زۆر کەس بەشەقامی ئەمیر کەبیر، هەر ئەڵێن (خیابانی چراغ گاز) و (خیابانی چراغ بەرق) و، زۆریش هەوڵ درا کە ئاوی تاران بکرێ بەلوولە و بۆڕییە، هەر لەو سەردەمەدا ویستیان چەندین چاڵی قووڵی ئورتوازی لێ بدەن کە ئاو بۆ ناو شار ئامادە بکەن، بەڵام ئەو ئەسکەنەیە و (مته)یەی کە زەوییەکەی پێ هەڵدەکەنرا شکا و، ئەندازیارە ئەوروپاییەکان لەبەر نەبوونی کەرەسەی ڕێڕەوی وەک ئۆتۆمۆبێل و شەمەنەفەر، وازیان لە دەرهێنانی ئاو هێنا... هەر لەو دەمەدا لە نێوانی شاری ڕەی و شاری تاران هێڵێکی ڕێ ئاسن بۆ شەمەنەفەر دامەزرابوو، قەتارێک بەسەریا ئەڕۆیشت پێی ئەوترا (ماشین رودی) واتا (شەمەنەفەری دووکەڵدار)... لەمانە بەولاوە تارانی پایتەخت، هیچ جۆرە پێشڕەوتێکی نەبوو. بۆ ئاو دوو جۆگە لە کەرەجەوە هەڵگیرابوو، بۆ تاران... بەڵام کە سەرنجی ئەوە درا لەگەڵ ڕۆژگاری بەرەو پێشڕەوا، یەک ناگرێ، چەندین کارێزیان لێ دا بەو خەیاڵەی ئاوی هەموو کارێزەکان لە جێگایێ کۆبکەنەوە و، بەلوولە بەناو شارەکەدا بەش بکەن ئەو حەلە مەکینەی ئاو هەڵدەر، بۆ بەرزی، لە ناوا نەبوو، دەبوایە ئاوی کارێزەکان بەگونج و لوولەی گڵێنە بەش بکەن. وەک ساڵەها لەوەبەر لە هەندێ جێگەی تری کرابوو... بەڵام ئەوەش

سوودی نەبوو. هەرکە ڕەزا شای مەزن هاتە سەرتەختی سەڵتەنەت داوێنی هیممەتی کرد بەدارا، چاکی لێ هەڵماڵی، پایتەختی ڕازاندەوە. شەقامەکانی لێ دا. کە لە سەردەمی ئەوا خەڵقی سەریان سوور ئەما کە ئەم شەقامە پانوپۆڕانە چییە؟ و بۆچ هێندە بەرین و بەربڵاون...؟ زانکۆی تاران دامەزرا، بەو ساختمانە چەند نهۆمانە و، بەو لق و بەشانەوە کە لەو حەلەدا بریتی بوون لە زانستگەکانی ئەدەبیات و علوم ئینسانی، علوم تەربیەتی علومی پزیشکی، علوم ئیداری، ئیلاهیات و مەعارف ئیسلامی، حقوق، فەننی، هونەرهای زیبا، کیشاوەرزی، دام پزیشکی، داودەرمانسازی و، ئیقتیساد و ئابووری... کە ئەم زانستگەیانەی لقی زانکۆی تاران، بناغەی بنەڕەتیی بوون بۆ زانکۆکانی ڕۆژگاری ئێمە و، ئەو زانستگە و زانست سەرا و، قوتابخانەی بەرز و قوتابخانەی هونەرییانە کە ئەمڕۆکە بەسەدان، دروست کراون، نەوەک هەر لە تارانی پایتەختدا، بەڵکو لە زۆربەی شارە گەورەکاندا وەک مەشهەد - شیراز - ئەسفەهان - ئابەدان - تەورێز... و هەندێ لە لقی زانستگە لە کرماشان و، هەمەدان و، ڕەزائییە و ڕەشت و سەدان شاری تر... جگە لەمانەش وترا زانستگەی جەنگ و، مۆزەخانەی پێنج نهۆمی و، کتێبخانەی میللی و بانکی میللی ئەمانە هەموو هی سەردەمی ڕەزا شای مەزنن. ساختمانی وەزارەتەکانی مەیدانی ئەرگ، وەکو وەزارەتی دارایی، کە خەڵقی شەیدای جۆری ساختمانەکەی ئەبوون، وەیا وەزارەتی داد گوستەری، کە نەخش و نیگارەکانی دەوروبەری، تەرازووی عەدالەت و، جۆری موحاکەمەکردن و جۆری تاوانباری و بێ تاوانی ڕوون ئەکاتەوە... هەروا وەزارەتی ئابووری... و لەولایشەوە شارەبانی گشتیی وڵات، وەزارەتی دەرەوەی وڵات و... باغە زلەکانی پارکی شەهر و، زۆر ساختمانی تری وەک ساختمانی ڕاە ئاهن، هەموو هی سەردەمی ڕەزا شای گەورەیە خۆ ئەو چیایانەی هەڵکۆڵراون، بۆ ڕێی ئۆتۆمۆبێل و شەمەنەفەر کون کراون، هێندە زۆرن نایێنە ژمار.

چی لە ڕێی تاران بەرەو باکور، کە بەرەو ییلاق و هاوینەهەواری وڵات ئەڕوا... چی لە ڕێی ئاوەدان و ئەهواز کە بەرەو کانگاکانی زێڕی ڕەش ئەڕوات... چی لە ڕێی کرماشان و قەسری شیرین کە خەڵقی یاد لە بێستون و لە شوێن قوڵنگەکانی فەرهاد ئەکەنەوە.

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواو ئەبێ بۆ وتاری ئایندە چاوەڕوان بن جارێ بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ...

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و کامەرانی بەسەربەرن لە وتاری ڕابردووا، ئاوی هەندێ لەو ساختمانە بەشکۆیانە و، لەو کارە بەرزانەمان برد، کە لە سەردەمی شاهیێتی شاهەنشای مەزن ڕەزا شای گەورەدا دامەزرابوون و، نەدەبوو ئاوی هەموو کارە گرنگەکانی ئەو لە وتارا تۆمار بکەین، چون ژمارەی ئەو کارە گرنگانە ئەوەندە زۆرە پێتەویستمان ئەکات بەنووسینی سەدەها وتار... ئێمە ئەمانەوێ لەو باغانەی کە ئەو پێی گەیاندووە لە هەریەکەیان گوڵێ؛ و لەو خەرمانە پڕ پیت و فەڕانەی کارە جوانەکانی لە هەریەکە نموونەیێ، بخەینە بەرچاو و بیدەین بەگوێی بیستیاری بەڕێزدا... لەمەودوا ئەکەوینە باسی ئەو کارانەی پاش سەردەمی ئەو گەورەیە، لە کیس چووە، بەهەشتییە، ئەنجام دراوە...

**جا ئێمە لەم وتاردا لەوە ئەدوێین کە ئاو بۆ شارێکی وەکو تاران چلۆن ئامادە کراوە، کە ئەم شارە لە ڕۆژگاری ئێمەدا، بەشەو ژمارەی خەڵکەکەی ئەگاتە پتر لە سێ ملیۆن و، بەڕۆژ لە چوار ملیۆنیش تێ ئەپەڕێ.**

**موزیک کوتا**

با لە سەرەتادا ئەوە بڵێین، لە دەورانی قاجار و، لە سەرەتای شاهیێتی بنەماڵەی پەهلەوییا ئاوی تاران سەر بەشارداری بوو. لە سەردەمی قاجاردا ویستیان بیری ئورتوازی و چاڵاوی قووڵ لێ بدەن، سەری نەگرت، ژمارەی کارێزەکانیان زۆر کرد و ئاوی تاران بەهۆی سەقاوە لە کارێزەوە بەشارا بڵاو ئەکرایەوە بەڵا لە سەردەمی شاهەنشاییێتی بنەماڵەی پەهلەوییا، تەنانەت لە ساڵی ١٣٢٠دا، هەست بەوە کرا کە دابینکردنی ئاو بۆ شاری تاران ئەبێتە هۆی گرفتاری لە سەرەتادا لە شەهریوەری ساڵی هەزار و سێ و سەد و بیست و پێنجدا کەوتنە باسی دامەزراندنی چەند کۆمیسیۆنی بۆ ئەوەی شاری تاران لوولەکەشی بکرێ و ئەم کۆمیسۆنە سێ ساڵی ڕەبەق خەریکی ئەخشە بەرداری شەقامەکان و کوچەکان بوو، ساڵی ١٣٢٨ کۆچی (واتا ساڵی ١٩٤٩ زایینی) بۆ بەڕێوەبردنی ئاوی تاران (سازمانی ئاو) دامەزرا و، ئەم سازمانە ساڵی ١٣٢٩ کەوتە لوولەکێشان بۆ ئاو شار. ئاوی کارێزەکانی لای سەرووی شار، کە نزیکەی ٣٥ کارێز بوو، لەگەڵ ئاوی ئەو بیر و چاڵە ئورتوزاییە قووڵانەی لێ درا، هەمووی خرایە عەمباراوی خاوێنکردنەوەکە پێی

ئەوترێ (تەصفیەخانە)، پاشان کە دیترا ئەو ئاوانەش بەش ناکا، سەد و بناوانەی کەرەج هەڵبەسترا و بەهۆی سێ موتۆڕی زۆر گەورەی کارەبایی و بەرقییەوە، ئاوی کەرەج هەڵدرا بۆ دێی بیلەقان کە لەوێ لە شەش عەماراوی زۆر گەورەدا، ئاوەکە بمێنێتەوە، تا گەرد و خاکی بنیشێ، لەوێوە ئاوەکە بەچەند موتۆڕی تر هەڵ ئەدرێ بۆ عەماراوی خاوێنکردنەوەکە پێی ئەوترێ (تەصفیە خانە) درێژایی بۆڕییە و لوولەکان، لە بناوانەی کەرەجەوە تا یەکەم عەمار خاوێن خانە کە لە جەلالیە سی و شەش کیلۆمەتر و نیوە، ئەم بۆڕییە و لوولانە لە (ثانیە)یێکا -کە ئەکات شەست یەکی دەقیقەیەک- هەزار و سێ سەد لیتر ئاویان پێیا ڕائەبوورێ... جگە لە یەکەم عەماری خاوێنکردنەوە، کە ناوی (جەلالییە)یە و عەماری دووەم لە (کەن) دامەزراوە... ئەم دوو عەمارە گەورەیە کە پێیان ئەوترێ خاوێن خانە، لە شەو و ڕۆژێکا پێنج سەد و چوار هەزار مەتری چوارگۆشەیی ئاو، خاوێن ئەکەنەوە و، بەهۆی پاڵەپەستۆی کارەبا و بەرقەوە ئاوەکە بەلوولەدا ئەخەنە ڕێ بۆ ناو ئەو عەماراوانەی لە هەندێ گەڕەکی ناو شار دامەزراون، ئەو عەماراوانەی کە لە پلەی دووەم دان، یا لە تانکی ئەلەمنیۆم دروست کراون و خراونە سەر سێ پێی زۆر بەرز... و یا ساختمانی لە چەمەنتۆ دروست کراون...

ئێمە لەم وتارەدا ناوی هەندێ لەو عەماراوانە دەبەین:

١- عەماری یوسف ئاباد - پەنجا و پێنج هەزار و پێنج سەد مەتری چوارگۆشە ئاو ئەگرێ.

٢- عەماری لای بێ سیمی قەسر هەفتا و چوار هەزار مەتری چوارگۆشە ئاو ئەگرێ.

٣- عەماراوی خۆرهەڵاتی جەلالیە پەنجا و پێنج هەزار و پێنج سەد مەتری چوارگۆشەیی ئەگرێ.

٤- عەماری لای باکوری بەهجەت ئاوا پەنجا و پێنج هەزار و پێنج سەد مەتری چوارگۆشەیی ئاو ئەگرێ.

٥- عەماری ئەمیر ئاباد هەژدە هەزار و پێنج سەد مەتری چوارگۆشەیی ئاو دەگرێ.

٦- عەماری مەجیدیە سی و حەوت هەزار مەتری چوارگۆشەیی ئاو دەگرێ.

٧- عەماری نارمەک هەژدە هەزار و پێنج سەد مەتری چوارگۆشەیی ئاو دەگرێ.

جگە لەم عەمار ئاوانە، زۆر عەماراوی تریش هەیە.

با ئەوەش بڵێین کە بناوانەی کەرەج ئەکەوێتە لای باکوری بەرەو خۆرئاوای تارانەوە و، سەست و سێ کیلۆمەتر لە یەکەوە دوورن، ئەم بناوانەیە کە پێی ئەوترێ (سەد کەرەج)

ئەسەر تەنگەبەریی واریان دروست کراوە و، ساڵی ١٣٤٠ فارسی ساختمانەکەی تەواوبووە و، کەوتۆتە بەرهەم... تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش.

١٣٥٤/٥/٢١

**وتاری: ۱۷۷**

بیستیاره بەرێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شادبێ.

وتمان لە ڕیزە وتارێکا باسی پێشکەوتەکانی شاری تەهرانی پایتەخت دەکەین... یەکێ لەو پێشکەوتانە بەدی هاتنی کارەبا و بەرقە.

بەرلەوەی کارەبا و بەرق بێتە دی، لە شەقامەکانی ئەوروپادا، بەهرە و کەڵک لە ڕەژووی بەرد وەرئەگیرا، کە بەشەو کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر شەقامەکان هەڵ ئەگیرسێنرا. بەڵام لە بەشی ئاسیادا زۆرتر سوود لە مۆم و شاپڵیتە و فانۆسە زلەکان وەرئەگیرا، کە قوتیلک و مۆمی تیا دائەنرا... لە سەردەمی پادشایەتی ناسرەدین شای قاجاردا، کە زۆر جار هاتوچۆی ئەوروپای کردبوو و حەزی لەوە بوو تاران جوان بکات، سەرەک وەزیری ئەو ڕۆژگارە حاج میرزا حوسێن خان سپاسالار لە شەقامی ئەمیر کەبیری ئێستە کارخانەیێکی چراغ گازی دامەزراند بوو بۆ ڕووناککردنی کۆڵانەکانی شار هەر بەناوی ئەو کارخانەیەوە بەشەقامی ئەمیر کەبیری ئەمڕۆ ئەوترا شەقامی چراغ گاز... پاش ئەو سەردەمە بە ٦١ ساڵ، لە سەردەمی شاهیێتیی شاهەنشای مەزن ڕەزا شای گەورەدا لە ساڵی ۱۳۱۳ فارسییا کارخانەیێکی کارەبا و بەرقی ئەشکودا لە تاراندا دامەزرا کە ظەرفیەتی ٦٤٠٠ - شەش هەزار و چوار سەد کیلۆوات بوو... ئنجا شەقامی چراغ گاز، بەناوی شەقامی چراغ بەرق ناوبانگی دەرکرد... بەڵام پاش ئەوە تاران کەوتە پەرەسەندن و، ڕازانەوە تا ڕادەیەک کە گەشتیاران و جیهان گەردان ناویان ناوە (بووکی خۆرهەڵات)... جا دەبێ لە هەر گۆشەیەکەوە سەرنجی بدەی نیشانەی پێشکەوت و، چاو ئەندازی بووکی خۆرهەڵات لەبەر چاوت بدرەوشێتەوە.

سەرمایەدارانی مرۆڤی وڵات و، دەوڵەتیش، کە بینیان پێتەویست بەبەرق و کارەبا زۆرە بۆ ڕوونکردنەوەی کۆشک و تەلارەکانیان و بۆ ئاوەدانی باغ و باغچەکانیان و، بۆ گەڕاندنی فابریقە و کارخانەکانیان، گەلێ دەزگای بەرق و کارەبایان کڕی و خستیانە کار، بەڵام ئەمانە دیسان مەبەس نەبوو... سازمانی ئاو و بەرق و کارەبا دامەزرا، خرایە پاڵ وەزارەتی ئاو و بەرق و کارەبا و، پەرە درا بەدەزگای بەرق و لە ناو تاران دوو نیروگای بەرق واتا دوو جێی هێزی کارەبا و بەرق بەدی هێنرا:

- یەکەم: (نیروگای ژالە)، کە ئەم کارخانەیانەی تێدا دامەزراوە:
- ئەشکودا، کە هێزی شەش هەزار و چوار سەد کیلۆ واتە لە ساتێکا.
- ویستنگهاوسی بەرایی، کە هێزی هەشت هەزار کیلۆواتە لە ساتێکا.
- ویستنگاوسی تازە، کە هێزی سێ هەزار و نۆسەد کیلۆواتە، لە ساتێکا.
- موتوری سێی دیزل کە هێزی سێ هەزار و نۆسەد کیلۆ واتە لە ساتێکا.
دووەم: (نیروگای تەرەشت)، کە ئەم کارخانەیانەی تێدا دامەزراوە:
- ئالەستومی بەرایی، کە هێزی پەنجا هەزار کیلۆواتە لە ساتێکا.
- ئالەستومی تازە، کە هێزی بیست و پێنج هەزار کیلۆواتە لە ساتێکا.

ئەم کارخانەیانە دیسان بەبەس نەزانرا بۆ پایتەخت چونکە بەپێی پێشکەوتنی وڵات بڕیار درا کە بەرق و کارەبا سەرانسەری وڵات دابگرێ. جا بڕیار درا کە هێز لە تاڤگە و بناوانە و ئاوی سەدەکان وەربگیرێ. جا بەهەڵبەستنی بناوانەی کەرەج کە ناونراوە سەدی ئەمیر کەبیر و کەڵک وەرگرتن لە ئاوی سەدە بۆ بەرق و کارەبا، هێزی بەرق گەیشتە نزیکەی چوارسەد و چوار ملیۆن کیلۆوات لە ساتێکا.

وا دیارە ئەمەش هەر بەشی نەکرد، چونکە پەرەسەندن، کارخانەی و فابریقە و دەزگای تری، پێتەویستی بەکارەبا و بەرقی پتر بوو... جا سەدی فەرەح دامەزرا... هەر بۆ ئەو مەبەستە... و لەسەر سەدەکانی تریش وەک (ئەسفەهان - ئاوەدان - شیراز - مەشهەد). دیسانەوە دەزگای زۆر زلی بەرق و کارەبا دامەزرا، بۆ ئەوەی کە بەرق بەهەموو شار و دێهاتەکان و جێ سەیرانەکان بگات... جا ئەم نیروگایانەی کە هاتە دی، هەموویان تێکڕا بەرق و کارەبا ئەگەیێنن بەزۆربەی دێهات و جێگا سەیرانەکانی وڵاتیش... ئەوەیە کە دەرگای سینەما و، تیاترۆ، مەغازە و خۆراکخانە و، شوێنە گشتییەکان، بێ باکانە، دەرگاکانیان بەبەرق ئەڕازێننەوە و، تابلۆی هەمەڕەنگی لە بەرق پێکهاتووی جوان جاڕ بۆ جێگەکانیان ئەدەن و، تەبلیغاتی بۆ ئەکەن.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ، شەوانی جەژن و ئاهەنگی وڵات شەقام و ساختمانەکانی پایتەخت، سەرانسەر وەرئەگەڕێ بەچراخان.

نرخی بەرق و کارەبا بۆهەر کیلۆواتێ دوو قران و هەشت شاهییە، ئەمە بۆ گشت خەڵقی، بەڵام بۆ ئەو جێگانەی کە بەرق زۆر لەناو ئەبەن، وەک کارخانە و، فابریقە و، سینەما و جێیانی تری... نرخی بەرق دائەشکێنرێ و، لەو نرخەی کە وترا بەکەمتر پێیان ئەفرۆشرێ.

جـا هەر کـەس بەهەوا پەیا و تـەیارە، شـەوان بەسـەر شـاری تەهراندا ڕابووری، بۆی دەرئەکەویٚ کە ئەو ناوەی گەشتیاران بەتەهرانیان داوە و، پێیان وتووە بووکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ڕاستیان کردووە.

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان لێرەدا تەواوبو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

١٣٥٤/٥/٢٥

٢٥/ خەرمانان/ ٢٦٨٣

**وتاری: ١٧٨**

گوێگره بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ... له وتارەکانی پێشوودا هەندێ شتمان دەربارەی تەهران نووسی، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ شاری تەهران بەوتار و چەند وتار و، بەکتێب و چەند کتێب وەسف ناکرێت، هەر گۆشەیەکی تەهران پێویستی بەوە هەیە، دەربارەی بنووسرێ... بەڵام بەداخەوە، ئێمە سەرچاوەی تازەمان لەبەردەستا نییە کە لە هەموو شت بدوێ... بۆ وێنە شەقامەکانی تاران زۆرن، هەندێکیان سەراسەری و پانوپۆڕن... شەقامی شا ڕەزا کە درێژترین شەقامی تارانە، بەچەند بەش ناو ئەبرێ، لە مەیدانی شەهیادەوە تا مەیدانی بیست و چواری ئەسفەند، پێی دەوترێ شەقامی ئایزنهاوەر... و لە مەیدانی بیست و چواری ئەسفەندەوە تا مەیدانی فردەوسی، پێی ئەوترێ شا ڕەزا لەوێشەوە تا مەیدانی فەوزییە چەند جارێ ناوی گۆڕاوە، لە مەیدانی فەوزییەوە تا لە شاری تەهران تێ ئەپەڕێ و بەکەناری تاران پارسدا ئەڕوا بەرەو ئاب عەلی پێی ئەوترێ شەقامی دەماوەند... ئەم شەقامە گەرچی پانوپۆڕە و، بەشی ئایزنهاوەر و شاهرەزای بلوارە، بەڵام هێشتا هەندێ کات بۆ هاتوچۆی ئۆتۆمۆبێل و کەرەسەی ماشێنی تەنگە... ئاشکراترین دروشمی ئەم شەقامە ئابودە و موجەسەمەی شاهرەزای مەزن و موجەسەمەی فیردەوسییە ساختمانی شەهیادیش کە لە ناوەندی مەیدانی شەهیادایە، یەکێکە لە ساختمانە زۆر سەیرەکانی جیهان، گەشتیاران و، خەڵقی ناو شاریش ڕۆژانە بەهەزاران ئەچن بۆ تەماشای... تەنانەت بۆ دیتنی ئەو فیلمانەی کە لە ڕاڕەوی ناو ساختمانەدا، جەژنی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی شاهەنشاهیی ئێران نیشان ئەدا... لەگەڵ زۆر شتی دێرینە و باستانی... یەکی تر لە شەقامە هەرە جوانەکانی ناو تەهران شەقامی پەهلەوییە، کە لە مەیدانی ڕێی ئاسنەوە دەس پێ دەکا بەرەو تەجریش و شمیران و، جوانترین مەیدانێ کە لەسەر ئەم شەقامەیە مەیدانی وەلی عەهدە کە ئەکەوێتە چوار ڕێیانی پەهلەوی -بلورای ئەلیەزابێث- کەریم خانی زەند... ئەم دوو شەقامە گەورە و دووررودرێژە لە دەورانی شاهەنشایی ڕەزا شای مەزندا، دامەزراون و، بەرەبەرە پەرەیان پێ دراوە.

شەقامی پەهلەوی، جوانترین شەقامێکە لە شارەکانی خۆرهەڵاتی ناوەندا، تەنانەت لە سێ ڕای عەبباس ئاباد بەرەو ژوور تا تەجریش کە هەر دوو لای شەقامەکە بەدار چنار

تەنراوە و، لە زۆر جێگە سێبەری چڕ شەقامەکە دائەپۆشێ... ئەم دوو شەقامە لە ناوەکانیان ئاشکرایە، کە یەکەم بەناوی خود (شاهرەزا) ناونراوە و، دووەمیان بەناوی (نازناوی) بنەماڵەی پەهلەوییەوە.

یەکێ تر لە شەقامەکانی ناو شاری تەهران شەقامی شایە ئەم شەقامەش کە کەوتۆتە ناوەندی شار و، ئەمبەر و ئەوبەری جوانترین بازاڕی تارانە، سێ ناوی پەیدا کردووە.

لە مەیدانی بەهارستانەوە، کە لەبەردەم ساختمانی پەرلەمان دایە، واتا جێی نوێنەرانی گەل، تا دەگاتە چوار ڕێی لالەزار سەعدی، پێی ئەوترێ (شا ئاباد)... و لە چوار ڕێی سەعدی ئەستەمولەوە تا چوار ڕێی فیردەوسی ئەستەمولێ، پێی ئەوترێ شەقامی ئەستەمبوڵ و لەوێوە تا چوار ڕێ حافز - یوسف ئاباد پێی ئەوترێ شەقامی نادری... و سەراسەر پێی ئەوترێ شەقامی شا... و با ئەوەش بڵێین کە بەفارسی بەشەقام ئەڵێن (خیابان) یەکی تر لە شەقامە جوانەکانی تاران شەقامی بلوارە ئەم بلوارە کە دوو لاییە و ناوەندی بەگوڵ و گوڵزار ڕازاوەتەوە، دوو ناوی هەیە:

یەکەم بلوار کەریم خان زەند لە مەیدانی بیست و پێنج شەهریوەرەوە تا مەیدانی وەلی عەهدە و دووەم بلواری ئەلیەزابێتە، کە لە مەیدانی وەلی عەهدەوە تا بیمارستانی هەزار تەخت خواب.

پاش نیوەڕوانی بەهاران و هاوینان و پایزان، ئەم بلوارانە سەیرانگەی جوانان، هۆی ناونرانی ئەم دوو شەقامەش ئاشکرایە،... یەکێ تر لە شەقامە جوانەکان ناوی (تەخت جەمشید)ە لەم شەقامەدا مەیدانێکی جوان هەیە بەناوی (مەیدان کاخ) یەکێ تر لە شەقامەکان ئاریا میهرە... بەناوی نازناوی محەمەد ڕەزا شای مەزنەوە ناونراوە، لایەکی پەهلەوییە و لایەکی خیابانی جەمال زادەیە، بەرامبەر بەم شەقامە کەمێ ژوورتر بەلای خۆرهەڵاتی شەقامی پەهلەوییا شەقامی تەخت (طاوس) هەیە... ئەم شەقامە جوانە بەناوی ئەو تەختەوە ناونراوە کە لە سەردەمی فەتح عەلی شای قاجاردا، لە لایەن وەستا هونەرمەندەکانی ئەسفەهانەوە لە عاج و ئەبەنووس وزێڕ دروست کرابوو. یەکێ تر لە شەقامەکان، شەقامی بیست و پێنجی شەهریوەرە لە مەیدانی عەبباس ئابادەوە دەس پێ ئەکا تا سەر کورشی کەبیر ئەم شەقامانەی کە ناوم برد جگە لە پەهلەوی هەموویان لە خۆرهەڵاتی تارانەوە بۆ لای خۆرئاوای تارانن و پەهلەوی بەناوەندیانا ئەڕوات. شەقامی حافز و شەقامی سەعدی و شەقامی فیردەوسیش بەناوی سێ شاعیری مەزنی ئێرانەوە

ناونراون، که له عالەمی ئەدەبا خێوی گەورەترین و بەنرخترین شوێنەوار بوون... تا ئەمڕۆ دیوانی حافز و گوڵستان و بۆستانی سەعدی و، شانامەی فیردەوسی، له شێوەی خۆیانا بێ هاوتا و، نایابترین وردەکاریی هونەر و شیعرن. ئەم شەقامانە له باشوور و لای خوارەوە بەرەو باکور دامەزراون، بەڵام زۆر دووورودرێژ نین... خیابانی لالەزار، گەرچی کورت و تەنگە، بەڵام زیندووکەرەوەی ناوی (باغی لالەزار) کە پێشا لەوێدا بووە، بەڵام پاش پەرەسەندنی تاران باغەکە بڕدراوە و، جێگەکەی بووە بەماڵ و بازاڕ و شەقام... یەکێ تر له شەقامە گەورەکانی تاران شەقامی کۆرشی مەزنە، ئەم شەقامە لەمەوبەر بەناوی شەقامی (شمیرانی کۆن) بەناوبانگ بوو، چون جگە له پالەوی تەنیا شەقامێ بوو له تارانەوە ئەچوو بۆ شمیران.

چەند ساڵێ لەمەوبەر له شەمیرانە و شەقامێکی پانوپۆڕی دوو سەرە بەناوی شاهرازی پارک وی له مەیدانی کەنەدییەوە کێشرا تا سەرووی هوتێل هیلتون، له خوار گەڕەکی مەحموودییەوە لەگەڵ پەهلەوی تێکەڵ ئەبێت. هەروا خیابانێکی تریش بەناوی خیابانی جوردن لەسەر شەقامی کەریم خانی زەندەوە بەرەو شمیران کێشرا، ئەم شەقامی جوردەنەش لەگەڵ شاهرای پارک ویدا، لەسەر پەهلەویدا ئەگەن بەیەک... ئەم شەقامە بەناوی دوکتۆر سامویل جوردنەوە ناونراوە، کە یەکێک بووە لەوانەی خەریکی پەرەدان بەئایینی مەسیحی بوون و، نزیکەی ٤٣ ساڵ له ئێراندا بەبڵاوکردنەوەی زانیاری و، بەپەروەردەی مێشکی منداڵان و لاوان و، بەڕێنومایی وەرزش و ئەو کارانەوە، خەریک بووە. ئەم دوکتۆر جوردەنە له دەبیرستانی ئەلبورز مامۆستا بووە لەوێ ئابودەیەکی بۆ دروست کراوە. جگە لەم شەقام و خیابانانەی وترا، شەقامی ئەمیر کەبیر، شەقامی ڕەی، شەقامی بوزەجومهەری، شەقامی مەولەوی، شەقامی عەبباسی و سەدەها شەقامی تری له تارانا هەیە، زۆربەیان بەناوی زانایان و نووسەران و هەستیاران و هونەرمەندان و، پیاوانی گەورەی خۆ وڵاتی، دەوڵەتانی ترەوە ناونراون...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، خۆشیتان هیوامانە.

١٣٥٤/٦/١٧

## وتاری: ۱۷۹

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە خۆشی و شادی بێ...

لەم وتارەدا باسی هەندێ لەو جێگەیانە دەکەین کە شوێنەواری فەرهەنگی و مێژوویییان پاراستووە و، لە تەهرانا هەن، وەک دێرینەخانە و مۆزەکان و، هەروا کتێبخانەکان... با لە سەرەتاشدا ئەوەتان بۆ ڕوون بکەینەوە کە وتارەکەی ئێمە وەنییە هەموو گۆشەیێ ڕوون بکاتەوە، بەڵکو لە هەر خەرروارە نموونەیێکە و لە هەر خەرمانە مشتێکە... و ئەوەش دەرئەخەین، کە مۆزە -واتا دێرینەخانە و، جێی شتی مێژوویی و شوێنەواری کۆن و باستانی- جۆری زۆرە... هەندێ لەو مۆزەیانە ئەو شتانەیان تێدایە کە لەبن عەرد دەرهێنراون یا لە کێو و چیا دۆزراونەوە، یا لەسەر بەردەنووسێکی گەورەی کە بۆ گواستنەوە نەشیابێ- ڕوونووس کراون، بەجۆری وێنە لێ گرتن و قاڵب لە ڕوو گرتن... جا (مۆزەی ئێرانی باستان) -کە ئەکەوێتە شەقامی قەوام ئەلسەڵتەنە و ڕووی دەرگاکەی لە شەقامی سپایە- گەورەترین مۆزەخانەی ئێرانە، لە تەهراندا، ئەم مۆزەخانەیە چەند نهۆم و تەبەقەیە، دێرینە و شوێنەواری دەورانی کاسی و عیلام و ماد و هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانی تیایە... کە دەوڵەتانی بەدەسەڵاتی ئێران زەمین بوون... دێرینە و شوێنەواری ئەو دەوڵەتانەشی تیایە کە دەستیان بەسەر خاکی ئێرانا گرتووە وەک ئاشووری و مەکدۆنی و عەرەبی ئیسلام... بێ گومان باسی ئەم مۆزەیە بەنووسین ناخرێتە سەر لاپەڕەی بەرنامە و، نەواری تۆمار... وەک پێشینانی ئێرانی وتویانە (حەفتامەنییە)...

یەکێ تر لە مۆزەکان، مۆزەی مەردم ناسییە، کە ئەکەوێتە شەقامی ئەرامینە... مەبەست لە مەردم ناسی ئەوەیە، لێرەدا دیمەن و ئابوودەی ڕەگەزەکانی مرۆڤ هەیە، وەک سپیی ئاریائی، زەردی چینی، ڕەشی ئەفەریقایی،... تا... هەتا...

یەکێ تر لە مۆزەکان، مۆزەی هونەرهای تەزینییە... مەبەست ئەو نەخش و نیگارانەیە، کە لەسەر گەچ و کاشی و، جلوبەرگ و مافوور و قاڵی و ئەو شتانە کێشراون، بۆ ڕازاندنەوەی ماڵ و دیوار و تالار و کەلوپەل و تابلۆ و بەرگی کتێب و شتی تری... ئەم مۆزەیە ئەکەوێتە شەقامی ئەمیر کەبیرەوە.

یەکێ تری لە مۆزەکان «مۆزەی جەواهیراتی سەڵتەنەتییە»... ئەم مۆزەیە ئەکەوێتە

شەقامی فیردەوسی و لە ناو بانکی میللی دایە لێرەدا تاجی ڕازاوەی شایانی ئێران، کە بەزێڕ و زیو و هەموو جۆرە گەوهەر و بەردێکی بەقیمەت نەخشێنراون، هەروا چەکی جەنگی وەک شمشێر و خەنجەر و چەوگانی فەرمانڕەوایی، کە ئەمانەش کالان وەدەستەکانیان بەجۆراوجۆری بەردی بەنرخ و ئەلماس و مرواری و گەوهەری تر... ڕازێنراونەوە. سەرەڕای ئەمانە ئەو بەردە بەنرخانەی کە سەرمایەی گەنجینەی ولاتن، وەک (ئەلماس و، یاقوت و، فیروزە و، شەوچرا و، زمروت و، لەعل و، عەقیق) کە لە هەموویان بەنرختر ئەو گەوهەرانەن کە بەتاجەکەی نادر شاوەن.

زۆر مۆزەخانەی تریش هەن، وەک «مۆزەی هونەری» ، کە بریتییە لە وێنە و نەقاشی و ئەو شوێنەوارانەی کە بەنووکی قەڵەم و نووکی پەڕ، هێنراونە بەرهەم... ئەم مۆزەیە ئەکەوێتە شەقامی کەمال الملک. یەکی تری لە مۆزەکان تالاری ئەلماسە لە کاخی گوڵستان ئەو کاخەی کە لای دیوارەکانی ئاینەکارییە و، تەخت و ئەسکەمیلەکانی زەڕنگارە و، فەرشەکانی مەیدانی ڕاووشکارە... لە هەندێ لەم جێیانەدا، کتێبخانەی دەستنووسی زۆر بەنرخیش هەیە و، قەواڵە و دەستاوێزی مێژوویی بەکەڵکیشی تیایە... تەنانەت ئەو نامەیانەی کە هەندێ لە شایانی بنەماڵەی قاجار بۆ فەرماندە و سەردارانی ناو ولاتیان نووسیوە، یا ئەو پەیمان و عەهدنامەیانەی کە لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا بەستوویانە...

یەکێ تر لە مۆزەخانەکان «مۆزەی جلوبەرگی کۆنە» ئەم مۆزەیە چەشنی هەموو جۆرە بەرگێکی شایان و فەرماندارانی کۆنی تێدایە، تا دەورانی شاهەنشا آریا میهر، هەروا جۆری بەرگ و جلی مرۆڤی ولاتی تیایە هەر لە سەردەمی کۆنەوە تا ئەمڕۆ... هی ژنان، هی پیاوان، هی پاڵەوانان، هی فەرماندە و سەرداران... هی سەربازان و جەنگاوەران و پیشەوەران و کاسب و فەلاح و شوان و گاوان و نیشتەجێ و کۆچەر...

هەروا مۆزەی کرد و پیشەی ولاتیش هەیە کە پێی دەوترێ (مۆزەی ئاثاری سەنعەتی) . لەم مۆزەیەدا نموونەی کاری خەڵقی ولات نیشان ئەدرێ، وەک بەرهەمی کرد - لە بەڕە، ماڤوور، قاڵی، جاجم و، جۆری تری... وەیا بەرهەمی کاری دەستی مزگەران و ئاسنگەران و، دارتاشان، وەیا هەموو شوێنەوارێکی پیشەیی مرۆڤی ولات...

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان دەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

١٣٥٤/٦/١٩

**وتاری: ۱۸۰**

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کامەرانی بێت، لە وتارەکانی پێشـوودا، خەریکی باس و دووان بووین دەربارەی تەهرانی کۆن و جێگە مێژوویییەکانی و، دووبارەی مۆزەخانە و کاخ و تەلارەکانی و، دەربارەی باغ و باغچە و، سەیرانگا و، مۆزەخانە و بازاڕ و شەقامەکانی... بەڵام باسی ئەم چاو ئەندازە و، ئەم سەیرانگایانە و، ئەم دیمەنانە، وا بەسووک و ئاسان ناخرێتە سەر لاپەڕەی مێژوو... ئێستە با بگەڕێینەوە سەر لایەنی جوغرافی و، بەڕێوەبەرایەتی... شاری تەهران ناوەندی ئوستانی ناوەند و مەرکەزییە... لەمەوبەر کە ئوستانەکانی ئێران بە ۱۲ دانرابوو، ئوستانی ناوەندی لەبەرئەوەی پایتەختە، ژمارەی بۆ دانەنرابوو... ئێستەش کە ژمارەی ئوستانەکان لە بیست تێپەڕیوە هەر بەئوستانی ناوەندی ئەبرێ، جا ئەم ئوستانی ناوەندییە چواردە فەرمانداری - و چل و چوار بەخشی هەیە...

سنووری شارستانی تاران بەم جۆرەیە: لای باکوری زنجیرە چیای بەرزە کە لە سەرەتای دەورانی موسوڵمانەتی یا عەرەب کردوویانە بە (ئەلبەرز) و لە پاشا گۆڕاوە بەئەلبورز... لای خۆرهەڵاتی شارستانەکانی دەماوەند و گەرمەسارە... لای باشوور و خوارووی زریاچەی خۆییە -کە پێی ئەوترێ دەریاچەی نەمەک- و شارستانی قومە و، شارستانی ڕەی... لای خۆرئاوای شارستانی کەرەج... جێی شاری تاران ۱۱۹۱ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە، ئەکەوێتە ناوەندی دوو شیوی کەرەج و جاجرودەوە، کە سەرچاوەی ئاوی هەردوو شیوەکە لە داوێنی چیای ئەلبورزەوە دێ، کە بەرزترین لووتکەی ڕیزە چیاکەی نزیک بەتاران ٤٠٠٠ مەترە.

فەرمانداری و شارستانەکانی سەر بەتاران ئەمانەی خوارەوەن:

۱- شارستانی تەهران کە چوار بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - وەرامین - کەن - ئەیوانەکی...

۲- کەرەج: پێنج بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری... ساوجبلاغ - کە بە (هەشت گرد) بەناوبانگە. شەهریار - کە (عەلی شا عەوض)یشی پێ ئەوترێ - ئیشتیهارد - تاڵەقان - یا شەهرەک.

٣- شارستانی قەزوین، حەوت بەخشی هەیە... حەومە و دەوروبەری - بوئین - زیائەدین ئاباد - یاتاکستان - موعەلیم کەلایە - یا ڕووباری ئەلەموت - ئاوەج - آبیک - تارم خواروو یا سپەردان.

٤- ئەراک سێ بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - فەس (یاکەمیجان) سەربەند یا ئاستانە.

٥- کاشان: سێ بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - ئاران - قەمسەر.

٦- دەماوەند: دوو بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - فیروزکوە.

٧- مەحەلات: دوو بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - فیروز کوە.

٨- ساوە: پێنج بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - نوبەران - زەرەند - خەرقان - یارازقان - جەعفەر ئاوا.

٩- قوم: دوو بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری -کۆهەک.

١٠- تەفرەش: کە تەرخورانیشی پێ ئەڵێن: چوار بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - خەلەجستان - یا دەستگرد - ئاشتیان - فەراهان یا فەرمەهین.

١١- ڕەی: دوو بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری - فەشاپویە - یا حەسەن ئاباد.

١٢- شەمێرانات کە تەجریشیشی پێ ئەڵێن: سێ بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری لەواسانات - یا گەلەندوک - ڕووبار قەسران یا فەشەم.

١٣- گەرمەسار: یەک بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری.

١٤- خومەین: یەک بەخشی هەیە: حەومە و دەوروبەری.

سنووری ئوستانەکەش بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانەکانی مازندەران و گیلان. و لای باشوور و خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی ئیسفەهان و شارستانەکانی ئەلیگودەرز و بروجورد لە ئوستانی لوڕستان و، لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دەشتی کە ویرد و فەرمانداریی سەمنان و، لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دوو ئوستانی زەنجان و هەمەدان، کە لەمەوبەر هەردوویان فەرمانداریی گشتی بوون... زنجیرە چیای ئەلبورز کە شاری تەهران ئەکەوێتە داوێنی، لە بەشی باکوری ئوستانەکە دایە و، درێژە ئەکێشێ تا سرانسەری سنووری ئوستانەکە...

لە شاری تەهراندا پلەی خوێندەواری و سەواد؛ بەرزبووەتەوە جگە لەوەی چەند زانکۆی

تێدایە وەکو: زانکۆی تاران - زانکۆی میللی - زانکۆی سەنعەتی و پیشەیی ئاریا میهر - زانکۆی پولی تەکنیک - سەدەها زانستگە و، قوتابخانەی بەرز و، ئاموزشگا و، قوتابخانەی ناوەنجی و، قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری بۆ فێرکردنی ژنان و پیاوانی نەخوێندەواری تێدایە.

ژمارەی دانیشتوانی شاری تەهران بەڕۆژ نەگاتە ٤ ملیون و بەشەو لە سێ ملیۆن تێپەڕ دەکات، هۆی ئەوەش ئەوەیە کە بەڕۆژ هاتوچۆی خەڵکی دێهات و شارەکانی دەوروبەری پتر شارەکە قەڵەباڵغ دەکات...

لە شاری تاراندا، سەدەها سینەما، دەیان تیاتر، سەدان سەماخانە، دانسینگ، کافەرستوران، چاخانە، قاوەخانە، هەیە.

لە شاری تەهراندا، سەدەها نەخۆشخانەی گەورە و گچکەی دەوڵەتی و میللی هەیە. سەدەها دەرمانخانە، دەرمانگا، هەیە.

لە شاری تەهراندا، دەیان ڕۆژنامە و گۆڤار و مەجەلە، بەفارسی و ئینگلیزی و عەرەبی دەرنەچێ...

لە شاری تەهراندا، سەدەها نامەخانە و کتێبخانە بۆ خوێندنەوە و مەتاڵا هەیە؛ تەنانەت لە ناو باغچەکانا، کتێبخانە دروست کراوە، کە قوتابییان هەم بۆ سەیرانی گوڵ و گوڵزار و، بۆ یاری بەزموڕەزمی هەڕەزانی و دیلانیو جۆلانێ بچن و، هەم لەوێ پاش وەڕزبوون لە یاری بۆ خۆیان بخوێننەوە...

لە شاری تەهراندا، ئیمامزادە و، زیارەتگا زۆرە... مزگەوتی گەورە و بچووک زۆرە. جوانترین و گەورەترین مزگەوت مزگەوتی سپاسالارە؛ کە نموونەی هونەری و وردەکاری و ڕەنگینییە... ڕۆژانە هەزاران کەس ئەچنە دیدەنیی، دیغەی لێ ئەگرن...

باغ و باغچە لەناو شاری تەهراندا زۆرە و، بەناوی پارک ناو ئەبرێن وەک (پارکی شەهر، پارکی فەرەح، پارکی وەلی عەهد - تاد) لە یەکێ لەم پارکانەدا، کە ئەکەوێتە لای بەشی خوارووی ناو شار زریاچەیێ دروست کراوە منداڵ تیا سواری بەلەم و قایق دەبن و شەمەندەفەری منداڵانەش بەناو پارکەکەدا دەگەڕێ و، فرۆکەی بچووکی مەشق و فێرکردنی تیایە.

لە تەهراندا جەنگەلی جانەوەرانی کێوی هەیە، پێی ئەوترێ (باغ وەحش) هەندێ جۆری جانەوەرانی کێوی تیا کۆکراوەتەوە.

له تەهراندا، بۆ هاتوچۆ، زۆرتر سوود له ئۆتۆمۆبێل و ماشێن وەرئەگیرێ، بەشەقامەکانا پاس ئەڕوات، ئۆتۆمۆبێلی کرێ و، تاکسی و، تایبەتی ئەوەندە زۆرە کە شەقامەکانی تارانی تەنگ کردووە و ژمارەی ئۆتۆمۆبێل، جگە لە هی سپا، سەری داوە لە نزیکەی ملیۆنێ...

له تەهراندا، سەدەها جێی شووشتنی بەرگ و جل هەیە کە پێی دەڵێن (خوشک شوئی)... سەدەها گەرماو هەیە، کە هەندێ لەوانە بۆ لەرکردنی قەڵەوەکانە و ناوی (سوزا)ی لێ نراوە... تاران، هەندێ بەشی لە جوانی و خاوێنیدا شایەستەیە کە پێی دەوترێ پاریسی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

## وتاری: ١٨١

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و خۆشی بێ...

لە وتارەکانی پێشوودا ئەوەندەی بۆمان لووا دەربارەی تەهران و پێشکەوتی دواین، هەم لە ڕووی پەرەسەندن و تەنینەوە و، هەم لە ڕووی پەیدابوونی شەقام و ساختمانی جوان و، ئاو و کارەبا و بەرق و، دامەزرانی کارخانەگەلی جیاجیا و، زانکۆی زانست و زانیاری بڵاوکەرەوە و، قوتابخانە و ئامۆزشگای زۆر و زەبەندە و، پارک و باغچەی جوان و ڕازاوە و، سەدەها سینەما و تیاتیرۆ و سەماخانە و، کافە و، بازاڕی قنجیلە و، دامەزراوی شایانی پایتەختەوە... تا ئەوێ کە وتمان: شاری تەهران لەبەر پاک و تەمیـیـزی بەشی پێشکەوتووی و، لەبەر ڕێکوپێکی شەقام و باغچەکانی... لە لایەن ئەو بێگانەیانەوە کە گەریدە و جیـهـان گـەردن و هاتوونەتە تەهران ئەم شارە ناونراوە (پاریسی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست).

ئێستە کە باسی ئوستانی ناوەندی دەکەین، کە شاری تەهران ناوەندێتی، وا بەباش نەزانین کە دەربارەی ئەو فەرمانداری و بەشانەش بدوێین کە سەر بەم ئوستانەن... جا لەم وتارەدا باسی (ئەراک) دەکەین... و نابێ گوێگرانی خۆشەویست لەم بارەوە بماندەنە بەر تیری ڕەخنە، کە بۆ چ باسی (ئەراک)یمان لە تیپی (ئەلف)دا نەکردووە، چون ئێمە زۆرتر هەوڵی ئەوە ئەدەین کە باسی بەکەڵک و پڕ لە سوود بۆ بیستیارانی خۆشەویست بڵاو بکەینەوە...

جا ئەراک یەکێکە لە فەرمانداری و شەهرستانەکانی سەر بەتەهران -واتا سەر بەئوستانی پایتەخت- ئەم ئەراکە ناوێکە لە سەردەمی شاهەنشاهی ڕەزا شای مەزنی پەهلەویدا دراوە بەم شارە... لەوەبەر ناوی سوڵتان ئاباد بووە، لە ساڵانی ١٢٢٣-١٢٢٧ کۆچییا، لەسەر فەرمانی فەتح عەلی شای قاجار، بەهۆی یوسف خانی گورجییەوە دامەزرێنراوە، کە فەرماندەی پادگان بووە لەوێ. لە سەرەتادت ناونراوە (قەڵای سوڵتان ئاباد)، پاشان قەڵاکەی لابراوە و بووە بەسوڵتان ئاباد ئنجا گۆڕاوە بەئەراک...

گۆیا لە سەدەی هەشتەمدا. لەو ناوەدا شارێکی بچکۆڵە هەبوو، ناوی (رامین) بووە و، لە دەورانی مەغولدا وێران و ناونیشانی نەماوەتەوە و لە سەردەمی سەفەوی و قاجاردا تەنیا لەو ناوەدا پادگانی -واتا سەربازخانەیێ- دروست کراوە... پاشان فەرماندەی ئەم

پادگانە یوسف خانی گورجی پێشنیهادی ئەوەی کردووە ساختمان و ئەوانەی تیا دروست بکرێ بۆ ماڵە ئەفسەرەکان و بەم هۆیەوە بووە بەقەڵای سوڵتان ئاوای عەراق... و (شاری نوێ)شیان پێ وتووە... لەوەپاش وشەی (عەراق) گۆڕدراوە بە (ئەراک) و (سوڵتان ئاوا) کەشی لێ دارنراوە.

جا (ئەراک) کە شارێکی زۆر تازەیە و تەمەنی ئەگاتە سەد و بیست و هەشت ساڵ، ئەمڕۆکە شارێکی قنجیلە و پاک و خاوێن و دارای خیابان و شەقام و بازاڕی ڕێکوپێکە، ڕێی ئاسن، بەکەناری دەڕوات و چەندین کارخانەی تیا دامەزراوە... لە سەرەتادا تەنیا، بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ پەروەری ناوبانگی هەبوو، کاری دەستیی خۆماڵیشی تیا هەبوو وەک کرد و تەون و چنین، واتا بەڕە و مافووری تیا دروست ئەکرا و، جاجم و دەوار و هۆڕ و شتی تیا ئەتەنرا و، گۆرەوی و پووزەوانەی تیا ئەچنرا.

ئەراک ناوەندی شارستان و فەرمانداربیە، جێگەکەی پێ دەشتێکی پانوپۆڕە، چەند ریزە چیایێ گەمارۆی داوە، لای باشوورەوە ڕیزە چیای ڕاسوەند هەیە، کە چەند پەل و لقێکی لێ جیا ئەبێتەوە لای خۆرئاواشەوە دوو ڕیزە چیای تری هەیە، یەکێکیان بەلای خوارووی دێهستانی (شەراء)ی سەر بەهەمەدانا درێژە ئەکێشێ تا چیای ئەڵوەندی هەمەدان... کێوی گەرەسو نیو کیلۆمەتر لە شاری ئەراکەوە دوورە... لووتکە بەرزەکانی چیاکانی دەوروبەری ئەراک ئەمانەن:

لووتکەی دوخواهرانی ڕاسوەند ٣٣٨٩ مەتر لە ڕووی زریە بەرزە... لووتکەی لەشکەر کە ئەکەوێتە باکوری سەرچاڵەوە ٢٩٣٨ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە - و زۆر لووتکەی تریش هەیە کە ئەگەنە نزیکەی ٣ هەزار مەتر لە بەرزیا...

لە ڕووبارە بەناوبانگەکانی ئەراک: یەکەم ڕووباری قەرەچایە کە سەرچاوەکەی لە چیاکانی (سەربەند گەزاز)ەوە هەڵئەسێو لە هەندێ هەرێم ناوەکەی ئەگۆڕدرێ و ناوانی (تورە - نورئابادسە ئاستانە) پەیدا ئەکات، ڕودخانەی خوشک و زریاچەی عەمارەتیش لە ئەراکدا ناسراون... کەویری نەمەگ زاری (میغان)یش ئەکەوێتە ناوەندی ئەراکەوە.

ئاووهەوای ئەراک لە زستانا سارد و، لە هاوینا فێنک و ناوەنجییە.

ئەراک سێ بەخشی هەیە: یەکەم حەومە و دەوروبەری. دووەم وەفەس -کە کەهیجانیشی پێ دەڵێن- سێیەم: سەربەنگ کە ئاستانەشی پێ ئەڵێن...

سنووری چوار لای شارستانی ئەراک بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی ئاشتیان و فەرهەمین کە سەر بەشارستانی تەفرەشن. لای خۆرهەڵاتیشەوە

هاوسنووره لەگەڵ بەخشی خەلەجستانی سەر بەشارستانی تەفرەش... هەروا هاوسنووره لەگەڵ شارستانی قوم و شارستانی مەحلاتیش... لای باشووریشەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی خومەین و بەشی چاپلقی سەر بەشارستانی ئەلیگودەرز... لای خۆرئاوایشەوە هاوسنووره لەگەڵ مەلایر با ئەوە بزانرێ کە لە کۆنا هەرێمی ئەراکی ئەمڕۆ سەر بەلوڕستان بووە.

شاری ئەراک، هەروەک لە ڕووی کشاوەرزیشەوە پێش ڕەوتی کردووە هەروا لە ڕووی پیشە و خوێندەواریشەوە پێشکەوتووە. لەم شارەدا زانستگەی بەرز هەیە، دەیان قوتابخانەی بەرز و دەیان قوتابخانەی ناوەنجی و سەدان قوتابخانەی بەرایی و قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە... چەند کتێبخانەی تێدایە، گەورەترینیان کتێبخانەی پەهلەوییە کە ٦٠٤٥ کتێبی تیایە... لەوێ لەمەوبەر ڕۆژنامەیێ هەبوو بەناوی ئەراک.

لەگەڵ ئەوەشدا کە شاری ئەراک تەمەنی زۆر نییە، لەوێ ساختمان و جێگەی دێرینەیی و مێژوویی هەیە، بۆ وێنە لەوێ گۆڕێ هەیە بەناوی (سلطان آباد چهار تاقی برزو) گوایە هی دەورانی ساسانییە هەروا ئاستانەیێ هەیە بەناوی (ئیمامزاده سەهل کوڕی عەلی) گوایە هی سەردەمی سەفەوییە. لەوێ چەندین مزگەوت و حوسێنییەش هەیە. سینەمای تیایە، گەرماوی هەیە، میوانخانەی زۆرە، کارەبا و بەرق و، تەلیفۆنی تیایە.

لەمەوبەر مافوور و سوجادەی ئەراک زۆر بەناوبانگ بوو، چون ئەوێ بازاڕی خوریی لوڕستان بوو، هەمیشە چاترین ڕێسی هەبوو.

دەسکەوتی ئەم شارە و، دەوروبەری لە یەکەم پلەدا بەرهەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵە... میوەیشی زۆرە تەنانەت ترێ، کشمیش بادام و گوێز.

لە ئەراکدا نەخۆشخانە، داروخانە، دەرمانگا هەیە. ئاوی شار هی لوولەیە و، سەرچاوەی ئاوەکە بیر و چاڵاوە کە قووڵییان ٦٠ مەتر ئەبێ.

ئەمەبوو هەندێ زانُست دەربارەی ئەراک کە شارستانێکە لە شارستانەکانی ئوستانی ناوەندی، کە تەهران ناوەندێتی.

بیستیارانی خۆشەویست لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش.

١٣٥٤/٧/٢

٢ گەلاڕێزان ٢٦٨٣

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شادبێ. ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی تەهران دەڕۆین.

ئەوە بوو وتمان تەهران لە ڕووە کە پایتەختی ناوەندی کیشوەری ئێرانە... بەڵام لەو ڕووە کە شارە ناوەندی ئوستانە... و لەو ڕووەشەوە کە شارستانە ناوەندی فەرمانداریی ناوچەییە. جا لەو ڕووەوە کە ناوەندی ئوستانە چەند فەرمانداری (واتا شەهرستان) و چەند بەخشی هەیە. ئێمە لە وتاری پێشوودا باسی یەکێک لە شارستانەکانی سەر بەتەهرانمان کرد، کە ئەراک بوو... لەم وتارەدا باسی یەکێکی تر لەو شارستانانە دەکەین کە سەر بەتەهرانە، ئەویش (تەفرەش)ە -کە (تەرخوران)یشی هەر پێ ئەڵێن. ڕیشەی ناوەکەی لە لایەن فەرهەنگنووسەکانەوە ڕۆشن نەکراوەتەوە... بەلای ئێمەوە وا گومان ئەکرێ بنچینەی ناوە (تەوەرەش) یا (تفی ڕەش) بووبێ، پاشان گۆڕابێ بە (تەف ڕەش)...

جێی ئەم شارستانە لە ڕووی جوغرافیاییەوە، ئەکەوێتە سەر پەنجا پلەی درێژی و ١٥ دەقیقە و، پانایی ٣٤ پلە و ٤٠ دەقیقەوە و ئەکەوێتە نێوانی ڕیزە چیایەکی سەخت و بێ ڕێوە... سنووری چوار لای بەم جۆرەیە:

لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی (نۆبەران)ی سەر بەشارستانی ساوە و، ئوستانی هەمەدان... و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی قوم و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە، لەگەڵ شارستانی ئەراک و چیاکانی خەلەجستان... و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی (شەراء پیشخور)ی هەمەدان و بەخشی کەیجانی شارستانی ئەراک...

ئەم شارستانی تەفرەشە چوار بەخشی هەیە: (١) دەوروبەر و حەومەی... (٢) خەلەجستان (واتا دەستگرد). (٣) ناشتیان. (٤) فەراهان (واتا فەرمەهین).

نزیکترین شارستان لە تەفرەشەوە ئەراکە، ماوا و دەرزی نێوانیان ١١٩ کیلۆمەترە لە تارانیشەوە ٢٨٢ کیلۆمەترە دوورە.

تەفرەش سەردەسێرە... چەند ڕووبارێکی هەیە بەناوبانگیان ئەمانەیە: قەرەچای - دەست ڕێیە - سیدابە.

ئەم شارۆلکەیە زۆر کۆن نییە، هەندێ شوێنەواری مێژوویی تیایە، هی بەرلەوەیە، کە بووبێ بەشارستان. وەک خوابگای ئیمامزادە زەید کوڕی قاسم - کوهەکی تەفرەش - ئیمامزادە ئەحمەد کوهی - بورج شیشە تاد...

تەفرەش تا ساڵی ١٣٣٦ بەخش بوو، پاشان کرا بەشارستان و، دێی تەرخوران دانرا بەناوەندی و، ئەم بەخشانەی پێ و بەسترا... بەخشی تەفرەش کە لەوە پێش هەبوو، بەشێ لە بەخشی فەراهانی سەر بەئەراک... و بەشێ لە بەخشی خەلەجستانی سەر بەقوم... ساڵی ١٣٣٧ دێهستانی ئاشتانیش کرا بەبەخشێکی تری...

هەندێ لە خەڵقی تەفرەش خوێندەوار بوون و، بەخۆشنووسی بەناوبانگ بوون.

لە سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ فارسییا، ژمارەی خەڵقی ئەم شارستانە نزیکەی ٩٥ هەزار کەسێ بوو.

تەفرەش، شارۆلکەیەکی جوانکیلەیە ٢ شەقامی تێدایە یەکێکیان ٢٤ مەتر پانە و ئەویتریان دە مەتر پانە.

ئاوی تەفرەش هی لوولەیە، کارەبا و بەرقیشی تیایە... تەلگراف و تەلیفۆن و پۆستخانەی هەیە، ژمارەیەکی باش قاوەخانە، چاخانە، خۆراکخانەی تیایە... کتێبخانەیەکی گشتی هەیە... چەند مزگەوت و حوسێنییەی تیایە... چەند دەرمانگای هەیە، نزیکەی بیست قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە، چەند قوتابخانەی ناوەنجیشی هەیە، چەند هوتێل و مێوانخانەی هەیە.

خەڵقی ئەم شارستانە زۆربەیان خێوی کشتوکاڵ و فەلاحەتین. دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە... میوەشیان هەیە، تەنانەت بادام، گوێز، پستە، ئاژەڵیشیان زۆرە...

کاری دەستییان بریتییە لە کرد و تەون و چنین، هەم بەڕە و مافوور دروست ئەکەن، هەم جاجم و دەوار و، هەم گورەبی و بلووز و ئەو جۆرە شتانە ئەچنن.

لەوێ چەند کورەی خشت هەیە... کورەی گەچ و ئاهەک و قسڵ هەیە... خەڵقی ئەم ناوە بەفارسی و، تورکی و، لوڕی قسە دەکەن.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

١٣٥٤/٧/٩

**وتاری: ١٨٣**

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ. کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆکوردییەکانی ئێرانه. ئێمه هێشتا لەسەر باسی تەهران و دەوروبەری ئەڕۆین و، باسی یەکێکی تر لە فەرمانداری و شارستانەکانی سەر بەتەهران ئەکەین. ئەم شارستانە ناوی (خومەین)ە. خومەین لەمەوبەر بەشێ بوو سەر بەشارستانی گوڵ پایەکان... لە ئازەر مانگی ساڵی ١٣٢٥ فارسییا بەخشی خومەین، لە شارستانی گوڵ پایەگان دابڕراو خرایە سەر شارستانی مەحلات و، چەند دێیەک لە ئەلیگودەرزیش دابڕرا و خرایە سەری. پاش ئەوە لە ئەسفەند مانگی ساڵی ١٣٣٧دا، خومەین لە مەحلات جیاکرایەوە و کرا بەشارستان...

سنووری چوار لای شارستانی خومەین؛ بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی مەحلات و، لای باکوری خۆرئاواییەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی ئەراک و لای خۆرهەلاتەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی ناوەندیی شارستانی مەحلات و لای باشوور و خوارەوەشی هاوسنووره لەگەڵ بەخشی ناوەندی شارستانی گوڵ پایەگان و، لای خۆرئاواشەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی چاپلوتی سەر بەشارستانی ئەلیگودەرز.

ئەم شاره لە ڕووی جوغرافیاییەوە ئەکەوێتەوە ٥٠ پله درێژائی و سێ دەقیقە و، ٣٣ پله پانایی و سی و هەشت دەقیقە... و لە سەرەڕێی ئەراک - قوم دایە و، ٦٠ کیلۆمەتر له مەحلاتەوە دووره و ئەکەوێتە لای باشووری خۆرئاوایەوە. شاری خومەین لە شاری گوڵ پایەگانەوە، لە هەموو شارانی تر نزیکتره و ٤١ کیلۆمەتر لێیەوە دووره و، لە تارانیشەوە ٣٢٣ کیلۆمەتر دووره. ئەم شاری خومەینە ئەکەوێتە پێ دەشت و لە ڕووی زریەوە ١٨٠٠ مەتر بەرزه.

شارستانی خومەین تەنیا یەک بەخشی هەیە، ئەویش (حەومە)یە.

ژمارەی دانیشتوانی شارستانەکە ئەگاتە ٦٣٠٠٠ کەسێ. خەڵقەکە موسوڵمانن و، چەند ماڵی جولەکەشی تێدایە. ئاووهەوای شارستانەکە ناوەنجییە... بەڵام هەرێمەکە سەردەسێره و لەسەر کوێستان و زوزان ئەژمێرڕێ. ژمارەی دانیشتوانی شارۆلکەی خومەین لە حەوت هەزار کەس بەرەو ژوورتره. ڕچی ئاینییان شیعەیێتییە، ئەم شارۆلکەیه

نزیکەی ٤٠٠ دوکانی تێدایە، هەموو جۆرە کڕین و فرۆشتنێ لەوێ ئەنجام ئەدرێ، بازاڕی بەخشی کەمەرەیە، لەم شارۆلکەیە و لە شارستانەکەدا، چەندین قوتابخانەی بەرایی و ناوەندی هەیە، چەندین مزگەوت و حوسێنییە هەیە... لە دێهاتەکانی قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. چەندین داروخانە و نەخۆشخانە هەیە. ئاوی خواردنەوە لوولە و بۆڕیە تەلگراف و تەلیفۆن و پۆستەخانەی تێدایە. ژمارەیەکی باش خۆراکخانە و، گەرماوی تێدایە. میوانخانەی هەیە. خەڵقی ئەم ناوە خێوی ئاژەڵ و کشتوکاڵن. دەسکەوتیان بەرهەمی ئاژەڵییە وەک خوری، ڕۆن، پەنیر و شیر و ماست، هەروا بەرهەمی کشتوکاڵی وەک گەنم، جۆ، برنج، پەمۆ، چەوەندەر، میوەشیان زۆرە، تەنانەت زەردەلو و قەیسی و، توێ و، بادەم و ترێ...

شەقامەکانی ناو شار ڕێکوپێکن هەندێکیان قیرتاوە و، هەندێکیان چەگل و زیخ ڕێژە.

لە خومەین چەند کارخانەی بچووک هەیە، وەک جۆلایی، نەجاری و، دارتاشی و، چاپخانە و شتی تری.

ئافرەتانی خەڵقی شار، هەندێکیان کرد و تەونی ئەزانن، قاڵی و مافوور دروست ئەکەن و، گلێم و بەڕە ئەتەنن...

لە شاری خومەیندا، شوێنەواری مێژوویی کۆنیش هەیە، وەک بارەگای ئیمام شاهزادە ئەبو تالیب.

خەڵقی ئەم شارستانە بەفارسی قسە دەکەن و، بۆ کار و کاسبی گورجوگۆڵ و ئازان. ئەمەبوو هەندێ زانیاری دەربارەی شارۆلکەی خومەین و شارستانەکەی... تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٤/٧/٢٠

**وتاری: ١٨٤**

گویگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەمـوو کاتێکتـان شادبێ، ئێـمە هەر لەسـەر باسی (تەهران) دەڕۆین. لەم وتارەدا باسی یەکێکی تری لەو شـارسـتـانانە دەکـەین کـە سـەر بەتەهرانن، ئەم شارستانە ناوی (دەماوەند)ە، دەوماوەند هەروەک ناوە بۆ چیـای لووتکە بەرزی دەمـاوەند، کـە وەکـو گـومـبـەزی سـپی لەناو ڕیزە چیـای ئەلبـورزدا ئالآی بەرزی هەڵداوە... هەروا ناوە بۆ شـارستـانەکەی دەوروبەری و، بۆ ئەو شـارۆلکەیەش کـە ناوەندی شارستانەکەیە.

ناوی دەماوەند لەبەرئەوە دراوە بەچیاکە، چون هەمیشە تەم و دوکەڵی پێوەبووە... هەم دوکەڵی ئەو کانە ئاگر پژێنانە و، هەم تەمی هالآوی ئەو لووتکە بەفرینانە. ناوی دەماوەند کە دراوە بەم جێیانە زۆر لەمەوبەر لە مێژووەکانا تۆمارکراوە. هەندێ وایان داوەتە قەڵەم کە کاوەی ئاسنگەر زاڵ بوو بەسەر ئەژدەهاکدا و، فرەیدوونی هێنایە سەر تەخت، ئەو حەلە ئەژدەهاک سەری پان نەکرایەوە نەکوژرا، بەڵکو برا لە دەماوەند خرایە زنجیر و پالەهەنگ هەروا هەندێ لە ئەفسـانەنووسـانی ئێـرانی وایان تۆمـار کـردووە، کـە دەمـاوەند جـێی سیـمـورغە و زالی باوکی ڕۆستەم و ڕۆسـتـەمی پاڵەوانی کوڕی، هەردوو لایان لە سایەی باڵی سیـمـورغدا گەورە بوون جگە لەم ئەفسـانەیانە، خەڵقی وڵاتی مـازەندەران هەزارەها ئەفسانەی تری لەم بارەوە، دەگێڕنەوە.

موزیک

لەگەڵ ئەوەشدا، کە لەمـەوبەر وەها دەوترا کـە کـەس نەیتـوانیـوە بگاتـە سـەر لـووتکەی دەمـاوەند، بەڵام یاقوتی حەمەوی و هەندێ تری لە جوغـرافیـانووسـان و مـێژوونووسـان، وتویانە کە خەڵقی توانیویانە بگەنە سەر لووتکەکە، بەڵام لەم سەدەیانەی دواییدا، ئولیوەر ساڵی ١٧٩٨ زایینی ویستبووی بگاتە لووتکەی دەماوەند و نەیتوانی بوو...

سـاڵی ١٨٣٧ تیلەرتامـسن ناوێـک چووە سـەر لووتـکەی دەمـاوەند. پاش ئەوە شاخەوانانی ئێرانی و هی دەرەوە زۆرجار گەیشتوونە پۆپنەی ئەم چیایە. ژاک دومورگان بۆ دیتنی شـوێنەواری قـەڵایەکی کـۆن چووە بەگژ یەکێـک لە لقەکـانی دەمـاوەندا، بەڵام زۆر ڕەنج و ئەرک دیوە تا توانیویە سەر بکەوێ، کە خۆی ئەم باسە ئەگێڕێتەوە، مرۆڤ سەرسام

ئەبێ و، بۆ خوێندەوارانی ئێمە دەرئەکەوێ کە خۆرهەڵاتناسەکان، بۆ ئەوەی بتوانن زانست و زانیاری کۆبکەنەوە، وڵاتەکانی خۆیان پێش بخەن، چ جۆرە ڕەنج و ئەرکێک ئەگرنە سەر شان.

هەر چۆن بێ شارۆلکەی دەماوەند کە ئەمڕۆ ناوەندی شارستانی دەماوەندە لەسەر شوێنەواری شوێنێکی کۆن دامەزراوە، ئەو شارە لە سەردەمی حەزرەتی عوسمان کوڕی عەفاندا کە پۆستنشینی سێیەم بووە، هەبووە، لەو سەردەمەدا سەعید کوڕی عاسی لە ساڵی ٣٠ کۆچیدا داگیری کردووە. حەمدوڵڵا موستەوفی قەزوینی دەڵێ: ئەو شارە ناوی (پشیان) بووە و، لەبەرئەوەی لەپاڵ دەماوەند بووە، پێی وتراوە دەماوەند، جگە لە شارۆلکەی پشیان هەر لەو ناوەدا دوو شار هەبووە ناویان (ویەم) و (شلنب) بووە، یاقوتی حەمەوی ئەم ویەمەیەی بەچاوی خۆی دیوە. هەروا لێرەدا شارۆلکەیەک هەبووە بەناوی فیروز کوە ئەم شارە لەلایەن تەیمووری لەنگەوە وێران کراوە، ئەمڕۆ شوێنەواری ئەوێ نزیک بەهێڵی ئاسنینی ڕێی شەمەنەفەر و قەتار نزیک بەدێ کەنار ئەبینرێ. هەروا لەو ناوەدا دوو قەڵا و دژی تری سەخت هەبووە ناویان (استناباو) و (جرهەد) بووە ئەمانە لە سەردەمی هارون ڕەشیددا، لە لایەن یەحیا بەرمەکییەوە داگیر کراون.

شارۆلکەی دەماوەندی ئێستە کە ناوەندی شارستانی دەماوەند سەر بەئوستانی تارانی پایتەختە، شارۆلکەیەکی بچووکە، ئەکەوێتە لاپاڵی چیای دەماوەند و، بەلێواری ڕووباری دەماوەندەوەیە، لە تارانەوە ٧٠ کیلۆمەتر دوورە، جێگەیەکی سەردەسێرە، لە زستانا زۆر سارد و لە هاوینا ناوەنجییە و، هاوینەهەواری خەڵقی تاران و دەوروبەرێتی. دانیشتوانی شارۆلکەکە ٧٠٠٠ کەسێ ئەبن... چەند دوکان و، چاخانە و، خۆراکخانە و مێوانخانەی تێدایە، قوتابخانەی ناوەنجی و بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تێدایە. مزگەوت و گەرماوی هەیە. مزگەوتی نوێژی هەینی -کە پێی دەوترێ مەسجد جامع- زۆر کۆنە، ئەڵێن هی سەرەتای پەیدابوونی ئاینی ئیسلامە. شاری دەماوەند لەسەر جێیەکی بەرز دامەزراوە، لە ڕووی زریەوە ٢٢٨٧ بەرزە.

شارستانی دەماوەند دوو بەخشی هەیە: یەکەم حەومە، واتا دەوروبەری. دووەم فیروز کوە. سنووری چوار دەوری بەم جۆرەیە لای باکورەوە ئەگاتە زنجیرە چیای ئەلبورز و لاریجان (نزیک بەشارستانی ئادول) و زنجیرە چیای سەوادکۆی سەر بەشارستانی شاهی... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی سەمنان... لای باشوور و خوارەوە

هاوسنووره لەگەڵ شارستانی گەرمسار و بەخشی ئەیوانەکیی سەر بەشارستانی تاران و، لای خۆرئاواوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی فەشەی سەر بەشارستانی تاران...

دەماوەند دوو ڕووباری هەیە: یەکەم (مشکین جە) دووەم (تار) لەم شارستانەدا، چەند دەبیرستان، چەند قوتابخانەی بەرایی، ٣١ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری، کە سپای زانست ئەیبەن بەڕێوە. چەند دەرمانگا و، نەخۆشخانەی تیایە. ئاوی دەماوەند لوولە و بۆرییە، بەرق و کارەبای هەیە. کاروباری خەڵقی ئەم وڵاتە کشتوکاڵ و باغداری و، ئاژەڵ بەخێوکردنە.

لەم شارستانەدا چەند جێی کۆن هەیە، وەک مزگەوتی گەورە - بورج شیلی - ئیمامزادە عەبدوڵڵا - ئیمامزادە هەفت تەن.

زبانی خەڵقی دەماوەند (تاتی)یە، تەنها جادانەکانی ئەو ناوە زبانیان کرمانجیی باکورە...

**چیای دەماوەند پڕە لە کانگا... بەتایبەت گۆگرد... جگە لەوە زۆر کانی ئاوی گەرماوی تیایە -کە پێی ئەوترێ گۆگردی- وەک کانیاوی ئەسک. ئەم هەرێمە هەمیشە** بوومەلەرزەی تیا ڕووئەدات.

**ڕێی هەراز کە بەم هەرێمەدا ڕائەبوورێ یەکێکە لەو ڕێیانەی کە تونیل و قومشی زۆر بۆ** کردووە... لەگەڵ ئەوەشدا، زستانان زۆر جار بەهۆی ڕووخانی شاخەوە ئەبەسترێ. ئەم ڕووخانی شاخەش هی بوومەلەرزەی هەمیشەییە.

**وتاری: ١٨٥**

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ، هیوامان سەرکەوتن و شادیتانە.

لەم وتارەدا باسی (ڕەی) دەکەین کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەتەهران یا تاران.

ئەگەر لەبیرتان مابێ ئێمە لەمەوبەر باسی چەند شارستانێکی سەر بەتارانمان کرد وەک ئەراک - تەفرەش - خومەین - دەماوەند...

موزیک

ڕەی ناوە بۆ شارێ و بۆ شارستانێ، کە ئەم شارە ناوەندێتی... شاری ڕەی ئەکەوێتە لای خوارووی تارانەوە بەلای باشووری خۆرهەلاتییا. ئەم شارە، کە چەند جار وێران بووە و، دووبارە دروست کراوەتەوە، لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێرانە و، لە سەردەمی مادا هەبووە. ناوی ئەم شارە لە پارسیی کۆندا (ڕاگا) و لە ئاوێستادا (ڕاگها) و لە یۆنانیدا (ڕاگس)ە. ناوەکە هەر لەوێوە هاتووە کە ئەم شارە سەرەڕێی خۆرهەلات و خۆرئاوای ئێرانزەمین بووە، بەداخەوە نازانرێ کە لە سەردەمی ماد و هەخامەنشیدا چلۆن بووە، هەر ئەوەندە ئەزانرێ کە ٣٣٠ ساڵ بەر لە میلاد و زایینی حەزرەتی عیسا، ئەسکەندەری مەکدۆنی، کە داریۆشی سێیەمی شکست بوو، لە ماوەی ١١ ڕۆژدا بەشەڕەوە خۆی لە هەمەدان -واتا ئەکباتان تا کون-ەوە گەیاندۆتە ڕەی... وا دیارە بەهۆی ئەم شەڕەوە شاری ڕەی وێران بووە و پاش ئەوە سلوکوسی یەکەم لە پادشایانی پاش ئەسکەندەر سەرلەنوێ دروستی کردۆتەوە و بەناوی زایەگای خۆی لە مەکدۆنیا ناوی ڕەیی نابوو (ئوزوپوس OZOPOS)... کە ئەشکانییەکان وڵاتی ئێران زەمینیان لەژێردەستی سلوکوسەکان ڕزگار کرد، ناویان ئارساکیا... بەڵام دوور نییە کە ئەوانیش هەر شارێکی تازەیان دروست کردبێ. یەزدی گوردی سێیەمیش کە بەرامبەر سپای عەرەبی ئیسلام شکا و، بەرەو چیاکان کشایەوە، بەم ڕەیەدا ڕابرد... لە ساڵانی ١٨-٢٤ی کۆچییا سپای عەرەبی ئیسلام داگیری کرد، لەو حەلەدا لەژێر دەسەلاتی بنەماڵەی میهراندا بوو... ئەم بنەماڵەیە بەرەگەز ئەچوونەوە سەر بەهرام چوپینە ئەوەبوو سپا وەختی کوڕی میهران کوڕی بەهرام چوپین، بەرەنگاریی سپای عەرەبی کرد، بەڵام نوعمان کوڕی موقەڕین بەسەریا زاڵبوو، شاری ڕەیی سووتاند و، وێران کرد... پاش ئەوە ساڵی ١٣٦ کۆچی سنبادی سەرکردەی لەشکری ئەبو موسلیمی خوراسانی داگیری کرد لە ساڵانی ١٤١-١٥٢دا، ڕەی کەوتەوە برەو،

ئەبوعەبدوڵڵا محەممەد مەهدی وەلی عەهدی مەنسووری عەبباسی، چەند ساڵی لە شاری ڕەی دانیشت و ئاوەدانی کردەوە و شارێکی تازەی لێ هێنایەدی ناوی نا (محەممەدییە) و، بەدەوریا خەندەقێکی لێ دا کە پڕ بێ لە ئاو و دوژمن نەتوانی لەپڕ هەڵمەتی بدات داگیری بکات هارونی ڕەشید کوڕی مەهدی لەم شارەدا هاتۆتە دنیا، کە پاشان لە خوراسان مرد. پاش مردنی هارون ڕەشید هەرێمی ڕەی کەوتبووە بەر ئەمین کوڕی هارون ڕەشید. بەڵام ساڵی ١٩٥ کۆچی تاهیر زولیەمینەین (طاهر ذوالیمینین) سەرداری سپای مەئمون ئەم شارەی لە فەرمانڕەوایانی سەر بەئەمین داگیرکرد... ساڵی ٢٥٠ کۆچی، کە ئێرانییەکان خەریک بوون لە نیلەی دەسەڵاتی عەرەب ڕزگار بێن، بنەماڵەی عەلەوی تەبەرستان شاڵاویان کردە سەر خانەدانی تاهریان و ڕەی لەم شەڕانەدا، کەوتە وێرانی... ساڵی ٢٨٩ بنەماڵەی سامانی کەوتنە پەرەسەندن، ئیسماعیل سامانی شاری ڕەیی داگیرکرد... لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیا یوسف کوڕی ئەبو ساج لە سامانییان وەری گرت و خۆی فەرمانڕەوایی تیا کرد، بەڵام سامانییەکان بەهێزی خۆیان و هێزی خەلافەتی عەبباسییەوە شاڵاویان کردە سەری و لێیان داگیر کردەوە... بەڵام سوارو کوڕی شێرویە کە عەرەب ناویان ناوە ئەسفار، شۆڕشی هەڵگیرساند و شاری ڕەیی کرد بەپایتەختی خۆی پاش ئەم سەردەمە ڕەی کەوتە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئال بویە و پتر لە سەد ساڵ لەژێردەستی ڕوکن الدەولە ئال بویە و، کوڕ و کوڕەزایا مایەوە. ساڵی ٣٩٧ کۆچی مەجد الدەولە ئال بویە کە هێشتا نەیئەتوانی کاروباری وڵات ببات بەڕێوە و، سەیدە خاتوونی دایکی سەرپەرشتی ئەوی ئەکرد و، وڵاتەکەی ئەبرد بەڕێوە، لە دایکی یاخی بوو و، کاروباری وڵاتی سپارد بەخەتیر ئەبو عەلی و کردی بەوەزیری خۆی. ئەم وەزیرە سەیدە خاتوونی برد لە قەڵایەکا داینا و خستییە ژێر چاوەدێری.

بەڵام سەیدە خاتوون بەدزییەوە هەڵات و چووە ئەهواز بۆ لای بەدر کوڕی حەسەن وەیهی، بەدر بەلەشکرێکەوە ڕووی کردە ڕەی مەجد الدەولە و خەتیر ئەبو عەلیی گرت و هەردووکیانی خستە زیندان و، سەیدە خاتوونی کردەوە سەرپەرشتی کاروباری مەجد الدەولە... پاش ماوەیەک مەجد الدەولە لەسەر تەخت دانیشت، بەڵام براکانی و خزمەکانی ئەیانەویست وڵاتەکەی داگیر بکەن، لە ترسا هاواری بردە بەر سوڵتان مەحموودی غەزنەوی. سوڵتان مەحموودی غەزنەوی هەلی دەس کەوت و هەموو وڵاتانی ژێردەستی مەجد الدولەی داگیر کرد. بەڵام تەنها چەند ساڵێ بەدەستی مایەوە. پاش ئەوە لە ساڵی ٤٥٥ دا سوڵتان توغروڵ بەگی سەلجووقی شاڵاوی هێنا وڵاتەکەی داگیرکرد. لە ساڵانی

٥٢٩ و، تا ٥٤٧ سولتان مەسعوودی سەلجووقی ئەم ناوەی سپاردبوو بەکابرایەک کە ناوی (اینانج) بوو... ئەم (اینانج)ە کچەکەی خۆی دابوو بەئەمیر محەمەدی سەلجووقی کە بەجیهان پەهلەوان ناوبانگی دەرکردبوو و، کوڕی ئەتابەگ ایل دەگز بوو. پاش ئەم ڕەی کەوتە ژێر دەسەلآتی قوتلوغ (اینانج).

گوێگرە بەڕێزەکان... لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/٨/٦

**وتاری: ١٨٦**

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

لە وتاری ڕابردوودا، باسی شارستانی (ڕەی)مان کرد، کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەتەهران و، دەربارەی بەسەرهاتی ئەم شارە گەیشتینە ئەوێ کە کەوتبووە ژێردەستی سەلجووقییەکان...

موزیک

بەرلەوەی دەورانی مەغۆل دەس پێ بکا و، شالاوی تاتار زۆر جێی ئێران وێران بکات، شاری ڕەی شارێکی جوان و هەموو جۆرە هۆیەکی پێش ڕەوتی تیابوو، وەلێ خەڵقی شارەکە لەو سەردەمەدا پەیڕەوی تەنها یەک ڕچی ئیسلام نەبوون، بەڵکو زۆربەیان لە پەیڕەوانی ڕچی حەنەفی و شافیعی بوون، کە ئەمەش شوێنەواری سەردەمی عەبباسی و سەلجووقی بوو لە کاتی دەیلەمییە ئال بویەکانیشەوە، لەو شارەدا پەیڕەوانی ڕچی جەعفەری شیعی هەر هەبوون... و جارجارە لە نێوانیاندا دووبەرەکی ڕووی ئەدا... بەڵام کە مەغۆل و تاتار شالاویان هێنا ئیتر شاری ڕەی داری بەسەر بەردییەوە نەما چونکە ئەوان لە ساڵی ٦١٧ کۆچییا، قەڵاچۆیان کرد، ئەوانەی ڕزگار بووبوون خۆیان گەیاندبووە گوندەکانی ناو چیا سەختەکان... ساڵی ٦٢١ کۆچی بۆ جاری دووەم هەڵیان کوتایەوە ناو شارەکە بۆ لەناوبردنی ئەوانەی کە ڕەنگە لە مەرگ ڕزگاریان بووبێ... لە سەردەمی غازان خانی مەغۆلدا قەڵا تەبەرەک کە نزیک بەڕەی بوو بۆ ئەوەی پایەگای سپای مەغۆل بێ، سەرلەنوێ تازە کرایەوە، لەشکرێکی مەغۆل گوێزرایەوە وەرامین، کە تەیموری لەنگ هەڵی کوتایە سەر ڕەی لەبەرئەوەی وێرانە بوو، بێ گیروگرفت چووە ناوی، هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی لە ڕێی سپاکەیا نەدیت.

گەشتیاری بەناوبانگ (کلاویخو) کە لە دەرباری پادشای ئیسپانیاوە نامە و دیاری دەبرد بۆ تەیموری لەنگ و، ئەیەویست دەوری باڵیوز بگێڕێ و ساڵی ١٤٠٤ زایینی (واتا ٨٠٦ کۆچ) گەیشتبووە ڕەی لەم شارەدا خەڵقی بەرچاو نەکەوتبوو، خانووی نەڕووخاوی نەدیبوو، تەنیا وێرانە شارێکا تێپەڕ بووبوو، کە خاپیر بووبوو... لە ساڵی ١٧٩٧ زایینی بەدواوە، زانایانی ئاسار کەوتنە لێکۆڵینەوەی شوێنەوارەکان و زۆر لەو

شته دێرینه و عەنتیکەیانەی دۆزرانەوە بەهۆی بازرگانە قاچاغچییەکانەوە، نێررانە بازارەکانی ئەمەریکا و ئەورووپا و فرۆشران.

لە دەورانی فەتح عەلی شای قاجارەوە، شاری ڕەی کەوتەوە زیندووبوونەوە، خانووبەرەی تازەی تیا دروست کرایەوە. تەنانەت بەو ناوەوەکە ئارامگای شا عەبدولعەظیم لەوێیە و، پەیڕەوانی ڕێچی شیعەیی ئەچنە زیارەت شارەکە کەوتەوە زیندووبوون... ئەمڕۆ شارستانە و ناوچەی فەرمانداری ڕەی... و چوار لای بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی شەهریاری سەر بەکەرەج و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ وەرامین و لای باشوور و خوارووی ئەگات بەسنووری شارستانی قوم و لای خۆرئاواشی ئەگاتە بەخشی ناوەندی وەزرەند لە شارستانی ساوە.

شاری ڕەی ئەکەوێتە سەر ڕێی قوم هەروا جادەی ئەسفەهان و شارەکانی تری بەشی لای خواریشی لەوێوە ئەڕوات.

لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا ڕەی زۆر پێشکەوت تا ئەندازێ نزیکە لەگەڵ تاران تێکەڵ ببێ سەرژمێری خەڵقی شار، کە ئەگاتە دووسەد هەزار کەسێک.

شوێنەواری کۆن کە ماونەوە و لەژێر زەوی هێنراونە دەرەوە و لە سایەی ئەو لێکۆڵینەوەیانەوە کە زانایانی ئاسار ئەنجامیان داوە تەنانەت دوکتور اشمیتی نوێنەری مۆزەی بوستون و زانستگای فیلادلفیا... دەسنیشان کراون.

یەکەم ئەقارەخانە - گۆڕستانی دەیلەمییەکانی ئال بویە - بورجی توغرولی دەورانی سەلجووقی - تەپەی مورتەزا کورد - گۆیا هی سەردەمی ساسانییە... تەپەی چەشمە عەلی و بارووی شارەکە - گۆیا هی سەرەتای دەورانی عیلامە و، ئاستانەی حەزرەتی شا عەبدولعەظیم و لە پاڵ ئەم ئاستانەیەدا، گۆڕی زۆر لە پیاوانی گەورە هەیە.

موزیک

شەقامەکانی شاری ڕەی پانوپۆڕ و قیرتاوکراون، ئاوی شارەکە لوولەیە، بەرق و کارەبای شاری ڕەی سەر بەکارەبای گشتیی تارانە... لەم شارەدا ٢٤ گەرماو هەیە. چەندین هوتێل و مێوانخانە هەیە. پتر لە ٨٠ قاوەخانە و ٥٠ خۆراکخانەی تیایە. تەلگراف و تەلیفۆن و پۆستەخانەی تیایە. کارخانە و کارگەی گەچ، کەرپووچ، کاشی و موزاییکی تیایە. چەند کتێبخانەی تیایە، تەنانەت کتێبخانەی ئاستانەی شا عەبدولعەظیم کە گومبەزە زێڕینەکانی ئەم بارەگایە لە دوورەوە ئەدرەوشێتەوە لەم شارە و لە دێیەکانی دەوروبەریدا

نزیکەی ١٠ قوتابخانەی بەرز و، ٣٠ قوتابخانەی بەرایی و، بەنجا قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری کە لە لایەن سپای زانستەوە بەڕێوە ئەبرێن.

شاری ڕەی و دەوروبەری، خێوی چاترین زەویوزاری کشتوکاڵن... لەوێ گەنم، جۆ، برنج، گەنمەشامی و ذورات پێ ئەگات و، ئاژەڵ بەخێو ئەکرێت و سوود لە بەرهەمی ئاژەڵی وەرئەگیرێ، وەک ڕۆن و پەنیر، ماست، شیر، خوری... لە ڕەی و دەوروبەری کارگەی کرد و تەون و چنین هەیە...

جگە لەوانەی وترا چەندین دەرمانخانە، داروخانە و، نەخۆشخانەی تیایە. ئارامگای شاهەنشای مەزنی پەهلەوی ڕەزا شا لەم شارە دایە... لە تارانەوە تا ڕەی شەقامێکی زۆر گەورە کێشراوە بەناوی شەقامی ئارامگا بەناوبانگە...

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا کاتێکی تری خواتان لەگەڵ بەخواتان ئەسپێرین.

**١٣٥٤/٨/١٢**

**وتاری: ١٨٧**

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتەتان خۆش، سەربەرزیتان هیوای بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە.

لەم وتارەدا باسی یەکێکی تری لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی تەهران دەکەین، کە ساوەی ناوە. ئێمە لە پیتی (سین)دا ساڵێک لەمەوبەر لە هەندێ دەنگوباسی مێژوویی و سەرگوزشتیی و بەسەرهاتی ساوە دوابووین، بەڵام ئێستە کە باسی شارستانەکانی سەر بەئوستانی تەهران دەکەین، دەبێ جارێکی تری ئەو باسانە دووبارە بکەینەوە، کە گوێگرە خۆشەویستەکان بێتەوە بیریان و، پتر لە قسەکان بکۆڵنەوە و، لە کەموکوڕیی زانیارییەکانی بۆیان بڵاودەکەینەوە ئاگادارمان کەنەوە...

موزیک

ساوە: یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی ناوەندی و پایتەخت لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی بوئین زەهرا و ئاوەج کە هەردووکیان سەر بەشارستانی قەزوینن و هەروا لەگەڵ دوو بەخشی شەهریار و ئیشتیهارد کە سەر بەشارستانی کەرەجن. لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی غاردا کە سەر بەشارستانی ڕەییە و لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی قوم و بەخشی خەلەجستانی سەر بەشارستانی تەف ڕەش و لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی ڕەزەن و شەراء... و پیشخور کە هەر سێ سەر بەشارستانی هەمەدان و وەیا ئوستانی هەمەدانن... جێی شاری ساوە دەشتێکی پانوپۆڕە، لە ڕووی زریەوە تەنیا ٩٦٠ مەتر بەرزە و، لە شارە هەرە کۆنەکانی هەرێمی چیا -واتا ئیقلیمی جبال- یا عێراقی عەجەم-ە لە فارسییا ناویان ناوە (ساوج)، ئەم شارە ١٣٧ کیلۆمەتر دوورە لە تارانی پایتەختەوە و، ٨٧ کیلۆمەتریش لە قومەوە، کە نزیکترین شارستانە لە ساوەجەوە... ئاووهەوای ساوەج فێنکە و ناوەنجییە و لە چاو دەوروبەرییا تۆزێ گەرمە. لەبەرئەوەی شارێی زریەی خەزەر و خەلیجی فارس بەناو ئەم شارەدا ڕائەبوورێ بایەخێکی پەیدا کردووە... هەروا ڕێی چەگل و قومڕێژی قیرتاو نەکراوی بازرگانیی ئەسفەهان بەشارەکەدا ڕائەبوورێ و، ڕێی ئاسنیش هەر لەوێوە ڕائەبوورێ...

موزیک

بابێینه سەر مێژووی شاری ساوه، لەم ڕووەوه هەواڵی مێژوویی و ئەفسانەیی زۆره. دەڵێن کەیخوسرەو پادشای بەناوبانگ بەو ناوەدا ڕابردووه، جێی شاری ئاوەج زریه بووه و، لەو ناوەدا ئاوەدانی نەبووه، کەیخوسرەو دەستووری داوه بەفەرمانڕەوای ئەو ناوەی وتووه، نزیک بەئاو دەبێ سایەش هەبێ کە خەڵقی پەنای پێ ببات... پاش ئەوه ڕەبیب شاری ساوەی دروست کردووه، کە خەڵقی ئەو ناوه بێنه سەیرانی سەر ئاو و، لەوێ بحەسێنەوه... ئەگەر ئەم ئەفسانه مێژوویییه، بەڕاست بدەینه قەڵەم و لەسەردەمی کۆندا جێی ساوه و ئاوه هەموو زریه بووبێ، دەبێ وا بدەینه قەڵەم کە ناوی ساوه لە بنەڕەتا ساوه ئاوه بووه – واتا سەراسەر ئاو بووه- ئەو داستانەش کە ئاینییەکان ئەیگێڕنەوه ئەڵێن کاتێ حەزرەتی محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا لە دایک بووه، زریاچەی ساوه وشک بۆتەوه... ئەم قسانه گەرچی لە ژیرەوه دووره و، بەهۆشی هیچ هۆشمەندێکا ناچێ، کە لەگەڵ بەدنیا هاتنی محەمەددا زریه وشک بێتەوه، چون محەمەد ڕەحمەته، نەک زەحمەت و، محەمەد خێر و بەرەکەته نەوەک قڕوقاتی و، ئەگەر شتی وا ڕوویشی دابێ چۆن ئەم هەواڵه لەگەڵ شەوی لەدایکبوونی ئەودا گەیشتۆته ولاتی مەککە کە هەزار کیلۆمەتر لە ساوەوه دووره...

بەلام ئایا لەم ناوەدا زریاچە هەبووه؟ هەندێ لە مێژوونووسان گومانیان وایه کە لە دەورانی پادشاهی کەیانییەکاندا، لەسەر ئەو ڕووبارەی کە ئێستە پێی ئەوترێ (قەرەسو) و ناوه تورکییەکەی ئەگەڕێتەوه بۆ دەورانی مەغۆل و لەوەبەر ناوی سیا ئاو بووه، سەدی هەڵبەستراوه و، لەو ناوەدا زریاچەیێ پێکهاتووه... کە ئەم قسەیانەش جێی بڕوا نین... ئەگەر زریاچەی ساوەیەک وشک بووبێتەوه دەبێ ساوەی تەبەرییه بووبێ کە کەنداوێ بووه نزیک بەئەردەنی ئێستە و لە ولاتی مەککەوه زۆر دوور نەبووه...

دانیشتوانی شارستانی ساوه ئەگەنه ١٥٠ هەزار کەسێک، زبانی زۆربەیان فارسییه و هەندێکیان تورکی و هەندێ تاتی -واتا لوڕیەکی تێکەڵ بەگۆرانی- قسە دەکەن... لەم شارەدا ساختمانی دێرینه و کۆنی مێژوویی ئەمانەن (منارەی مزگەوتی مەیدان) هی ساڵی ٤٥٣ کۆچییە منارەی مزگەوتی هەینی هی ساڵی ٥٠٤ کۆچییە، شوێنەواری گۆڕی ئاسموئیل کە گۆیا لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بووه. زۆر گۆڕی ئیمامزادەش هەن لەو ناوه، وەک ئیمامزاده نوح، ئیمامزاده عورقوب، بەلام نووسەری ئەم بەرنامەیەش هەروەک گوێگره بەڕێزەکان لە مێژووا ناوی عورقوبی بەدروزنی بیستووه نەوەک بەئیمامزادەیی. هەڵبەستیارێکی عەرەب وتویه (قەواعید عورقوب لەها مەتەل – قواعد عرقوب لها مثل

* وما مواعیدوهم الا الاباطیل) واتا درۆ و بەڵێنەکانی ئەوانیش هەروەک هی عورقوب جگە لە پرووچ شتێکی تری نییە.

هەرچۆن ببێ ناوی لە کتێبە جوغرافییە تەئریخییەکاندا بەئیمامزادە تۆمار کراوە. شارستانی ساوە، ئاوی بۆری هەیە... کارەبا و بەرقی هەیە، سینەمایەکی تیایە، شەش خۆراکخانە و چەند میوانخانەی تیایە، ١٤ قاوەخانە و، ١٤ گەرماوی تیایە. یانەی وەرزشی هەیە تەلیفۆن و تەلگراف و بێ تەلی تیایە لە شارستانەکەدا ١٣ قوتابخانەی بەرایی و سێ قوتابخانەی ناوەنجی، ٦٠ قوتابخانەی بەرگری نەخوێندەواری تیایە، کتێبخانەیەکی تیایە، چەندین مزگەوت و حوسێنییەی تیایە.

ساوە شارستانێکی کشتوکاڵییە و، خەڵقەکەی هەروەک بەکشتوکاڵەوە خەریکن ئاژەڵیش بەخێو دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە ساوە هەمووجۆرە میوەیەکی هەیە بەڵام هەناری ساوە چاترین جۆرە هەناری بەناوبانگە و، کاڵەک و گوندورەشی هەر باشە.

لە ساوە، کرد و، جۆلاییش هەیە. لەوێ فەرش و قالی و مافووری باش دروست ئەکرێ، گلێم و جاجم و شتی تریش ئەهێنرێ... نەخۆشخانەیەکی تیایە لەگەڵ دە دەرمانگا و چەند داروخانە... گوێگرە بەرێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

١٣٥٤/٨/٢٠

## وتاری: ١٨٨

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ، ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی تەهران دەڕۆین، کە هەم ناوەندی ئوستانە و هەم پایتەختی ئێرانە و، لەمەوبەر ناوی چەند شارستانێکمان ڕوون کردەوە لە شارستانەکانی سەر بەتەهران تا ئێستە کاتی ئەوە هاتووە کە دەربارەی یەکێکی تری لە شارستانەکان بدوێین، کە ئەویش شارستانی قەزوینە...

موزیک

شارستانی قەزوین، ئەکەوێتە باشوور و لای خوارووی هەرێمی گیلانەوە، سەر بەئوستانی ناوەندیی. لەلای باکوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ڕود سەر و بەخشەکانی عەمارلو و جیرەند، کە سەر بەشارستانی ڕودبارن... لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی (تاڵەقان - هەشتگرد - ئیشتیهارد) کە سەر بەشارستانی کەرەجن و، لای باشووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی زەرەند و خەرقان کە سەر بەشارستانی ساوەن و هەروا لەگەڵ بەخشی ڕەزەن کە سەر بەشارستانی هەمەدانە و ئوستانی هەمەدانە. لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئەبهەر و قەیدار کە سەر بەشارستانی زەنجانن کە بۆتە ناوەندی ئوستان ژمارەی دانیشتوانی شارستان ئەگاتە نیو ملیۆن.

ئەم شارستانە حەوت بەخشی هەیە... یەکەم دەوروبەری قەزوین کە بەفارسی پێی ئەوترێ حەومە -بوئین - زیاء ئاباد (واتا تاکستان) - معلم کلایە (واتا ڕووباری ئەلەموت) - ئاوەج - ئابریک - طارمی خواروو (کە پێی ئەوترێ سپەردان). ناوەندی ئەم شارستانە شاری قەزوینە، کە شارێکی کۆن و بەربڵاوە، لە تارانەوە ١٤٤ کیلۆمەتر دوورە و، لەوێوە بۆ ڕەشت ١٨٧ کیلۆمەترە. بۆ زەنجانیش لە قەزوینەوە ١٧٤ کیلۆمەترە و لە هەمەدانیشەوە ٢٣٩ کیلۆمەترە، نزیکترین شار لە قەزوینەوە کەرەجە، کە ئەویش هێشتا (١٠٥) کیلۆمەترە ڕێیان لە نێوانایە...

شاری قەزوین ئەکەوێتە دەشتێکی پانوپۆڕ، لەوێوە تا بەندەر پەهلەوی ٢٦٤ کیلۆمەترە... ئەم قەزوینە هەوایەکی وشکی هەیە، لە زستانا تا بیست پلە ژێر سفر سارد ئەبێت و لە هاوینا ناوەنجییە، واش ئەبێ کە تا ٣٥ پلە گەرم ئەبێت، ڕیزە چیای

ئەلەموت: دەشتی قەزوین لە گەیلان جیا ئەکاتەوە... هەرچەندە هەندێ لە مێژوونووسان زریەی خەزەریان ناوناوە زریەی قەزوین... ڕیزە چیای خەرقانیش ئەکەوێتە نێوانی دەشتی قەزوین و دەشتی هەمەدانەوە... شوێنی شاری قەزوین گەرچی پێ دەشتە بەڵام هێشتا ۲۳۰۲ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە.

دانیشتوانی شاری قەزوین کە ناوەندی شارستانەکەیە، ژمارەی سەریان بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ گەییوەتە ٨٨١٠٦ کەس... زبانی خەڵقی شارەکە لە یەکەم پلەدا فارسییە، تورکی و کوردیشی تیا قسە ئەکرێ و لە دێهاتەکانی دەوروپشتی قەزوینیشدا کورد و تاتی زۆرن...

موزیک

بابێینە سەر بەسەرهاتی شاری قەزوین، گۆیا شاری قەزوین بەفەرمانی شاپوری یەکەمی ساسانی، وەیا شاپووری ذوالئەکتافی ساسانی دامەزراوە، بەڵام لەوەپاش تا سەردەمی ئیسلام چی تیا ڕووی داوە، بەتەواوی نازانرێ موستەوفی قەزوینی لە کتێبی تەئریخی گوزیدەدا، شتی زۆر سەیری دەربارەی قەزوین نووسیوە، بۆ وێنە دەڵێ: شاری قەزوین شوورەی هەبوو کە سپای ئیسلام بۆ داگیرکردنی هاتن، خەڵقی لەگەڵیان کەوتنە شەڕەوە و ماوەیەکی دوورودرێژ شارەکەیان گەمارۆ دا... خەڵقەکە پیاو و ژن و منداڵ چوونە سەربانەکان و لەوێوە سپای ئیسلامیان دایە بەر بەرد و تیر و پڕ بەدەم هاواریشیان ئەکرد:

«نە مسلمان بیم و نە گزیت دەهیم          بشی ئەو مەکەشی کاما برەهیم»

واتا نە موسڵمان ئەبین و، نە سەرانە ئەدەین... بچنەوە بۆ مەکە بچنەوە با ڕزگارمان بێ...

خاوەنی تەئریخی گوزیدە ئەم هەڵبەستەی بەپەهلەوی کۆن داناوە، کە ئەمڕۆکە ئەبینین تێکەڵە لە لوڕی و گۆرانی...

بەڵام پاش ئەم گەمارۆدانە لە سەردەمی خەلیفەی سێیەمدا، بەراء کوڕی عازب ناو ساڵی ٢٤ کۆچی بووە والی ڕەی... ئەم والییە لە سەرەتادا هەڵی کوتایە سەر ئەبهەر، ئنجا شاڵاوی کردە سەر قەزوین خەڵقی شارەکە، پێشنیلەکانی ئەویان گوێ گرت، بەڵام سەریان بۆ سەرانە دانەچەماند... هەروەک لە هەڵبەستەکەشا هەروایان وتبوو (نەگزیت) دەهیم... بەراء پاش ئەوەی بەسەر قەزویندا زاڵ بوو، هێزێکی سپای عەرەبی لە قەزوین دانا کە ژمارەیان پێنج سەد کەس ئەبوو، بەسەرۆکایەتی تولەیحە کوڕی خوەیلد ئەسەدی و

مەیسرەی عائیدی و، بەشێ لە زەویوزاری ئەو ناوەی خستە ژێردەستیان و لە ناو پێنج سەد کەسەکەدا زۆریشیان لە عێلی بەنی تەغلەبی عەرەبی بوون. بەمانە ئەوترا ئەساورە واتا سواران. ئەمانە بەسەر فەلاح و کشاوەرزەکانا، باج و پیتاکی دەسکەوتیان دانا کە دەیەکی دەرئامەت بوو، ئەم باج و پیتاکە تا سەردەمی عەبباسی رۆژ بەرۆژ پتر باری خاوەن کشتوکاڵ و خاوەن ئاژەڵەکانی قورس ئەکرد، لە سەردەمی ئەمەوییەکانا، کە هەرێمی چیا دژی ئەمەوی راپەرین، سەعید کوڕی عاس کوڕی ئومەیە هەڵی کوتایە سەر دەیلەمستان و شاری قەزوینی داگیر کرد و، کردی بەبنکەی هێزی سپایی... حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی - کە ناوبانگی بەحەجاج ظالم بووەتەوە، کوڕەکەی خۆی نارد بۆ شەڕی ولاّتی چیا، محەمەدی کوڕی گەیشتە قەزوین و لەوێ مزگەوتێکی گەورەی دامەزراند بەناوی مزگەوتی ثەور، ئەم مزگەوتەی لەو گەڕەکەی قەزوین دروست کرد، کە سپای عەرەبی ئیسلامی تیابوو و پێی ئەوترا گەڕەکی بەنی جونەید، لە سەردەمی عەبباسیدا، موسا کوڕی هادی گەیشتە قەزوین و فەرمانی دا بەرامبەر بەشاری قەزوین شارێکی تری دروست کراوە زەویوزاری روستە ئاوای کردە وەقفی جێگە گشتییەکانی شارەکە وەک مزگەوت و، پرد و، گەرماو و، عەمری کوڕی رۆمیی کردە فەرمانڕەوای ئەوێ و، ئەم شارە ناونرا (قەزوین موسا)... کە هارون رەشید بوو بەخەلیفەی عەبباسی و بەقەزویندا رابرد، خەڵقی شارەکە چوونە پیرییەوە و سکالاّیان کرد و دەردی دڵیان بۆ کرد و، داوایان لێ کرد باج و پیتاکی سەر کشتوکاڵیان لێ کەم بکەنەوە کە لەوەبەر ئەندازەی دەیەک بوو. هارون فەرمانی دا باج و پیتاکیان سووک کرد و، لەوێ مزگەوتێکی گەورەیان دروست کرد و، دوکان و بازاڕ و شتی تریش دروست کرا.

موستەوفی قەزوینی کە خۆی خەڵکی قەزوین بووە، زۆر باس و هەواڵی سەیری کۆکردۆتەوە... تا رادەیەک زۆر فەرمودەشی لە زمانی پێغەمبەرەوە لە کتێبەکەیا تۆمار کردووە، کە زانایانی زانستی فەرمایشی پێغەمبەر، بەدرۆیان داوەتە قەڵەم.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو پاش وەی ئەم وتارە مایەوە بۆ هەفتەی داهاتوو. تا ئەو حەلە بەخواتان دەسپێرین خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/٨/٢٧

گوێگرە خۆشەویستەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، لە وتاری پێشوودا کە نە باسی شارستانی قەزوین دواین گەیشتینە ئەوێ کە قەزوین لە سەرەتای شالاوی عەرەبی ئیسلامدا هەبووە، ولاتەکە پاش شەڕ و بەرەنگاری ئنجا سەری بۆ ئیسلام دانەواندووە هەندێ خەڵقی ولات موسوڵمان بوون و هەندێکیان بەناموسوڵمانی ماونەوە و سەرانەشیان نەداوە... گوایە لە دەورانی عەبباسیدا شارەکە پەرەپێدراوە، شارێ بەناوی قەزوین موسا و شارێکی تری بەناوی قەزوین موبارەک خراوەتە سەر کۆنە شارەکە... نە سەدەی چوارەمدا قەزوین کەوتە ژێر دەسەلاتی ئال بویە، ساحێب کوڕی عەببادی وەزیری فەخرالدەولە ئال بویە شوورەیەکی کێشا بەدەوری شاری قەزویندا...

ناسر خوسرەو، بەقەزویندا ڕابردووە، باسی خۆشی شارەکە و سەختی دیوار و باروو کونگرە و قەلاکانی کردووە و، لەوەدوا قەزوین چەند جارێ بەر بوومەلەرزە کەوتووە، وێران بووە... بەلام پاش ئەوەی حەسەنی داعیی عەلەوی دژی ئەلەموتی دامەزراند و، بنەماڵەی شێخانی عەلەوی تا سەردەمی حەسەن سەباحیش ڕۆژ بەڕۆژ دەسەلاتیان لە پەرەسەندن بوو، هەم بەرامبەر بەئال بویە و، هەم بەرامبەر بەسولاجیقە و عەباسییەکان، ولاتیان ئەپاراست، ئیتر کەمتر ناوی قەزوین دەبرا...

لە سەردەمی سەفەوییەکاندا جارێکی تری قەزوین کەوتەوە پەرەسەندن و ماوەیەک پایتەختی ولات بوو... لەوێ چەند ساختمانێکی بەناوبانگ لەو دووره دامەزرا وەک عالی قەپو -واتا دەرکی بەرز- ئەو ساختمانەیە کە تا ئێستەش خەڵقی ئەچنە دیتنی و شارەبانیی تیایە. هەروا ساختمانی چل ستونیش هەر هی ئەو دەورەیە... ئارامگای شازادە حوسێنییش، لە لایەن زینەب بیگمی خوشکی شا عەبباسی سەفەوییەوە دروست کراوە. پاش دەورانی سەفەوی، جارێکی تری شاری قەزوین پاشەوپاش کشایەوە، لە ئاوەدانییەوە رووی کردە وێرانی و گەرچی ناوی ١٧ گەڕەکە کۆنەکە هەر هەبوو... بەلام زۆربەیان وێرانە بوون، لە سالانی ١٣١٠ فارسی بەدواوە، لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا، قەزوین زیندووبووەوە، کەوتەوە خۆی... هەم لە ڕووی کشتوکاڵ و باغ و میوەوە پەرەی سەند و، هەم ڕێی ئاسنینی قەتار بووە هۆی ئەوەی دەسکەوتی هەرێمەکە بنێرن بۆ تاران و بۆ جێگەی تری. ئەمڕۆ لە دەشتی قەزویندا سەدەها کارخانە دامەزراوە وەک کارخانەی

دروستکردنی پارچە و کاڵا بۆ جلوبەرگ، کارخانەی کرد و تەنین و چنین بۆ قاڵی و، فەرش و، شتی تری. ئەمڕۆ لە دەشتی قەزویندا گەورەترین مەزرا دامەزراوە بۆ پێگەیاندنی جوجە و بەناوهێنانی هێلکە... شەقامی تاران - بەغدا بەناوەندی قەزویندا ڕائەبووری و، بڕیار وایە شارێ ئوتوبانی کە لە تارانەوە گەییوەتە پایینی کەرەج، بەزووترین کات بگاتە قەزوین.

## موزیک

ئەمڕۆ لە دەوروبەری قەزوین و ناو شارا سەدەها قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی بەرەنگاریی نەخوێندەواری هەیە کە لەلایەن سپای زانستەوە بەڕێوە ئەبرێن... دەیان قوتابخانەی ناوەنجی هەیە هی کوڕانە و کچانە... لە شارەکە و شارەکانی نزیکیدا تەلگراف - تەلیفۆن - و پۆستخانە - ئاوی لوولە و بۆڕی، کارەبا و بەرق هەیە.

لە شاری قەزویندا چەند سینەما، نزیکەی سەد و پەنجا ڕیستۆران و جێی نانخۆری و، سەد خۆراکخانەی پلاو و گۆشت - چل گەرماوی پاکوخاوێن و چەندین هوتێل و مێوانخانەی تێدایە. ژمارەی دانیشتوانی شارستانی قەزوین بەهەموو بەخشەکانییەوە ئەگاتە نیو ملیۆن... بەڵام دانیشتوانی خودشاریی قەزوین ئنجا نزیکەی نەوەد هەزار کەس ئەبێ، زۆربەی دانیشتوان بەفارسی قسە دەکەن، کورد و تورکیش لەو ناوەدا هەن. ڕچی ئاینی شیعەیێتییە لەو ناوەدا مەسیحیش هەن.

لە ڕووی ئابوورییەوە، کارخانەی مەیکەدە، کارخانەی پەمۆ پاکژکردنەوە، کارخانەی ڕۆنی گیایی، بەرهەم و دەسکەوتیان بەوڵاتی ئێراندا بڵاوئەبێتەوە... جگە لەوە دەسکەوتی کشتوکاڵی ئەمانەن: دەغڵ و دانەوێڵە... گەرچەک - تووی گوڵەبەرڕۆژە - بادام - گوێز - مێوە، تەنانەت ترێ و مێوژ. لە هەرێمی قەزویندا ئاژەڵیش بەخێو دەکرێ دەسکەوتی ئاژەڵیش بریتییە لە خوری، ڕۆن، شیر، پەنیر... و شتی تری.

لە قەزویندا چەند شەقام و خەیابان هەیە، بەڵام دوو شەقامی سەراسەری کە ناویان پەهلەوی و شا لە باکور و لای ژووری شارەوە تا باشوور و لا خواری شار درێژە ئەکێشن. چەند شەقامی تریشی تیایە بەم ناوانە: (فیردەوسی - خەیام - مەولەوی - سپەهـ).

شوێنەواری دێرینەی و مێژوویی ئەمانەن:

منارەی مزگەوتی مەیدان - منارەی مزگەوتی هەینی - مزگەوتی هەینی خۆی کە هی سەردەمی مەغۆلە - نەزەرگایی بەناوی (اثموئیل) لە پێغەمبەرانی ئیسرائیلی.

گونبەزەکەی ئارامگای موستەوفی قەزوینی - چەندین ئیمامزادە...

لە قەزویندا، چەندین مزگەوت و حوسێنییە هەیە، گۆیا مزگەوتی گەورە بەناوی ئیمامی شافیعییەوە دروست کراوە، پاش ئەوە چەند تازەکراوەتەوە، هەیوانی زلی بۆ دروست کراوە کە پێی دەوترێ شەبستان. لە هەرێمی قەزوینیشدا دێرینە و شوێنەواری تر زۆرە.

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/٩/٤

**وتاری: ١٩٠**

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و کامەرانی بەسەربەرن، هۆی سەربەرزیانە کە ئێوەی گوێگری بەڕێز، لە بەرنامەکان ڕازی و، سوودمەند بن. هێشتا هەر لەسەر باسی تەهران دەڕۆین، کە وتمان هەندێ لە مێژوونووسان و جوغرافیا زانان، بە (طێ)ی گەورە دەینووسن و هەندێ بە (تێ)ی بچووک، بەڵام ئێمە لە کاتی خۆیا باسمان نەکردبوو، هێشتبوومانەوە بۆ ئەوەی لە پیتی (طێ)دا لێی بدوێین.

موزیک

لەم وتارەدا دەربارەی (قوم) ئەدوێین کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی تەهران؛ ئەم شارستانە تەنیا دوو بەخشی هەیە: یەکەم دەوروبەری کە پێی ئەوترێ (حەومە) دووەم (کوهەک). سنووری شارستانی قوم بەم جۆرەیە: لای باکور و ژوورەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی ساوە و بەخشی غاری سەر بەئوستانی ڕەی... لای باکوری خۆرهەڵاتییەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی وەرامینی سەر بەشارستانی تاران... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنووره لەگەڵ زەریاچەی خۆی -کە بەفارسی پێی ئەوترێ دەریاچەی نەمەگ- هەروا لەگەڵ شارستانی کاشان... و لای باشوور و خواریشەوە دیسان هاوسنووره کاشان و بەخشی مەحەلات... و لای خۆرئاواشەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی خەلەجستانی سەر بەشارستانی تەفرەش. سەر زەویی شارستانی قوم دەشتانە، تەنیا ٩٧٥ مەتر لە ڕووی زریە بەرزترە، لای خۆرئاواوە ئەگات بەکلکەی چیای خەرقان و، لای باشووری خۆرئاواشەوە ئەگاتە ڕیزە چیاکانی کلکەی ئەلوەند، دێیەکانی سەر بەشارستانی قوم ئەکەونە لای خۆرئاوای و لای باشووری... چاترین دێی سەر بەقوم ئەمانەن: قوهستان - ئەردەهال - جاسپ... ئاووهەوای قوم، لەبەرئەوەی نزیک بەبیابانی کەویرە لە هاوینا گەرمە و ئەگاتە ٤٠ پلە سەرووی سفر و، زستانان هەوای ناوەنجی و فێنکە و، لە ساردترین ڕۆژانی زستانا ئنجا دەگاتە ٧ پلە سەر سفر... بەڵام دێهاتەکانی سەر بەشارستانی قوم تەنانەت جاسپ بەخۆشی هەوا و فێنکی بەناوبانگن... شارستانی قوم ١٨٠ کیلۆمەترە لە تارانەوە و، لەوێوە بۆ ئەسفەهان ٢٦٥ کیلۆمەترە. جادەی قیرتاوکراوی ئەسفالتی ئەسفەهان - تاران و ڕێی ئاسنی قەتار و شەمەنەفەر بەشاری قومدا ڕائەبوورن.

ژمارەی دانیشتوانی شارستانی قوم بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٥ گەییوەتە ١٨٦ هەزار کەسێک. بەڵام کتێبی (ایران زەمین) وای تۆمارکردووە، کە ژمارەی دانیشتوان ١٣٤ هەزار کەس بووە. بێ گومان مەبەستی نووسەری کتێبەکە خەڵقی شاری قوم نەوەک هەموو شارستانەکە.

بابێینە سەر باسی مێژوویی قوم، هەندێ لە مێژوونووسان دیرێکی دامەزرانی ئەم شارە دەبەنەوە بۆ سەردەمی پادشایانی پێشدادی کۆنی ئێران و، یاقوتی حەمەوی ئەڵێ ناوی ئەم شارە لە سەرەتادا کومەندان بووە، پاش ئەوەی عەرەبی ئیسلام داگیریان کردووە، ناوەکە گۆڕاوە بەقوم بەڵام ڕەنگە ئەم بیروباوەڕە شتێکی خەیاڵی بێ... دوور نییە ناوەکە هەر لە قومەوە هاتبێ کە بەفارسی پێی دەوترێ ڕیگ و ڕەنگە لە بنەڕەتا ناوی قوم فارسیی کۆن بووبێ و کەوتبێتە تورکییەوە، چونکە وا دراوەتە قەڵەم، کە کتێبی بەچێر و خەتی پەهلەوی دەورانی ساسانی ماوەتەوە ناوی خوسرەو کوازان وریزکییە... لەم کتێبەدا ناوی شاری قوم تۆمار کراوە...

## موزیک

هەندێ لە مێژوونووسان وتویانە: قوم لە سەردەمی هەخامەنشیدا هەبووە، بەڵام ئەسکەندەری مەکدۆنی وێرانی کردووە... بەڵام لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا ئەم شارە هەبووە و، عەرەب داگیریان کردووە و، کاروباری بەڕێوەبردنی و باج و پیتاکی بەستراوە بەوالی و فەرمانڕەوای ئیسفەهانەوە نەوەک بەفەرمانداریی ڕەیەوە کە لێیەوە نزیکتر بووە، گوایە لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا شاری قوم دووبەش بووە (میخان و کمندان).

لە سەردەمی ئال بویەدا ئەم شارە قەڵا و شوورە و باروی هەبووە، پاشان ئەم قەڵا و باروانە بەهۆی شەڕوشۆڕ و بوومەلەرزەوە ڕووخاوە، یاقوتی حەمەوی ئەو کۆنە قەڵایانەی بەچاوی خۆی دیوە و زۆری بە بازاڕ و مزگەوت و کۆشک و باڵاخانەکانیدا هەڵداوە... بەڵام پاش ئەوەی ئەو دیویە، لە لایەن مەغۆڵەوە شاڵاو کراوەتە سەری و وێران کراوە... موستەوفی قەزوینی نووسیویە: شوورەی قوم لە شوورەی قەزوین پانوپۆڕترە بەڵام شارەکە وێرانەیە، پاش ئەوە دووبارە شارەکە ئاوەدان کراوەتەوە. هۆی ئەوەی کە خەڵقی زۆر دەربەستی ئەم شارە هاتوون ئەوەیە کە ئارامگای مەعسوومەی تیایە، گوایە مەعسوومە ناوی فاتیمە و خوشکی ئیمام ڕەزایە، لە مەدینەوە هاتووە بچێ بۆ مەشهەد لەوێ ژارخوار کراوە. بەڵام زۆر سەیرە مێژوونووس و جوغرافیازانەکانی کۆنی ئیسلامی، وەک ئیبن

حەوقەل و ئیستەخری و یاقوتی حەمەوی و موستەوفی قەزوینی هیچیان باسی ئەوەیان نەکردووە، کە خوابگای مەعسوومە لە قومە...

لە سەدەی دەیەمی کۆچییا شا ئیسماعیلی سەفەوی زۆر هەوڵی دا کە قوم ئاوەدان بێ و، لای باکووری ئارامگای مەعسوومەوە هەیوانێکی بەرزی دروست کرد... هەروا شا تەهماسپ یەکێکی دانا بەسەر ئارامگاکەوە، بەناوی (قەولیەت) و سەرپەرشتیکردنی ئەو خوابگایە، ئەو حەلە هێشتا گومەزەکەی ئاڵتوونی نەبوو...

شا سەفی سەفەوی بۆ ئەوەی ژن و پیاو جیاواز دابنیشن هەیوانێکی گەورەی دروست کرد تایبەتی بۆ ژنان. پاش ئەوە شا عەبباس موشەبەکێکی لە پۆڵا دروست کرد بۆ سەر خوابگاکە و، لەوە بەدوا لە لایەن خەڵقی وڵاتەوە ساڵ بەساڵ ئەم خوابگایە ڕازاوە و، گومەزەکەی تازە کرایەوە و، گیرا لە زێڕ.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان دوایی هات، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٤/٩/١٢

## وتاری: ١٩١

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

ئێمە هێشتا لەسەر باسی (قوم) دەڕۆین. لە وتاری پێشوودا وتمان: مێژوونووسان لایان وایە کە قوم یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێران زەمین، چون کەوتۆتە سەرەڕێی، کاروانەڕێی شارەکانی لا خوار و باشووری وڵات... و خۆرهەڵات و خۆرئاوای وڵات. تەنانەت ڕێی ئاوریشم و بازرگانی تری، نێوانی چین و ئێران - کە لە خوراسانەوە بەرەو تیسفون -واتا بەغدای ئێستە- ڕۆییوە بەم هەرێمەدا ڕابردووە. جا دوور نییە ئەم شاری قومە کۆن بووبێ. مێژوونووسان بۆ گەواهی لەسەر کۆنێتیی شاری قوم ئەفسانەیەکیان تۆمار کردووە ئەڵێن: یەکێک لە پادشایانی ساسانی، لە کابرای یاوەری خۆی دەپرسی، دەڵێ: دەبێ بێنی بەهەشت چۆن بێ؟ کابرا لەوە ڕاما دەڵێ: بێنی سێوی شاهی - گوڵی فارسی - شەرابی خوسرەوانی - نەرگسی مسکی - وەنەوشەی ئەسفەهان - نیلۆفەری سیروان - زەعفەرانی قوم... و چەند شتێکی تریش کە ئەو هەوڵی داوە ئەگەر لە کاتێکا یەک بگرن، بێنی وەک بێنی بەهەشت ئەهێننە دی... لەم باسە ئەفسانەییە کۆنەدا ناوی قوم براوە، کە گوایە یەکێک لە بەرهەمەکانی زەعفەران بووە...

لە سەردەمی ئیسلامیشدا، بەو هۆیەی قوم لە ناوەندی ئەسفەهان و ڕەیدا بووە، ناوبانگی هەبووە. تەنانەت کە مەرقەدی حەزرەتی فاتیمەی مەعسومەی خوشکی ئیمام ڕەزا لەوێ بووە و، هەزاران کەس چوونە زیارەتی و، بەگومەز و منارە ڕازاوەتەوە، زۆرتر ناوبانگی داوەتە ئەم شاری قومە، بەڵام لە سەرەتای شاڵاوی مەغۆلدا ئەم شارە بەر تاڵان و برۆ کەوتووە، کاول و وێران بووە. پاشان تۆزێک ئاوەدانی ڕووی تێ کردووە، بەڵام دیسانەوە بەر هێرشی ئیلخانیانی تەیووری لەنگ کەوتووە و، خاپوور بووە... لە سەدەی دەیەمدا، سەفەوییەکان، زۆر دەربەستی قوم هاتوون و کەوتوونە ئاوەدانکردنەوەی... بەڵام پاش ئەوە، لەو شەڕانەدا لە نێوان ئاخر پادشای سەفەوی و ئەفغانەکاندا ڕووی داوە، جارێکی تری قوم وێران بووەتەوە، چون ئەفغانەکان ئەم شارەیان کردبووە بنە و پایەگای خۆیان... لە سەردەمی قاجاردا، فەتح عەلی شا هەر بەلاوی بەڵێنی دابوو، هەرکات ببێ بەپادشا باشترین تەعمیرات لە بارەگای مەعسومەدا بکات، هەرکە بووە پادشا دەستووری دا گومەزەکەی مەعسومەیان بەخشتی (توجی زەرد) پۆشی و، خشتەکانیان

ئالآوز و بەزەڕ ڕۆکیش کرد و، لە شارەکەشدا نەخۆشخانەیەکی بەناوی (دار الشیفا) دروست کرد و، ئاموزشگاییێکی ئاینی دامەزراند و، میوانسەرایەکی دامەزراند و، گۆڕخانەییێکی بۆ خۆی و بنەماڵەی دروست کرد. لە سەردەمی ناسرەدین شادا باروو بورج و قەلا بۆ شاری قوم دروست کرا... و باغ و باغاتی لێ درا... هەر لەم سەردەمەدا کە ئەمین سوڵتان هەیوانی ئاینەبەندی مەعسوومەی بناغە دانا و پاش مەرگی و ئەو کوڕەکەی کە ناوی ئەتابەگ عەلی ئەسغەر خان بوو، پێکی هێناوەتەوە و کرد و شاری قوم پەرەی سەند و ڕازایەوە...

## موزیک

لە ساڵی ١٣٠٧ فارسی بەدواوە، لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا کەوتە گۆڕان، بۆ یەکەم جار بەفەرمانی ڕەزا شای مەزن گەورە گۆڕستانە گەورەکەی لای باکوری بارەگای مەعسوومە تەخت کرا و دوو لای کرا بەشەقام کە بەفارسی پێی ئەوترێ خیابان و ناوەندی کرا بەباغ و باغچە، شەقامەکان ناویان نرا شەقامی ئاستانە و شەقامی ئیرەم و، ئەم شەقامانە تا دەمی بازاڕ درێژەیان پێ درا و، لای کۆنە مەیدانی شارەکەوە شەقامێکی تری پانوپۆڕ لە خۆرهەلآتی شارەوە بەرەو خۆرئاوای شار کێشرا... و هەروا لای مزگەوتی گەورەی شاریشەوە شەقامی بەهروز کێشرا و، بەم جۆرە شاری قوم دیمەنێکی نوێیە پەیدا کرد، تەنانەت پاش ئەوەی کە (قوتابخانەی ناوەندی حەکیم نیزامی، نەخۆشخانەی فاتیمە، نەخۆشخانەی سیهامیە، نەخۆشخانەی نیکویی و مزگەوتی گەورە و مەدرەسەی حوجەتیە) دروست کران، جگە لەمانەی وترا لە قومدا مزگەوتی ئیمام حەسەن، مزگەوتی جومعە - مزگەوتی پەنجەی عەلی و بازاڕی تیمچە، لە ساختمانە کۆنەکانی هەرە جوانی شاری قومن.

ژمارەی دانیشتوانی شاری قوم بەپێی ڕۆژگار گۆڕاوە ساڵی ١٢٨٦ کۆچی دانیشتوانی قوم ژمارەیان ٢٤ هەزار کەس بووە و، ساڵی ١٣٠٤ بووەتە ٣٥ هەزار کەس و ساڵی ١٣١٦ گەییوەتە ٥٥ هەزار کەس و ساڵی ١٣٢٦ گەییوەتە نزیکەی ٨٤ هەزار کەس.

شاری قوم لەبەرئەوەی لەو هەرێمەدا شاری تری نزیک نییە، جێی بازرگانی و کڕین و فرۆشتنە... خەڵقی دەوروبەری ڕووی تێ ئەکەن، لەبەرئەوە بازاڕێکی دوو هەزار دوکانی تیایە... نزیکەی ٣٠ گاراژ، ٤٠ میوانخانە و، هوتێل و، ٧٨ چاخانە و، ٧٥ نانەواخانە و ٣٥ قەسابی تێدایە... کە ئەم جێیانە لە کاتی زیارەتدا ئەوەندە قەڵەباڵغ و شلۆقن بەر ناکەون تەنانەت لە مانگەکانی (محەڕەم سەفەر - ڕەمەزان)دا.

زانســـتگەی ئاینی شــاری قــوم کــە پێی دەڵێن حــەوزەی عــیلم، گــەرچی لە ســەرەتا موسوڵمانەتییەوە دەستی پێ کردووە، بەڵام لە ساڵی ١٣٤٠ کۆچی بەدواوە پەرەی سەند، قوتابخانە ئاینییەکانی سەردەمی سەفەوی و سەردەمی قاجار هەموو خرایە ژێر دەستووری و نیزامێکەوە و، حەوزەی عیلمیەی لێ پێکهات وەک لە وتاری ئایندەدا باسی دەکەین، ئێستە کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده خواتان لەگەڵ، ئەم کاتەتان باش.

١٣٥٤/٩/١٨

**وتاری: ۱۹۲**

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتات بەشادی و خۆشی ڕابوێرن.

ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی قوم دەڕۆین... ئەوەبوو لە وتارەکانی ڕابردووا، مێژووی قومان ڕوون کردەوە، هەروا لەوەش دواین کە قوم چەند جارێ بەر شالاوی دوژمن کەوتووە، وێران بووە، دووبارە ئاوەدان بۆتەوە... لەوەش دواین کە گەورەترین هۆی ئەوەی کە ڕابەرانی ولاتی ئێران دەربەستی قوم پتر هاتوون ئەوەیە کە ئارامگا و مەزاری حەزرەتی مەعسوومە فاتیمە خاتوونی خوشکی ئیمام ڕەزای تێدایە. هەر لەبەر پیرۆزی ئەم جێگەیە تا ئێستە وەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە تەرمی چەند کەسێ لە پادشایانی ئێران لەوێ نێژراوە، کە ئەمانەن: شا سەفیی سەفەوی یەکەم - شا عەبباسی سەفەوی دووەم - شا سلێمانی سەفەوی - شا سوڵتان حوسێنی سەفەوی - شا تەهماسپ دووەم - فەتح عەلی شای قاجار... کە لەمانە پێنجیان لە گومەزەکەی حەزرەتی مەعصوومەدان جگە لەم شاریارانە، زۆر پیاوی گەورە لەو خاکەدا نێژراوە، وەک عەلی بن جەعفەر - ئەحمەد بن قاسم - حارث بن احمد بن زين العابدين - ئیمامزادە جەعفەر - ئیمامزادە ئیبراهیم - موسای مویەرقەع... ئەمانە هەموویان گومەز و بارەگایان بەسەرەوە دروست کراوە، هەروا ساختمانی ئاستانەی زەید کوڕی عەلی - ساختمان و گومەزی چل دوختەران... ئەمانە هەموو لە دێرینە و شوێنەوارانی کۆنی قوم ئەدرێنە قەڵەم.

موزیک

زۆر لە نووسەران و شاعیران و، زانایانی گەورە پاڵشت دراونە قوم، وەک یەعقوب قومی کە یەکێ بووە لەوانەی لە حەدیث و فەرمایشاتی پێغەمبەرا شارەزا بووە - سەدرەدین قومی یەکێک بووە لە عولەمای ئیمامیە - مەلا محەمەد تاهیری قومی، دانەری زۆر کتێب بووە لە فیقە و تەفسیرد... تا ڕادەیەک کە وتراوە نیزامی گەنجەییش خەڵقی قومە... گوایە وتوویە: (چو در گرچه دربحر گنجەگم * ولی زقهستان شهرقمم)... بەڵام زۆر لە مێژوونووسانی ئەدەبی، ئەم هەواڵەیان بەدرۆ داوەتە قەڵەم. چونکە شێوەی هەڵبەستەکە لە هی گەنجەوی ناچێ... نیزامی گەنجەیی ئەگەر ئەم ڕەگەزەی پاڵشت بەخۆی بدایە، لەو قەسیدەیە وا ئەیووت: کە باسی شوێن و ڕەگەزی خۆی دەکا و دەڵێ: (گرت

پدرم بەنسبت جد * یوسف پسر زکی مؤید)... و لە پاشان ئەڵێ:

گـرمـا ورم ان رئیـسـەء کـرد
مـادر صـفـتـانە پیش من مـرد

دیارە ئەوەی کە وتوویانە؛ هەڵبەستراوە...

## موزیک

ئەمـڕۆ لە قـوم و دەوروبەریـا دەیان قـوتابخـانەی منالان، قـوتابخـانەی بەرایی، قـوتابخـانەی ناوەنجی و مـامـۆستـایان هەیە... دە قـوتابخـانەی ئاینیشی تێدایە... چەند کتێبخانەی تێدایە... لە هەموویان گەورەتر کتێبخانەی حەزرەتی مەعسـوومـەیە. چەند ڕۆژنامە و گۆڤاری تیا دەرئەچێ وەک:

ڕۆژنامـەی ئوستـواری حەفـتـەیی مەجـموعـەی حیکمـەتی حەفـتـەیی - سـەرچەشـمـەیی حەفتەیی - مەکتەب ئیسلام مانگانە...

لەم شـارەدا ۱٦۳ گـەرمـاو و - چەندین هوتێل و میـوانخـانە هەیە. چەندین بانک و - گاراژی تێدایە کە کاروباری میـوان و ڕێبوار جێبـەجێ دەکەن... لە قـومـدا نزیکەی ۱۰۰ خۆراکخـانەی تیـایە، کـەباب و خـواردەمـەنی تری تـیـا دروست ئەکـرێ. ۱٦۰ قـاوەخـانە و چاخانەی تیایە.

بەرق و کـارەبا و تەلیـفـۆنی هەیە... ئاوی شـار هی لوولە و بۆرییـە. لە قـومـدا چەند نەخـۆشـخـانە هەیە، چەندین دەرمـانگا - داروخـانە مـەتەب هەیە... لە لایەن ئابوورییـەوە دەوروبەری شاری قوم بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن. سـەر زەوی قوم، بەهۆی ئەم ڕووبار و شـیـوانەوە ئاو ئەدرێ: کـە لە چیـاکـانی گـوڵ پایەکـانەوە سـەربەرەو خـوار ئەبێتەوە. وەک: (گوڵ ئەفشـان - ئەناربار - لەعل ڕود - لەعل بار) ئەم ئاوانە گەرچی لە سـەرچاوەوە شیـرینن... بەڵام کە دەگەنە نزیـک قوم چونکە سـەر زەوییـەکە شوورەزارە، شۆر ئەبن... خەڵکی شـاری قـوم لە هاتوچۆی خەڵق کە ئەچن بۆ زیارەت، سـوود و قـازاجـیـان زۆرە، تەنانەت ئەو کـارگـە و کـرێکارانەی گـۆڕ هەڵکەنن... لە شـاری قـومـدا ۲۰ کـورەی خشـتی سوورەوەکـراو هەیە و، چەند کورەی گـەچ و ئاهـکێش هەیە، هەروا لە شـاری قـوم کـارخـانەی جـولایی-هەلاچی- تەون و کـرد هەیە. فـەرش و قـالیی قـوم ناوبانگی هەیە. قوتابخـانە ئاینییـەکانیـان مەلا و ئاخوندی باش پێ ئەگەیێنێ... لە قومدا سینەمـا و تیـاترۆ و جێگەی قـومـار و شـتی خراپ قەدەغـەیە، چون شارێکی ئاینـییە و خەڵقەکەی پارێزگار و

توندوتیژن. له شاری قوم زۆر دوکان و مەغازە هەیە کە تەنیا گوڵدان و کاسە و گۆزەی لە قوڵەکراوە سوورەوەکراو ئەفرۆشن...

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواو بوو، تا وتاری ئاینده بەخواتا ئەسپێرین خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/٩/٢٤

**وتاری: ١٩٣**

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، هیوامان خۆشحاڵی و سەرکەوتنتانە، ئێمە لەم بەرنامەیەدا گۆشەیی تری لە پێشینەی (تەهران)تان بۆ ڕوون دەکەینەوە، هەم لە ڕووی جوغرافی و هەم لە ڕووی مێژوویییەوە. لەم هەلەدا باسی (کاشان) دەکەین کە هەم شارستانێکە و هەم شارێکە ناوەندی شارستانەکەیە و چوار بەخشی هەیە: یەکەم حەومە -واتا دەوروبەری-. دووەم ئەران، سێیەم قەمسەر. چوارەم نەتەنز و، سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای باکوری هاوسنوورە لەگەڵ کەویری خۆی و زریاچەی قوم... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئەردستان... و لای باشووری خۆرئاوایەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی مەیمەی سەر بەئەسفەهان... و لای خۆرئاواشەوە ئەگاتە سنووری بەخشی دەلیجانی سەر بەمەحلات و، ئەکەوێتە ٥١ پلەی درێژایی و ٣٣ پلەی پانایی و لە ڕووی زریە ٩٤٥ مەتر بەرزترە و، سەر زەوییەکەی پێ دەشتە و لە هەندێ جێ زورگ و هەڵەتی هەیە، بەرزترین لووتکەی کێوەکانی ئەوانەن دەکەونە لای خوارووی قۆڵی نیاسەر کە بەرزاییان ئەگاتە ٣٦٠٠مەتر، لە ڕووی زریەوە، لووتکەی کەرکەس کە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای نەتەنز بەرزایی لە ڕووی زریەوە ٣٨٩٨ مەترە.

هەوای شارستانی کاشان لە هەندێ بەخشەکانا گەرم و لە هەندێ ناوەنجی و لە هەندێدا ساردە و، لە ڕووی ئاوەوە کەم ئاوە و، ڕووباری گەورەی تیا نییە، هەندێ خڕەوشکی تیایە کە هاوین بێ ئاو و زستان ئاویان پێیا دەڕوا وەک شیوەکانی قەمسەر، ئابەر، هەنجەن - کوهرود... بەڵام ئەم کانی ئاوانەی هەیە کانی فین - کانی شا - کانی میلا گرد - کانی ئابەر... و هی تری.

موزیک

کاشان یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێران زەمین، لە سەردەمی پادشاهی ساسانییەکانا شارێکی بەناوبانگ و ناسراوبووە، نەخش و نیگاری کاشی کە لە جیهانا دەنگی داوەتەوە، پاڵشت ئەدرێ بەم شارە.

عەرەب کە دەڵێن (قاشانی) مەبەستیان نەخش و نیگاری کاشییە، چ ئەم نەخش و

نیگاره بەسەر خشتی سوورەوەکراو و مۆزائیک و فەرشەوە بێ، چ بەسەر دەستکردی ترەوە بێ لەوانەی لە تەختەی مس و توج دروست ئەکرێن وەک سینی، قاپ، سەماوەر. ئەم شاری کاشان لە سەردەمی شەڕی ئێران و عەرەبی ئیسلامدا وێران بووە و گۆیا هەر بەوێرانی ماوە تا سەردەمی عەبباسی... پاشان ئاوەدان کراوەتەوە...

## موزیک

ژمارەی دانیشتوانی شارستانی کاشان نزیکەی ١٥٨ هەزار کەس ئەبێ و، ١٣٤ ئاوایی و دێی هەیە. زمانی خەڵقی کاشان فارسیی کۆنە هەر ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کاشان لە کۆنە شارەکانی ئێرانە... تەنانەت لەوێ پەرستشگایەک هەیە بەناوی (مەعبەدی سلوکی) کە هی پێش سەردەمی ئەشکانییە. جێی شانازی خەڵقی کاشان ئەوەیە کە زبانەکەیان ساف و تێکەڵ بەوشەی بێگانەی عەرەبی نەبووە، کاروباری خەڵقی دەوروبەری کاشان کشتوکاڵ و مێگەل و ئاژەڵ بەخێوکردنە، بەڵام (کرد)یشیان بەناوبانگە و، فەرشی کاشان لە فەرشە بەقیمەت و بەنرخەکانی ئێرانە.

ژمارەی دانیشتوانی خود شاری کاشان ئەگاتە ٦٠ هەزار کەسێ، لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەوییا کاشان پەرەی سەندووە، لەسەر فەرمانی ڕەزا شای گەورە چەند شەقامی گەورەی تیا کێشراوە، درێژایی شەقامی پەهلەوی ٣ کیلۆمەترە و، شەقامی سەبا و شەقامی فەیزی و شەقامی ئەفزەڵ بەناوی هەستیار و شاعیرە بەناوبانگەکانەوە ناونراون... خیابانی شاهپور بەرەو ڕێ ئاسنە کە لە تارانەوە بەرەو یەزد ئەچێ...

کاشان بازاڕێکی سەرپۆشراوی دوورودرێژی هەیە، کە شەقامی ئەفزەڵ بەنزیکیدا ئەڕوات. ئەم بازاڕە نزیکەی ٢٧٠٠ دوکان و مەغازەی تیایە، هەروا چەند خۆراکخانەی تیایە، کە بەزاراوەی ئەمڕۆ پێیان ئەوترێ (ڕیستۆران) - هەروا ١٧ چاخانە و ٢٣ چێشتخانەی چڵە و کەبابی تیایە، لەگەڵ حەوت دانە هوتێل و مێوانخانە... لە شاری کاشاندا ٢٨ گەرماو هەیە و باغ و باغاتی خورمایشی تیایە، ئاوی شارەکە لوولە و بۆرییە، بەرق و کارەبای تیایە، دوو نەخۆشخانە و ٢٠ دەرمانگا و شەش داروخانە و ساختمانی خێراتی... تێدایە. هەر لە کۆنەوە شاری کاشان بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە خوێندەوار و شاعیری تیا هەڵکەوتووە، تا ئەندازەیی کە کەلیمی هەمەدانیش کراوە بەکەلیمی کاشانی، لە کاشان و دەوروبەریدا نزیکەی ٣٠ قوتابخانەی بەرایی - سەد قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری ١٠ قوتابخانەی ناوەنجی یەک باغچەی

منالآن که پێی دەوترێ کودەکستان و یەک هونەرستان و، کتێبخانەیەکی گشتی بەناوی ئەمیر کەبیر هەیە، زۆرخانە و، یانەشی تێدایە، لەوێ ڕۆژنامەیەکیش هەیە بەناوی (شەفەقی کاشان)ە...

لە کاشان، کارخانە و کارگە زۆرە، کارخانەکانی لاچپەروی و، کارخانەی مشکی و، کارخانەی قاڵی... و کارخانەی قەدیفەی مەخمەڵ و، کارخانەی شتی سوورمەدار و، کارخانەی ڕستن و بەن و دەزوو و، کارخانەی چیکەنەی پەمۆ ئەمانەی هەموو تیایە.

لە کاشان و دەوروبەری شوێنەواری کۆن و هی مێژوویی زۆرە، دوو تەپۆلکەی «ستیالک» هەڵکۆڵراون، دێرینەی کۆنیان تیا دەس کەوتووە مێژوویان ئەچێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ، بەم تەپەیا «ستیسلک»یش ئەڵێن. ئاتەشکەدەی خورم دەشت - ئاتەشکەدەی نیاسەر، هەردووکیان هی سەردەمی ساسانین. مزگەوتی هەینی هی سەردەمی سەلجووقییە، لە دێی فین باغی شا بەناوبانگە، لە سەردەمی سەفەوی و زەندی و قاجاریدا لەوێ زۆر کۆشک و تەلار کرا و لە چەشمەی سلێمانی حەومز و ئاوفیشقینە و گۆمی مەلە دروست کراوە. هەر لەم فینەدا گەرماوێکی بەناوبانگ هەیە، کە ئەمیر کەبیری تیا کوژراوە.

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/١٠/٣

**وتاری: ١٩٤**

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

لەم ڕیزە وتارەدا هێشتا هەر لەسەر باسی تەهران و دەوروبەری ئەڕۆین یەکێکی تر لە شارستانەکانی ئوستانی تاران کەرەجە، ناوی کەرەج کۆنە، بەڵام ئەم شارستانە کۆن نییە. کەرەج ناوە بۆ چەند جێگەیەک، یەکەمیان (کەرەجی ئەبو دولەف)ە ئەم شارە لە لوڕستان بوو، لە دەوری نەهاوەند، دووەم (کەرەج ڕود)ە کە پاشان بەکەرەرود ناسراوە، سەر بەقومە، شەرەفخانی بەتلیسی نووسەری شەرەفنامە، لە کاتێکا باوکی لە دەوڵەتی عوسمانی یاخی بووە و، لە شۆڕشا شکستی خواردووە و، پەنای هێناوەتە بەر شا تەهماسپی سەفەوی، لەم کەرەج ڕودەدا لە دایک بووە. سێیەم (کەرەج ڕەی)ە، کە مەبەست کەرەجی ئێستەیە لای خۆرئاوای تارانەوە، ئەم کەرەجە زۆر کۆن نییە. نووسەری کتێبی (تەئریخ طەهران) عەبدولعەزیز جەواهیر کەلام بەهەڵەدا چووە لە لاپەڕە ٥١ دا کەرەجی ڕەیی لەباتی کەرەجی ئەبو دولەف ناوبردووە و، نووسیویە: (کەرەج لە سەرەتای سەدەی پێنجەما ئاوەدان و ناوچەیەکی گرنگ بووە، بەپێی وتەی ئیبن ئەثیر ساڵی ٤٢٥ کۆچی مەسعود کوڕی سوڵتان مەحموود مسبوکتەکین هێزێکی گەورە، کە فەرماندەیی ئەو هێزەی دابووە ئەبو سەهل حەمدونی - ناردە سەر عەلائە الدەولە کوڕی کاکۆیە و فەرهاد کوڕی مەرداوێژ، پاش شەڕێکی سەخت عەلاء الدەولە پەنای بردە کێوەکانی ئەسفەهان و گوڵ پایەگان و، لەشکرەکەی مەسعوود لە کەرەج، لەشکربەزی کرد). بێ گومان مەبەستی ئیبن ئەثیر کەرەجی ئەبودولەفە، کە لە خوار گوڵپایەگانەوە بووە، لە نێوانی هەرێمی نەهاوەند و ئیزەجدا، نەوەک کەرەجی ڕەی... هەر چۆن بێ کەرەج ئەمڕۆ هەم ناوە بۆ شارۆلکەیەک و هەم بۆ شارستانێ، چوار دەوری شارستانەکەم بەم جۆرەیە: لای باکورەوە ئەگاتە زنجیرە چیای ئەلبورز و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی شەمیران و لای باشوور و خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی غاری سەر بەشارستانی ڕەی و لەگەڵ بەشەکانی خەرقان وەزەرەندی سەر بەشارستانی ساوە و لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئابیەکی سەر بەشارستانی قەزوین. شاری کەرەجی ئەمڕۆکە لە دەورانی سەفەوی بەدواوە دێیەکی بچووک بوو، ئەمڕۆ شارێکی جوان و پڕ لە باغ و گوڵ و گوڵزارە، ئەکەوێتە سەر شاقەمەڕێی تاران - قەزوین و بەشی زۆری شارەکە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای

ڕووباری کەرەج و بەشی کەمی ئەکەوێتە بەری خۆرهەڵاتی ڕووبارەکە...

موستەوفی قەزوینی ناوی ئەم ڕووباری کەرەجەی بردووە ئەڵێ: پردێکی یەک کەمەریی بەسەرەوەیە ناوی پردی خاتوونە... دەڵێن بەفەرمانی زوبەیدە خاتوونی ژنی هارون ڕەشیدی عەبباسی دروست کراوە. میستەر لیسترنج لە کتێبی سەرزەمینهای خیلافەتی شەرقیدا ئەڵێ: شوێنەواری ئەم پردە ئێستەش هەر ماوە. ئەمڕۆ بەسەر ڕووباری کەرەجەوە چەند پردی ئاسن دروست کراوە، پانترینی ئەو پردانە پردی سەرەڕێیە (ئوتوبان)ە شارستانی کەرەج پێنج بەخشی هەیە : یەکەم دەوروبەر و ناوخۆی کە بەفارسی پێی ئەوترێ (حەومە). دووەم ساوجبلاغ (هەشتگرد). سێیەم شەهریار عەلی شا عەوض. چوارەم ئیشتیهارد. پێنجەم طالەقان (شەهرەک).

شاری کەرەج، بەتایبەت ڕووبارەکەی هاوینەهەواری خەڵقی تارانە، ڕۆژانی هەینی، بەلای کەمەوە نیو ملیۆن کەس ئەڕژێتە بن باغەکانی کەرەج و کەناری ڕووبارەکە و تا شەو لەوێ بەسەر ئەبەن. ئەم کەرەجەی کە یاقوت بەناوی دێیەکی بچووک ناوی بردووە، لە دەورانی شا عەبباسی سەفەویدا کاروانسەرایەکی تیا دروست کراوە، لە دەورانی قاجاریدا، زۆر کۆشک و تەلاری پادشایانی تیا بووە، لەم سەردەمەدا گەڕەکی عەزیمیە و چەند گەڕەکی تری زۆر جوانی تیا دروست کراوە و، لەم شارەدا زانستگەی کیشاوەرزی و کشتوکاڵ هەیە، کارخانەی شەکر، کارخانەی چەمەنتۆ، کارخانەی تەلی کارەبا کە بەفارسی پێ دەوترێ (سیم) کارخانەی مقەوا... هەروا کارخانەکانی ئۆتۆمۆبێلی ناسیونال و کارخانەی پاتری و، کارخانەی لامپ و چرا و، کارخانەی دەرمان و سەدەها کارخانەی تری هەن کە ئەکەونە سەرەڕێی تاران - کەرەج... لە شاری کەرەج وا بەپێی فەرهەنگی دیهخودا ٤٥ مزگەوت هەیە، ٥ قوتابخانەی ناوەنجی ٢٢ قوتابخانەی بەرایی و ١٠٦ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری بۆ دێیەکانی دەوروبەری و، ئامۆزشگای پیشەیی و، ئاموزشگای تری تیایە و، چەند کتێبخانەی تیایە، تەنانەت کتێبخانەی زانستگەی کشاوەرزی و، کتێبخانەی یانەی وەرزشی.

لە کەرەجدا بیمارستانێک و دوو دەرمانگا هەیە، یەکێکیان دەرمانگای ڕازییە، لە کەرەجدا نزیکەی ٢٠ خۆراکخانە و ڕیستۆران و، ٦٠ قاوەخانە و چاخانە و ٣٠ کەبابخانەی تیایە... یەکێ لەو شوێنانەی کە خەڵق ئەچنە دیتنی نیاوانە و سەدی کەرەج، کە پێی ئەوترێ سەدی ئەمیر کەبیر. ڕێی چالوس - ڕەشت بەناوەندی کەرەجدا ڕائەبوورێ،

بەکەناری ڕووباری کەرەجدا، لەم ڕێیەدا، لە چەند جێگەدا شاخ کون کراون و پێیان ئەوترێ (تونیل). ڕووباری کەرەج بەتونیلی کەندواندا ڕائەبوورێ و، سەدی کەرەجی لێ هەڵئەبەسترێ، لەم سەدە زۆر بەهرە وەرئەگیرێ، هەم بۆ ئاودانی زەویوزاری کەرەج و هەم بۆ شاری تاران کە بۆڕی و لوولە ئەکێشرێ و، هەم لەم ئاوە کارەبا و بەرق بەدی ئەهێنرێ نزیکەی ٧٥ هەزار کیلۆوات لە ساتێکا.

پالافتەی قسە کەرەج وەختە لەگەڵ شاری تاران تێکەڵ بەیەک بن. دانیشتوانی شارستانی کەرەج بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ کە ئاخرین سەرژمێری بووە، گەییوەتە ٢٣٧ هەزار کەس...

ژمارەی دانیشتوانی شارەکەش گەییوەتە ٤٥ هەزار کەس... بەڵام ئەم سەرژمێرییە هی ١٠ ساڵ لەمەوبەرە، دێیەکانی دەوروبەری کەرەج خێر و بێر و پڕ لە پیت و بڕشتن، تەنانەت (حەسارەک - بەرقان - فەشەند) و، لەمەوبەر ئەم دێیانە و هەموو دەوروبەری کەرەج هەر بەناوی ساوجبلاغ ئەناسران و، ژمارەی دێیەکانی ئەو ناوە ئەگەیشت بە ١٦٠ دێ.

ئاوی خواردنەوەی کەرەج هی لوولە و بۆڕییە، کارەبای هەیە، تەلیفۆن و تەلگراف و پۆستەخانەی تیایە، میوەی زۆرە، دەغڵ و دانەوێڵەی فراوانە، ئاژەڵ لە هەموو دێیەکانی بەخێو ئەکرێ، جێی پەروەرشی دام لە دەشت کەرەج زۆرە.

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

١٣٥٤/١٠/٩

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش.
ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی تەهران دەڕۆین بەو ناوەوە کە ناوەندی ئوستانە و چەندین شارستانی هەیە... ئێمە لە وتارەکانی ڕابردووا، باسمان لە چەندین شارستان کرد و، هێشتا چەند شارستانێکی سەر بەتاران ماوە کە باسی لێ بکەین. لەم وتارەدا باسی (گەرمەسار) دەکەین. ئەم گەرمەسارە لەمەوبەر بەناوی «قشلاق» دەناسرا و ناوەندی بەخش بوو، پاشان کەمێ پەرەی سەند و، ساختمانی دەوڵەتی تیا کرا و، کرا بەشارستان و، بەخشێکیشی تیا دامەزراو، کە بەخشەکەش تەنیا دەوروبەری خۆیەتی کە بەفارسی پێ دەوترێ (حەومە).

سنووری چوار دەوری ئەم شارستانە لە ڕووی جوغرافییەوە بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی دەماوەند و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی سەمنان و لای باشوور و قیبلەوە سنووری ئەگاتە دەشتی کەویر، واتا ئەو بیابانە قومەڵانەی کە جگە لە قوم و ڕیگ هیچی تری تیا نییە و، لای باشووری خۆرئاواشی زەریاچەی خوییە کە بەزریاچەی قوم بەناوبانگە و، لای خۆرئاواشی ئەگاتە سنووری دوو بەخشی ئەیوانکی وەرامین، کە هەردوویان سەر بەشارستانی ئوستانی تارانن.

موزیک

گەرمەسار ئەکەوێتە کەناری ڕێی ئاسنی خەتی قەتار و شەمەنەفەر کە دوو لقی لێ دەبێتەوە، خەتێکیان ئەڕوا لە تارانەوە بۆ مەشهەد و، خەتێکیان ئەڕوا بۆ گورگان... سەر زەویی گەرمەسار ئەکەوێتە پێ دەشت بەڵام ئەم ڕیزە کێوانە دەوروبەریان گرتووە: کەلەرز - سەریر - قالیباف - و سەردەر.

گەرمەسار لە ڕووی جوغرافییەوە ئەکەوێتە ٥٣ و ١٨ دەقیقە درێژایی و، ٣٥ پلە و ١٣ دەقیقە پانایی...

ئاووهەوای گەرمەسار، لە هاوینا زۆر گەرم و لە زستانا ناوەنجییە تەنیا ڕووبارێکی هەیە پێی دەوترێ «حەبەڵە» ئاواییەکانی دەوروبەری ئاو ئەدات، بەڵام ئاوی شارۆلکەکە هی بۆڕی و لوولەیە و، بەرق و کارەباشی هی تارانە...

ژمارەی دانیشتوانی شارستانەکە بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ گەییوەتە نزیکەی ٣٦٠٠٠ هەزار کەسێک و، ژمارەی دانیشتوانی خەڵقی شارۆلکەکەی ناوەندی شارستانەکە گەییوەتە ٣٥٠٠ کەس...

دێیەکانی دەوروبەری گەرمەسار لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن و هەرچەند زۆر گەرمە بەڵام بەهۆی رووباری حەبەڵەوە گەنم، جۆ، پەمۆ، سێو زەمینی و پەتاتە پێ ئەگەیێنن باغ و باغاتی ترێ و هەنجیریشیان هەیە، کاڵەک و شوتی و خەیاری گەرمەسار بەناوبانگە، گەرمەسار بەوپێیەی سەر بەتارانە لە رووی فەرهەنگەوە، پێشکەوتووە شەش قوتابخانەی بەرایی و ٣٠ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تیایە کە لە لایەن سپای دانیشەوە بەرێوە ئەبرێن و، ٣ قوتابخانەی ناوەنجی تیایە و، کتێبخانەیەکی گشتی هەیە، نەخۆشخانەیەک و شەش دەرمانگای تیایە، دوو خۆراکخانەی ریستۆرانی و ٨ چاخانەی تیایە و ٢ گەرماوی هەیە، مزگەوتی تیایە، بازارێکی موناسبی هەیە... لە گەرمەساردا کردی دەستی هەیە وەک: تەون، چنین، جۆلایی، لەوێ فەرشی باش دروست ئەکرێ، گۆرەوی و بلووز ئەچنرێ...

چەند کارگەی ئاسنگەری و، جۆشکاری تیایە، کارگەی سازکردنەوەی ماشێن و ئۆتۆمۆبێل، لە گەراجەکانا هەیە کە پێی دەوترێ سەرویس و، کارخانەی خشتی سوورەوەکراو و کاشی و موزائیک و گەچ و ئاهەکی تیایە، تەلیفۆن و پۆستەخانەی هەیە.

گوێگرە خۆشەویستەکان، دەربارەی گەرمەسار ئەمەندە زانیاریمان بەرچاو کەوت لە کتێبە جوغرافیاکانا تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتەتان باش.

١٣٥٤/١٠/١٦

**وتاری: ١٩٦**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش و شادی بێ.

هێشتا ئێمە لەسەر باسی تەهران و دەوروبەری ئەڕۆین... لەم وتارەدا باسی (شەمران) دەکەین، بەپێی وردبوونەوەی مامۆستایانی زبان و فەرهەنگ وشەی «شەم» لە بنەڕەتا لەگەڵ وشەی (زم)ی زمستان لە یەک ڕیشەوە هاتوون، وشەی «ران»یش لە بنەڕەتا لەگەڵ وشەکانی «لان» و «ڕام» هەر لە یەک بنەماڵەن، بەوپێیە، وشەی «شەمران» واتا «لانە سەرما و جێی سارد»[1].

موزیک

«شمران» کە لە زاراوەی ئەمڕۆدا پێ ئەوترێ «شمێران» و لە سەرەتادا «سمران»یشی پێ وتراوە، ئەڵێن لە ناوی پاڵەوانێکی ئێرانییەوە هاتووە، بەڵام دەبێ ئەم بیروباوەڕە ئەفسانە بێ چونکە ناوی «شەمران» بەزۆر لە چیاکان و دێکانی و شارەکان دراوە، هەروەک شەمیران لای تاران هەیە، هەروا شەمیران لای سلێمانیش هەیە و، دێیەکیشە لای مەرو و، شارێکیشە لە ئەرمەنستان و، لە هەندێ جێ ناوەکە بووەتە «سەمیران» و «شەمیلان» و «شەمیرام»...

بۆ وێنە، یەکەم جیهانگەردی کە ناوی «شەمیران»ی بردبێ میسعەر کوڕی موهەلهەلە، کە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە، نووسیویە: «گەیشتمە قەڵا بەناوبانگی سەمیران پادشایانی دەیلەم -واتا ئال بویە- هەندێ ساختمانی و کۆشکی بەشکۆم بەرچاو کەوت، کە لە وڵاتی پادشایانی ترا بەرچاوم نەکەوتبوو و دوو هەزار و هەشت سەد و پەنجا خانووی گەورە و بچووکی تیابوو، لەو حەلەدا فەرمانڕەوای وڵاتەکە محەمەد کوڕی موسافیر بوو - مەبەستی ئەمیر محەمەدی کوردی ڕەوادییە کە بەناوی مەملان بەناوبانگە- ئەو ئەمیرە، هەر کالایەکی جوانی بەرچاو بکەوتایە، هەر کردێکی ڕیزە کاری بدیبایە ناوی وەستاکەی دەپرسی و، پارە و دیارییەکی زۆری بۆ دەنارد و، خوڵکی دەکرد و داوای لێ دەکرد بێتە ئەوێ، کە دەهات لەو قەڵایەدا ئەیهێشتەوە منداڵی وڵاتی دەخستە ژێردەستی کە فێری ئەو

---

(١) ئەمانە قسەی فەرهەنگی دیهخودایە.

پیشەیەیان بکات و بەم جۆرە توانی نزیکەی پێنج هەزار وەستای ڕیزە کارە و پیشەوەری کارامە لەو قەلایەدا کۆبکاتەوە».

پاش ئەوە ڕوکن الدەولە ئال بویە سالی ٣٧٩ کۆچی ئەو قەلایەی داگیرکرد...»

پاش میسعەر، یاقوتی حەمەوی باسی قەلای شەمیران ئەکا و ئەلێ: سەمیران قەلایەکی قایم و سەختە بەسەر ڕووبارێکی گەورەوەیە، سەر بەویلایەتی تارمە، ئەم قەلایە خاوەنی ئەلەموت وێرانی کردووە و، شوێنەواری زۆر جوان و ڕێکوپێکی ماوەتەوە نیشانەی گرنگی ئەو قەلایەیە، جا لەم باسانە وا دیارە لە سەرەتادا شەمیران بەبەشی ئەمدیو و ئەودیوی چیای ئەلبورز وتراوە پاشان کە قەلای شەمیرانی سەر بەتارم وێران بووە، ئەم دێی شەمیرانی لای قیبلەی ئەلبورز جێی شەمیرانی سەر بەتارم گرتۆتەوە، ئەمڕۆکە ئەو شەمیرانەی ئەکەوێتە داوێنی چیای ئەلبورز بەلای قیبلە و خواروودا، کە ئەکا باشووری چیاکە، بووە بەشارێکی گرنگ و بەناوی «تەجریش» بەناوبانگە، کە ناوەندی شارستانی شەمیرانە، ئەم شارستانە یەک بەشی هەیە ئەویش لە دەوروبەرێتی کە پێی دەوترێ - بەفارسی- «حەومە» و، ٨٤ دێی تیایە، کە ئەم جێیانە لە سەرەتادا (تەجریش - قولهەک - تیاوەران - سەلتەنەت ئاباد - وەنەک - ئیمامزادە قاسم) دێ بوون کە ئەمڕۆ بوون بەچەند گەڕەکێ لە شاری تارانی پایتەخت و، لە تەجریشی ناوەندی شارستانی شەمیران دێیەکانی تری ئەمانە بوون ڕۆستەم ئاوا - دز ئاشوب یا دز ئاشیپ - حەساربو عەلی - جەماران - دەرەکە - کەن - لەواسانات و هی تری، کە ئەم دێیانە لەم ڕۆژگارەدا سەیرانگای خەلقی تارانی پایتەختن.

ئەمڕۆ شەمیران، گەرچی بەناو شارستانە و جێی فەرماندارە، بەلام لە ڕاستەقینەدا، گرنگترین پارچەی پایتەختە، هەم کاخی سەعد ئابادی تیایە و هەم کاخی سەلتەنەتیی ساحێبقرانییەی نیاوەران جگە لەوە دەفتەری تایبەتی شاهەنشا، وەزارەتی دەربار، هەردوو لە شەمیران دان و، لەم شارەدا، ساختمانی زۆر بەشکۆ هەیە، وەک هوتێلی دەربەند و، جێی تری، وەک دانیشگای میللی چەند خەستەخانە و نەخۆشخانەی تێدایە و، چەند قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی ناوەنجی تێدایە، پۆست و تەلگراف و، بەرقی منتقەئی و ئاوی لولەیی هەیە، مەیدانی تەجریش جێگە سەیرانی ڕۆژانی هەینییە و، دەربەند هاوینەهەوارێکی خۆش و سەیرانگایە، باغچە گەورەکەی نیاوەران، ڕازاوەیە بەهەموو گوڵ و دار و دەوەنێ و، کەرەسە و شتومەکی یاری و گەمەی تێدایە بۆ سەر

گەرمکردنی منداڵان. لە شەمیران واتا تەجریشدا زۆر شەقامی جوانی دوو سەرەی قیرتاوکراو هەیە، لە ناو شیوی دەربەندەوە بۆ سەرەوەی چیاکە، نەردەوانی بەرقی دامەزراوە کە بەزمانی فەرهەنگی پێی دەوترێ «تلەسیش Tehesyej» خەڵق پێیا دەچنە سەرەوە، لە ناو شیوی دەربەندا، دەیان خۆراکخانە و چاخانە و کەبابخانە هەیە، کە لە ساڵێکا هەشت مانگ خەڵق بۆ سەیران دەچنە ئەوێ لەوێ ڕائەبوێرن. لە شەمیران، هەزاران دوکان و مەغازە و فرۆشگا و، خۆراکخانە و گەرماو هەیە، گۆڕستانێکی تێدایە بە «ظەهیر الدەولە» بەناوبانگە و بەدار و گوڵ ڕازاوەتەوە لە شەمیرانا سینەماش هەیە. چەندین مزگەوت و ئیمامزادەشی تیایە گومەزە جوانەکەی ئیمامزادە قاسم بێ وێنەیە لە جوانیی نەخش و نیگاری کاشیکارییا.

گوێگرە بەڕێزەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا حەوتەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش.

١٣٥٤/١٠/٢٨

**وتاری: ١٩٧**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ بەهیوام لەبیرتان بێ کە ئێمە لە ڕیزە وتارەکەمانا لە پیتی «طێ» داین و، گەرچی ئەم حرفە کوردی و ئێرانی، نییە بەڵام لە سەرەتای ئیسلامەوە هاتۆتە ناو زمانە ئارییەکانەوە.

موزیک

جا لەم وتارەدا باسی (طەبەس) ئەکەین بەپێی فەرهەنگی جوغرافیایی طەبەس ناوە بۆ زۆر جێگە لە ئێراندا... طەبەس کە ئەمڕۆ شارستانێکە سەر بەئوستانی خوراسان و ناوەندەکەی شارۆلکەی گوڵشەنە... و، طەبەس کە ناوەندی بەشی سەفی ئابادی سەر بەشارستانی سەبزەدارە، هەروا «طەبەس مەسینا» و «طەبەسین»یش هەیە، کە ئەمانە هەموویان سەر بەئوستانی خوراسانن...

جارێ با چاوێ بگێڕین بەلای مێژوویییا... لە سەرەتای ئیسلاما کە عەرەب سپایان گەیشتە خوراسان بەم هەرێمی طەبەس و دەوروبەرەی -کە کوهستانی چیایی و سەخت بوو- ئەیانوت ئیالەتی قوهستان Ouhistan و بەدوو شارۆلکەی واتە شهرکی «طەبەس» کە لەیەکەوە نزیک بوون، ئەوترا طەبەسەین -واتا دوو طەبەس- لە دواییدا بۆ ئەوەی لە یەکیان جیا بکەنەوە ناوی ئەم طەبەسی گوڵشەنەیان نابوو «طەبەس خورما» و ناوی ئەو طەبەس سەفی ئابادەیان نابوو طەبەس عونناب. جا ئێمە لەم وتارەدا باسی طەبەسی خورمای ئەو حەلە دەکەین - کە موستەوفی قەزوینی ناوی ناوە طەبەس گیلەکی- و لە سەردەمی جوغرافیانووسی بەناوبانگ ئیبن حەوقەلدا -واتا لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا - کە طەبەس لە قائین بچووکتر بووە و، لەبەرئەوەی نزیک بەکەویر بووە، لەسەر گەرمیان ژمێرراوە و بەگەرمەسێر دانراوە.

هەروا لەبەرئەوەی کە لەسەر ڕێی خوراسان بووە پێی وتراوە دەروازەی خوراسان... طەبەس هەر لە کۆنەوە خورمای زۆر بووە، مزگەوتێکی جوانی هەبوو... چاڵاوێکی زۆر گەورەی هەبووە کە ئاوی تیا کراوەتە عەمار و، گەرماوی زۆر بووە...

ساڵی ٤٤٤ کۆچی ناسر خوسرەوی عەلەوی هەستیار و نووسەری بەناوبانگ بەم شارۆلکەی طەبەسەدا ڕابردووە و، باسی هێمنی و ئاسایشی ئەو ناوەی کردووە، لە سایەی

ئەمیری ئەوێدا کە ناوی «گیلەک کوڕی محەممەد بووە جا ئەڵێ: ئەوەندە ئەو ناوە هێمن بوو، خەڵق بەشەو دەرگای حەوش و ماڵ و دوکانیان کلیل نەئەدا... موستەوفی قەزوینیش کە باسی طەبەس ئەکا ئەڵێ دار خورما و، نارنج و لیمۆی زۆر بووە... هەروا باسی ئەوەش دەکا کە لەو سەردەمەدا شیوی طەبەس دوو ئاشگێڕ ئاوی پیا ڕابردووە».

لە نیوەی سەدەی پێنجەمی کۆچیا ئیسماعیلییەکان طەبەسیان داگیرکرد و قەڵا قایم و سەختەکەی طەبەسیان زۆرتر بەشوورە و کونگەرە پتەوتر کردەوە، بەڵام ساڵی ٤٩٤ کۆچی سوڵتان سەنجەری سەلجووقی سپای نارده سەریان و قەڵاکەی گەمارۆدا و، گەلێ ساختمان و خانووبەرەی لەو شارەدا وێران کرد.

موزیک

بابێینە سەر ئەم دواییـیە، لە سەردەمی قاجاردا طەبەس ناوەندی بەخش بوو، سەر بەفیردەوس، پاشان بەخشەکە پەرەی سەند و کرا بەشارستان و، جێی فەرماندار. ئەمڕۆ طەبەس هەم ناوە بۆ شارستانەکە و، هەم بۆ هەرێمەکە، بەڵام ناوی شارۆلکەی ناوەندی شارستانەکە گۆڕدرا و، بووە «طەبەس گولشەن»... جا سنووری ئەم شارستانە بەم جۆرەیە: لای باکور واتە شمال ئەگاتە کەویری خوێ... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستان بیرجەند و بەخشی شیرویە، کە سەر بەشارستانی فیردەوسە، لای باشوور واتە جنوب و خوارووی‌شەوە هاوسنوورە لەگەڵ کەویری لووت و ئوستانی کرمان و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنوورە هەم لەگەڵ کەویری لووت و هەم لەگەڵ ئوستانی ئەسفەهان...

لە ڕووی جوغرافیشەوە، طەبەس ئەکەوێتە درێژایی ٥٧ دەرەجە و ٤٣ دەقیقە و پانایی ٣٦ دەرەجە و ٢٦ دەقیقە. و بەکەناری کەویرەوەیە لە شاری فیردەوسەوە ١٨٧ کیلۆمەترە و، بۆ مەشهەد ٦٠٧ کیلۆمەتر و بۆ تاران ١٣٤٥ کیلۆمەتر و، لە ڕووی زریەوە ٩٠٠ مەتر بەرزی و نزیکترین ڕیزە چیا لە طەبەسەوە زنجیرە چیای شترییە کە ٣٠ کیلۆمەتر لە شارۆلکەی طەبەسەوە دوورە.

هەرچەندە طەبەس لەسەر گەرمیان ئەژمێررێ، بەڵام چون دارستانی خورما و لیمۆ و پرتەقاڵ و نارنج و شتی تری زۆرە هەوای زۆر خۆشە. و تەنها عەیبی کەمی ئاوە گەرچی لە کۆنا ئاوی لە ئەمڕۆ زۆرتر بووە...

طەبەس دوو بەخشی هەیە: یەکەم دەوروبەری کە پێی ئەوترێ حەومە. دووەم دەست گوردان، کە لە هەردوو بەخشەکەدا نزیکەی ١٩٥ دێی گەورە و بچووک هەیە، ناوەندی

دێهەستانەکان ئەم دێیانەن «کریت - سەنگردان - دیهوک - جوخواە - دەستگردان - نیسفەهەک».

ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارستانە بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ پتر لە ٣٣ هەزار کەس بووە، بەڵام ژمارەی دانیشتوانی خود و شارۆلکەکە گەییوەتە دە هەزار کەس.

طەبەس لە ڕووی فەرهەنگ و خوێندەوارییەوە بەرەو پێشکەوتن دەڕوات. پتر لە شەش قوتابخانەی بەرایی واتە ابتدائی و سێ قوتابخانەی ناوەنجی واتە متوسطە و ٣٥ قوتابخانەی مبارزە لەگەڵ نەخوێندەواری و بێ سەودای تیایە، کتێبخانەیەکی گشتیی هەیە... نەخۆشخانە و چەند دەرمانگا و داروخانەی تیایە، ئاوی طەبەس هی لوولە و بۆرییە، کارەبا و بەرقی لەژێر دەستی شەهرداری دایە، میهمان سەرایێک و، چەند قاوەخانەیەک و چاخانە و خۆراکخانەی تێدایە و گەرماویشی زۆرە.

لە ساختمان و دێرینە کۆنەکانی طەبەس مزگەوتی گەورەی هەینی واتە جومعە و قوتابخانە و منارەکە هی دەورانی سەلجووقییە - و گومبەزی بارەگای شازادە حوسێن بەناوبانگن...

بەشی زۆربەی خەڵقی طەبەس و دەوروبەری بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن... ئەوانەی کارامە و لێ وەشاوەن خەریکی کرد و تەون و چنین دەبن، وەک دروستکردنی مافوور و واتە قاڵی و سوجادە و گلێم و جاجم و، چنینی بلووز و گۆرەوی و، سازکردنی قاپ و قاچاغی مسی... لە طەبەسدا، کارخانەی بچووکی خشتی سوورەوەکراو، بەردتاشی، گەچ و قسڵ و ئەهەک هەیە، هەروا کارخانەی دروستکردنی موزائیک و تەختە بەردی دەستکردی پەستراویش هەیە. ئاسنگەری و جۆشکاری و حەڵەبی سازی و نەجاری و ئەو کارانەشی تێدایە.

لە طەبەسدا مزگەوت و حوسێنییە و، ئیمامزادەش هەن... گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین هەموو کاتێکتان ڕوون و پڕ لە شادی بێ.

١٣٥٤/١٠/١٥

## وتاری: ١٩٨

گـوێگرە بەڕێزەکـانی وڵاتەکـەت باشـتـر بناسـە ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان شـاد بێ، ڕەزابوونی ئێوە لە بەرنامەکەمان هۆی دڵخۆشی نووسەران و بەڕێوەبەرانی بەرنامەکەیە.

موزیک

لەم حەوتەیەدا، باسی (طەبەرسـتـان) دەکـەین، بێ گـومـان زۆر لە بیـسـتـیـارانی بەڕێز دەمـێکە ناوی طەبەرسـتـانیـان بەرگوێ نەکەوتووە، بەڵام چون ئەم ناوە زۆر مـێـژوویـیـە و، هاوناوی مـازەندەرانە، ئێـمـە ناچاربووین لێی بدوێین، چون هەروەک زۆرجـار بۆمـان ڕوون کردوونەوە وتارەکەی ئێـمـە بەپێی پیـتـەکـانی ئەلف و بێـیـە و، ئێمـە گەیشـتـووینە پیـتی (طێ) کـە هەرچەندە لە فـارسی و کـوردیـیـا، پیـتـێکی ڕەسـەن نیـیـە، بەڵام لە کـاتێکەوە ئیـسـلام هاتۆتە وڵاتەوە، ئەم پیـتی (طێ)یە جێی خـۆی کردوتەوە و، لە زۆر جـێـدا تێی بچووک چۆتە قاڵبی ئەم طێیە گەورەیەوە.

موزیک

طبرستـان تێهەڵکێشـە لە دوو وشـەی «طبر» و «ستـان» -واتا جێی «طەبەر»ەکـان. لە بنەڕەتا طبر لە «توپور»ەوە هاتووە کە ناوی یەکێک لە گەلانی ئاری نژادبوو، لەم هەرێمەدا نیشتەجێ بووە.

هەندێ کـــەس وایان داوەتە قـــەڵەم کـــە «طەبەر» ئەو تەورەیە داری پێ ئەبڕن و، لەبەرئەوەی مـازەندەران دارستـانی زۆربووە و، خەڵقی ئەو ناوە زۆرتر لەگەڵ دار بڕینەوە و، خـەڵووز دروسـتـکردن خـەریکبـوون ناویان نراوە «طەبەر»... بەڵام ئەمـە وەکـو بۆتان ڕوون بووەتەوە تەنیا ئەفسانەی ئەوانەیە کە لە فەرهەنگی وڵات دووربوون.

مـەبەست لە طەبەرسـتـان، مـازەندەرانە... ئەم وڵاتە تا سـەردەمی ئال بویەش، سنووری لە ئەمـڕۆ بەربڵاوتر بوو، تەهرانی ئەمـڕۆ و شـاری ڕەی تا کـەویر، هەمـوو لەسـەر طەربەسـتـان بوون...

موسـتەوفی قـەزوینی دەربـارەی چۆن ئاوەدانبوونەوەی طەبەرسـتان چیرۆکی ئەگێـڕێتـەوە، ئێـمـە لێـرەدا بۆتان ناگـێـڕینەوە، چون لەگـەڵ ڕادیۆدا سـاز نیـیـە... بەڵام خۆتان بۆ پێکەنین چاوی پیـا بگـێـڕن. جـا لێـرەدا بۆ بیـرەوەری پێـتـان ڕائەگـەینین کـە ئەو ناوانەی لە

فـەزهەنگەکـانا هەن، وەک طەبەریی لای ئوردون، طەبەرەکی لای رەی و جـێگایانـی تری ناوەکەیان لەوێوە هاتووە کە قـەومی توپور تیـیا جیٚگیـربوون، یلە کـۆچیـان بۆ کـردووە و، هەرکـات لەناوبردنی «مـەلایێ، نووسـەرێ، هەسـتـیـارێ، فـەرمـانڕەوایێ کـا وترا طەبەری مـەبەست خـەلّقی طەبەرسـتـانی مـازەندەرانە... بەلاّم هەر کـات وترا طەبەرانی مـەبەست طەبەرییەی لای ئوردونە.

ناوەندی طەبەرستان لە کۆنا شاری دەماوەند بووە، کە بەهۆی بوومەلەرزەوە، وێران بووە، پاشـان چەند جار ئاوەدان بووەتەوە سنووری جـوغـراف یایی بەم جۆرە بووە: لای خـۆرئاوای هاوسنوور بووە لەگـەلّ گـیـلان... لای باشـووریـیـەوە ڕاتە جنوبەوە هاوسنووربووە لەگـەلّ عێراقی عەجەم -واتا ئوسـتانەکانی ئەسفەهان و تەهرانی ئێستە- تا زنجیرە چیای ئەلبورز و، لای خۆرهەلاّتییەوە هاوسنوور بووە لەگەلّ خوراسان و، لەم سەردەمەدا ئوستانی گورگان لەسەر طەبەرستـان بووە و، کەوتۆتە پلەی ٣٦-٣٧ پانایی و ٥٠-٥٤ درێژایی سەر زەوی و، بەلای باشـوور و خۆرهەلاّتی زریەی خـەزەردا، کە هەم پێی وتراوە، زریەی طەبەرسـتـان و، هەم پێی وتراوە زریەی قەزوین...

ناوی مـازەندەران بەپێی وتەی یاقـوتی حـەمـەوی ناوێکی تازە پەیدابووی، سـەردەمی مەغۆلە... لە سـەردەمی مەغـۆلدا چون خەلّقی ولاّت بەپادشایان و گەورەیانی خۆیان وتووە «مەزن» مەغـۆلەکـان ناوی ولاّتەکەیان ناوە «مـازن دەرئان» واتا مـەزنی تیـایە. ئەگەر ئەم قسـانەی جوغرافی نووسـان ڕاست بێ، ئەگـەر ڕاست بێ بۆمـان دەرئەخات کە وشەی مەزن لەناو فارسی زمانەکانا لەبیر چوەتەوە، واژەی عەرەبی «کەبیر» جێی ئەوی گرتۆتەوە بەلاّم لە کوردییا هەر ماوە و نەگۆڕاوە... پاش سەردەمی ماد و پاش سـەردەمی هەخامـەنشی لە سـەردەمی ئەشکانیـیـا تا سـەردەمی سـاسـانیش، هەمـیـشـە سـپـەهبـودێک دانراوە بەفـەرمـانڕەوای طەبەرسـتـان، لەبەرئەوە سـەرداری طەبەرسـتـان بەناوی سـپـەهبـود ناسراوە، عەرەب پێیان وتوون «ئیصپەهبذ - ئیصپەهبوذان»، گەرچی سپای ئیسلامی عەرەب، لە سـەرەتادا چەند جـارێ شـالاّویان بردە سـەر ئەم ولاّتە بەلاّم بۆیان داگیـر نەئەکـرا بەئاشـتی کارەکەیان دەبڕییەوە و بەسەرانە و پیتاک و باج قایل دەبوون. سپەهبودانی طەبەرستان تا نیوەی سەدەی دووەمی کۆچی هێشتـا هەر سەربەخۆ بوون و پارە و سکەیان بەناوخـۆیانەوە بوو، نووسـینی سـەر سکە و پولەکـان هەر خەتی پەهلەویی کـۆن بوو، ئەم سـەربەخـۆییـەی طەبەرستـان و سەرشـۆڕ نەکردنی بۆ فـەرمانی عـەرەب تا دەورانی ئەبو موسلیمی خوراسانی هەر درێژەی کێشـا، سـالّی ١٣١ کۆچی ئەبو موسلم نامەیەکی لە سپەهبودی طەبەرستـان

نووسی کە واز لە سەرچڵی و یاغیّتی بهیّنیّ و، سەر بۆ فەرمانی عەبباسی دانەوێنێ.
پاش کوژرانی ئەبو موسلیم ئیتر سپەهبود، جاری سەربەخۆیی وڵاتی دا و لە دەوڵەتی عەبباسی یاغی بوو... بەڵام بەفەرمانی مەنسووری عەبباسی چەندین جار لەشکر نێررایە سەر تەبەرستان بەڵام بەشکستەوە لەشکر نەگەڕایەوە. ئاخرین جار، لە ساڵی ١٤٣ کۆچییا، وەیاخۆ لە ساڵی ١٥٦ کۆچییا بەسەر طەبەرستاندا زاڵ بوون و داگیریان کرد و، سپەهبود بەدیل گیرا، بەڵام خۆی ژارخوار کرد، لە سەردەمی مەئموون کوڕی هارون ڕەشید فەرمانڕەوای طەبەرستان مازیاربوو... دیسان مەئموون پایەی سپەهبودی دابوویێ و ناوی نابوو محەمەد. ئەم مازیارە کە ئێمە لە وتاری ئایندەدا سەرگوزشتی ئەنووسین ئێرانییەکی پاکِ نژادبوو لە سەردەمی موعتەسەمی کوڕی هارون ڕەشیدا کە پاش ئەمین و مەئموون لەسەر کورسیی خەلافەت و پۆستنشینی دانیشت، مازیاری هەر بۆ پۆستنشینی هێشتەوە، بەڵام تا ساڵی ٢٢٤ کۆچی -واتا ٨٣٩ زایینی- پاش ئەوە نێوانی مازیار و موعتەسەم تێکچوو و، شەڕ لە نێوانیان گەرم بوو، سەرئەنجام مازیار تێ شکا و طەبەرستان کەوتە ژێردەستی بنەماڵەی عەلەوییەکانی طەبەرستان.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان بەرنامەکەمان لێرەدا تەواوبوو تا کاتێکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

١٣٥٤/١١/٢٨

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسه ئەم کاته و هەموو کاتێکتان شاد بێ، ئاواتی ئێمه کامەرانی و خۆشیتانه... له وتاری ڕابردوودا وتمان «طەبەرستان» ناوبووه بۆ ئەو هەرێمەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ مازەندەران و، لەوەش بەربڵاوتر بووه، چون ئوستانی گورگانی ئەم سەردەمه و، بەشێ له ئوستانی ناوەندی وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆش، واتا تا ڕەی و تەهران و کەویر... هەر بەشێ بوون له طەبەرستان. هەروا وتمان هەمیشه فەرمانڕەوای طەبەرستان بەناوی ئیسپەهبود (سپەهبود) نێو براوه و، ئەم ناوه گەرچی ئەمڕۆکه ناوی سپاییيه و له پلەی ئەرتەشبود خوارتره و، لەگەڵ فەریقی عەرەبی و میر ئالایی سەردەمی کۆنی عوسمانی وەک یەکن، بەڵام له سەردەمی کۆندا ئیسپەهبود - یا ئیسفەهبوذ... واتا نازناوێکی فەرمانڕەوایانه و پادشایانه بووه، نەوەک ئەرتەشییانه... جگه لەوەش وتمام که له سەردەمی کوڕانی هارون ڕەشیددا، مازیار دەیلەمی فەرمانڕەوای ئەوێ بوو و، لەسەر دەستووری کۆن پێی ئەوترا ئیسپەهبود و، ئەوە بوو له وتاری پێشوودا بەڵێنمان دانێ که لەم وتارەدا «مازیار»تان پێ بناسێنین، جا تکایه گوێ بدەنه وتارەکه.

موزیک

مازیار، که لەلایەن موعتەسەم کوڕی هارون ڕەشیدەوه، هەر لەسەر فەرمانڕەوایی طەبەرستان مابوو، خۆی خەڵقی مازەندەران و کوڕی هورمزی کوڕی سوخرای مەزن بوو. ساڵی ٢٠٨ کۆچی مەئمون کوڕی هارون ڕەشید دایانبوو بەفەرمانڕەوای طەبەرستان و پایەی ئیسفەهبود بوو، بەڵام تا ساڵی ٢٢٤ کۆچی دەستی گرت بەسەر هەموو خاکی طەبەرستان و، بەهاوکاریی پەنامەکی «ئەفشین» که سپاسالاری سەردەمی خەلیفەی عەبباسی بوو، سەربەخۆیی خۆی جاڕدا و، له موعتەسەمی خەلیفه عەبباسی یاخی بوو و، لەگەڵ پەیڕەوانی بابەکی خوڕەمی پەیمانی بەست... بەڵام کوهیاری برای نهێن بڕی و خیانەتی کرد و، پیلانی گرتنی ئەوی بۆ خەلیفه و فەرماندەیانی لەشکرەکانی کێشا، خەلیفه دەستووری دا بەعەبدوڵڵا کوڕی تاهیری فەرمانڕەوای خوراسان، شاڵاوی کرده سەری و گرتی و ناردییه سامەراء و لەوێ لەگەڵ بابەک پێکەوه له سێداره دران و خنکاندران، ئنجا طەبەرستان کەوته ژێر فەرمانی عەبدوڵڵا کوڕی تاهیر... بەڵام ساڵی ٢٤٩ کۆچی حەسەن کوڕی زەیدی عەلەوی حەسەنی له طەبەرستاندا شۆڕشی

هەڵگیرساند، وڵاتەکەی لەژێر چنگی عەبباسییەکان دەرهێنا و، عەبدوڵڵا کوڕی تاهیری ڕافڕاند و دەوڵەتی عەلەوی لەوێ دامەزراند... پاش ئەوان ئنجا وڵاتی طەبەرستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی «باطنی»، واتا دەوڵەتی ئیسماعیلییەکان، کە داعی بزورگ دایمەزراندبوو و، پاشان حەسەن سەباح پەرەی پێ دا و قەڵای ئەلەموتی کردە ناوەندی فەرمانرەوایی خۆی و، سەردەمێکیش لەژێر دەسەڵاتی ئال بویەدا بوو، ئنجا سەلجووقییەکان... طەبەرستان لە سەردەمی مەغۆلدا لەبەرئەوەی کە وڵاتێکی سەوزەڵاخ و پڕ لە دارستان و جەنگەڵ بوو، هەروا لەبەرئەوەی وڵاتێکی کشتوکاڵدار و پڕ لە کیلگە و مەزرای برنج و، باغاتی میوە بوو، وەرگەڕابوو بەعەماری ئازووقە بۆ دوژمنانی وڵات. پاش ئەوەی کە دەسەڵاتی مەغۆل و ئیلخانی و جەلایری و ئاق قویونلو و، قەرەقویونلو، بەهۆی نەبەرد و خەباتی خەڵقی وڵاتی ئێرانەوە، لەناوچوو، لە مازەندەراندا - کە لەوەبەر ناوی طەبەرستان بوو، دەسەڵاتی خۆوڵاتی، بەدی هات و، خاکەکە لە دوژمن زگار بوو، ئنجا بنەماڵەی سەفەوی دەستیان بەسەر طەبەرستانی کۆن -واتا مەزەندەرانا- گرت.

موزیک

لە سەردەمی شاهەنشاهی بنەماڵەی پەهلەویدا، مازەندەران -واتا طەبەرستانی کۆن- پەرەی سەند و پێش ڕەوتی کرد... و لە سەرەتادا ناونراوە بەئوستانی دووەم و، سنووری تازەی بەم جۆرە نەخشە کێشرا: لای باکور و ژووری، ئەگاتە زریەی خەزەر -کەلە مێژووا هەم بەزریەی طەبەرستان و هەم بەزریەی قەزوین تۆمارکراوە- و هەر لەو بەشەوە هاوسنوورە لەگەڵ کۆماری تورکمەنستان -کە یەکێکە لە جمهوریەتەکانی شورەوی- لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی خوراسان و فەرمانداریی گشتیی سەمنان و، لای خواروویشەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی ناوەندییا -واتا لەگەڵ ئوستانی تەهراندا کە پایتەختیشە-.

ناوەندی طەبەرستان، لە سەرەتادا شاری دەماوەند بوو، بەڵام لەم سەردەمەدا ناوەندی مازەندەران شاری سارییە، شارستانەکانی ئەم ئوستانە (ساری، بیهشەهر، شاهی، شەهسوار، بابول، ئامول، نەوەر، گورگان و دەشت گورگانە...) شارە جوانەکانی ئەم ئوستانە کە هاوینەهەواری خەڵقی وڵاتن ئەمانەن: بەندەر شا - چالوس - بەندەر نەوشەهر - ڕامسەر - شەهسەوار - شاهی - بابولسەر - و زۆری تر. دەربارەی ئاوەدانی ئەم داستانە و، باغات و جەنگەڵ و کێوەکانی و ئەو پێش ڕەوتەی کە لە سەردەمی

شاهەنشاهی پەهلەویدا ڕووی داوە، لە باسی مازەندەراندا قسەی لێوە دەکەین. ئێمە لەم وتارەدا ویستمان ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە طەبەرستان کوێ بووە و ناوی طەبەرستان لە چییەوە هاتووە و، کەی ناوی مازەندەران پەیدا بووە و، چۆن وشەی «کەبیر»ی عەرەبی جێی «مازن»ی کۆنی ئێرانی گرتۆتەوە. ئیتر لێرەدا کاتمان تەواوبوو.

تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر خۆش بێ.

١٣٥٤/١٢/٣

## وتاری: ٢٠٠

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

وتاری ئەم حەوتەیەمان دەربارەی قەڵایەکە ناوبانگێکی گەورەی هەبووە لە مێژووی ئێرانا و، گەلێ قەوماوەی گرنگی تیا ڕووی داوە... تا ئەو ڕادەیەی کە سەلجووقییەکان ناچاربوون بەڕووخاندنی قەڵاکە و هەڵتەکاندنی و چۆلکردنی دەوروبەری. ئەم قەڵایە ناوی «طەبەرک» بوو بەسەر شاخ و چیاکانی دەوروبەری ڕەیەوە بوو. پاش گوێدانە موسیقایی بیروڕای جوغرافیانووسان و مێژوونووسانتان بۆ ڕوون دەکەینەوە.

موزیک

دەڵێن قەڵای طەبەرەک قەڵایەکی سەخت بوو، مەنوجەهر دروستی کردووە و، یەکەم قەڵای سەر زەوییە و ئەم قسەیەی خاوەنی حەبیب السدر وا دیارە ئەفسانەیەکی ڕووتە، بەڵام ئەوەی ئێمە دەیزانین، ئەم قەڵایە بەرلەوەی سپای عەرەبی ئیسلام ڕەی داگیر بکات هەبووە.

ئەم قەڵایە کەوتۆتە نزیک ئەو ڕێیە کە لە شاری ڕەیەوە بۆ خوراسان چووە، بەسەر گردێکەوە بووە... لە سەردەمی ئال بویەدا هەر کەسێک سەرچڵی بکردایە لەوێ زیندانیان دەکرد. ساڵی ٣٩٧ کۆچی مەجد الدەولە ئال بویە کە تەمەنی گەیبووە ١٦ ساڵ و نەیەویست خۆی کاروباری وڵات بەڕێوەبەرێ... و لەژێر چاوەدێریی سەیدە خاتوون دایکی یا نەبێ، کاروباری وڵاتی سپارد؛ خەتیر ئەبو عەلی و کردی بەسەرەک وەزیری وڵات... ئەم خەتیر ئەبو عەلییە سەیدە خاتوون دایکی مەجد الدەولەی ناردە، قەڵای طەبەرک لەوێ دەسبەسەر بمێنێ. سەیدە خاتوون شەو لە ناوێ لە قەڵاکە هەڵات و پنای بردە بەر بەدر کوڕی حەسەن وەیهی کە فەرمانڕەوای کوردستان بوو -واتا بەشی خۆرئاوا و خواروی ئێرانی لەژێردەستا بوو- لەم حەلەدا بەدر بۆ ڕێکخستنی کاروبار لە خۆزستان بوو، کە هەواڵی هاتنی سەیدە خاتوونی بیست پێشوازییەکی گەرمی لێ کرد و، چوو بەپیرییەوە، پاش ئەوەی چەند ڕۆژ خزمەتی کرد، سپایەکی پەنجا هەزار کەسی کۆکردەوە و، لەگەڵ سەیدە خاتووندا شالاوی کردە سەر ڕەی شارەکەی گەمارۆدا، سوڵتان مەجد الدەواله و سەرەک وەزیرەکەی خەتیر ئەبو عەلی بەدیل گرت و، شەمس الدەولەی کوڕی بەهاتە

الدەولەی لە جێی مەجد الدەولەی برای دانایە سەر تەختی سەڵتەنەت بەو مەرجەی کە لەژێر چاوەدێری سەیدە خاتووندا بێ.

## موزیک

یەکێ تر لەو قەومەاوەیانەی کە لە قەڵای طەبەرکدا رووی داوە ئەمەیە کە بۆتان دەگێڕینەوە:

ساڵی ٥٨٨ کۆچی سوڵتان خوارەزم شا کە شاری ڕەیی لە ئال بویە داگیر کرد یەکێک لە فەرماندەکانی خۆیی کردە فەرمانڕەوای قەڵای طەبەرک -ئەو فەرماندەیە ناوی طەم غاج بوو، دووهەزار سواری لەگەڵ بوو... هەر ئەو ساڵە سوڵتان توغروڵ کوڕی ئەرسەلان کوڕی توغروڵی سەلجوقی کە لە سەردەمی قزل ئەرسەلاندا زیندان کرابوو، هەلی بۆ هەڵکەوتبوو هەلاتبوو و هێزێکی پێکەوە نابوو، هەڵی کوتابووە سەر شاری ڕەی و داگیری کرد و، نوێنەرانی خوارەزم شا ڕایان کرد و ولاتیان بەجێ هێشت... توغروڵ قەڵای طەبەرکی گەمارۆدا خوارەزمییەکان لە قەڵاکەدا بوون، تکایان لە سوڵتان توغروڵ کرد ماوەیان بدات کە ماڵ و گرانباریان کۆبکەنەوە و چۆڵی بکەن...

سوڵتان توغروڵ، بەو مەرجە ڕێی دان کە تەنیا شتومەکی خۆیلان ببەن. چەک و تفاقی جەنگی لەگەڵ خۆیان نەبەن، بەلام ئەوان بەتەگبیر و ڕاوێژیی غولامێکی سوڵتان توغروڵ کە پەنای بردبووە ئەو قەڵایە، ویستیان چەک و تفاقی شەڕیش ببەن... لەسەر ئەوە لەگەڵ هێزەکەی سوڵتان توغروڵ لێیان بووە شەڕ... و لە نێوانی هەردوولادا کوشتارێکی سەخت ڕووی دا سەرئەنجام سوڵتان توغروڵ بەسەر خوارەزمییەکان زاڵبوو و قەڵای طەبەرک داگیر کرا... و سوڵتان توغروڵ فەرمانی دا بەڕووخاندنی قەڵاکە... پیاو ماقووڵانی شاری ڕەی و سەردارانی لەشکرەکەی تکایان لێ کرد نەیڕووخێنێ و خۆی بچێ جێگەکەی ببینێ و بزانێ ئەم قەڵا سەختە بەکەڵکی دێ؟... بەلام توغروڵ وتی هەڵەی فەرمانڕەوایانی پێشوو ئەوەبووە، هەر کەس بەو نیازەی کە بتوانێ هێز لە قەڵای طەبەرکدا دابنێ بۆ بەرەنگاریی دوژمن، قەڵاکەیان هێشتۆتەوە و، نەیانڕووخاندووە، پاشان بووەتە هۆی شکستی خۆیان، من هەرگیز ئەم کارە ناکەم.

دەسبەجێ فەرمانی دا بەخەڵقی شاری ڕەی کە بچن ئەو قەڵایە تالان بکەن... پاش ئەوەی قەڵاکە خاڵی بوو... ئنجا فەرمانی دا بەخەڵقی شاری ڕەی کە بەجۆرێکی هەرەوەزی و تێکڕایێ بچن بۆ ڕووخاندنی قەڵاکە. خەڵقی شار هەرکەسە کەرەسەیێکی لەگەڵ خۆی

برد، وەک پاچ و بێڵ، پێ مەڕە و، نوێڵ و قولنگ و، قەڵاکەیان کون کون کرد و، بەهۆی باروت و شتی تری تەقەمەنییەوەو قەڵاکەیان لە بناغەوە هەڵتەکاند پاش ئەوە چەند جارێ توغروڵ بەویدا ڕابرد و، داوای لە خەڵق کرد نابێ شوێنی کەلاوەشی بمێنێ. ئەمەبوو داستان و چیرۆکی هەڵتەکاندنی قەڵای طەبەرک.

موزیک

بەپێی وتەی موستەوفی قەزوینی لە دەوروبەری قەڵای طەبەرک «کانی مس و کانی زیو» هەبووە و. لە سەردەمی سەلجوقییا سوود لەو زیوو و مسە وەرگیراوە.

دەڵێن توغروڵ دەیوت: ئەم قەڵای طەبەرکە وەک ماری دوو سەر وایە، سەرێکی وا لەسەر زەویی جیادا = واتا عێراقی عەجەمییا و، سەرێکیشی وا لەسەر زەوی خوراساندا. ئەو هێزەی بەسەریا زاڵ بێ، هەردوو هەرێمەکە ئەخاتە ترسولەرزەوە.

ئەبو موعین حوسێن کوڕی حەسەن طەبەرکی کە یەکێ بووە لە مەزنترین زانایانی حدیث واتە فەرمایشی پێغەمبەر (د.خ) لەسەر بێ.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان تەواو خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/١٢/١١

**وتاری: ٢٠١**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شادبێ. کامەرانی و بەختیاری ئێوە، یەگانە ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامە و ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە. لەم حەوتەیەدا باسی شارێکتان بۆ دەکەین، هەم زایینگای چەند هەستیاری مەزن و، هەم ئارامگا و خوابگای هەندێ پیاوی گەورەی ئاینی و جیهانییە. ئەم جێیە ناوی «طوس»ە و گەرچی طوس ناوە بۆ زۆر جێ و بۆ زۆر پیاوی ناوداریش، بەڵام مەبەستی ئێمە لەم وتارەدا «طوسی مەشهەدە» و ئەم وتارەش وەڵامە بۆ گەنجێکی بەنرخ کە ناوی شادمانە و نامەی بۆ نووسیوین و، سەرگوزەشتی ئەم جێیەی لێ ویستووین.

موزیک

«طوس» شارێ بووە، چەند کیلۆمەترێ لە ژووور شاری مەشهەدی ئەمڕۆوە دەربارەی مێژووی دروست کران و دامەزرانی ئەم شارە، ئەفسانە زۆرە، گوایە ئەم شارە لە لایەن جەمشیدی جەمەوە دروست کراوە پاشان بەهۆی بوومەلەرزەوە، وەیا وەیشومەییێکی تری ڕۆژگارەوە وێران بووە، پاشان طوسی نەوزەری سەردار سپای کەیخوسرەوی کەیانی دووبارە ئاوەدانی کردۆتەوە و بەم ناوە ناسراوە... لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە عەرەب ئەفسانەیەکیان بۆ ڕێک خستووە، دەڵێن لە شاری طوس تا سەدەی چوارەمی کۆچیش وێرانەی ساختمانێکی بڵند و بەشکۆ هەبووە، دیوار و کونگەرەکانی زۆر بەرز بووە و، هەیوان و ژووری زۆری تیا بووە و، سەردار و ژێرزەویی گەورە گەورەی هەبووە، ئەم ساختمانە یادگاری توبەعی پادشای یەمەنە، کە خاکی ئێرانی لەژێر چنگابووە و، ئەو ساختمانە گەورەیەی دروست کردووە، کە بنەکەی بارگەوبنە بێ و ئازووقە و چەک و تفاقی تیابێ و، خۆی لەوێوە شاڵاوی کردۆتە سەر چین... و بۆ ئەوەی پاشماوەی هەبێ گەنجینەیەکی زۆری کردۆتە ژێر خۆڵەوە و لەژێر ئەو کۆشکە -لە دەوروبەرەیدا شاردوویەتییەوە... پاشان دۆزراوەتەوە براوەتەوە بۆ یەمەن...

موزیک

لە سەرەتای ئیسلامدا، کە سپای ئیسلام شاڵاویان کردۆتە سەر ئێران و، یەزدی گورد توانای بەرەنگاری نەماوە، ئەم شاری طوسە هەر خۆی نەداوەتە دەستی سپای ئیسلامەوە،

بەڵام لەوەدوا لە سەردەمی پۆستنشینیی خەلیفەی سێیەمدا داگیر کراوە. لەو حەلەدا شاری (طوس) شارێکی گەورە و پان و بەرین بووە. لە چەند شارۆلکەی جیاجیا پێکهاتووە، دووان لەو شارۆلکەیانە ناویان «تابەران و نۆگان» بووە کە پتر لە دە هەزار دێی پڕ لە پیت و بەرەکەت، بەدەوریانا بووە. ئەم شاری طوسە تا سەدەی چوارەمی کۆچی هەر هەبووە... پاشان وێران بووە، لەو حەلانەدا شاری مەشهەدی ئەمڕۆ دێیەک بووە ناوی سناباد بووە، تا سەدەی سێیەمی کۆچی پەرەی سەندبوو باغێکی زۆر گەورە، لە نزیکی ئەم دێیە هەبوو، ساڵی ١٩٣ کۆچی کە هارون ڕەشیدی خەلیفەی عەبباسی لەوێ مرد، لە ناو ئەو باغەدا ناشتیان، پاشان ساڵی ٢٠٢ کۆچی تەرمی ئیمام ڕەزا لەوێ نێژرا... ئیمام ڕەزا ناوی عەلی کوڕی ئیمام موسای کازم و نازناوی ڕەزابوو. مەئمون کوڕی هارون ڕەشید بۆ ئەوەی پشتی خۆی ئەستوور و بەهێز بکات لە ئێرانا، ئیمام ڕەزای لە مەدینەوە هێنابووە خوراسان و لەوێ کردبووی بەوەلی عەهد و جێگرەوەی خۆی، بەڵام پاش ماوەیەک فەرمانی نهێنی دابوو بەژارخوارکردنی. پاش کۆچی دوایی تەرمەکەی هەر لەو باغە نێژرابوو کە هارون ڕەشیدی تیا نێژرابوو. وا دیارە مەئمون بۆ ئەوەی خەڵق فریو بدات کە دەستی لەو ژار بەخوارددانەدا نییە ئیمام ڕەزای لە گومبەزەکەی هارون ڕەشیدا ناشتبوو، بەڵام پاش ئەوەی کە ساڵی ٢٠٢ ئیمام ڕەزا لەو باغەدا نێژرا، ئیتر دێی سناباد پەرەی سەند و، تەنییەوە و، بوو بەشارێکی گەورە. و خەڵقی شاری طوس گێڕایانەوە ئەوێ، بەڵام هەر لەبەرئەوەی کە سناباد سەر بەطوس بوو و، شاری طوسیش بریتی بوو لە دوو شارۆلکەی تاوەران و نوقان... هەر لەبەرئەوە هەندێ لە مێژوونووسان وایان داوەتە قەڵەم کە شاری مەشهەدی ئەمڕۆ لە بنەڕەتا ناوی «نوقان» بووە... بەم هۆیەوە خاوەنی «حدود العالم) کە کۆنترین جوغرافیایەکە بەفارسی نووسراوە لە لاپەڕە ٥٦دا ئەڵێ: طوس هەرێمێکە لە هەرێمەکانی خوراسان و لە چەند شارۆلکە هاتۆتە بەرهەم: وەک تەوران، نوقان، بەروغن، ڕایکان، بەنوازە و، کەوتۆتە نێوانی چیاکانەوە، کە کانی پیرۆزە و، مس و، سورب واتە (قورقوشم) و، سورمە و کل و، شتی تری تیایە...

تەنانەت شەوە و، مەنجەڵی لە بەرد تاشراوی ئەوێ ناوبانگی دەرهێنا و ئارامگەی پیرۆزی عەلی کوڕی موسای ڕەزا لەوێیە... و خەڵقی ئەچن بۆ سەردانی و زیارەتکردنی، گۆڕی هارون ڕەشیدیش هەر لەوێیە.

ئەم شاری طوسە کە لە سەدەی شەشەم بەدواوە بەر لافاوی شالاوی مەغۆل کەوت و، خشتی بەسەر خشتییەوە نەما و بەوێرانی مایەوە، پیاوانی زۆر گەورەی پێ گەیاندووە، بۆ

نموونه خواجه نیزامەدین الملک، کە لە سەردەمی ئال بویە و سەلجووقیدا بەناوبانگترین وەزیری ڕووی زەمین بوو... هەروا فیردەوسی خاوەنی شانامە و، خواجه نەسیرەدین وەزیری هۆلاکۆ و، غەزالییەکان محەمەد و ئەحمەد کە یەکەمیان گەورەترین فەیلەسوف و فەقیه بووە، دووەمیان یەکێ بووە لە سۆفییە و عورەفا... ئەمانە خەڵقی شاری طوس بوون.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان ئەمەبوو هەندێ زانیاری دەربارەی طوس و لە وتاری حەوتەی ئایندەدا، شتی تریش دەربارەی طوس ئەخەینە بەرگوێتان، ئێستە کاتمان تەواوبوو، بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

١٣٥٤/١٢/١٨

**وتاری: ٢-٢**

گوێگرە ئازیزەکان سەلاوێکی گولاویتان پێشکەش دەکەین... بەهیوایین ساڵی تازەتان ساڵێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی و بەفەڕ و پڕ پیت و بەرەکەت بێ... لە وتاری پێشوودا ئەگەر لە یادتان مابێ باسی «طوس»مان بۆتان کردبوو، بەڵام بەڵێنمان پێ دابوون کە لەسەر باسەکە بڕۆین... لەبەرئەوە وتارەکەمان بەر پیرۆزبایی ساڵی تازەش دەکەوێ...

جارێ با گوێ بدەینە موزیکی تازە ساڵی ١٣٥٥ ئنجا لەسەر باسەکە دەڕۆین...

موزیک

بیستیارانی خۆشەویست... لە وتاری پێشوودا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە مێژوونووسان وایان بۆ دەرکەوتووە «طوس» شارێکی زۆر کۆن بووە و، هەندێ لە نووسەرانی ئەفسانەنووسیش وایان دابووە قەڵەم، کە شاری طوس لە ڕۆژگاری مێژووی ئەفسانەییا لە لایەن توببەعی پادشای یەمەنەوە داگیرکراوە و، کراوە بەبنکە و عەماری ئازووقە بۆ سپایێ کە شالاوی کردۆتە سەر چین... بەڵام ئەفسانەنووسان ئەوەیان لەبیرچۆتەوە ناوی ئەو توببەعە خەیاڵییە تۆمار بکەن، وەیا سەریان لێ تێکچووە و لەبیریان چۆتەوە کە توببەع ناوێکی تایبەتی نەبووە و، نازناوێکی پایەیی بووە. هەروەک لەمەوبەر بەشاهانی ئێران و ڕۆم و چین دەوترا «کیسرا» و «قەیسەری» و «خاقان» هەروا لە سەردەمی کۆنیشا بەپادشایانی یەمەن و توران وتراوە «توببەع و ئوغوز». بەڵام کام توببەع بەسەر ئێراندا شالاوی بردۆتە سەر چین؟ خۆ ژمارەی توببەعەکان لە دەیان پتر بووە!! لە ڕاستییا بۆمان دەرئەکەوێ نە طوس شارێکی هێندە کۆن و ئەفسانەییە و نە توببەعیش توانیویە داگیری بکات و لەوێ عەماری ئازووقە دابنێ.

موزیک

شاری ئەمڕۆی مەشهەد کە جێی طوسی گرتۆتەوە وەکو مێژوونووسان بۆیان دەرخستووین... لە بنەڕتا باغێکی زۆر گەورە بووە، دوو قۆناغ لە شاری طوسەوە دووربووە، نزیک بەدێی سناباد -کە ئەم دێیە هەم پێی دەوترا «بەرذەعە» و هەم پێ دەوترا «موثەقەب»... مێژوونووسان لایان وایە لەبەرئەوەی کە شباکەکەی سەر مەرقەدی ئیمام ڕەزا و، سەر قەبری هارون ڕەشید کون کون بووە، عەرەب پێیان وتووە «موثەقەب» واتە

کون کونکراو... بەڵکو هەندێ لایان وایە کە موثەقەب ناوی قەڵای دێیەکە بووە و، قەڵاش لە چوار لاوە کون کون دروست ئەکرێ بۆ ئەوەی پاسەوان و ئێشکچی قەڵا بتوانن خەڵقی لێوە بدیێن، بەم پێیە دەبێ وشەی بەرذەعەش کە مێژوونووسان دەڵێن نازانین بۆ چ پێی وتراوە «بەرذەعە» دەبێ لە بنەڕەتا «بەرزە» بووبێ و، هەر پاش ناوی قەڵاکە بووبێ.

بەڵام زۆر سەیرە تا ئەمڕۆکە ناوی یەکێک لە گەڕەک و بەشەکانی شاری مەشهەد هەر ناوی «نوقان»ە... و ئەم نوقانە ئەکەوێتە لای ژووری شارەکەوە بەرەو لای خۆرهەڵات وا دیارە ناوی ئەم گەڕەکە هەر لە ناوی نوقانی شاری طوسەوە ماوەتەوە... ئەو ڕووبارە ئاوەش کە بەشی لای ژوورووی لای خۆرئاوای شاری مەشهەد ئاو ئەدات، تا ئێستە هەر ناوی «ئاوی سناباد»ە، بەناو ئەو دێیەوەیە کە باسمان کرد.

ناوی طوس تا سالانی ٦٢٠-٦٥٠ هەر مابوو، بەڵام شارەکە ساڵی ٦١٧ کۆچی بەر شالاوی مەغۆل کەوتبووە و وێران بووبوو... ئیمام محەمەدی غەزالی و بەشەی شاری طوس نێژرابوو، کە پێی دەوترا «طابەران» وەیاخۆ «تاوران»... ئەم طوسە لە سەرەتای ئیسلامەوە تا سەردەمی مەغۆل هەرچەندە ناوی شارەکە بووە، بەڵام لە هەمان کاتا بەهەرێمەکەش هەر ئەوترا «ولایەتی طوسی».

موستەوفی قەزوینی یەکەم مێژوونووس و جوغرافیازانێکە کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەم بەدواوە، ناوی دێی «سناباد»ی گۆڕیوە بە «مەشهەد» و لەوە بەدواوە هەمیشە مەشهەد وتراوە.

موستەوفی دەڵێ: مەشهەد، بانە بەرزێکی پێ دەشتی ڕاستیی و سەوزە کە لە بنەڕتا پێی وترا «مێرگی تەکان» درێژایی ئەم دەشتە سەوزە دوازدە فرسەنگ و پانایی ێنج فەرسەنگە... ڕەزی ترێ و باغی هەنجیری زۆرە. خەڵقی وڵاتی طوس ڕەوشت باش و خاوەن باوەڕ و میوان دۆستن... ئیبن بەتوتەش شاری مەشهەدی چەند ساڵی دوای ئەوە دیوە و نووسیویە: مەشهەد شارێکی گەورەیە، بازاڕەکانی ئاوەدانە... چوار دەوری شارەکە چیایە... مەرقەدی ئیمام ڕەزا لەژێر گومەزێکی گەورە دایە... قوتابخانەیەکی گەورەی لە پالایە... شباکی سەر مەرقەدی ئیمام لە دار دروست کراو بەسەر مەرقەدەکەوە هەڵواسراوە، دەرگای مەرقەدەکەش هەر گیراوە لە زیو...

کەلاویخوی سەفیری ئیسپانیا کە ساڵی ٨٠٨ کۆچی دەچوو بۆ لای تەیموری لەنگ، بەشاری مەشهەدا تێپەڕبووە دەڵێ مەرقەدی ئیمام ڕەزا زۆر بەشکۆیە، لەو حەلەدا

موسوڵمانەکان ڕێیان داوە کە مەسیحییەکان بچنە زیارەتی قەبری ئیمام ڕەزا.

گوێگرە بەڕێزەکـان ئەم تۆزە باسـەی «مەشـهـەد» هی دەورانێ بوو کـە هێـشـتـا هەر بە «طوس» ئەناسرا... ئێمە کە گەیشتینە باسی پیتی میم ئەو حەڵە لە مەشهەد ئەدوێین... ئێستا کاتمان تەواوبوو خواتان لەگەڵ.

١٣٥٤/١٢/٢٤

**وتاری: ۲۰۳**

گوێگرە خۆشەویستەکان هیوای کامەرانی و بەختیاریتان، هەروا شادمانی و سەربەرزیتان بەهۆی ساڵی تازەوە.

لەم ڕۆژانەدا چەند نامەمان بۆ هات پرسیاری ئەوەمان لێ دەکەن مێژووی تازەی شاهەنشاهییان بۆ ڕوون بکەینەوە... لەمەوبەر شاهەنشایی ئێران، مێژووی دامەزرانی، لە تەقویمەکاندا نەئەنووسرا... تەنیا مێژووی کۆچی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام دەنووسرا (درودی خوای لێ بێ)... مێژووی کۆچی پێغەمبەر لە وڵاتە موسوڵمانەکانا بەپێی مانگە عەرەبییەکانە... و دەکات هەزار و سێ سەد و نەوەد و شەش ۱۳۹٦ ساڵ لەمەوبەر زانایانی ستارەتاس و تەقویمنووس، ساڵی کۆچی پێغەمبەریان بەپێی سووڕانی زەوی و خۆر و مانگ لەگەڵ سێ سەد و شەست و پێنج ڕۆژ و چەند ساتا، هەڵسەنگاند مێژووی کۆچییان بەوپێیە ژمارە کرد، بووە ساڵی هەزار و سێ سەد و پەنجا و پێنج. ئەم ساڵ مێژووی دامەزرانی شاهەنشاهییەتی ئێران بەڕەسمیەت ناسرا، ئەویش لەو ڕۆژەوە کە کورشی مەزن یەکەم شاهەنشای هەخامەنشی چۆتە سەر تەخت کە ئەکات دوو هەزار و پێنج سەد و سی و پێنج ساڵ ۲٥۳٥ ساڵ... ئەمەبوو وەڵامی پرسیار ئەو دۆستانەی کە نامەیان بۆ نووسیوین. بەهیوای وەرامەکەی خۆیان وەربگرنەوە.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لەم حەوتەیەدا باسی (طەرهان) دەکەین؛ کە جێگەیەکە لە هەرێمی لوڕستان وا دیارە ناوی «طەرهان» لە بنەڕەتا لە وشەی «تەرخان»ەوە هاتووە، ئەو ئێلانەی کە لەم هەرێمەدا، مەڵبەندیان کردووە و نیشتەجێن، لە دەورانی پادشایەتیی نەتابەگەکانی لوڕستاندا لە باج و پیتاک «تەرخان» بوون... بەڵام لوڕەکان ئەم وشەیە تۆزی قەڵەوتر بدرکێنن...

طەرهان، کە لە هەندێ جێ «طەرحان» نووسراوە ناوە بۆ چەند جێگەیەک: ناوی دێیەکە... ناوی دێهستانێکە... ناوی بەخشێکە... هەروا ناوی عێلێکی کوردە، کە چەند تیرەیان هەیە، وەک: سوری - ئومەرائی - گراوەند - دەماوەند - کۆشکی - ئادینەوەند - ئەزدەج - ڕومیانی - چاواری - بوالی - ئازادبەختی - کرمانی - کە هەموویان ئەگەنە حەوت هەزار خێزان و ژمارەیان ئەگاتە نزیکەی ٤٠ هەزار کەسێ... و ئەمانە

هەموویان نیشتەجێی بەخشی «طەرهان»ن...

بەخشی طەرهان یەکێکە لە بەخشەکانی سەر بەشارستانی خوڕەم ئاوا ئەکەوێتە لای خۆرئاوای شارستانەکەوە و سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای خۆرهەڵاتی بەخشەکە هاوسنوورە لەگەڵ ڕووباری کوشکان... و لەگەڵ بەخشی چنگنی. لای خۆرئاوای هاوسنوورە و لەگەڵ ڕووباری سەیمەرە... لای باکور و ژووری هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی دلفان... لای خوار و باشووری، دیسان ئەگاتەوە سەر ئاوی سەیمەرە و، ڕووباری کوشکان... بەم جۆرە ئەبێ بڵێین نیمچە دوورگەیە...

ئەم بەخشی طەرهانە سێ دێهستانی هەیە: یەکەم دێهستانی کوهدەشت، کە شەست و هەشت ئاوایی هەیە... دووەم دێهستانی ڕومیشکان سی و دوو دێی هەیە... سێیەم دێهستانی طەرهان چڵ ئاوایی هەیە دانیشتوانی ئەم سێ دێهستانە ئەگەنە ٣٠ هەزار کەسێ...

موزیک

هەرێمی تەرهان، گەرمەسێرە، ئاوی بەخشەکە هی ڕووباری سەیمەرەیە و، زۆر لە دێیەکان لە ئاوی چاڵاو و بیر بەهرە وەرئەگرن. بەرزترین کێوی ئەم بەخشە چیای بلورانە دانیشتوانی لەگەڵ کشاوەرزی و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن.

ڕووباری خوسرەو ئاباد هەندێ لە زەویوزاری ئەو ناوە ئاوئەدات... ئافرەتانی ئەم دێیانە بەچنین و تەون و کردەوە خۆیان سەرگەرم دەکەن، مافوور و سوجادە و قالی و، جاجم و بەڕە و گۆرەوی و شاڵ دروست ئەکەن.

لەم بەخشەدا چەند قوتابخانەی بەرایی هەیە. چەند قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، دەرمانگا هەیە مزگەوت و حوسێنییە هەیە... دوکان و مەغازە هەیە، ڕون و خوری و پێستە و دەغڵ و دانەوێڵەیان بۆ فرۆشتن ئەبەنە شاری خوڕەم ئاوا...

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا بەرنامەی داهاتوو بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/١/١٠

١٣٥٥/١/١٠

١٠/نەورۆز/٢٦٨٤

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەکامەرانی و شادی ڕابوێرن. ئەم بەرنامەیە لەوەدابوو کە دوایی بەپیتی «طێ» بهێنێ و، دووبارەی ئەو شار و دێیانە بدوێ کە بەپیتی «ظێ» دەس پێ ئەکەن، ئەگەر جێگەیەکی وەها هەبێ کە لە ڕووی جوغرافی و مێژوویییەوە بۆ باس بشێ... بەڵام لە سەید ئەحمەد ناوێکەوە نامەیەکمان بۆ هات، لە بارەی دێی «طوغان»ەوە پرسیاری لێ کردووین... کە ئەم ناوە چییە؟ و لەکوێوە هاتووە. ئێمە کە فەرهەنگی جوغرافیایی و ناوی تایبەتیمان پشکنی بۆمان دەرکەوت ئەم ناوە هی سەردەمی مەغۆلە ماوەتەوە، لە سەدەی شەشەم بەدواوە، ناوی «طوغان» بیستراوە، یاقوتی حەمەوی باسی ئەوەی کردووە کە طوغان شارێکە و قەڵایەکە لە هەرێمی (ئەرزەن الروم) لە بەشی ئەرمەنستان... بەڵام مەبەستی کاک سەید ئەحمەد لێکۆڵینەوەیە دەربارەی ناوی طوغان، کە گوندێکە لە گوندەکانی دێهستانی ئیسفەند ئاوا سەر بەبەخشی قوڕ و ئوستانی کوردستان.

جا لە وەرامی ئەو برادەرەدا ئەڵێین طوغان ناوێکی تورکییە جغەتائییە، لە سەردەمی مەغۆلەوە کەوتۆتە ناو... لە سەردەمی ئەرغون خان کوڕی ئەبەقاضاندا، کە لە پادشایانی مەغۆل بوو، کابرایەکی وشیار و زرنگ و هەستیار هەبوو ناوی طوغان بوو، فارسیشی چاک ئەزانی... کە ئەرغون لە لایەن سوڵتان ئەحمەد تەکوداری برایەوە، والیی بەغدابوو، ئەم طوغانەی لەگەڵ بوو. پاشان کە ئەرغون چووە سەر تەختی سەڵتەنەت و خواجە وەجیەدین لە وەزیری کەوت، ئەم طوغانە جێی گرتەوە... خواجە وەجیەدین نامەیەکی بەهەڵبەست بۆی نووسی و گلەیی لە چەرخی بەدی ڕۆژگار کرد و، کەوتە پاکانەکردن بەرامبەر بەو تاوانانەی خرابووە سەر شانی... ئەم طوغانە وەرامی نامە درێژەکەی بەم هەڵبەستانە دایەوە، کە فارسین...

سالها جام جم بدست تو بود
چون تو نشناختی، کسی چه کند؟
گوهر شب چراغ بودت لیک
چون خود انداختی، کسی چه کند؟

اسب رهوار بود و مـيـدان خـوش

چون تو بد تاختي، كسي چه كند ؟

برده بودي و نقـشت آمـده بود

چون تو كژ باغتي، كسي چه كند؟

بەڵام لەوەدوا هەستـێـرەی ئەم طوغـانەوە كـەوتەوە لێـژی و لە سـەردەمی سـەڵتـەنەتی گیخاتوی مەغۆلیدا لە سێدارە درا جا ئەم جێیانەی کە ناوی طوغانیان پێوەیە، یادی ئەو طوغانەن.

موزیک

طوغـان دێیەکە لە دێهستانەکانی ئەسغەرزئاوای بەخشی قورووەی ئوستانی کوردستان، ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی بەلای باکور و ژووریا، خاکەکەی زورگ و هەڵەتە، سەردەسێرە، ئاوی خواردنەوەیان هی چەمە، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵەیە. کاروباریان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە... ڕچی ئاینییان مەزهەبی جەعفەرییە، زبانیان تورکییە، فارسی و کوردیش ئەزانن. ژنانیان، تەون و کـرد و چنین ئەزانن. لەم دێیەدا قوتابخانەیەکی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە، مزگەوت و حوسێنییەشی تیایە ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە ٤٠٠ کەسێک.

جگە لەم طوغانە، هەر لە دێهستانی ئەسغەرز ئابادا دێیەکی تریش هەیە ناوی «طوغان پلو سرکان»ە وا دیارە خەڵقەکەی کە لە سەرەتادا لەم ئاواییەوە ڕۆیشتوون بۆ ئەوێ...

ئا ئەمە بوو زانیاریێ کە لە فەرهەنگەکانا دەربارەی دێی طوغان بەدەس هات.

تا بەرنامەیەکی تری بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ.

٢٥٣٥/١/١٦

١٦/نەورۆز/٢٦٨٤

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، سەربەرزی و ژیانی کامەرانی ئێوە، ئاواتی بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆیی ئێرانە. و هۆی خۆشبەختییە بۆ ئێمە کە پێتان ڕابگەیێنین لەبەرئەوەی کە لە باسی سێ پیتی «ظێ و عەین و غەین»دا ناوانی مێژوویی و جوغرافی وەها نەبوو کە سەرچاوە جوغرافیاییەکان، خۆیان بەباسییەوە ماندوو کردبێ و، بەکەڵکی ئەوە بێن بەرنامەیان دەربارە بنووسرێ... لەبەرئەوە لەو ناوانە گەڕاین کە بەو سێ پیتە دەس پێ ئەکەن... ئیتر بەرنامەکان بەو پیتە دەس پێ ئەکرێ کە سەرەتای «فێ»یە. جا بەوپێیەی کە ڕۆشن کرایەوە وتاری ئەم حەوتەیەمان باسی «فارس»ە... و بەهیواین پەسەندی ئێوەی بەڕێز بێ و سوودیان لێ وەربگیرێ...

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! ئەم حەفتەیە باسی «فارس» دەکەین... ئەم وشەیە لە بنەڕەتا «پارس» بووە، عەرەب کە پیتی «پێ»یان نەبووە گۆڕیویانە بەفارس. و ئەمڕۆ فارس هەروەکو ناوێکی جوغرافیایی بۆ ئوستانی فارس -کە ناوەندەکەی شیرازە- هەروا ناویشە بۆ گەلێکی ئێرانیی کۆن، کە تا ئەمڕۆ بەشێوە زمانی فارسی ئەدوێن و، لە سەدەهای کۆنەوە، مێژوونووسانی عەرەب گەلی فارسیان لە باتی گەلی ئێران بەکاربردووە و، هەروەک وترا ناوی فارس لە بنەڕەتا پارس بووە، کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکانا «پارسە» تۆمارکراوە و، یۆنانییەکانیش «پەرسیس»یان پێ وتوە... هەندێ لە مێژوونووسان لایان وایە کە هەندێ عێل و تیرەی کۆچەر کە لە دەوروبەری زریەچەی نورمێیە دەریاچەی ڕەزائییە دەژیان، یا لە دەوروبەری کرمانشا، ئەمانە سەردەمی دەسەڵاتی پادشاهیی مادا، ئەو هەرێمەیان بەجێ هێشتووە و کۆچیان کردۆتە هەرێمی فارس و لەگەڵ بەخێوکردنی ئاژەڵ و مەڕومالات خەریک بوون... و هەرچەندە تا ئێستەش ئەم باسە بەتەواوی بۆ مێژوونووسان ڕوون نەبۆتەوە، کە هۆی کۆچی پارسواکان لە هەرێمی ڕەزائییەوە بۆ هەرێمی فارس چییە بەڵام گومان دەکرێ... شەڕ و هەرای نێوانی ئاشوور و ماد لەلایەکەوە و، شاڵاو و پەلاماری سکاکان بۆ سەر ئەو هەرێمە، لەلایەکی ترەوە بوون بەهۆی وەڕزنەبوونی ئەم عێلانە و گواستنەوەیان بۆ ئەم هەرێمی پارسە... دووریش نییە

هۆی کۆچکردنەکەیان ئەوە بووبێ، کە جارجار لەسەر زەوی «ئەنشان» -یا «ئەنزان»-دا کە لەوەبەر ژێردەستی دەوڵەتی عیلام بووە و، کەوتۆتە ژێردەستی دەوڵەتی ماد... شۆڕش و یاخیبێتی ڕووی دا بێ و، مادەکان، پارسواکانیان ناردبێتە ئەو ناوە، هەم بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشی ئەوان و، هەم بۆ دامەزراندنی ئاسایش لەو هەرێمەدا... هیرودوت کە پێی ئەوترێ «باوکی مێژوو» نووسیویە: پارسیان سێ چین بوون: یەکەم چینی بەرز - واتا شەڕکەران - لە سێ تیرە پێک ئەهاتن «پاسار گادای» و «مارافی ئی» و «ماسپی ئی»... دووەم چینی مسکێن و کشاوەرز کە خانوونشین بوون، سێیەم ئەوانەی کۆچەری ڕەشماڵ نشین بوون کە لە چادر و دەوارا ئەژیان و، بەچیا و پێ دەشتەکانا، ئەسووڕان بۆ مەڕ لەوەڕاندن...

ئەم پارسوایانە کە هیردوت بەم جۆرە دەربارەیان دواوە ناویان لە بەردە نووسراوەکانی سەردەمی ئاشووریشا هەر بەم جۆرە تۆمارکراوە، بەڵام ئەو حەلە هێشتا هەر لە دەوروبەری زریاچەی ڕەزائییەی ئەمڕۆیی بوون، کۆچیان نەکردبوو بەرەو فارسی ئەمڕۆیی. ئەم پارسییانە، لە سایەی کورشی گەورەوە ناویان بەرزەوە بوو، کە خۆی لە تیرەی پارساگاد بوو، ئەو لە سەرەتادا بەهۆی ئەم عێلەوە هەرێمی ئەنشانی لە چنگی ئەوانە دەرهێنا کە دەسیان بەسەریا گرتبوو

موزیک

ئێمە کە باسی فارس دەکەین، لێرەدا کاتی ئەوە نییە، کە دوورودرێژ دەربارەی دامەزرانی دەوڵەتی هەخامەنشی بدوێین... تەنیا ئەوە ڕوون ئەکەینەوە، کە لە سەردەمی هەخامەنشیدا پارس بەو سەر زەوییە دەگوترا کە چوار دەوری بەم جۆرە بوو: لای خۆرئاوای ئەگەیشتە چیاکان و پێدەشتەکانی سەر زەویی عیلام لای خۆرهەڵاتەوە بیابانی لارستان ئەکەوتە نێوانی پارس و کارمانیا -واتا کرمان- و لای خۆرئاوای باکورییەوە سنووری ئەگەیشتە هەرێمی پارایتاکینە Parîtakne واتا سنووری ئەسفەهانی ئەمڕۆیی، کە سەر بەدەوڵەتی ماد بوو و، لای خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باکوریشەوە، ئەگەیشتە کەویر... یەکێک لە سەردارەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی سەر زەوی پارسی بەم جۆرە ناساندووە کە سێ بەشە... بەشی کەنار زریەیی... کە بەشێکی قومەڵانی و لمی و گەرمەسێرییە و، تەنیا دارخورمای هەیە... بەشی چیایی... بەشی سەر زەویی پڕ پیت و بڕشت...

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان بەسەرچوو بەهیواین هەموو کاتێکتان بەشادی ڕابوێرن.

٢٥٣٥/١/٢٤

## وتاری: ٦-٢

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان، کامەرانیتان هیوای بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێرانە، ئەگەر لە یادتان مابێ حەوتەی ڕابردوو باسی «فارس» بوو، ئەوەبوو ڕوونمان کردەوە کە وشەی فارس لە بنەڕەتا «پارس» بووە، عەرەب کە پیتی «پێ»یان نەبووە، ناوەکەیان گۆڕیوە، بەفارس و خەڵقی وڵاتی ئێرانیش لەبەر بەشکۆیی ئاینی ئیسلام، ئەو پیتی «فێ»یەیان لە جێی «پێ» داناوە و، تا ئەمڕۆش هەر فارس ئەڵێن و، با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی پێشوو و بەموسیقاییێکی خۆماڵیش گوێمان بحەسێنینەوە.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز

ئەوەبوو وتمان پارسواکان لە بنەڕەتا لای خوارووی زریاچەی ئورمیە (دەریای ڕەزائیە) دائەنیشتن و بەرەو هەرێمی ئەنزان گوێزایانەوە، هۆی ئەم گوێزانەوەش وەک دەرئەکەوێ یا لەبەر شاڵاو و دەسدرێژیی پەی دەرپەیی سکاکان و، ئاشوورییەکان بووە، یاخۆ پارسواکان بەدەستووری یەکێک لە پادشایانی ماد گواستوویانەتەوە بۆ سەر سنووری عیلام، کە وڵاتەکە لە شاڵاوی ئاشوور بپارێزن، چون ئاشوورییەکان هەروەک لە هەرێمی کوردستان و ئازەربایجانەوە پەلاماری وڵاتیان ئەدا، هەروا لای خوارووی وڵاتەوە لە لوڕستان و خوزستانیشەوە هەر لە پەلاماردانا بوون. جا کۆچ و ڕەوی پارسواکان بۆ مێژوونووسان ڕوون نەبۆتەوە ئایا لە سەردەمی هەخامەنش و نەوەکانیا بووە، یا لەوەبەر بووە. کتێبە مێژوویییەکان هەر ئەوەندەیان بۆ تۆمار کردووین کە پارسوکان لە دەوروبەری سەر زەوی ئەنشان -یا ئەنزان- بەسەر هەندێ لە دەسەڵاتە خۆماڵییەکانا زاڵ بوون و هەرێمی پارسیان تەواو خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەڵام لە هەمان کاتا مێژوونووسان دەڵێن «کەبوجی»یەی هەخامەنشی هەروەک سەرداری پارس بوو، هەروا زاوای ئیشتوویگای ئاخرین پادشای ماد بوو، ماندانای کچی خواستبوو، کە کورشی لێ پەیدابوو و، لەو حەلەدا بەناوی پادشای مادەوە فەرمانڕەوای پارس بوو.

هەخامەنشییەکان، واتا ئەو سەردارانەی کە لە تیرەی پارسەگەرد -کە پاشان ناوەکە گۆڕاوە بە «پازارگاد»- دەسەڵاتیان بەسەر هەرێمی پارسدا هەبووە، تا ئێستە نەزانراوە

چەند کەسیان یەک لەدوای یەک فەرمانڕەواییان کردووە. بەڵام ناوی ئەم بنەماڵەیە بەهۆی کوورشی مەزنەوە بەرزبووەوە، کووروش شاهەنشاهییەکی پتەوی بەربڵاوی دامەزران... هەر لەبەرئەوەیە هەندێ لەوانەی کە تەفسیریان بۆ قورئانی پیرۆز نووسیوە، وایان داوەتە قەڵەم کە مەبەس لە ذولقەرنین - کە ناوی لە قورئانی مەزندا هاتووە، کووروشی گەورەیە، چونکە خاکی شاهەنشاهی ئێران لە سەردەمی ئەوا بەرەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا پەرەی تەواوی سەندبوو،... هەخامەنشییەکان کە پایتەختیان هەرێمی فارسی ئێران بوو لە ٥٥٩ بەر لە میلادی عیساوە تا ٣٣٠ بەر لە میلاد فەرمانڕەوا و شاهەنشاهی ئێرانیان بەدەستەوە بوو - واتا نزیکەی ٣٣٩ساڵی ڕەبەق خێوی گەورەترین دەسەڵاتی ئەو سەردەمە بوون... شکۆی ئەو شاهەنشاهییە بەهۆی ئەو دێرینە و، شوێنەوارانە و، بەردە نووسراوانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە کە لە پازارگاد -یا پرس پولیس-وە تەخت جەمشید و چیای بێستون و، چیای ئەڵوەندی هەمەدان و، نۆکەندی کاناڵی سویس، کە لەو حەلەدا بەتەواوەتی هەڵ نەکەندرابوو نووسرابوون و، هەڵکەندرابوون. بەڵێ ئەو پارسوایانە کە لە سەرەتادا، لە هەرێمی ماد بوون و، لەگەڵ مادەکانی پسمام و ئامۆزایانا لە ڕەگەزەی پاکی ئاری بوون توانییان ناوی خۆیان، نەوەک هەر لەسەر لاپەڕەی مێژوو تۆمار بکەن، بەڵکو ناوی خۆیان لەسەر تاشەبەردی ڕەق تۆمارکەن، کە لە دوو هەزار و پێنج سەد و سی و پێنج ساڵەوە تا ئەمڕۆ گەردشی چەرخی ڕۆژگار و، چەکوشی دوژمنانی بەدکار لە توانایانا نەبووە، ئەو شکۆیە نابوود بکەن. بەڵێ شکۆی ئارای نژادان دەبێ هەر بمێنێ و هەر پایەداربێ...

موزیک

بیستیارانی بەڕێز، ئەم شکۆ و ئەو ڕەنگەی پارسواکان بەجۆرێ مێژووی ڕازاندۆتەوە، کە ناوی «پارس» و ناوی «ئێران» لە سەرچاوە مێژووییەکانا، هەر بەیەک دانراوە... بەڵام لەوە پاش ناوی «فارس» -کە لە پارسەوە وەرگەڕاوە بە «فارس»ی عەرەبی بچووک بووەتەوە، بۆتە ناو بۆ هەرێمی، یا وەکو ئەمڕۆ ئەوترێ بووەتە ناو بۆ ئوستانێ لە ئوستانەکانی ئێران... با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە لە بنەماڵەی ساسانیش لە بنەڕەتا هەر لە ئوستانی فارسەوە سەریان هەڵداوە... بەڵام ئەشکانیان، کە پاش دەورانی ئەسکەندەر و سلوکییەکان، لە ئێرانا فەرمانڕەواییان کردووە، بەبیروڕای هەندێ لە مێژوونووسان لە سەرەتادا خەڵقی چیا -وانا عێراقی عەجەم- بوون و گۆیا لە سەرەتادا هی دەوروبەری «نەهاوەند» بوون... و چەند دەوڵەتێکی جیاجیایان هەبووە... و دەسەڵاتیان بەسەر پارسدا

نەبووە، لەو حەلەدا لە هەرێمی پارس چەند سەردارییەکی بچووکی ناوەخۆ هەبووە، کە هەرێمی فارسیان بەڕێوەبردووە...

موزیک

بیستیارانی خۆشەویست لێرەدا کاتمان تەواوبوو، پاشماوەی باسی فارس لە وتارەکانی دواییدا بلاو دەکرێتەوە، ئێستە خواحافیزیتان لەگەڵ دەڵێین بەکامەرانی و سەرفرازی بژین.

٢٥٣٥/١/٣١

**وتاری: ٢٠٧**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە کامەرانیستان هیوای بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە، لە وتارەکانی پێشوودا هەندێ زانیاریمان دەربارەی فارس بۆ روون کردنەوە... ئێستەش هەر لەسەر ئەو باسە ئەڕۆین بەهیواین پەسەندی بکەن.

موزیک

وتمان ناوی هەرێمی «فارس» کە ئێستە پێی ئەوترێ ئوستانی فارس لە ناوی نەتەوەی «پارس»ەوە هاتووە، کە لە دەوروبەری زریاچەی (دریاچە) ئورمێیە (ڕەزائیە)وە گوێزاویانەتەوە بۆ هەرێمی فارس و لەوێ هەرێمەکە، ناوە کۆنەکەی کوێربووەتەوە و ناوی «فارس»ی پەیدا کردووە... پاشان هەروەکو بەنەتەوەکە وتراوە «پارس» هەروا بەو جێیەش کە تیا نیشتەجێ بوون، دیسانەوە وتراوە «پارس» و عەرەب کردوویانە بەفارس.

هەرێمی فارس لە ٥٥٩ بەر لە میلادەوە تا ٣٢١ بەر لە میلاد لەژێر دەسەڵاتی شاهەنشاهیی هەخامەنشیدا بووە، کە سەرەتای دەسەڵاتی شاهەنشاهی لە کوروشی مەزنەوە تا داریوشی سێیەم بەردەوام بوو.

شاهانی هەخامەنشی بەم جۆرە هاتوونە خوارەوە: «کوروش - کەبوجییە - داریوش - خشایارشا - ئەردەشێری یەکەم - داریوشی دووەم - ئەردەشێری دووەم - ئەردەشێری سێیەم - داریۆشی سێیەم»... بەڵام ئەوەی هۆی داخ و مەخابنە، فەرهەنگنووسەکان، دەربارەی سەرەتای دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە قسەیان یەک ناگرێ؛ هەندێکیان چوونە سەر تەختی کورشی مەزنیان بەساڵی ٥٥٩ بەر لە میلاد داناوە و، هەندێکیان بە ٥٥٣ بەر لە میلاد، بەڵام دەبێ ٥٥٩ ساڵە کە ڕاستتر بێ. پاش دەورانی شاهەنشاهی هەخامەنشی و داگیرکرانی هەرێمی فارس لە لایەن دوژمنەوە لەو ناوەدا هەندێ سەرداریتی خۆماڵی دامەزراوە... گەلی ئێران کە زۆر زوو خۆی لە دوژمن ڕزگار کرد، توانی شکۆی دەورانی هەخامەنشی زیندوو بکاتەوە و، لە قاڵبی دەوڵەتی ساسانیدا، ئەو شکۆ و ڕەنگە وەکو قەڵایەکی پۆڵایین دابڕێژێ. بنەماڵەی ساسانیش هەر خەڵقی فارس بوون ساسان یەکێ بوو لە گەورەترین موبەدان و زانایانی پەرستشگای ئەناهیتا -کە بەفارسیی تازە ناهیدی پێ ئەوترێ- ئەم پەرستشگایە لە شاری ئیستەخری فارس بوو، پاپەکی کوڕی ساسان کە گەنجێکی پێ کەوتووە و، لێهاتوو بوو، شەیدای «ڕام بەهیشت» خانمی کچی سەرداری

عێلی بازرەنگی بووبوو، کچەکەی خواست و پاشان دەسەلاتیشی لە دەست ئەو سەرداره زەوت کرد و، کەوتە پەرەدان بەدەسەلاتی خۆی، لە سەرەتادا، ئەو هەرێمانەی دەوروبەری ئیستەخری خستە ژێر دەست خۆی، تەنانەت ناردی دژی «داراب گورد»ی داگیرکرد، -کە قەلایەکی زۆر سەخت و بەناوبانگ بوو و ئەردەشێری کوڕی تیا دانا... ئنجا پتر کەوتە فراوانکردنەوەی سنووری ولاتەکەی... ئەردەوانی پێنجەم کە ئاخرین پادشای ئەشکانی بوو... لە ئەردەشێر ڕاپەڕی، نامەیەکی توندوتیژی لێ نووسی و، تانوتی لێ دا کە شایانی پادشایی نییە، چون لە دەوارە شڕی خێڵەکانی ولاتی فارسا گەورە بووە، بەلام ئەردەشێری کوڕی بابەک کە بەهێزی عێلی بازەرەنگییەوە، ئەینازی و، خێڵ و عێلەکانی تریش یارمەتییان ئەدا، پاش ئەوەی هەموو هەرێمی فارسی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، ئنجا هەلی کوتایە سەر هەرێمەکانی ژێردەستی ئەردەوان و هەمووی لەژێر دەست دەرهێنا و گەورەترین شاهەنشاهی دامەزراند... بنەمالەی ساسانی نزیکەی ٤٥٠ چوار سەد و پەنجا ساڵ، شاهەنشای ئێران بوون و، لەو حەلەدا ولاتێکی پانوپۆڕ و بەربلاو بوو شاهانی ساسانی گەرچی پایتەختی ولاتیان، تا سەردەمێ لە فارس بوو، پاشان گوێزایانەوە بۆ زۆر جێ و، چەندین کۆشک و تالاریان دروست کرد هاوینەهەواری جیا - و بەهارە هەوار جیا، بۆ وێنە لە کاتێکا «تیسفون» کرابووە پایتەخت کە نزیکی ئێستەی بەغدا بوو، لە هەمان کاتا پایتەختی بەهارە هەواریش لە شوش و شوشتەرا هەبوو... و پایتەختی هاوینە لە فارس بوو...

ولاتی فارس لە دەورانی ساسانیدا بەچەند بەش دانرابوو، کە پێ ئەوترا «خوڕە» و عەرەب گۆڕیبوویان بە «کورە»... یەکەم کورەی ئەردەشێر، کە شیراز ناوەندی بوو و ناوەندی ئوستانەکەش بوو. دووەم کورەی شاپور کە ناوەندی شاری شاپور بوو، سێیەم کورەی ئەرەجان... چوارەم کورەی ئیستەخر، کە شاری پەرس پولیسی هەخامەنشی ناوەندی بوو. پێنجەم کورەی داراب گورد بوو.

عەرەب، کە توانییان پاش ڕووخاندنی دەولەتی ساسانی ولاتی فارس داگیر بکەن، ناوی ئەم کورەیانەیان نەگۆڕی... بەلام لە سەردەمی ساسانی و سەرەتای ئیسلامیشدا بەشێکی گەورەی یەزد و کرمان و خوزستان، سەر بەفارس بوو، ئەمڕۆ ئوستانی فارس لە ئەیالەتی فارسی کۆن بچووکترە.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز چاوەڕوانی وتاری ئاینده بن، ئێستە بەخواتان ئەسپێرین.

**وتاری: ٢٠٨**

بیستیارانی خۆشەویست، کامەرانی و بەختیاریتان هیوای نووسەر و بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە، با بیخەینەوە بیرتان کە ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی «فارس» دەڕۆین.

موزیک

هەروەکو لە وتاری پێشوودا وتمان: فارس کە ئەمڕۆ پێ ئەوترێ ئوستانی فارس، لە سەردەمی ساسانیدا بریتی بوو لە چەند «خورە» واتا چەندین ویلایەت، ساسانییەکان لە سەرەتادا پایتەختیان شاری پەرسی پولیس بوو، ئەم شارە ناوەندی ویلایەتی ئیصطەخر بوو کە لەو حەلەدا پێی ئەوترا خورەی ئیصطەخر، بێ گومان وشەی ئیصطەخریش لە بنەڕەتا «ئیستەخر» بووە بەتێی بچووک، بەلام عەرەب لایان سەخت بووە، بەوجۆرە بیدرکێنن گۆڕیویانە و ئیصطەخر بەصاد و طێ... جا هەروەک زووتریش دیاردیمان بۆ کرد لە سەردەمی ساسانیدا، فارس بریتی بوو لە پێنج کورە، یاخورە... واتا ئەیالەت... کە ئەمانە بوون: ئەردەشێر خورە - ناوەندەکەی شیراز بوو، هەرچەندە شیرازی ئێستە لەو حەلەدا، ئەم شارە نەبوو... کورەی شاپور کە ناوەندەکەشی شاری شاپور بوو... ناوەندەکەشی شاری ئەڕەجان بوو... کورەی چوارەم هەرێمی ئیصطەخر بوو، کە ناوەندی شاری پەرسی پولیسی پایتەختی ساسانیان بوو کورەی پێنجەم شاری داراب گورد بوو، کە لە دواییدا عەرەب ناویان نا داراب جورد... جوغرافیانووسانی ئیسلامی فارسیان لە ڕووی ئاووهەواوە بەدوو بەش دانابوو... گەرمەسێر کە ئەوان پێیان ئەوت «جروم» و سەردەسێر کە ئەوان پێیان ئەوت «صرود»، بۆ ئەم دوو بەشە هێڵ و سنوورێکی خەیاڵی هەبوو کە گەرمەسێری لە سەردەسێر جیا ئەکردەوە.

ساسانیان، وا دیارە لە سەردەمی یازدەیەمین پادشایاندا کە ناوی ئەردەشێری دووەم بووە پایتەختی شاهەنشاهییان لە پەرس پولیسەوە گوێزراوەتەوە بۆ دەوروبەری کرماشانی ئێستە و تاق بوستانیان کردووە بەپایتەخت، دیارە هۆی گوێزانەوەی پایتەخت، یا پەرەسەندن و تەنینەوەی سنووری وڵاتەکە بوو، وەیا هۆی ئەوەبووە کە شەڕ و هەرای نێوانی ئێران و ڕۆم لە لایەکەوە و شەڕ و هەرای نێوانی ئیران و هەفتالیان Heftalyan کە عەرەب پێیان وتوون «هەیاطلە» لەلایەکی ترەوە، وای هێنابێتە پێشەوە کە پایتەخت بگوێزرێتەوە بۆ «تاق بوستان» کە ناوەندی وڵات بێ... پاشان لە دەورانی خوسرەوی

ئەنەوشیرەواندا پایتەختی ساسانی گوێزرایەوە بۆ تیسفون کە لەوەبەر، لە سەردەمی ئەشکانییەکانەوە، جارجارە زستانان پادشایانی ئێران لەوێ ژیانیان بەسەر ئەبرد... بێ گومان هۆی گوێزانەوەی پایتەختی ساسانی بۆ تیسفون ئەوەبووە کە ئێران توانی بووی ولاتی عەرەب تا یەمەن بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی و سەردارێکی بچووک لە عەرەبەکانی نێوانی دیجلە و فورات پێک بهێنێ بەناوی دەولەتی «حیرە»وە یا دەولەتی مەنازرە... چون رۆم، لە شاما سەرداریەتییەکی عەرەبیان دامەزراندبوو بەناوی غەسانیان...

شاری تیسفون کە عەرەب پێیان ئەوت «مەدائین» ئەکەوتە جێی ئێستەی شارۆلکەی سەلمان پاک لای خوارووی بەرەو خۆرهەلاتی بەغداوە... کە لەم شوێنەدا تا ئەمڕۆ نیشانێ لە کۆشکی شاهەنشاهی ساسانی ماوە و بەناوی «تاقی کیسرا» بەناوبانگە...

موزیک

فارس، ئەم ناوە کە ئەمڕۆ دراوە بەیەکێک لە ئوستانە هەرە گرنگەکانی ئێران، لە سەرەتای ئیسلاما لەباتی ناوی ئێران بەکاردەبرا، مێژوونووسانی عەرەب لەباتی ئەوەی بلێن ولاتی ئێران، یا کیشوەری ئێران، یا شارەکانی ئێران، ئەیانووت ئیقلیم فارس، بیلاد فارس،... بەلام خەلقی ولاتی فارس، تەنانەت کوردەکانی شوانکارە، توانییان لە هەندێ بەشی ولاتی فارسدا دەسەلاتی خۆمالی دابمەزرێنن و خۆ لەژێر دەسەلاتی عەرەب رابپسکێنن و، خەلقی تریش بەرەو زیندووکردنەوەی نژادی ئێرانی رابەری بکەن دەولەتی شوانکارە، کە قەلای ئیگیان کردبووە ناوەندی ولات... هەموو فارسییان دەستەوەبوو، بەنومایەزەگانی خولەفای ئەمەوی و عەبباسی، تەنیا باج و پیتاکیان ئەدا... بەلام لەگەل سەفارییەکانا برایانە ژیان و لەگەل دەولەتی ئال بویەدا کەوتنە شەڕەوە...

سەفارییەکان شیرازیان کردە پایتەخت، کە لەو حەلەدا شارۆلکەیەک بووە، پاشان پەرەی سەند و تەنییەوە...

لە سەدەی چوارەمی کۆچییا شاری شیراز کە بووبوو بەپایتەختی عەضود الدەولەی ئال بویە زۆر پەرەی سەندبوو و شاری شیراز شوورەیەکی زۆر سەختی بۆ دروست کرابوو ئەم دەروازانەی هەبوو: (دەروازەی ئیصطەخر - دەروازەی شوشتەر - دەروازەی بەند ئاستانە - دەروازەی غەسان - دەروازەی سەلم - دەروازەی کەوار - دەروازەی مەند رود - دەروازەی میهەن دەر) سولتان عەضود الدەولە ئال بویە لەلای ژووری شیرازەوە، بەسەر کارێزێکەوە کە لە دێی جوینە و سەر بەرەو خوار ئەبووەوە بەرەو شیراز، لەوێدا کۆشکێکی

شاهانەی دروست کرد و، هەر ئەوەبوو کە پاشان وەرگەڕا بەبیمارستان و نەخۆشخانەی عەضودی بەناوبانگ... و لە خوار شیرازیشەوە بەچەند کیلۆمەترێ کۆشکێکی تری دروست کرد، ناوی نا «گردی پەنای خوسرەو» عەرەب ناویان نا «گرد فنا خسرو». دەوروبەری ئەم کۆشکە بووە شار و، بووە جێی سکەی دراو لێدان - واتا: مەرکەزی ضەرابخانە - بازاڕێکی زۆر جوانیشی تیا دامەزرا... بەڵام لە سەردەمی مەغۆلدا وێران بوون...

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان... لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین هەموو کاتێکتان شادبێ.

٢٥٣٥/٢/١٥

**وتاری: ٩-٢**

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شادبێ، هیوای ئێمە، پەسەندی ئێوەی بەڕێزە کە پڕ بەدڵ گوێ ئەدەنە ئەم بەرنامەیە و، ڕەخنەی لێ دەگرن و ڕێنومایییمان دەکەن.

با ئەوەش بڵێین کە ئێمە هێشتا هەر لە باسی «فارس» دەڕۆین.

موزیک

وتمان «فارس» هەروەکو سەدەها ساڵ پایتەختی هەخامەنشییان و هەندێ لە شاهانی ساسانی بووە، هەروا لە نووسینی مێژوونووسی و جوغرافیانووسانی ئیسلامیشدا، هەمیشە ناوی فارس هاوتای ناو ئێران بووە... لە دەورەی ئال بویەشدا کە وڵاتی ئێران و عێراق و زۆر جێی تریان لەژێردەستابوو، دیسان فارس پایتەختی سوڵتان عەضود الدەولە بوو... گەرچی هەندێکیان پایتەختیان شاری ڕەی و هەندێکیشیان جێیانی تری وەک هەمەدان و بەغدا...

فارس کە لەو سەردەمەدا ناوەندەکەی شیرازبوو، کەوتە پەرەسەندن و گەشانەوە، لە دەوروبەری شیراز و لە شارەکانی تریدا زۆر کۆشک و تەلاری گرنگ و، مزگەوت و بازاڕی بەشکۆ دروست کرا... تەنانەت لە سەردەمی ڕوکن الدەولە ئال بویەدا چەند کانیاو و کارێزێ لێ درا و، ئاوەکەیان کرا بەیەک، بەناوی ئاوی ڕوکن ئاباد سەرەولێژ کرایەوە بۆ دەوروبەری شیراز و گۆڕەپان و دەشتایی «موصەللا = مُصَلّی)ی پێ ئاوێژە کرایەوە... ئەم دەشتە بوو بەگوڵ و گوڵزارێکی سەیر و، سەیرانگایەکی جوان... و لە سەدەی چوارەمەوە تا سەدەی حەوتەم ئەم خۆشی و سەفایەی باغ و ئاوەکان، ڕۆژ بەڕۆژ پڕ ڕەونەقتر ئەبوو. حافیزی شیرازی لە دیوانە بەناوبانگەکەیدا، دەیان جار ناوی ئەم جێگەیانەی بردووە... تەنانەت لەم هەڵبەستە.

آب رکن آباد و گل گشت مصلارا»

..............................................

موزیک

بەڵام لە سەردەمی هەرەدوایی دەورانی ئال بویەدا، کە سەلجووقییەکان شاڵاویان هێنا،

ولاتی فارس تۆزێ تەگەرە و کۆسپەی دی تەنانەت شەڕوشۆڕی کە لە نێوانی سەرداریتیی شوانکارە و سەلجووقییەکانا رووی دا. وێرانییەکی زۆری خستەوە. بەڵام پاش ئەوە سەلجووقییەکان کەوتنەوە ئاوەدانکردنەوەی ئەو جێیانەی وێرانیان کردبوو، لە زۆر جێ شوورە و قەڵایان دروست کرد... پاش سەلجووقییەکان، فارس ماوەیەک لەژێر دەسەڵاتی خوارەزمییەکانا بوو. ئینجا کەوتە ژێر دەسەڵاتی مەغۆل... ئەوەی ڕاستی بێ تا نیوەی سەدەی شەشەمی کۆچی ولاتەکە لەژێر فەرمانی ڕاستەقینەی سەرداریتیی شوانکارەدا بوو... ئال بویە - سەلجووقی - خوارەزمیٚ... تەنیا باج و پیتاکێکی ساڵانەیان لەم فەرمانڕەواییە وەرئەگرت... لە سایەی سەلجووقی و خوارەزمی و مەغۆلەکان، بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوایی تازە کاروباری ولاتیان گرتە دەست... ئەم بنەماڵەیە تورک بوون و لە ولاتی فارسدا پەروەردە بووبوون، ڕەوش و ئەخلاق و زبانی بومیان وەرگرتبوو، ئەم بنەماڵەیە بەناوی «سەلغەریان» وەیا «زەنگی» ناسراون. دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە سەنقەری کوڕی مەودوو بوو، چۆن باپیرە گەوریان ناوی سەلغەر بوو، بەسەلغەریان ناسران پاش ئەو موزەفەرەدین زەنگیی برای بوو بەفەرمانڕەوا لە نەوەکانی ئەم زەنگییە ئەبوبەکری کوڕی سەعد و سەعد کوڕی ئەبوبکر هاوچەرخی هەستیاری بەناوبانگ سەعدی شیرازی بوون و، سەعدی لە دەورانی ئەماندا کاروباری گرنگی بەدەس بوو، بۆیە لە گولستانا زۆر بەبنەماڵەی زەنگییەکانا هەڵ ئەڵێ...

جیهانگەردی بەناوبانگ «شاردن» کە چووەتە فارس و هەڵبەستەکانی حافیزی شیرازی هاتووە بەبیرا، زۆر گورج چووەتە دیدەنیی «ئاوی ڕوکن ئاباد جا» نووسیویە، ئاوی ڕوکن ئاباد، لەوانە نییە شایانی لێ دووان بێ... پاش ئەویش جیهانگەردێکی تری بەناوی «گوبینو» چووەتە شیراز، ئەویش وتویە: ئەم ئاوی ڕوکن ئابادەی حافیز ئەوەندە هەڵی ناوە، ئەمڕۆکە جۆگەڵەیەکی بچووکی کەم ئاوی چڵکاوە...

## موزیک

با لە باسی بنەماڵەی زەنگی لابدەین، پاش ئەوان ڕاستەوڕاست ولاتەکە کەوتە ژێر چنگی مەغۆلەوە، ئەوان هەر ساڵ و ولاتی فارسیان ئەدا بەیەکێک لە دەربەگەکان بەساڵانە... و پێیان ئەوت «ئینجو»، جا دامەزرێنەری بنەماڵەیێ کە پاش زەنگییە سەلغەرییەکان لە فارسدا دەسەڵاتیان گرتە دەست، کە ناوی شەرەفەدین مەحموود شا بوو بەنازناوی ئینجو ناسرا، چون کاروباری تایبەتی هۆلاکۆی ئیلخانی پێ سپێررابوو لە

فارس... ئەم بنەماڵەیە لە ساڵی ٧٠٣ کۆچی و تا ساڵی ٧٥٨ کۆچی سەرداریێتیی فارسیان بەدەست بوو، لە نەوەی «ئینجو» شێخ ئەبو ئیسحاق ئینجو بەدەسەڵاتێکی تەواو دەستی دایە بەڕێوەبردنی وڵاتی فارس و، لەگەڵ مەلک ئەشرەف چوپانی مەغۆلیدا کردی بەشەڕ و، لە وڵات ڕەتاندی و دەری کرد و بەم جۆرە فارس بوو بەهەرێمێکی سەربەخۆ. بەڵام بنەماڵەی ئینجو بەکوژرانی شێخ ئەبو ئیسحاق لە ساڵی ٧٤٢ کۆچییا کوێرەوە بوو... دەسەڵاتی بنەماڵەکەیان بەسەرچوو...

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٢/٢٢

**وتاری: ٢١٠**

گوێگره بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتەتان خۆش، کامەرانیتان و ژیانی شادانەتان، هۆی خۆشیی ئێمەیە، ئەوەش زۆریاش بزانن کە ئێمە هەرگیز لە وەرامدانەوەی نامەکانی ئێوە درێغی ناکەین و دڵنیابن ئەوەی لە سەرچاوەی مێژوویی و جوغرافیا هەبێ، دەربارەی وەرامی پرسیارەکانتان، ڕوونی ئەکەینەوە،... و با ئەوەش بڵێین ئێمە هێشتا هەر لەسەر باسی فارس دەڕۆین و جارێ با پێکەوە گوێ بدەینە موزیکێکی شاد.

موزیک

وتمان ناوی فارس لەمەوبەر، لەگەڵ ناوی ئێراندا هاوشان و هاوپایەبوون، لەو کتێبە مێژووییانە و جوغرافیاییانەدا کە بەعەرەبی نووسراون، ناوی ئێران و ناوی فارس وەک یەک بەکارئەبران، بەڵکو ناوی فارس زۆرتر بەناوبانگ بووە بەڵام ناوی ئێران، تەنانەت، لە دەورانی سەفەوییەوە تا ئەمڕۆ زۆرتر کەوتۆتە سەر زمان و، لە سەردەمی شاهەنشاهی بەشکۆی پەنجا ساڵەی بنەماڵەی پەهلەوی مەزنا، فارس بووە بەناوێکی تایبەتی بۆ ئوستانێ کە لەم چوار چێوەی جوغرافیاییەدا ئەناسرێت: لای ژوور و باکوری هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی ئەسفەهان و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی ساحیلی و لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئوستانی کرمان، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ خەلیجی فارس و، دەریای عومان و ئوستانی ساحیلی...

ئوستانی فارس یەکێکە لە ئوستانە هەرە گرنگەکانی ئەمڕۆی ئێران، پێوانەی سەر زەویی ئەم ئوستانە ١٣٧.٧٢٢ کیلۆمەتری چوارگۆشەییە، هەرێمێکی شاخاوی و چیاییە و، پێ دەشت و ڕاستاییشی زۆرە، سێ زریاچەی تیایە، دەوروبەری زریاچەکان زەویوزارێکی بەپیت و بڕشتە... لە ڕووی دیمەنی سروشتی و کردگارییەوە ئەتوانرێ هەرێمی فارس بەسێ جۆر دابنرێ و، بەشەکانی لە یەک جیا بکرێنەوە:

بەشی یەکەم: هەرێمی لای ژووروی فارسە کە ڕووبار و لافاوی ئەو بەشە شۆڕ ئەبێتەوە و، ئەڕژێتە زریاچەکانی ناو ئوستانەکە.

بەشی دووەم: کە بەشی ناوەندییە ئەو زەویوزارە بەپیت و بڕشتانەیە کە بەدەوروبەری زریاچەکەدان.

بەشی سێیەم: لای خوارووی هەرێمی فارسە، ناوی لافاوی ئەم هەرێمە ئەڕژێتە خەلیجی فارسەوە...

بەجۆرێکی ڕۆشن ئەتوانرێ بوترێ: بەشی چیایی هەرێمی فارس و شاخ و هەڵەتەکانی، کلکەی ڕیزە چیاکانی زاگرۆس ئەهێننە دی، کە لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلات درێژەی کێشاوە و، لەم هەرێمەدا وردە وردە نزمتر ئەبێتەوە تا لەگەڵ زەوییا یەکسان ئەبێ.

موزیک

ئوستانی فارس کە ئەمڕۆکە شیراز ناوەندی ئوستانداریێکەیەتی لە یازدە شارستان پێکهاتووە... مەبەست لە شارستان تەنیا شار و شارۆلکە نییە، بەڵکو مەبەست لە شارستان ئەو بەشە ئیداری و بەڕێوەبەرایەتییەیە کە فەرمانداریێ بەڕێوەی دەبا و، هەر شارستانەش چەند بەخشێکی هەیە، شارستانەکانی فارس بریتین لەم جێیانە... (شارستانی ناوخۆی شیراز - ئابادە - کازرون - فەیروز ئاباد - جەهرەم - نەی ڕیز - فەسا - ئیصطەهبانات - داراب - لار - مەمەسنی) و، با ئەوەش بزانین کە ئەم شارستانانە سی و یەک بەخشیان هەیە.

ژمارەی دانیشتوانی ئوستانی فارس، لە دوو ملیون تێپەڕیوە بەڵام لە سەرژمێریی هەرە دواییدا، کەساڵی ١٣٤٥ شەمسی - واتا ساڵی ٢٥٢٥ شاهەنشاهی - ئەنجام درابوو، ژمارەی دانیشتوانی فارس بەنزیکەی ملیۆن و نیوی درابووە قەڵەم، ئەو حەلە هێشتا عێلە کۆچەرەکان بەتەواوەتی دێ نشین نەکرابوون...

عێلە گەورەکانی ولاتی فارس، لەمەوبەر بریتی بوون لە لوڕە بەختیارییەکان و، شوانکارە، لەم سەدانەی دواییەشدا، سەفەوییەکان عێلی قەشقاییان گوێزاوەتەوە فارس... ئەم قەشقاییانە لە هەرێمەکانی بەختیارییا دامەزراون، لەبەرئەوە تێکەڵ بەیەک بوون... زۆر جار بەختیارییەکانی ولاتی فارس هەر بەقەشقایی ناو ئەبرێن... تا ڕادەیەک کە هەندێ لە خوغرافیانووسەکان کە بەزبانی فارسی کتێبیان داناوە نووسیویانە: عێلی قەشقایی لەبەرئەوە ناوبانگیان بەرزبۆتەوە، کە پشتیوانییان لە کەریم خانی زەند کردووە...

ئەمڕۆ شیراز ناوەندی ئوستانی فارسە، لە ناو خەڵقی ئێراندا بەشاری گوڵ و بولبول بەناوبانگە، چون شیراز جێگەیەکی ئاووهەوا خۆش، پڕ لە گوڵ و گوڵزارە هەروا جێی ئەدەبی فارسییە... باشترین هەستیاران و شاعیرانی فارسی زمانی ئێران لەوێ هەڵکەوتوون بۆ نموونە ئەو هەستیارانە تەنیا ناوی سەعدی شیرازی و حافیزی شیرازی

بەسە، کە لە ڕووی ئەدەبی بەرزەوە سەری هەموو ئێرانی نژادێکیان بەرز کردوەتەوە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتی بەرنامەکە تەواوبوو، تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد.

٢٥٣٥/٢/٢٧

## وتاری: ٢١١

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد...

لەو نامـەیانەی کـە بۆمـان دەنووسن، دڵشـاد ئەبین و، لەو ڕەخنەیانەی دەیانگرن و، لەو پەسـەندانەی دەری ئەخەن خۆشـحاڵین و، ئەوەندەی بۆمـان بلوێ و، سەرچاوە جـوغـرافی و مێژووییەکان یارمەتیمان بدەن، لە وەرامدانەوەی پرسیارەکانتان دوا ناکەوین.

ئەوەش بزانن کە ئەم حەفتەیە باسی دێیەکی بچووکتان بۆ دەکەین ناوی «فـارسینج»ە و، ئەم وتارە وەرام بۆ کاک حەمە عەلی ناو، کە بەفارسینجدا تێپەڕیوە و، داوای مێژینەی ئەم جێیەی کردووە جا پاش بڵاوکردنەوەی پارچەیەک مۆزیکی شاد لێی ئەدوێین.

موزیک

فـارسینج لە بنەڕەتا ناوی دێیەکی گەورەیە، سەر بەشـارستـانی ئەسەد ئابادە، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای ئەسەد ئاواوە. ٤٠ کیلۆمەتر لێیـەوە دوورە و، هەروا ئەکەوێتـە خۆرئاوای لای خواری سونقورەوە بەدووری ١٥ کیلۆمەتر... دانیشـتوانی ئەم دێیە هەزار و پێنج سەد کەسێکن، شێوەی زمـانیـان لوڕییە، هەندێکیـانیش تورکی قسـە دەکەن، بەڵام هەموویان زبانی فارسی باش دەزانن.

ئەم دێیـە سـەردەسێـرە، وڵاتێکی ئاوێژەیە، چەم و کـانی ئاوی زۆرە، خەڵقی ئەم دێیـە بەکشـتـوکـاڵەوە خەریکن، دەسکەوتیـان دەغڵ و دانەوێڵـە و مـیـوەیە، ترێی فـارسـینج ناوبانگێکی تایبـەتی هەیە، توتنی زۆریش پێ ئەگەیێنێ... هەروا پەتاتە و سێـو زەمـینی زۆربەی دەوڵەمەندانی خەڵقی ئەم دێیە، خاوەنی ڕان و مێگەلن ماست و شیر و کەرە و سەرشیر و پەنیر و ڕۆن و خوری و پێستـە و کاوڕ و مەڕی خۆیان بۆ فرۆشتن ئەنێرنە ئەسەد ئاباد و هەمەدان. ژنانی خەڵقی ئەم دێیە، زۆربەیان تەون و کرد و چنین ئەزانن... فەرش و سەجادەی باش دروست ئەکەن و، گۆرەوی و پووزەوانەی سفت ئەچنن.

موزیک

فـارسـینج کە نـاوی ئەم دێیـە بووە، لە دوایییـا بـووە بەناو بۆ دێهـسـتـانێ، پێکهـاتووە لە ١٩ دێی بچـووک و گـەورە، کـە یەکـێکە لـە چوار دێهـسـتـانەکـەی ئەسـەد ئاباد و، سنووری چوار دەوری ئەم دێهـسـتـانی فارسینجە بەم جۆرەیە: کەوتۆتە لای خوارووی بەرەو خۆرئاوای

بەخشی ئەسەد ئابادەوە، لای باکور و ژووررووی بەشی خۆرئاوایەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سونقوری کولیایی و لای باشوور و خواریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی خودابەندە لوی بەخشی سەحنە و، لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی جوککە ئەفشار ئەم دێهستانی فارسینجە، کەوتۆتە پێ دەشت و دارستانێکی بچووک و، چیا و کێوی بەرز گەمارۆی داوە، تەنانەت لە بەشی لای خوارووی خۆرئاواوە. بەرزترین لووتکەی ئەو کێوانەی ئەکەونە لای خوارووی ئەم دێهستانی فارسینجەوە، ناوی «نخود چاڵە» بەرزایی ئەم لووتکەیە لە ڕووی زریەوە ٣٢٦٧ مەترە... لووتکەی کێوی داڵاخانیش کە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای دێهستانەکەوە بەرزایی ٣٣٣٨ مەترە...

یەکێک لە ڕووبار و شیوەکانی ئەم دێهستانی فارسینجە ناوی «کەنگیر شا»یە. دوور نییە ئەم کەنگیر شایە ناوی یەکێ بووبێ لە بنەماڵەی پادشایانی ماد کە ئەو هەرێمەیان لەژێر دەستا بووە، چون ناوی «کەنگیر» لە زۆر جێی تری ئێرانی کۆنیشا هەیە... تەنانەت «کەنگیر» ناوی شیوێکی زۆر گەورەیە کە لە بەخشی سۆمارەوە بەرەو خوار ئەبێتەوە بۆ مەندەلی و قازانییە لە بەشی کوردستانی عێراق.

دێ گەورەکانی دێهستانی فارسینج ئەمانەی خوارەوەن: فارسینج کە ناوەندی دێهستانەکەیە - چقا باڵاها - چەم چەم - سوڵتان تاهیر - قشڵاق...

لەم دێهستانەدا چەند قوتابخانەیێ هەیە و، چەند قوتابخانەش هەیە کە لە لایەن سوپاهی پانی دانشەوە بەڕێوە ئەبرێن. لە دێیەکانا مزگەوت و حوسێنییەش هەیە. باغ و میوەی زۆریش هەیە... دێیەکانی تری ئەم دێهستانەش خاوەن مێگەل و کشتوکاڵن.

گوێگرە بەڕێزەکان، ئا ئەمەبوو ئەو زانست و زانیارییانەی کە لە سەرچاوە جوغرافییەکانا دەربارەی فارسینج بەدەس هاتن...

ئا ئێستە کە کاتمان تەواوبوو، ئێوە بەخوای یەکتا ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ.

٢٥٣٥/٣/٤

## وتاری: ٢١٢

گـوێگره بەڕێزەکـانی وڵاتەکەت باشـتـر بناسـه ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان شـادبێ. لەم وتارەدا دەربارەی «فاراب» ئەدوێین...

وشەی «فـاراب» بەپێی فەرهەنگ بەو جێیە ئەڵێـن کە سـەر زەوی و خاکـەکەی بەهۆی کـارێز و جۆگـە و چەمـاوەوە ئاو بخوات و، پێـتـەویـستی کـەمـتـر بەئاوی باران بێ... ئەمـە بۆمـان دەرئەخا پیـتـی (فێ)ی فـاراب لە بنەڕەتا پ (پێ) بووە و، شێوەی عـەرەبێتی کـاری کردۆتە وشەکە و لە فارسییا بۆتە «فاراب» و لە بنەڕەتا هەر «پاراو»ی کوردیی و ئێرانیی کۆنە...

موزیک

ناوی فـاراب ناوێکی کـۆنە و لە خـاکی ئێـراندا زۆر جـێگەی «فـاراب» ناو هەیە، لە ئێـرانی پانوپۆڕی کۆنیـشـدا زۆر جێی تری هەبوون بەناوی فـاراب و، زانای بەنـاوبانـگ و نووسـەری مـەزنیـان پێ گەیاندووە، بەڵام لە سەدەکانی دواییـدا، ئەو جێگەیانە کەوتوونە وڵاتانی هاوسێوە.

دوو هەرێمی فـاراب ناو، کـە تا ئەمـڕۆش ئێـران شـانازی بەزانایـانی خـەڵقی ئەوێوە دەکـات، ئەمـڕۆ دەکەونە دەرەوەی ئێـران، بۆ وێنە فـاراب هەرێمێ بووە لەودیوی ڕووباری سەیحون -واتا لە مـا وەراء النهر- لەسەر سنووری تورکسـتـانی کۆن... فەیلەسوفی گەورە ئەبو نەسر فارابی، کـە سـاڵی ڕابردوو لـە دانشگای تاران جەژنی هەزار سـاڵەی بەرپاکـرا، خـەڵقی ئەم شـارە بوو. هەروا ئیـسـمـاعـیلی کـوڕی حـەمـادی جەوهەری دانەری کـتـێبی «صەحاح» کە فەرهەنگێکی گەورەی عـەرەبی فارسییـە، دیسـان خەڵقی ئەم فارابەیە. و دەیان زانای تریش وەکو ئەبو ئیبراهیم ئیـسحاق خاڵی جەوهەری و، ئەبو زەکەریا یەحیا ئەحمەدی فارابی...

ئەم شارە کە «ئەترار»یشی پێ دەوترا لە لایەن تەیموور لەنگەوە وێران کرا و، کەلاوەکانی ئەکەوێتە بەشی خۆرهەڵاتی تورکسـتانی ئەمڕۆ و نۆ فەرسەنگێ لێیەوە دوورە، فـارابێکی تریش هەیە سەر بەهەرێمی گوزگانـان و نزیکی شاری بەڵخە و، شـەش قۆناغ لە بەڵخەوە دوورە و، دوای ئەوەی کە وێران کراوە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ «خەیر ئاوا»...

موزیک

هەر بەناوی فاراب لە دەوروبەری ئەردەبێل دێیەکی گەورە هەیە، سەر بەدێهەستانی کیوی بەخشی سنجابودی شارستانی هەرو ئابادە، خەڵقی ئەم دێیە خاوەن کشتوکاڵ و مێگەل و ئاژەڵی ترە و، کارو کاسبی دانیشتوانی ئەو دێیە فەلاحەت و شوانییە...

هەر بەناوی فاراب چەند جێیەک هەیە سەر بەدێهەستانی عەمارلو بەخشی ڕودباری شارستانی ڕەشت، ئەم دێهەستانە ئەکەوێتە بەشی خۆرهەڵاتی مەنجیل و لای ژووری ڕووباری شاهرود، هەروەک ئەکەوێتە شیو و دۆڵەکانی لای خواری عەمارلو هەرێم و مەنتیقەیەکی چیایی و شاخاوییە، ئەم ناوچەیە ئاووهەوای ساردە و جگە لە دێیەکانی دێهستانی شاهرود کە ئاووهەوایان ناوەنجییە ئەو دوای هەرێمەکە سەردەسێرە. کاروباری خەڵقی هەرێمی فارابی ڕەشت کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە ناوەندی دێهستانەکە دێی «جیرندە»یە و، دێ گەورەکانی بەشی فاراب ئەم ئاواییانەیە: کلیشم - ئەنبوە - پاک دێ - مەنجیل - لوشان... ئەم فارابە ٣٠ ئاوایی تێدایە کە سەر ژمارەی دانیشتوانیان ئەگاتە ١١ یانزە هەزار کەس، قوتابخانەی بەراییان هەیە قوتابخانەی پەیکار لەگەڵ بێ سوادی تێدایە مزگەوت و حوسێنییەیان هەیە.

جگە لەم فارابانەی وترا لە شارستانی ئەراکیشدا دێیەک هەیە ناوی فارابە ئەکەوێتە بەخشی وەفەس Wafas. ئەم دێیە ئەکەوێتە سەر شیوی «شەرا» خەڵقەکەی فەللاح و خەریکی کشتوکاڵن لەم دێیەدا چەوەندەری شەکر و، سێو زەمینی -کە لە هەندێ جێ پێی ئەوترێ پەتاتە- و توتن و شتی تر ئەکیلرێ.

ئەمە بوو هەندێ جێی فاراب، کە بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە ناویان بەرچاو کەوتبوو و، بۆ ڕوونکردنەوەی جوغرافیی جێگەکان بەپێویست زانران بنووسرێن.

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاییندە بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٣/١٠

گوێگره خۆشەویست و بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

لەم وتارەدا باسی «فەسا» دەکەین کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی فارس و ناویشە بۆ شارۆلکەیەک و هەم بۆ چەند تیپێک. شارستانی فەسا لە رووی نەخشەی جوغرافیاییەوە بەم جۆرەیە: لای ژووروو، باکورییەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئابادە و بەشێ لە شارستانی سیرجان و، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی شیرازی کە ناوەندی ئوستانی فارسە. لای خوارو و باشوورییەوە هاوسنوورە لەگەڵ جهرم و لار... لای خۆرهەڵاتییەوە هەمیسان هاوسنوورە لەگەڵ سیرجان...

لە رووی هەڵکەوتی جوغرافیاییەوە ئەکەوێتە سەر پلەی درێژایی٥٣ دەرەجە و ٤١ دەقیقە... هەروەک ئەکەوێتە سەر پلەی پانایی ٢٨ دەرەجە و ٥٨ دەقیقە. نزیکترین شار لەم شارستانەی فەساوە شارستانی (جهرم)ە، کە ٧٣ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە... و لە فەساشەوە بۆ شیراز ١٦٦ کیلۆمەترە و لە فەساشەوە تا تاران ١٠٨٥ کلیۆمەترە.

شاری فەسا لە رووی مێژووییەوە شارێکی کۆنە، لە سەردەمی ساسانیدا هەبووە، بێ گومان ناوی فەسا لە بنەڕەتا «پەسا» بووە، عەرەب لەبەرئەوەی «پێ»یان نەبووە (فێ)یان لە جێی داناوە. ئەم شارستانی فەسایە دوو جۆرە ئاووهەوای هەیە: لای ژووری و باکوری بەرەو خۆرئاوایی، هەوای فێنکە و، چیاکانی سەردەسێرە هۆی ئەوەش زریاچەی بەختەگان و، ریزە کێوە بەرزەکانە، ئەمانە بوونەتە سەبارەتی ئەوەی فێنک بێ. لای خوارووی فەسا و بەشی خۆرهەڵاتیشی زۆر گەرمە و، هەرێمەکەی گەرمەسێر ئەدرێتە قەڵەم، تەنانەت دەشت و بیابانی ئیزە دخواست.

دانیشتوانی شارستانەکە ئەگەنە ١٤٦ هەزار کەسێ و، لە ٣٠٢ ئاوایی و، دێ و، شارۆلکەدا دائەنیشن. عێلە بەناوبانگەکانی ئەم هەرێمە ئەمانەن: عێلی باسری – عێلی عەرەب – عێلی بەهارلو – عێلی ئینانلو – عێلی دیندارلو – عێلی شا هسەوەن – عێلی قەرائی – عێلی چهار راهی...

بەپێی رەهنومای شەهرستانها، دانیشتوانی شاری فەسا ئەگەنە ٧٨ هەزار کەسێ... بەڵام ئەم ژمارەیە جێی باوەڕ نییە، لەوەبەر ژمارەی دانیشتوانی شارەکە بەپێی ئەو

زانیارییەی کە لە جوغرافیای ڕەزم ئارادا نووسراوە، لە ٩ هەزار کەس کەمتر بووە...

دەسکەوتی ئەم شارستانە دەغڵ و دانەوێڵە و، خورما و پەمۆ و، میوەی موتوربەکراو – کە عەرەب پێی دەڵێن مورەکەببات- وەک پورتەقاڵ - لیمۆ - کەبات - نارنج - تورنج - هەروا برنج و، شیرەمەنی – و خوری و پێستە...

کاروباری خەڵقی وڵاتەکە ئاژەڵ بەخێوکردن و، کشتوکاڵ و کرد و تەون و جۆلایی و هەللاجییە، لەو ناوە فەرش و قاڵیی باش ئەچنرێ، بەرە و جاجمی باش ئەتەنیرێ.

موزیک

لە شارستانی فەسادا نیشانەی شارێکی کۆن هەیە، خەڵقی پێی دەڵێن «تەل ضەحاک» و لە شاری فەساوە دوو کیلۆمەتر دوورە هەروا لە «دەرتەنگ»یش شوێنەواری باستانی هەیە.

لە شارستانی فەسادا چەند قوتابخانەی بەرایی و، چەند قوتابخانەی ناوەنجی و، چەند قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری -کە پێی ئەوترێ موبارەزە با بێ سەوادی- و چەند مزگەوت و حوسێنییە هەیە. نەخۆشخانەی تێدایە و، دەرمانگا و، داروخانەی زۆرە و دەزگایەکی کاروباری خێریی تێدایە. ئاوی شار هی لوولەیە... کارەبا و بەرقی تێدایە، سینەمای هەیە لەگەڵ چەند ڕستوران و لوقە و خۆراکخانە و، قاوەخانە و کەبابخانەش زۆرە.

لە شاری فەسادا چەند کارخانە دامەزراوە، کارخانەی چنین کارخانەی ئامادەکردنی کەوش و کەلوپەل... کارخانەی نەجاری... کارخانەی چاپەمەنی و، کارخانەی جۆشکاری و کارخانەی گەج و خشتی سوورەوەکراو.

موزیک

کێوە هەرە بەرزەکانی فەسا ئەمانەن:

– کێوی خەرمان کێر، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای فەساوە و درێژە ئەکێشی تا زریاچەی بەختەگان و بەرزترین لووتکەی ئەم چیایە ئەگاتە ٣٢٠٢ مەتر.

– کێوی تودەج کە لای ژووری شاری فەساوە دەس پێ ئەکا تا لای خواری ئیستەهبانات درێژە ئەکێشی و بەرزترین لووتکەی ئەم ڕیزە ئەگاتە ٣١٥٠ مەتر.

ڕووبارەکانی شاری فەسا ئەمانەن:

- ڕووباری عەکس ڕۆستەم کە سەرچاوەکەی ئەچێتەوە سەر فەسارود و بەشێ لە دێهاتەکان ئاوێژە دەکات.

- ڕود بەشار، لای خواری دی (ایگ)ەوە هەڵئەسێ و پاش ئەوەی ئەگتە نزیکی دێی داراب پێی ئەوتری (ڕووباری باڵ) و لەو ناوەدا کشتوکاڵی پێ ئاو ئەدرێ.

لە زۆر دەمێکەوە شاری فەسا بەوە ناسراوە کە زانا و مەلا و شێخی تیا هەڵکەوتووە، شێخ شەطاحی ڕۆژبهانی عاشق کە ئەمڕۆ ئارامگای لە شیرازە و، لە پایەی سەعدی و حافیزا ئەدرێتە قەڵەم خەڵقی شاری فەسایە.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٤/٥

گوێگرە بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادی و خۆشی بێ، نووسەری ئەم بەرنامەیە و بەڕێوەرانی بەرنامە کوردییەکان کامەرانی و سەربەرزی ئێوەیان دەوێ و، هیوایان ئەوەیە بەرنامەکان دڵتان ڕازی بکات.

موزیک

ئێمە لەم وتارەدا باسی فەیروز ئاباد دەکەین، لە خاکی ئێرانا زۆر جێ و دێ و شاری «فەیروز ئاوا» ناو هەیە، بەڵام ئێمە لەم وتارەدا باسی فەیروز ئاوای لای شیراز دەکەین، چون زایەگان زانای گرانبەها محەمەد فەیروز ئابادی خاوەنی «ئەلقاموس الموحیط – القاموس المحیط» بووە... فەیروز ئاباد شارێکی کۆنە، ئەگەڕێتەوە بۆ دەورانی هەخامەنشی و ئەشکانی، لەوەبەر ناوی گۆڕ بووە، چون جێگەکەی قووڵ بووە... «ئیصطەخری» دەڵێ شوێنی شاری فەیروز ئاوا، لە بنەڕەتا گۆمێکی گەورە، واتا زەریاچەیەک بووە، ئاوێکی گەنکاوی هەبووە ئەسکەندەری مەکدۆنی بڕیاری داوە ئەو ناوە لەبەر خۆشیی هەوای بیکا بەهاوینەهەوار... بەڵام زریاچەکەی بۆ وشک نەکراوەتەوە و هەروا ماوەتەوە تا سەردەمی ئەردەشێری بابەکان... ئەم پادشایە ئەندازیاران و پیاوە ژیرەکانی کۆکردووەتەوە، داوای تەدبیری لێ کردوون بۆ ڕزگاربوون لە دەست ئەو ئاوە گەنگاوە، چون هەموو دەوروبەری بەرزایی و کێو بووە، ڕێی کەلەبەری نەبووە... بڕیاردراوە یەکێک لە کێوەکانی کون بکرێ و ڕێی ئاوەکە بکرێتەوە و، سەرئەنجام چیاکە کون کراوە و زەوییەکە وشک بۆتەوە و کراوەتە شار... ئەم ئەفسانە دووردرێژە، کە ئێمە کورتەیمان هێنا، دەربارەی فەیروز ئاوادا ڕێک خراوە و، لە سەردەمی ئەردەشێردا ئەم هەرێمە ناونرابوو «ئەردەشێر خورە = واتا کورەی ئەردەشێر» بەڵام خەڵقی وڵات بەشارەکەیان دەوت گۆڕ، چون جێگەکەی قووڵ بوو، ئەم ناوە هەروا مایەوە تا سەدەی چوارەمی کۆچی، لەو سەردەمەدا لە ناوەندی شارەکەدا سەکۆیێ بەرز هەبوو... ساختمانێکی زۆر جوانی لەسەر دروست کرابوو، پێی ئەوترا تەربال -واتا هەیوان- و دەوروبەری شارەکە شوورە و قەڵا بوو، چوار دەرگای هەبوو... دەرگای هورمز ئەکەوتە لای ژوور و، دەروازەی ئەردەشێر ئەکەوتە لای خوار و، دەروازەی میهر ئەکەوتە لای خۆرهەڵات و دەروازەی بەهرام ئەکەوتە لای خۆرئاوا... و شارەکەم بەربڵاو و فراوان بوو و، لە ئیصطەخر گەورەتر بوو، مەیدانێکی زۆر گەورەی هەبوو کە پڕ لە گوڵ و گوڵزار بوو، گوڵی سووری فەیروز ئاوا بەناوبانگ بوو، دەرەوەی شارەکە لای هەر

دەرگایەکە تا یەک ساتە ڕێ باغ و خانووبەرە بوو. ناوی شارەکە لە یەکێک لە کێوە هەرە بەرزەکانەوە بە«کونج» هێنرابووە ناو شار و، سەری کونجەکە لوولەیەکی مسین بوو، کە ناوەکەی زۆر بەتوندی لێ دەرئەهات. عەضود الدەولەی دەیلەمی هەموو حەفتەیێ ئەچوو بۆ ئەم شارە، بەڵام کە بیستی خەڵق ئەیانوت: (عەضود الدەولە چوو بۆ گۆڕ) لەبەرئەوە زۆری لا ناخۆش بوو فەرمانی دا ناوی شارەکەیان گۆڕی بەفەیروز ئاباد بەڵام خەڵق هەموو هەر بەگۆڕیان ناو ئەبرد و پاش سەردەمێکی دوورودرێژ ئنجا ناوەکەیان لەبیر چووەوە.

موزیک

لەم سەردەمەدا فەیروز ئاباد یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی فارس و سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی جەهرم و، شارستانی لار و، لای ژوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی شیراز و، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی کازرون و شارستانی بوشەهر...

ئاووهەوای شارستانی فەیروز ئاوا دوو جۆرە: دێهەستانەکانی خواجە و، مەیمەند و، دەوروبەری فەیروز ئاوا - خۆی - ناوەنجییە نە گەرمە، نە فێنک، بەڵام بەشی لای خواری شارستانەکە، تەنانەت دێهستانەکانی: قیر - گازرین - لەسەر گەرمەسێر دەژمێررێن.

شارستانی فەیروز ئاباد سێ بەخشی هەیە: یەکەم دەوروبەری کە بەفارسی پێ دەوترێ «حەومە»... دووەم قیر و کازرین... سێیەم فەراش بەند...

شاری فەیروز ئاوا لە ڕووی جوغرافییەوە ئەکەوێتە سەر درێژایی پلەی ٥٢ و دەقیقە ٢٦... هەروا ئەکەوێتە سەر پانایی ٢٨ پلە و ٥٢ دەقیقە و، هەرێمەکە چیاییە و، پێ دەشتی زۆر کەمە... و شوێنی شارەکە گەرچی لە چاو دەوروبەریدا چاڵە، بەڵام لە ڕووی زریەوە ١٥٧٠ مەتر بەرزترە.

نزیکترین شار لە فەیروز ئابادەوە خودشاری شیرازە کە ناوەندی ئوستانی فارسە و ١١٦ کیلۆمەتر لە یەکەوە دوورن، بەڵام لە فەیروز ئاواوە تا تارانی پایتەخت ١٠٥٣ کیلۆمەترە.

شاری فەیروز ئاوا یەکێک لەو شارانەیە کە نزیکەی چوارسەد ساڵی بەڵکو پتر، لەژێردەستی فەرمانڕەوایی شوانکارەدا بوو.

لە وتاری ئایندەدا، باسی ئەو دەسەڵاتانە دەکەین کە لەم هەرێمەدا بەدەسەڵات بوون... هەروا ناوی ئەو زانایانە دەبەین کە خەڵقی ئەم شارستانەن ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین... ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن.

٢٥٣٥/٣/٢٤

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی بێ. هیوامان وایە سەرفراز و کامەران و خۆشبەخت بن... لە وتاری پێشوودا چەند گۆشەیەکمان لە جوغرافیای مێژوویی فەیروز ئاباد ڕوون کردەوە و، هەروەک بەڵێنمان دانی لەم وتارەدا هەندێ تر لەو زانستانەتان بۆ ڕوون ئەکەینەوە کە لە سەرچاوە مێژوویی و جوغرافیاییەکانا بەر چاومان کەوتووە. و جارێ با گوێ بدەینە پارچە مۆسیقایێ.

موزیک

لە وتاری پێشوودا وتمان «فەیروز ئاباد» کە ناوەندی شارستانی فەیروز ئابادە، یەکێکە لە شارۆلکە هەرە کۆنەکانی ئێران زەمین و، لە سەرەتادا ناوی «گوڕ» بووە، عەرەب کە پیتی «گاف»یان نییە، گۆڕیویانە بە «جیم» و ناویان ناوە «جوڕ» و ئەو چەشنە گوڵەباغەی تا ئەمڕۆ پێی ئەوترێ «جوری»، لە سەرەتادا لەم شارەوە بڵاوبووەتەوە، کە عەرەب پێی دەڵێن «وەرد الجوری» واتە گوڵی جوری.

بەڵام هەروەک لە وتاری پێشوودا وتمان ناوی «گوڕ» لە سەردەمی ئەردەشێری پایەکانەوە، کە پێی ئەوترا «خورەی ئەدەشێر» تا سەدەی چوارەمی کۆچی هەر «گوڕ» بوو.

لەم دەورەدا عەضود الدەولە ئال بویە کە لە نوقلانەی خەڵق دڵگیر ئەبوو کاتێک دەیانوت: سوڵتان چوو بۆ گۆڕ ناوی شارەکەی گۆڕی بە «فەیروز ئاباد».

شارستانی فەیروز ئاباد سێ بەخشی هەیە: یەکەم بەخشی ناوەندییە کە خودی شاری فەیروز ئاباد ناوەندێتی، واتا شاری فەیروز ئاوا هەم ناوەندی دێهستانی فەیروز ئابادە و، هەم ناوەندی بەخشی فەیروز ئابادە و، هەم ناوەندی شارستانەکەیە، لەم شارەدا هەم فەرماندار هەیە و هەم بەخشدار، سەرژمێری دانیشتوانی شارەکە ئەگاتە یانزە هەزار کەسێ... دوو بەخشەکەی تری «قر کازرین» و فەراش بەندە بەخشی مەرکەزی حەوت دێهستانی هەیە کە ئەمانەن: دێهستانی فەیروز ئاباد - ئەربەعەی پایین - ئەربەعەی باڵا - دەزگاە - فەراش بەند - خواجە - مەیەند... ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارستانە بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ -واتا ساڵی ٢٥٢٥ شاهەنشاهی- لە ٦٧ هەزار پتر بووە.

موزیک

شوێنەواری دێرینە و کۆن لەم شارستانەدا ئەمانەیە: ئاتەشکەدەی ئەعظەم - کەلاوەکانی

شاری گۆڕ - منارەی مزگەوتێکی کۆن لە ناوەندی شارەکەدا - کەلاوەی ساختمانێکی ساسانی - پردێکی دەوری ساسانی - کاروانسەرایەکی کۆن لە دەرەوەی شارەکەدا بەندەر و بنەوانەی تاهیرە - وێرانەی ئاتەشکەدەی ساسانی - قەلعە ڕوختەر - و زۆر جێی تری کۆن.

لە فەیروز ئاوا و دەوروبەریدا چەند قوتابخانەی بەرایی... چەند قوتابخانەی ناوەنجی هەیە... هەروا چەند قوتابخانە هەیە بۆ لابردنی نەخوێندەواری و بەرەنگاری لەگەڵ بێ سەوادی، کە لە لایەن سپای زانستییەوە بەڕێوەئەبرێن... و نەخۆشخانە و دەرمانگا وداروخانەی تێدایە تەلگراف و تەلیفون و ئاووکارەبا (بەرق)ی تێدایە،... چەندین مزگەوت و تەکیە و حوسێنییەی تێدایە، سێ گەرماوی هەیە و، چەندین هوتێل و مێوانخانەی هەیە.

هەرێمی فەیروز ئاباد هەرێمێکی کشتوکاڵییە، جیهانگەرد و توریشیش بۆ تەماشای شوێنەواری کۆن دیدەنیی لێ ئەکەن. لەم شارە و دەوروبەرەدا فەرش دروست ئەکرێ، ئەوانەی فەرش ئەتەنن، گڵێم و بەڕەش دروست ئەکەن. هەروا لەوێ کاروباری «گۆزەگەری» و کلاش چنی و هەلاجی و شتی تریش هەیە...

کورەی خشتی سوورەوەکراو و، گەچ و ئاهەکیش هەیە، گەراجی تەعمیرگای ئۆتۆمۆبێل و ماشێن و، لوولەکەشی - و جۆشکاری تێدایە.

دەسکەوتی خەڵق خەلە و دانەوێڵە و میوە و شتی ترە.

دانیشتوانی هەرێمەکە بەختیاری و قەشقایین.

دەوروبەری فەیروز ئاباد بەکێوی بەرز تەنراوە... بەرزترین لووتکەی چیای سفیدار ٣١٧٠ مەترە لە ڕووی زریەوە، ئەم چیایە بەجەنگەڵی دار بەڕو و دارەبەن و بادام پۆشراوە.

بەرزترین لووتکەی چیای پەریز ئەگاتە ٢٧٨٠ مەتر لە ڕووی دەریاوە ڕووبارەکانی فەیروز ئاوا بریتیین لە: ڕووباری قەرەج ئاغاج کە سەرچاوەکەی لە شارستانی شیرازەوە دێ، هەندێ زەویوزاری «جەهرم» ئاو ئەدا ئنجا بەخشی قیر و کازرین... ڕووباری فەیروز ئاوا کە بە«حەنیفەکان»یش ناو ئەبرێ لە چیای سفیدارەوە سەرچاوەکانی دێتە خوارەوە...

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان خەریکە بەسەرئەچێ تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین، کامەران بژین.

٢٥٣٥/٣/٣١

گوێگره بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ، سەربەرزی و خۆشبەختی ئێوە ئاواتی نووسەر و بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە. ئێمە لەم وتارەدا بلمی (فریدن)دەکەین، کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی ئەسفەهان و، بەفەریدنی داران بەناوبانگە...

جارێ با گوێ بدەینە پارچەیێ موزیک

موزیک

فەریدن، هەروەک شارستانێکە هەروا دێهستانێکیشە کە ئەم فەریدنە ناوەندێتی و، لە هەمان کاتا ناوەندی شارستانەکەیە.

چوار لای دێهستانەکە بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکوری دێهستانەکانی خونسار و گوڵ پایەگان، لای خۆرهەڵاتی کرۆن و دیهەک و، لای خوار و باشووری چوار محاڵی بەختیاری و، لای خۆرئاوای بەربرود و، جاپلق و، بەختیارییە، دێهستانەکە ١٧٣ دێی هەیە، ناوەندی ئەم دێهستانە دێی «داران»ە هەر لەبەرئەوەیە کە بەشارستانی فەریدن ئەڵێن شارستانی فەریدنی داران.

ئنجا با بکەوینە سەر باسی شارستانی فەریدن ئەم شارستانە ئەکەوێتە درێژایی جوغرافییەوە بەپلەی ٥٠ و دەقیقە ٢٤... و پانایی جوغرافی ٣٢ پلە و ٥٨ دەقیقە. لە فەریدنەوە بۆ ئەسفەهان ١٦٤ کیلۆمەترە. نزیکترین شار لە فەریدنەوە، شاری گوڵ پایەگان کە ٧٢ کیلۆمەتر لەیەکەوە دوورن. بەڵام فەریدن لە تارانەوە ٤٢٤ کیلۆمەتر دوورە.

چوار لای شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی گوڵ پایەگان و، لای باکوری بەرەو خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی ئەلیگودەرز و، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ نەجەف ئاباد و، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سەردەشتی سەر بەشارستانی ئیزە و، لای خوار و باشووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارکرد...

ئەم شارستانی فەریدنە کەوتۆتە پێدەشتێکی ڕاستان و، زەویوزاری زۆر بەبرشت و پر پیت و بەرەکەتی هەیە. بەرزایی سەر زەوی ئەم شارستانە لە ڕووی زریەوە ٢١٣٠ مەترە و، چیاکانی دالانکۆ - کوەباغ باڵا - هەرمودەر - گەمارۆیان داوە... بەشێ لەم چیایانە

جەنگەڵدار و بەدرەخت و دەوەن پۆشراوە. زەویوزاری پێ دەشتەکە بەناوی داران پار ئاو ئەبێ. فەریدن سێ بەخشی هەیە: یەکەم دەوروبەری کە بەفارسی پێی ئەوترێ خەومیە، ئە دووەم فرەیدون شەهر کە لە بنەڕەتا پێی ئەوترا «ئاخورە». سێیەم: چادگان. ئەم شارستانە ٢٦٢ دێی هەیە. ژمارەی دانیشتوانی شارستانی فەریدن بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٣٣٢ خورشیدی (واتا ٢٥١٢ شاهەنشاهی) کە لە جوغرافیای ڕەزم ئارا و فەرهەنگی دیهخودادا نووسراوە ١٣٩ هەزار کەس بووە... بەڵام بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ خورشیدی واتا ٢٥٢٥ی شاهەنشاهی بە ١٣٥ هەزار و شتێ دانراوە... دەبێ هەندێ لە دێهاتەکانی پاش ئەوە بەسترابێ بەیەکێکی تری لە شارستانەکانەوە...

موزیک

بەپێی لێکۆڵینەوەی جیولۆجی -واتا پشکنینی ژێر زەوی- لەم هەرێمەدا نەوت و، بەردی خەڵووز هەیە، گەرچی تا ئێستە بەهرەیان وەرنەگیراوە... کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن، کاری هەمیشەیی خەڵقی ئەو ناوەیە، هەروەک لەو ناوەدا تەون و جۆلایش هەیە، ژنانی هەرێمەکە قاڵی ئەچنن و، بەرە ئەتەنن و، جۆلاکانیش جاجم و بەرماڵ دروست ئەکەن. ئەم شارستانە دەسکەوتی دەغڵ و دانەوێڵە و توتن و شیرەمەنی، وەک ڕۆن و پەنیر و ماست و کەرە و شیر. هەروا خوری و پێستەیە.

لەم شارستانەدا قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی ناوەندی قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری -کە پێی دەوترێ موبارەزەی با بێ سەوادی- هەیە و نەخۆشخانەی تێدایە و دەرمانگا و داروخانەی هەیە، مزگەوت و حوسێنییەی تێدایە، گەرماو و، مێوانخانەی هەیە. ئاوی لوولەیە... بەرق و کارەبای تیایە... لەم شارستانەدا چەند کارخانە و کارگەی تیایە... ئەمەبوو، ئەو زانیاریانەی دەربارەی شاری فەریدن بەدەستمان هێنا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە دانیشتوانی ئەم هەرێمە بەختیارین، لەهجەیان لورییە، فارسیش ئەزانن.

موزیک

جگە لەم فەریدنە چەند جێگەیەکی تریش بەناوی فەریدن هەیە، بۆ وێنە فەریدن دێیەکی بچووکە لە دێهستانی نائین سەر بەبەخشی ناوخۆی نائین و، ئەکەوێتە لای خۆرئاوای بەخشەکەوە بەدووری ٢٤ کیلۆمەتر...

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان تەواوبوو تا وتارێکی تر بەخواتان ئەسپێرین، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٤/٩

**وتاری: ٢١٧**

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کەیفوخۆشی بێت... هیوای ئێمە پێشکەوت و سەرکەوت و سەربەرزیی ئێوەیە و، بەباشی ئەزانم کە پێتان ڕاگەیێنم لەم وتارەدا باسی «فەلاوەرجان» دەکەین... کە هەم گوندێکە ناوەندی بەخشێکە بەم ناوە و، هەم بەخشێکە سەر بەشارستانی ئەسفەهان، ناوەندی ئوستانی ئەسفەهان...

موزیک

وتمان فەلاوەرجان ناوی بەخشێکە سەر بەشارستانی ئەسفەهان... جا سنووری چوار لای ئەم بەخشە بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشەکانی سەدە و نەجەف ئاباد... و لای خوار و باشووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی شا ڕەزا و، شارستانی شهر کورد و، لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی «کرارەج Ker-arej» و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی لار.

ناوەندی ئەم بەخشە دێی فەلاوەرجانە کە دەکەوێتە لای خۆرئاوای بەرەو خواری ئەسفەهانەوە و، ١٥ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە و، بەسەر کەناری ڕووباری زایەندەڕودەوەیە.

جێی ئەم بەخش و دێیە ئەکەوێتە سەر درێژایی جوغرافیایی ٥١ دەرەجە و ٣٧ دەقیقە و، ٣٠ سانیە بەلای نیصف النهاری (نیوەڕۆی) گرینویجدا... هەروەک ئەکەوێتە پانایی جوغرافی ٣٢ دەرەجە و ٣٣ دەقیقە...

ئەم بەخشە ٤ دێهستانی هەیە: یەکەم «ئای دوغمیش» کە ٤٥ ئاوایی بەدەوردایە ژمارەی دانیشتوانیان ئەگاتە ٢٥ هەزار کەسێ. دووەم دێهستانی ناشیان کە ٣٣ دێی بەدەورایە و، ژمارەی دانیشتوانیان ئەگاتە ٤٨ هەزار کەسێ... سێیەم دێهستانی (گارکەن)ە، کە ٥٣ دێی بەدەورایە و، ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە ١٨ هەزار کەس، چوارەم دێهستانی ئوشتورجانە کە ٦٥ دێی هەیە و، ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە ٥٧ هەزار کەسێ. بەم پێیەی وترا دانیشتوانی بەشی فەلاوەرجان لە ١٥٠ هەزار کەس بەرەو ژوورترە.

موزیک

فەلاوەرجان ئەکەوێتە پێ دەشتێکی سەوزەلاغی بژوێنی پڕ پیت و بەرەکەت و، پڕ لە جەنگەڵ و باغ و درەخت.

ئاووهەوای فەلاوەرجان، ناوەنجییە، نە زۆر گەرم و نە زۆر سارده، بەوهۆیەوە کە بەکەناری ڕووباری زایەندە ڕوده و باغ و جەنگەڵ و قامیشەڵانی زۆره، فێنکه.

خاکی فەلاوەرجان کانگای سورب (واتا قورقوشم) و مز و قەڵاییه. گەچ و خوێی بەردیشی هەیە ئاوی فەلاوەرجان، هی ڕووباری زایەندە ڕوده و، لە هەندێ دێ و ئاواییدا کاریز و بیر هەیه.

لە فەلاوەرجاندا چەند قوتابخانە، مزگەوت و حوسێنییە هەیە. نزیکەی سەد دوکان و مەغازەی تێدایە، گەرماو و گەراجی تێدایە... دەرمانگا، داروخانە نەخۆشخانەی تێدایە.

خەڵقی فەلاوەرجان کیشاوەرز و فەلاحن، کار و کاسبییان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنه.

لەم بەخشەدا سێ ڕیزە چیا هەیە، یەکەم ڕیزە چیای شاهکوه و لاشتر... دووەم ڕیزە چیای ناوەندی کە بەرزترین لوتکەکانی بریتییە لە کێوی موسا، کێوی فیروزان - کێوی سورخ - کێوی جوزان... سێیەم ڕیزە چیای لای خوارە، کە لوتکەکانی بریتین لە کێوی کولاه سپا و کێوی ڕوخ و کێوی لا تاریک.

لە بەخشی فەلاوەرجاندا بەسەر ئاوی ڕووباری زایەندە ڕودەوە (٤) چوار پرد دروستکراوە: پردی زەمان خاک - پردی بیستەگان -پردی بابا مەحموود- پردی فەلاوەرجان. دێی فەلاوەرجان کە ناوەندی بەخشەکەیە، ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە پێنج هەزار کەس، هەموویان موسوڵمانن، لەسەر ڕچی جەعفەرین... واتا سەر بەدوازده ئیمامن. زبانیان فارسییە، لەم دێیەدا چەند قاوەخانە و چاخانە و، کەبابخانە و، مێوانخانەش هەیە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتی بەرنامەمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین.

٢٥٣٥/٤/١٤

**وتاری: ٢١٨**

گوێگرە بەڕێزەکانی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و خۆشی بەسەربەرن، هیوای نووسەری ئەم بەرنامەیە و بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکان لە ڕادیۆی ئێراندا ئەوەیە کە ئێوەی بەڕێز لەوپەڕی سەرکەوتوویی و پێشکەوتوویيدا بن و، بەهەڵیشی دەزانین کە پێتان ڕابگەیێنین لەم بەرنامەیەدا باسی «فەهلی»یان دەکەین، بەڵام با لەپێشدا پێکەوە گوێ بدەینە ئاهەنگێکی شاد.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان

فەهلیان، ناوە بۆ چەند جێگەیەک لە ئوستانی فارسدا، ناوە بۆ دێهستانێ و، بۆ شارۆلکەیەک کە ناوەندی بەخشی فەهلیان بووە و، ناوە بۆ بەخشێکیش کە لە سەرەتادا سەر بەشارستانی کازرون بووە، بەڵام لەم دواییەدا هەرێمەکە کراوە بەشارستان و ناونراوە «مەمەسنی» و دێهستانی فەهلیان بووەتە بەخشی ناوخۆ و دەوروبەری کە بەفارسی پێی ئەوترێ حەومە، جا فەهلیان شارۆلکەیەکە و ناوەندی شارستانی مەمەسنییە و ئەمڕۆکە ناوی گۆڕاوە پێی ئەوترێ «نۆر ئاباد». ئەم شارستانە تەنیا دوو بەخشی هەیە یەکەم حەومە، ماهورمیلانی (میلاطون)...

ناوی فەهلیان، وەکو گومان دەکرێ لە ناوی «فەیلیان»ەوە هاتووە، وا دیارە خەڵقی ئەم دێیانەی ناویان فەهلیانە لە بنەڕەتا لە لوڕە فەیلییەکانی پشتکۆن و، لەوێوە هاتوونە ئەم ناوە... زانایان بڕوایان وایە کە وشەی فەهلیان لە بەهلەوییەوە هاتووە سنووری چواردەوری فەهلیان مەمەسنی بەم جۆرەیە، لای ژوورروو خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ئەردەکانی سەر بەشیراز و، شارستانی کازرون و، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی بەهبەهانی سەر بەئوستانی خۆزستان، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی خشت سەر بەشارستانی کازرون...

ئەم شارستانە لە ڕووی جوغرافییەوە بەم جۆرە هەڵکەوتووە ئەکەوێت ٥١ دەرەجە و پلە درێژایی و ٣٧ دەقیقە... و لای پانایییەوە ئەکەوێتە پلەی ٣٠ دەرەجە و ١٧ دەقیقە و، لە ڕووی زریاوە نزیکەی ٨٦٠ مەتر بەرزە... ئاووهەوای هەرێمەکە گەرمە، بەڵام پێ دەشتەکانی نزیکی کوە کیلویە فێنکە.

ڕووبارەکانی ئەم هەرێمە: فەهلیان - شیر - شیرین - تنگ شیب و کەنییە. زەویوزاری هەرێمەکە لەم ڕووبارە و شیو و چەمانە و ئاوی بۆ هەڵئەسێ.

دیهاتی ئەم هەرێمە بەرلەوەی ببێ بەشارستان، ٢٤٠ دێ بوو و، لە پێنج دیهستانِ پێکهاتبوو، کە ئەمانە بوون: فەهلیان - ڕۆستەم - جاوید - بەکەش - دوشمەن زیاری.

ژمارەی دانیشتوانی ئەم هەرێمە بەپێی سەرژمێریساڵی ١٣٣٥ شەمسی (٢٥١٥ شاهەنشاهی) نزیکەی ٤٢ هەزار کەس بووە بەڵام لە ١٣٤٥دا گەییوەتە ٧٠ هەزار کەسێ.

کاروباری خەڵقی ئەم وڵاتە کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە. کێوەکانی ئەم ناوە بەجەنگەڵی بەڕو و مازوو پۆشراون. جگە لەوە میوەی کێوی وەک هەنجیرە کێویلە، هەرمێ و، ترێ و گوێز و بادامی هەیە.

بەرهەمی کشتوکاڵی ئەوێ دەغڵ و دانەوێڵە و، پەمۆ و تریاک و شتی ترە. کاری خەڵقی ئەو ناوە تەنانەت ژنان بریتییە لە کرد و تەون و چنینِ وەک قاڵی، بەڕە، جاجم و شتی تر.

ئاوی خواردنەوەش بۆتە بۆڕی و لوولە و، کارەبا و بەرقیشی بۆ چووە. لەوێ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری و موبارەزەی بێ سەوادی هەیە کە لە لایەن سەربازەکانی سپای دانیشەوە بەڕێوە دەبرێن.

تەلگراف و تەلیفۆنی بێ تەل کە پێی ئەوترێ بێ سیم لەوێ دامەزراوە و، ڕێ خۆش کراوە بۆ ئەوەی بکەوێتە پێش ڕەوتکردن.

زۆربەی دانیشتوانی هەرێمەکە لە عێلی مەمەسنین، کە نیشتەجێ بوون و لەگەڵ کشتوکاڵ خەریکن لەهجەی خەڵکی ئەو ناوە لوڕیی فەیلییە و، فارسیش ئەزانن ڕچی ئاینیشیان شیعەیێتییە.

مزگەوت و حوسێنییەشیان هەیە و، چەند دوکان و مەغازە و مێوانخانەش لەوێ دروست کراوە.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٤/٢٢

**وتاری: ٢١٩**

گوێگره خۆشه‌ویسته‌کانی به‌رنامه‌ی وڵاته‌کەت باشتر بناسه ئەم کاته و هەموو کاتێکتان بەسەربەرزی و شادی و بەختیاری بەسەربەرن، لەم وتارەدا دەربارەی «فومەن» ئەدوێین، هیوامان وایه بەدڵتان بێ.

موزیک

فومەن، یەکێکه له شارستانەکانی سەر بەئوستانی گەیلان، دوو بەخشی هەیه: یەکەم ناوەخۆ و دەوروبەری که بەفارسی پێی ئەوترێ «حەومە»... دووەم بەخشی شفت.

سنووری چوار لای ئەم شارستانه فومەنه بەم جۆرەیه: لای ژوور و باکورەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی سەومیعەسەرا، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنووره لەگەڵ شارستانی ڕەشت، لای خوار و و باشووری خۆرئاواییەوە ئەگاته کلکەی چیای ئەلبورز که له یاسای جوغرافیانووساندا پێی ئەوترێ «خەط الرەاس» و، ئەم کلکەی چیای ئەلبورزه سنوورێکی سروشتی و گردکارییه له نێوانی شارستانی فومەن و طارمدا که سەر بەزەنجانه...

فومەن ئەکەوێته پێ دەشتێکی ڕاستان، که تەنیا ٥٤ مەتر، له ڕووی زریه (دەریا) بەرزتره و، له ڕووی نەخشەی جوغرافییەوە ئەکەوێته سەر درێژایی ٤٩ پله و ٢ دەقیقه و، پانایی ٢٧ پله و ١٢ دەقیقه. ناووهەوای فومەن، وەک شارەکانی تری ئوستانی گەیلان لەبەر نزیکی زریەی خەزەر (دەریاچه خەزەر) نمناک و گەرما و سەرمای ناوەنجییه و، سەراسەری سەر زەوییەکەی سەوز ئەچێتەوە وەک ئەطلەسی سەوز...

فومەن، له سەدەی هەشتەمی کۆچییا، واتا بەر له شەش سەد ساڵ یەکێ بووه له شاره بەناوبانگەکانی لای خۆرئاوای سفید ڕود و گەورەترین شاری وڵاتی دەیلەم بووه و، چون له کەناری زریای خەزەرەوە دوور بووه، وەک هاوینەهەواری ئەو هەرێمه ئەدرایه قەڵەم...

فومەن یەکێکه لەو هەرێمانەی بەکشتوکاڵەوە خەریکن، دەسکەوتی ئەوێ له پلەی یەکەمدا برنجه، ئنجا میوه و دەغڵ و دانەوێڵەی تر. و توتن و تریاکیش، هەروا چاییش زۆر ئەچێنرێ.

ئەم شارستانی فومەنه چەند ڕووبار و شیوی هەیه، که بۆ ئاودانی زەویوزار سوودی لێ وەردەگیرێ... وەک ماسوله - گاز ڕودخان گشت ڕووبار - قەلعەڕودخان- شاخرز - شفت - پسیخان و سەنگ و هی تری... ئەم ڕووبار و جۆگه و شیوانه لای خۆرئاواوه بەرەو لای

خۆرهەڵات ئەکشێن و ڕێ ئەکەن و سەرئەنجام ئەڕژێنە ناو زۆنگاوێ کە پاش تێکەڵبوون لەگەڵ سفید ڕود ئەڕژێتە ناو دەریای خەزەرەوە.

موزیک

شارستانی فومەن نزیکەی ٢٨٠ دێی گەورە و بچووکی هەیە، کە سەر زەوییەکانیان بەهۆی ئەم ڕووبارانەوە ئاو ئەدرێ کە ناویان برا و، بەشێکی کەم لە دێ و ئاوایییەکان ئاو لە بیر و چاڵ ئەخۆنەوە...

ساڵی ١٣٤١ شەمسی، کە دەوڵەتی شاهەنشایی ئێران سەرنجی دا، جارجارە بەهۆی کەم بارانییەوە، دەغڵ و میوە و برنج و دەسکەوتی فومەن تووشی کەم بژشتی و نەهاتی دەبێ، دەستوور درا بەوەی بەهۆی قومشێکی واتە تۆنێلێکی زۆر گرنگ و پانوپۆڕەوە، لە بەند تاریکەوە ئاوی بۆ ڕاکێشرێ. ئەم قومشە کە پێی ئەوترێ (تونێل ئاب بەری فومنات) بەدووەمین تونیلی جیهان دراوەتە قەڵەم و ١٧ کیلۆمەترێ درێژایی تونێلەکەیە.

ناوەندی ئەم شارستانە، شارۆلکەی فومەنە کە ئەکەوێتە لای خۆرئاوای بەرەو خۆارەوا باشووری شاری ڕەشت، بەماوەی ٢٧ کیلۆمەتر و، لە شەش دێ پێکهاتووە کە ئەمانەن:

بازار - شەهر بیجار - جهود بیجار - شەویل کنار - نەقارچیان - خەندەق بیجار.

دانیشتوانی ئەم شارۆلکەیە دوکان و مەغازە و، چەند گەرماو و چەند مزگەوت و حوسێنییە و، چەند نەخۆشخانە و دەرمانگا و، داروخانە و قوتابخانەی بەرایی و ناوەنجی کوڕانە و کچانە هەیە. ئاوی لوولە و بۆرییە و کارەبا و بەرقی هەیە.

لە شارۆلکە فومەندا قەڵای ڕودخان هەیە، گومان ئەکرێ هی دەورانی ئەشکانی بێ، مەنارەی کۆنە مزگەوتێکیش هەیە، کە هی دەورانی سەلجووقییە.

ژمارەی خەڵقی شارستانەکە بەدوو بەخشی حەومە و شەفتەوە بەپێی سەرژمێرەی ساڵی ١٣٤٥ شەمسی (٢٥٢٥ شاهەنشاهی) ئەگاتە نزیکەی ١٢٤ هەزار کەس، زبانیان فارسی و گیلەکییە. لە دێهات و بەخشەکانیشا چەندین قوتابخانەی لابەری نەخوێندەواری و (مویارەزە با بێ سەوادی) هەیە.

فومەن جێگەیەکە و جیهانگەردان، دیدەنی دەکەن و، بەرەو پێشکەوتن دەڕوات.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان کاتمان تەواوبوو بەخواتان دەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٤/٢٩

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ، هیوادارین بەختیار و کامەران بن. لەو وتارەدا باسی دێیەکتان بۆ دەکەین کە چەند هەستیار و پیاوی گەورەی پێ گەیاندووە و، بەوە ناوبانگی بەرزبۆتەوە، ئەم دێیە ناوی فەراهانە و، جارێ با گوێ بدەینە پارچەیەک مۆسیقی.

مۆزیک

فەراهان گوندێکە، سەر بەبەخشی «فەرمەهین»ی ژێر فەرمانی شارستانی ئەراک، ئوستانی ناوەندی. لە ڕووی جوغرافیاییەوە هەڵکەوتی بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە لای ژوور و باکوری شاری ئەراک و کەویر خۆیی میغان. ئەم فەراهانە ناوەندی دێهستانێکە هەر بەم ناوە و، پتر لە ١٣٠ دێی بەدەوراوە و، خۆی لە شێ گەرەک پێکهاتووە، فەراهانی سەرەوە، فەراهانی خوارەوە، گەرەکی سادات «واتا سەییدەکان» و، لەو دێیانەی کە بەناوبانگن دێی ساروق و، دێی زوڵف ئاباد و، دێی فەرمەهین کە ناوەندی بەخشەکەیە و، لە دێهستانی فەراهان دایە، بابێینە سەر باسوخواسی مێژوویی، ئەم دێی فەراهانە کۆنە و، لە سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیا هەبووە گوایە ئاباقای کوڕی هۆلاکۆی تاتار (مەغۆل) لەم دێیەدا بووە کە هۆلاکۆی باوکی مردووە. لە ١٣ ڕەمەزانی ساڵی ٦٦٣ کۆچییا، سەرانی سپای تاتار، ئاباقایان لە جێی باوکی لەسەر تەختی ئیلخانێتی داناوە و، هەر لەم فەراهانەدا، تاجی خانییان لەسەر ناوە.

مۆزیک

فەراهان، جێیەکی خۆش و، ئاووهەوای سازگارە و، سەردەسێرێشە، بەشی زۆری گوند و ئاواییەکانی دەوروبەری، ئاو لە چاڵ و بیر هەڵئەکێشن، وەیا سوود لە کارێز و کانی وەرئەگرن. ئەم دێی فەراهانە لەو ڕووەوە ناوبانگی پەیدا کردووە کە زۆر پیاوی گەورەی هێناوەتە ناو... وەک ئەدیب المەمالیک فەراهانی -میرزا بوزورگ فەراهانی- میرزا ئەبولقاسم قائیمقامی فەرهانی - میرزا تەقی خان ئەمیر نیزام، کە پێی ئەوترا ئەمیر کەبیر... ئەمانە هەموویان خەڵقی ئەم فەراهانەن.

دێهستانی فەراهان، ناوچەی خوێندەواری و زانست و ئەدەب و هەڵبەست بووە، هەستیاری وەک ئەدیب المەمالیک و، نووسەری وەک میرزا بوزوورگی هێناوەتە بەرهەم،

ئێـمـه لێـرەدا بەپارچه هەڵبـەسـتێکی ئەدیب الممالیک وتارەکـەمـان دوا ئەهێنین: ئەدیب الممـالیـک کـابرایەکی نیشـتـمـانپـەرست و وشـیـار بـووه و، لەوه بێزاربوو، کـه هەسـتـیـار و نووسـەران، هەر خـەریکی هەڵـنـانی چاوی جـوان و، زوڵفـی درێژ و، باڵای بەرز و، دەمی بچووک و لێوی قەیتانی بوون. یا خەریکی هەڵنانی پیاوانی گەوره و ورویایی بوون...

جا ئەدیب الممالیک ئەم پارچه هەڵبەستەی هۆنیوەتەوە:

تاکی ای شـاعـر سـخن پرداز؟
می کنی وصف دلبـــران طراز
دفـتـــری پرکنی زمـــوهومـــات
کـــه منم شـاعـــر سـخن پرداز
ذم ممدوح گـــه کنی زغـــرض
مــدح مــذمـــوم گــه کنی از آز
مـیـزنی لاف گـاهی از عـرفـان
و زحقـیـقت سخن کنی و مجاز
از پی وصف یـار مــــوهومی
گـاه أطناب و گـاهی دهی ایجـار
طـرەات در مـــــثـل بـود طـرار
غـمـزەات در صـدقت بود خـمـار
مـــتـمـــاثل رخت بود بـا مــاه
مـــتـمـــایل قـــدت بود بـاناز
تلخ از حـســرت توام شـد کـام
فـــاش از مـــحنت توام شـــد راز

ئەم چەند هەڵبەستی لەو پارچەیه.

خەڵقی فەراهان، لەگەڵ کشـتوکاڵ و مێگەل پەروەردەکردن خەریکن و، زۆربەی ژنانیـان خەریکی کرد و تەون و چنین، قاڵی و بەڕه و جاجم و شتی تر دروست ئەکەن. له فەراهان، مزگەوت، حوسێنییه، قوتابخانه، گەرماو و، شتی وا هەیه. دوکان و مەغازەش هەیه.

گوێگره خۆشەویسـتەکان کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاته و هەموو کاتێکتان شاد.

٢٥٣٥/٥/٤

## وتاری: ٣٢١

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ و ڕۆژگارتان بەکامەرانی و بەختیاری ڕابوێرن. لەم وتارەدا باسی فیردەوس ئەکەین، کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی خوراسان...

موزیک

فیردەوس، کە ناوە بۆ شارۆلکەیەک، ناوەندی بەخشێکە و ناوەندی ئەو شارستانەشە، کە بەخشەکەی پێوە بەستراوە... فیردەوس ناوێکی تازە پەیدایە، لە سەرەتای مێژوودا ئەم جێگەیە ناوی «تون TON» بووە، وا دیارە لە کاتی خۆیا بەقایینەوە بەستراوە، بۆیە پێی ئەوترا تون قایین TON & AYN لەگەڵ ئەوەشدا کە لەیەکەوە دووربوون و، تون لای خۆرئاوای بەرەو لای ژووری قایین بەدورایی پەنجا میل... زۆربەی جوغرافیانووسەکانی سەرەتای ئیسلام ناوی «تون»یان بردووە. تەنانەت مەقدیسی و، ناسر خوسرەو.

شارۆلکەی «تون» -واتا فیردەوسی ئەمڕۆ- بەپێی قسەی ناسر خوسرەو، لە سەدەی چوارەمی کۆچییا بەرەو ڕۆخان و وێرانی چووە، چونکە ئەڵێ: کاتێ من شاری تونم دیت، زۆربەی وێرانە بوو، بەکەناری بیابانێکی چۆڵەوە بوو، لای خۆرهەڵاتی باغ و باغات بوو، خەڵقی ئەوێ دەیانگوت لەوەبەر چوار سەد کارگەی تەون و کردی تیا بووە، کە قاڵی و زیلو و بەڕە و جاجمیان دروست کردووە باغ و باغاتی و پستەی زۆربوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەڵێن پستە هەر لە چیا و کوێستانا دەڕوێ. ناوی تون هی چەم و کارێز بوو، بەدەوری شارەکەدا شوورەیەکی قایمیش هەبوو.... بەڵام حەمدوڵلا موستەوفی قەزوینی لە سەدەی هەشتەمی کۆچییا ئەڵێ: شاری تۆن لە سەرەتادا شارێکی گەورە بووە، لە سەردەمی ئێمەدا (واتا لە سەدەی هەشتەمی کۆچییا) شارێکی ناوەنجییە و بەم جۆرە دامەزراوە، بەدەوری شارەکەدا شوورەیەکی قایم کێشراوە، ئنجا بەدەوریا خەندەقێکی قووڵی بێ ئاو هەڵکەندراوە، لەناو شارەکەدا بازارێک بەپاڵی حەسارەکەدا دروست کراوە، دەوروبەری شوورەکە بەباغ و دارستان تەنراوە، ئنجا مەزرا و کێلگەی کشتوکاڵ دەس پێ دەکا و بەدەوری مەزراکانی شا بناوانە هەڵبەستراوە بۆ ئەوەی هەرکات باران بیارێ سوود لە ناوی باران وەربگیرێ، دەسکەوتی تون دەغڵ و دانەوێڵە و میوە و ئەوریشمە.

موزیک

هەروا لە فەرهەنگ جوغرافیایی ئێراندا نووسراوە: شاری تون -واتا فیردەوسی ئەمڕۆ- ، بەرلەوەی مەغۆل و تاتار شاڵاو بکەنە سەر ئێران ۳۰۰ مزگەوتی تیابووە، یەکێ لەوانە مزگەوتی جمعە بووە هەروا ۳۰۰ عەمماراوی هەبووە، لە هێرشی هۆلاکۆدا ئەم شارۆلکەیە تووشی گیروگرفت و پەت پەتی هاتووە، ٤٠٠ هەزار کەس لە خەڵقی ئەوێ کوژراوە و لە لاشەی مردووان گردێ هاتۆتە بەرهەم کە هۆلاکۆ بۆ فیز چووەتە سەر لاشەکان و لەوێ تەختی داناوە و تا ئەمڕۆ بەتەپەی تەختی هۆلاکۆ دراوەتە قەڵەم، ئەگەر ئەم داستانەش، بەتەواوی ڕاست نەبێ، گەواهە لەسەر ئەوەی لە سەردەمی هۆلاکۆدا وێران بووە:

گەرچی ئێمە نازانین ئەم شارە تا کەی ناوی (تون) بووەوکەی گۆڕاوە بە(فیردەوس) بەڵام دەبێ پاش دەورانی هۆلاکۆ لە لایەن ئیسماعیلییەکانەوە ناوی (فیردەوس)ی بەسەردا برابێ.

هەڵکەوتی شاری فیردەوس بەم جۆرەیە، ئەکەوێتە بنەپاڵی چیای «کەلات» و لە دەشتێک دایە.

سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی گەناباد و کەویری نەمەک... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی قانیات کە یەکێکە لە بەخشەکانی شارستانی بیرجەند و، لای خوار و باشوورەوە، هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی خوسف Xusf و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی تەبەس. و ئەکەوێتە سەر خەتی ٥٨ دەرەجە ١٠ دەقیقەی درێژایی و ٣٤ دەرەچە و یەک دەقیقە پانایی جوغرافیایی...

لە فیردەوسەوە تا شاری مەشهەد کە ناوەندی ئوستانی خوراسانە ٤٢٠ کیلۆمەترە و، تا تاران ١١٥٨ کیلۆمەترە و، لە ڕووی شارستانێتییەوە لە پلەی دووەم دایە. و ١٢٩٧ مەتر بەرزترە لە ڕووی زریە (دەریا). و ئاووهەوای گۆڕک (متغیرە)، بەپێی ئاووهەوای کەویر، چیاکانی کوە سیاە وەکو کوە عبدلی و کوە شش تو فیردەوسی و گەناباد لە یەک جیا ئەکەنەوە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواووبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٥/١٣

## وتاری: ۲۳۲

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و کامەرانی بێ، هیوای بەڕێوەبەران و نووسەرانی بەرنامە کوردییەکان بەختیاری و سەربەرزی ئێوەیە، ئێمە بەنامە و نووسراوەکانتان دڵ گەرم ئەبین و زۆرتر لەسەر کار پشت ئەستوور و بەهێز دەبین و سپاستان دەکەین... لەم وتارە شا هەر لەسەر باسی فیردەوس ئەڕۆین...

موزیک

لە وتاری پێشوودا بۆ ئێوەمان ڕوون کردەوە کە شارۆلکەی فیردەوسی ناوەندی شارستانی فیردەوسی، سەر بەئوستانی خوراسان، لەمەوبەر ناو «تون» بووە و، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تاینە و پتر لە ۱۰۰ کیلۆمەتر دوورە، پێی وتراوە «تون قایین»، هۆی ئەو ناونانەش دەبێ لەبەرئەوە بووبێ، کە لەو سەردەمەدا قایین لە تون گەورەتر و فراوانتر بووە و، تون سەر بەقایین بووە...

شارستانی فیردەوس سێ بەخشی هەیە: یەکەم ناوخۆ و دەوروبەری کە بەفارسی پێی دەڵێن حەومە. دووەم بشرویە. سێیەم سەرایان.

سەر زەویی فیردەوس پێ دەشتە و، کەوتۆتە کەناری ڕیزە چیای کەلات و، ۱۲۹۷ مەتر لە ڕووی زریە (دەریا) بەرزترە. ڕیزە زوورگ و هەڵەت و چیای ئەکەوێتە نێوانی فیردەوس و گەناباد، ئەم ڕیزە چیایە لە هەر هەرێمێ ناوێکی تایبەتی هەیە: وەکو چیای کوە سیاە، چیای کوە عبدالی - چیای کوە شەش تو و چەندێکی تری. لای ژووری فیردەوسیش بەچیاکانی کەلات تەنراوە، کە لە لای ژوورەوە بەرەو خۆرهەڵات و بەرەو خواری درێژە ئەکێشێ. چیای گوە گوڵستانەش ئەکەوێتە نێوانی فیردەوس و تەبەسەوە... هەروا چیاکانی شتورکوە و، کوە جەلال و، ماوەیان ٢٤ کیلۆمەتر ڕێگە ئەبێ.

فیردەوس ڕووبار و شسیوی گەورەی پێیا ناڕوات، تەنها چەند شیوێکی پێیا دەڕوات کە زستانان لە ئاوی لافاو پڕ دەبن وەک چەمی یەخاب... چەمی پشوو، کە سەرچاوەیان لە چیای بشرویەوە دێت... ژمارەی دانیشتوانی شارستانی فیردەوس بەپێی سەرژمێری ساڵی ۲۵۲۵ شاهەنشاهی نزیکەی ٤٨ هەزار کەس بووە... و دانیشتوانی خود شارۆلکەی فیردەوس نزیکەی یازدە هەزار کەس بوون.

موزیک

ئەمرۆ شارۆلکەی فیردەوس، شارۆلکەیەکی قنجیلەی ڕێکوپێکە، چوار شەقامی قیرتاوی (ئەسفالتەی) سەرانسەری تێدایە... چەند مزگەوت، حوسێنییەی تێدایە، ژمارەیەک قوتابخانەی بەرایی و، قوتابخانەی ناوەنجی تێدایە. پتر لە ٣٠ قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری (کە بەفارسی پێی دەڵێن موبارەز بابی سەوادی) تێدایە، سازمانی دەرمانی لەم شارستانەدا بریتییە لە یەک نەخۆشخانە، چەند دەرمانگا و، چەند داروخانە.

ئەم شارستانە بەرق و کارەبای هەیە... ئاوی لوولە و بۆرییەی هەیە. ٩ گەرماوی تێدایە، میهمان خانەی هەیە. مەیدانی زۆرخانە وەرزشی تێدایە.

ساختمانی کۆن و شوێنەواری دێرینەی شارستانی فیردەوس بریتین لەمانە:

بارەگای ئیمامزادە سوڵتان محەمەد ئیبراهیم - مزگەوتی گەورەی جومعە - مەدرەسەی عیلمیە- مزگەوتی کوشک - عەمباراوی زۆر و زەبەندە، بۆ ئەوەی هاوینان لەباتی سەرداب بەکاربێت و بەفراوی زستانی تێ بکرێ.

خەڵقی شارستانی فیردەوس، بەشی زۆریان لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن... لە شارەکانا مەغازە و دوکان و بازاڕ هەیە. چەند چاخانە، کەبابخانە، قاوەخانە چێشتخانە، خۆراکخانەی تێدایە.

دەسکەوتی خەڵقی شارستان، بەرهەمی کشتوکاڵە کە بریتییە لە گەنم - جۆ - زەعفەران - پەمۆ - توتن و میوەی هەمەجۆر.

دەستکردی خەڵقی شارستانی فیردەوس بەڕە، جاجم و خاڵییە. لە شاری فیردەوسدا گەلێ کارخانەی نەجاری - ئاسنگەری - تەنەکەچێتی تیایە.

لە دەوروبەری فیردەوس کانی قەڵایی و مز (کە بەفارسی پێ دەوترێ ڕوی) هەیە هەروا گەڕاوی گۆگردی هەیە کە نیشانەی بوونی «کبریت»ە و، لە چیای کەلات کانی نەوت دۆزراوەتەوە گەرچی هێشتا بەهرەی وەرنەگیراوە.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان بەسەرچوو، تا کاتێکی تری کە بەیەک دەگەینەوە، شادمانیتان هیوامە، ئەم کاتەتان شاد.

٢٥٣٥/٥/١٨

## وتاری: ٢٢٣

گوێگره خۆشەویست و بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، هیوای ئێمە ئەوەیە کە لە وتارەکانمان بەهرە وەرگرن و، پەسەندە بکەن. لەم وتارەدا باسی «فوشەنج» ئەکەین... بێ گومان ئەم ناوە لای زۆریان نەناسراوە... بەڵام ئێمە ئەم باسەمان بۆیە خستە ناو، چون لە برادەرێ کە ڕۆستەم فەرهادی ناوە نامەیەکمان بۆ هاتووە داوای ڕوونکردنەوەی باسی فوشەنج دەکات... جا ئێمەش ئەم وتارەمان تەرخان کرد بۆ باسی فوشەنج... و با لە سەرەتادا گوێ بدەینە موزیک.

موزیک

لە ئوستانی خوراساندا، دوو جێ هەیە یەکێکیان ناوی فوشەنجان و ئەوی تریان ناوی فوشانە. دەڵێن «فوشەنجان» لە ناوی پشەنگی باوکی ئەفراسیابەوە گۆڕاوە، ئەم گۆڕانەی هۆی ئەوەیە کە عەرەبی ئیسلام پیتی «پێ» و پیتی گافیان نییە...

خۆرهەڵاتناسی بەناوبانگ لیسترنج لە کتێبی «سەرزەمینهای خیلافەت شەرقی»دا، دەربارەی فوشەنج لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژی هەیە، لە وەڵامی ئەو برادەرەدا ئەینووسین بەڵکو زۆرباش وەڵامی پرسیارەکەی بۆ ڕوون بێتەوە.

فوشەنج، کە لە بنەڕەتا لە ناوی پرشەنگ و پشەنگەوە هاتووە، شارێ بووە لای خۆرئاوای هەراتی ئەمڕۆوە لە ئەفغانستان، دەبێ شوێنەواری ئەو شارە نزیک بەشاری غەریان بووبێ کە ئەکەوێتە کەناری لای چەپی ڕووباری هەری ڕود... ئیبن حەوقەل لە سەردەمی خۆیا کە ئەو شارەی دیوە نووسیویە: نیوەی هەرات دەبێ و، هەروەک ئەو ئەکەوێتە پێ دەشتێ و، لە چیاوە دوو فەرسەنگە و، لە ناو دارستان دایە و داری عەرعەر لەم شارەدا زۆر سەیر هەڵ دەکەوێ....

ئەم شاری بوشەنگە شوورەیەکی بەدەورا هەبووە، هەروا خەندەقێکی دەورا دەوریش... بۆ چوونە ناو شار، وەیا لێ دەرچوون لە شارەکە نزیکی سەد دەروازەی هەیە، یەکێ لە دەروازەکانی پێی دەوترا دەروازەی عەلی و، ڕوو بەنیشاپور بوو یەکێکی تری پێی دەوترا ڕێبازی هەرات ڕوو بەخۆر هەڵات بوو، سێیەمی پێی دەوترا دەروازەی کوهستان و، ڕووی لە باشووری خۆرئاوایی بوو...

یاقوتی حەمەویش ئەم شارەی دیوە ئەڵێ: لە دۆڵێکا بوو، پڕ لە دار و درەخت.

حەمدوللا موستەوفیش لە سەدەی هەشتەمی کۆچییا ناوی براوە نەڵێ وڵاتێکی ئاوەدانە، پڕە لە میوە و دارودرەخت، تەنانەت کاڵەک و گوندۆرە و میوەی تری زۆر بەناوبانگە لە چاکییا و، سەد جۆرە ترێی هەبووە و، ئاش و ئاسیاوەکانی لەوانە بوون، کە بەهۆی «با»وە دەگەڕان واتا ئاسایوی ئاوی نەبوون، ئاسیاوی بایی بوون لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە دەڵێن: فیرعەونی میسر کە هامان وەزیری بووە و، لەگەڵ حەزرەتی موسادا، کێشە و بەرەیان بەناوبانگە و لە قورئاندا، بەسەرهاتی دووروودرێژیان باس کراوە... دەڵێن ئەو فیرعەونە و، هامانی وەزیری لە بنەڕەتا هەردووکیان لەم شاری بوشەنگە چوونە میسر لەم ڕووەوە کە چۆن گەییونە میسر و، چۆن دەسەڵاتیان پەیداکردووە، کە فەرمانڕەوایی وڵاتیان گرتۆتە دەست داستانێی دووروودرێژ هەیە، بۆ ئەم بەرنامەیە دەست نادات.

موزیک

ساڵی ٧٨٣ کۆچی سپای ئەمیر تەیموری لەنگ ئابلووقە و گەمارۆی ئەم شارەی دا و، لەگەڵ ئەوەشدا کە شاری بوشەنگ شوورەی هەبوو و، خەندەقێکی گەورەی پڕ ئاوی بەدەورا بوو و، جگە لە سێ دەروازە ڕێی تری نەبوو، بەپێی وتەی شەرەفەدین عەلی یەزدی خاوەنی زەفەرنامە ئەم قەڵایە نەیتوانێ بەرامبەر بەسپای تەیموور خۆی ڕابگرێ و خۆی دا بەدەستەوە...

شاری بوشەنگ لە لایەن سپای ئەمیر تەیموورەوە تالان کرا، خەڵقەکەی قڕان کرا و، دەرودیواری وێران کراو بەتورەکە بێژرا... پاش ماوەیەک لە جێی ئەم شارە وێران شاری غەریان دامەزرا...

با لەبیریشمان نەچێ سێ شاری فەڕگورد - و خەرگورد - و کوسوی، کە لە شارەکانی هەرێمی کوهستان بوون کە عەرەب پێیان دەوت قوهستان، هەر سێ شارەکە لە کاروباری دەسەڵاتدا سەر بەبوشەنگ بوون، کە عەرەب کردوویانە بەفوشەنگ و فوشەنج و تا ئەمڕۆش لە ئێرانا هەر بەم جۆرە ناودەبرێن.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان بەرنامەکەمان لێرەدا تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر باش بێ.

٢٠٣٥/٥/٢٦

## وتاری: ٢٢٤

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاته و هەموو کاتێکتان شاد بێ. لەم وتارەدا باسی دێهستانێ ئەکەین سەر بەبەخشی دیواندەرەی ئوستانی کوردستانە ئەم دێهستانە ناوی «قەراتەوەرە»یە، یەکێکە لەو شەش دێهستانەی ئەم بەخشی دیواندەرەیان لێ پێکهاتووە و، جارێ با گوێ بدەینە پارچە موسیقایێ.

موزیک

دێهستانی قەراتەوەرە Qaratvare ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی بەخشەکەوە و، چوار لای بەم جۆرە سنوور ئەکێشرێ: لای ژوورو و خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی سیامەنسووری سەر بەشارستانی بیجار، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی نەجەف ئابادی سەر بەشارستانی بیجاری باس کرا و... لای خۆرئاوای لا خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی ساراڵ، هەروا هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی هوباتوی سەر بەبەخشی دیواندەرە...

هەرێمەکە، بەرزەبانە، چیاییە، خاکەکەی بەکەڵکی کشتوکاڵ دێت، بەپیت و بڕشتە، هەوای سەردە و، سەر شێوەکانی ناوەنجی و فێنکە.

ناوی هەرێمەکە لە ناوی کێوی قەراتەوەرەوە پەیدا بووە، کە دەکەوێتە لای ژووروی دێهستانەکەوە و، بەرزترین لوتکەی ئەگاتە ٢١٩٧ مەترە، لە ڕووی زریاوە چاڵترین و نزمترین جێگەی ئەم دێهستانە ئاوایی «قزگەیە» کە ١٦٦٧ مەتر لە ڕووی زریە (دەریا) بەرزترە و، بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە هەرێمەکە تا چی ڕادەیەک بەرزەبانە.

شارۆلکەی دیواندەرە، ناوەندی ئەم دێهستانەیە و، بەدەوروبەریدا ٥٠ ئاوایی گەورە و بچووک هەیە... ژمارەی دانیشتوانی ئەم دێهستانە، پتر لە ١٥ هەزار کەسە دێ گەورەکانی ئەم دێهستانە ئەمانەن: قەڵا ڕوتەڵە - وەزمان - گاشەلە - شاڵی شڵ - پاپاڵە - قەرەگۆڵ - دەربەند...

موزیک

سەر زەوی ئەم هەرێمە بەپیت و بڕشتە، خەڵقی وڵات کاروکاسبییان کشاوەرزی و فەلایی و، ئاژەڵ بەخێوکردنە. گەرچی دەغڵ و دانەوێڵە بەجۆرێکی دێمی و بێ ئاویی

نەگات بەڵام لەم هەرێمەدا چوار ڕووباری ئاوی تێدایە، گەورەیان ئاوی ڕووباری قزل ئوزانە - کە لای خواری دێهستانی قەڵا توورەوە تێ ئەپەڕێ و لای خۆرئاوایەوە ڕوو ئەکاتە لای خۆرهەڵاتی و، لای دێهستانی سارالیشەوە لقێ تر تێکەڵی ئەبێ و ڕوو ئەکاتە شارستانی بیجار...

ڕووبارەکانی تری وەک «قزل ئوزان»ین، ئاویان کەمترە لەم شیوانە پەیدا دەبن:

١- شیوی ڕەنگین، لەو ئاوانە پەیدا دەبێت کە لە کێوی خاجی سەیدەوە سەرەو خوار ئەبێتەوە و بەکەناری دیواندەرەدا ڕائەبووڕێ و هەشت کیلۆمەتر دوور لە دیواندەرەوە ئەڕژێتە ناو قزل ئوزان.

٢- شیوی وەل کوشتی کە لە دێهستانی ئوباتووە ڕوو ئەکاتە دێهستانی قەراتەوەرە Qér-atévéré و، دێیەکانی کەناری بەهرەی لێ وەرئەگرن.

٣- شیوی قەرە گۆڵ لە بەرزەبانەکانی تەگەربارنییەوە بەرەو خوار دەبێتەوە و، خاکی چەند دێ و زەویوزاری ئاو ئەدا ئنجا لە سنووری دێی حوسێن ئابادی سەر بەبیجار تێکەڵ بەقزل ئوزان دەبێت.

دێهستانی قەراتەوەرە، وەکو وتمان ناوەندەکەی شارۆلکەی دیواندەرەیە، کە لە هەمان کاتا ناوەندی بەخشی دیواندەرەشە و، ١٥١ کیلۆمەتر لە سنەوە (کە ناوەندی ئوستانی کوردستان)ە دوورە. هەروا لە سەقزیشەوە ١٠٤ کیلۆمەتر دوورە.

لە ئاواییەکانی سەر قەراتەوەرە و لە دیواندەرەدا چەند قوتابخانەیەکی بەرایی هەیە، چەند قوتابخانەی بەرەنگاری نەخوێندەواری -کە بەفارسی پێی ئەوترێ موبارەزە بابی سەوادی هەیە - هەر لە دێیەکانا چەندین مزگەوت هەیە.

ژمارەی دانیشتوانی دێهستانی قەراتەوەرە ئەگاتە ١٥ هەزار کەس، بەسی هەرەزۆریان بەکشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکن زۆربەی دانیشتوان لە عێلی گەڵواخین.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

٢٥٣٥/٦/١٦

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ. هیوای ئێمە کامەرانی و بەختیاری ئێوەیە، لەو نامانەی کە دەینووسن و لەو دڵ ڕەزاییەی دەری ئەبڕن بەرامبەر بەبەرنامەکان، زۆر سپاسگوزاری ئێمە لەم وتارەدا دەربارەی «قروە» ئەدوێین کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی کوردستان، جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی خەم ڕەوێن.

موزیک

قروە، ناوە بۆ زۆر لە دێ و ئاواییەکانی ئێران، بۆ وێنە قروە شارۆلکەیەکە سەر بەبەخشی ڕەزەنی شارستانی هەمەدان...

قروە یەکێکە لە گوندەکان دێهستانی کولیائی بەخشی سونقوری شارستانی کرمانشا[1]، کە ئێمە لەم وتارەدا مەبەستمان هیچ کامیان نییە، بەڵکو مەبەستی ئێمە شارستانی قوروەیە کە شارۆلکەی قوروە ناوەندێتی هەروەک بەدرێژە لێی ئەدوێین.

سنووری چوار لای شارستانی قوروە بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی بیجاری سەر بەئوستانی کوردستان و، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی کەبودی سەر بەشارستانی هەمەدان و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئەسەد ئابادی سەر بەهەمەدان و لەگەڵ سیمینەرود و، لای خۆرئاواشەوە دیسان هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی شاری سنەی ناوەندی ئوستانی کوردستان...

ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارستانە سەد و پێنج هەزار کەس ئەبێ... کە لە نزیکەی ٢٥٠ دێدا نیشتەجێن و، ئەم دێیانە بەپێنج دێهستان بەش کراون: «ئیسفەند ئاباد - ییلاق - چهار دۆڵی - خودا بەندەلو - لەک» و، هەندێ لەم دێهستانانە، لەم دواییەدا بوون بەبەخش.

شاری قوروە ناوەندی ئەم شارستانەیە، کە ئەکەوێتە سەر ٤٩ پلە و ٦ دەقیقە درێژایی جوغرافیایی بەلای خۆرهەڵاتا و ٣٥ پلە و ١٨ دەقیقە پانایی بەلای ژوور و باکورا...

شاری قوروە، لە شاری هەمەدانەوە، لە هەموو جێ نزیکترە کە لە یەکەوە ٨٧ کیلۆمەتر

---

(١) هەروەها قوروە ناوە بۆ مەڵبەندێ، کە لە نزیکی زنجان دایە. (مردوخ)

دوورن و، له سنەی ناوەندی نوستانی کوردستانەوە ٩٣ کیلۆمەتر دوورە و، لە تارانەوە ٤٢٤ کیلۆمەتر دوورە.

موزیک

شارستانی قوروە، هەرێمێکی سەردەسێرە و، لە ڕووی زریاوە بەرزە، ئاوی زۆرە و ئاوێژەیە، ئاوی خواردن هی لولەیە و بۆڕییە، کارەبا و بەرقی هەیە، تەگراف و تەلیفونی تیایە پۆستخانەی هەیە، چەند میوانخانە و هوتێل و گەرماوی تیایە. پێنج دەرمانگای تێدایە، کتێبخانەیەکی گشتی هەیە خەڵقی ولاتەکە زۆربەیان فەلاحن و بەکشتوکاڵەوە خەریکن و ئاژەڵ بەخێو دەکەن و، باغ و باغاتیان هەیە.

لە شاری قوروە و دێهاتەکاندا مزگەوت، حوسێنییە، قوتابخانەی بەرایی و ناوەندی هەیە، چەندین قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری تێدایە، کە بەفارسی پێ دەوترێ مبارزه با بی سوادی... زمانی خەڵقی شارستانی قوروە فارسی - کوردی- تورکییە.

خەڵقی قروە، دەسکەوتیان، بەراوردی کشتوکاڵە وەک گەنم و جۆ و دەغڵ و دانەوێڵەی تری... دەستکردشیان مافوور و قاڵی و بەڕە و جاجم و بلووز و گورەوی و شتی ترە.

لە شاری قوروەدا کارگەی جۆشکاری و، تەنەکەچێتی و جەلەبی سازی و کارخانەی گەچ و خشتی سوورەوەکراو و موزائیک هەیە...

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەو زانیارییەی کە ئێمە دەربارەی قوروە بەدەسمان هێنا لە کتێبە جوغرافیاییەکاندا هەر ئەمە.

## وتاری: ٢٢٦

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، وتاری ئەم حەفتەیەمان دەربارەی «قەیدار»ە، بێ گومان ئەم ناوە بەگوێی زۆربەی خوێنەدەوارانی بیستیار ناناشنایە... چون قەیداری ئەمڕۆ بەخشێکی بچووکی سەر بەئوستانی زەنجانە... بەڵام قەیدار لە سەدەی نۆیەم، دەیەمەدا هەرێمێکی بەناوبانگ بووە و، قەڵا سەختەکانی قەیدار، لە دژە سەختەکانی ژێردەستی فەرمانڕەوایانی سیامەنسوور بوون.. جارێ با گوێ بدەینە پارچەیەک مۆسیقا ئنجا ئەگەڕێینەوە سەر باسەکەمان.

موزیک

قەیدار، یەکێک بووە لەو هەرێمانەی کە قەڵەمڕەوی عێلی سیامەنسووری بووە، ساڵی ٩٦٠ کۆچی شا تەهماسپی سەفەوی کە دیویە خەلیل بەگی سیامەنسووری پیاوێکی جوامێر و ئازا و نەبەردە فەرمانی سەردارێتی بۆ مۆرکردووە و، هەرێمەکانی سوڵتانیە، زەنجان زەڕی کەمەر، ئەبهەر، قەیدار و جێیانی تری، کە لەژێر چنگی عێلی سیامەنسووردا بوون، بەناوی قەڵەمڕەو داوێتی بەئەو و دەستووری داوەتێ کە لە کوردەکانی سیامەنسوور و کوردانی تری هێزێکی سێ هەزار سواریی پڕ چەکی ئامادەی هەبێ بۆ پاراستنی هەرێمەکە و، بۆ فەرمانبەرداری شا تەهماسپ و، لەقەبی خانێتیشی داوەتێ...

جا ئەم قەیدارە، یەکێ بووە لە قەڵا هەرە گرنگەکانی ئەو ناوە لە سەدەی نۆیەم و دەیەمدا.

پاش ئەوەی خەلیل بەگی سیامەنسوور بەفەرمانی شا تەهماسپ بەهێزی سیامەنسوورەوە چووە بۆ کوژاندنەوەی ئاشوب و هەرای دەوری خوراسان، قەیدار و هەرێمەکانی تری قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی سیامەنسوور کەوتۆتە ژێر چنگی دەوڵەتیار خانی کوڕی خەلیل بەگی سیامەنسووری ئێستا واز لە باسی مێژووی کۆن بهێنین و بگەڕێینەوە سەر باسی ئەمڕۆ.

موزیک

لەم سەردەمەدا، قەیدار بەخشێکە سەر بەئوستانی زەنجان ناوەندی ئەم بەخشە دێی «قەیدار پێغەمبەر»ە و، چوار لای سنووری ئەم بەخشە بەم جۆرەیە: ئەکەوێتە لای

خوارەوەی زەنجان و، لای خۆرهەلاتی و هاوسنووره لەگەڵ خود شارستانی زەنجان و، لای ژوور و باکوورەوە، هاوسنووره لەگەڵ بەخشی ناوەندیی زەنجان کە پێی دەوترێ بەخشی حەومە و، لای خۆرهەلاتەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی ئەبهەر لای خۆرهەلاتی جنوبییەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی ئاوەجی سەر بەقەزوین و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنووره لەگەڵ بەخشی میهرەبان و، لای ژوور و باکوریشەوە هاوسنووره لەگەڵ دێهستانی ئیج ڕود. ئەم بەخشە لە پێنج دێهستان پێکهاتووە کە ئەمانەن: خودابەندەلو - سەجاس ڕود - بزینە ڕود - سوهرەوەرد - قشلاق ئەفشار، کە لە ٣٦٠ دێ زیاترن.

ناوەندی ئەم بەخشە دێی قەیدار پێغەمبەرە کە دەکەوێتە دێهستانی خودابەندەلو و، ٧٨ کیلۆمەتر لە زەنجانەوە دوورە و ئەکەوێتە درێژایی ٤٨ دەرەجە و پلەی جوغرافیایی و ٣٥ دەقیقە و پانایی جوغرافیایی ٢٦ دەرەجە و پلە و ٧ دەقیقە. و هەرێمەکە سەردەسێرە و دانیشتوانی شارۆلکەی قەیدار پێغەمبەر ٢٢٨١ کەسن و، دانیشتوانی هەموو بەخشەکە نزیکەی سەد هەزار کەسێ ئەبن. گۆڕستانی قەیدار، یەکێکە لە ساختمانە هەرە کۆنەکانی شارۆلکەی قەیدار، گۆیا لە سەدەی حەوتەمدا دروست کراوە...

لەم بەخشەدا، بەهرە لە ئاوی کارێز و چەم و جۆگاوە ئەگیرێ ڕووبارەکانی سەجاسو بزینە ڕود، سوهرەوەرد، کە بەم بەخشەدا ڕائەبوورن ئەڕژێنە قزل ئوزان. ڕووباری خڕ ڕودیش پاش ئەوەی لەم بەخشەوە ئەچێت بەرەو قەزوین بەلای خوارووی کەرەج و ڕەیدا، تێ ئەپەڕێ و ئەڕژێتە کەویری ئەمەگی کاشان کار و پیشەی خەڵقی قەیدار کشتوکاڵ و، ئاژەڵ بەخێوکردنە بەرهەمی دەستییان کردە وەک بەڕە و مافوور و قاڵی و، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و هەنگوین و میوەیە.

لەم بەخشەدا مزگەوت، حوسێنییە، قوتابخانەی بەرایی قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری هەیە. گۆڕستانی قەیدار پێغەمبەر، زیارەتگای خەڵقی ئەو ناوەیە و لە ڕووی ئاینی و مێژووەوە ناوی پێغەمبەری قەیدار ناویان نییە، بەشی زۆربەی زەویوزاری دێی قەیدار وەقفی دانیشگای تارانە دانیشگای ئارانە... زبانی خەڵقی ئەم بەخشی قەیدارە فارسی - کوردی - توركییە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان، لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٦/٣٠

گوێگره بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان باش لەم وتارەدا باسی «قەرە قویونلو» دەکەین، کە ناوە بۆ چەند جێگەیەک لە ئوستانەکانی ئازەربایجانی شەرقی و ئازەربایجانی غەربیدا... و بەرلەوە دەس بکەین بەباسی ئەو جێگەیانە با گوێ بدەینە پارچەیەک موزیک.

موزیک

قەرە قویونلو، ناوێکی تورکییە، واتا سەر بەمەڕی ڕەش... ئەم ناوە لە بنەڕەتێکەوە هاتووە، باش وایە جارێ ئەوە بۆ گوێگرە خۆشەویستەکان ڕوون بکەینەوە ئنجا بچینە سەرباسەکەمان.

لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا، کە دەسەلاتی مەغۆل و تاتارەکان کەوتە بێ هێزی، تورکمانەکانی ما وراء النهر سوودیان لە هەل وەرگرت و کەوتنە پەرەدانی دەسەلاتیان، لەو عێلە تورکمانانەی، لە سایەی تاتار و مەغۆلا، پەڕەوازە بوون دوو عێلیان دەسەلاتیان پەیدا کرد و، سەرو دەوڵەتێکیان دامەزراند، یەکێ لەو عێلانە دیمەنی مەڕی ڕەشیان لەسەر ئالا و بەیداغەکانیان کێشابوو، بەناوی (قەرە قویونلو) ناسران و، ئەوی تریان وێنەی مەڕی سپییان لەسەر ئالا و بەیداغەکانیان کێشابوو، پێیان ئەوترا (ئاق قویونلو). قەرە قویونلوەکان هەرێمی ئازەربایجان - وانیان لە پاشماوەی مەغۆلەکان داگیرکرد و، ئاق قویونلووەکانیش هەرێمی دیاربەکریان داگیرکرد و، هەریەکە دەسەلاتی خۆیان پەرە پێ دا دامەزرێنەری دەوڵەتی قەرە قویونلو ناوی قەرە یوسف بوو کە لە نێوانی ۷۷٤-۷۸۰دا، بناغەی دەوڵەتەکەی لەلای ژووروی بەین النهرەین دامەزراند و، ئازەربایجانی داگیرکرد و، چوار کەسیان لەسەر تەختی حکوومەت دانیشتن وەک: قەرا یوسف لە ساڵی ۷۸۰ و تا ۸۳۳ ئەسکەندەری کوڕی تا ۸٤۱، میرزا جیهانشای کوڕی قەرا یوسف تا ۸۷۲ و، لە شەڕ لەگەڵ حەسەن بەگ ئاق قویونلودا شکا و کوژرا و تەرمەکەی لە تەورێز لە مزگەوتی کەبود (مسجد کبود) لە ساختمانی موزەفەرییە نێژرا. پاش ئەو حەسەن عەلی کوڕی لە جێی دانیشت بەڵام زۆری نەبرد دەوڵەتەکەیان لەناوچوو.

موزیک

جا لەبەرئەوەی ئەم عێلی قەرەقویونە بەئازەربایجان و کوردستانا بڵاوبوونەوە، لەبەرئەوە ناوی قەرە قویونلو و قەرە قویون، هەم لە ئازەربایجان و، هەم لە کوردستان و هەم لە کرمانشاهان بەرگوێ دەکەوێ.

ئێستە بابێینەوە سەر ئەو جێگەیانەی ناویان قەرە قویون وەیا قەرەقویونلووە.

قەرە قویون گوندێکە، ناوەندی دێهستانی قەرە قویونی سەر بەبەخشی حەومەیی شارستانی ماکویە، ئەکەوێتە لای خواری بەخشی سار و لە ٤٦ ئاوایی پێکهاتووە و، ژمارەی دانیشتوانی ئەگاتە دە هەزار کەسێ. هەروا قەرەقویون ناوی دێیەکە سەر بەدێهستانی ئەرسەکنا بەخشی پول دەشتی شارستانی ماکو... قەرە قویونلو دێیەکە سەر بەدێهستانی چوار دۆڵی بەخشی ناوەندی شارستانی مەراغە... قەرە قویونلو دێیەکە سەر بەدێهستانی نازلو بەخشی ناوخۆی شارستانی ڕەزائییە، قەرە قویونلو دێیەکە سەر بەدێهستانی تەکات بەخشی نەوخەندانی شارستانی دەرەگەز و، دانیشتوانی ٦٠٠ کەس ئەبێ.

دانیشتوانی ئەم دێیانە، هەموویان پاشماوەی عێلی قەرە قویونلوی کۆنن، لە ئێرانا ماونەوە و، خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنن، دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و بەرهەمی ئاژەڵییە. لەم دێیانەدا قوتابخانەی بەرایی هەیە، مزگەوت و حوسێنییە و، دوکان هەیە، زۆربەی ئافرەتانیان کرد و تەون ئەزانن بەڕە، مافوور، جاجم، قاڵی، دورست ئەکەن...

## موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش.

**وتاری: ٢٢٨**

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەمــوو کاتێکتـان شـاد بێ، ئاواتی ئێـمە ئەوەیە کە ئێـوەی بەڕێز لە وتارەکـان و بەرنامـەکـان کـەڵک وەربگرن و بەدڵ لێـیـان ڕەزا بن، کـە ئێـمـە دڵ گەرمانە و پشت ئەستوورانە بتوانین درێژە بەخزمەت بدەین... وتاری ئەم جارەمان دەربارەی «قزڵبـاشـە»، لە بلوجـسـتان دوو دێ هەیە ناویان قزڵباشە و سەر بەشارستانی زابل دراونە قـەڵەم و، پێـویسـتـە بەرلەوەی باسی ئەو جێـیـانە بکەین ئەوە ڕوون بکەینەوە کـە وشـەی «قزڵباش» لە کوێوە هاتووە؟ و کەی پەیدابووە؟ ئەمانە هەمووی پاش بڵاوکردنەوەی پارچە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

بیسـتـیارانی خۆشەویست! قـزڵبـاش، وتەیەکی تێـهەڵکێـشی تورکیـیـە، لە دوو وتەی «قـزل» و «باش» پێکهـاتووە واتا سـەرسـوور، ئەم ناوە لە سـەردەمی دەوڵەتی سـەفـەویدا دراوە بە نۆ عـێل و تیـرەی تورک لە پەیڕەوانی سـەفـەوییـە، کـە بریتی بوون لەم نۆ عـێلە: (روملو - شاملو - ایسـتـاجلو - تەکەللو - ذوالقادر - ئەفشـار - قـاجار - ورساق - و قەرەباغی...».

وەکو ئەوترێ، ئەم عـێلانـە لە سـەرەتادا هەمـوویان لەگـەڵ شـێخ جونەیدی ئەوەی شـێخ سەفی و باپیری شا ئیـسـمـاعیلدا پەیوەندی دەروێشی و سۆفـیێـتیـیان هەبوو، شێخ جونەید بەناوی جیهاد و غەزاوە، هێزی لەم عێلانە پێک ئەهێنا و، شەڕی لەگەڵ ئەرمەنییەکان و گورجییەکان ئەکرد.

پاش شێخ جونەید، شێخ حەیدەری کوڕی لەم عێلانەی داوا کرد کە بەلاسایی پەیڕەوانی ئیمامی عەلی، کە لە شـەڕی «صیفین»دا شتێکی سووریان ئەبەست بەسەرەوە، ئەمانیش کلاوێکی سوور لەسـەر بکەن،... جا ئەم عێلانە لە لباد کلاوێکی درێژی سووریان دروست ئەکرد و دوازدە ڕیزیان بەدەورا ئەکێشا بەناوی دوازدە ئیمام و، پێی ئەوترا تاجی قزڵباش. ئەم هێزانەی کە لەم عێلانە پێک هات بەناوی سپای قزڵباش لە خزمەتی شێخ حەیدەردا بوون و ئەوان لەقەب و نازناوی «شا»یان خسـتـە سـەر ناوی شـێخ حەیدەر. پاشـان کە شـا حـەیدەر کـوژرا و ئەم عـێـلانە بەرامـبەر ئاق قـویونلووەکـان هەر لە شـەڕدا بوون، توانییـان

«شێخ ئیسماعیلی سەفەوی بشارنەوە و، پەروەردەی بکەن و، لە ڕێیا شەڕ بکەن، تا کردیان بە شا ئیسماعیل. شا ئیسماعیلیش پاداشی خزمەتی ئەم قزڵباشانەی بەجۆرێکی باش دایەوە، هەر هەرێمێکی لە دوژمن داگیر دەکرد یەکێک لە سەرانی قزڵباشی دەکرد بەفەرمانڕەوا و ئەمیری ئەو هەرێمە و بەتەواوی سەربەستی و سەربەخۆیی ئەدایێ، سەردارانی قزڵباش لە سەردەمی شا ئیسماعیل و شا تەهماسپدا ئەوپەڕی دەسەڵاتیان هەبوو، بەڵام ئەو ئیخلاسی دەرویشی و سۆفیتییە، وەرگەڕا بەئاغایێتی و فیودالی و دەرەبەگێتی و زۆر لە بنەماڵەی سەفەوی بەدەستی ئەوان کوژرا و چاو هەڵکۆڵرا. شا عەبباسی سەفەوی کە هاتە سەر تەخت دەسەڵاتی قزڵباشەکانی کەم کردەوە و؛ بەناو ئێرانا بڵاوی کردنەوە و، تەرتە وەرتە بوون، بەجۆرێ کە مەیدانی نەدا ناونیشانیان بمێنێتەوە. جا هی ئەوە کە لە ئازەربایجان جێگەیەک نییە ناوی قزڵباشی هەبێ... کەچی لە بلوجستانا ناوی دوو دێی قزڵباش ناو هەیە...

موزیک

جا وەکو وتمان لە شارستانی «زابل»دا، لە دێهستانی نارونیدا دوو دێی قزڵباش ناو هەیە، یەکێکیان قزڵباش خواجە ئەحمەد و ئەوی تریان قزڵباش شەریف ئابادە، هەردووکیان دەکەونە لای خۆرهەڵاتی «سێ کۆهە»ی سەر سنووری ئەفغانستان.

ناویان هی ڕووباری «هیرمەند»ە و، بەرهەمیان هی کشتوکاڵ و مێگەل و ئاژەڵە، هەرێمێکە گەرمەسێر و، دانیشتوانی هەردوو دێیەکە ناگاتە ۳۰۰ کەس.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان ئەمەبوو باسی قزڵباش، تا بەرنامەی ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

۲۵۳۵/۷/۱۲

گوێگره خۆشەویستەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، لەم بەرنامەیەدا دەربارەی قەسری شیرین ئەدوێین کە هەم ناوە بۆ شارێ و هەم بۆ شارستانێ، کە ئەم شارە ناوەندێتی و، ناوی خۆی لەوێوە وەرگرتووە. جارێ با گوێ بدەینە پارچەیەک مۆسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز! قەسری شیرین یەکێکە لە شارە کۆنە مێژووییەکانی ئێران ئەکەوێتە سەر درێژایی جوغرافیایی ٤٥ دەرەجە و ٣٥ دەقیقە و پانایی جوغرافیایی ٣٤ دەرەجە و ٣١ دەقیقە... بەرزایی جێگەی شاری قەسر لە ڕووی زریاوە (دەریاوە) ٣٢٦ مەترە و، دوورایی قەسری شیرین لەسەر سنووری عێراقەوە ٢١ کیلۆمەترە و، لە قەسرەوە بۆ کرمانشای ناوەندی ئوستانەکە ١٨٢ کیلۆمەترە و، بۆ تارانی پایتەختیش ٧٧٠ کیلۆمەترە و، یەکێکە لە شارستانەکانی دووەم پلە لە ڕووی جێگە و پایە و ئەم شارە، لە سەردەمی ساسانییا هەبووە، بەپێی ئەفسانەی مێژوو لەم ناوەدا لە لایەن خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانییەوە بۆ شیرینی خاتوونی قەسری دروست کراوە و، لەبەرئەوە ئەم جێگەیە بەقەسری شیرن ناوی پەیدا کردووە. گوایە شیرین کچێکی ئەرمەنی بووە و لەسەر ئاینی مەسیحی بووە لە داستانە کوردییەکانا ناوی «شیرین ئەرمەن» زۆرجار دووپات کراوەتەوە، زۆربەی هەستیارانی کورد، کە بەشێوەی گۆرانی هەڵبەستیان هۆنیوەتەوە، بەجوانی و شۆخو شەنگیی شیرینی ئەرمەندا هەڵیان گوتووە...

پادشای ساسانی خوسرەوی پەروێز. هاوینان زۆربەی ڕۆژگاری ژیانی لە کرماشان بەسەربردووە و، زستانان لەبەر سەرما گواستیوویەتییەوە کاخی زستانەی قەسری شیرین.

ئەفسانەنووسانی داستانی، وتویانە: خوسرەوی پەروێز، سەشتی هەبووە، هیچ کام لە پادشایانی جیهان نەیانبووە: یەکەم شیرینی ژنی، کە لە جیهانا بێ وێنە و هەمتا بووە، دووەم گۆرانی وێژەکەی کە ناوی «پەهلەبود» بووە، لە هەموو مۆسیقا زانانی جیهان، چاتر و دەنگ خۆشتر بووە... سێیەم ئەسپی شەودێز، ئەسپەکەی خوسرەو پەروێز، کە لە جیهانا بێ هاوتا بووە.

موزیک

قەسری شیرین چۆن دروست کراوە و کەی؟ بێ گومان جێگای ئێستای قەسری شیرین لە

هەزاران ساڵەوە هەر ئاوەدان بووە و، شارە دێ بووە، تەنانەت لەبەرئەوەی سەرەڕێی «کلدە» و «بابل» بووە، کە هاتوچۆیان هەبووە بۆ ئێران زەمین پڕبووە لە کاروانسەرا و، بازاڕیشی گەرم بووە... گۆیا پادشای ساسانی خوسرەو پەروێز، کە بەخوسرەوی دووەم بەناوبانگە دەستووری داوە بەئەندازیارانی کشتوکاڵ و بەوانەی کە جانەوەرانی کێوی هۆگر و ڕام دەکەن. لە دەوروبەری قەسری شیرینی ئێستە باغێک دامەزرێنن، کە لە هەر چوار لاوە دوو فەرسەنگ درێژایی و پانایی بێت و، لەم باغەدا هەموو جۆرە دارودەوەن و گوڵ و گوڵزار و، جانەوەری کێوی و، مەل و ماسی و مار و مور و پەرەندە و، خەزەندە و، ئاژەڵی خۆماڵی و کەوی تیا بێ... ئەندازیاران و پسپۆران بەحەوت ساڵ ئەم باغە پێ ئەگەیێنن و لە شەوێکا کە پادشا سەرگەرمی کەیف و بەزم ئەبێ «پەهل بود»ی گۆرانی وێژی موزیک لێدەر، ئاهەنگی ڕێک ئەخات بەناوی «باغی نچیران»، کە پادشا گوێ ئەداتە ئاهەنگەکە زۆری پێ خۆش ئەبێ و، شیرین ئەڵێ ئێستە کە باغی وەحشەکە ئامادە بووە، تۆ چیت دەوێ تیا بێ؟

شیرین دەڵێ دەستوور بدە، دوو جۆگە لەم باغەدا دروست بدەن، لە مەڕمەڕی تاشراو. و بەهەردووکیانا شەراب ڕێ بکات و شا کە مەستی بادەیی شەرابی عەشق بوو، هەر لەو جێیەدا فەرمانی دا بەدروستکردنی ئەو دوو جۆگەیە، هەروا بڕیار درا لەسەر داخوازی شیرین لە نێوانی ئەو دوو جۆگەیەدا کۆشکێکی شاهانە دروست بکرێ، کە لە وڵاتی پانوپۆڕی ئێراندا بێ وێنە و بێ هاوتا بێ... ئا ئەمەیە هۆی ئەوەی کە ئەم شارۆلکەیە ناوی قەسری شیرینی دراوەتێ... جوغرافیانووسی بەناوبانگ ئیبن ڕستە لە کتێبی «ئەلئەعلاق النەفسیە»دا باسی شوێنەواری ئەم کۆشکەی کردووە نووسیویە: «هەیوانێکی گەورەی بەربڵاو، لە گەچ و خشتی سوورەوەکراو دروست کراوە، بەدەوری ئەم هەیوانەدا چەندین ژوور دامەزراوە، ئەم ژوورانە دەرگەیان لەناو هەیوانەکە دایە، لە دەرگای هەیوانەکەدا سەکۆیەک هەیە لە مەڕمەڕ دروست کراوە».

ئەمەی کە ئیبن ڕستە دیویە، شوێنەواری کۆشکەکەیە، کە لای زۆر بەشکۆ بووە، دەبێ خود کۆشکەکە چۆن کە بەرلەوە بەپێنج سەد ساڵ، بەر شالاوی دوژمنی نەزان کەوتووە، وێران بووە، نەخش و نیگاری تێک دراوە و کەلاوەی ماوەتەوە. گوێگرە خۆشەویستەکان ئەمە باسی کۆنی قەسری شیرین بوو، لە وتارەکانی ئایندەدا باشتر ئەم باسانە ڕوون دەکەینەوە ئێستا بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش بێ.

٢٥٣٥/٧/١٩

## وتاری: ٢٣٠

گوێگره بەڕێز و خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، ئاواتی ئێمە کامەرانی و پێشکەوتنی ئێوەیە، لەم بەرنامەیەدا ئێمە لەسەر باسی قەسری شیرین ئەڕۆین، با جارێ گوێتمان بەموسیقایی شاد بکەین.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز

لە وتاری پێشوودا، ئەوەمان ڕوون کردەوە، کە شارۆلکەی قەسری شیرینی ئەمڕۆ، زۆر دەمێکە ئاوایە و، لە سەردەمی خوسرەو پەرویزی پادشای ساسانیدا، باغی جانەوەرانی تیا دامەزراوە و، شیرین داوای لە خوسرەوی دڵداری کردووە کە بەناو ئەو باغە گەورەیەدا، دوو جۆگەی سەراسەری رابکێشرێ و، ئەم جۆگەیانە لە بەردی مەڕمەڕ بێ، بەناویانا لەباتی ئاو، شەڕاب هەبێ... ئێستە ئەو دوای باسەکە...

موزیک

لەبەرئەوەی کە قەسری شیرین، لە سەرەتای ئیسلامی و، لە دەورانی ئەمەوی و عەبباسی و، فەرمانڕەوای حەسەن وەیهیدا، سەر بەحەلەوان بووە، ناوی زۆر کەم هاتووە لە مێژوودا و، تەنیا باشی قەسرەکەی خەسرەو پەرویز کراوە کە بۆ شیرینی دروست کردووە و، بۆتە هۆی ناوەکەی... هەر لەبەرئەوەیە کە زۆربەی جوغرافیانووسانی کۆن، تەنها لەو بارەوە لێی دووان، کە کاخ و قەسرێکی ساسانی بەشکۆی تیابووە.

بەڵام حەمدوڵلا موستەوفی قەزوینی وتویە: بەشەش فەرسەنگ لە ژوور خانەقینەوە، شاری قەسری شیرین هەیە، کە یەکەم شاری سەر بەهەرێمی چیاییە و، شار نییە گوندێکی گەورەیە شوێنەواری قەڵا و قوللە و کۆشکێکی ساسانی تیا ماوە.

پاش ئەوە تا سەردەمی سەفەوی کەمتر ناوی قەسری شیرین بەرچاو کەوتووە، لە سەردەمی سەفەوی و عوسمانیدا هەمیشە لە سای شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانییەوە، بەر شالاوی سپایی کەوتووە، وێران بووە. گۆیا ئەو مزگەوتەی ئێستە هەیێتی، لە سەردەمی سەفەویدا دروست کراوە هەروا لەبەرئەوەی کە لە سەردەمی ساسانیدا، سەرەڕێی مەدائین و لە سەردەمی عەبباسی و پاش ئەوەدا لە سەرەڕێی بەغدا و، حیجازدا بووە، هەمیشە پڕ بووە لە کاروانسەرا و خان...

شاری قەسری شیرین گەرچی لە چاو کرند و کرماشان گەرمەسێرە، بەڵام جێگەیەکی خۆشە، بەسەر لێوار و کەناری ڕووباری ئەلوەندەوە دامەزراوە - لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەوی یەکەمدا بڕیار درا جۆگەیەکی گەورە لە ڕووباری ئەلوەند هەڵ بگێری و، بیست ئاشگێڕ ئاوی تێ بکرێ و بەکەناری شارا ببرێ، کە بەکەناری ئەو جۆگەیەدا، سەرای دەوڵەتی و، ساختمانەکانی تری دەوڵەت دروست بکرێ.

شارستانی قەسری شیرین، سێ بەخشی هەیە: یەکەم بەخشی ناوخۆ کە پێی ئەوترێ حەومە... دووەم بەخشی سومار... سێیەم بەخشی پل زەهاو. ئەم شارستانە نزیکەی ١٥٥ دێی هەیە، کە هەر بەشەیان سەر بەبەخشێکە.

ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارستانە بەپێی سەرژمێریی ساڵی ٢٥٢٣ ئەگاتە ٧٦ هەزار کەس. و سەرژمێری خەڵقی شارەکە پتر لە دە هەزار کەسە... وا دیارە، جوامێری هەماوەند، کە لە سەردەمی قاجارا پەنای هێناوەتە کیشوەری ئێران و، لە هەرێمی قەسری شیرین جێی دراوەتێ، لەسەر شوێنەواری قەسری شیرین ئەو قەسرەی کە خوسرەو پەرویز بۆ شیرینی دروست کردبوو - قەڵایەکی دروست کردبوو، ئەمڕۆ هێشتا شوێنەواری ماوە، شوێنەواری تری کۆن لە دەوروبەری قەسری شیرین: یەکەم بەردەنووسی «شێخان»ە ئەم بەردەنووسە گەرچی خەتەکەی نەماوە، بەڵام پاڵەوانێک کە تیر و کەمانێکی بەدەستەوەیە و، سەربازێکی دوژمنی بەدیل گرتووە و، لەژێر پێیا ئەپارێتەوە، ئەم پەیکەرە هێشتا هەر دیارە و بەقسەی باستان شوناسان ئەم کەتیبەیە کۆنترین کەتیبەی جیهانییە و، ئەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ بەر لە میلادی، یەکێکی تری لە شوێنەوارەکانی دەوری قەسری شیرین «دوکان داود»ە، کە لە کێوی سیبەکۆ دایە پەیکەری پارسایەکی مادییە خەریکە لە خوا ئەپاڕێتەوە چڵەدارێکی خورمای بەدەستەوەیە.

یەکێکی تری لە دێرینەکان بەردەنووسی «ئانوبانینی»یە کە پێی خستۆتە سەر سنگی دیلی و، خەریکە دوو دیلی تری لە دەست «نانا»ی خوای کۆنی هەرێمی زاگرۆس وەرئەگرێ. جگە لەم سێ شوێنەوارە زۆر گرنگە، چەندین شوێنەواری تریش هەیە، لە وتاری ئایندەدا باسی ئەکەین. جارێ کاتمان تەواوبوو. خواتان لەگەڵ.

موزیک

٢٥٣٥/٧/٢١

**وتاری: ٢٣١**

گوێکرە خۆشەویستەکان، ئەم کاتەتان باش، کامەرانی و شادیتان هیوای نووسەران و بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێرانە و، بەهیوام لەبیرتان مابێ کە ئێمە هێشتا لەسەر باسی قەسری شیرین و دەوروبەری ئەڕۆین... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێ.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

لە وتاری پێشوودا باسی سێ شوێنەواری گرنگمان کرد، کە لە دەوروبەری قەسری شیریندا هەن: یەکەمیان بەردەنووسی «شێخان» بوو، کە گومان ئەگرێ هی دەورانی بەر لە سێ هەزار ساڵ پێش زایینی (میلادی) بێ. واتا هی بەر لە پێنج هەزار ساڵ... دووەمیان پەیکەرێکی مادی بوو کە لە «دوکان داود»ە لە کێوی سیبەکۆ، ڕەنگە هی هەزار ساڵی بەر لە زایینی بێ، واتا هی نزیکەی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەرە... سێیەمیان نزیک بەسەرپێڵە، (واتا سەرپولی زەهاو) کە پێی ئەوترێ بەردەنووسی «ئانتوبانین»، جگە لەم پەیکەرە و بەردەنووسانە نزیک بەسەرپێڵ ئەشکەوتێکی سەرداب ڕەنگ هەیە، کە گۆیاهی سەردەمی مادە، بەڵام خەڵقی ئەو دەوروبەرە پێی دەڵێن «نوتاغی فەرهاد» جێگەیەکی تری لەو شوێنەوارە مێژوویانە هێشتا ماوە و، کوردەکانی دەوری قەسری شیرین پێی دەڵێن«حەوش کوڕی» ئەم جێیە گەرچی کاخێکی بەهارە هەواری پادشایانی ساسانی بووە، بەڵام بەپێی ئەم ناوەدا، کە هەر لە کۆنەوە ماوەتەوە دەبێ «حەوش کوڕی» جێی بەخێوکردنی وڵاخی بەرزە، واتا ماین و ئەسپ و ئێستری، وێژە و تایبەتی کۆشکی شاهانە بووبێ... دوور نییە ئەو جەنگەڵەی کە خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی دەستووری دابوو بەڕێکخستنی باغ و باغات و سەیرانگا، هەر لەم جێگەیەدا بووبی... چون تا ئێستەش شوێنەوار و کۆنە کەلاوەی هەندێ ساختمانی و ئاثاری باغ و جەنگەڵ بەدی ئەکرێ.

موزیک

ئەمڕۆ قەسری شیرین کە یەکێکە لە شارستانەکانی سەر بەئوستانی کرمانشا ناوەکەی لە ناوی شاری قەسری شیرینەوە هاتووە، کە ناوەندی شارستانەکەیە، ئەم شارستانە سێ بەخشی هەیە: بەخشی ناوخۆی کە بەفارسی پێی ئەوترێ حەومە بەخشی سومار... و

بەخشی سەرپێڵی زەهاو کە بەفارسی پێی دەڵێن «سەرپل» و سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە:

لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی شا ئابادی غەرب بەتایبەتی لەگەڵ بەخشی کەند... لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەشی باوەجانی سەر بەشارستانی پاوە، کە ناوەندەکەی ئەزگلەیە لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ دوو قەزای خانەقین و بەدرەدا، لە کیشوەری عێراق، لای خواریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی چەواری سەر بەشارستانی ئیلام... مەڵبەندی قەسری شیرین کەوتۆتە داوێنی چیاوە و، لە چاو هەرێمی چیایی، بەگەرمەسێر ئەدرێتە قەڵەم، بەڵام بەوهۆیەوە کە شارەکە کەوتۆتە کەناری ڕووباری ئەلوەند و جۆگەی پەهلەویش هەر لەو کەنارە دایە بەشەو هەوای فێنک و ئمدارە. بەرزایی جێی قەسری شیرین لە ڕووی زریەوە (دەریا)وە ٣٢٦ مەترە. ڕووباری ئەلوەند، کە لە سەرەتادا بەحەلەوانی کۆندا هاتووە و، بەناوی حەلەوان بەناوبانگە، بەشێکی زۆری زەویوزاری قەسری شیرین ئاو ئەدات، لە بنەڕەتا لە کێوەڕەشەوە دێ کە دەکەوێتە لای خواری دێی ڕێژاو و بەفارسی پێی دەوترێ کوە سپاهانە... ڕووبارێکی تریش هەیە، ناوی «قورەتو»ی دراوەتێ... ئەم ڕووبارە لە چەند جۆگە و شیو و چەماو و، کانیاو پێک دێ، واتا جۆگەی سەراو سینە سادق، جۆگەی وەلاش، چەمی دەرەشێر، جۆگەی دزگە و، چەمی دەرەبیشەکان... ئەمانە هەموویان پاش ئەوەی زەویوزاری دێیەکانیان ئاو ئەدەن بەرەو خوار ئەکشێن و ناوی چەمی قورەتو پەیدا ئەکەن.

ژمارەی دانیشتوانی شارستانی قەسری شیرین بەپێی سەرژمێریی ساڵی ٢٥٢٥ گەییوەتە نزیکەی ٨٠ هەزار کەسێ، کە ئەم خەڵقە لە شاری قەسری شیریندا ٥ هەزار کەس ئەبن و لە هەر سێ بەخشەکەشا ٦٥ هەزار کەس ئەبن شاری قەسری شیرین، شارێکی ڕێکوپێکە، بازارێکی گەرمی پڕ لە کڕیار و فرۆشیار هەیە... چەند هوتێل و چەند مێوانخانە و چەند کاروانسەرای تێدایە... مزگەوت و حوسێنییەی زۆرە، خانەقایەک و مزگەوتی سەفەوییە هی پێنج سەدە لەمەوبەرن، قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی ناوەنجی کچانە و کوڕانەی تیایە قوتابخانەی لابەری نەخوێندەواری کە پێی ئەوترێ مبارزە با بێ سەوادی لە زۆربەی دێیەکانا هەیە... لە شاری قەسردا سینەما هەیە شەقامەکانی قیر و ئەسفاڵیت کراون، چەند مەیدانی تیایە. ئاوی لوولە و بۆڕی، کارەبا و بەرقی هەیە.

ڕۆژنامەی «شاه ایل»ی قەسری شیرین حەفتەی جارێ دەرئەچوو... چاپخانە و کتێبخانەی تێدایە...

قەسری شیرین هەرێمێکی کشتوکاڵییە دەسکەوتیان دەغڵ و دانەوێڵە و میوەیە، قەسری شیرین باغ و دارستانی زۆرە، میوەی هەمەڕەنگی هەیە... خورما و پرتەقاڵ و لیمۆ و هەنار و هەنجیر و ترێی هەیە.

ئاژەڵ بەخێوکردن یەکێک لە پیشەی خەڵقی ئەو ناوەیە. لە دێهات و شارا کرد و تەون، زۆرتر کاری ئافرەتانەیە، بەڕە، قاڵی، سوخانی باش دروست ئەکەن. زۆر کارخانە و کارگەی بچووکی تیایە وەک جلوبەرگ دووری، کەوش و قوندرەسازی، جۆلایی و شتی تری.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا بەرنامەکەمان تەواوبوو ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شادبێ

٢٥٣٥/٨/١٠

## وتاری: ٢٣٢

گوێگرە بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە

ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و خۆشی ڕابووێ، لەم بەرنامەیدا باسی دێیەکی بچووک دەکەین، ئەمڕۆکە دێیە و، ناوەندی دێهستانێکە بەناوی ئەوەوە ناونراوە، بەڵام لە بنەڕەتا قەڵایەکی گرنگ و ناوەندی سەرداریێتیی عێلێک بووە و، لە مێژوودا دەورێکی گێڕاوە... ئەم دێیە و دێهستانەکەش ناوی «قوتورە»... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا ئنجا لەسەر باسەکە ئەڕۆین.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

قوتور ناوی دێیەکە ئەکەوێتە لای خواری شارستانی خۆی بۆ لای خۆرئاوای بەدووریی ٥١ کیلۆمەتر... ئەم دێیە ناوەندی دێهستانی قوتورە کە یەکێکە لە ٧ دێهستانی سەر بەبەخشی دەوروبەری خۆی کە بەفارسی پێی دەوترێ (بەخشی حەومە)... دێهستانەکە بریتییە لە ٢٧ دێی گەورە و بچووک و، دانیشتوانی ئەم دێهستانە تێکڕا ئەگەنە پێنج هەزار کەسێ، هەموویان موسوڵمان و کوردن... ئەم دێی قوتورە لە مێژوو جوغرافیادا، تەمەنی لە هەزار ساڵ پترە، مێژوونووسان لایان وایە عیسا بەگی دونبولی ئەم ناوەی ئاوەدان کردۆتەوە، کە خۆی یەکێ بووە لە نەتەوەی یەحیا بەرمەکی، ئەوەش ئاشکرایە کە یەحیا کوڕی خالیدی بەرمەکی و باوکی جەعفەری بەرمەکییە. ئەم پیاوە لەلەی هارون ڕەشید بووە و، ماوەی ١٧ ساڵی ڕەبەقیش لە لایەن خەلیفەی عەبباسییەوە فەرمانڕەوای ئازەربایجان بووە و، جەعفەری کوڕیشی وەزیری هارون ڕەشید بووە، تا تووشی نەگبەت و ڕقوکینی خەلیفە بوون و، قڕان خرایە بنەماڵەیان. ئەم عیسایە لە نەوەی ئەوانە و، بەسەرۆکی عێلی دونبولی هاتۆتە قوتور و دۆڵی قوتور و، سوگمون ئاوا و هەرێمەکانی دەوروبەری خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی... پاش ئەوە ساڵەهای ساڵ ئەم هەرێمە لەژێردەستی سەردارانی دونبولیدا بووە، کە تا سەردەمی سەفەوی لەسەر ڕچی یەزیدی بوون و، پاش ئەوە وازیان لە یەزیدێتی هێنا و، پەیڕەوییان لە ئاینی ئیسلام کرد...

موزیک

لەسەردەمی جەلال الدەولە خوارەزمشادا قوتور قەلایەکی قاییم بوو، بەدرەدین کوڕی سەرهەنگ، کە نائبی حاجب عەلی پێشکاری خاتوونی سولتان جەلال الدەولە بوو، لە ترسی تاتار ڕای کرد و خۆی دایە پەنای قەلای قوتور. سالی ٨٠٢ ئەمیر تەیموور گورگان قوتوری کردە مەلبەند و، میرانشای کوڕی خۆیی لە سەرداریتی و فەرمانڕەوایی ئازەربایجان لابرد...

لە دەورەی قەرە قویونلو و ئاق قویونلودا، قوتور لەژێردەستی سەردارانی دونبولیدا بووە.

لە سەردەمی سەفەویدا، سولتان سلێمان خانی قانوونی قوتور و بارگیری و سوگمان ئاوا و هەرێمەکانی تری ژێردەستی حاجی بەگی دونبولی داگیرکرد، بەقەوالەی فەرمانڕەوایی دای بەمەنسوور بەگی کوڕی محەمەد بەگ دونبولی کە برازای حاجی بەگی دونبولی بوو.

سالی ١٠٤٣ کۆچی کە سپای ئێران، لەگەل عوسمانی لە شەڕدا بوو و گەمارۆی وانی دا، لە هەلێکا شالاوی کردە سەر قەلای قوتور و، داگیری کرد، لەو حەلەدا فەرمانڕەوای قەلای قوتور زەینەل بەگی مەحموودی بوو، ئەم عێلی مەحموودییەش لە سەرەتادا یەزیدی بوون، پاشان پەیڕەوییان لە ئاینی ئیسلام کرد. لە سەردەمی فەتح عەلی شای قاجاردا، خۆی و قوتور و دەوروبەریان لەژێر فەرمانی جەعفەرخانی دونبولیدا بوو بەلام عەبباس میرزا کە نائب ئەلسەلتەنە بوو لە ئازەربایجان دائەنیشت و پادەگانی فەرمانڕەوایی ئازەربایجان لەو سەردەمەدا تەورێز بوو و، جەعفەر خان سەری بۆ باج و پیتاک دانەئەنواند، عەبباس میرزا شالاوی کردە سەر خۆی و، جەعفەر خانی دونبولی خۆی گەیاندە قەلای قوتور و لەوێ خۆی قایم کرد.

سالی ١٢٢٠ﻫ لە (ژوبێری) نومایەندەی ناپلیۆن هاتووە بۆ ئێران، شەوێک لە قوتور ماوەتەوە لەو حەلەدا سەرداری قوتور و عێلی دونبولی موسا بەگ بووە... ئەم موسا بەگە زۆر پیاوانە پێشوازی لە ژوبێر کردووە و، ژوبێریش لە گەشتنامەکەیا، زۆر ستایشی موسا بەگی کردووە.

## موزیک

قوتور هەروەک لە سەرەتادا دیاردیمان بۆ کرد، ئەمڕۆ هەم ناوی دێی قوتورە و، هەم ناوی دێهستانی قوتور، کە ٢٧ ئاوایی پێوە بەستراوە، خەلقی ئەم دێیانە کاریان کشتوکال و ئاژەل بەخێوکردنە، لەگەل ئەوەشا هەرێمەکە کوێستانی و زۆر سەختە، ڕێی ئۆتۆمۆبێلی بۆ

خۆش کراوە، لە دێیەکانی قوتابخانە دانراوە کە لە لایەن سپای دانشەوە بەڕێوە ئەبرێ، هەروا سپای -تەرویج- واتە پەرەپێدان بەکاروباری کشتوکاڵ لەو ناوەدا سەرپەرشتی کاروباری کشاوەرزەکان دەکات و سەر زەوییەکی بژوێن و بەپیت و فەڕی هەیە، دانیشتوانی ئەم دێیانە ئەمڕۆ لە عێلی شکاکن. خەڵقی دێیەکان زۆریان کرد و تەونیش دەزانن، قاڵی و سوجادە و بەڕە دروست ئەکەن.

دەسکەوتی گرنگی خەڵقی قوتور دەغڵ و دانەوێڵە و خوری و ڕۆن و پەنیر و ماستە...

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین ئەو کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ.

٢٥٣٥/٨/٢٠

**وتاری: ٢٣٣**

گوێکره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، ئێمە لەم وتارەدا دەربارەی دێهستانی قولقول ڕود ئەدوێین کە یەکێکە لەو سێ دێهستانەی بەخشی ناوخۆی شارستانی «تویسەرکان»ی لێ پێکهاتووە و، با لە سەرەتادا گوێ بدەینە پارچەیەک موسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

واژەی «قولقول» واژەیەکی کوردییە، بۆ ئەو کانی ئاوانە بەکاردێت کە زۆر بەتوندی لە زەوییەوە هەڵئەقووڵێن و، ئەم ئاوانە زۆرتر لە هەرێمەکانی کوردستاندا بەرگوێ دەکەون، بۆ وێنە قولقول دێیەکە سەر بەدێهستانی خورەم ڕودی سەر بەشارستانی تویسەرکان... قولقول ئاوا دێیەکە سەر بەدێهستانی پێشخوری بەخشی ڕەزەنی سەر بەهەمەدان... قوڵقوڵە دێیەکە سەر بەدێهستانی کەلاتەرزانی بەخشی ناوخۆی شارستانی سنە (سنندج)... قولقولە دێیەکە سەر بەدێهستانی ییلاقی بەخشی ناوخۆی شارستانی سنە... قولقولە دێیەکە سەر بەدێهستانی مێرەدێی بەخشی ناوخۆی شاری سەقز... قوڵقوڵە ناوی دێیەکە سەر بەبەخشی ناوخۆی شارستانی مەریوان، قوڵقوڵە دێیەکە سەر بەدێهستانی باوەجانی بەخشی ئەلاثی شارستانی کرمانشا... و زۆر جێی تریش هەیە هەر بەم ناوە... بەڵام وەک لە پێشا وتمان ئێمە باسی قولقول ڕود ئەکەین: قولقول ڕود... دێهستانێکە سەر بەشارستانی تویسەرکان، ئەکەوێتە لای خوارووی شارستانەکە... لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی کەرزان ڕود. لای خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ دوو شارستانی مەلایر و نەهاوەند لای خۆرهەڵاتیشەوە دیسان هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی مەلایر... و لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی نەهاوەند و شارستانی کەنگاوەر...

موزیک

دێهستانی قولقولە ڕود، لە ٤٠ ئاوایی پێکهاتووە ژمارەی دانیشتوانی ئەم دێیانە ئەگاتە بیست هەزار کەسێک ناوەندی ئەم دێهسانە دێی فەرەس فاجە Fares Fajە، ئەم دێیە گەورە دێیە، ئەکەوێتە سەر ڕێی کرمانشا تویسەرکان، دوو مزگەوتی تیایە، چەند قوتابخانەی کچانە و کوڕانەی تێدایە، چەند دوکان و کاروانسەرای هەیە، لە جەنگی

یەکەمی جیهانییا پردێکی گەورەی تیا دروست کراوە، بەسەر ڕووباری قولقول ڕودەوەیە ڕێی جەمیل ئاوا بەسەر ئەم پردەدا ڕانەبووری.

هەرێمی قولقول ڕود، هەرێمێکی چیای سەردەسێرە، کێوی سیادەڕە و، کێوی گەلیان ئەکەونە لای خواری ئەم دێهستانە و لە نێوانی دێهستانەکە و شارستانی نەهاوەندان. کێوی کەمەر زەردیش ئەکەوێتە نێوانی ئەم دێهستانە و بەخشی کەنگاوەر.

دوو چەمی کەرزان ڕود و سەرابی، کە پاشان تێکەڵ دەبن و، ڕووباری قولقول ڕود ئەهێننە بەرهەم. ئەم چەم و ئاوانە و هەندێ کارێز و کانی و زەویوزاری ئەم دێهستانە ئاو ئەدەن. بەوهۆیەوە باشترین جێی کشتوکاڵ و باغ و جەنگەڵە خەڵقی دێیەکانی سەر بەقولقول ڕود هەموویان خاوەنی کشتوکاڵ و ئاژەڵن لەو ناوە دەغڵ و دانەوێڵە ئەچێنن تەریاک و خەشخاش ئەهێننە بەرهەم. میوەی زۆری ترێ، هەنجیر، هەناریان هەیە، هەروا گوێز و بادام و کشمیش. ژنانی ئەو دێیانە لەگەڵ کرد و تەون خەریکن باشترین قاڵی، بەڕە و، جاجم دروست ئەکەن...

دێی قەڵەباڵغ و گەورە دێ ئەم دێهستانە یەکەم «فەرەس فاج»ە کە دانیشتوانی هەزار و سەد کەس ئەبێ... هەروا دێیانی فەریازان - سوتلق - بابا کەماڵ - لامیان - میان دێ... لە ئاواییە گەورە و قەڵەباڵغەکانن.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی قولقولە ڕود، بەهیواین هەمیشە لە خۆشی و کامەرانیدا بن.

٢٥٣٥/٨/٢٦

## وتاری: ٢٣٤

گوێکرە بەرێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی و خۆشی و کامەرانی ڕابوێرن، نووسەر و بەرێوەبەرانی ئەم بەرنامەیە، ئاواتەخوازی خۆشی ژیانی ئێوەن. ئێمە لەم وتارەدا دەربارەی «قوم» ئەدوێین... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەرێز! قوم، یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێران، بەپێی وتەی هەندێ لە جوغرافیانووسان ناوی ئەم شارە لە بنەڕەتا «کوماندان» بووە و، عەرەب ناوەکەیان داتاشیوە و سووک کردۆتەوە بۆتە قوم، بەڵام بەپێی بیروباوەڕی من ناوەکە هەر لە بنەڕەتا لەوێوە هاتووە، کە ئەم سەر زەوییە قومەڵانە بۆیە پێی وتراوە قوم، هەرچۆن بێ قوم ناوە بۆ شارێک و شارستانێک، کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی ناوەندی (پایتەخت) و سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای ژوورووە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی تاران و، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ کەویری خوێ... و لای خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ کاشان و مەحلات و لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ ساوە و ئەراک ئەم شارستانە دوو بەخشی هەیە یەکەم بەشی ناوخۆ «حەومە» و بەپێی فەرهەنگی موعین ناوەندی بەخشەکە دێی دەستجوردە. دووەم بەخشی قوهستانە کە دێ کوهەک ناوەندی بەخشەکەیە.

دەربارەی کۆنیی شاری قوم ئەفسانە زۆرە، تا ڕادەیەک کە وتویانە ئەم شارە لە لایەن پادشایانی پێش دادیانەوە دروست کراوە و، تەهمورشا ئاوەدانی کردۆتەوە... هەروا کتێبێ کە بەزمانی پەهلەوی لە سەردەمی پادشایەتی ساسانییا نووسراوە و، ناوی کتێبەکە «خوسرەو کەوازان و ڕیزەک»ە... لەم کتێبەدا ناوی شاری قوم هاتووە و باسی ئەوە کراوە کە قوم زەعفەرانی باشی هەیە.

موزیک

بێ گومان لە سەردەمی پەیدابوونی ئایینی ئیسلامدا شاری قوم هەبووە و، جێگەیەکی ناسراوبووە، گوایە ساڵی ٢٣ کۆچی لە لایەن ئەبو موسای ئەشعەرییەوە داگیرکراوە و، کەوتۆتە ژێردەستی هێزی عەرەبی ئیسلام... قوم لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامدا سەر بەکاشان بووە و هەمیشە لەگەڵ کاشان ناوبراوە و، پێی وتراوە قومی کاشان... پاشان لە

ڕووی ئیـداری و بەڕێوەبەرایەتییـەوە بەسـتـراوە بەئیـسـفـەهان و چونکە لە سـەردەمی عەبباسیدا نومایەندەی خەلیفە لە ئیسفەهان دانیشتووە تا سەردەمی هارون ڕەشید، قوم بەئیسفەهانەوە بەسترابوو بەڵام شارۆلکەیەکی بچووک بووە، لە پاومانی سەدەی دووەمی کۆچیدا حەزرەتی فاتیمەی مەعـسوومە کچی ئیمـام موسای کاظم، گوایە لە مەدینەی منەوەرەوە هاتووە بچێ بۆ دیتنی ئیمام عەلی ڕەزا لە خوراسان... بەڵام لە ڕێ لە شاری قوم نەخۆش دەکەوێ و، ناکامی مەرگ چنگی لە یەخە قایم دەکا و کۆچی دوایی دەکا و، لە شـاری قوم ئەنێژرێ... پاش ئەوە دۆسـتـدارانی خانەوادەی پێـغـەمـبەر، بەهۆی مەرقـەدی مەعـسـوومەوە، ڕوو ئەکەنە شـاری قـوم و، شـارەکە ئاوەدان ئەکەنەوە و، پەرەئەسـێنێ. لە سەدەی سێیـەمدا شـاری قـوم دوو گەڕەکی گەورەبووە گەڕەگی مەینجان پتر لە هەزار ماڵ بووە و قەڵایەکی سەخت و قایمی تیا بووە گەڕەکی کومەندان لە هەزار ماڵ کەمتر بووە.

ڕووبارێ کە بەناو شارەکەدا ڕائەبوورد ئەم دوو گەڕەکەی لە یەک جیا دەکردەوە و، بەسەر ئەم ڕووبارەوە چەند پردی بەبەرد و قـسـڵ دروست کـراوە هەبووە. شـاری قـوم شـوورە و بارووی هەبووە، ئەم شـوورەیەی کـە بەدەوری شـارەکـەدا کـێـشـرابوو، لە شـوورەی دەوری قەزوین گەورەتر بووە، شوورەی دەوری شاری قەزوین دە هەزار هەنگاو... واتا دە کیلۆمەتر درێژایی بووە... بەڵام شوورەی دەوری قـوم چل هەنگاو زیاتر بووە. جوغـرافـیـانووسی زانا ئیبن حەوقـەل لە سـەدەی چوارەمـا ئەم شـارەی دیوە ئەڵێ: زەویوزاری قـوم زۆر بەپیت و برشـتـە باغ و باغـاتی زۆرە تەنانەت لەوێ پسـتـە و چەقاڵە بەدەم زۆرە. یاقوتی حەمەویش بەشاری قومدا ڕابردووە و، باسی ئەوەی کردووە کە لە قومدا قـەڵایەکی کۆنی ئێرانی بووە، هی پێش سەردەمی ئیسلام. موستەوفی قەزوینی ئەڵێ: خەڵقی قوم زستـانان چاڵاوی زۆر قـووڵیـان هەبوو پڕیان ئەکـرد لە بەفـر و، هاوین لەو ئاوە سـاردەی ژێر زەوی بەهرەیان وەرئەگرت بۆ خـواردنەوە، بیری ئاویشـیـان هەبوو کـە بەپانزە گـەز دەگـەییـیە ئاو... لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ئاوەکـەی تۆزێ شـوێر بوو... بەڵام زۆر سـازگـاربوو، لە ڕاسـتـە بانەکـانی قـوم چاترین دەغڵ و دانەوێڵە و، مـیـوەهات پێ ئەگـەیی. تەنانەت هەنار - پسـتـە - هەنجـیـری ڕەش... هەروا کاڵەک و گوندورە، جگە لەوانەش قوم پەمۆی چاکی پێ ئەگەیاند...

موزیک

بیستیارانی بەڕێز کاتمان لێرەدا تەواوبوو، لە وتارەکانی ئایندەدا لەسەر باسەکە ئەڕۆین، ئیتر ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان هەر شاد بێ.

۲۰۳۵/۹/۱

## وتاری: ٢٣٥

گوێگرە بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ... سەربەرزی و کامەرانیتان یەکێکە لەو هۆیانەی کە نووسەر و بەڕێوەبەرانی ڕادیۆ کوردییەکانی ئێران پێی شاد و دڵخۆشن. ئێمە لەسەر باسی «قوم» دەڕۆین... ئەوەبوو هەفتەی ڕابردوو، دەربارەی مێژووی کۆنی ئەم شارە دوواین و، ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ئەم شارە لە زۆر کۆنەوە هەر ئاوابووە و، لە سەرەتادا وەک هەندێ وتوویانە ناوی «کومەندانە» بووە پاشان بەهۆی هاتنی ئیسلامەوە، کومەندانە بووە بەقومدانە و، داتاشراوە بووە بە قوم...

هەروا ئەوەشمان وت کە ڕەنگە «قوم» هەر لەوێوە بووبێ بەناو کە ئەم شارە لە دەشتێکی قومەڵانە دایە... ئێستە با هەندێ باسی تری دەربارەی قوم بڵاو بکەینەوە.

موزیک

قوم ناوەندی شارستانی قومە، کە سەر بەئوستانی ناوەندییە، ئەم شارستانە دوو بەخشی هەیە یەکەم ناوخۆ (حەومە) دووەم کوهەک... بەخشی ناوخۆ لە چەند دێهستان پێکهاتووە، یەکێ لەوانە دێهستانی قمرودە، کە دێ قومرود ناوەندێتی... ئەم گەورە دێیە کە نزیک شارێی قوم - تارانە قوتابخانە، مزگەوت، حوسێنییە و، چەندین دوکانی تیایە، خەڵقەکەی لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن. هەروا دێی دەستجوردیش ناوەندی بەخشی کوهەکی سەر بەشارستانی قومە... ئەم گەورە دێیەش خێوی قوتابخانەی بەرایی، مزگەوت، حوسێنییەیە، چاخانە، ڕیستۆران، گەرماوی تیایە. خەڵقەکەی لەگەڵ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریکن.

موزیک کوتا

قوم، لە سەرەتای ئیسلامدا شارێکی ئاوەدان بووە، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا، پاش ئەوەی کە حەزرەتی مەعسوومەی خوشکی ئیمام ڕەزای ئیمامی هەشتەم لەوێ کۆچی دوایی کردووە بەهۆی ئەوەوە کە خوابگا و ئارامگای لەوێ بووە. موسوڵمانەکان، تەنانەت شیعەکان پتر هاتوون بۆ زیارەت و لەوێ نیشتەجێ بوون، بەم جۆرە شاری قوم پەرەی سەندووە بۆتە شارێکی دوو گەڕەکی گەورە ئەم شارە لە سەردەمی ئال بویە و سەلجووقیدا، زۆر پەرەی سەندووە تەنانەت ساختمانی بارەگای حەزرەتی مەعسوومە کە ساڵی ٥٢٩

کۆچی دروست کراوە... و ساختمانی ئیمام زادە جەعفەر کە ساڵی ٦٧٧ کۆچی دروست کراوە و، ساختمانی گومەزەکەی ئیمامزادە ئەحمەد قاسم کە ساڵی ٧٠٨ کۆچی دروست کراوە و ساختمانی گومەزی ئیمام موسای موبەرقەع کە پاش ئەوانە دروست کراوە و، ساختمانی گومەزی ئیمامزادە عەلی جەعفەری کە ساڵی ٧١٠ کۆچی دروست کراوە... ئەمانە هەموو گەواهی لەسەر ئەوەی کە ئەم شارە شارێکی بەشکۆ و ئاوەدان و خاوەن دەرئامەد بووە، جگە لەمانەی زۆر جێگەی تری کۆن و باستانی تیایە. لە دەورانی مەغۆل و تاتاردا. ئەم شارە لەبەرئەوەی لەسەرە رێدا بووە، لە لایەن سپای دوژمنەوە پێشێل کراوە، بەڵام نەگەییوە ئەوەی کە ببێ بەخەرابە و، خەڵق هەمیشە هەوڵیان داوە ئاوا و ئاوەدان بێ... بەڵام لە دەورانی ئەمیر تەیموری لەنگدا، کە بەئەمیر تەیموور گورگان بەناوبانگە خاکی بەتورەکە بێژرا، شارەکە وێران کرا، خەڵقەکە قڕان کران،... پاش ئەوە لە سەردمی سەفەویدا دیسان کەوتەوە برەو، ئاوەدانی پەیدا کرد. ساڵی ٩٣٥ کۆچی ساختمانی چل دوختەرانی تیا دامەزرا و، گومەز و بارەگاکانی ئیمامزادەکان سەرلەنوێ تازە کرایەوە.

لە سەدەکانی ناوەندی دەورانی ئیسلامدا، لە شاری قومدا کارخانەی چنینی کاڵای هەوریشمی و، کارخانەی شووشەسازی هەبووە...

لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا زۆر هەوڵ دراوە کە شاری قوم ئاوا و مەعمور بێ... لەوێ کارخانەی جۆلایی دانراوە بۆ پارچە و کاڵای دەزوویی و خورین. هەروا گەلێ کارگەی تری تێدایە وەک نەجاری و دارتاشی و، چەرمسازی و، چاپخانە و چاپەمەنی و، ئاسنگەری...

لە شاری قومدا دە قوتابخانەی ئاینیی زۆر رێکوپێک هەیە بۆ پێگەیاندنی مەلا و ئاخوند. و لەم قوتابخانەیانەدا هەمیشە چوار هەزار کەسێ خەریکی خوێندنن... جگە لە قوتابخانەی ئاینی لەم شارستانەدا پتر لە ٥٠ قوتابخانەی بەرایی ٣٠ قوتابخانەی ناوەنجی و، هونەری و پیشەیی تیایە... هەروا لە شارستانەکەدا ٤٠ قوتابخانەی لابەری نەخوێندەواری دامەزراوە، کە لە لایەن سپای زانستەوە (سپای دانش) بەرێوە ئەبرێن... شاری قوم لەبەرئەوەی زیارەتگای زۆرە و، خەڵق بۆی ئەچن بازارێکی چەند هەزار دوکانی تیایە، نزیکەی ١٠٠ ریستۆران و ٢٠٠ چاخانە و، چەندین هوتێل و مێوانخانەی باشی تێدایە، شاری قوم ئاوی لوولە و بۆری هەیە، کارەبا و بەرقی هەیە، تەلگراف و تەلیفۆنی

هەیە. چەندین نەخۆشخانە، داروخانە، دەرمانگای تیایە. شەمەنەفەر بەنزیکیا ڕائەبووڕێ و، ئەکەوێتە سەر شەقامی گەورەی کاشان و ئەراک و ئەسفەهانە. لە قومەوە بۆ تاران ١٥٤ کلیۆمەترە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٩/٩

## وتاری: ٢٣٦

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ، ئاواتی ئێمە ئەوەیە بیستیارانی خۆشەویست لە بەرنامە کوردییەکانی ڕادیۆی ئێران ڕازی بن و پرسیار و ڕەخنەی خۆیان بۆ ئێمە بنێرن. لەم بەرنامەیەدا ئێمە باسی (قوچان) دەکەین... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێ.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

قوچان یەکێکە لە شارستانە پڕ پیت و بەرەکەتەکانی ئوستانی خوراسان. جوغرافیانووسانی سەردەمی موسوڵمانەتی ناوی ئەم جێگەیەیان بەچەند جۆر تۆمار کردووە... (خەبوشان - خوجان - خوشان - گوچان)...

جا قوچان ناوە بۆ شارستانێ و بۆ بەخشێ و بۆ شارێ... شارەکە کەوتۆتە بەخشی ناوخۆی شارستانەکە و ئەکەوێتە کەناری ڕوباری «ئەترەک»... ئەم ڕووبارە لە دۆڵێکەوە سەرچاوەی هەڵئەسێ کە لە سەرەتادا بەرەو خۆرئاوا ئەکشێ، ئنجا بەرەو خۆرهەڵات ئەڕوا... لەم دۆڵە زونگ ئاوەوە دوو ئاو پەیدا ئەبێ، ڕووباری مەشهەد و ڕووباری ئەترەک، جا سنووری چوار لای شارستانی قوچان بەم جۆرەیە. لای ژوور و باکوری سنووری سەرحەدی ئێران و شوورەوییە، لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوور لەگەڵ شارستانی دەرەگەز و، لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی بوجنورد و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی مەشهەد...

ئێمە دەربارەی مێژووی کۆنی ئەم شاری خەبوشان (قوچان)ە، هەر ئەوەندە ئەزانین کە لە سەردەمی یاقوتی حەمەویدا (سەدەی شەشەم) خەبوشان ناوەندی ویلایەتی «نەسا» بووە و، نەوەد و سێ دێی بەدەورا بووە، لە دەورانی هۆلاکۆی تاتارا، بەم هەرێمەیان وتووە ئیستیوا، کە دەبێ لەبەر بەرزیی هەرێمەکە بووبێ... هۆلاکۆ کە بەوە بەناوبانگە وڵاتی وێران ئەکرد و، کوشتاری ئەکرد، ئەم شارەی ئاوەدان کردۆتەوە و، ئەرغونی نەوەی ساختمانەکانی پەرە پێ داوە.

موزیک

شارستانی قوچان لەبەرئەوەی جێگەکەی بەرزە و، کەوتۆتە هەرێمی چیاکانی هەزار مەسجید و، ئالاداغ و، شاجهان... لە هاوینا ئاووهەوای فێنک و خۆشە و لە زستانا ساردەسێرە و، زۆرجار بەفر و بەهمەن رێگەکان و گەردەنەکان ئەبەستێ چیای هەزار مەسجید کلکەی ریزە چیای ئەڵبەرزە، کە بەرەو خۆرهەڵات درێژە ئەکێشێ هەر لە گیغان تا گەردەنەی ئەڵڵاهو ئەکبەر و لەوێوە ئنجا بەرەو خۆرهەڵات دەکشێ و چەند زنجیرەیێ چیای لێ پەیدا دەبێ...

ڕووباری ئەترەک کە لە قوچانەوە بەرەو لای خۆرئاوا ئەکشێ بەشی هەرەزۆری زەویوزاری بەخشی قوچان و بەخشی شیروان ئەکات بە بەرئاو...

لەم هەرێمەدا، زۆر جار بوومەلەرزە ڕوو ئەدا، لە ساڵانی ١٣١١-١٣١٢ کۆچییا بوومەلەرزەیەکی زۆر سەخت لە قوچان ڕووی دا شارەکەی وێران کرد و، پتر لە دە هەزار کەس لەناوچوون... لەو حەلەدا محەممەد ناسرخان شوجاع الدەولە سەرۆکی عێلی زەعفەرانلو گەورە پیاوی ئەو ناوە بوو، زەوییەکی زۆری بەخشی بەخەڵکی شارەکە و، سەرلەنوێ شارەکەیان ئاواکردەوە شوێنی ئێستەی شاری قوچان، کە ١٢ کیلۆمەتر لە شوێنی کۆنە قوچانەوە دوورە، لە ساڵی ١٣١٣ کۆچییەوە دامەزراوە...

لە سەرەتادا ئەم شارە ناونرا «ناسری» هەم بەناوی محەممەد ناسرخانەوە کە ئەم زەوییەی بەخشی، هەم بەناوی ناسرەدین شای قاجارەوە کە لەو سەردەمەدا پادشای ئێران بوو... بەڵام خەڵک لەگەڵ ناوی قوچان ڕاهاتبوون ئەو ناوەیان لەبیر بردەوە...

شاری تازەی قوچان لەسەر شێوەیەکی تازەی ڕێکوپێک دروست کراوە، شەقامەکانی ڕاست، کۆڵانەکانی گەورە و فراوانن، چوار ڕێیەکانی ڕێکوپێک لەسەر شێوەیەکی ئەندازیارانەیە. لە قوچانەوە بۆ مەشهەدی ناوەندی ئوستان ١٢٠ کیلۆمەترە. هەروا بۆ سەر سنووری شوورەی - ئێرانیش کە پێی ئەوترێ باجگیران دیسانەوە ١٢٠ کیلۆمەترە... لەمەوبەر قوچان سێ بەخشی هەبوو: ناوخۆ - باجگیران - شیروان... بەڵام لە ساڵانی دواییدا شیروانیش کرا بەشارستان. ئێستە قوچان دوو بەخشی هەیە: ناوخۆ و باجگیران.

لەوەبەر ئەم شارستانە ٤٣٢ دێی هەبوو، بەڵام کە بەخشی شیروان جیاوە بوو و، بوو بەشارستانی سەربەخۆ، چەند دێهستان بەسترا بەوێوە...

بەخشی ناوخۆی قوچان لە ١١ دێهستان پێکهاتووە و، ٢٦٣ دێیان هەیە. ناوی دێهستانەکان ئەمانەن: دەغانی - خەرەق کوهنە - فرود - شەهر کوهنە - مایون -

جەعفەر ئاباد - جەعفەر ئاباد فاروج - چەری - فاروج، دەوڵەت خانە - مەزرەج...
دانیشتوانی ئەم شارستانە ژمارەیان ئەگاتە ١١١ هەزار کەس و، لە عێلەکانی زەعفەرانلو
- پیچەرانلو- میلانلوی کوردن... لە وتاری ئایندەدا دووردرێژ دەربارەی قوچان و
پێشکەوتی ئەدوێین ئێستە کاتمان تەواو بوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم
کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/٩/١٥

**وتاری: ٢٣٧**

گوێگرە خۆشەویست و بەڕێزەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ بەهیواین وتاری وڵاتەکەت باشتر بناسە بەدڵتان بێ و، سوودی هەبێ. ئێمە لەم وتارەدا لەسەر باسی قوچان دەڕۆین و، جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

مۆزیک

بیستیارانی بەڕێز

وتمان قوچان کە لە کتێبە مێژووییەکانا پێی وتراوە (خەبوشان) شارێکی کۆن بووە، بەڵام بەهۆی بوومەلەرزەوە چەندین جار جێگای گۆڕاوە. ئەم شوێنەی کە ئێستە شاری قوچانی لەسەر دامەزراوە، بەر لەساڵی ١٣١١ی کۆچی، زەویوزاری شوجاع الدەولە ناسر خانی سەرداری عێلی زەعفەرانلوی کورد بوو...

پاش ئەوەی کە لە ساڵی ١٣١١دا بوومەلەرزەیەکی سەخت ڕووی دا و، هەموو شاری قوچانی وێران کرد، ناسر خان زەویوزارەکەی خۆی بەخۆڕایی دا بەدانیشتوانی شار و شارەکەیان گوێزایەوە ئەم سەر زەوییەی ئێستە کە چەند کیلۆمەتری لە کۆنە شارەکەوە دوورە. هەر بەناوی ناسر خان وەیا بەناوی ناسرەدین شای قاجارەوە شارە تازەکە ناونرا «ناسری» بەڵام خەڵقی ئەو ناوە زمانیان بەناوی قوچان ڕاهاتبوو، ناوی ناسرییان لەبیر بردەوە و، لەم ماوەیەدا قوچان بوو بەشارێکی قنجیلە، چونکە هەر لە سەرەتادا لەسەر نەخشەیەکی جوان دامەزرابوو، تەنانەت هەندێ ئەندازیاری کارامە و کارلێهاتوو لەسەر بناغەیەکی جوان و نەخشەیەکی ڕێکوپێک کۆڵان و شەقامەکانیان کێشابوو...

موزیک

شاری قوچان ئەکەوێتە سەر درێژایی جوغرافی ٥٨ پلە (دەرەجە) و ٣٠ دەقیقە و، پانایی ٣٧ پلە و ٧ دەقیقەی جوغرافی... و لەبەرئەوەی هەرێمەکە چیاییە، لە ڕووی زریە (دەریا) ١٣٥٠ مەتر بڵندترە.

ئاووهەوای قوچان لە زستاندا سارد و لە هاویندا فێنکە دانیشتوانی شاری قوچان و شارستانەکە بەهەردوو بەخشەکەوە ئەگاتە ١٧٠ هەزار کەس و شێوەی قسەکانیان فارسی و کوردی کرمانجییە. زۆربەی دانیشتوانی دێهات و شارەکانی سەر بەشارستانی قوچان لە

کورگەلی خێڵ و عێلەکانی زەعفەرانلو - پیچەرانلو - میلانلو و هی ترن، بەرلەوەی شیروان ببێتە شارستان، یەکێ بوو لە بەشەکانی سەر بەقوچان و لە ساڵی ١٣٣٨ شەمسیدا واتا ٢٥١٨ شاهەنشاهیدا ئەم شارستانە ٤٣٤ دێی گەورە و بچووکی هەبوو، بەڵام پاش ئەوەی شیروان بوو بەشارستان دێیەکانی سەر بەبەخشی شیروان کە ١٣٥ وەیا پتر بوون، لە قوچان جیاکرانەوە.

موزیک

لە قوچاندا نزیکەی بیست قوتابخانەی بەرایی (دەبستان) و شەش قوتابخانەی ناوەنجی (دەبیرستان) و ٨٠ قوتابخانەی مبارزە بابێ سوادی واتە لابەری نەخوێندەواری هەیە کە لە لایەن سپای زانستەوە بەڕێوە ئەبرێن. کتێبخانەیەکی گشتی و مۆزەییک و یانەیەکی وەرزشی تیایە. نەخۆشخانەیەکی ناوەنجی تیایە کە ٣٤ تەختی تیایە بۆ خەواندن و تیمارکردنی نەخۆش. هەروا ٦ دەرمانگا و، ٨ دەرمانفرۆشی تیایە. لە قوچاندا ٧ میوانخانە و ٣ هوتێل و چەند ڕیستۆران و کەبابخانە و چاخانە هەیە و، بازاڕێکی باشی تیایە. ڕێی ئاسنی شەمەنەفەری مەشهەد سەد کیلۆمەتر لە قوچانەوە دوورە. ئەم شارە تەلگراف و بێ تەل و تەلیفۆنی هەیە، کە خەڵقی ئەو ناوە بەخۆیەوە پەیوەندییان لەگەڵ کیشوەری شاهەنشایی خۆیانا هەیە... ئاوی ناو شار لوولە و بۆرییەیە، کارخانەی بەرق و کارەبای تیایە چەند سینەمایەکی هەیە و، چەند گەرماویشی تیایە، مزگەوت و حوسێنییەی هەیە. قوچان وڵاتێکی بەبەرهەمە، دەرئامەدی پیت و بڕشتی زۆرە، هەم دەسکەوتی کشتوکاڵیی باشە وەک گەنم، جۆ، برنج، هەم بەرهەمی ئاژەڵی زۆرە وەک ڕۆن، ماست، پەنیر، پێستە، خوری. لە قوچان و بەخشەکانیدا کرد و تەون و جۆلایی باوە، لەوێ مافوور و قاڵی و سوجادە و بەڕە و گلێم و شاڵی باش دروست ئەکرێ. جگە لەوانە لە قوچاندا چەند کارخانەی خشتی سوورەوەکراو و، نەجاری و دارتاشی و، دەباغی هەیە. هەروا چاپخانەشی تێدایە. یەکەمین شوێنەواری کۆن لەوێدا گۆڕستانی ئیمامزادە ئیبراهیم... کە گۆیا لە بنەماڵەی ئیمام ڕەزای ئیمامی هەشتەمە.

قوچان میوەشی زۆرە. تەنانەت هەنجیر و ترێ و هەناری بەناوبانگە، بادام و گوێز و پستەشی هەیە.

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

## وتاری: ٢٣٨

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و خۆشی بێ هۆی بەختەوەری و کامەرانی نووسەر و بەڕێوەبەرانی ئەم بەرنامەیەیە کە دیسانەوە لەگەڵ ئێوەدا بەیەک دەگەینەوە و، هەموو ئاواتمان ئەوەیە کە بەرنامەکەمان سوودی هەبێ و ئێوەی گوێگرانی بەڕێز پەسەندی بکەن. ئێمە لەم وتارەدا باسی «قایین» دەکەین، کە ناوە بۆ شارۆلکەیەک و بۆ بەخشێک و، شارۆلکەکە ناوەندی بەخشەکەشە... و با لە سەرەتادا پێکەوە گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز

قایین بەخشێکە لە بەخشەکانی شارستانی بیرجەند، سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای ژوورو و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ سەرحەدی ئێران - ئەفغان... لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی فیردەوس و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی بیرجەند و لەگەڵ بەخشی دەرەمیان.

بەخشی قایین لە پێنج دێهستان یا -لە پێنج بلوک- پێکهاتووە... یەکەم دێهستانی قایین کە دێهستانی ناوخۆی بەخشەکەیە... دووەم دێهستانی نیم بلوک... سێیەم دێهستانی پەس کۆ... چوارەم زەهان... پێنجەم زیرکوە. ئەم پێنج دێهستانە کە بەخشەکەیان لێ پێکهاتووە بریتیین لە ٢٨٦ دێ... و دانیشتووی بەخشەکە تێکڕا ژمارەیان ئەگاتە ٧٠ هەزار کەسێ.

شارۆلکەی قایین کە ناوەندی ئەم بەخشەیە ئەکەوێتە لای ئەکەوێتە لای ژووری بەخشەکەوە بۆ لای خۆرهەلات، نزیک بەجادە و شەقامە ڕێی مەشهەد - زاهیدان...

موزیک

شاری قایین، کۆنە و لە کتێبی موعجیم البولداندا ناوی براوە... کۆنە شارەکە بەسەر گردێکەوە بووە بەبەرزایی ١٥٠٠ مەترێک پاشان شارەکە وێران بووە و، شوێنەواری ماوە... ئەم شاری قایینەی ئێستە لە سەردەمی شاهروخ میرزا دروست کراوە. لێرەدا دەبێ بڵێم: هەم «شاهروخی کوڕەزای تەیموورلەنگ پادشای خوراسان بووە و، هەم شاهروخی

کوڕەزای نادر شا... و بۆمان ڕۆشن نەبووەوە کامیان دروستیان کردووە. ئەم شاری قایینە زۆر خوێندەوار و زانا و هەستیاری پێ گەیاندووە، لە کتێبی (ئەلئەنساب سەمعانی «الانساب سمعانی»)دا، ناوی هەندێ لەو زانایانە هاتووە، وەک: ئیسحاق کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم قایینی... جونەید کوڕی محەمەد کوڕی عەلی قایینی... محەمەد کوڕی عەلی قایینی کە هەرسێکیان لە زانایانی بەناوبانگ بوون و، لە فەرمایش زانانە (مُحَدِّثْ) بوون کە زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەریان لەبەربوو (درودی خوای لێ بێ)... هەروا زۆر مەلا و زانای تر لە قایینەدا هەڵکەوتوون تەنانەت دوو کەسیان دەربارەی مێژووی قایین کتێبیان نووسیوە، یەکێ لەوانە کتێبی (بەهارستان»... دەربارەی مێژووی قایین، ئاغای ئایەتی قایینی نووسیویە... ئەوی تریان کتێبی (تەئریخ ئیبن حیسام)ە.

موزیک

ئاووهەوای قایین، یەکسان نییە... هەندێ لە دێهستانەکان گەرمەسێرە و هەندێ تریان ناوەنجییە، نە زۆر گەرمە، نە فێنک... ئاوی ئەو ناوەش سازگارە... تەنیا دێهاتی ئەردکول - مەهدی ئاباد، ئاهەنگەران و یەزدان و چەند دێی تری، ئاویان شۆرە.

خەڵقی قایین بەفارسی قسە دەکەن، هەندێکیان ئەفغانی - کوردی تورکیش دەزانن. لە قایینەدا نەخۆشخانە - پۆست و تەلگراف و چەندین مزگەوت و حوسێنییە و گەرماو و، مێوانخانە و، ریستۆران هەیە... بازاڕەکەی ۳۰۰ دوکان ئەبێ... بەشی زۆری مرۆڤی قایین بەکشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریکن لەوێ کرد و تەون و جۆلاییش باوە... زۆربەی ژنان بەڕە، گلێم، قاڵی ئەتەنن. خوریی قایین زۆر بەناوبانگە. دەسکەوتی کشتوکاڵ لە بەشی قایینەدا بەزۆری دەغڵ و دانەوێڵەیە، شەڵەم و چەوەندەر و، هەرزن و، زەعفەرانیش زۆر پێ ئەگەیێنرێ.

دانیشتوانی شارۆلکەی قایین شەش هەزار کەس ئەبن... شارەکە دوو شەقامی گەورەی تێدایە «خیابان خوراسان و خیابان خەواف» و مەیدانێکی گەورەشی هەیە پێی ئەوترێ مەیدانی ئاسایشگا و، دوو مەیدانی تریشی تێدایە...

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

۱۹/۱۰/۲۵۳۵

**وتاری: ۲۳۹**

گوێگره بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد. لەم وتارەدا باسی جێگەیەکتان بۆ دەکەین... هەزارەها ساڵە لە ناو زریەی فارسدا (خەلیجی فارس) ئاوایە، بەڵام تا ئەم ساڵانەی دواییە، ئاوەدانێکی وەها نەبووە بەغیلی پێ ببرێ... لەم دواییەدا، لە سای هیمەتی مەردانەی شاهەنشا ئاریا میهرەوە، کە زۆر بەجەختەوە داوێنی کۆششی کردووە بەلادا؛ بۆ پێش خستنی شار و دێیەکانی دەوروبەری خەلیجی فارس و، ئاوەدانکردنەوەی دوورگەکان بەساختمان و باغ و گوڵزار... ئەم جێیەش کە ئەمانەوێ ناوی ببەین و لێی بدوێین پەرەی سەندووە و، ڕازاوەتەوە و خەڵقەکەی لە پەژمووردەیی ڕزگاریان بووە و بووژانەتەوە... ئەم جێیە «قشمە»، کە ئەم ناوە لە بنەڕەتا بەجێی ئاوێژە ئەڵێن... جارێ با گوێ بدەینە ئاهەنگێکی مۆسیقا.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

«قشم» یا «قەشەم» ناوە بۆ دوورگەیەک (جەزیرەیەک) لە ناوەندی زریەی فارس «خەلیجی فارسی»دا و، نزیکەی ٢٤ کیلۆمەترە لە بەندەر عەبباسەوە درێژایی سەر زەویی ئەم جەزیرەیە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ١١٥ کیلۆمەترە و پانایی سەر زەوییەکەی لە ژوورەوە بۆ خوار، لە هەندێ جێ ٣ کیلۆمەترە و، لە هەندێ جێ پانترە، ئەگاتە دە کیلۆمەتر و لەم سەر زەوییەدا پتر لە ٥٠ ئاوایی تێدایە، بەناوی ئەم جەزیرەیەوە بەخشێ دامەزراوە پێی ئەوترێ بەخشی «قشم»: ناوەندی بەخشەکەش هەر شارۆلکەی «قشم»ە. ئەم شارۆلکەی قشمە، ئەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی دوورگە جەزیرەکە... ساڵی ١٣٠٢ کۆچی بوومەلەرزە ئەم شارۆلکەیەی وێران کرد و، تا ئێستە شوێنەواری شارۆلکە کۆنەکە هەر ماوە پاشان هەر لەو نزیکانە شارەکە دروست کرایەوە... و لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا پەرەی سەند... بەخشی قشم نەوەک تەنیا بریتییە لە جەزیرەی قشم، بەڵکو بریتییە لە پێنج جەزیرە... جەزیرەی قشم - جەزیرەی هورموز - جەزیرەی هەنگام - جەزیرەی لازک - و وردە جەزیرەکانی تونبی گەورە و تونبی بچووک... ئەم جەزیرانە پاش جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم لەژێردەستی هێزی زریەیی ئینگلیسدا بوو، بەڵام شاهەنشا ئاریا میهر ئەم جەزیرانەی لە چنگی ئینگلیس ڕزگار کرد و ئەمڕۆ جەزیرەی قشم پایەگای

گەورەترین هێزی چەکداری ئێرانە. تەنانەت جەزیرەکانی تونبی گەورە و تونبی بچووک کە نزیک بەتەنگەی هورمزن و، لەمەوبەر نیوە چۆڵ بوون و، تەنیا چەندماڵێکی تیابوو کە بەماسی گرتن و کاروباری هێزی زریەی ئینگلیسەوە خەریک بوون و، ئەمڕۆ ئازادانە خەریکی بازرگانی و تێکۆشینن.

موزیک

بەخشی قشم سەر بەشارستانی بەندەر عەبباسە، لەمەوبەر شارستانی بەندەر عەبباسی سەر بەئوستانی -کرمان و موکران- بوو پاشان کرا بەفەرمانداریی گشتی بەنادر و جەزائیر... لەم ساڵانەی دواییەدا، کە پیشەسازی و کارخانە سەنعەتییەکان پەرەی سەند و، پاڵاوگەکانی نەوت ئەو جەزیرەیانەی ئاوەدان کردەوە فەرمانداری ساحلی و فەرمانداری بەنادر کرا بەئوستانی ساحلی و ناونرا ئوستانی هورموز لەمەوبەر، ئاوی قشم هی چاڵاو و بیر و کارێز بوو و، لەبەر تاڵی سوود لە ئاوی زریە نەئەبرا... ئەمڕۆ ئاوایی و شارەکان لە ئاوی لوولە و بۆڕییە، بەهرەوەرن و، بەشی زۆری خەڵقی ئەو ئاوە لە کارخانە و کارگەکاندا بەکارەوە خەریکن و ماسی گیریش وەکو جارانی نییە کە بەتۆڕ و قولاب بێ... ئێستە کەشتی گەلی گەورە، بۆ ڕاوەماسی دروست کراوە.

لە دێهات و شارەکانی بەخشی قشمدا، قوتابخانەی بەرایی، ناوەنجی، دامەزراوە. نەخۆشخانە داروخانە دەرمانگا هەیە، مزگەوت، حوسێنییە دروست کراوە... هوتێل، میوانخانە، بازاڕ، گەرماو، لە هەموو گۆشەیەکا بەرچاو ئەکەوێ... چادر و ڕەشماڵ و زنج و ئەو زەنجوکۆخانەی کە جاران لە حەسیر و بارییە دروست ئەکران ئەمڕۆکە وەرگەڕاون بەکۆشک و تەلار. و ئەو خەڵقەی کە جاران هەڵمی گەرمی زریە ئەیپرووکاندن ئەمڕۆکە هەموویان خاوەنی پانکە و کولێر و یەخچاڵن (واتا خێوی باوەشینی کارەبایی و، یەخسازن). و بەم جۆرەی کە وترا بەخشی قشم و، شارۆلکەی قشم و جەزیرەی قشم ئەمڕۆ هەرێمێکی ئاوەدان و پێش کەوتووە.

موزیک

بیستیارانی بەرێز لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئایندە کە بەیەکتر دەگەینەوە، بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

۲۵۳۵/۱۰/۲۹

**وتاری: ٢٤٠**

گوێگره خۆشەویستەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن. خۆمان بەخۆش بەخت و بەختیار ئەزانین کە بتوانین بەپێشکەشکردنی وتاری وڵاتەکەت باشتر بناسە دڵی ئێوەی بەرێز رابکێشین بۆ گوێدان بەو مەبەستانەی ئەینووسین و بڵاوی دەکەینەوە.

ئێمە لەم وتارەدا باسی جێگەیەک دەکەین، کە تا ئێستە کەمتر ناوی بەرگوێی هەموو بیستیارانی بەرێز کەوتووە، چون هەم جێگەکە بچووکە و هەم رووداوە و قەوماوەی مێژوویی وەهای تیا هەڵ نەکەوتووە، کە ببێتە هۆی ناسرانی، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، کە بەفەرمانی خاوەن شکۆیی مەزن، شاهەنشا ئاریا میهر «لژیونی خزمەتگوزارانی مرۆڤایەتی» (لژیونی خدمتگزاران بشر) دامەزرا و ئەندامەکانی چاکی خزمەتیان کرد بەدارا و، خۆیان ئامادە کرد کاروباری هەرە قورس بگرنە مل و، لە جێی دوور و پاشکەوتووشدا خزمەت ئەنجام بدەن. کومیتەی لژیون، لە کۆبوونەوەی گشتی یەکەم ساڵیدا بڕیاری دا، یەکەم هەنگاوی خزمەتی لژیون، بۆ تاقیکردنەوە لە «قیر و کارزین»ەوە دەست پێ بکات. بەم جۆرە ناوی قیر و کارزین کەوتە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکان و... و خوێندەواران و نووسەرانیش قەڵەمیان دەربارەی خستە کار جا ئێمە بەجۆرێکی کورت و گەلاڵە، کە لە فەرهەنگەکانا هاتووە دەربارەی قیر و کارزین ئەدوێین.

موزیک

قیر و کارزین ئەمرۆکە ناوی بەخشێکە سەر بەشارستانی فەیروز ئاباد... ناوەکە تێهەڵکێشە لە ناوی دوو دێ: یەکەم «قیر» و دووەم «کارزین» و، ئەم پێکەوە ئاڵانی ناوە زۆر سەیرە چون کارزین هەشت کیلۆمەتر رێ، لە قیرەوە دوورە.

ئەم بەخشە لە دوو دێهستان پێکهاتووە: یەکەم قیر و کارزین کە ٢٧ دێی هەیە، بەڵکو پتریش بووبێ... دووەم ئەفرەز کە ١٥ دێی هەیە... یا پتر، چون بەخشەکە لە ساڵی ١٣٣٠ شەمسیدا (٢٥١٠ شاهەنشاهیدا) ٤٢ دێی هەبووە و، ئێمە سەرژمارێکی تازەترمان بەدەسەوە نییە.

ناوەندی بەخشەکە گەورە دێ یا (شارۆلکە)ی قیرە... کە لە رووی هەڵکەوتی جوغرافیاییەوە ئەکەوێتە سەر خەتی درێژایی ٥٣ دەرەجە و ٣٠ دەقیقە و پانایی ٢٨

دەرەجە و ٢٩ دەقیـقـە. و ئەکـەوێتـە لای خـۆرهەڵاتی فـیـروز ئـاواوە، بەلای خـوارووییا بەدوورایی ٧٢ کیلۆمەتر و، سەر زەویی بەخشەکە چیاییە و ڕاستـان و پێ دەشت نییە و، لە ڕووی زریەش ٧٥٠ مەتر بەرزترە.

چوار لای سنووری بەخشـەکە بەم جۆرەیە: لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی کۆهەکی سەر بەشارستـانی جهرم و، هەروا لەگەڵ بەخشی ناوەرزیی شارسـتـانی لار. لای خۆرئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی شـارسـتـانی فـیـروز ئاباد... لای ژوورو و باکووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سێ کانی سەر بەشارستـانی جهرم و، لای خوار و باشووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانەکانی لار و بوشەهر.

موزیک

دانیـشـتـوانی بەخشـەکـە ساڵی ٢٥١٠ شاهەنشـاهی ١٢ هەزار کەسێ بـوون، هەر لەو حەلەدا دانیـشـتـوانی شارۆلکەی قـیـر ٢٣٠٠ کـەس بوون. شـارۆلکەی قـیـر کـە ناوەندی بەخشـەکـەیە بازاڕێکی بچووکی ٤٠ دوکـانـی تیـابووە و، لە بەخـشـەکـە قـوتابخـانـەیەکی بەرایی هەبووە... بەڵام لەم دواییەدا، لە سـایەی کۆشـشی لژیونەوە، چەند قـوتابخـانەیەکی تیـا دامـەزراوە، هەندێکیـان لە لایەن سـپـای دانشـەوە و هەندێکیـان لە لایەن ئەندامـانی لژیونەوە بەڕێوە ئەبرێن. هەروا مزگەوت و حوسێنییە و گەرماوی تیا دامەزراوە، دەرمانگا و داروخانەی تیـایە. پۆست و تەلگراف و ئیداراتی تری دەوڵـەتی تیا دامـەزراوە. لەمەوبەر کە هەوای ناسازبووە، بەهۆی بەرەنگاری لەگەڵ «مەلاریا» ناسازییەکە، لابراوە.

ئاوی خواردنەوە لەمەوبەر، لە چەند کانی و کـارێز و چەمی قـەرە ئـاغـاجەوە دابین کـراوە، لەم دواییەدا، ئاوی خواردنەوە بەلوولەکێشییە و، بەرق و کارەباشی بۆ ڕاکێشراوە.

دانیـشـتـوانی بەشی قـیـر و کـارزین لـەمەوبەر لە عـێـلی شـوڵی سـەر بەشـوانـکارە بوون، پاشـان بەخـتـیـاری و قـەشـقـاییـیـان تێکەڵ بووە... یەکـێک لە شـاعـیـران بەزبانی فـارسی وتوویە:

ز کردان ڕاوند و شاهین و شول

بسی لشکر آمـد سـوی دزفـول

ئەو حەلەی کە ئەو هەستیارە ئەم هەڵبەستەی وتووە، کوردانی ڕاوەندی لە ئازەربایجان و گـورجـسـتـانـا دائەنیـشـتن و بنەمـاڵەی سـەلاحـەدینی ئەیوبی، لە تیـرەی هەزەبانی سـەر بەڕاوەندی بوون، بەڵام شاهینەکان لە دەشتی کرمانشا دائەنیشتن و قـەڵای شاهین یادگاری

ئەوانە شولەکانیش لە شولستان دائەنیشتن کە سەر بەئوستانی شیرازی ئێستە بوو... ئەو تیرە و عێلانەی کە ئێستە لە بەشی قیر و کارزین دائەنیشن ئەم تیرەیانەن: کورد شولی - عەمەلە - موصلو - بوربو - چهابنیچە...

شارۆلکەی قیر جێی هاتوچوونی بەختیاری و قەشقاییە بۆ کڕین و فرۆشتن، خێلاتییەکان و، دێ نشینەکان دەغل و دانەوێلە و خوری و پێستە و ڕۆن دێنن بۆ فرۆشتن و شەکر و چای و کالاو جلوبەرگ دەکڕن...

کاری خەلقی بەخشی قیر و کارزین کشتوکال و ئاژەل بەخێوکردنە، دەسکەوتیان برنج و پەمۆ و توتن و لیمۆ و پرتەقال و خورمایە.

بەپێی قسەی کەسێکی ئاشنا چەند ساڵێ لەمەوبەر لەوێ بوومەلەرزە رووی داوە، پاش بوومەلەرزەکە، دەوڵەت ئەو ناوەی سەرلەنوێ ئاوەدان کردۆتەوە...

موزیک

گوێگرە بەرێزەکان لێرەدا کاتمان تەواوبوو ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ.

٢٥٣٥/١١/٩

گوێگرە بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەمـوو کاتێکتـان شـاد بێ، لەم بەرنامەیەدا باسـی «قەڵعە دەرەسی» دەکەین، کە ناوە بۆ دێهەسـتـانێ و ناوەکە تورکـییـە واتا «شـیـوی قـەڵا» کەچی مەبەست قەڵای سەر شیوە،... وەک لەمەوپاش بۆمان ڕوون ئەبێتەوە.

موزیک

لە سەردەمی سەفـەویدا، هەمـیشـە لەسـەر سنووری ئێـران و تورکـیـا -کە ئەو حەلە پێی دەترا عوسمانی- ئاژاوە زۆر ڕووی ئەدا و، عێل و خێڵەکانی سەر سنوور شاڵاویان ئەکردە سەر زەویوزاری هاوسێکانیان و، جارجارە مەڕوماڵاتی یەکتریان بەتاڵان ئەبرد. لەبەرئەوە زۆر لە گوند و دێیەکانی سەر سنوور، دژ و قەڵای سەختیان دائەمەزراند بۆ ئەوەی بتوانن بەرەنگاریی دوژمن بکەن...

قەڵعە دەرەسی یەکێکە لە دێهستانەکانی بەخشی ناوخۆی شارستانی ماکو، لای ژووررو و خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی «ساری سوباسار» هەروەک هاوسنوورە، لەگەڵ مەرزی کیشوەری تورکیای هاومەرزی کیشوەری ئێران... و لای خواریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی «بەبەجیک» و دێهستانی چاڵدێران... و لای خۆرئاوایشەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێی ئاواجیق... ئەم گوند و دێیانەی کە لەم ناوەدان، لە دەوری سەفەوییەکاندا هی «دونبولی»یەکان بوون... پاش ئەوە کەوتنە ژێردەستی عێلەکانی جەلالی و میلانی...

دێهەسـتـانی قـەڵعە دەرەسی، لە ٢٨ دێی گەورە و بچووک پێکهاتووە، گەورەترینی ئەو دێیانە: «باغچەجق - دانالو - سەنگەر - قەڵعە جق»ن...

دانیشتوانی باغچەجق نزیکەی شەش سەد کەس ئەبن و کاروباریان کشتوکاڵ و مێگەل بەخێوکردنە... دانیشتوانی دانالوش هەروا کاروباریان کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردنە و، ئێستە دانالو بووە بەدوو گوند... دانالوی بچووک و دانالوی گەورە...

سـەنگەریش دانیشـتـوانی ٤ سـەد کـەس دەبن لەگـەڵ کشـتـوکـاڵ و ئاژەڵ بەخـێـوکـردن خەریکن... قەڵعە جوقیش گوندێکی گەورەیە خەڵقەکەی ٧٠٠ کەس دەبن لەگەڵ کشتوکاڵ خەریکن ئەم دێیانە ئەکەونە سەرەڕێی جادەی ماکو- بازرگان - پول دەشت.

ئەو شـیـو و ڕووبارانەی زەویوزاری ئەم دێهـەسـتـانە ئاو ئەدەن و خـەڵق لە ئاویـان سـوود

وەرنەگرن ئەمانەن: شیوی ساری سو لە زۆنگاوەکانی سنووری تورکیاوە بەرەو خوار دەبێتەوە و لای ژووری دێهستانی قەڵعە دەرەسییەوە، دێتە سنووری خاکی ئێرانەوە...
هەروەک گوندەکانی دێهستانی قەڵعە دەرەسی سوودی لێ وەردەگرن... هەروا گوندەکانی دێهستانی «ساری سو باسار»یش هەر کەڵکی لێ وەردەگرن - چەمی زەنگماریش کە ناوەکەی لە چیاکانی «ساری ئوجاق و چرکین»ەوە دێتە خوارەوە، لای خۆرئاواوە دێتە ناو سنووری دێهستانی قەڵعە دەرەوە... لە سەرەتادا پێی ئەوترێ «ئاق چای» پاشان کە ئاوی شیوی «ساری سو» تێکەڵی ئەبێ... هەروا کانیاو چەماوەکانی بازرگانیش ئەرژێنە ناوی... ئنجا ناوێکی تازە پەیدا دەکات پێی دەوترێ ڕووباری زەنگمار.

موزیک

دێهستانی قەڵعە دەرەسی، هەرێمێکی چیایی و زوورگ و هەڵەتە ئاووهەوای ساردە... دانیشتوانی هەموو دێهستانەکە ئەگەنە حەوت هەزار کەسێ. کاروباریان تێکڕا کشتوکاڵی و دەغڵ و دانەوێڵە و، توتن و پەمۆ و چەوەندەرە باغ و باغاتیان هەیە.

لەم دێیانەدا سپای دانش خەریکە خەڵق ئەکات بەخوێندەوار و لە دێکانا قوتابخانە دامەزراوە.

هەروا لەم دێیانەدا مزگەوت و حوسێنییە هەیە، لە گەورە دێکاندا دوکان و، گەرماویش هەیە، ئەم دێیانەی خوری، ماست، ڕۆن، پیست، دەغڵ و دانەوێڵە و میوە ئەنێرن بۆ بازاڕی شاری ماکو.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان هەر ئەمەندە زانیاریمان دەربارەی قەڵعە دەرە لە سەرچاوە مێژوویی و جوغرافییەکانا دەس کەوت تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش.

٢٥٣٥/١١/١٧

## وتاری: ٢٤٢

گوێگرە خۆشەویست و بەڕێزەکانی بەرنامەی «ولاتەکەت باشتر بناسە» ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەخۆشی بەسەربەرن... هیوای ئێمەی نووسەران و بەڕێوەبەرانی بەرنامە کوردییەکان، ڕەزامەندی ئێوەیە لە بەرنامەکان و، تکایشمان وایە کە هەرگا وەرامی پرسیارێکتان دواکەوت لێمان ببورن چون ئەم بەرنامەیە بەتایبەتی بەپێی زنجیرەی «ئەلف بێ» دامەزراوە و، با ئێستە ئەوە دەربخەم کە پێش سێ مانگ نامەیەکمان پێ گەیی لە نووسەری لاوی مێژوو جوغرافیادۆست کاک دڵشاد بەرزنجییەوە داوای کردبوو، بۆی ڕوون بکەینەوە «قوهستان» کوێیە؟ و ئەگەر مەبەست لە «قوهستان» هەرێمی چیایی بەشی خۆرئاوای ئێرانە، بۆچ بەکوهستان ناو نەبراوە؟ و کافەکە گۆڕاوە بەقاف؟! ئێمە لەگەڵ سپاسی کاک دڵشاد بەرزنجیا، زۆر لەو سەرنجە وردەی ئەو دڵخۆشین کە بۆتە هۆی ئەوەی لەم بارەوە بکۆڵینەوە و، بەهیواین گوێی لە وەرامەکەی بێ.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

بۆ وەلامی پرسیارەکەی کاک دڵشاد، کەوتینە پشکنینی سەرچاوە مێژوویی و جوغرافییەکان، بۆمان دەرکەوت وشەی قوهستان لە بنەڕەتا کوهستانە واتا هەرێمی چیایی، جا عەرەب ناوی قوهستانیان بۆ زۆر جێ بەکارهێناوە: یەکەم بۆ هەرێمی چیایی غەرب و جنوبی ئێران، واتا لە زەهاو بەرەو ژوور تا ڕەی و ئەسفەهان و، جارجارە بەربلاوتریش... دووەم قوهستانی خوراسان... ئەم قوهستانە لە چاو پێ دەشت و دۆڵیایی «هیرمەند» -کە زۆر نەوی و چاڵە- بەرزایی زیادە، عەرەب لایان بووە بەچیا و ناویان ناوە قوهستان و ناوەکە ماوەتەوە: ئیبن حەوقەل یەکێک لە جوغرافیانووسەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی نووسیویە: بەشی زۆری شارەکانی قوهستان سەردەسێرە، جگە لە «طەبەس گیلەکی»، لەو شارەکانی تر دارخورما ناڕوێ هەروا ئەڵێ: گەورەترین شاری قوهستان شاری «قاین»ە... لەم شارەدا قوهەندز (واتا کۆنە دژ) هەیە و بەدەوری شارەکەدا خەندەق لێ دراوە و، مزگەوتێکی گەورەی بۆ نوێژی هەینی هەیە.

هەروا عەرەب شارەکانی قاین و، تون (فیردەوسی ئەمڕۆ) و، بوشت و، تورشیز و

تەبەس گیلەکی و دێهاتەکانی کەناری کەویریان سەر بەقوهستانی خوراسان داوەتە قەڵەم.

جگە لەمانە چەند جێی تری بەناوی قوهستان هەیە... ئەمڕۆ لە جوغرافیای ئێراندا قوهستان ناوی یەکێ لە دێهستانەکانی سەر بە بەخشی ناوخۆی شارستانی سیرجان، کە سنووری چوار لای بەم جۆرەیە: لای باکور (شمال) و ژوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی پاریز. و لای خۆرهەڵاتەوە (شرق) هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی کوە پەنج، لای خوار و باشوورەوە (جنوب) هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی ناوخۆ و دەوروبەری سەعید ئاباد و لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی زیدئاوا...

موزیک

جگە لەمانەی وترا مەقدیسی جوغرافیانووس ناوی شارێکی تری بردووە لە بلوچستان کە ناوی قوهستان بووە و، پێی وتراوە: «قوهستانی ئەبوالغانم» کە ئەمەیان جێگەیەکی گەرمەسێر بووە لە ناوەندی باغاتی خورمادا بووە، مزگەوتێک و قەڵایەکی هەبووە.

موزیک

لەوانەی باسمان کرد، دەرئەکەوێ عەرەب هەروەک بەهەرێمی خۆرئاوا و لای خواری ئێرانیان وتووە «بلاد الجبل» هەروا کوهستانەکەشیان کردووە بەعەرەبی، وتویانە قوهستان... بەڵام لە سەردەمی سەلجووقیدا، کە خەلیفەی عەبباسی نازناوی «سوڵتان العیراقەین»ی داوە بەسەلاتینی سەلجووقی. خەڵق وایان داوەتە قەڵەم کە عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم مەبەستە. لەبەرئەوە بەنێوانی دوو ڕووباری دیجلە و فوراتیان وتووە عێراقی عەرەب و، لە حەلەوان بەرەو ژوور تا ئەسفەهان و ڕەییان ناوە عێراقی عەجەم. جا قوهستان و - بیلاد الجەبەل و - عێراقی عەجەم هەر سێکیان ناو بوون بۆ هەرێمی چیای بەشی خۆرئاوا و لا خواری ئێران... لە حەلەوان و زەهاو بەرەو ژوو تا ڕەی و ئەسفەهان.

پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە، بەهیواین کاک دڵشاد بەرزنجی وەڵامی پرسیارەکەی خۆی گوێ لێ بووبێ. و چون ئێمە لێرەدا کاتمان تەواوبوو، لەگەڵ بیستیارانی بەڕێزدا خواحافیزی دەکەین و بەخوایان دەسپێرین.

٢٥/١١/٢٥٣٥

گوێگره خۆشەویست و بەڕێزەکان ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان خۆش و پڕ لە شادی بێ.
لەم وتارەدا باسی (کازرون) دەکەین کە یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی فارس و سێ بەخشی هەیە. هەروە ناوە بۆ شارستان. ناوە بۆ بەخشی ناوخۆی شارستانەکە و ئەو دێهستانەش کە ناوەندی بەخشەکەی تێدایە...

موزیک

گوێگره خۆشەویستەکان! کازرون یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێران، لە سەردەمی ساسانیدا سەر بەشەهر شاپور بووە، لە حەلەدا ناوەندی ئوستان و پایتەختی ساسانی بوو. پاشان کە شاری شاپور وێران بوو فیروز کوڕی بارامی ساسانی لەباتی ئەو شاری شاپورە، پەرەی داوە بەئاوەدانیی کازرون... دوای ئەو، ئنجا قوبادی ساسانی، پتر ئاوەدانی کردوەتەوە و، شارەکە ئەوەندە گەورە بووە، کە دوو ئاتەشگای تیا بووە.

ئێستە شاری کازرون، ناوەندی بەخش و ناوەندی فەرمانداری و شارستانی کازرونە و، سنووری جوغرافیایی بەم جۆرەیە: لای باکورەوە هاوسنووری شارستانی نورئابادی مەمەسنی، لەمەوبەر کە ئەم شارستانە پەیدا نەبووبوو هاوسنوور بوو لەگەڵ بەهبەهان، بەڵام لەم ساڵانەی دواییەدا بەهەبەهان بەستراوە بەئوستانی خوزستانەوە. لای خۆرهەڵاتی کازرون سنووری شارستانی شیرازە. لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ هەندێ بەشی شارستانی بەرازجان و، بەخشی فەراشبەندی سەر بەشارستانی فیروز ئاوا. لای خۆرئاوایشەوە دیسانەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی بەرازجان. سەر زەویی شارستانی کازرون لە ڕووی هەڵکەوتی جوغرافیاییەوە بەم جۆرەیە: کەوتۆتە سەر خەتی درێژایی ٥١ دەرەجە و ٤٠ دەقیقە و پانایی ٣٩ دەرەجە و ٣٧ دەقیقە و سەر زەوییەکەی لە ڕووی زریە (دەریا) نزیکەی ٨٠٠ مەتر بەرزترە. ژمارەی دانیشتوانی هەموو شارستانەکە بەپێی سەرژمێریی ساڵی ٢٥٢٥شاهەنشاهی/ ١٣٤٥ شەمسی گەییوەتە ١٠٣ هەزار کەس، ئەمانە لە سێ بەخش دان بەخشی ناوخۆ (حەومە) بەخشی خشت و کمارەج - کە کەنار تەختیشی پێ ئەڵێن و بەخشی کوەمەڕە (کەنوورانیشی پێ ئەڵێن) و، لەم سێ بەخشەدا ٤٠٩ ئاوایی و دێی گەورە و بچووک هەیە، لەمانە ٨٩ دێیان سەر بەبەخشی کازرونە...

موزیک

کازرون هەرێمێکی گەرمەسێرە، ئاووهەوای لە هەندێ جێ یەکجار گەرم و لە هەندێ جێ تۆزێ باشترە...

ئاوی شارستانی کازرون هی سێ ڕووبار و چەند چەم و کانی و کارێزە و ئەمانەیان لە هەموو بەناوبانگترە:

یەکەم: ڕووباری شەش پیر، سەرچاوەکەی لای خواری ئەردەکانەوە پەیدا ئەبێ و، بەرەو لای خۆرئاوا ڕێ ئەگرێتە بەر و، لە ١٨ کیلۆمەتری فەهلیان تێکەڵ بەڕودی شیرین ئەبێ. ئەم ئاوە سەر زەوی دێیەکانی دێهستانی دوشمەن زیاری... و فەهلیان و ڕۆستەم ئاباد ئاو ئەدات، ئنجا تێکەڵ بەئاوی شیوی تەنگ شیب ئەبێ.

دووەم: ڕودخانەی شاپورە، لە بەرزایی چیاکانی کوە مەرە و نەوەدانەوە بەرەو خوارەوە ئەبێ و، زەویوزارەکانی ئاواییەکانی شاپور و خشت ئاو ئەدا و شیو و دۆڵەکان ئەبڕێ بۆ دەرەوەی شارستان.

سێیەم: ڕووباری دالەکییە، کە سەرچاوەی لە کێو و چیاکانی کوە مەرە و سورخییەوە دێتە خوارێ و دێیەکانی جەرە ئاو ئەدات... ئەم ئاوە زۆرە، بۆیە پردی دالەکی لەسەر بەستراوە، ڕووباری شاپور و ڕووباری دالکێ لە شارستانی بوشەهر تێکەڵ ئەبن و ڕووباری حللە پێک ئەهێنن کە ئەڕژێتە خەلیجی فارسەوە.

چیا بەرزەکانی کازرون ئەمانەن:

١- چیایەک کە درێژە ئەکێشی بەکەناری ڕووباری فەهلیان واتا چیاکانی کوهگیلویە، ئەم چیایە لە هەندێ جێ زۆر بەرز و لە هەندێ جێ کەمێ نەویترە. بەرزترین لووتکەی ئەم چیایە قوللەی پەرەگەدان ٢٤٠٠ مەتر بەرزە. قوللەی بەردکۆ ٢٠٠٠ مەتر بەرزە. کوی سپا ١٩٠٠ مەتر بەرزە... و کۆی زنج لە هەمووی بەرزترە و ئەگاتە ٣٠٠٠ مەتر.

٢- ریزە چیای لای خواری بەهبەهان و گەچساران کە لەگەڵ کێوی مەرە سورخیدا یەک ئەگرێ، بەرزترین لووتکەی قوللەی کوە بوزان ١٦٠٠ مەترە، کوی ئاب گەرم ١٧٢٠ مەترە.

٣- ڕیزە چیای نێوان ڕووباری دالەکی و شاپور کە لە خوار جەرەوە دێ. بەرزترین قوللەی کێوی سەرپالشتە کە ١٧٩٠ مەتر بەرزە...

موزیک

ئەم شارە زۆر ئاوەدانە، بازاڕێکی باشی تیایە، نزیکەی ١٤ چاخانە و ٣٠ ڕیستۆران و

١٥ گەرماو و چوار میوانخانە و هوتێل، چەند سینەمای تێدایە، نەخۆشخانە، داروخانە و، دەرمانگای هەیە ١٧ قوتابخانەی بەرایی... ٨٠ قوتابخانەی بەرەنگاری لەگەڵ نەخوێندەواری (مبارزە بابی سوادی) و ٤٠ قوتابخانەی ناوەنجی تێدایە، کتێبخانە، پۆستخانە - تەلگراف و تەلیفۆن و بەنزینخانەی تێدایە. ئاوی خواردنەوە هی لوولە و بۆرییە. بەرق و کارەبای تێدایە. چەند مزگەوت و حوسێنییە و قوتابخانەی ئاینی تێدایە.

دانیشتوانی نزیکەی ٢٦ هەزار کەس ئەبن کاریان بازرگانی و کشتوکاڵ و هەندێ پیشەی وردە وەک گیوە و کلاش و دۆڵکەی ئاو بۆ ئاو لە بیر و چاڵ دەرهێنان، هەروا تەون و کردیش لەوێ هەیە... مافوور و سوجادە و قالی و بەڕە و جاجم و شتی تریش دروست ئەکەن.

باغ و باغاتی خورما و پورتەقاڵ و لیمۆی تیایە، برنج و کونجی و دەغڵ و دانەوێڵەی تیا بەدەس دێ. پەمۆ و توتن و سیو زەمینی و پەتاتەی هەیە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەمەبوو هەندێ زانیاری دەربارەی شاری کازرون. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە لەم شارەدا دانا و ئەدیبی زۆر بەناوبانگ هەڵکەوتووە یەکێ لەوانە ئەبو ئیسحاقی کازرونییە کە یەکێ بووە لە مەلا چاکان و شێخانی هەرە بەناوبانگ.

چۆن کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەشادی بەسەربەرن.

٢٥٣٥/١٢/٤

**وتاری: ٢٤٤**

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەم کاتەتان خۆش... لەم وتارەدا باسی «کامیاران» دەکەین، کە هەم دێیەکی گەورەیە و ناوەندی دێهستانی کامیارانە و، هەم بۆتە ناوەندی ئەو بەخشەی بەناوی ئەوەوە ناونراوە...

مۆزیک

بیستیارانی بەڕێز

کامیاران یەکێکە لە بەخشەکانی ئوستانی کوردستان و، سەر بەشارستانی سنەندجە، ٨٢ کیلۆمەتر لە شاری سنەوە دوورە و، ئەکەوێتە لای باشوور و خوارووی سنەوە و، لە کرمانشایشەوە ٧٧ کیلۆمەتر دوورە و ئەکەوێتە لای خۆرئاوای.

لە ڕووی هەڵکەوتی جوغرافیاییەوە، ئەکەوێتە سەر خەتی ٤٦ دەرەجە و ٥٤ دەقیقەی درێژایی... و ٣٤ دەرەجە و ٤٧ دەقیقەی پانایی و، لە ڕووی زریاش (دەریا) ١٣٦٤ مەتر بەرزترە.

سنووری بەخشەکەش بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی شارستانی سنە... لای خوارەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی ناو دەربەند (میان دربند) سەر بەبەخشی ناوخۆی کرمانشا - هەروا هاوسنووریشە هەر لەو سەمتەوە لەگەڵ بەخشی ڕەوانسەری سەر بەکرمانشا... لای خۆرهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ دێهستانی بیلەواری سەر بەبەشی ناوەندی کرمانشا، کە ئەم جێیە یەکێکە لە شوێنە مێژووییەکانی هەرێمی کرمانشا و، بەداخەوە لە شەرەفنامەدا بەهەڵە نووسراوە «تیلەوار». هەروا کامیاران لای خۆرهەڵاتەوە سوچێکی ئەگاتەوە سنووری بەخشی سونقوری کولیائی. لای خۆرئاواشەوە، کامیاران هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی ناوخۆی شارستانی پاوە و، سوچێکیشی ئەگاتە سنووری بەخشی ڕەزاوی سەر بەشارستانی سنە.

ئەم ئەخشەی چوار لای سنوورە بەپێی فەرهەنگی جوغرافیایی ڕەزم ئارا و، فەرهەنگی دیهخودایە...

هەرێمی کامیاران، چیای و کۆهستانییە و لەم بەخشەدا چوار دێهستان هەیە: دێهستانی بیلاوەر، لە ٦٤ دێ پێکهاتووە دێهستانی سورسور لە ٤١ دێ پێکهاتووە...

دێهستانی گاوەڕو ٣٨ دێی تیایە... دێهستانی ژاوەڕۆ ١١ دێی هەیە. لەو حەلەدا کە ئەم سەر ژمارییە کراوە ژمارەی دانیشتوانی ئەم بەخشی کامیارانە بریتی بووە لە ٣٨٥٠٠ کەس.

زەویوزاری بەخشی کامیاران، هەرچەندە چیایی و کوێهستانییە بەڵام زۆر بەپیت و بەرەکەت و بەبڕشتە، خەڵقی ئەم ناوە تێکڕا خاوەن کشتوکاڵ و، خاوەن ئاژەڵن. دەسکەوتی کشتوکاڵییان بریتییە لە دەغڵ و دانەوێڵە و، برنج و توتن و میوەی کێوی و میوەی باغ و باغاتی پەروەرشی. و دەسکەوتی ئاژەڵیی خەڵقی ئەو ناوەش بریتییە لە شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن و خوری و پێستە و شتی تری.

دەسکەوتی جەنگەڵی وڵات بریتییە لە بەڕوو، مازو، سیچکە، قەزوان، بنێشت تاد...

## موزیک

لەم بەخشەدا دوو ڕووباری گرنگ هەیە بەناوی ژاوەرود و گاوەرود، کە ناوی دوو دێهستانی ئەم بەخشەیان لێوە هاتووە. ژاوەرود بریتییە لە چەند چەم و شیوی کە لە تەرزان و جێگەیانی تریێەوە دێت پاشان هەمووی تێکەڵ بەڕەزاو و بەزێ ئاو ئەبێ. لەبەرئەوەی شیوەکان قووڵن کەمتر بۆ ئاودێری زەویوزار سوودیان هەیە. ڕووباری گاوەڕۆ لە چیاکانی سونقوری کولیاییێەوە بەرەو خوار دەبێتەوە و هەندێ لە ئاواییەکانی دۆڵی گاوەڕۆ ئاو ئەدات... هەروا ڕووباری ئەمیر ئابادیش.

جگە لەمانە هەندێ چەماوی تریش هەیە وەک شیوی لەوەن (ڕودخانەی لون) و شیوی مرواری (ڕودخانەی مروارید).

چیا و کێوە هەرە بەرز و بەناوبانگەکانی هەرێمی کامیاران ئەمانەن:

قوللەی بەرزی گەروەنەی مروارید ٢٢٣٥ مەترە لە ڕووی زریەوە.

قوللەی کاشتەر ٢١٨٠ مەترە... قوللەی عاشقان ٢٧٦٢ مەترە... قوللەی بەردە سوور ٢٦١٣ مەترە... قوللەی سەریر عەطاء ٢٧٧٨ مەترە... قوللەی شاهنشین ٢٩٤٩ مەترە...

هەرێمی کامیاران، لە زۆر کۆبوونەوە، جێی خوێندەواران و ئەدیبان و شاعیران بووە. لەم ناوەدا مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی تأثیری زیادی هەبووە، حەبیبوڵڵای کاشتەری کە یەکێک بووە لە زانا هەرە بەناوبانگەکانی بنەماڵەی مەردوخی لە بنەڕەتا خەڵقی دێی کاشتەری کامیاران بووە. هەروا ئەدیبی بەناوبانگ کەمالەدین کامیارانی خەڵقی ئەم هەرێمە بووە.

ئەمڕۆ، لە کامیاراندا، قوتابخانە، نەخۆشخانە پوست، تەلگراف، میوانخانە، ڕیستۆران و بازاڕ هەیە. لە زۆربەی دێیەکاندا قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری (مبارزە بابی سوادی) لە کارایە، سپای دانش و سپای ترویج ئابادانی و سپای بهداشت، لە زۆربەی دێیەکاندا ئەرکی خۆیان گرتۆتە سەرشان و خزمەتی گەل و نیشتمان دەکەن.

جادەی قیرتاوی کرمانشا - بۆ سنە، بەناو بەخشی کامیاراندا ڕائەبووڕێ و، ئەم ڕێیە کاروباری هاتوچۆی خەڵقی هەموار کردووە.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان ئەمە بوو هەندێ زانیاری دەربارەی بەخشی کامیاران، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان بەخۆشی ڕابوێرن.

٢٥٣٥/١٢/١٠

## وتاری: ٢٤٥

گوێگره خۆشەویستەکان، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان شاد بێ... لەم وتارەدا باسی «کاشان» دەکەین، کە یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئێران و، ئەمڕۆکە ناوەندی شارستانێکە سەر بەئوستانی تاران، پایتەختی وڵاتی ئێران.

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

هەرکە ناوی کاشان بێتە سەر زمان، مرۆڤ بەر لە هەموو شتێ نەخش و نیگار و هونەری بەبیرا دێ. فەرشی کاشان، نموونەی تەون و کردی وڵاتی ئێرانە کە لە هەموو جیهانا دەنگی داوەتەوە. لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ، بەو کەرپووچە نەخشراوانە کە گومەزی مزگەوتەکان و بەردەرکی ماڵەکانی پێ ئەڕازێتەوە ئەوترێ کاشی، کە نیسبەت ئەلای شاری کاشانە، کە بەر لە هەموو وڵاتی ئەم نەخش و نیگارانەی داهێناوە، کە بەناوی ئەوەوە لە جیهانا تۆمار بووە.

عەرەب لەگەڵ ئەوەشدا کە پیتی کافیان هەیە، بەڵام ناوی کاشانیان گۆڕیوە بە «قاشان» و بەو هونەرانەی دەستکردی ئەوێ ئەڵێن قاشانی.

وا دیارە ناوی کاشان لە بنەڕەتا لە نەتەوەی کاسایەوە هاتبێ و، پاش ڕووخان و لەناوچوونی دەوڵەتی کاسی، کە کاشی و کوشی و کاسایت و، ناوی تریان پێ دراوە، هەندێ لەو خەڵقە ئەم شارەیان ئاوەدان کردبێتەوە، وەیاخۆ سنووری کاسییەکان، کە بەئاشکرا نازانرێ تا کوێ گەییوە، تا ئەم شارە هاتبێ. کێ چوزانی ئێمە دەبینین زریەی خەزەر، کە یۆنانییەکان پێیان دەوت «کاسپین» و پاشان پێی دەوترا دەریای قەزوین و، هەروا شاری قەزوین کە لە بنەڕەتا ناوی کاسپین بووە، هەمووی لە ناوی «کاسی»یەکانەوە پەیدا بووە، جا هەر چۆن بێ ئەمەمان بۆ دەرئەکەوێ کە شاری کاشان زۆر لەمێژ هەبووە... تەنانەت لە سەردەمی شاهەنشاهی ساسانییانا، شارێکی بەناوبانگ بووە و لە سەردەمی شاڵاوی عەرەبی ئیسلامدا، زۆر جێی وێران بووە... پاشان لە سەردەمی عەبباسییا گەرچی ئاوەدانی خۆی تازە کردۆتەوە، بەڵام لە دەورانی مەغوڵدا وا دیسانەوە لەبەر پێی لەشکرا پێشێل بووە و، خاپیر و وێران بووە. ئەمڕۆ شاری کاشان شارێکی جوان و خاوێن و، پڕ لە

کارخانەی جۆرجۆرە وەک کارخانەی پارچەی کالآ... کارخانەی پەتو... کارگەی تەون و کردی فەرش و قالّی سوجادە و و شالّ...

شاری کاشان ناوەندی شارستانی کاشانە، سێ بەخشی هەیە: بەخشی ناوخۆ (حەومە) و بەخشی ئاران و بەخشی قەمسەر.

سنووری شارستانەکە بەم جۆرەیە:

لای سەرەوە و باکوری ئەگاتە کەویری نەمەکەوە دەریاچەی قوم... لای خۆرهەلآتەوە هاوسنوورە لەگەلّ شارستانی ئەردەستان... لای خوارەوە هاوسنوورە لەگەلّ شارستانی نەتەنز، هەروا لەگەلّ بەخشی میمەی سەر بەشارستانی ئەسفەهان. لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەلّ بەخشی دەلیجان سەر بەشارستانی مەحلات.

خود شاری کاشان کەوتۆتە ڕێبازی ڕێی ئاسنی تاران بۆ یەزد. لە ڕووی جوغرافیاییشەوە کەوتۆتە سەر درێژایی ٥١ دەرەجە و ٢٧ دەقیقە و پانایی ٣٣ دەرەجە و ٥٩ دەقیقە و لە ڕووی زریەش ٩٤٥ مەتر بلّندترە.

ئاووهەوای کاشان یەک شێوە نییە، پێ دەشتەکان زۆر گەرم و هەوای وشکە، بەلآم شوێنە بەرز و چیاییەکانی ناوەنجییە، هۆی گەرمیی کاشان نزیکێتیی هەرێمەکە لە کەویری نەمەک و، هەروا نەبوونی ڕووباری گەورەیە و، هەندێ وشکە خڕ و شیو هەیە زستان باران ئاویان پێیا دێ. چەم و شیوەکانی نابر - قەمسەر - قوهرود - هەنجن... هاوینان کەمێ ئاویان هەیە و، لەم هەرێمەدا چەند کانیاویش هەیە وەک چەشمەفین - چەشمە نیاسەر - چەشمە نابر - چەشمە شا - چەشمە جوهەق بالآ - و ئەو دوای دێهات و هەرێمەکە زۆرتر ئیعتیماد ئەدەنە سەر کارێز و بیر و چالآو... دێی فین کە سەر بەکاشانە دێیەکی خۆش و پڕ ئاو و، خێوی باغ و باغاتی زۆرە. لە یەکێ گەرماوەکانی ئەم دێی «فین»ەدا کە ئەمیر کەبیر نیشتەر لە ڕەگی درا و مرد.

لە کاشاندا دێرینە و ئاثاری کۆن زۆرە، مینبەری مزگەوتی مەیدان، کە بەجوانترین کاشی ڕازاوەتەوە، ڕەنگە هی سەردەمی عەبباسی بێ... قەلآ کۆنە، کە چوار تاقی هەیە و، بەناوی ئاتەشکەدەی خوڕەم دەشت بەناوبانگە یەکێکە لە ساختمانە هەرە کۆنەکان کە تا ئێستە شوێنەواری هەر ماوە. مەدرەسەی سولّتانیش کە ساختمانێکی ڕەنگامەی بەرز و، گومەزێکی کاشیکاری جوانی هەیە و یەکێکە لە ساختمانە هەرە کۆنەکان. دێرینە و شوێنەواری تری زۆرە.

دانیشتوانی شارستانی کاشان، نزیکەی ١٦٠ هەزار کەسێ ئەبن و، زبانیان تێکڕا فارسیی کۆنە. خەڵقی شاری کاشان ژمارەیان ئەگاتە ٥٥ هەزار کەس، لەمەوبەر زۆرتربوون، بەڵام زۆر لە بازرگانە دەوڵەمەندەکان لە تاران جێ نشین بوون.

لە کاشان و دەوروبەریدا، نزیکەی ٣٠ قوتابخانەی بەرایی سەد قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری (مبارزە بابی سوادی) کە لە لایەن سپای دانشەوە بەڕێوە ئەبرێ و، دە قوتابخانەی ناوەندی هەیە... هەروا هونەرستانێ لەوێ دامەزراوە بۆ فێرکردنی کار و پیشە و، کتێبخانەیەکی گشتی تیایە بەناوی کتێبخانەی ئەمیر کەبیر، هەروا چەند مێوانخانە و ڕێستۆران و سینەمای تیایە. شەقام و جادەکانی قیرڕێژ و ئیسفاڵت کراوە.

نەخۆشخانە و دەرمانگا و داروخانەی تیایە. ئاوی خواردنەوە هی بۆڕی و لوولەیە. و گەرچی وڵاتەکە گەرمەسێرە، کاشان شارێکی بازرگانییە. گوێگرە بەڕێزەکان کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین.

٢٥٣٥/١٢/١٩

**وتاری: ٢٤٦**

گوێگرە خۆشەویستەکان کامەرانی و خۆشیتان هیوای نووسەر و بەڕێوەبەرانی بەرنامەی ولاتەکەت باشتر بناسە و، بەرنامە کوردییەکانی ترە - لەبەرئەوەی وتاری ئەم بەرنامەیە نەکەوێتە ڕۆژانی جەژنی نەورۆز و ساڵی تازە بەهەلی دەزانین پیرۆزبایی ساڵی تازەتان پێ بڵێین و هیوای ژیانێکی خۆشتر و کامەرانترتان بۆ بکەین لە یەزدانی گەورە.

ئێمە لەم وتارەدا باسی «کاشمەر» دەکەین، کە ناوە بۆ شارستانێک و بەخشی ناوخۆی شارستانە و، شارێ کە ناوەندی شارستانەکەیە... بەڵام جارێ با گوێ بدەینە موزیکێ.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان، ناوی کاشمەر، لە سەردەمی بناغە دانەری شاهەنشاهیی پەهلەوی، گەورە پیاوی ناودار، ڕەزا شای کەبیردا پەیدابووە. ئەم هەرێمە لە بنەڕەتا بەناوی هەرێمی «تورشیز» دەناسرا.

جوغرافیانووسانی سەردەمی ئیسلامی کە زۆرتر بەعەرەبی نووسیویانە ئەم ناوەیان بەم جۆرە تۆمار کردووە «تورشیش - تورشیز - تورشیس - طورثیث». جا لە هەر کتێبێکی جوغرافی کۆندا یەکێ لەم ناوەتان بەرچاو کەوت ئەوە، «کاشمەر»ی ئەمڕۆیە.

تورشیز گوایە لە شارە هەرە کۆنەکانی ولاتی ئێران بووە، ئاشو زەردەشت لە سەردەمی گوشتاسپی کوڕی لەهراسپی پادشای کەیانیدا، لە ساتی بەختیاریدا (ساعت طالع سعد) بەبێ هەستێرەناسی، دوو داری کاژی ناشتووە، یەکێ لە کشمری تورشیز و یەکێ لە فەریومەد... ئەم داری کاژی کەشمرە قەدی چووە بەهەوادا و لقویۆپی ئەوەندە بلاوبووەتەوە کە بەپێی ئەفسانە هەزارەها گا و گوسفەند و مەڕ و بزن لەژێریدا مۆڵی داوە... ئەم داری کاژە لەلای زەردەشتیان گەییوەتە ئەوپەڕی پیرۆزی و موقەدەسی، کە عەرەبی ئیسلام ولاتی ئێرانیان داگیرکردووە و، بەکاژیان وتووە سەرو، دارەکە لە زبانی شاعیرانی ولاتی فارسدا، بەسەرو کشیمر یا سەروی کاشمەر ناوبراوە.

فیردەوسی وتویە:

یکی شاخ سرو اورید از بهشت
بەپیش در کشیمر اندر بکشت

یـکی ســــــرو آزادەرا زردهشت
بـەپـیــش در آذر انــدر بـکـشـت

ئەمیر معزی وتوویە:

ترک نزاید چو تو بەکـاشـمــراندر
سـرو بنالد چو تو بە کـاشـمـر اندر

گوایە هۆی ناوی کاشـمەریش هەر لەم دارەوەیە... (کاژغـەر) واتا داری گـەورەی کاژ و کـاژبەر و، کـاشـمـەریش لەوەوە پەیدابوون بەپێی ئەفـسـانەی کـۆن ئەم دارە ١٤٥٠ سـاڵ ژیاوە، پاشـان خـەلیـفـەی عـەبـبـاسـی مـوتەوەکـیـل (مُتَـوَکِّل) سـاڵی ٢٤٧، لە کـاتێکا ویسـتـوویە کـاخی جـەعـفـەری دامـەزرێنی، وەسـفی ئەم دارەی بیـسـتـووە، فـەرمـانی داوە بەتاهیری ذوالیەمینەین (طاهر ذوالیمینین) والی خوراسان کە ئەو دارە ببڕێتەوە بینێرێ بۆ ئەوەی سـاڵۆنی (هەیوانی گـەورەی) کۆشکەکەی پێ دارە ڕا بکرێ. تاهیـر دەستووری داوە بەبڕینەوەی پەیڕەوانی ئاشـو زەردەشت کـە ئەم دارەیان زۆر لا پیـرۆز و مـوقـەدەس بووە، تکایان کردووە نەیبڕنەوە، سوودی نەبووە کەوتوونە زایەڵە و زاری و فیغان و، پەنجا هەزار دیناری ئەو حەلەیان داوە کە فکاک دەس هەڵ گرن، دیسـان سوودی نەبووە، تاهیر دارەکەی بڕیوەتەوە و، پارچەکـانی بەقافڵەی وشـترا بۆ بەغدا ناردووە ئەو شەدەی دارەکـان گەییوەتە کەناری ڕووباری دیجلە... وا ڕووی داوە کە غولامان و دەربارییانی موتەوەکیل بەدەستووری کوڕەکەی خۆی - کـە ناوی مونتـەسیر بووە - کوشتوویانە و پارچە پارچەیان کردووە و، ئەمە دانراوە بەموعجیزەی ئاشو زەردەشت.

موزیک

ئەفسـانەی دەربارەی سەرەوی کـاشـمـەر زۆرە... ئێـمـە نامـانەوێ وتارەکـەمـان بەو باسـە پڕ بکەینەوە.

گەلاڵەی قسە، جوغـرافیـانووسانی کۆن زۆر وەسفی ئاوەدانی کاشـمەری کۆنیـان کردووە، کە لەو حەلەدا ناوی «تورشیز» بووە تا ڕادەیی مەقدیسی نووسیویە: لە سەدەی چوارەمدا، لە هەمـوو جیـهـانی ئیـسـلامدا، جگە لە مـزگەوتی دیمەشقی شـام، مزگەوتێ لە مـزگەوتی کـاشـمــەر جـوانتـر دروست نەکـراوە. ئەم ولاتـە ئەوەندە بەبڕشت و بەپیت و بـەرەکـەت و پڕ دەسکەوت بووە. کە بەعەمـاری ولاتی خوراسان ناوبراوە و، کالای بازرگانی لەوێوە نێرراوە بۆ ئەسفەهان و بۆ شیراز (فارس).

سالی ٥٢٠ کۆچی سولتان سەنجەری سەلجووقی، شالاوی بردۆتە سەر ئەم هەرێمە و تالانی کردووە، پاشان ئیسماعیلییەکان بەسەر ئەم ولاتەدا زاڵ بوون و، لەو ناوە سەدەها قەلایی قایم و سەختیان دروست کردووە و، هەموو قوهستانی (کوهستان) ئەو ناوەیان لەژێردەستا بووە، گوایە سالی ٥٣٠ سەرۆکی هەرێمی کاشمەر بۆ ڕزگارکردنی هەرێمەکە کە لەژێر چنگی ئیسماعیلییەکان پەنای بردۆتە بەر تورکەکان (مەبەستی تورکەکانی ئوزبەکستانە) بەلام عێلاتی تورک لەباتی ئەوەی یاریدەی خەلقی ولات بدەن کە لە چنگی ئیسماعیلییەکان ڕزگار بن، خۆیان ولاتەکەیان تالان کرد و، هەرێمی تورشیزیان وێران کرد... لە سەدەی حەوتەمدا هۆلاکۆ خانی تاتاری مەغۆل، ئسماعیلییەکانی لەو ناوە هەلکەند و، تەرتەوەرتەیکردن و، قەلاکانی داگیرکردن، لە ولاتی تورشیزدا لەو حەلەدا قەلای سەخت و قایم زۆربوو، وەک (قەلای ئاتەشگا - قەلای میکال - قەلای بەردا ڕود) پاش ئەوە تورشیز کەوتەوە ئاوەدانی پاشان ئەمیر تەیموری لەنگ سالی ٧٨٣ ئەم تورشیزەی وێران کرد و، لە ڕووی نەخشە ناوی سڕییەوە.

لە شوێنەواری کۆنی کاشمەر (تورشیز) منارەی مزگەوتێ ماوەتەوە بەمنارەی کاشمەر ناوئەبرێ.

لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا، دووبارە ناوی کاشمەر زیندووکرایەوە، ناوی تورشیز گۆڕا بەکاشمەر و ئەمڕۆ کاشمەر یەکێکە لە شارستانەکانی ئوستانی خوراسان و، شارێکی ئاوەدان و، بەپیت و بەرەکەتە و لە وتاری ئایندەدا باسی دەکەین ئێستە کاتمان تەواوبوو بەخواتان ئەسپێرین.

٢٥٣٥/١٢/٢٥

## وتاری: ٢٤٧

گوێگره بەڕێزەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە، ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی و خۆشی بێ. ئەم وتارە پاشماوەی وتارێکە لە ساڵی ڕابردووا دەربارەی کاشمەر نووسرابوو، لەو وتارەدا پیرۆزبایی ساڵی نوێمان بەبیستیاران ڕاگەیاند، لەم وتارەشا کە لە ساڵی تازەدا بڵاوئەبێتەوە، جارێکی تریش پیرۆزباییتان پێشکەش دەکەین، بەهیوایین سێزدە بەدەرتان، بەدەر کردبێ، خۆری بەشەوقی بەهاری تازە، سەرمای زستانی ڕابردووی لە لەش دەرکردبن، لە ڕەگتانا خوێن کەوتبێتە جوولە و مێشکتان بەبۆنی ڕەیحان و شەونم و نەرگس و گوڵاڵان بووژابێتەوە، زەویی پاراو فەرشی زومەڕەدینی بۆ ڕاخستبن، گولیلکە سوورەی نیسان ئاڵای ئاڵی هەڵدابێ، لە دڵتان ژەنگی غەم و خەفەتی ڕەوانبێتەوە بەدەم گەشتوگوزاری ناو چیمەن و لالە زارەوە زەمزە بکەن و هەڵبەستی پیرەمێردی کورد بخوێننەوە، کە لە گۆرانی ساڵا، ئەیوت:

من ڕەنگی ئاڵم بۆیە خۆش ئەوێ      لە شەفەق، موژدەی خۆر دەرئەکەوێ

موزیک

بیستیارانی بەڕێز!

وتاری ئێمە جوغرافی تەئریخییە، بەڵام بەهار، نەورۆز، ساڵی تازە ئێمەشیان هێنایە زەمزەمە، ئەمەیە نیشانەی سەرکەوت و پێشکەوتی وڵات...

ئەگەر لەبیرتان مابێ وتمان کاشمەر ئەمڕۆ لە سەرەتادا ناوی تورشیز بووە و، لەو نزیکە دێیەک هەبووە کاشمەری ناوبووە، کە ئاشو زەردەشت کاژی تیا ناشتووە...

شاهەنشای مەزنی پهلەوی ڕەزا شا کەبیر، بەیادی ناوی کۆنەوە، ناوی تورشیزی گۆڕییەوە بەکاشمەر، کە هەمیشە مرۆڤ بزانن سەرووی کاشمەر، نیسبەتی بەم هەرێمە دراوە.

کاشمەری ئەمڕۆ یەکێکە لەو شارستانانەی سەر بەخوراسانن، لە ڕووی جوغرافییەوە سنووری چوار لای بەم جۆرەیە:

لای باکور و ژوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی پژقان، کە یەکێکە لە بەخشەکانی شارستانی نیشاپور، هەروا شەش تەمەد کە بەخشێکە سەر بەشارستانی سەبزەوار. لای

خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ شارستانی توربەتی حەیدەرییە... لای خوار و باشووریشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی بەجستان، کە سەر بەشارستانی گەنابادە، هەروا لەگەڵ بەخشی بەشەرویە، سەر بەشارستانی فیردەوس.

شاری کاشمەر ئەکەوێتە سەر دەرەجە ٤٨، ٢٧ دەقیقەی طولی جوغرافی و ٣٥ دەرەجە و ١١ دەقیقە عورضی جوغرافیایی و، لە مەشهەدەوە ٢٤٦ کیلۆمەتر دوورە... و لەوێوە بۆ تاران ٩٢٦ کیلۆمەترە.

ئاووهەوای کاشمەر جۆرجۆرە، لای خۆرهەڵاتی، بەرەو لای باکور چون چیاییە، نمناک و زستانێکی سارد دووردرێژی هەیە، بەڵام لای خۆرئاوای، زۆر سارد نییە ناوەنجییە، لای خواری کە نزیک کەویرە، گەرمە.

لە شارستانی کاشمەردا، رووبارێکی بەناوبانگ نییە... هەندێ شیو و دۆڵ و چەماو هەیە، کە بەهاران پڕ لە ئاوی بەفراون و هاوینان وشکن.

لە چیاکانی شارستانی کاشمەر ناوی «کوە سورخ» و «کوە دەرەوەند» و «کوە گەرماب» نەبەین. لە کوە سورخدا لووتکەی ئاتەش فشان «ئاگرپژین» هەیە، زنجیرە کێوێکی تریش بەکوە موغان بەناوبانگە.

کاشمەر چوار بەخشی هەیە یەکەم بەخشی ناوخۆ (حەومە) دووەم بەخشی کوە سورخ (ریوش) سێیەم بەخشی ئاباد چوارەم بەخشی بەرسکەند. ژمارەی دانیشتوانی شارستانی کاشمەر بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٣٤٥ شەمسی واتا ساڵی ٢٥٢٥ شاهەنشاهی نزیکەی ١٠٧ هەزار کەس بووە، کە لە ١٥٣ ئاواییدا دائەنیشن و، بەخشی ناوخۆی کاشمەر لە ٢٤ دێی گەورە و بچووک پێکهاتووە و، ژمارەی دانیشتوانی بەخشی ناوخۆ ئەگاتە ٤٠ هەزار کەس.

موزیک

ئەم شاری کاشمەرە، جوان دامەزراوە شەقامەکانی قیرڕێژ و ئەسفالتە کراوە، ئیدارەی پۆست و تەلگراف و تەلیفۆنی هەیە...

سینەمای تێدایە، بازارێکی سەد دوکانی هەیە، مێوانخانە و هوتێلی تێدایە، گەرماوی زۆرە، نەخۆشخانە و دەرمانگا و، داروخانەی تێدایە، باشگای وەرزش و، کتێبخانەی گشتیی هەیە و لە شارستانەکەدا چەندین قوتابخانەی بەرایی، قوتابخانەی ناوەنجی، قوتابخانەی لابردنی نەخوێندەواری (مبارزە بابی سوادی) تێدایە کە لە لایەن سپای

دانشەوە ئیدارە ئەکرێ، بەدیەکان سپای بیهداشت و سپای تەرویحی کشاوەرزن خەڵقی ڕێ نموون ئەکەن بۆ تەندروستی و بۆ ڕێکخستنی کاروباری کشتوکاڵ. لە شاری کاشمەر و لە بەخشەکان و لە دێکاندا مزگەوت، حوسێنییە، هەیە... چەندین چاخانە و ڕیستۆرانی تێدایە شوێنەواری کۆنی مێژوویی لە کاشمەر زۆرە، منارەی کاشمەر زۆر کۆن و بەناوبانگە، گۆیا هی سەدەی چوارەمی کۆچییە و بەمنارەی عەلی ئاباد ئەناسرێ و، چەند ساختمانی دەورانی سەفەوی تێدایە.

خەڵقی شارستانەکە زۆربەیان خێوی کشتوکاڵن و، بەئاژەڵداری و مێگەل بەخێوکردنەوە خەریکن.

پیاوان و ژنانی کاشمەر زۆریان بەکرد و تەنین و چنینەوە خەریکن لەوێ فەرش و قالی و سوجادە و بەڕە و بەرماڵ و شتی تری دروست ئەکرێ، کارخانە و کارگەی تری لەوێ زۆرە وەک چنین، نەجاری، ئاسنگەری، دەباغچێتی و چەرمسازی. ئاوی خواردنەوەی شارستانی کاشمەر، هەم هی بۆڕی و لوولەیە و هەم کارێز و کانییە... کارەبا و بەرقیشی هەیە

موزیک

گوێگرە بەڕێزەکان ئەمەبوو هەندێ زانیاری دەربارەی کاشمەر و لەبیرتان نەچێ ئەمڕۆش لە کاشمەر چەند دار کاژێ هەیە کە تەمەنیان بەپێی وتەی خەڵقی ئەو ناوە ئەگاتە هەشت سەد ساڵ. لێرەدا کاتی بەرنامە تەواوبوو، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین.

٢٥٣٦/١/٨

**وتاری: ٢٤٨**

گوێگره خۆشەویستەکانی بەرنامەی وڵاتەکەت باشتر بناسە ئەم کاتە و هەموو کاتێکتان پڕ لە شادی بێ، هیوای ئێمە ڕەزامەندی ئێوەیە... ماوەیەک لەمەوبەر کاک «سیامەک ئەردەشێر» ناوێ نامەیەکی نووسیبوو، ئەیەویست بۆی ڕوون بکەینەوە ئاوی «کارون» لە کوێیە؟ سەرچاوەی لەکوێوە هەڵئەسێ، لە بنەڕەتا ناوی چی بووە؟ مێژوونووسانی ئیسلامی بەچییان ناوبردووە؟ لە کۆنا چی سەد و بنەوانەیەکی لەسەر دروست کراوە؟ ئێستە چ سەدێکی لەسەرە؟ و هەندێ پرسیاری تر... کە بۆ وەرامی هەر یەک لەم پرسیارانە پێویستە بەرنامەیێ بنووسرێ، بەڵام ئێمە وەرامەکان لەم بەرنامەیەدا گەڵاڵە دەکەین و، بەهیواین کاک سیامەک خۆی گوێی لێ بێ...

موزیک

بیستیارانی بەڕێز

ڕووباری کارون، یەکێکە لە ڕووبارە هەرە بەتێن و تەوژمەکانی ئوستانی خوزستان، لە نێوانی شوشتەر و ڕووباری ئەروەند ڕودا (شەتولعەرەب) لای ژوور و باکورەوە، ئەکشێ بەرەو خوار و باشوور و، لە ژوور ئەهوازەوە ئەبێ بەدوو بەشەوە، یەکێکیان بەلای ڕاستا ئەڕوات و، بەناوی «شـــەطیط» بەناوبانگە ئەوی تریان بەلای چەپا ئەڕوات و ناوی «گەرگەر»ە... بەڵام دوو لقە ماوەیەک خوارتر دیسان ئەگەنەوە بەیەک و لە «بەند قیر» تێکەڵ بەیەک ئەبنەوە و، کارون بەرەو خوار دەڕوا تا لە نزیکی شاری «خوڕەم شەهر» تێکەڵ بەئەروەند ڕود ئەبێ. جگە لەم دوو بەشەی وترا، چەند ڕووبارێکی تری وەک ئاب دز و کەرخەش تێکەڵ بەکارون دەبن.

یۆنانییەکان بەکارونیان ئەوت «پازی تایگرس Pasi Tigris» واتا دیجلەی بچووک، جوغرافیانووسانی ئیسلامیش لە سەرەتادا هەر ئەم ناوەیان بەکار ئەبرد و پێیان دەگوت «دوجەیل» واتا دیجلەی بچووک، بەڵام لەبەرئەوەی «دوجەیل»ی تری هەبوو لای بەغدا. بەمیان ئەوت «دوجەیلی ئەهواز».

بەلقەکانی ڕووباری کاروندا، لە ژوور ئەهوازەوە «کەڵەک» ڕێی ئەکرد. کەڵەک بریتییە لە چەند پێستەیەکی پڕ لە پف و با دار و قامیشی ئەخرایە سەر و، چەند سەڵپی پێوە

ئەبەسترا بۆ ئەوەی بتوانرێ بەهۆیانەوە کەڵەکە کە ببرێ بۆ کەنار و، ئەو کەڵەکەبار ئەکرا لە دەغڵ و دانەوێڵــە و شــتی تری بۆ فــرۆشتن ئەبرا بۆ شــارەکــان. لە خــوار ئەهوازەوە چون ڕووبارەکە لێژ ئەبووەوە ئاوەکە پتر تیژ ئەبوو، کەڵەک سەرەنخون ئەبوو... هەروا قــایغ و بەلەمیش کاری نەدەکرد...

موزیک

ســاڵی ٢٦٠ زایینی، پاش شەڕێک کە لە نێوانی ئێران و ڕۆمدا قەومــا ڕۆم شکا و، شاپوری ئەوەڵ (یەکەم) - ڤالەرین (Valerin)ی قەیسەری ڕۆمی بەدیل گرت و، پەیمانی ئەوەی لەگەڵ بەست نەیکوژێ و ئازادی بکات بەو مەرجانەی کە ئەندازیاران و کارگەران و پسپۆڕانی کارەمــا بهێنێ لە وڵاتی ئێراندا، چەند بنەوانە و سەد و ســاختمــانی زۆر زل دروست بکات، ئینجا ئازاد بێ، لەو سەردەمەشا یەکێ لە پایتەختەکانی ساسانی شوش بوو. جــا لەوێ بنەوانە و ســەدە بەناوبانگەکــەی شــازەروان دامــەزرا، لە خــوارووی شوشتەرەوە، کە تاریخ نووسانی ئیسلامی ئەو سەدەیان بەیەکێک لە شتە سەیرەکانی جیهان (عەجائیبات جیهان) داوەتە قەڵەم، ئەم سەد و بناوانەیە کە یەکێ لە لقەکانی کارون بوو... ئەو حەلە سیمــان و چەمەنتۆ نەبوو، کارگەران لە پێشــا ناو سەدەکەیان سەراسەر بەفەرشی بەرد ڕاخست و جەمسەرەکانیان قایم کرد و بەجەنگەڵی ئاسنین و بەقورقوشم و مز و قەلایی دایان ڕێت، ئەم بنەوانەیە کە زۆریش بەرزبوو چەند جۆگەیەکی لێ هەڵگیرا، بەتایبەتی جۆگەی دەشتاباد کە بەلای خۆرهەلاتی شوشتەر ڕاکێشرابوو، دەشتێکی پانوپۆڕی ئاو ئەدا... ئەم جۆگەیە لای خوارەوە دیسان ئەڕژایەوە ناو ڕووباری کارون. دەوروبەری ئەم ڕووبارانەی کە لە کارونەوە هەڵئەسا، زۆرتر ساز ئەکرا بۆ چاندنی قامیشی شەکر. شوێنەواری سەدەکە ئێستەش دیارە.

لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەویدا، لەسەر کارون و لقەکانی چەند سەد و بنەوانە دامەزرا: سەدی محەمەد ڕەزا شا پەهلەوی ٢٥ کیلۆمەتر لە ژوور دزپولەوە (دزفول) لەسەر ڕووباری دز دامەزرا و، ساڵی ١٣٤١ شەمسی (١٥٢١ شاهەنشاهی) گەیشتە پلەی بەهرەوەری و، لەوە بەدوا سەدی ڕەزا شا کەبیر لەسەر خود کارون دامەزرا، بۆ پاراستنی هەندێ شاری خوزستان لە لافاو و سێلاو، هەروا بۆ بەناوهێنانی بەرق و کارەبا ئەمڕۆ سەدی کارون یەکێکە لە سەدە هەرە گەورەکانی ئێران...

موزیک

یەکێک لەو گەشتیارانەی عەرەب کە بەم هەرێمەدا ڕابردووە، ئیبن بەتوتەیە ئەو ناوی کارون ناوە ڕووباری شین (نهر الازرق)...

بابێینە سەر ئەوەی ناوی کارون لە چییەوە هاتووە؟ و کەی پەیدا بووە؟ هەروەک وتمان نووسەرانی فارس وەک قەزوینی و هی تر، لەباتی کارون دوجەیل ئەهواز و دوجەیل شوشتەریان وتووە. بەڵام لەوە دوا، بەتایبەتی لە سەردەمی شاهەنشاهی پەهلەوییا ناوی کارون جێی خۆی گرتووە... ئەم ناوە لە وشەی «کوهرەنگ» وەرگیراوە، کە ناوە بۆ ئەو کێوانەی سەرچاوەی کارونی لێوە دێت. خود کارون لە کێوەکانی لوڕستانی گەورەوە دێت و، لقەکانی لە چیاکانی لوڕستانی بچووکەوە دێت، کارون کە پێی ئەوترا دوجەیل لە چیای زەرد کۆهەوە دەڕژێتە خوارەوە، ئەم چیای زەردکۆهە، لە دوولاوە خێروبێری ئەرێژێ بەولاتا لای خوارەوە کارون کە بەناو چیای پڕ لە پێچ و پلووچی کێوەکانا بەرەو خوار ئەبێتەوە و، زایەندە ڕود کە بەلای ژوورا بۆ لای ئەسفەهان ئەکشێ...

ڕووباری کارون پاش ئەوەی تێکەڵ بەئەروەند ڕود ئەبێ لەو جێیە کە ناوی «سلێمانان»ە، تێکەڵ بەخەلیجی فارس ئەبن.

ئەروەند ڕود کە عەرەب ناویان ناوە شەتولعەرەب لە بنەڕەتا ناوی ڕووباری «بەهمەن شیر» بوو. هەر وا خەلیجی فارس لە بنەڕەتا ناوی زەریەی ئەو ڕەنگ بوو ئەمە بۆمان دەرئەخا پارسیی کۆن لەباتی دەریا زریەیان وتووە...

موزیک

گوێگرانی بەڕێز لێرەدا کاتمان تەواوبوو، تا وتاری ئاینده بەخواتان ئەسپێرین.

## وتاری: ٢٤٩

گـوێگره بەڕێزەکـان ئەم کـاتە و هەمـوو کـاتێکتـان شـاد بێ، لەم ڕۆژانەدا لە بەرنامـەی سەرلەبەیانیاندا، ناوێ خرایە «هەڵ هێن» کە لەوێ نادر شای ئەفشار گەنجینە و جەواهیر و شـتی گـرانبـای تیـا داناوە، کـە دوژمن نەتوانێ ڕێی پێ بەرێ، هەروا دز و خـائینـانی ناوخۆی ولاتیش پەیی پێ نەبەن، ئەم جێیە ناوی کەلاتی نادرییە و، ئەم وتارە دەربارەی ئەوێ دەنووسین.

موزیک

کەلات وشەیەکی کۆنی ئێرانییە، بەساختمانێ هەروا بەدێیەک وتراوە کە بەسەر گردێکی بەرزەوە دروست کرابێ، ئەم وشەیە وەرگەڕاوە بە «کەلاک» لە هەندێ شێوەی ئێرانا و، لە ئەرمەنیشـا بووە بە «کەهەلەکە» و پاشان کەوتۆتە زبانی عەرەبی و بووە بە «قەلعە» و، لە کوردیشا تا ئەمڕۆ هەر پێی ئەوترێ «قەڵا»، کە هاوناوە لەگەڵ و دژی فارسی. فیـردەوسی لە شاهنامەدا. لەباتی شار و دێ و قەڵای قایم بەکاری هێناوە و دەڵێ:

گـذر برکـلات ایچ گـونه مـکن
گر آن رە ڕوی خام گردد سخن

بەڵام دەقیقی هەر لەباتی قەڵا بەکاری هێناوە وتویە:

تیـر تـو از کـلات فـرود آورد هربر
تیـغ تو از فـرات بر آرد نهنـگ ڕا

لە چیاکانی خوراسـاندا، لە نێوانی ڕێی ئەبیوەرد و میهەنەدا، قـەڵایەکی سـەخت هەیە، کە ناوی ئەم دژە لە کـتێبە جوغـرافییە کۆنەکانا تۆمـار نەکراوە، تەنیا «عـوتبی» نەبێ کە یەکـێکە لە مـێژوونووسـانی سەردەمی غـەزنەوی و سـەدەی چوارەمی کـۆچی ناوی بردووە، هیچ کـەسی تری لێی نەدواوە... لە سـەدەی هەشتـەمی کۆچیـدا ئەمیـر تەیمووری لەنگ ئەم قەڵایەی گەمارۆ دا، چون خەڵقی قەڵاکە مـاوەیەک بەرەنگاری بوون، پاشـان تـوانی سـەریان پێ شـۆڕ بکات و قـەڵاکە داگیـر بکات، لە سـەرەتادا قـەڵاکەی وێران کـرد پاشـان دووبارە دروستی کردەوە... ئەم قەڵایە لە سەردەمی نادر شـادا زۆر بـایەخی پێ درا، کە نادر شا لە شـالاو بۆ سـەر هینـدسـتـان گـەڕایەوە هەرچی گـەنجـینەی هەبوو لەوێ قـایمی کـرد و، پاش

کوژرانی لە لایەن کوردەکانییەوە دەرهێنرا.

موزیک

کەلاتی نادری ئەمڕۆ، نازناوی نادری لێ فڕێ دراوە و بەکەلات ناوئەبرێ و یەکێکە لە بەخشەکانی شارستانی دەرەگەزی سەر بەئوستانی خوراسان و، لە چوار لاوە سنووری بەم جۆرەیە: لای ژوور و باکورەوە سەرحەدی سنووری ئێران - شووروەوی پێک دێنێ و، لای خوار و باشوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ چیای ئالاداغ -هەزار مەسجید- و بەخشی ناوخۆی شارستانی مەشهەد... و لای خۆرئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی لوتف ئاباد... و لای خۆرهەڵاتیشەوە هاوسنوورە لەگەڵ بەخشی سەرەخس.

هەرێمەکە سەردەسێر و، زستانان بەرف رێگەکان بەربەست ئەکات و، تەنیا بەهۆی مەکینەی پارۆ و بەرف ماڵەوە، ئەکرێتەوە کە وەزارەتی ڕاە بەکاری دێنێ. ئاوی خواردنەوە و، ئاودانی کشتوکاڵ هی کانی و چەم و ڕووبارەکانە. خەڵقی وڵاتەکە خێوی کشتوکاڵ و باغ و دارستانن و، ئاژەڵ بەخێو ئەکەن و، بەوێژە و تایبەت مەڕیان زۆرە.

بەخشی کەلات، لە ۹۳ دێ یا زیاتر پێکهاتووە... خود کەلات نادری دێیەکی گەورەیە، بەسەر کێوەکەوە، لە ناو دێیەکەدا چەند دوکان هەیە، چەند مێوانخانە و ڕیستۆران و ئاشپەزخانە و چاخانە و کەبابخانەی تێدایە. لەمەوبەر کۆڵان و شەقامەکانی ناو دێ زۆر تەنگ و پیس و پۆخڵ بوون، لە سەردەمی شاهەنشایی پەهلەویدا ئاوڕی لێ درایەوە، شوێنە کۆنەکان و کەلاوەکانی تەعمیر کرایەوە.

لەم دێیەدا کە ناوەندی بەخشەکەیە، تەلیفۆن، تەلگراف، پۆستخانە، قوتابخانەی ناوەنجی و بەرایی هەیە. دانیشتوانی هەموو بەخشەکە ۲۰ هەزار کەسێ ئەبن، زۆربەیان لەو خەڵقە کوردەن کە لە عێڵاتی زەنگەنە و گۆران بوون، نادر شا لە کاتی خۆیا بردوونی بۆ پاراستنی سەرحەد و سنوورەکان... لە کەلات و دەوروبەری هەروەک قوتابخانە و نەخۆشخانە و دەرمانگا و داروخانە هەیە. هەروا مزگەوت و حوسێنییەش هەیە.

جگە لەم کەلاتە، لە خاکی ئێراندا زۆر جێ و دێی تریش هەیە کە ناویان کەلاتە. وەک کەلاتی گوناباد، کەلاتی ئیسفرائین.

موزیک

گوێگرە خۆشەویستەکان، دەربارەی کەلات هەر ئەمەندە زانیاریمان بەدەس هێنا، تا وتاری ئایندە بەخواتان ئەسپێرین.

۲۵۳٦/۲/٤

# پێڕست